مانیفستۆی شارستانیێتی دیموکراتی

پەرتووکی سێیەم

# سۆسیۆلۆژیای ئازادی

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

و: لوقمان عەبدوڵڵا

مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی

پەرتووکی سێیەم

# سۆسیۆلۆژیای ئازادی

تاقیکردنەوە سەبارەت بە سۆسیۆلۆژیای ئازادی

عەبدوڵڵا ئۆجەلان

و. لوقمان عەبدوڵڵا

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

سێیەمین بەشە گەورەکەی ئەم بەرگرینامە بنەڕەتییەی سەبارەت بە پرۆسەی "سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە" هەوڵی ئامادەکردنی دەدەم کە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا لەبارەی منەوە بڕیاری لەسەرداوە، بەردەوامی هەردوو بەشی سەرەتایە و تەواویان دەکات. هەردوو بەشی سەرەتا ئامانجیان روونکردنەوەیەکی گشتی دەسەڵات و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو. چونکە زاراوەی دەسەڵات وەك " ئامێرە(دامەزراوە)کانی توندوتیژی" پێناسە دەکرێت کە لەسەر رەنج و هەوڵەکانی مرۆڤ ئاواکراوە و ئامانجی زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم و توانستەکانی بەهایە. ئامێرەکانی دەسەڵات کە بەشێوەیەکی هەمەجۆر و بەرفراوان ئاولکراون لە دوا شیکاردا سیستەمێکی فشارە کە لەسەر رەنجی مرۆڤ ئاواکراوە. هەرچی سەردەمی مۆدێرنیتەیە کە وەك دەستەواژە بە" سیستەمی سەرمایەداری" ناو دەبرێت، کۆمەڵگای رووبەڕووی پێشکەوتووترین شێوەکانی ئەم سیستەمانە کردۆتەوە. سیستەمی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمڕۆشمان کە جیهانگیریشی پێدەڵێن، لەناو ئەو مۆدێلەی خوازیارین پەرەی پێبدەین، بریتییە لە قۆناخێکی تایبەتی "سیستەمی دیموکراسی و دەسەڵاتی جیهان" .

لەوانەیە بگووترێت ئەم جۆرە بەرگرینامەی لەژێر ناوی کەسایەتی عەبدوڵڵا ئۆج ئالآن پێشکەش دەکرێت چ پەیوەندییەکی بە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپاوە هەیە کە دامەزراوێکی سەرووی نەتەوەکانە و وەك هاووڵاتی تەنیا مافی سەرلێدان بە تاکەکان دەدات؟

پەیوەندییەکی بەرچاو و بەکاریگەر جێگای باسە. گرنگتریش ئەوەیە: تا سیستەمی شارستانی شینەکرێتەوە کە ناوەندێتی و تەوەرەی ئەورووپا بە بنەما دەگرێت، سیستەمی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و حقوقی ئەورووپا شیناکرێتەوە کە بە "هێزی نەرم" گوزارشت دەکرێت. تەنیا کاتێك ئەم سیستەمەی شارستانی تەوەرەی ئەورووپا شیکار بکرێت ئەو کاتە بەشێوەیەکی لێهاتووانە دەتوانرێت "هێزی نەرم" شرۆڤە بکرێت. لەهەمانکاتدا پێویستە سیستەمی شارستانی ئەورووپا بەردەوام ئەوە رەچاو بکات کە لەتەواوی هەلومەرجەکانی جیهان زیاتر بەشێوەیەکی تۆکمەتر بووە بە "سیستەمی شارستانی جیهان". یەکێك لە رەهەندە هەرە گرنگەکانی ئەم شارستانییە، تایبەتمەندێتی بەدەستهێنانی هاووڵاتێتی تاکە. لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا تاك، تاکڕەوێتی و هاووڵاتێتی تا ئەم

رادەیــە لــەناو کۆمــەڵگادا واتــادار نــەبووە. رووبــەڕووی راســتینەی ســەردەمێك (مۆدێرنیتــەی سەرمایەداری) بووینەتـەوە کـە لـە ئاستێکی بـەرزدا کۆمـەڵگا لەتاکدا، تـاکیش لـەناو " کۆمـەڵگای سیمبۆلی"دا توێنراوەتەوە.

لەم سۆنگەیەوە" لە قۆناخێکدا رزگاربوون لە راستینەی ئـەم سـەردەمە زۆر زەحمەتـە (مـەحاڵ نییە) ئەو " گومانە مەزنە"ی سەبارەت بەو ناسنامەیەم هەمبوو کە وەك هاووڵاتیێتی کۆمـاری تورکیـا ( ئەندامێتی کۆماری تورکیا) ئـاولکراوە، راسـتییەکی حاشـاهەڵنەگرە لـە بنەڕەتـدا مـنی رووبـەڕووی سیستەمێکی قورسی دادگایی و سـزادان کـردەوە. کۆمـاری تورکیـا وەك وڵاتێـك کـە پـەیمانی مـافی مرۆڤی ئەورووپای واژۆکردووە، پەسەند نـەکردنی بڕیـاری "سـەرلەنوێ دادگـایی کردنـەوە"ی دادگـای مافی مرۆڤی ئەورووپا کە لە بارەی منەوە داویەتی، هەروەها گوێڕایەڵی کردنی کۆنسەی ئـەورووپاش بـۆ ئەم هەڵوێستەی تورکیا، تەواو سکانداڵ و پێشـێلکردنی حقوقـە. زۆربـەی وڵاتـە بچووکەکان خۆیـان دانیــان بــەو راســتییە دانــا کــە بــەهۆی فشــارەکانی وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا هەڵوێسـتی بەمجۆرەیان نوانـدووە. بەشـێوەیەکی روون و ئاشـکرا پێشـێلکارییەك جێگـای بـاس بـوو کـە لەگـەڵ تێزەکانی هێزی نـەرم نـاکۆك بـوو. لـە دەرەنجامی ئەمەشـدا دە سـاڵە لـە دۆخـی کەسـێکدام کـە " دادگایی ناکرێت". ئێستاش لە زیندانی ژووری ئینفیرادی ئیمرالـی ـــ زینـدانی دوورگـەی دەریاچـەی مەڕمەڕەیە کە بەشێوەیەکی باو زیندانییە بەناوبانگ و قورسەکان رووبەڕووی مـردن دەهێڵرێنـەوە ـــ بەردەوامی بەدۆخی کەسێك دەدەم کە " دانوەرانە دادگایی نەکراوە".

من بۆخۆم هیچ کاتێك گومانم لەوە نەکرد کە تەواوی ئـەو قۆناخـەی لـە هـەنگاونانم بـۆ ئـەورووپا دەستی پێکرد و لـە ئیمرالـی کۆتـایی پێهـات، بـەهاوکاری نێـوان وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ـــ یەکێتی ئەورووپا جێبەجێکراوە. گومانم لەوەش نەبوو کە ئەو رۆڵەی کەوتۆتە سـەر کۆمـاری تورکیـا، چاوشییە. لەکاتێکدا ئەمـە راسـتییە روونەکەیـە، بۆچـی هێنـدە رێگـای پێچاوپێچ تاقیدەکرێتـەوە و پەنای بۆ دەبرێت؟ لەوانەیە کەسانێك ئەم داوەرییەم قورس ببینن. ئەگەر بڵێم، تەنیا لە ٢ی شوباتی ١٩٩٩ بە فەرمانی تایبەتی ناتۆ تەواوی فڕۆکەخانەکانی ئەورووپا بەرامبەر بەو فڕۆکەیە داخرا کە مـنی هەڵگرتبوو، بەپێی پێویست قەناعەتکار دەبێت (ببوو بە رۆژەڤی رۆژنامـەکانی ئـەو کاتـە). هەڵبەتـە رفاندنم بۆ کینیا و سەپاندنی چاودێرییەکی رەها ( لە فڕۆکەخانە تەواوی نامە و کاسێتەکانم دەسـتی بەسەردا گیرا) و رادەستکردنەوەم بـە تورکیـا، بەشـێوەیەکی فـەرمی دان پێـدانانی لەلایـەن ژەنـراڵ گالیتـاری نوێنـەری "بیـل کلینتـۆن"ی سـەرۆکی ئەوکاتـەی ئـەمریکا، بـەپێی پێویسـت راسـتییەکە

ڕووندەکاتەوە. لێرەدا باسکردنی خیانەتە چەپەڵەکەی کاربەدەستانی یۆنان (لە سەروویانەوە کاربەدەستە لەپێشەکانی وەزارەتی دەرەوە، هەواڵگری میللی و کۆنسڵگەری، ئەرکداری تایبەت کالاندریس، بە تایبەتیش سەرۆك وەزیران سمیتس ) پێویست نابینم. ئەمانە خاڵی روون و ئاشکران.

مادام پەیوەست بە حقوقی تاك سوود وەرگرتنم لە حقوقی ئەورووپا مافێکە: بۆچی دووبارە پەنا برایە بەر ئەم هەموو ڕێگا تاریك، شارلوە و تەڵەکەبازیانەوە؟ چ جۆرە سەودا و مامەڵەیەك لەناو مەسەلەکەدا هەبوو؟ کێ کەوتە نێو شانۆی سەوداکانەوە، بەرامبەر بەچی؟ لەوانەیە بەرامبەر بە تابلۆ خوێناوییەکانی قۆناخی شەڕەکانی داگیرکاری، سووتاندنی جادووگەران، شەڕی مەزهەبی و نەتەوەیی، پێکدادانە چینایەتی و ململانێ ئایدیۆلۆژییەکانی مێژووی دەسەڵاتی ئەورووپا و ئەمریکا، ئەزموونی من بە دڵۆپێك لە دەریا لەقەڵەم بدرێت، بەڵام دیسان گرنگە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە.

بەرلەهەموو شتێك پێویستە بڵێم ئەو چەمکە پەسەند ناکەم کە تاك لە ناسنامەی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵگای خۆی دادەبڕێت و دەرهەست (ئەبستراکت)ی دەکات. مافی "سەرلێدانی تاکەکەسی" کە بە سووربوونەوە دەسەپێنرێت هەرگیز ئەو واتایە نابەخشێت کە باس دەکرێت. چونکە وێناکردنی تاکێکی دابڕێنراو لە ناسنامەی کۆمەڵگاکەی سەفسەتە (چەنەبازی)یەکی ئەبستمۆلۆژی فەرمییە کە ناوەندەکەی ئەورووپایە و خۆی بە "زانستی" دادەنێت. هەڵبەتە سوڵتانە کەڕەکانیش[1] کە نابیسن ئەوانیش دەزانن من بەناوی کوردان دادگایی دەکرێم: کە لە دۆخی تراژیدیترین گەلی جیهاندایە.

تەنانەت ئەم ڕاستییانەی زۆر بەکورتی ئاماژەشم پێکردن سەبارەت بە چوارچێوە و فراوانی دۆزەکەم بەپێی پێویست بۆچوونێك دەخاتەڕوو. وەك ئاشکرایە ناتوانن دووچاری ڕەوشی بکەری نادیارم بکەن. هێزی سیستەمی شارستانی ناوەندی (بەڕێبەرایەتی دەسەڵاتی هەژموونی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا) هەرچییەك بێت، ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە تەواوی هێزەکانی سیستەم لە دۆزەکەم، لە دەستگیرکردن و دادگاییکردنەکەمدا ڕۆڵێکی چالاکیان بینیوە. لەڕاستیدا لەو قۆناخەدا

---

[1] سوڵتانی کەڕیش گوێی لێبووە: پەندێکی گەلەری تورکییە، بەو واتایە دێت کە کەس نەماوە مەسەلەکەی نەبیستبێت.

گەلەکەم بەرامبەر ئەم گەمە گەورەیە بەردەوام لەسەر پێیان بوو. شەرمەزاری کرد، سەدان شەهیدی پێشکەشکرد، بەهەزاران کەس دەستگیرکران. گەلەکەم زۆر بەباشی دەرکی بە پەیوەندی من لەگەڵ ترازیدیا مێژووییەکەی خۆی کرد. رزگاربوونی خۆی لە پووچەڵکردنەوە و تێکدانی ئەم ترازیدیایەدا بینی و بە ئاگاییەوە خاوەندارێتی دۆزەکەی کرد. هەرچی ئەرکی شەرەفمەندانەی راگەیاندنی ئەم راستیەیە کەوتە سەر شانی من.

روون و ئاشکرایە تا لەهەموو لایەکەوە ناسنامە کۆمەڵایەتییەکەم روون نەکەمەوە کە بەلانی کەم لەژێر ستەم و چەوسانەوەی سیستەمی ناوەندی شارستانی پێنج هەزار ساڵە ناڵاندوویەتی و لەهەمانکاتدا شێوەی بە راستینەی گەلەکەمان داوە، ناشێ باس لە روونکردنەوەی دۆزەکەم بکرێت. لەم چوارچێوەیەدا پێوانە دەست لێبەرنەدراوەکانی تاوتوێکردنی بەرگرینامەکەم لەم راستیانەدا شاراوەیە. ناچارم یەکێك لە گوتەکانم دووبارە بکەمەوە کە زۆر جار ئاماژەم پێکردووە "ساتی وەها دێتە پێشەوە، مێژوو لە کەسایەتییەکدا، کەسایەتی لەمێژوودا شاراوەیە". هەرچەندە زۆر بە ئێش و ئازاریش بێت، حاشاهەڵنەگرە کە تا رادەیەك من شەرەفی ئەم کەسایەتییەم بەرکەوتووە. جیاوازی من لەوەدایە، زۆریاش دەزانم لەبەرئەوەی لەولاتری "قوربانی قەدەر" خوازیاری رۆڵ بینین بووم، ئەم نەخشە و پیلانەیان لەبەرامبەرمدا بەڕێوەبرد. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو دروشمی دۆزەکەم کرد بە "ئازادی سەردەوکەێت".

تێکدان و پووچەڵکردنەوەی چارەنووسی دووبارەبۆوەی پیلان و گەمە ترازیدییەکان و شکاندنەوەی بەلای ئازادیدا، بەسە بۆئەوەی هەموو ئێش و ئازارێك رەچاو بکرێت. ئەم جارە لەکاتێکدا لەگەڵ هەڤاڵانم لە پارییەکدا جێگای خۆمان دەگرین کە ناوەکەی خودی راستی بۆخۆیەتی، ئەوەی دەبێتە بەشی قەدەر تێکشکانە.

لەبەرئەم هۆکارانەوە دەرکی پێدەکرێت بۆچی ئەم بەشەی بەرگرینامەم لەژێر ناوی کۆمەڵناسی ئازادی پێشکەشکردووە. هەرهەنگاوێکی ئازادی دەشێ تەنیا تاقیکردنەوەیەك بێت. لەم سۆنگەیەوە ناوی تاقیکردنەوە سەبارەت بە کۆمەڵناسی ئازادی لەجێگای خۆیدایە.

بێگومان شارستانی ناوەندی هەژموونگەرایی ئەورووپا بریتییە لە روویەکی مەدالیاکە. ئەم شارستانییە زیاتر گوزارشت لە دامەزراو و ئامێرەکانی دەسەڵات دەکات کە زیاتر لەسەر زێدە ـــ بەرهەم ئاولکراوە. لایەکەی دیکەشی، رووی دیموکراتی شارستانییە. ئەو بۆچوونانەی بناخەی ئەم بەرگرینامەیە پێکدێنن میراسی شارستانێتی دیموکراتی بەبنەما دەگرێت. بەخولیا و ئەشقێکی

مەزنەوە لە سوقراتەوە تا دەگاتە نۆزی خۆم، وابەستەی میراسی لە ژمارنەهاتووی تێکۆشانەکانی ئەخلاق و هزر، شەڕڤانانی گەل و کۆمینم. ئەوەی دەتوانم ئەنجامی بدەم، پێشکەشکردنی کۆمەکێکی بچووکە، زیادکردنی دڵۆپێکە لە دەریایەك. کۆتەڵەکانی مرۆڤایەتی بەشی بنەڕەتی سەرچاوەکەم پێکدێنن. بەڵام زەمینەی مێژووی پێنج هەزار ساڵەی رلوەستەی دیموکراتی و دانایی نەریتی رۆژهەڵات لە بناخەکەیاندا شاراوەیە و رۆڵ دەبینێت. هەروەکو چۆن تا بیر لەم زەمینە نەکرێتەوە ناتوانرێت مێژووی گەردوونی مرۆڤایەتی بنووسرێتەوە، ئەوا شرۆڤەیەکی واتادار سەبارەت بە رۆژی ئەمڕۆشمان ناکرێت.

تەوەرەی بنەڕەتی هزری بەرگرینامەکەم ئەوەیە: کاروانی کۆمەڵگای مێژوویی لە سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیدا بەشێوەیەکی ئازادانە ئاراستە بگرێت، تاکەکانیشی بەشێوەیەکی باشتر و جوانتر لەناو هەبووندا بژین کە سەرچاوەی خۆی لە بنەمای راستەوە وەردەگرێت.

سەبارەت بە چۆنیەتی و شێوازی نووسینەکەشم ئاماژەکردن بەچەند خاڵێك رۆشنکەرەوە و سوودبەخش دەبێت. لە هەلومەرجی زۆری ئینفیرادی تەنیا مۆڵەت بە تاکە پەرتووك، گۆڤارێك و رۆژنامەیەك دەدرێت کە لام بێت. دەرفەت و هەلومەرجی ئەوەم نەبوو تێبینیەکانم بنووسمەوە، یان هەندێك برگە لە پەرتووکی دیکە وەربگرم. هەر بابەتێکی کە گرنگم دەبینی لە یادەوەری (ذاکرە)ی خۆم تۆمارم دەکرد و لە کەسایەتی خۆمدا هەرسم دەکرد، ئەمە بوو بە پەیڕەوی سەرەکیم. وەك کۆیلە گوێڕایەڵی قەدەخەکانیان نەبووم. ئەو وەڵامەی بەرامبەر ئەم قەدەخەکاریانە پیشانمدا، هەنگاو بەهەنگاو زیاتر یادەوەری خۆم زەلالترکرد کە کۆگای زانیاریەکانی گەردوونە، هەروەها هزرم کرد بە سەرکێش کە رۆڵی دیاریکەری هەیە.

بەڵام لاوازییە هەرە گەورەکەی ئەم پەیڕەوە لەبیرکردنە. هەربۆیە نەنووسینی تێبینییەکان لەم لایەنەوە رۆڵی بەربەستی بینی. کاتێك ئامادەکاری نووسینی ئەم بەشەم دەکرد پێنووسیشیان لێ قەدەخەکردم. بەڵام دوای ئەوەی لە دەیەمین رۆژی سزای گۆشەگیری ئەم قەدەخەیە هەڵگیرا، یەکسەر دەستم بەنووسین کرد، چونکە چەندەی دەچێت درەنگ دەکەوێت، نەمدەتوانی بەڵێنەکەی خۆم جێبەجێبکەم. ئەو وەڵامەی بەرامبەر قەدەخەکردنی پێنووس نیشانمدا: قاڵبوونەوەیەکی زیاتر بوو سەبارەت بە گەڵاڵەنامە بنەڕەتییەکە.

هەروەها بەشەکەی دواتری بەرگرینامەکەم بەشێوەی "دیموکراتیزەکردنی کلتووری رۆژهەڵاتی ناوین" و "رێگە چارەی شارستانێتی دیموکراتی لە کوردستان" گەڵاڵەکراوە کە گۆڕەپانی

بەرجەستە و کۆنکرێتی پراکتیزەکردنی هێزی بنەڕەتیمە. بۆ نووسینی ئەم بەشانەی هەر ڕۆشنبیرێکی ئامادە دەتوانێت بیاننووسێت، وەك دیار دەبێت ماوەیەکی زیاتر دەخایەنێت. بەڵام کاتێك لەژێر ڕۆشنایی شیکارکردنی کۆمەڵگای مێژوویی کوردستان کە بۆتە دڵی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گرێگرتوو، ڕەوشی هەنووکەیی تاوتوێ بکرێت، چەندەی بڵێی جۆش وخرۆش دەبەخشێت و بەرپرسیارێتی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. لەمیانەی زەبرێکی ئەسکەندەریانە (لێدانێکی وەکو ئەسکەندەر، بەڵام لایەنی جەستەیی کەم بێت و تەنیا لەکاتی پێویستدا بەکاربهێنرێت، هێزێکە کە واتا لایەنە قورسەکەی پێکدێنێت) کە لە ساتی دروستبوونی گرێکوێرە نوێیەکەی گۆردیۆن[٢] بوەشێنرێت کە هی رابردوو ـ ئەمڕۆ و ـ داهاتووە، بەم شێوازە بکرێتەوە، پیرۆزترین و سەرەکیترین ئەرکە.

[٢] گرێکوێرەی گۆردیۆن: چیرۆکێکی میتۆلۆژییە. بەگوێرەی ئەم چیرۆکە فریگیا پادشایەکی بە ناوی (گۆردیاس) هەبووە کە دامەزرێنەری شاری گۆردیۆنە. ئەڵقەکانی زنجیری گالیسکەکەی زۆر ئاڵۆز بووە، تەنیا ئەسکەندەری مەکەدۆنی توانیویەتی بە شمشێرەکەی بیپچڕێنێت. لەو ڕۆژەوە وەك نموونەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی گرێکوێرەکان ئاماژەی پێدەکرێت.

## دەروازە

بەلانی کەم بەڕادەی ئامێرەکانی (دامودەزگاکانی) دەسەلآت و بەرهەمهێنان ــ کەڵەکەکردن، پێکهاتە (بونیاد)ە مەعریفیەکەی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری لەناو قەیرلندایە. وەك پێویستییەکی سروشتی بونیادی زانیاری کە بۆ گفتوگۆی ئازاد کراوەن، دەرفەتی راڤەکردنێکی بەرفراوان سەبارەت بە رەهەندەکانی قەیرانی زانستی دەبەخشێت. رۆڵی زانیاری لەبونیادەکانی دەسەلآت و کۆمەڵگادا بەرادەیەك واتادار بووە کە ناتوانرێت لەگەڵ هیچ قۆناخێکدا بەراورد بکرێت. ئامێر و دەزگاکانی زانیاری ــ مەعریفی ژیانی کۆمەڵگا بەشۆرشێکی مێژووییدا تێپەڕدەبێت. قۆناخەکانی شۆڕش کە وەك قەیرانە، لەناوەرۆکی خۆیدا رۆڵی گەران بەدوای رژێمەکانی حەقیقەتیشدا دەبینێت. هەژموون تەنیا لە گۆڕەپانەکانی کۆمەڵ، بەرهەمهێنان و دەسەلآتدا پەلناهاوێژێت، بەڵکو لە گۆڕەپانی زانین (مەعریفە)شدا تێکۆشانێکی دژواری هەژموونگەرایی بەرێوەدەچێت. هەر بونیادێکی بەرهەمهێنان ــ کۆمەڵ ــ دەسەلآت ئەگەر مەشروعییەتی خۆی لەبواری (گۆڕەپانی) زانین ــ مەعریفە بەدەست نەهێنابێت، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن توانای هەمیشەییکردنی هەبوونی خۆی نابێت.

ئەم راستییە ئاشکرا بووە و ئیتر گفتوگۆی لەسەر دەکرێت کە: ئەو زانستە پۆزێتیڤستانەی تا ماوەیەکی نزیکیش حوکمڕانیان دەکرد، هەروەکو باس دەکران هیچ یەکێکیان خاوەن دیدگای دژە ــ میتافیزیك و دژە ــ ئایین نەبوون، بەڵکو بەلانی کەم هێندەی زاراوەکانی ئایین و میتافیزیك هەڵگری رەهەندێکی ئایینی و میتافیزیکی بوون. گوایە قۆناخەکانی سەرکەوتنی زانستەکانی سروشت کە دەکرێتە موڵکی کۆمەڵگای یۆنانی کۆن و ئەورووپای سەردەمی رۆشنگەری، قۆناخێکن کە زانستەکانی سروشت لەناواخندا زەبری کوشندەیان بەرکەوتووە. چەمکی راستی ــ پێشکەوتنی بەردەوام ، لاوازترین لایەنی ئەم زانستە پۆزێتیڤانە پێکدێنێت. چونکە بونیاد و ئامانجێکی بەم جۆرەی گەردوون دەستنیشان نەکراوە. چ دونیای ژێر ــ ئەتوم بێت، یان دونیای گەردوونی بێت، لە دوالیزمی چاودێر ــ چاودێریکراو رزگاری نابێت. هەڵبەتە مەعریفەی مرۆڤیش دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم قۆناخ و پرۆسەیەوە. پەی پێنابرێت کە چۆن بەرۆڵێکی سەرووتری ئەم چوارچێوەیە دەگەیەنرێت. بەلآم خودی ماتەوزەی جیاوازی ناکۆتا و بێسنوور پێویستی شرۆڤە و راڤەی نوێ پیشاندەدات.

کۆمەڵناسی کە بونیادێکی زانستی ناوەندێتی ئەوروپایە، هەروەکو هەوەسدارانی زانستی پۆزێتیف کە نزیکی فیزیا، کیمیا و بایۆلۆژی دەبنەوە، کۆمەڵگاش بە دیاردەیەکی هاوشێوە دادەنێن، لەمیانەی هەمان هەوڵێستەوە هەوڵی روونکردنەوەی دەدەن، و بانگەشەکانیان لەوە زیاتر تێپەڕناکات. پیشاندانی بوێری بە ئۆبژەکردنی کۆمەڵگای مرۆڤ کە خاوەن سروشتێکی زۆر جیاوازە، بەپێچەوانەی مەزەندەکان رێگای لەپێش رۆشنبوونەوە نەکردۆتەوە، بەڵکو لە رێخۆشکردن بۆ بتبوونێکی رووکەشی رزگاری نەبووە. گفتوگۆکانی زانستی رۆژی ئەمرۆمان بەپێی پێویست ئاشکرای کردووە کە کرانەوە فەلسەفییەکانی ئایدیۆلۆگە ئەڵمانەکان، زانستی ئابووری ـ سیاسی ئایدیۆلۆگە ئینگلیزەکان و کۆمەڵناسی فەیلەسوفە فەرەنسییەکان کە لەپێناو پێشکەشکردنی زانیاری بە دەوڵەت ـ نەتەوەکانیان دەست بەکاربوون، هەریەکەیان ئامرازێکی رەواکردنی ئامێرەکانی دەسەڵات و کەڵەکەکردنی سەرمایەن. لە دوا شیکاردا فەلسەفەی ئەڵمانی، ئابووری ـ سیاسی ئینگلیز و کۆمەڵناسی فەرەنسی لە رەخساندنی زەمینە بۆ میللیگەرایی هەڵکشاوی دەوڵەت ـ نەتەوە رزگاریان نەبووە. بەشێوەیەکی گشتی، بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین ئەولوی ئەو کۆمەڵناسییانەی ناوەندەکەیان ئەوروپایە، بونیادی زانیاری (مەعریفی) سیستەمی جیهانی سەرمایەدارین کە ناوەندەکەی ئەوروپایە.

بەڵام درکاندنی ئەمانە کێشەکە چارەسەر ناکات. بەرادەی پێویست ئاشکرا بووە کە کۆمەڵناسی یاخود سۆسیالیزمی مارکس ـ ئەنگلس کە وەك بۆچوونێکی دژ سەریهەڵدا، قەبەترین شرۆڤەی کۆمەڵگا بووە. بەپێی پێویست لە رەوتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنرلو، سۆسیال ـ دیموکرات، رزگاری نیشتیمانی، بزووتنەوەو سیستەمی دەوڵەتەکانیان دەرکی پێدەکەین سەرباری بانگەشەکانی دژایەتیکردنیان بۆ سیستەم، لەو رەوشە رزگاریان نەبووە کە لە ئایدیۆلۆژیای فەرمی سەرمایەداری، واتە لە لیبرالیزم زیاتر خزمەت بە سەرمایەداری نەکەن. سەرەڕای نەریتە رەسەنەکانی تێکۆشانیان، تەنانەت بەناوی چین و نەتەوە چەوساوەکانەوە خزانیان بۆ ناو ئەم رەوشە، لە نزیکەوە گرێدراوی بونیادەکانی زانیارییانە. بونیادەکانی زانیاری کە پشتییان پێبەستووە، بەلایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانیانەوە، ئەنجامێکی پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئەگەر زنجیرەی هەڵە و کەموکورتییە جددییەکانیان لە بونیاد و پارادایمە(پارادیگما) سەرەکییەکەیاندا نەبوایە، هەروا بە ئاسانی ئەم ئەنجامانە دەرنەدەکەوتن.

هەرچی بیرۆزە زێدەڕۆییەکانی رێژەیین کە خۆیان وەك رەوتێکی دیکەی دژ دەسەپاند، خۆ رزگارکردنیان لە بوون بە بونیادی زانیاری سیستەمی جیهانی سەرمایەداری لەولاوە بمێنێت، لەوانەیە بەهۆی ئاکرەوێتی ئەوپەڕگەراییان بێت هەرەزێدە خزمەتیان بە ئاکرەوێتی سەرمایەداری

کردووە. هەڵوێستە ئەنارشیستییەکانیش دەکەوێتە ناو ئەمەوە. هەروەکو زۆرجاریش بینراوە، رەخنەکردنی سەرمایەداری و بە زارەکی نیشاندانی دژایەتیکردنی سەرمایەداری رێگایەکی بەکاریگەری خزمەتکردنی سەرمایەدارییە. هەڵە و ناتەولوییەکانی پارادایم و بونیادەکانی زانیاری رۆڵی سەرەکی لەمەدا دەبینن.

نە بەوڕادەیەی دەگووترێت زانستە فیزیاییەکان تەنیا گرێدراوی سروشتی فیزیایی (کیمیا و بایۆلۆژیشی لەناودا)یە، نە ئەدەبیات، مێژوو، فەلسەفە، ئابووری ــ سیاسی و کۆمەڵناسیش تەنیا پەیوەندیداری سروشتی کۆمەڵگایە. دەشێت زاراوەی زانستی کۆمەڵایەتی وەك خاڵی یەکتربڕینی هەردوو زانست بە واتا بەرفراوانەکەی بە ئەرێنی پێشوازی بکرێت. چونکە هەر زانستێك ناچارە کۆمەڵایەتی بێت.

لەمیانەی هاوڕابوون لەسەر پێناسەی زانستی کۆمەڵایەتی کێشەکە چارەسەر ناکرێت. ئەوەی گرنگترە، چی وەك مۆدێلی سەرەکی بە بنەما دەگیرێت، بە واتایەکی دیکە لە شیکارکردنی کۆمەڵگادا کامە یەکینە بەبنەما دەگیرێت. کاتێك بگووترێت "یەکینەی سەرەکی هەمووی سروشتی کۆمەڵگایە"، واتایەکی ئەوتۆی بۆ زانستی کۆمەڵایەتی نابێت. لەناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بێژمارەکاندا هەڵبژاردنی ئەوانەی گرنگی دیاریکەرییان هەیە، ئەو بژارەیە کە پێویستە لەپێناو هەڵوێستێکی تیۆری واتادار ئەنجامبدرێت. ئەو یەکینە کۆمەڵایەتییەی هەڵدەبژێردرێت بەو ڕادەیەی هەمووێتی ڕوونبکاتەوە واتادار دەبینرێت.

هەروەکو دەزانرێت مۆدێلی جیاواز سەبارەت بە بواری کۆمەڵایەتی پێشخراوە. ئەو هەڵوێستانەی کە دەناسرێن و زۆر بەکاردەهێنرێن بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەت، بە تایبەتیش دەوڵەت ــ نەتەوە بەبنەما دەگرن پشت بە ڕێنومایی و دیدگای چینی ناوینی بۆرژوازیی دەبەستن. لەچوارچێوەی ئاواکردن، رووخان و پارچەبوونی دەوڵەتەکان لێکۆڵینەوە و شیکار لەبارەی مێژوو و کۆمەڵگا دەکرێت. ئەم مەیلە کە یەکێك لە رووکەشانەترین مۆدێلەکانی هەڵوێستە سەبارەت بە راستینەی کۆمەڵگای مێژوویی، لەچەمکی فەرمی پەروەردەی دەوڵەت بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێت. ئامانجی سەرەکیش بینینی رۆڵی ئایدیۆلۆژیای رەواکردنی دەوڵەتە. لەجیاتی ئەوەی رۆشنکەرەوە بێت، خزمەتی پەردەپۆشکردنی کێشە ئاڵۆزەکانی مێژوو و کۆمەڵگا دەکات. ئەمەش بێ رەواج و بێ متمانەترین هەڵوێستی کۆمەڵناسییە.

هەڵوێستی مارکسیستی کە چین و ئابووری وەك یەکینەی سەرەکی هەڵبژارد، بەرامبەر بەیەکینەی دەوڵەت خوازیاربوو خۆی وەك مۆدێلێکی ئەلتەرناتیف فۆرمێل بکات. سەرباری ئەوەی لەمیانەی هەڵبژاردنی چینی کارکەر و ئابووری سەرمایەداری وەك مۆدێلی سەرەکی شیکارکردنی

کۆمەلگا، هەولّی روونکردنەوەی گرنگێتی بونیادی چینایەتی و ئابووری کۆمەلگا و مێژووی داوە، بەلام ناتەواوی و کەموکورتی جددی لەخۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی ئەم هەلوێستە دەولەت و دامەزراوەکانی دیکەی سەرخانی بە بەرهەمی ژێرخان لەقەلەمدا و وەك رەنگدانەوە هەرەمەکیەکانی هەلسەنگاند، بۆیە رێگەی لەپێش خزاندنە ناو میتۆدی بچووککردنەوە بۆ ئابووری کردەوە کە ئیکۆنۆمیزمی پێدەگوترێت. میتۆدی بچووککردنەوە بۆ ئابووری وەك میتۆدی بچووککردنەوە بۆ دەولەت لەناتەواوی و رۆلّی پەردەپۆشکردنی راستینەی کۆمەلگای مێژوویی رزگاری نەبوو کە خاوەن یەکگرتوویی پەیوەندییە تێکەلّ و ئالۆزەکانە. بەتایبەتیش ئەنالیزە ناتەولوەکانی دەسەلات و دەولەت، رێگای لەپێش خۆپڕچەکنەکردن و تەیارنەکردنی ئایدیۆلۆژی و سیاسیانەی ئەو گەل و چینە رەنجدەر و چەوساوانە کردەوە کە بانگەشەی نوێنەرایەتی کردنیانی دەکرد. رووخاندن و ئاولکردنی دەولەت و دەسەلات لە میانەی چەمکی تێکۆشانی تەسکی ئابووری کە بەشێوەی پیلانگێڕی دەولەتی هەلپەرستانەیە، بەلانی کەم بە ئەندازەی ئایدیۆلۆژیا تایبەتەکەی خزمەتی بە سەرمایەداری کردووە. واقیعی چین و روسیا زۆر بەباشی ئەم خالّە روون دەکەنەوە.

زۆرجار ئەو چەمکانەش دەبینرێن کە خوازیارن مێژوو و کۆمەلگا تەنیا وەك دەستە و هێزی دەسەلات شرۆڤە بکەن. بەلام ئەم هەلوێستانەش بەقەدەر بڕاری مۆدێلی دەولەت ناتەولو و بەکەموکورتییە. هەرچەندە دەسەلات یەکینەیەکی بەرفرلوانتری لێکۆلّینەوە بێت، بەلام بەتەنیا ناتوانێت سروشتی کۆمەلایەتی روونبکاتەوە. لەگەلّ ئەوەی دەسەلاتی کۆمەلایەتی بابەتێکی گرنگی لێکۆلّینەوەیە و لایەنی روونکردنەوەی هەیە، بەلام میتۆدی بچووککردنەوە بۆ دەسەلات هەمان ئەو کەموکورتیانەی هەیە کە لە جۆرەکانی دیکەی میتۆدی بچووککردنەوەدا دەبینرێت.

هەروەها شیکردنەوەی کۆمەلگا وەك رەوشێکی پەرەسەندنە ناکۆتاکانی پەیوەندییە پاوانخوازییە بێبەش لە رێساکان جۆرێك لەو هەلوێستانەیە کە زۆرجار رووبەروومان بۆتەوە. ئەم هەلوێستە رێژەییە زێدەڕۆییانەی دەتوانین وەك هەلوێستی ئەدەبی وێنەیی وەسفی بکەین، لەناو دارستانە کۆمەلایەتیەکاندا تەنیا بەرەو ونبوونت دەبات. هەرچی هەلوێستەکانی زێدەڕۆیی گەردوونییە (رەهایە) کە وەك پێچەوانەکەی دیارە، بەلام لەگەوهەردا هەمان رۆلّ دەبینێت ، لە رێگای چەند یاسایەکی سادە و رووکەشی فیزیاوە هەولّی پێناسەکردنی کۆمەلگا دەدات. وەك دیارە ئەم هەلوێستەیە کە لەبەرامبەر دەولەمەندی هەمەڕەنگی کۆمەلگا زیاترین خزمەت بە کوێربوون دەکات. چەمکی کۆمەلگای پۆزێتیڤیست مۆدێلێکی قەبەی شایانی تێگەیشتنە کە هەم رێژەیی زێدەڕۆ، هەم رەهابوونی(گەردوونی) زێدەڕۆ لەناواخنی خۆیدا هەلّدەگرێت.

لیبرالیزم وەك ئایدیۆلۆژیای فەرمی بۆرژوازی چینی ناوین بەشێوەی بژارێکی پێکەوە لکێنراوی تەولوی ئەم مۆدێلە ئاماژە پێکرلوانە خۆی پێشکەش دەکات. لە رووخساردا خۆی وەها پیشاندەدات کە خاوەندارێتی لەلایەنی راستی هەر مۆدێلێك کردووەو خۆی دەکات بەسیستەم. لە ناوەڕۆکدا لایەنە ناتەولوەکانی تەواوی مۆدێلەکان لەگەڵ هەندێك راستی تێکەڵ دەکات، بەردەوام شێوەیەکی هەرە مەترسیداری بەیەکەوەلکاندن(خستنە سەریەك) وەك مۆدێلێکی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکات. وەك چەمکێکی فەرمی یانگای کۆمەڵکاری(هاوبەشی) کۆمەڵگا داگیردەکات. هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی خۆی مسۆگەر دەکات.

لەیەکەمین گەورە بەرگرینامەکانمدا کە لەژێر ناوی " **لەدەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانێتی دیموکراتی**" دابوو، کارێکی ئەوتۆم لەبارەی مۆدێلەوە نەکرد، تەنانەت بەبێ هەستکردن بەم لایەنە پێشکەشم کرد. بەهۆی نەبوونی دەرفەتی لێکۆڵینەوە بەپەلە ئامادەم کردبوو. بانگەشەی پێشخستنی مۆدێلێکیشم نەبوو. شێوازێکی سروشتیم باسکردبوو کە لەبارەی راستینەی کۆمەڵگاوە خاوەنی بووم. دواتر دەرفەتی خوێندنەوە و شیکردنەوەی مۆدێلی هەڵوێستی هەندێك کۆمەڵناسی گرنگم بۆ رەخسا، لە سەرووی هەمووشیانەوە موورای بۆکین، عەمانۆئیل والرشتاین و فرناند برلودل. هەروەها بەپوختی و لەناوەڕۆکدا لەهەندێك فەیلەسوفی وەك نیچە و میشێل فۆکۆ تێگەیشتم. لەناو ئەمانە هەرە گرنگییان ئەندری گوندەر فرانك[1] بوو کە لەژێر ناوی **سیستەمی جیهانی** دا کۆکراوەی بۆچوونی چەندین بیرمەندی پێشکەشکردووە. کۆکراوەکەی ئەو بیرمەندەی تەنانەت سەرەتا ناوەکەیشم نەدەزانی، لەوە درەنگ نەکەوتم کە وەك بە بانگەشەترین پارێزەری بەرگرینامەکەم هەڵیسەنگێنم. کاتێك چەندین بیرمەند لەم ماوەیەی دواییدا لە شیکردنەوەکانیاندا هەڵوێستی هاوشێوەیان پێشکەشکرد، منی بەرەو قاڵبوونەوە لەبارەی کارکردن لەسەر مۆدێلی خۆم ئاودا.

لەناوەڕۆکی بەرگرینامەکەمدا سەرە داوە گرنگەکانی ئەنالیزی والرشتاین لەبارەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی و شیکردنەوەکانی فرناند برلودل سەبارەت بە"**ماوەی مێژوویی**" دەبینرێت. کۆمەکیان بە هەوڵەکانم کرد کە ماوەیەکی درێژە لەمیانەی هەڵوێستێکی هاوشێوەوە هەوڵی

---

[1] ئەندرێ گوندەر فرانك: مامۆستایەکی خانەنشینکراوی زانکۆیە، بەرامبەر بە چەمکی ناوەندیگەرایی ئەورووپی کە سەرەتای سیستەمی جیهانی هاوچەرخ بۆ پەرەسەندنی سەرمایەداری دەگەڕێنێتەوە، گرنگی بە تاوتوێکردنی مێژوو لە چوارچێوەی چەمکی گەردوونی دەدات. داکۆکی لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە جیهانی هاوچەرخ بەرهەمی ئەم پێنج سەدەیەی دوایی نییە، بەڵکو بەلانی کەم بەرهەمی پێنج هەزار ساڵە. کۆڵەکەی سیستەمی جیهانی ئێستا بۆ میزۆپۆتامیای خواروو دەگەڕێنێتەوە. هەروەها کەڵەکەکردنی سەرمایە وەك هێزێکی بزوێنەری مێژووی پێنج هەزار ساڵە هەڵدەسەنگێنێت. ئەم بۆچوونانەی لە "سیستەمی جیهانی" دا کۆکردۆتەوە.

ڕوونکردنەوەی تێکشکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەدەم. هەروەها جگەلەوەی کە لە تێگەیشتنی شرۆڤەکانی نیچە و میشێل فۆکۆ لەبارەی مۆدێرنیتە و دەسەڵات زەحمەتیم نەبینی، بەڵکو زۆر نزیک بە مەیلە سەرەکییەکانی خۆشمم بینی. هەروەها ناتوانرێت باس لە شاکارەکەی گۆردن شیڵد لەبارەی کارە ئەرکۆلۆژیەکانی میزۆپۆتامیا نەکرێت کە لەژێر ناوی **"چی لەمێژوو ڕوویدا"** پێشکەشیکردووە و ئاسۆی مرۆڤ فراوان دەکات. دوای ئەوەی چەندین کاروخەباتی فەیلەسوفەکانم یەکە بەیەکە وەك ڕاپۆرت شیکردەوە و لێکۆڵینەوەم لەبارەوە کردن، بەرلەوەی بەشوێن بانگەشەی " یەکینەی مۆدێلی خۆم"دا بگەڕێم، ناچاربووم بژاری خۆم دیاربکەم. پێویستە بەهەڵە لەوە تێنەگەن کە: پەیڕەوی پەرەپێدراوی ئەنالیزی ئەم بەرگرینامەیە گەورەیەم وەك مۆدێلێك پێشکەشکردووە. تەواوی کێشەکە لای من ئەوەبوو کە چۆن: یەکینەی ئەنالیزێکی سەرتاسەری و دیاریکەری مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی وەك بژار دەستنیشان بکرێت. هەروەکو بەکورتی ئاماژەم پێیان کرد تەواوی ئەو مۆدیلانەی کە هەن، هەرچەندە لایەنی ڕاستیشیان هەبێت، بەڵام کەموکورتی و هەڵەی ئەوتۆشیان هەیە کە ناکرێت نەبینرێت. کەموکورتی هاوبەش لە هەموویاندا دەست نیشاندەکەم.

تەنانەت مۆدێلی ئەندری گوندەر فرانك **"سیستەمی جیهانی"** کە هەرە زێدە لێی نزیك بوومەتەوە، بە تێڕوانینی من کەموکورتی زۆر جدی لەخۆوە دەگرێت. کۆمەڵگای سۆمەر کە بە سەرچاوەی سیستەمی جیهانی دادەنێین، ئاشکرایە ئەو کۆمەڵگایەیە کە یەکەمین جار کەڵەکەکردنی سەرمایەی تێدا ئەنجامدراوە. تا ئەوپەڕادە ئەو هەڵوێستە ڕاست دەبینم کە کەڵەکەبوونی مۆڵبووی شارستانی لە کۆمەڵگای سۆمەرەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان وەك ڕووباری بنەڕەتی دەبینێت. هەروەها تەقلی ئەو بۆچوونەش دەبم کە دەڵێت: کەڵەکەبوون بەردەوامییەکی مێژوویی بەشێوەی هەژموون ــ پێشبڕکێ، ناوەند ـ کەنار و دابەزین ــ هەڵکشانی هەیە. ئەو سێ کۆڵەکەیەی کەڵەکەبوونی تێدا بەدیدێت (ئابووری، سیاسەت، ئایدیۆلۆژیا) و ڕەهەندە ئەخلاقییەکەیان مەسەلەیەکن مایەی تێگەیشتنە. هەربۆیە لەجیاتی شێوازی بەکارهێنان شێوازەکانی پاشەکەوت وکەڵەکەکردن گرنگییان زیاد دەبێت. بەمجۆرە قۆناخەکانی گواستنەوەی هوژموونگەرایی بەرامبەر بە گواستنەوەی شێوازەکانی بەرهەمهێنان ئەنجامی گرنگی لێدەکەوێتەوە. ڕەخنەی فرانك دەرهەق بە والرشتاین لەو بارەیەوە کە ئەنالیزەکردنی بۆ سیستەمی جیهانی ــ سەرمایەداری ناوەندگەرایی ئەورووپا، سەرمایەداری وەك تاکە سیستەمێکی بونیادنراوی سەرتاسەری جیهان پێشکەش کردووە، لەجێگای خۆیدا بوو. ریزپەڕی شارستانی ئەورووپا هەڵوێستێکی ئەوپەڕگەری بوو. تەنانەت وەك شارستانییەکی کۆتایی (لوتکە) دەکرێ بەمارژینالیش لەقەڵەم بدرێت. هەروەها هەڵسەنگاندنی

زارلوەكانی شێوە ـ كۆمەڵگاكانی لەجۆری سۆسیالیزم، سەرمایەداری، كۆیلەداری و دەرەبەگایەتی وەك راستیيە ئایدیۆلۆژییەكان هەڵوێستێكی نزیك بە راستی بوو. ئەم زارلوانە لەجیاتی روونكردنەوەی راستی كۆمەڵگا، زیاتر خزمەت بە پەردەپۆشكردنی دەكەن، ئەمەش بۆچوونێكە پێویستە پشتگوێ نەخرێت و شایانی هەڵوەستە لەسەركردن بوو. لێكەڕینی " یەكێتی لەناو جیاوازیەكان"دا دەیتوانی كۆمەك بە چارەسەری بكات، بەڵام ناتەولو بوو. هەروەها ئاشكرابوو كە كۆمەكێكی دەوڵەمەندتری پێشكەش بە شیكاركردنی كۆمەڵگای مێژوویی كردووە. لەپێناو ژیانێكی باشتر و جوانتری كۆمەڵگا دەبوایە بەشی بە هەڵەداچوونیش وەك ئەنالیزێكی سیستەم هەڵسەنگێنم. بەڵام سەرەكیترین كەموكورتیەكەی ئەوەیە كە: مەترسی پێشكەشكردنی گێژاوێكی بازنەیی داخراوی لەخۆوە دەگرت. بەجۆرێك هەڵوێستی پیشاندەدا وەك بڵێی سیستەمەكانی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی قەدەرێكن. راستتر بەشێوەیەكی دیالیكتیكیانە رێگاكانی رزگاربوون نیشان نەدەدرا.

لەبەرئەوەی ئەنالیزی والرشتاین لەبارەی سیستەمی ـ سەرمایەداری جیهانی تەنیا ماوەی پێنج سەد ساڵی تاوتوێكردووە، ناتەواو بوو. ئەگەر شیكردنەوەكانی پێنج هەزار ساڵی بگرتبایەوە بێگومان زۆر بەرهەمدار و بەپیتتر دەبوو. لە هەڵسەنگاندنی زۆرێك لەبیرمەندان لەبارەی سیستەمی جیهان سەرەداوی ئەمەمان بینی. هەرچی خاڵی بەهێزیەتی: والرشتاین توانیویەتی ئەنالیزێكی بەهێزتر سەبارەت بە رزگاربوون لە سیستەمی جیهانی بكات. هەڵوێستەكانی كۆمەك بەخش بوون.

پێشكەشكردنی شیكاری سەرمایەداری و چەمكێكی گشتگیری كۆمەڵگا لەلایەن فرناند برلودلەوە بەشێوەی " ماوە مێژوویيەكان" بەڕاستیش ئاسۆی مرۆڤ فرلوان دەكات. بەتایبەتیش چەسپاندن و جەختكردنەوەی لەبارەی: سەرمایەداری دژی بازارە، پاوانەكانی دەسەڵات و پاوانەكانی ئابووری خاوەن تایبەتمەندێتی هاوشێوەن، تا دوارادە گرنگن. ئەو رستەیەی هەرە زێدە پێم خۆش بوو " دەسەڵاتە هەڵاوساوە زێدەڕۆكان(تۆكمەكان) بەردەوام سەرمایە دەردەدەن و بڵاودەكەنەوە" بوو. گوتەی " دەسەڵاتیش وەك پارە كەڵەكە دەكرێت" دەست نیشانكردنێكی بەهادارە بۆ ئەوانەی تێی دەگەن. بەستنەوەی سەرنەكەوتنی شۆڕشە سۆسیالیستییەكان لەلایەن والرشتاین و فرناند برلودلەوە لەلایەنێكەوە بەتێپەڕنەكردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دیاریكەر و ئەزموونبەخشە. هەروەها تەڤلی پێویستی لێپرسینەوەی هەرلوو بیرمەندی بەناوبانگ دەبم سەبارەت بە "میتۆدی بچووككردنەوە بۆ ئیكۆنۆمیزم" كە بەتایبەت باسیان كردووە.

پێویستەجارێكی دیكەش ئامارەی پێ بكەم، هەڵوێستم سەبارەت بە زانستی كۆمەڵایەتی، ئەگەر بەشێوەیەكی سنووردار بە بۆچوونی ئەم بیرمەندانە كاریگەر بێت كە باسم كردن و، كاریگەری هاوشێوەی چەندین بیرمەندی دیكەی لەسەرییێت، بەڵام رەهەندی تایبەت بەخۆیشی هەیە.

لەوبڕوایەدام ئەو مەسەلانەی لە دووەمین بەرگرینامە گەورەکەم "بەرگریکردن لە گەلێك"دا ئاماژەم پێکردبوون قووڵترم کردوونەتەوە و بە سیستەمێکم گەیاندوون. ئەم خاڵە لەژێر ئەوبڕوایەمدا شاراوەیە: بەگوێرەی من ئەو ئەپستمۆلۆژی ( بونیادەکانی زانیاری)یانەی کەوا لە ئارادان، لەبوون بە بەشێکی ئامێرەکانی دەسەڵات رزگاریان نەبووە. بەپێچەوانەی ئیرادەکەیان بەمجۆرە بووە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە کەسێکی وەك کارل مارکس کە خاوەن هەڵوێستێکی زانستییە و یەکێکە لەوانەی کە بەشێوەیەکی لێهاتووانە ناواخنی سەرمایەی بینیوە. بەڵام ئەم تایبەتمەندێتییە گرنگەی بەشی ئەوەی نەکردووە لەمۆدێرنیتەی سەرمایەداری دابڕێت. ژیان و پێکهاتەی ئەو زانیاریانەی مارکس پشتی پێدەبەست بەهەزاران داوەوە گرێدراوی ئەو مۆدێرنیتەیە بوو. نەك بۆ تاوانبارکردنیان بەڵکو بۆ تێگەیشتن و روونکردنەوەی راستییەکەیان ئاماژەی پێدەکەم. هەمان کێشە بۆ لینین و ماویش لەجێگای خۆیدایە. ئەو سیستەمەی بیریان لێکردبۆوە لەمیانەی چەندین پێشینەی داڕێژراودوە ( بونیادی زانیارییەکان، چەمکی ژیانی مۆدێرن) ئاڵوودەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوون. بۆ نموونە لەو بڕوایەدابوون کە بابەتێکی زەبەلاحی وەك ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـــ نەتەوە بە چۆنایەتییەکی سۆسیالیستانە فەتح دەکەن. کەچی ئەم قاڵبە سەرەکیانەی مۆدێرنیتە لەبواری شێوە و ناوەڕۆکدا گرێدراوی کەڵەکەبوونی سەرمایە بوون، ئەوەی بەبنەمایان بگرێت، هەرچەندە دژیشی بێت، لە ئاواکردنی سەرمایەداری رزگاری نابێت. سەبارەت بەم خاڵانە رەخنەکانم دەرهەق بە سۆسیالیزمی(ریال) بونیادنراو روون و ئاشکرا بوون. بەڵام رەخنەکردن بەش ناکات. پێویستە چی لەجێگای دابنێم؟ ئەمەیان پرسیارە گرنگەکە بوو. ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە بەردەوام لەبارەیەوە قاڵدەبوومەوە.

سەرباری ئەوەی بژاری شارستانێتی(ژیار) دیموکراتی لە رووخساردا زۆر ساکارە، بەڵام تا ئاولێنانێکی نوێ گونجاو دەبینرێت و بە ئاسایی پێشوازی لێدەکرێت، پێشخستنی مۆدێلی هەڵوێستێکی سیستەماتیك لەژێر هەمان ناودا لای من زۆر پێویست و رۆشنکەرەوە دەبێت. بەرلەهەموو شتێك ئەم بژارە سیستەمێکی ئەلتەرناتیف لەجێگای سیستەمی شارستانی ناوەندی جیهان پێشنیار دەکات. شارستانێتی دیموکراتی تەنیا ئۆتۆپیایەك نییە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان و داهاتوو: بۆ شرۆڤەیەکی بەرجەستەتری کۆمەڵگای مێژوویی تا ئوارادە بە پێویست و رۆشنکەرەوە دەبینرێت. لەهەر هەلومەرجێکی شوێن و زەمەندا کە کەڵەکەبوونی سەرمایە و ئامێرەکانی دەسەڵات هەبن، بوونی بەرخودان و ئەلتەرناتیفێك پێویستییەکی سروشتی کۆمەڵایەتییە. لەهیچ شوێن و زەمەنێکدا کۆمەڵگاکان بەرامبەر بە کۆبوونەوەی سەرمایە و ئامێرەکانی دەسەڵات بێبەرخودان و

ئەڵتەرناتیف نەجولاونەتەوە. تێکشکانیان زیاتر بۆ نەبوونی بەرخودان و ئەڵتەرناتیف ناگەڕێتەوە، بەڵکو پێویستە لەهۆکاری تر بگەڕێین.

تا چیرۆکە سەیر و سەمەرەکانی کۆبوونەوەی دەسەڵات و سەرمایە زۆر بە باشی هەرس نەکەین، لە واتادارکردنی زاراوەی شارستانێتی دیموکراتیدا زەحمەتی دەبینین. لەم بارەیەوە پێکهاتە و بونیادی زانیارییەکانیان بەردەوام لەنێوان دوو هەڵەدا هاتوچۆیان بووە: یان بەتەولوی لەناو بونیادەکانی زانیاری ـ دەسەڵاتدا تولونەتەوە، یان بەشێوەی مەزهەبە ئیفلیجەکان ( بەبێ ئەوەی بژارە زانستی، سیاسی و هەڵوێستە ئەخلاقییەکانیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ هەڵبژێرن) لە پاشکۆیی، یان بە پاشکۆ هێشتنەوە رزگاریان نەبووە. بێگومان پێوستە بەردەوام رۆڵی فریودەرانە و توندوتیژی سەرمایە رەچاو بکرێت. تا ئەم دوو چەمکە بەکاریگەرەی بونیادی زانیاری مەحکوم نەکرێن، بژاری شارستانێتی دیموکراتی نابینرێت. ئەوەی پێویستەلێپرسینەوەی لەبارەوە بکرێت راستینەی شارستانێتی دیموکراتی نییە، بەڵکو بونیادەکانی زانیاری ــ دەسەڵات و مەزهەبگەرایی گومرایە کە ناهێڵێت ببیسترێت و بەربەستی دەکات. ئەو راستیانەی ناتوانرێت تەنیا لەمیانەی کەموکورتی و هەڵەکانی نێو باسەکانی کۆمەڵگای مێژوویی روون بکرێنەوە، تەنیا لەمیانەی " قەڵەمبازێکی زانستی" ریشەیی، واتە لە رێگای شۆڕشێکی بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانرێت وەرچەرخێنرێت.

بونیادەکانی دەوڵەت و سەرمایە کە لەسەر بنەمای کەڵەکەبوونی سەرمایەی پێنج هەزار ساڵی ئاواکراوە، لەمیانەی ئەزموونی رۆژانەیان زۆر بەباشی دەیانزانی تا بەپێوانەیەکی بڵند بونیادی زانیاری و ئایدیۆلۆژی خۆیان رێك نەخەن ناتوانن بەردەوامی بە رژێمەکەیان بدەن. هەروەها پێویستە باش بزانرێت تا کەڵەکەبوونی بەردەوامی ئامێرەکانی مەشروعیەت و زێدە ــ بەها و زێدە ــ بەرهەمی ئامێرەکانی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی وەك فاکتەری سەرەکی تێڕوانینەکان نەبینرێت، زانستە کۆمەڵایەتییەکان نابن بە رژێمی حەقیقەتی واتادار. تا دەرك بەوە نەکرێت کە بونیادەکانی زانستی پۆزێتیف، فەلسەفە، ئاین و میتۆلۆژیا بەشێوەیەکی خەست لەگەڵ مێژووی کەڵەکەبوونی دەسەڵات و سەرمایە لەناویەکدان، کە بەردەوام چاودێری یەکینەکانی قازانج و بەرژەوەندی دەکەن، ناشێت شۆڕش لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەنجام بدرێت.

دووەمین خاڵی گرنگ کە لە دەستەواژەی شارستانێتی دیموکراتی دەستەبەر بکرێت ئەوەیە کە بەرفراوانترین زەمینە پێشکەش بە شۆڕشی زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەکات. ئەمە وەك بانگەشەیەکی ( دەتوانین بەتێزیشی ناوببەین) سەرەکی چاودێری دەکەین: بانگەشەیەکی لەو جۆرەی کە تەولوی "بەربەرکان"، کۆچی قەومەکان، لۆمپەنەکان، قەبیلەکان، کۆمۆنەکان، مەزهەبە

لادەرەکان، جادووگەران، بێکاران و هەژارانی مێژوو بەخۆیەوە دیون بەردەوام لە بزاڤ و سیستەمی واتادار بێبەشبوون، کاتێك دەڵێن ئەمەش چارەنووسەکەیانە، ئاشکرایە کە ئافراندنی بونیادی زانست، فەلسەفە، ئاین و میتۆلۆژییە بەناوی بەرژەوەندی کەڵەکەکارانی سەرمایەو دەسەڵاتەوە: ئاواکردنی دامەزراو و ئامێرەکانی کەڵەکەبوونی زانیارییە. هەر تەنیا باڵادەستی سەرمایە و دەسەڵات لەمێژوودا لەئارادا نییە. بەڵکو لەهەمانکاتدا لەگەڵ ئەم باڵادەستیانەدا سیستەمی زانیاری (میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستی) و باڵادەستییەکەیان بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵیاندا هەبووە و بەردەوام یەکێتی بەرژەوەندی نێوانیان جێگای باس بووە. هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی بونیادی چەندین زانستی کۆمەڵایەتی رکابەر لەسەرووی هەمووشیانەوە زانستی کۆمەڵایەتی مارکسی، بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە کە شۆڕشی زانستە کۆمەڵایەتیەکانیان پاڵپشت بە مێژووی تەواوی کەڵەکەبوونی سەرمایە و دەسەڵات تاوتوێ نەکردووە و تێکەڵ بەسیستەمی شارستانێتییەکی ئەڵتەرناتیف پێشیان نەخستووە. بێگومان زۆرێك لەو خاڵانەی باسدەکرێن، رەخنەی بەرفراوانی لەبارەوە کراوە، بەڵام بەرەو پێشتر نەبراوە، بەچوارچێوەی باسکردنێك نەگەیەنراوە کە تەواوی مێژوو بگرێتەوە. چەمکی سیستەمی جیهانیان پێشنەخستووە، لە تاقیکردنەوە و ئەزموونی نیوەچڵ و پارچە پارچە رزگاریان نەبووە.

سێیەمین فاکتەری سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی ئەوەیە: بەبێ ئەوەی دەرفەت بە کەڵەکەبوونەکانی دەوڵەت و دەسەڵات و سەرمایە بدات کە پشت بە چینی ناوین دەبەستن و هەموو کاتێك رۆڵی خانەکانی شێرپەنجە دەبینن، خاوەنی هێزی پەرەپێدانی فاکتەرەکانی شار و پیشەسازین کە لەسەردەمی شۆڕشی کشتوکاڵەوە سەریهەڵداوە.

واتە دەڵێت " بەڵێ" بۆ شار و پیشەسازی، بەڵام " نەخێر" بۆ ئەوخانە شێرپەنجەییانەی لە بونیادەکەیاندا هەیە. کاتێك لەبارەی تۆڕە زەبەلاحەکانی گەیاندن، شار ـ پیشەسازی ـ دەسەڵاتی رۆژگاری ئەمڕۆمان وردبینەوە، هەروەها کاتێك ئەم راستیەشمان لەگەڵیدا جێگیرکرد کە لەبوارەکانی ژینگە، ژن، هەژاری و بێکاری لە ئاستی کارەساتدا کێشەیان ناوەتەوە، ئەوکاتە دەبینین کە بەکارهێنانی گوزارشتی شێرپەنجە بۆ بونیادە کۆمەڵایەتییەکان لەجێگای خۆیدایە. بەتایبەتی هاواری زانا کۆمەڵایەتییە لەپێشەکانی رۆژی ئەمڕۆمان لەسەرووی هەموویانەوە ئەمانوێل والرشتاین، لەگەڵ هاواری بڵندبووی ئەنارشیستەکان، ئوتۆپیاگەراکان، یاخیبوونی لادێییەکان، گومراکانی مەزهەب، لێشاوی بەربەرەکان (زارلوەی بەربەر سەرلەنوێ گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت) کە بەردەوام لە مێژوودا جێگایان هەبووە، هەروە دوایش فێمینستەکان و بزاڤەکانی ژینگە، بەرامبەر بە هەڕەشەی شێرپەنجەبوون کەسەبارەت بە بونیادی کۆمەڵگا گوزارشت لەکارەسات دەکەن، ئەمانە

هەموویان دەتوانن واتایەکی تەواو و گشتگیر بەدەست بێنن. هیچ کۆمەڵگایەك بۆماوەیەکی درێژخایەن ناتوانێت کەڵەکەبوونی ئامێرەکانی گەیاندن، دەوڵەت، دەسەلات، سەرمایە، چینی ناوین و شار هەڵبگرێت کە لە ئارادان. ئەو کۆمەڵگایەی کە بە شێوەیەکی توند لەناو قەفەسی ئاسنیندا بەندکراوە، ئەگەر ناڵە و هاوارەکانی بە ئاستی ئەنجامگرتن نەگەیەنێت، هەروەك چۆن بەشێوەیەکی بەرچاو روونی دەکاتەوە کە سیستەمی شارستانی ناوەندی لەژێر رەوشی قەیران و کائۆسی کێشەکاندا شاراوەیە کە رۆژانە زەنگە هێماکانی (SOS) پیشاندەدات: بانگەشە دەکەین، بۆ دەرکەوتن لە قەیران و کائۆس پێویستی بە رۆشنکرنەوەیەك هەیە کە گرێدراوی سەرچاوە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگای مێژوویيە و، رەوشی هەنووکەیی وەك نۆخی ئەم سەرچاوانە شیکاردەکات. لەسەر ئەم بنەمایە ئایندەش لە رێگای سیستەمێکی ناوەندی جیهانی شارستانێتی دیموکراتی فەراهەم دەبێت.

بەرگرینامەکەم لەچواردەورەی رۆشنکردنەوەی رەهەندە هەمەجۆرەکانی ئەم تێزە سەرەکیەدا قاڵدەبێتەوە. هەوڵدانم بۆ تێگەیشتنی مێژوو لە رەهەندە گەردوونیەکاندا، بێگومان گرێدراوی ئەم بۆچوونەیە: مێژووی گەردوونی نەبێت مێژووە خۆجێییەکان واتایەکیان نابێت: دەکرێت مێژووی کۆمەڵگا هەرە بێکاریگەرەکانیش لەژێر روناکی مێژووی گەردوونیدا رۆشنبکرێتەوە، بەبڕوای من ئەمە بەهای پرەنسیپێکی هەیە. هەروەها لە ئاستی پرەنسیپ بەها بەو راستییە دەدەم کە: هەنووکە (رەوشی ئێستا) مێژووە، مێژووش ئێستایە. بەڵام ئەم خاڵە گرنگەشی لێ زیاد دەکەم، دەبێت دووبارەی بکەمەوە کە هاوبەشێتی لەم دوو پرەنسیپە گرنگەی مێژوو دەکەم: نۆخی ئێستای خۆجێیی، تەنیا وەك دووبارە بوونەوەیەك، وەك نەریتێك مێژوو دووبارە ناکاتەوە. مسۆگەر **کۆمەکی جیاوازی و تایبەتبوونی خۆی** تەڤلی دەکات، کە لە کەڵەکەبوونی مێژوویيدا رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. واتە مێژوو تەنیا دووبارە بوونەوە نییە: کۆمەکی هەموو زەمەن و شوێنێك کۆ دەکاتەوە و ئینجا دووبارە دەبێتەوە.

نەك تەنیا بەرگرینامەکانی پێشترم، بەڵکو کاتێك لەچوارچێوەی ئەم پرەنسیپانەدا سەیری جیاوازیی تەواوی ئاخافتنە زارەکی و نووسراوەکانم بکرێت، هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە بەتێگەیشتنەوە پێشوازی لەم هەڵوێستەم دەکەن. ئاشکرایە کە پێویستە بۆچوونەکانم وەك دووبارەیەکی وشك یان هەڵگەڕانەوەیەکی ریشەیی شرۆڤە نەکرێت. ئەوانەی ئاگاداری توێژینەوە و لێوردبوونەوەن دەزانن پێشکەوتن جیاوازییە. تاکە پرەنسیپی گەردوونیش ئەوەیە لەمیانەی جیاوازییەوە گۆڕانکاری ئەنجامدەدات. کاتێك یەك دەبێت بە دوان، تەنیا کۆبوونەوەی

چەندایەتییەکی ساکار بەدینایەت: لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام جیاوازی دوو لە یەك جێگای باس دەبێت.

سەبارەت بەم بەشەی بەرگرینامەکەم، لەبەشی دوای پێشەکی و دەروازەدا هەندێك كێشەی پەیڕەو گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە پارچەبوونی زێدەی زانستەکان بەواتای قەیرانی زانستی دێت و ئەمەش گرێدراوی قەیرانی سیستەمە. ڕاوەستە لەسەر واتای هەڵوێستی گشتگیرانەی دەرهەق بە زانست دەکرێت.

وەك بابەتێکی دیکەی پەیڕەو، جەخت لەسەر سروشتە جیاوازەکان، بە تایبەتیش جەخت لەسەر جیاوازی سروشتی کۆمەڵگا دەکرێتەوە. گەڕانەوە بۆ سروشت (یەکەمین سروشت) هەڵوێستی ریشەیی کردووە بە پێویستییەك: لەهەمانکاتدا لەمیانەی پەیوەندییەکەی بە کێشەی ژنەوە تاوتوێ دەکرێت.

بە تەگبیرەوە نزیکی جیاوازی سۆبژە ـــ ئۆبژە دەبینەوە و ئەو کێشانەی لەگەڵ خۆی هێناویەتی و ڕێگاکانی بەلاوەنانیشی تاوتوێ دەکرێت. گرێدانی بە سیستەمی کەڵەکەکردنی سەرمایەوە پیشاندەدرێت، جەخت لەسەر پێویستی بەلاوەنانی دەکرێتەوە.

هەروەها شەفافیەت و کراوەبوون سەبارەت بە دوالیزمی پەیڕەوی گرنگی لەجۆری موتڵەقیەت ـ ڕێژەیی، بازنەیی ـــ ڕاستەهێڵی و جیهانگیری ـــ خۆجێیی بایەخدارە. هەروەها پێویستی بە سەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی پەیڕەوی دیالیکتیکیش هەیە.

زەلالبوون سەبارەت بە زاراوە و دەستەواژەکانی پەیڕەو دەشێت باسکردنی بابەتەکانی دیکە ئاسان بکات. لەبەرئەم هۆکارەش پێویست بینرلوە وەك بابەتێك ڕێکبخرێت.

بەشی چوارەم سەرەدێڕی هەڵوێستێکی فەلسەفی سەبارەت بە ئازادی لەخۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی لەنزیکەوە گرێدراوی ئازادییە، ڕۆشنکردنەوەی بابەتەکە واتادار دەکات. ماهیەتی هەژموونگەرایی و باڵادەستی سیستەمی شارستانی ناوەندی کارەکتەری ئازادی شارستانێتی دیموکراتی دەکات بە پێشەنگ. لەم بەشەدا پەیوەندی توندی یەکسانی بە ئازادییەوە شیدەکرێتەوە. گرنگتریش ئەوەیە ڕاوەستە لەسەر زاراوەی یەکسانی دەکرێت کە دەستەواژەیەکی ڕاستەقینەیە و لەسەر بنەمای ڕەچاوکردنی جیاوازییەکان شرۆڤە دەکرێت. لەمیانەی ڕەچاوکردنی ئەو خاڵەی کە: زاراوەکانی ئازادی و یەکسانی لە ڕێگای پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سیستەمەکانەوە شێنەکرلونەتەوە و لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕێگایان لەپێش کێشەی جددی کردۆتەوە، سەرلەنوێ شرۆڤەکردنەوەیان سەبارەت بەتێزە سەرەکییەکەمان ڕۆشنکەرەوە دەبێت.

بەشی پێنجەم رەخنەکردنی ئەقڵی جۆری مرۆڤ تاوتوێدەکات. کاتێك هەوڵی پێناسەکرنی ئەقڵی کۆمەڵایەتی دەدرێت، هەوڵی رۆشنکردنەوەی چالاکبوونەکەی دەدرێت لەبواری رەهەندەکانی تیۆری - پراکتیك و ئەنالیتیك - سۆزدارییەوە. بەکارهێنانی ئەقڵ لەلایەن سیستەمەکانی جیهانەوە دەشێ رێگا لەپێش چی بکاتەوە؟ وەك ئامرازی چارەسەری و کێشە ئایا ئەقڵ سنووری هەیە؟ چۆن دەتوانین ئەمانوێل کانت هەنووکەیی بکەینەوە؟ تەنانەت ئەمجۆرە پرسیارانەش ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەو ئەقڵەی وەك ئامرازی چارەسەرکردن بەکاری دێنین لەوانەیە بۆخۆی رێگا لەپێش کێشە وگرفتی ئالۆزتر بکاتەوە.

لەبەشی شەشەمدا لێکۆڵینەوە سەبارەت بە سەرهەڵدان و پەرەسەندنی کێشەی کۆمەڵایەتی دەکرێت. هەوڵی شیکردنەوەی دەدەین کەچۆن بە درێژایی قۆناخەکانی مێژوو سیستەمی شارستانی ناوەندی سەرچاوەی سەرەکی کێشەکانە. ئیتر هەژان و زۆربوونی لق و پۆپی کێشە کۆمەڵایەتییەکان گرێدراوی ناوەرۆکی سیستەمە. هەربۆیە دامەزراو و ئامێرەکانی کەڵەکەبوونی سەرمایە و دەسەڵات خۆیان خودی کێشەکەن. جۆرێك لەمێژووی کێشە گەڵاڵە دەکرێت.

لەبەشی حەوتەم سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی وەك ئامرازی چارسەرەکردنی کێشەکان پێشنیار دەکرێت. سەرلەنوێ گەڵاڵەکردنی مێژوو وەك مێژووی کۆمەڵگا کامە واتا لەناواخنی خۆیدا هەڵدەگرێت؟ ئاماژە بە پەیوەندی نەپچڕاوی نێوان کۆمەڵگای دیموکراتی و مێژوو دەکرێت.

بەشی هەشتەم وەك بەردەوامی بەشی حەوتەم هەوڵدەدات مۆدێرنیتە(تازەگەری)ی دیموکراتی وەك ئەلتەرناتیفی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێناسە بکات. بەو رادەیەی بۆمان دەکرێت لەژێر رۆشنایی وانەی چارەنووسساز هۆکارەکانی پێویستی هەبوونی دوو چەمکی مۆدێرنیتە تاوتوێ دەکەین. بە تایبەتی نۆڕاندنی شۆڕشە هاوچەرخەکان لەم چوارچێوەیەدا دووبارە چاوێکی پێدا دەخشێنرێتەوە.

بەشی نۆیەم هەوڵی شیکارکردنی قەیرانی سیستەماتیکی سەرمایەداری و دەرفەتەکانی دەرکەوتن دەدات. لەکاتێدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەك نۆخی هەنووکەیی سیستەمی شارستانی جیهان شیدەکرێتەوە، دەشێت ئەلتەرناتیفەکانی چی بن؟ چۆن دەتوانین مۆدێرنیتەی دیموکراتی ئاوا بکەین. کۆسپ و دەرفەتەکان چی پێشکەش دەکەن؟ بێگومان ئەم پرسیارانەی تا نواڕادە بەکاریگەرن وەڵامەکانیش لەهەناوی خۆیاندا هەڵدەگرن.

بەشی دەیەم وەك ئەنجام بیری لێدەکرێتەوە. لەزۆر لایەنەوە ئاماری ئاقیکردنەوەکە هەڵدەرێژێت. مێژوو نە لەسەر راستەهێڵێکی قەدەرگەرایی ئاراستە دەگرێت، نە تەنیا سەربەخۆ بەرەو ئامانجی چاوەڕوانکراو بەرەوپێشەوە دەڕوات. سەربەخۆ بەتەنیا نە سەرچاوەی خراپییە، نە

زوو و نە درەنگ پێشکەشکەری چاکەیە. دەشێ کۆمەڵگابوونی مرۆڤ ژیانێکی جوان بڕەخسێنێت. خودی کۆمەڵگا سەرچاوەیەکی گرنگی چارەسەرییە. هەر ئەوەندەیە بزانین دونیاکەمان لە جۆرەکانی نەخۆشییە کوشندەکان ـ جۆرەکانی شێرپەنجەشی لەناودا ــ بپارێزین، لە دونیاکەمان تێبگەین کە بەهەشتێکی دڵڕفێن و نایابی بۆ رەخساندووین و ژیانێکی جوان هەڵبژێرین!

## هەندێک کێشەی پەیڕەو

پەیڕەو بە واتای ئەو ڕێگایە دێت کە بەشێوەیەکی قەدبڕ بە ئامانجت دەگەیەنێت، زاراوەیەک نییە ناوەندەکەی ئەورووپا بێت. لەچاخە دێرینەکانەوە لەلایەن قوتابخانەکانی دانایی رۆژهەڵاتی ناوینەوە تاقیکراوەتەوە. بەردەوام ئەو ڕێگایانە تاقیکراونەتەوە کە بۆ گەیشتن بە زانیاری گونجاون، ئەنجامگیرەکانیشیان وەک سەرەکیترین پەیڕەو هەڵبژاردووە. لەبەر ئەوەی لۆژیک زاراوەیەکە لەناو قوتابخانە هزریەکاندا زیاترین قاڵبوونەوەی لەبارەوە دەکرێت. لەم سۆنگەوە پێشخستنی پەیڕەو ڕێسایەکە لێی ڕاهاتووین. کاتێک ناوەندی هەژموونگەرایی سیستەمی شارستانی جیهان بەرەو ئەورووپا هەڵخلیسکا، ئەو گۆڕانکاریانەی لەزۆر گۆڕەپان و بواردا باڵادەستییان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، لەلایەنی زانستیشدا لەبواری بابەتی پەیڕەوەوە سەریهەڵدا. دەرکەوتنی باکۆن، دیکارت و گالیلۆ لە سەدەکانی شازدەهەم و حەڤدەهەمەوە لەمیانەی هەڵوێستە گرنگەکانیان لەبارەی میتۆدەوە، لە نزیکەوە گرێدراوی خزین و گواستنەوەی سیستەمی هەژموونگەراییە بۆ ئەورووپا.

سەرهەڵدانی جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژە کە لە گرنگترین دەستەواژە و زاراوەکانی پەیڕەوە، پەیوەندی بە حوکمڕانیکردنی سروشتەوە هەیە. ئامێرە نوێکانی کەڵەکەکردنی سەرمایە و دەسەڵات، چەندەی قورساییان خستەسەر سەرچاوەکانی سروشتی کۆمەڵایەتی و فیزیۆلۆژی ـ بایۆلۆژی، ئەوا لە تێگەیشتنی ڕادە و ئاستی شیاوی ئەم سەرچاوانەشدا درەنگ نەکەوتن. چەندە سەرچاوەی هەردوو سروشت دەکران بە ئۆبژە، ئەوا یەک بەدوای یەک کۆمەکی زیادبووی خۆشیان پێشکەش بە کەڵەکەکردنی سەرمایە و دەسەڵات دەکرد. وەڵامی ئەم گۆڕانکارییە مادییە لەبواری فیکریدا جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە بوو. لەکاتێکدا ئەم ئۆخە بەشێوەی جیاوازی ئۆبژەکتیف ــ سۆبژەکتیف لەلایەن باکۆن پیشاندەدرێت، لای دیکارت بەشێوەی دوالیزمە تیژەکەی جیاوازی ڕوح ــ جەستە ڕەنگدەداتەوە. لای گالیلۆش ماتماتیک وەک پێشکەوتووترین پێوانەی ئۆبژە و زمانی سروشت دەخرێتەڕوو. کاروانە درێژخایەنەکەی مێژوو لەمیزۆبۆتامیا هاوشێوەی ئەو پێشکەوتنەی لەیۆنانی چاخی کلاسیک ڕێگای لەپێش کردۆتەوە، بەجیاوازییە تایبەتەکانییەوە لە ڕۆژئاوای ئەورووپا دووبارە دەبێتەوە. کۆمەڵگای سۆمەریش لە ڕاستیدا کردەوەی ژیانی هەزاران ساڵی پاڵاوتەی میزۆبۆتامیای

سەرووی بۆ میزۆپۆتامیای خواروو گواستەوە، جیاوازییە تایبەتیەکانیشی خستەڕوو و شێوەیەکی ئۆرژینالی ئافراند.

لە سیستەمە شارستانییە ناوەندییەکاندا بەردەوام سۆبژە سەرچاوەکەی بۆ سەرمایە و دەسەڵات دەگەڕێتەوە. نوێنەرایەتی مەعریفە، گوتە و ئیرادەی ئازاد دەکات. هەندێکجار تاکە، هەندێکجاریش دەزگا و دامەزراوەیە، بەڵام بەردەوام هەیە. هەرچی بەشی ئۆبژەیە: بەردەوام ژنان، گەلان و بەرەبەرەکانی دەرەوەی دەسەڵاتن. تەنیا کاتێك ڕۆڵی خزمەتکردنی سۆبژەیەکی وەك سروشت ببینن دێنەوە یادیان. وەك پێویستی سروشتەکە بیر لە واتایەکی دیکەیان ناکرێتەوە. چیرۆکەکانی خوڵقاندنی مرۆڤی بەندە لە پیسایی خوداوەندەکان، خوڵقاندنی ژن لە پەراسووی پیاوەوە کە لەمیتۆلۆژیاکانی سۆمەر باس دەکرێت، ڕەهەندەکانی بە ئۆبژەکردن لە قووڵاییەکانی مێژوودا پیشاندەدات. بێگومان گواستنەوەی ئەم هەڵوێستەی سۆبژە ــ ئۆبژە بۆ هزری ئەورووپا دوای گۆڕان و وەرچەرخانی مەزن بەدیهاتووە. بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لەم ڕاستییە بکرێت کە زنجیرەی پەرەسەندن بەم ئاراستەیەدا بووە.

بێکاریگەربوونی جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گرێدراوی سەرکێشی سەرمایەداری فینانسە. هەژموونگەرایی ڕەمزی سەرمایەداری فینانس لە سیستەمی شارستانی ناوەندیدا، تەواوی نۆخە کۆنەکانی سۆبژە ــ ئۆبژەی هەڵوەشاندۆتەوە. ئەو ڕەوشەی: بەپێی پێویستی هەرکەسێك لەهەندێك جێگا خۆی بە سۆبژە دادەنێت، لەهەندێك جێگای دیکەش ئۆبژە، بەشێوەیەکی بەهێز گرێدراوی شێوە نوێکانی کەڵەکەبوونی سەرمایە و دەسەڵاتە. ئەو ئامێرانەی دەسەڵات و سەرمایە ( کە سەرچاوەی خۆی لەمیللیگەرایی، ئاینگەرایی، ڕەگەزگەرایی و زانستگەرایی) دەگرێت و لە ڕەهەندە واقیعی و ناواقیعییەکاندا وەك هەرەسی بەفر لە زیادبووندان وەك هەشت پێ کۆمەڵگای پێچاوە. لەهەلومەرجێکی بەمجۆرەدا هەرکەس دەتوانێت خۆی لە نۆخی سۆبژە و ئۆبژەدا ببینێت. لەکاتێکدا ئامێرە(دامودەزگا) ئایدیۆلۆژییەکان ڕۆڵی خوداوەندەکانی کۆمەڵگای سۆمەر دەگرنە ئەستۆ، ئەوا هەروەکو چۆن گۆڕین و وەرچەرخانی سۆبژە ـ ئۆبژە دەبێتە ناچاری، هەڵبەتە خوداوەندەکانیش لەمیانەی تایبەتمەندییە ڕەمزییەکانیان و حوکمڕانییان ئەم جیاوازییە بێواتا دەکەن.

بەدرێژایی مێژووی شارستانی ناوەندی بەرەبەرە پارچەبوونی مەعریفە و لەدەستدانی پیرۆزییەکەی چیرۆکێکی هاوشێوەی هەیە. ئەم خاڵە لە مێژوودا تێبینی کراوە: چەندە ئامرازو ئامێرەکانی دەسەڵات و سەرمایە زیاد بووە، بەو ئەندازەیە زانستەکانیش پارچە پارچەبوون. لە تەواوی کۆمەڵگاکانی کلان و هۆزدا زانست یەکپارچەیە. نوێنەرەکانی پیرۆز دەبینرێن. زانست وەك

نیعمەتێکی خودا پەسەند دەکرێت. بەپێی ئارەزوو و هەوڵەکانیان بەسەر هەرکەسێکدا دابەش ددکرێت. لەکاتێکدا لە میتۆلۆژیاکان بە تەواوی بەمجۆرەیە، لە ئایین و فەلسەفەشدا لە ئاستی پێشڕەوێتیدا هەڵوێستەکان بەم ئاراستەیە، یەکەمین پارچەبوون زیاتر لە زانستەکانی سروشت و بونیادی زانستی ئەوروپای رۆژئاوادا دەبینرێت. رێکخستنە نوێیەکانی مەعریفە (ئەکادیمیا و زانکۆکان) کە پلە بە پلە لە کۆمەڵگا دابڕاون و بە تەواوەتی لە خزمەتی ئامێرەکانی دەسەڵات ـــ سەرمایە بەکاردەهێنرێن، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا خۆیان لە بەرچاوترین ئاست و پایەی دامەزراوەکانی دەوڵەتی نوێ (لیڤی ئەتهان)دا دەبینن. بەسەرمایەکردنی زانست و قۆناخی بە دەسەڵاتبوونی، بۆتە قۆناخی نامۆبوون بە کۆمەڵگاشەوە. چیتر پەرستگا و بڕیارگەکانی زانست جێگای چارەسەرکردنی کێشەکان نین، ئیتر بوونەتە ناوەندی ئافراندنی کێشە و نامۆبوون و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی. چەند سەرچاوەی سروشت و کۆمەڵگا هەیە، ئەوەندە لقەی زانستیش ئاواکراوە. تەنیا ئەم واقیع و راستییە بەسە بۆ ئەوەی تێکەڵبوونی زانست ـــ سەرمایە ـــ دەسەڵات بسەلمێنرێت و روون ببێتەوە. بواری زانست لەو راستییە دوورکەوتۆتەوە کە وەك پیرۆزییەکی تەواوی کۆمەڵگا خزمەت بکات. بەڵکو ناوەندەکانی زانست بوونەتە پیشەیەکی بەپارە، تەنانەت بووە بەسەرمایە: بوونەتە مەترسیدارترین شەریکی دەسەڵات. هەموومان باش دەزانین لەسەرووی هەموویانەوە چەکە ناوکییەکان و هەموو جۆرە چەکەکانی وێرانکاری و ئەو گۆڕانکاریانەی هەڕەشە لە ئیکۆلۆژی دەکەن، سەرچاوەی خۆیان لە ناوەندەکانی زانستەوە وەردەگرن. لەجیاتی نیگەرانییان سەبارەت بە حەقیقەت (ویژدانی کۆمەڵکاری کۆمەڵگا) بۆ پلەی ئاقڵمەندێتی بەپیتترین بەرهەمی دەسەڵات و سەرمایە پایەدار کراون.

لە رۆژگاریی ئەمڕۆماندا کاتێك دەڵێین زانست، یەکەم پرسیاری بە ئەقڵدا دێت " چەندە پارە دێنێت؟" . هەرچی ئەوەی کە کۆمەڵگا لە زانستی داوا دەکات، وەڵامدانەوەی مەترسی و نیگەرانییە سەرەکییەکانێتی. بەڵام بەهۆی نیگەرانییە ماددی و مەعنەوییەکانی، لەناو هەموویێتی و یەکپارچەیی زانستیدا کۆمەڵایەتی بەپیشەی ئیلاهی لە قەڵەمدراوە و بەمجۆرە پەسەندی کردووە. خراپبوونی ئەکادیمیا و زانکۆکان گرێدراوی ئەم هەلومەرجانەیە. قەیرانی زانستی سەرچاوەی خۆی لەم هەلومەرجانە وەردەگرێت. گرێدراو بە مێژووی شارستانی مێژووی مەعریفەش گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینیوە، لەهەمان ئاستدا بەشی خۆی لەقەیرانە گشتییەکانی سیستەم وەرگرتووە. لەکاتێکدا دەیەوێت ببێتە ئامرازی چارەسەرکردن، خۆی بووە بە گەورەترین ئامرازی کێشەکان. ئەنجام پارچەبوونی زانستی، پەرتەوازەبوون و کائۆسە.

سروشتە جیاوازەکان، بە گوزارشتێکی دیکە کێشەکانی سروشتی یەکەم، دووەم و سێیەم پێویستی بە تێگەیشتن هەیە. تەواوی سروشتی دەرەوەی کۆمەڵگای مرۆڤ بەشێوەی سروشتی یەکەم جیادەکرێتەوە. ئەمە زاراوەیەکە لەناوەخۆیدا ناکۆکە. تەنانەت دەتوانرێت جیاوازی هەمەرەنگی ناکۆتای لەجۆری زیندوو ـ بێگیان، رووەك ـ ئاژەڵ، فیزیا ـ کیمیا، هەنگاوێك لەپێشتر جیاوازی ماددەی بینراو ـ نەبینراو و وزە ـ ماددە پێشبخرێت. هەروەها دەتوانرێت باس لە کۆمەڵگای تایبەتی هەریەکێك لەم جیاوازیانە بکرێت. کاتێك لە نزیکترەوە تەماشای کێشەی سروشتەکان بکەین، ئەوکاتە کاریگەرییە قووڵەکەی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی لەسەر دەبینین. دەتوانرێت جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە ئەمە جیاوازییەکی تەندروستانە نییە و بەلانی کەمەوە پێویستە لەمیانەی شەرت و مەرجەوە جەخت لەسەر هەنگاونان بەرەو ئەم جیاوازییە بکرێتەوە.

کۆمەڵگای مرۆڤ ، واتە سروشتی دووەم، بێگومان قۆناخێکی زۆر گرنگی پەرەسەندنی سروشتییە کە سۆبژەی خۆی هەیە. لەجیاتی سروشتێکی جیاواز پێناسەکردنی وەك قۆناخێکی جیاوازی سروشت واتادارترە.

گرنگترین خەسڵەتی جیاکەرەوەی سروشتی کۆمەڵگا، ئەرمایی و ئاستی بەرزی توانای زهنی و هێزە خۆ ئافرێنەرەکەیەتی. بێگومان لە سروشتی یەکەمیشدا زهن خاوەن ئەزمایی و هێزی ئافراندنە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی خاوەن ئەرکێکی قورس، وشك و خاوە. وەك هێڵێك تیۆریزەکردنی سروشتی کۆمەڵایەتی گرنگییەکی زۆری هەیە. هەرچەندە کۆمەڵناسە یەکەمینەکان لەبواری لەپێشینەیی پلەی یەکەمیان بەم خاڵە دابێت، بەڵام تا رۆژگاری ئەمڕۆمان شیکارەکانی بونیاد و بەش دەرکەوتوتە پێشتر، ئەمەش هەروەکو ئەوەیە کە لە شیکاری سروشتەکانی دیکەدا تێبینی کراوە. هەروەها دابەشکردنی سروشتی کۆمەڵگا بە شێوەی بونیادەکانی ژێرخان ـ سەرخان و بەشەکانی ئابووری ـ سیاسی ـ دەسەڵات، چین و قۆناخەکانی لەشێوەی کۆمینالی ـ سەرەتایی، کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیزم ـ کۆمینیزم تەنیا لەسەر بنەمای هەڵوێستێکی زۆر وریایانەی "جیاوازییەکان" دەشێت ئەنجامی واتاداری لێبکەوێتەوە. چونکە شیکاری هیچ چین، بەش و بونیادێك ناتوانێت جێگەی هەڵوێستی تیۆری سەرتاسەری بگرێتەوە. لەم بارەیەوە دەتوانرێت بگوترێت هیچ فەیلەسوف و کۆمەڵناسێك هەڵوێستی گشتگیریانەی ئەفلاتوون و ئەرستۆیان تێپەڕنەکردووە. تەنانەت شرۆڤە گشتگیریەکانی دانا و پێغەمبەرەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، بەگشتیش بە ریشە رۆژهەڵاتییەکان بەگوێرەی فەیلەسوف و کۆمەڵناسەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەزموونبەخش و کۆمەڵایەتیانەترە. بەرەو پێشتر گوزارشت لەبەهای هەڵوێستێکی پێشکەوتوو و پێگەیشتووانەتر دەکەن. پێویستە بە بایەخ پێدانەوە

جەخت لەسەرئەم خاڵە بکرێتەوە کە ئامێرەکانی کەڵەکەکردنی سەرمایە و دەسەڵات گرنگترین رۆڵیان لەمەدا بینیوە.

سەبارەت بە کۆمەڵگای مرۆڤ سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی بەهێز پێویستی بە میتۆدێکی هەڵوێستی تیۆریانەی قووڵ هەیە. پێویستە بە بایەخ پێدانەوە دەرك بەو راستییە بکرێت کە" راستینەی ئەو پەیڕەوە کۆمەڵناسیانەی لەناو قەرەباڵغی چەندایەتی ژمارەی زۆردا خنکاون لەجیاتی روونکردنەوەی راستییەکان پەردەپۆشیان دەکات. ئەگەر بڵێم ئەو کۆمەڵناسیانەی لەئارادان لە میتۆلۆژیاکان زیاتر راستییەکان دەشارنەوە، پێویستە بەزێدەرۆیی لە قەڵەم نەدرێت. تەنانەت بەگوێرەی تێگەیشتنە کۆمەڵناسییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەمیتۆلۆژیاکاندا هەستکردن بەراستی تا ئواڕادە مرۆییە و زیاتر لە حەقیقەت نزیکە.

بێگومان زانستی کۆمەڵایەتی گرنگە، بەڵام زەحمەتە ئۆخی ئێستای بە زانست ناو ببرێت. ئەو گوتە کۆمەڵناسییانەی لە ئارادان جگە لە مەشروعیەت پێدانی مۆدێرنیتەی فەرمی هیچ واتایەکی دیکەی نییە. سەبارەت بەم بابەتە پێویستی بە شۆڕشێکی زانستی و قەڵەمبازێکی ریشەیی میتۆد و پەیڕەو هەیە.

هەرچی ئەو قۆناخەیە کە لەمیانەی قۆناخی سروشتی سێیەم هەوڵی واتاردارکردنی دەدرێت، تەنیا لەرێگای ئەم شۆڕشەی زانست و پەیڕەوەوە دەشێت فەراهەم ببێت. وەك زاراوە سروشتی سێیەم گوزارشت لە قۆناخێکی بەرزتری سەرلەنوێ کۆکبوونی سروشتی یەکەم و دووەم دەکات. سەنتێزی ئاستێکی باڵاتری سروشتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ سروشتی یەکەمدا بە ئەندازەی پارادایمی تیۆری شۆڕشگێرانە پێویستی بە شۆڕشێکی ریشەیی کرداری هەیە. بەتایبەتیش تێپەڕکردنی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) دیاریکەرە کە قۆناخی ئەمڕۆی سیستەمی شارستانی ناوەندییە. هەر لەم پێناوەشدا لە ئاستی هەرە نزمدا پێشخستنی بونیادەکانی شارستانێتی دیموکراتی، هەروەها پەرەسەندنی کارەکتەری کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی و فێمێنیستی کە بابەتی جیاکەرەوەن، لەگەڵ کاراکردنی هونەری سیاسەتی دیموکراتیانە و دامەزراندنی کۆمەڵی دیموکراتی و مەدەنی ئەو هەنگاوانەن کە پێویستە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بهاوێژرێن.

سروشتی سێیەم بەڵێنی ئۆتۆپیا یان بەهەشتێکی نوێ نییە، بەڵکو فەراهەمکردنی تەقلیبوونی مرۆڤە بۆ خۆ گونجاندنی مەزن لەمیانەی پاراستنی هێزی زانستە زیادبووەکەی مرۆڤ لەبارەی سروشتەکانەوە. ئەمە تەنیا تامەزرۆیی، ئامانجێك یان بەڵێنی ئۆتۆپیا خەیاڵییەکان نییە، هونەری ژیانی جوان و چاکە کە واتای کرداری هەنووکەیی و رۆژانەیی هەیە. باس لە بایۆلۆژیزم ناکەم. مەترسی ئەم هەڵوێستە دەزانم. باس لە بەهەشتی ئۆتۆپیای " خودایی" کەڵەکەبوونەکانی دەسەڵات

و سەرمایەش ناکەم. هەروەها ئاگاداری ئامانجە رووخێنەر و ترسناکەکانی ئەم هەڵوێستەم و دەزانم لە قووڵاییدا گوزارشت لەچی دەکات. هەروەها دەتوانم ئەوەش بڵێم کە بەڵێنی بەهەشتی کۆمۆنیزمی گەلەری ماتریالیزمیش سەرەتاییە و کرداری نییە، بەڵکو جۆرێك لە جەمسەری هێڵەکانی لیبرالیزمە. هەڵبەتە لە ئەزموونی رۆژانەیی ژیاندا دەرکی پێدەکەین کە هەموو جۆرە بەڵێنێکی لیبرالیزم بۆنی دۆزەخی لێدێت.

بەدیهاتنی سروشتی سێیەم پێویستی بە " ماوە"یەکی زەمەنی درێژخایەن هەیە. سیستەمی دیموکراتیك ـ کە وەکو رژێمی پراکتیزەکردن و گوزارەکردنی ئازادی و یەکسانی سروشتی یەکەم و دووەمە لە قۆناخێکی سەرووتردا و لەسەر بنەمای جیاوازیەکانە ـ تەنیا کاتێك تایبەتمەندێتییەکانی کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی و فێمێنیزمی لەناودا پێشبکەوێت، فەرلەهەم دەبێت. سروشتی کۆمەڵگای مرۆڤ دینامیکەکانی بەدیهاتنی ئەم قۆناخە لەخۆوە دەگرێت. راوەستەکردن لەسەر مەسەلەی سروشتە جیاوازەکان کە پێویستە لەمیانەی ئەم پەیرەوەوە قاڵبوونەوەی لەبارەوە بکرێت ، دەشێت بەرەو دەرەنجامی تیۆری و کرداری واتادارمان ببات.

لەم قۆناخەی دواییدا لەچوارچێوەی گەردوونگەرایی رەها ـ رێژەیی گفتوگۆ لەبارەی یەکێك لە کێشە گرنگەکانی پەیرەو دەکرێت. هەروەها شرۆڤەکردنی بەشێوەی واتای گەردوونی یان پارچەیی گوزارشت لە هەمان ناوەرۆك دەکات. رووبەرووی کێشەیەکی پەیرەو بووینەتەوە کە پێویستە بە وردی و هەستیارییەوە شیکار بکرێت. دەشێت ئەم کێشەیە وەك ئەو قۆناخە نوێیەش پێناسە بکەین کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە پێی گەیشتووە. بەهۆی ئەو هەلومەرجە ماددییانەی بناخەی ئەم جۆرە کێشانەی پەیرەو پێکدێنن هەڵوێستە وشکەکانی ئامێرەکانی دەسەڵات و سەرمایە بە "یاسا" ناودەبرێت، بەڵام پێوەلکانی رەونەقی"گەردوونی رەها" بە هەڵوێستی یاساییەوە لەنزیکەوە گرێدراوی بوونێتی بە ئامرازی مەشروعیەت پێدانی ئایدیۆلۆژی. گوتەی "یاسا پۆڵا دەبڕێت" لێرەوە دێت. پێویستە باش دەرکی پێبکرێت کە یاسا بەرهەمێکی دەسەڵاتە. پێویستە لەبیر نەکەین کە دەسەڵات بە واتای سەرمایە دێت. گوتەی حوکمڕانی دەسەڵات، لەهەمانکاتدا بە واتای "یاسا" دێت. هەرچی یاسایە بەو رادەیەی " گەردوونی رەها" بێت بەهێزە و بەرەنگاربوونەوەی زەحمەت دەبێت. بەم جۆرە ئافراندنی خوداوەند لە خەیاڵی مرۆڤەوە دەست پێدەکات. بەمجۆرە ئەو دیکتاتۆریەتەی ناتوانێت بە ئاشکرا گوزارشتی بکات مرۆڤی دەسەڵاتدار دەیکات بە ئیلاهی، بەم شێوەیە ئامرازێکی نێجگار دانایانەی مەشروعیەت پێدان دەخولقێنێت و بە ئاسانی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەکەی وێنا دەکات. پێویستە چاك دەرك بەو خاڵە بکرێت کە ئەم جۆرە هەوڵانە ـ بە تەولویش نەبێت ـ تا رادەیەکی زۆر سەرچاوەو بناخەی ئەم رێسا گەردوونی و رەهایانە پێکدێنێت.

هەرچی ڕێژەییە هەرچەندە وەك جەمسەرێکی دژ ڕەنگبداتەوە، بەڵام مەترسییەکی هاوشێوە لەخۆوە دەگرێت. تەواو گوزارشت لە دۆخی مرۆڤی سووکایەتی پێکراو دەکات کە لە گشت ڕێسا، ڕێگا و پەیڕەوێك دوورخراوەتەوە. دەرگای خۆی بۆ چەمکی ئەوپەڕگەری " چەندە مرۆڤ هەیە هێندە ڕێسا و پەیڕەویش هەن" ئاواڵا دەکات. بەگوێرەی ئەوەی ئەمە لەبواری پراکتیکدا نەکردەیەو ناشێت بەڕێوەبچێت، لە ئەنجامدا خۆبەدەستەوەدانی بۆ ڕێسا گەردوونی و ڕەهاکان دەست لێبەرنەدراوە. هەروو چەمکیش زێدەڕۆیی لە بەشی ژێری کۆمەڵگای مرۆڤ دەکەن، یان بەناستی "یاسای گەردوونی ڕەها"ی دەگەیەنن، یان بەشێوەی " هەرکەسێك یاسای خۆی هەیە" بۆ میتۆدی مۆدێل بچووك دەکرێتەوە، بەمجۆرەش بەلارێیدا دەبەن. دەشێت شرۆڤەیەکی واقیعیانەتر سەبارەت بە ژێری کۆمەڵگا بکرێت. بەبێ ئەوەی ڕێسای گەردوونی ڕەها و شرۆڤەی ڕێژەیی بگەیەنینە دۆخی دوو جەمسەری دژ، کردنیان بە زاراوەی دوو دۆخی تێکەڵی ڕاستینەی سروشتی، دەشێت ڕێگا لەپێش باسکردنێکی بەپێز و بەپیتتر بکاتەوە. ئەمەش ڕێسای ڕەهای نەگۆڕ بە پەرەسەندنی ڕاستەهێڵی دەگەیەنێت، ئەگەر ئەمەش کۆتایی هەبوایە، ئەوا دەبوایە تائێستا لە گەردووندا پێی بگەین. ڕەوتی گەشەسەندن کەموکوڕیەکی بەمجۆرەی هەیە. ئەگەر ڕاستبوایە کە بەردەوام گەردوون بۆ ئامانجێك بەرەو پێشەوە دەچێت، وەك پێویستییەکی زاراوەی " ئەزەلییەت" کە بێ سەرەتایە، لەمێژیوو دەبوایە بەو ئامانجەی بگات. بەپێچەوانەوە، ڕێژەگەرایی زاراوەی " سووڕانەوەی بازنەیی ناکۆتا" لەخۆوە دەگرێت، ئەگەر ئەمەش ڕاستبوایە، دەبوایە ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنە گەردوونیانەی لە ئارادان روویان نەدابایە. لەبەرئەم هۆکارانە گەشەسەندنی ڕاستەهێڵی ڕەها و سووڕانەوەی بازنەیی لە ناوەڕۆکدا دەبن بەیەك، چەمکی پەیڕەوێکن کە لە ڕوونکردنەوەی پەرەسەندنی گۆڕاو و جیاوازی گەردوون بێبەشن. پەیڕەوی ناتەواون. لەو بڕوایەدام کە پێناسەی پەیڕەوی هەرە نزیك لەڕاستی پێویستە بەم شێوە بێت "لە میانەی هەمەڕەنگی و جیاوازییەوە گۆڕانکاری فەراهەم دەبێت، ئەمەش بەو ڕادەیەی ساتەوەختی و هەنووکەیی بێت، ئەوا ناکۆتابوونیش لە خۆوە دەگرێت". بەڵام گوتەی" پەرەسەندن بازنەییە، سووڕی بازنەییش بە واتای پەرەسەندن دێت، هەروەها بەو ئەندازەیەی ناکۆتابوون لە ساتەوەختی ئێستادا شاراوەیە و لەگەڵیدا بۆتە یەك، ئەوا یەکپارچەیی بونیادە ساتە وەختیەکانیش ناکۆتابوون لەخۆوە دەگرن" سەبارەت بە ئاولکردن و پێشخستنی ڕژێمی حەقیقەت ڕێنومایی و دیدگایەکی ڕوونکەرەوە و دەرکپێکراوی پەیڕەو دەخاتەڕوو.

سەبارەت بەپەیڕەوی دیالیکتیکیش ئاماژەکردن بەچەند خاڵێك گرنگە. بێگومان دۆزینەوەی پەیڕەوی دیالیکتیکی دەسکەوتێکی گەورەیە. لەمیانەی تێڕوانین و چاودێرییە قووڵەکانەوە هەر ساتێك ئەو ڕاستییە بەرچاو دەکەوێت کە گەردوون کارەکتەری دیالیکتیکی لەخۆوە دەگرێت. بەڵام

ئەو خاڵەی لێرەدا جێگای کێشەیە سەبارەت بە چۆنیەتی پێناسەکردنی دیالیکتیکە. جیاوازی نێوان راڤەکانی مارکس و هیگل لەبارەی دیالیکتیکەوە دەزانرێت. ئەو وێرانکارییانەی رێگایان لەپێش کردەوە بۆ هەردوو راڤەو شرۆڤەش هیوا بەخش نەبوون. رێکردنەوەی شرۆڤەی هیگڵ لەپێش دەوڵەتی میللیگەرایی ئەڵمان، لەمیانەی جێبەجێکردنی فاشیزمەوە دەرەنجامە سامناکەکانی خۆی خستۆتەروو. هەرچەندە ئەنجامی پرلکتیك و کردارە چینایەتییە تەسکەکانی ریال ــ سۆسیالیزمی شوێنکەوتووانی مارکس جیاوازیش بێت، بەڵام هەروەکو دەزانرێت رێگای لەپێش چەندین خراپی و وێرانکاری کردەوە. لێرە لەجیاتی ئەوەی کەموکورییەکان لەمارکس یان هیگڵدا ببینرێت، راستتر ئەوەیە سەرچاوەکەی لەوانەدا ببینرێت کە دیالیکتیکیان بەهەڵە شرۆڤە و راڤەکردووە. هەروەکو چۆن بە موڵککردن و گەڕاندنەوەی هەڵوێستی دیالیکتیکی بۆ مارکس و هیگل راست نییە، کردنی بە موڵکی فیکری یۆنانی چاخی کۆنیش تەواو لە جێگای خۆیدا نییە. لە راڤەی داناکانی(حەکیمەکانی) رۆژهەڵاتدا زۆرجار شرۆڤە و راڤەی دیالیکتیکی دەبینرێت. بێگومان لە یۆنانی چاخی کۆن و ئەورووپای رۆشنگەریدا دەسکەوتی گرنگ سەبارەت بەم بابەتە بەدەست هاتوون.

راڤەکردنی دیالیکتیك وەك یەکێتی لەناوبەرانەی دژەکان، یان راڤەکردنی بەشێوەی ئافرێنەر و خوڵقێنەری ساتەوەختی و گۆڕانی بەبێ دژ، راست نییە. چەمکی یەکەم زۆر قەبەیە، بە مەیلێك دەگات کە جەمسەرەکان دەکات بە دوژمنی یەکتری، ئەمەش بەرەو ئەنجامێکمان دەبات کە گەردوون لە دۆخی کائۆسی بەردەوام و بێبەش لە رێسا دەبینێت. هەرچی چەمکی دووەمە گەشەسەندن بەرەو ئەنجامێك دەبات کە بەبێ گرژی و دژایەتی بە دوای گۆڕانێکدا دەگەڕێت کە خاوەن دینامیکی خۆی نییە، بەردەوام پێویستی بەهەبوونی هێزیکی دەرەکی دەبینێت، هەڵبەتە ناشێ ئەمە ئەرێ بکرێت. هەروەکو دەزانرێت لەم رێگایەوە بە میتافیزیك گەیشتوون.

لە رەوشێکی وەهادا رزگارکردن و پاککردنەوەی دیالیکتیك لەم دوو راڤە و شرۆڤە زێدەڕۆییانە گرنگیەکی زۆری هەیە. هەڵبەتە ئەوەی لەپێشکەوتنەکاندا دەبینرێت دیالیکتیکی بونیادنەرە نەك رووخێنەر. بۆ نموونە خودی مرۆڤ پەرەسەندنێکی دیالیکتیکی وەهای لە ناواخنی خۆیدا هەڵگرتووە لەوانەیە بەقەدەر تەمەنی شیمانەکراوی گەردوون بێت. هەروەکو چۆن مرۆڤ خاوەن پێشکەوتووترین ناوك و گەردیلەی تەنۆلکەکانی لە ئەتۆم وردترە ، ئەوا تەواوی قۆناخەکانی پەرەسەندنی بایۆلۆژیش لە خۆوە دەگرێت. ئەم پەرەسەندنە نایابە، دیالیکتیکییە. بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت کە دیالیکتیکێکی پێشکەوتن و بونیادی پیشاندەدات، چونکە ئەمە لەبەرچاوانە. بێگومان ناکۆکییە چینایەتییەکان (دەشێت ناکۆکی هۆزایەتی، ئەتنیك، نەتەوەیی و سیستەمەکانیشی بخرێتە سەر) کە گفتوگۆی زۆری لەبارەوە دەکرێت دوژمنایەتی دیار وبەرچاو لەخۆوە دەگرێت. بەڵام کاتێك

هێزە سەرسوڕهێنەرەکەی نەرمایی ئەقڵی کۆمەڵایەتی لەبیرنەکەین، ئەوا بەبێ ئەوەی ئەم ناکۆکیانە بە کۆمەڵکوژی بگات دەتوانین بەگوێرەی ڕۆحی دیالیکتیك چارەسەریان بکەین. هەڵبەتە سروشتی کۆمەڵایەتی پڕ لە نموونەی بێژماری ئەم چەشنە چارەسەریانەیە. بەڵام ئایدیۆلۆگەکان کاتێك بەنیازن بەشێوەیەکی چاکتر پێشکەوتنەکان روون بکەنەوە، لەوانەیە لە دەرەوەی ئیرادەی خۆیان دەکەونە ناو ئەنجامی پێچەوانەوە. زۆرجار تێخزانیان بۆ ناو ئەم ڕەوشەوە پیشانیدەدات کە تاکو ئێستاش راڤەو شرۆڤەکردنی دیالیکتیك بابەخدارە.

بۆئەوەی سەبارەت بە بابەتی دیالیکتیك ڕێگا بەهەڵە نەدرێت، بەشێوەیەکی کورتیش بێت پێویستە بەراوردکردنەکەی لەگەڵ میتافیزیك شرۆڤە بکرێت. بێگومان لە دەرەوە واتە لە خولقێنەردا گەڕانی میتافیزیك بەدوای هەبووندا نەزۆکترین هەڵوێستی مێژوو بووە. ئەو فەلسەفە، ئایین و زانستە پۆزێتیڤستانەی ئەم هەڵوێستە ڕێگای لەپێش کردۆتەوە تەواو سیستەمێکی "داگیرکاری زهنی" ئافراندووە. سروشت لەدەرەوە پێویستی بە خولقێنەر نییە، یاخود ئەگەر پێویستیشی هەبێت دەشێت ئەم خولقێنەرە لەناوەخۆیدا بێت. بەڵام زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە میتافیزیا " ڕژێمە داگیرکارەکانی زهنی" وەك خولقێنەرێکی دەرەکی لەسەر ژێری سروشتی کۆمەڵایەتی جێگیرکردووە. لەم چوارچێوەیەدا ڕەخنەکردن و تێپەڕکردنی میتافیزیك بابەخ و گرنگییەکی زۆری هەیە.

بەڵام ئەو خاڵەی سەبارەت بەمیتافیزیکەوە خوازیاری باسکردنیم پەیوەندی بە لایەنێکی دیکەیەوە هەیە. مەبەستم لەوەیە کە مرۆڤ بەبێ میتافیزیك نابێت. ئەو میتافیزیکەی باسی دەکەم داهێنانە کلتوورییەکانی کۆمەڵگای مرۆڤە. شانبەشانی میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە و زانستەکان، هەموو جۆرە هونەرێك، سیاسەت و تەکنیکەکانی بەرهەمهێنان جێگای خۆیان تێدا دەگرن. سۆز و هەستەکانی چاکی و جوانی هیچ هاوتا و بەرامبەرێکی بەرجەستەیان نییە. ئەمانە بەهایەکی تایبەت بە مرۆڤن. بە تایبەتیش ئەخلاق و هونەر بەهای میتافیزیکن. ئەوەی لێرەدا پێویستە ڕۆشن بکرێتەوە دوالیزمی میتافیزیك ــ دیالیکتیك نییە، بەڵکوجیاوازیکردنە لە نێوان داهێنانە چاك و جوانەکانی میتافیزیك و خراپ و قێزەونیەکانی میتافیزیك. هەروەها مەسەلەی دوالیزمی ئایین ــ بێ دینی و فەلسەفە ــ زانستیش نییە، بەڵکو ئەو باوەڕی، ڕاستی و حەقیقەتە ئایینی، فەلسەفی و زانستیانەن کە ژیانیان سەرنج ڕاکێشتر و دڵڕفێن کردووە.

پێویستە لەبیر نەکەین کە سروشت شانۆگەرییەکی هەمەڕەنگ و گەورەی خستۆتە بەردەم ژیانی مرۆڤەوە. ناشێت ڕۆڵی مرۆڤ لەم شانۆگەریەدا هەمان ڕۆڵی سروشت بێت. بەڵکو لەم شانۆگەریەدا تەنیا لەمیانەی سیناریۆکانی خۆیەوە دەتوانێت ژیانی خۆی ڕێکبخات. پێناسەکردنی

شانۆ وەك رەنگدانەوەی ژیان سەرچاوەی خۆی لەم راستییە قووڵەوە وەردەگرێت. ئەوەی گرنگە کەموکورتی و لایەنە خراپ و قێزەونەکانی ژیانی ئەم شانۆگەرییە بۆ نزمترین ئاست دابخرێت، هەرچی راستی، چاکە و جوانییەکانە بۆ بڵندترین ئاست بەرزبکرێتەوە. کاتێك باسی میتافیزکی چاك، جوان و راست دەکەین، مەبەستمان ئەم خەسڵەت و کارەکتەرە قووڵەی مرۆڤە. ئەگەر نا باس لەو میتافیزیکە ناکەین کە مرۆڤ کوێر، کەڕ و لاڵ و بێ هەست دەکات. کاتێك سەبارەت بە پەیڕەو بەرلوورنکاری لەنێوان دیالیکتیك ـــ میتافیزیك دەکەین لەو بڕوایەدام کە ئەم چەسپاندن و دەستنیشانکردنانە زۆر گرنگ و بایەخدارن.

## کێشەی ئازادی

ناتوانم ڕێگری لەخۆم بکەم و نەڵێم وەك بڵێی ئازادی ئامانجی گەردوونە. زۆرجار لەخۆمم پرسیوە بەڕاستی گەردوون بەدوای ئازادیەوەیە. بەردەوام ئەم گوتەیەم بە ناتەواو داناوە کە ئازادی تەنیا وەك لێکەڕینێکی قووڵی کۆمەڵگای مرۆڤ دەبینێت. لەو بڕوایەدابووم کە مسۆگەر لایەنێکی پەیوەندیداری بەگەردوونەوە هەیە. کاتێك وەك پێکهاتەی بنەڕەتی گەردوون بیر لەدوالیزمی تەنۆلکە ـ وزە بکەینەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە وزە بە واتای ئازادی دێت. هەرچی تەنۆلکەی مادییە بەبڕوای من دۆخی مەحکومکراوی بەشێکی وزەیە. تیشك دۆخێکی وزەیە. ئایا دەتوانرێت نکوڵی لە لێشاوی ئازادانەی تیشك بکرێت؟ ئێمە ناچارین ئەو پێناسانە ئەرێ بکەین کە بڕەکان(کوانتەم) وەك فاکتەری ڕۆشنکردنەوەی تەواوی هەمەڕەنگیەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دادەنێت، هەروەها وەك بچووکترین بەشی وزە پێناسە دەکرێت. بەڵێ جووڵەی کوانتەمی هێزی ئافرێنەری تەواوی هەمەرەنگیەکانە. ناتوانم ڕێگری لەخۆم بکەم و نەپرسم: ئایا ئەمەیە ئەو خودلوەندەی بەردەوام بەدوایدا دەگەڕێن. کاتێك دەڵێن ئەودیوی ــ گەردوون هەمان کارەکتەری کوانتەمی هەیە، دیسان دێمە جۆش و دەڵێم لەوانەیە، ناتوانم ڕێگری لەخۆم بکەم و نەڵێم ئایا ئەمەیە کە لەدەرەوە بەخولقێنەری خودلوەند ناودەبرێت.

بەبڕوای من سەبارەت بە بابەتی ئازادی گرنگ ئەوەیە خۆ خۆیی نەبین و نەکەوینە نێو میتۆدی بچووککردنەوە و سنووردارکردنی مەسەلەکە بەمرۆڤەوە. ئایا دەتوانرێت نکوڵی لە هەڵپەی باڵندەو ئاژەڵەکانی ناو قەفەس بکرێت لەپێناو ئازادیدا؟ لەکاتێکدا ئاوازو جریواندنی بولبول نەوازەترین سەمفۆنیا تێپەڕ دەکات، جگە لەئازادی لەرێگای کامە دەستەواژەوە دەتوانرێت ئەم راستییە روونبکرێتەوە؟ ئەگەر زیاتر بەرەو پێشەوە برۆین، ئایا گشت دەنگ و رەنگەکانی گەردوون ئازادی ناهێننەوە بیری مرۆڤ؟ ئایا جگە لە لێکەڕینی ئازادی لەرێگای کامە زارلوەوە گشت هەڵپەکانی ژنان روون بکەینەوە کە یەکەمین و دواترین کۆیلە قووڵەکەی کۆمەڵگای مرۆڤن؟ کاتێك فەیلەسوفەقاڵبۆوەکان، بۆ نموونە کاتێك سپینۆزا ئازادی بە دەرکەوتن لە جەهالەت و وەك هێزی واتا شرۆڤە دەکات ئایا بەرەو هەمان دەرگا ناچێت؟

نـاخوازم کێشـەکە لـەناو ناوەڕۆکـە ناکۆتاکەیـدا بخنکێـنم. هـەروەها نامـەوێت وەك نۆخـی "مەحکومیەتی" لەچارەنووسرلوی سەردەمی لەدایکبوونم گوزارشتی لێ بکـەم. بەڵگەکەشـی، جگـە لەچەند رستەیەکی کە بەیادی پرۆمیتۆس نووسیومە، هیچ کاتێك نووسینی هۆنراوەم تاقینـەکردەوە، کەجۆرێك لە لێگەڕینی ئازادییە. هەروەکو دەزانرێت ئەویش جگە لەلایـەنی خـەیاڵ و وێناکردن هـیچ واتایەکی دیکەی نەبوو. بەڵام ئایا دەتوانرێت ئەم راستییە رەچاو نەکرێت کە دێدەوان و پـەیجورێکی بەحەسرەتی واتای ئازادیم؟

کاتێك ئازادی کۆمـەڵگا وەك کێشـەیەك تـاوتوێ دەکـەین، ئامـانجی ئـەم پێشـەکییە کورتـەمان سـەرنج راکێشـانە بـۆ سـەر قـووڵایی بابەتەکـە. هـەروەها پێناسـەکردنی کۆمـەڵگا وەك سروشـتێکی خـاوەن پێگەیشـتووترین ژێـری مۆڵبـوو، سـەبارەت بـە بابـەتی شـیکاری ئـازادیش رۆشـنکەرەوەیە. گۆرەپانە چرەکانی ژێری گۆرەپانی هەستیارن بەرامبەر بە ئازادی. کامە کۆمەڵگا وەك هێـزی ئـەقڵ، کلتوور و ژێری خۆی قاڵکردبێتەوە، بەو مانایە دێت کە تا ئەو رادەیە خۆی نزیکی ئازادی کردۆتـەوە. هەروەها ئەم گوتەیەش راستە: کۆمەڵگایەك چـەندە خـۆی لـە بـەهای ئـەم ژێـری، ئـەقڵ و کلتـوورە بێبەشکردبێت یان لێی بێبەش کرابێت، تا ئەورادەیە لەناو کۆیلایەتیدا دەژیت.

کاتێك سەبارەت بەبابەتی هۆزی عیبرانی قاڵدەبمەوە، بەردەوام هزرم گـیرۆدەی دوو خەسـڵەتی سەرەکییان دەبێت. یەکەمیان، لێهاتووییانە سەبارەت بە بابەتی پارە، بـەردەوام حـوکمڕانێتی پـارە لەدەست خۆیاندا دەهێڵنەوە. لە هەردوو بواری تیۆری و پراکتیکییەوە بەشێوەیەکی لێهاتووانە بـاش دەزانن چۆن لەم رێگایەوە دەتوانن جیهان بـە خۆیانـەوە ببەسـتنەوە، تەنانـەت بیخەنـە ژێردەسـتی خۆیان. دەتوانین ئەمـە بـە حـوکمڕانێتی دونیـای مـاددیش ناوببـەین. بەبڕوای مـن ئـەوەی گـرنگترە سەرکەوتنیانە لەهی دووەمدا، واتـە سـەرکەوتنیانە لەهونـەری حـوکمڕانی مەعنەویـدا. بەهۆییـەکان سـەرەتا لەمیانـەی پێغەمبـەرەکان، دواتـر نووسـەر (کاتب)ەکانیـان، لـە سـەردەمی مۆدێرنیتـەی سەرمایەداریشـدا لـە رێگـای هـەرجۆرە فەیلەسـوف، دانـا و هونەرمەنـدە جـۆر بـە جۆرەکانیـەوە حوکمڕانییەکی کلتووری مەعنەویی هاوشانی تەمەنی مێژوویان ئاواکردووە. لـەم سـۆنگەیەوە گوتـەی هیچ هۆزێك وەك هۆزی عیبرانـی دەوڵەمەنـد و ئـازاد نییـە، گوتەیـەکی راسـت و لـەجێگای خۆیدایـە. سەبارەت بەم سەردەمەمان ئاماژەکردن بە چەند نموونەیەك بە زیادیشەوە ئـەم راسـتییە پشتڕاسـت دەکاتەوە. زۆرینـەی هـەرە زۆری هێـزی حـوکمڕانی راسـتەقینەی سـەرمایەی فینـانس کـە ئـابووری جیهانگیری بەڕێوە دەبات بەبنەچە عیبرانین، واتە یەهودین. لە دەرکـەوتنی فەلسـەفەی هاوچـەرخدا باسکردنی سپینۆزا، لە سۆسیۆلۆژیادا مارکس، لە سایکۆلۆژیدا فرۆید و لە زانستی فیزیاشدا دەشێت باسی ئەنیشتاین بکرێت، هەروەها دەتوانرێت بـە سـەدان تیـۆریزانی زانسـتی، هونـەری و سیاسـیش

لەمانە زیادبکرێن، دەشێت سەبارەت بە هێزی رۆشنبیری یەهودییەکان بیرۆکەیەکمان پێ ببەخشێت. ئایا دەشێت حوکمڕانێتی یەهودی لە دونیای رۆشنبیریدا نکوڵی لێبکرێت؟

بەڵام لە رووەکەی تری مەدالیاکەدا ئەوانەی دیکەی دونیا هەن. دەوڵەمەندی ماددی و مەعنەوی، هێز و حوکمڕانێتی لایەنێك، بەرامبەر بەهەژاری، لاوازی و مێگەلبوونی ئەوانەی دیکەدا بەدیدێت. لەم سۆنگەیەوە ئەو گوتە بەناوبانگەی مارکس کە سەبارەت بە پرۆلیتاریا گووتویەتی "ئەگەر پرۆلیتاریا خوازیاری ئازادییە (بەگوتەیەکی دیکە رزگاربوون) جگە لە ئازادکردنی تەواوی کۆمەڵگا هیچ چارەیەکی دیکەی نییە" بۆ یەهودییەکانیش لەجێگای خۆیدایە. هەروەکو بڵێی مارکس بیری لە یەهودییەکان کردۆتەوە و ئەم قسەیەی کردووە. ئەگەر یەهودییەکان خوازیارن لە ئازادی خۆیان دڵنیابن، واتە لە دەوڵەمەندێتی، ژیری و هێزی واتایان دڵنیابن، جگە لەوەی بەهەمان شێوە کۆمەڵگای جیهانیش دەوڵەمەند بکەن و لەبواری مەعنەوییەوە بەهێزیان بکەن، هیچ رێگایەکی دیکەیان نییە. ئەگەرنا دەشێت هەرکاتێك هیتلەری نوێیان لەبەرامبەردا قووت ببێتەوە. لەم چوارچێوەیەدا تەنیا کاتێك لەناو ئازادی و رزگاری کۆمەڵگای دونیادا بیر لەئازادی و رزگاری یەهودییەکان بکرێتەوە، دەکرێت فەراهەم ببێت. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا لەکۆمەڵکوژییە سامناکەکەی یەهودییەکاندا دەشێ دەرك بەو راستییە بکەین کە ئەو دەوڵەمەندی و پایە مەعنەوییەی لەسەر بنەمای هەژاری و جەهالەتی ئەوانی دیکەوە ئاواکرابێت بەهایەکی راستەقینەی ئازادی لەخۆوە ناگرێت. واتای راستەقینەی ئازادی لەخۆوە ناگرێت. واتای راستەقینەی ئازادی پێویستە جیاوازی ئێمە ـ ئەوانی دیکە تێپەڕ بکات و هەرکەسێك خاوەندارێتی لە کارەکتەرەکەی بکات.

کاتێك سیستەمی شارستانی ناوەندی لەسەربنەمای کێشەی ئازادی هەڵسەنگێنین، ئەوا دەبینین بەکۆیلایەتییەك بارکراوە کە بەشێوەی کەڵەکەبوون کەوتۆتە سەریەك. لەناو سێ رەهەندا کۆیلایەتی بەشێوەیەکی بەهێز دەگوزەرێنرێت: سەرەتا کۆیلایەتی ئایدیۆلۆژی ئاوادەکرێت. ئاواکردنی خودلوەندی حوکمڕان و ترسێنەر لەمیتۆلۆژیاکاندا، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگای سۆمەردا زۆر بەکاریگەرە و مایەی تێگەیشتنە. نهۆمی سەرەوەی زیگۆرات (زەقورە) وەك شوێنی ئەو خودلوەندە بیری لێدەکرێتەوە کە حوکمڕانی زەن دەکات. نهۆمەکانی ناوەڕاستیش بریارگای بەڕێوەبەرایەتی سیاسی راهیبەکانە. هەرچی نهۆمی هەرە خوارەوەیە وەك نهۆمی خەباتکارانی کێڵگە و پیشەکاران ئامادەکراوە کە بۆ هەموو کارێك بەکاریان دێنن. تا رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم مۆدێلە لەگەوهەردا نەگۆڕاوە، تەنیا بە پێگەیەکی سەرسوڕهێنەری کرانەوە ـــ بڵاوبوونەوە گەیشتووە. ئەم چیرۆکە پێنج هەزار ساڵییەی سیستەمی شارستانی ناوەندی گریمان و وێنای

مێژووی هەرە نزیك بەڕاستییە. ڕاستتر ، واقیعێکە بەشێوەیەکی پشتبەستوو بە ئەزموون(ئەمپێریك)[١] تێبینی کراوە. شیکارکردنی زەقورە، شیکارکردنی سیستەمی شارستانی ناوەندییە. لەم سۆنگەیەوە شیکارکردنی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری ڕۆژگاری ئەمڕۆمانە لەمیانەی جێگیرکردنی لەسەر بناخە ڕاستەقینەکەی خۆیەوە. لەکاتێکدا پەرەسەندنی سەرمایە و دەسەڵات بەشێوەیەکی کەڵەکەبوو ڕوویکی مەدالیاکەیە، لە ڕووەکەی دیکەشی کۆیلایەتی، برسێتی، هەژاری و مێگەلبوونێکی ترسناك جێگای باسە.

لەم چوارچێوەیەدا" باشتر تێدەگەین کە کێشەی ئازادی چۆن قووڵبۆتەوە. سیستەمی شارستانی ناوەندی بەمجۆرەیە" تا هەنگاو بەهەنگاو (تدریجی) کۆمەڵگا لە ئازادی بێبەش نەکات و نەیخاتە ئاستی کۆمەڵگای مێگەل، ناتوانێت بەردەوام بێت و هەبوونی خۆی بپارێزێت. ئەو چارەسەرییەی لە لۆژیکی سیستەمدا هەیە زیاتر ئاواکردن و پێشخستنی ئامێرەکانی دەسەڵات و سەرمایەیە. ئەمەش بەواتای هەژاری و مێگەلبوونێکی زیاتر دێت. تا ئەم ڕادەیە گەورەبوونی کێشەی ئازادی و بوونی بە کێشەی سەرەکی هەر سەردەمێك، بەهۆی ئەو دوالیزمەیە کە لە سروشتی سیستەمدا هەیە. لەخۆڕا باسی پێگە نموونەییەکەی هۆزی یەهودیمان نەکرد. چەندەی بڵێی فێرکەر و ئەزموونبەخشە. خوێندنەوەی ئازادی و کۆیلایەتیش لەڕێگای یەهودیەتەوە، بەدرێژایی چەندین چاخ و سەردەم هیچی لە گرنگی خۆی لەدەست نەداوە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم باسەدا دەتوانین زیاتر دەرك بەو گفتوگۆ باو و نەریتییە بکەین: ئاخۆ پارە یاخود مەعریفە کامەیان زیاتر ئازادییان دابینکردووە. پارە وەك ئامرازێکی کۆکردنەوەی سەرمایە، واتە تا وەك ئامرازێکی زەوتکردنی زێدەبەرهەم و بەها ڕۆڵ ببینێت، بەردەوام ئامرازی کۆیلایەتییە. تەنانەت کاتێك بەردەوام خاوەنەکەی خۆشی بانگهێشتی کۆمەڵکوژی دەکات، زۆر بەباشی ڕوونی دەکاتەوە کە نابێتە ئامرازێکی متمانەپێکراو بۆ ئازادی. پارە ڕۆڵی ئەو تەنۆلکە مادییە دەبینێت کە دژی وزەیە. هەروەها دەتوانرێت بگووترێت هەر کاتێك مەعریفە زیاتر نزیك بە ئازادییە. ئەو مەعریفەیەی لەسەر ڕاستی ئاواکرابێت هەموو کاتێك ئاسۆی ئازادی ڕۆشن دەکاتەوە. لەبەرئەم هۆکارەیە بەردەوام مەعریفە وەك لێشاوی وزە پێناسە دەکرێت.

پێناسەکردنی ئازادی وەك زیادبوون، فرەچەشنی و جیاوازییەکانی گەردوون سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ئەخلاقی کۆمەڵگاش ئاسانکاری پێشکەش دەکات. ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەیش بێت

---

[١] ئەزموونگەرایی (Ampirizim): ڕەوتێکی فەلسەفییە لەو بڕوایەدایە کە تەولوی مەعریفەی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگای ئەزموونەوە بە دەست دێت. بوونی هەر فیکرێکی خۆڕسك و مەعریفەیەکی لە پێشینەیی ئەزموونی کردەیی ڕەت دەکاتەوە.

زیادبوون، فرەچەشنی و جیاوازی، بەردەوام توانای مافی هەڵبژاردنی هەبوونێکی ژیرمان دێنێتەوە یاد کە لە ناواخنیدا هەیە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانیش هەبوونی ژیرییەك دەسەلمێنن کە رووەکی بەرەو فرەڕەنگی ئاراستەکردووە. هیچ کارگەیەکی دەستکردی مرۆڤ تائێستا نەیتوانیوە پێکهاتەی ناوخانەیەکی زیندوو دروست بکات. لەوانەیە هێندەی هیگل نەتوانین باس لە ژیری رەهای گەردوونی (Geist) بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دیسان باسکردنی هەبوونێکی لێکچووی ژیری لە گەردوون، ناکرێت تەواو وەك ناماقووڵییەك ببینرێت. چونکە جگە لە هەبوونی ژیری، ناتوانین لەمیانەی هیچ باسێکی دیکە ئاماژە بە جیاوازیبوون بکەین. بانگەوازی بەردەوامی زیادبوون و فرەچەشنی بۆ ئازادی و بیر هێنانەوەی، پێویستە بەهۆی چەخماخەی ئەو ژیرییە بێت کە لە ریشەکەیاندا هەیە. بەو رادەیەی مەعریفە بڕی کردووە دەشێت مرۆڤ وەك ژیرترین هەبوونی گەردوون پێناسە بکرێت. کەواتە، ئەی مرۆڤ چۆن ئەم ژیرییەی بەدەست هێناوە؟ لە بواری زانستی (جەستەیی، بایۆلۆژی، سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی) مرۆڤم وەك پوختەی مێژووی گەردوون پێناسەکردبوو. لەم پێناسەیەدا مرۆڤ وەك کەڵەکەبوونی ژیری گەردوون پێناسە دەکرێت. لەبەرئەم هۆکارەشە کە چەندین قوتابخانەی فەلسەفی مرۆڤ وەك ماکێتێك یان نموونەیەکی بچووکی گەردوون دەخەنەڕوو.

ئەرمایی و ئاستی ژیری کۆمەڵگای مرۆڤ بناخەی راستەقینەی بونیادنانی کۆمەڵگا پێکدێنێت. لەم روانگەیەوە پێناسەکردنی ئازادی وەك هێزی بونیادنانی کۆمەڵگا لەجێگای خۆیدایە. وەك ئاگادارین" لەسەردەمی یەکەمین جڤاتەکانی مرۆڤەوە ئازادی بە رلوەستەی ئەخلاقی ناوبراوە. لەدۆخێکی وەهادا ئەخلاقی کۆمەڵگا تەنیا لە رێگای ئازادییەوە مەیسەر دەبێت. راستتر، ئازادی سەرچاوەی ئەخلاقە. هەروەها دەشێت ئەخلاق بە دۆخی رەقبووی ئازادی، نەریتەکەی یاخود رێساکەی ناوببەین. ئەگەر ئازادی سەرچاوەی بژاری ئەخلاقی بێت، کاتێك پەیوەندی ئازادی بە ژیری، مەعریفە و ئەقڵ رەچاوبکرێت، ناوزەدکردنی ئەخلاق بە هۆشیاری (ویژدان)هاوبەشی کۆمەڵگا زیاتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. تەنیا لەم چوارچێوەیەدا دەشێ ناوزەدکردنی تیۆری ئەخلاق بە ئەتیك(ئەخلاقناسی) واتابەخش بێت. چونکە لەدەرەوەی بنچینە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا ناتوانین باس لە ئەتیکێك بکەین. بێگومان دەتوانرێت فەلسەفەیەکی پێگەیشتووی ئەخلاق و ئەتیك (زانست)ە کەی لە ئەزموونە ئەخلاقییەکان بەدەست بهێنرێت. بەڵام ئەتیکی ساختە مەحاڵە. وەك دەزانرێت لەم بارەیەوە کانت هەوڵێکی زۆری داوە، کاتێك کانت ئەقڵی پراکتیکی بە ئەتیك ناو دەبات، مایەی تێگەیشتنە. هەروەها لەهەمانکاتدا شرۆڤەو راڤەکردنی ئەخلاق وەك دەرفەت و بژارێکی ئازادی بۆچوونێکە تا رۆژگاری ئەمرۆشمان پەسەندەو پەیرەو دەکرێت.

رایەڵەی نێوان سیاسەتی کۆمەڵگا و ئازادی رەوشێکی بەرچاوە. گۆڕەپانی سیاسی ئەو گۆڕەپانەیە کە ئەقڵە کەهانەتییەکان ـ پێشتر راستییەکان پێشبینی دەکەن ـ زیاترین ململانێی تێدا دەکەن، قاڵدەبنەوە و هەوڵی بەدەستهێنانی ئەنجام دەدەن. لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانرێت وەك ئەو گۆڕەپانە پێناسەبکرێت کە تۆبژە بەشدارەکان لە رێگای هونەری سیاسەتەوە خۆیان ئازادکردووە. هەر کۆمەڵگایەك سیاسەتی کۆمەڵایەتی پێشنەخات، پێویستە باش بزانێت کە بەرامبەرەکەی وەك بێبەشبوون لە ئازادی بەسەریدا دەشکێتەوەو وەك باجێك لێی دەبڕێتەوە. لەم واتایەدا، شکۆداری هونەری سیاسەت رووبەڕوومان دەبێتەوە. هەر کۆمەڵگایەك (کڵان، قەبیلە، قەوم، نەتەوە، چین، تەنانەت ئامێرەکانی دەسەڵات و دەوڵەتیش) سیاسەتی خۆی پێشنەخات مەحکومی ژێرکەوتنە. هەڵبەتە پێشنەخستنی (ئاوانەکردنی) سیاسەت، بەواتای دان نەنانی بەویژدان ، بەرژەوەندییە ژیانییەکان و ناسنامەی خۆی دێت. کەوتن و ژێرکەوتنێکی لەمە قورستر بۆ هیچ کۆمەڵگایەك جێگای باس نابێت. تەنیا کاتێك لەپێناو بەرژەوەندی و ناسنامەی خۆیان و ویژدانی هاوبەشیان رابوونە سەرپێیان، بە واتایەکی دیکە کاتێك کەوتنە ناو تێکۆشانی سیاسییەوە، دەکرێ داواکاری ئازادی ئەمجۆرە کۆمەڵگایانە جێگای باس بێت. داواکردنی ئازادی بەبێ سیاسەت، بەهەڵەداچوونێکی ترسناکە.

بۆئەوەی پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئازادی چەواشە نەکرێت پێویستە بەهەستیارییەوە جیاوازییەکەی لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەت و دەسەڵات (لە راستیدا ناوبردنی بە بێ سیاسەتی راسترە) دەستنیشان بکرێت. دەشێ ئامێرەکانی (دامودەزگاکانی) دەوڵەت و دەسەڵات لەپێناو مەیسەرکردنی کاروبارەکانیان ستراتیژ و تەکتیکیان هەبێت، بەڵام بە واتا راستەقینەکەی سیاسەتیان نابێت. هەڵبەتە خودی دەوڵەت و دەسەڵات لەو سەردەمەدا دێنە ئاراوە کە نکوڵیکردن لە سیاسەتی کۆمەڵگا فەراهەم دەبێت. لەو شوێنەی سیاسەت کۆتایی پێدێت بونیادەکانی دەوڵەت و دەسەڵات دەست بەکاردەبن. دەسەڵات و دەوڵەت ئەو شوێنەیە کە گوتەی سیاسی کۆتایی پێدێت، واتە ئەو شوێنەیە کە ئازادی ون دەبێت. لەوێدا تەنیا ئیدارەکردن، گوێڕایەڵی، فەرماندان و فەرمان وەرگرتن جێگای باسە" یاسا و پەیڕەوی ناوخۆ لە ئارادایە. هەر دەسەڵات و دەوڵەتێك ئەقڵێکی بەستەڵەکە. هێز و لاوازییەکەشیان لەم تایبەتمەندیانەوە وەردەگرن. لە دۆخێکی وەهادا ناشێت و نابێت دەوڵەت و دەسەڵات جێگای بەدواداگەڕان و بەدیهێنانی ئازادی بێت. کاتێك هیگل دەوڵەت وەك گۆڕەپانی راستەقینەی بەدیهاتنی ئازادی پێشکەش دەکات، بناخەی تەولوی بۆچوون و بونیادە باڵادەستەکانی مۆدێرنیتە (فەرمی) دادەنێت. هەروەها فاشیزمی هیتلەر لەسەرووی ئەو نموونانەوە دێت کە چۆنیەتی دەرەنجامەکانی ئەم بۆچوونە روون دەکاتەوە. هەروەها کاتێك مارکس و ئەنگلس

لەمیانـەی چـەمکی سۆسـیالیزمی زانسـتییەوە کـە خۆیـان پێشـەنگایەتییان دەکـرد، دەوڵـەت و دەسەڵاتیان وەك ئامرازی سەرەکی بونیادی سۆسیالیزم پێشبینی کرد، بـەبێ ئـەوەی ئاگـاداری بـن، جەرگبڕترین گورز بوو بەر ئازادی و یەکسانی کەوت. لیبراڵەکان باشتر هەستیان بـە گوتـەی "چـەندە دەوڵەت هەبێت، هێندە ئـازادی کـەم دەبێتـەوە" کـردووە. بۆ سەرکەوتنەکانیشـیان قـەرزداری ئـەم دووربینییەن.

دەوڵەت و دەسـەڵات بـەو سیفەتەی ئامرازەکـانی باڵادەسـتی و زۆرداریـن، وەك پێویسـتییەکی گەوهەرەکەیان، جگە لەو بـەهاو زێـدە ــ بەرهەمانـەی لـەرێگای توندوتیژییـەوە دەسـتیان بەسـەردا گرتووە، واتە جگە لـە جـۆرێکی جیـاوازی کـۆی سـەرمایە هـیچ واتایـەکی دیکـەیان نییـە. سـەرمایە دەکرێت بە دەوڵەت، دەوڵەتش دەکرێـت بـە سـەرمایە. هـەمان خـاڵ بـۆ هـەموو جـۆرە ئامێرەکـانی دەسـەڵات لەجێگـەی خۆیدایـە. چـەندە گۆڕەپـانی سیاسـەتی کۆمـەڵگا (کۆمەڵایـەتی) ئافرێنـەری ئازادییە، بەو ئەندازەیـەش گۆڕەپانـەکانی دەوڵـەت و دەسـەڵاتی گۆڕەپـانی لەدەسـتدانی ئـازادین. لەوانەیە بونیادەکانی دەوڵـەت و دەسەڵات چـەندین کـەس، گـروپ و نەتـەوە دەوڵەمەنـدتر و رزگـار بکات. بەڵام هەروەکو لە نموونەی یەهودیەکاندا بینیمان، ئەمە تەنیا لەمیانەی کۆیلایـەتی و هـەژاری کۆمەڵگاکانی دیکە بەدیدێت. دەرەنجامەکەشـی هـەموو جـۆرە وێرانکارییەکـە، لەجینۆسایدەوە تـا دەگاتــە هــەموو جــۆرە شــەڕە دژوار و مەترسـیدارەکان. لـە سـەردەمی سیسـتەمی جیهـانی سەرمایەداریدا سیاسەت گـەورەترین زیـانی بەرکـەوتووە. لـەم قۆناخـەی کـە سیسـتەمی شارسـتانی ناوەندی درێژایی تەمەنی مێژوو بە لوتکە گەیشتووە، دەشێت باس لەمردنی راسـتەقینەی سیاسـەت بکرێت. لەم سۆنگەوە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بەجۆرێك لەناوچوونی سیاسەت لە ئارادایـە کـە لەگـەڵ هیچ سەردەمێکدا بەراورد ناکرێت. وەك چۆن نەمانی ئەخلاق ــ کە بە گۆڕەپانی ئازادی دادەنرێت ــ دیاردەیەکی رۆژی ئەمڕۆمانە، لەو زیـاتر لەناوچـوونی گۆڕەپـانی سیاسـەت جێگـای باسـە. هەربۆیـە ئەگەر ئازادیخوازین، بەر لەهەموو شتێك پێویستە لە رێگای هێزی رۆشـنبیریمان سـەرلەنوێ ویـژدانی هاوبەشـی کۆمـەڵگا واتــە ئـەخلاق و ئـەقڵی هاوبەشـی (سیاسـەت) لەهــەموو لایەنێکـەوە بیخەینـە سەرپێیان و کارای بکەین، لەمەش زیاتر هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە.

پەیوەندیەکانی نێوان ئازادی و دیموکراسی ئاڵۆزترە. کامـەیان سەرچاوەی ئەویتریانـە جێگـای گفتوگۆیەکی بەردەوامە. بەڵام بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین چڕی هەردوو پەیوەندییش خۆراك پێدەر و تەواوکەری یەکترن. بەو ئەندازەیەی پەیوەست بـە ئـازادی بـیر لەسیاسـەتی کۆمـەڵگا بکەینـەوە، دەتوانین پـەیوەندییـەکەی لەگەڵ دیموکراسیش دروستبکەین. نۆخی هەرە بەرجەستە (کۆنکریتی)ی پۆلیتیکای کۆمەڵگا سیاسەتی دیموکراتیانەیە. لەم سۆنگەیەوە" دەتوانرێت سیاسەتی دیموکراتییانە

وەك هونەری راستەقینەی ئازادبوون پێناسە بكرێت. تا سیاسەتی دیموكراتییانە بەڕێوە نەبرێت، بەشێوەیەكی گشتی كۆمەڵگا، بەتایبەتیش ناشێ هیچ گەل و جڤاتێك پۆلیتیك بێ یان لەرێگای سیاسییەوە ئازادی بەدەست بێنێت. سیاسەتی دیموكراتییانە قوتابخانەی راستەقینەی ژیاندن و فێربوونی ئازادییە. كاروبارەكانی پۆلیتیكا چەندە سۆبژەی دیموكراتی بئافرێنێت، تا ئەو رادەیەش سیاسەتی دیموكراتییانە كۆمەڵگا پۆلیتیزە دەكات، لەم سۆنگەیەشەوە ئازادی دەكات. ئەگەر سیاسیبوون وەك شێوەی سەرەكی ئازادبوون پەسەند بكەین، ئەوكاتە پێویستە بزانین كە چەندە كۆمەڵگا پۆلیتیزە بكەین ئەوەندەش دەتوانین ئازادی بكەین، بەپێچەوانەشەوە چەندە كۆمەڵگا ئازادبكەین ئەوا پۆلیتیزەی دەكەین. بێگومان چەندین گۆڕەپانی كۆمەڵگا هەیە كە خۆراك پێدەری ئازادی و سیاسەتن، سەرچاوە ئایدیۆلۆژییەكانیش لەسەرووی ئەمانەوە دێن. بەڵام دوو سەرچاوەی سەرەكی كە ئافرێنەرو خۆراك پێدەری یەكترن، سیاسەتی كۆمەڵگا و ئازادییە.

زۆرجار پەیوەندی نێوان یەكسانی و ئازادی بەزۆری تێكەڵ دەكرێت. لە راستیدا بەلانی كەم هێندەی پەیوەندییەكانیان لەگەڵ دیموكراسی، پەیوەندی نێوان هەردووكیان ئاڵۆز و بەكێشەیە. هەندێك جار دەبینین كە یەكسانی تەواو لەسەر حیسابی ئازادی بەدیهاتووە. زیاتر جەخت لەسەر ئەوە دەكرێتەوە: ناشێت هەردووكیان بەیەكەوە بەدیبێن، پێویستە یەكێكیان سازش بكات. هەروەها باسی ئەوەش دەكرێت، بۆ دەستەبەركردنی ئازادی هەندێكجار پێویستی بە تەعویزدان لەبواری یەكسانیدا دەبینرێت.

روونكردنەوەی جیاوازی نێوان سروشتی هەردوو دیاردە یان زاراوە، لەپێناو دەستنیشانكردنێكی راست بۆ كێشەكە پێویستە. یەكسانی زیاتر زاراوەیەكی حقوقە. بەبێ جیاوازی كردن لەنێوان تاك و جڤاتەكان، هەمان مافیان بۆ رەوا دەبینێت. كەچی لە راستیدا هێندەی گەردوون، جیاوازی خەسڵەتێكی بنەڕەتی كۆمەڵگاشە. جیاوازێتی دەستەواژەیەكە بەرامبەر بە دابەشكردنی هەمان جۆری ماف داخراوە. ئەوكاتە یەكسانی واتادار دەبێت كەجیاوازییەكان بە بنەما بگرێت. گرنگترین هۆكاری سەرنەكەوتنی چەمكی یەكسانی سۆسیالیستی، رەچاونەكردنی جیاوازییەكان بوو. ئەمەش یەكێك لەهۆكارە گرنگەكانی لەناوچوونی بوو. دادپەروەری راستەقینە تەنیا لەمیانەی چەمكێكی یەكسانی بەدیدێت كە جیاوازییەكان بەبنەما بگرێت.

باسی ئەو خاڵەمان كرد كە ئازادی هۆگریەكی زۆری بۆ زاراوەی جیاوازی هەیە، هەربۆیە تەنیا كاتێك یەكسانی گرێدراوی جیاوازی بێت دەشێت پەیوەندییەكی واتاداری لەگەڵ ئازادی دروست بكرێت. گونجاندنی یەكسانی لەگەڵ ئازادی یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی سیاسەتی كۆمەڵگایە.

بەبێ ئاماژەکردن بە گفتوگۆکانی پەیوەندی نێوان دەستەواژەکانی ئازادی تاك و کۆمەڵ ئەم بابەتە تێپەڕناکەین. روونکردنەوەی پەیوەندی نێوان ئەم دوو پۆلێنە کە وەك ئازادی پۆزەتیف و نێگەتیفیش هەوڵی پێناسەکردنیان دەدرێت، تائێستاش گرنگی و بایەخی خۆی پاراستووە. بێگومان لە دەرەنجامی تێکدانە مەترسیدارەکەی کۆمەڵکاری کۆمەڵگاوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئازادی تاك (ئازادی نێگەتیف)ی خرۆشاندووە. ئاماژەکردن بەو راستییە جێگای بایەخە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ئازادی تاکەکەسی بەلانی کەم هێندەی دیاردەی دەسەڵات سیاسەتی کۆمەڵگای لەناوبردووە. روونکردنەوەی رۆڵی تاکڕەوێتی لە داڕووخاندنی کۆمەڵگا، بەتایبەتیش رۆڵی لەنکوڵیکردن لە ئەخلاق و سیاسەت، کێشە هەرە سەختەکانی گفتوگۆکانی ئازادییە. کاتێك بڵێین ئەو کۆمەڵگایەی لە رێگەی تاکڕەوێتییەوە کراوە بەئەتۆم، توانای بەرخودانی بەرامبەر هیچ ئامێرێکی سەرمایە و دەسەڵات نەماوە، ئەو کاتە باشتر لە مەترسی شێرپەنجەی کێشەکانی کۆمەڵگا تێدەگەین. دەستنیشانکردنی تاکڕەوێتی لیبرالیزم وەك سەرچاوەی سەرەکی لەناوبردنی ئازادی و سیاسەتی کۆمەڵگا، دەشێت زەمینە بۆ پێهەڵگرتنێکی واتادار ئامادەبکات. بێگومان لێرەدا کەسێتی تاك جێگای باس نییە، گفتوگۆ لەبارەی پێویستی کەسێتی تاکەوە ناکەین. ئەوەی گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت، تاکڕەوێتی ئایدیۆلۆژی و لیبرالیزمە، کە لەمیانەی ئایدیالیزەکردنەوە ئازادی و سیاسەتی کۆمەڵگای لەناوبردووە.

هەرچی ئازادی هاوبەشە، لە راستیدا وا خەریکین گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین. پێویستە بەگرنگییەوە ئاماژە بەم خاڵە بکەین: ئازادی راستەقینە بەئەندازەی کەسێتی تاك بە دەستنیشانکردنی ناسنامە، بەدیهاتنی بەرژەوەندی و پاراستنی ئاسایشی هەرجۆرە جڤاتێك (هۆز، قەوم، نەتەوە، چین، پیشە..هتد) دا تێپەڕ دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە واتادار دەبێت. تەنیا کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە ئازادییەکانی تاك و کۆمەڵ لەگەڵ یەکتری گونجان، دەتوانرێت باس لە سیستەمێکی سەرکەوتووی سروشتی کۆمەڵگای ئازاد بکرێت. هەرچەندە ئەو ئازادییەی لیبرالیزم بە واتای تاکڕەوێتی هاری کرد لەگەڵ ئەو ئازادییەی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەناوی هاوبەشێتی خرۆشاندی وەك دووجەمسەری دژ پێناسە بکرێن، بەڵام لەمیانەی ئەزموونی سەدەی بیستەم ئاشکرابووە کە لێکچوونێکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە. هەردووکیشیان بژاری لیبرالیزمن. کاتێك چاودێری ئەو راستییە بکەین کەچۆن گەمەکانی دەوڵەتگەرایی و تایبەتیبوون لەلایەن هەمان دەستەوە پراکتیزە دەکرێت، باشتر دەرك بەوخاڵانە دەکرێت کە خوازیاری ئاماژە پێکردنیانین.

لەدوای تاقیکردنەوەی مۆدێلەکانی تاکڕەوێتی (لیبرالیزمی هۆڤ) و هاوبەشێتی (سۆسیالیزمی فیرعەون) سەدەی بیستەم، کە ماڵوێرانی و کاولکارییەکی گەورەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا،

ئاشکرابووه کە کۆمەڵگای دیموکراتی لەبارترین زەمینەیە بۆ گونجاندنی ئازادییەکانی تاك و ئازادییەکانی کۆمەڵ. دەتوانین بڵێین بەو ئەندازەیەی کۆمەڵگای دیموکرات ئازادییەکانی تاك و کۆمەڵ لەگەڵ یەکدی هاوسەنگ دەکات، گونجاوترین رژێمی سیاسی کۆمەڵگاشە کە لەسەر بنەمای جیاوازییەکان چەمکێکی یەکسانی فەراهەم دەکات.

# هێزی ئەقڵی کۆمەڵایەتی

تا هێزی پەیوەندیەکەی ئاستی ژیری جۆری مرۆڤ لەگەڵ قۆناخی کۆمەڵگای تایبەت بەخۆی دەرکی پێنەکرێت، بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت بەشێوەیەکی شایستە دەرفەتەکانی چارەسەرکردنی کێشە پەیوەندیدارەکانی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنرێت. وەك جۆر دەشێت پێوانەی ماتەوزەی ئاستی ژیری قۆناخی مرۆڤ لەسەرەتادا بابەتێکی قەبلاندن بێ. دەشێت بەمجۆرەش نەبێت. بەڵام دیاردەی شەڕە دژوارەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، کە لەهەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا ژینگەی رووبەڕووی لەناوچوون کردۆتەوە، بەشێوەیەکی زەق ئاشکرای کردووە کە، رووبەڕووی ژیریەکی زۆر جیاوازین. ئاشکرایە و مایەی تێگەیشتنە کە تەنیا لەمیانەی شیکارکردنی چینەکان، راچێتەی ئابووری، تەگبیری سیاسی، توانا زەبەلاحەکانی دەسەڵات و دەوڵەتەوە کاولکارییە کۆمەڵایەتی و ئیکۆلۆژییەکان بەربەست ناکرێت" تەنانەت ئەم واقیعە سەلمێنراویشە. ئاشکرایە کێشەکە پێویستی بەتاوتوێکردنێکی ریشەیی هەیە.

بێگومان بەدرێژایی چاخ و سەردەمەکان هەڵوەستە سەبارەت بەهێزی ئەقڵ کراوە. لەم بارەیەوە شتێکی زۆر نوێ ناڵێم: لەو بڕوایەدام کە سەرنجڕاکێشان بۆ سەر لایەکی جیاوازی ئەقڵ، بایەخەکەی لەهەموو کاتێك زیاتر بووە. پەیوەندی ئەقڵ لەگەڵ کۆمەڵگا ئاشکرایە. کۆمەڵگا گەشە نەکات ئەقڵیش بەرەو پێشەوە ناچێت، ئەمە خاڵێکە هەر چاودێرێکی ئاسایی مێژوو هەستی پێدەکات. ئەو خاڵە سەرەکییەی پێویستە دەرکی پێبکرێت: هەبوونی کۆمەڵگا لەمیانەی کامە هەلومەرجەوە دانی بەمەشروعیەتی ئەقڵەوە ناوە. لەمیانەی هیچ هەلومەرجێکی مەشروعیەتی کۆمەڵگادا دەرك بە روونکردنەوەی ئەو وێرانکارییە ناکرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بە تایبەتیش باڵادەستی سەرمایە ـ فینانسی جیهانگیری قۆناخی نزیك لە رێگای " ئەقڵی هێمایی" یەوە لە دەرەنجامی بەدەستهێنانی قازانجێکی مەترسیدارەوە کۆمەڵگا و ژینگەی تووچارکردووە. بە کورتی و کرمانجی هیچ شێوەیەکی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی و ئازاد، تاڵانکاری " ئەقڵی هێمایی" ئەرێ ناکات. کەواتە بەنداوەکانی مەشروعیەتی کۆمەڵگا چۆن، لەلایەن کێ و کامە زهنییەت و ئامرازەوە پارچە کراوە؟ بەرامبەر بەهێزی رووخێنەری ئەقڵ، رۆڵی ئاواکردن،

چاککردنەوە و قایمکردن هی کێیە؟ ڕێسای کامە زهنییەت لەجێبەجێکردنی ئەم ڕۆڵە بەرپرسیارە و لەمیانەی کامە ئامرازەوەیە؟ ئەم کێشانە ژیانین و مسۆگەر پێویستیان بە وەڵامدانەوە هەیە.

بەگرنگییەکی زۆرەوە هەڵوەستەکردنی والرشتاین سەبارەت بە دەرکەوتنی ئەو ڕژێمەی ناوی سیستەمی ـ جیهانی سەرمایەداری لێناوە، لەلایەنی منەوە جێی بایەخە و بەهەندی وەردەگرم. هەروەها هەوڵەکانی (فرناند براودل)یش سەبارەت بەشیکارکردنی بابەتەکە ئاسۆ فرلولنکار دەبینم، هەروەکو بڵێی تاڵە مووێکی بۆ چل پارچە دابەشکردووە. هەروەها شیکارەکانی (سەمیر ئەمین[1])یش سەبارەت بە سەرمایەداری، بەتایبەتیش ئەو بەشانەی پەیوەندییەکەی بە ڕووخانی شارستانییە ئیسلامییەکان تاوتوێ دەکات، بەشێوەیەکی ڕێژەیی لایەنی فێرکەری هەیە. زۆر لەبیرمەندەکان بەهەستیارییەوە نزیکی بابەتەکە دەبنەوە. ئەو ئەنجامە هاوبەشەی پێیگەیشتوون لە دەورووبەری لاوازی نەریتی دەوڵەت لە ئەورووپا، هەڵوەشانەوەی کڵێسا و ڕووخاندنی شارستانی ئیسلام لەلایەن جەنگیزخانی مەغۆلییەوە، کۆدەبێتەوە. سەرمایەداری کە بە شێری ناو قەفەس دەچوێندرێت، لەمیانەی سوود وەرگرتنی لە کراوەیی دەرگا لەسایەی ئەم هەلومەرجانەوە پەرە دەسەنێت، سەرەتا لە ئەورووپای ڕۆژئاوا زاڵ دەبێت: دواتر بەرێزە هێرشەکانی خۆی بۆ سەر تەواوی ئەورووپا، ئەمریکای باکوور و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە هێرشەکەی بۆ سەر تەواوی جیهان تەواوکردووە. لەکاتێکدا ئەو هێزەی پێشتر لەناو قەفەس بوو، بووە بەحوکمڕانی جیهان، هەرچی فەرمانڕەواکانی پێشووترن خزێنراونەتە ناو قەفەسی ئاسنینەوە. هەرچی قایمکردنی کۆمەڵگایە لەناو قەفەسی ئاسنینەوە کە لەلایەن لێڤی ئەتهانەوە ئەنجامدەدرێت، لەژێر ناوی ئیستیعارە، دەکرێت بە بانگەشەیەك. بە گوتە بەناوبانگەکەی ماکس ویبەر ئەوەی دەکرێتە جێگای باس" کۆمەڵگا لەلایەن بیرۆکراتەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە دەخرێتە ناو قەفەسەوە. تابلۆ ترسناکەکەی کۆمەڵگا بەمجۆرە پێشکەش دەکرێت: ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراش نەبێت، تۆزێك لەرێگای سایکۆلۆژیای تاوانباری و بەشێوەیەکی ترسنۆکانە و چرپاندنیش بێت، تەواوی کۆمەڵناسە بەناوبانگەکان خوازیاری درکاندنی بوون.

خۆم بەشێوەیەکی بەرفراوانتر و لەمیانەی پەیوەندییەکەی بەسیستەمی شارستانی ناوەندییەوە تەماشای کێشەکە دەکەم. تەنانەت لەو بڕوایەدام پێویستە کێشەکە تۆزێکیش

---

[1] سەمیر ئەمین: نووسەرێکی میسرییە، لەمیانەی بۆچوونەکانی سەبارەت بە تیۆرییەکانی سەرمایەداری، جیهانگیری و گەشەی ئابووری ناسراوە. هەروەها بە بۆچوونەکانی سەبارەت بزاوتە ڕکابەرەکانی سیستەم جێگای باسە. یەکێك لە بەرگریکارانی مارکسیزمە.

بەمێژووی گەشەسەندنی ئەقڵی هێمایی ـ ئەنالیتیکەوە پەیوەندیدار بکرێت. بێگومان ئەو هەنگاوەی ئەقڵی ئەنالیتیك لەسەردەمی سیستەمی شارستانی ناوەندیدا هاوێشتوویەتی، ماهیەتێکی زەبەلاحی هەیە. بەڵام تەواوی بونیادەکانی شارستانی کاریگەرییەکی هاوشێوە پیشاندەدەن. هۆکارێکی دیکەی گرنگ: ئەقڵی مرۆڤ تایبەتمەندێتی هێمایی بەدەست دێنێت و بە بەهرەی چارەسەری ئەنالیتیکی دەگات، ئەمەش هێندەی فاکتەری شارستانی بایەخدارە. چونکە ئەوەی دەرگای بۆ فاکتەری شارستانی کردۆتەوە ئەقڵی ئەنالیتیکە.

تەولوی گیانلەبەرەکان تا دەگات بە مرۆڤیشەوە، لەمیانەی ئەو پرەنسیپانەی ئەقڵەوە کاردەکەن کە هەڵە ناکات. ئەم شێوازەی ئەقڵ کە دەتوانین بە ئەقڵی سۆزداری یان سروشتی(خۆڕسك) ناوی ببەین، نزیك بە ئەقڵی شاراوەیە. کاریگەرییەکان بە پەرچەکرداری ساتەوەختی و لەناکاو وەڵام دەدرێتەوە. دۆخی کار ـ کاردانەوەی رووەك و ئاژەڵان لەم بارەیەوە زۆر ئەزموونبەخشە. لەمیانەی شێوازێکی راهاتنەوە ژیانی خۆیان بەڕێوە دەبەن کە بریتییە لە زاوزێکردن، خۆپاراستن و خواردن. هەڵەکردن هێندە کەمە دەتوانین بڵێین نییە. لایەنگیری ئەوەم بابەتەکە بۆ بواری بوونەوەرە بێ گیانەکانیش بگوازینەوە. بۆ نموونە ئەگەر وەك ئەقڵێکی شاراوە ( رەمەکی خۆڕسك) بیر لە هێزی کێشی زەوی (من خۆم ئەو بڕوایەم هەیە) بکەینەوە، ئەوا هەر نۆبژەیەك، تەنانەت تۆزقاڵێکی بەڕادەی هێزی خۆی، هەست بە کاریگەری پاڵنان و راکێشان دەکات. رلکردن لەم کاریگەرییە زۆر سنووردارە. لەوانەیە تەنیا لەئاستی هێزی تیشکدا راکردن جێگای باس بێت. ئەو فەلسەفانەی کە گەردوون بەبێ پرەنسیپ و دەست والا لەقەڵەم دەدەن، بەگوێرەی من زۆر ماقووڵ و جێی باوەڕی نین. هەرچی ئەو بۆچوونەیە کەدەڵێت گەردوون لەمیانەی ژیرییەکی دیاردا جموجۆڵ دەکات، پێویستی بە راوەستە و هەڵوەستەکردنێکی تەواو هەیە.

سەرسوڕهێنەری ژیری مرۆڤ لەوەدایە، توانای پێشێلکردنی ئەم ژیرییە گەردوونییەی هەیە. لەوانەیە لەمیانەی نموونەی تیشکەوە ئەم شێوە ژیرییە (ژیری ئەنالیتیك) وەك باڵابوونێك بۆ مرۆڤ شرۆڤە بکرێت. بەڵام ناکۆکبوونی لەگەڵ زۆر لایەن و قورسی شێوازی ئەقڵی گەردووندا چۆن شیکار دەکەین؟ لەوانەیە " بیرتۆزی کائۆس" تاڕادەیەك بابەتەکە روونبکاتەوە. هەروەکو دەزانرێت لەتیۆری کائوسدا لەناو بێ سیستەمییەکی گەورەدا بە دوای سیستەمدا دەگەڕێن. بەبێ کائۆس ناشێت سیستەم ئاوابکرێت. ناتوانرێت نکوڵی لەلایەنی راستی و مافداری ئەم هەڵوێستە بکرێت. بەڵام لێرەدا کێشە ئەوەیە" لەژێر کاریگەری کائوس (تەنگژە و قەیرانیش)ی کۆمەڵگادا ژیانی مرۆڤ

لەشوێنێکی چۆن و تاچەند دەتوانێت بەردەوام بێت. چونکە شوێن و ماوەی بەرگەگرتنی کۆمەڵگا بەرامبەر بە قۆناخەکانی کائوس سنووردارە. درێژەکێشانی ماوەکە و کاولکاری بێسنووری شوێن (ئیکۆلۆژی دەوروبەر)، بە ئاسانی دەتوانێت کۆتایی بە کۆمەڵگاکان بێنێت. لە مێژوودا تێبینی دەکەین کە چەندین کۆمەڵگا تووچاری ئەم رەوشە هاتوون. هەروەکو دەزانین بەدرێژایی تەمەنی درێژماوە کە مرۆڤ بەشێوەی جڤاتە سەرەتاییەکان بەردەوامی بە هەبوونی خۆیداوە (٩٨٪ماوەی ژیانی) لەناو ئەم زەمینەی کائوسەدا ژیاوە. ماوەی ئەو ژیانەی لەژێر سایەی سیستەمی نیولیتیک و شارستانی بەرێوەچووە بە گشتی لە کۆی ٢٪ ماوەی ژیان کەمترە. بەکورتی، درێژخایاندنی ماوەی کائوس لەوانەیە بە تەواوی کۆتایی بە ژیان نەهێنێت، بەڵام ئەمجارە مەترسییەکە زۆر جیاوازترە. جیاوازییەکی زەق لەنێوان قۆناخی کائوسی پێش شارستانی و سەردەمی شارستانی هەیە. نەك تەنیا بۆ مرۆڤ بەڵکو سەبارەت بە تەواوی گیانلەبەران شارستانی ژینگەی بە سنوورەکانی سامناکی گەیاندووە. رەوشی خراپتریش ئەوەیە ئەو دەسەڵات و سەرمایەی لەهەناوی کۆمەڵگادا هەیە بەشێوازی شێرپەنجە (زێدەڕۆیی لەگەورەکردنی شار و شارگەرایی، گەورەبوونی چینی ناوین، بێکاری، میللیگەرایی، رەگەزگەرایی، زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان) بڵاودەبێتەوە. ئەگەر هەر تەنیا ئەم گەورەبوونەی شێوازی شێرپەنجەیی بەدۆخی ئێستایەوە بەردەوام بێت، ئەوا بە حەسرەتی قۆناخی کڵانی بەر لەشارستانی دەبین. قۆناخی کائوس کە لەگەڵ شێرپەنجەدا هاتووە، لە سیستەمی نوێ زیاتر، دەشێت بە مردنی کۆمەڵگاش ئەنجامگیر ببێت. لەمەدا پێشدلوەرییەکی زێدەڕۆییانە ناکەین. ئەو مرۆڤ و زانایانەی هەست بە بەرپرسیاری دەکەن، رۆژانە دلوەری قورستر سەبارەت بەم بابەتە پێشدەخەن.

لەوانەیە کەسانێك هەبن بڵێن" پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگای شێرپەنجەیی چ پەیوەندییەکی بە ئەقڵی ئەنالیتیکەوە هەیە؟ لە رەوشێکی وەهادا با لە نزیکەوە ئاشنای ئەم ئەقڵیەتە ببین. ئەقڵی هێمایی رۆڵێکی پێشەنگایەتی بینیوە. روونترین شێوەی ئەمەش لەکاتی گوزەرکردن لە زمانی ئیشارەتەوە (جولە جەستەییەکان لەپێشە) بۆ زمانی هێمایی دەبینین. ئیتر لەجیاتی جووڵەکانی جەستە، لەمیانەی کۆمەڵە دەنگێکەوە کە لەسەری رێککەوتوون (پەیوەندییەکی فیزیکی و بایۆلۆژی لەگەڵ مەسەلە ئیشارەت پێکراوەکان نییە) دەتوانن پەیوەندی واتایی ببەستن. با "چاو" بەنموونە وەربگرین" سەرباری ئەوەی مۆڵبوونی دەنگ هیچ پەیوەندییەکی جەستەیی بەچاوەوە نییە، هەرکەسێکی لەگەڵ ئەم پێناسەیە هاوڕابێت، کاتێك دەنگی وشەی "چاو"ببیسێت، چاو دێنێتە ئەقڵی خۆی. دۆزینەوەی زمانی هێمایی بەمجۆرە بووە. هەرچەندە

هەوڵە ئەنترۆپۆلۆژییەکان سەرەتای ئەم زمانە بە گروپەکانی هۆمۆ ساپیانس ببەستنەوە کە بنەچەکەیان بۆ رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەگەڕێتەوە و ئەنجامدەری دوا لێشاوی کۆچن، بەڵام گشتییان لەسەر ئەوە هاوڕان کە ئەقینەوە بنەڕەتییەکەی لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین بووە. بەتایبەتیش گروپە زمانەکانی ئاریان و سەمیتیك ئەم تێزە بەهێز دەکەن.

بونیادی زمانی هێمایی کاریگەریەکی زۆری لەسەر هزر هەبووە. لەوانەیە رزگاربوون لەزمانی جەستە و بیرکردنەوە لە رێگای وشەکانەوە لە یەکەمین شۆڕشە مەزنەکانی زهنییەت بێت. ئەمەش لەکاتێکدا دابڕانی مرۆڤ لە جیهانی ئاژەڵان خێرا دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە تاودانێکی مەزنە بۆ ئەوەی لەدەوروبەری دامەزراندنی زمانی هێمایی کۆببنەوە. چونکە ئەوانەی بەهەمان سیستەمی دەنگەوە قسە دەکەن، هێدی هێدی هەم جیاواز دەبن، هەم هێزی زیری بەدەست دێنن و یەکێتی خۆیان بەرەو پێشەوە دەبەن. لەمیانەی کۆمەکە هێزلکانی ئەم زمانەوە شۆڕشی نیولیتیك ئەنجامدراوە. لەرێگای زمانی نیشارەتەوە گەیشتن بەم قۆناخەی شۆڕش زەحمەت بوو. لەبەرئەوەی زۆر جار باسی ئەوە کراوە کەدواتر چۆن تێپەڕی شارستانی بوون، لێرە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام زانینی ئەو راستییەش سوودبەخشە کە دەشتەکانی میزۆپۆتامیا و بنارەکانی زنجیرە شاخی زاگرۆس ــ تۆرۆس کە بە "هیلالی بەپیت" ناودەبرێت، رۆڵی سەرەکی ئەم پەرەسەندنانەی بینیوە.

ئەوەی ئاماژەمان پێکرد رۆڵی ئەرێنی ئەقڵی هێمایی دەخاتەروو. هەرچی مەترسیەکەیەتی، پێویستە لە دەستپێکردنی دابڕان لە ژینگەدا ببینن. کۆمەڵگاکانی پێشووتر کۆمەڵگای ژینگەی سروشتین. هەروەکو پەیوەندی دایك و کۆرپەکەی، ئەم کۆمەڵگایانەش لەباوەشی سروشتدان. هێزی هزری هێمایی، پێویستی ئەم شێوازەی ژیانی لاوازکردووە. چونکە کۆمەڵگای نوێ لە رێگای زمانە نوێیەکەیەوە ناو لە ژینگە دەنێت، لەم سۆنگەیەوە رێگای نوێی بەکارهێنان دەکاتەوە. ئەم رێگا نوێیە، رێگای هەژموونێکی مەزنە بەسەر جیهانی رووك و ئاژەڵانەوە. شێوازەکانی هزری بەر لەزمانی هێمایی، بەردەوام لەمیانەی ئەقڵی سۆزدارییەوە بەدیهاتوون. سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ئەقڵی سۆزداری: لەرێگای سۆزەکانییەوە بیردەکاتەوە کە فاکتەری دەست لێبەرنەدراوی کار و کاردانەوەکانێتی. لە ناخەوەیە، بێ درۆیە و دوور لە فێڵ و تەڵەکەبازییە. زۆر زەحمەتە ئاماژە بەدایکێك بکەیت لەناخەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکەی نەکات، بەدرۆ و فێڵبازییەوە بێت. زهنی جیهانی رووەك و ئاژەڵانیش بەمجۆرە کاردەکات. لە کاتی بە دەرکەوتنی شێردا، رەنگدانەوەی زهنی ئاژەڵەکانی راو(نێچیر) وەك خۆی لە سۆزەکانیاندا دەبینین. فێڵ لە هەردووکیشیاندا نییە.

بەڵام دەشێت هەزارویەك هێزی فێڵاوی و درۆ(بێبەش لە سۆن) لە زەمانی هێمایی مرۆڤدا بخوێنینەوە. مەترسییە گەورەکەی ئەم شێوازەی هزراندن، لەبنەڕەتدا لەمیانەی تێپەڕبوون بۆ قۆناخی شارستانی وێرانکارییە گەورەکەی خۆی پیشاندەدات.

لە کەڵەکەکردنی دەسەڵات و سەرمایەدا هێزی ئەنالیتیك ڕۆڵێکی دیاریکەر دەبینێت کە لەڕێگای زمانی هێماییەوە بەدەست هاتووە. لەمیانەی بەکارهێنانی هێزەکەی کە پشت بە درۆ و تەڵەکەبازی دەبەستێت و پەیوەندی بەناواخنەوە نییە، هەر لەسەرەتاوە ئەم هێزە توانایەکی گەورەی دیلکردن و چەوساندنەوەی کۆمەڵگا بەدەست دێنێت. هەروەکو دەزانرێت هەردوو بەشی ڕاست و چەپی پێشەوەی مێشکی مرۆڤ سەبارەت بەم دوو ژیرییە خاوەن ڕۆڵن. ئەو بەشەی کرداری هزری ئەنالیتیکی تێدا فەراهەم دەبێت، ئەو بەشەیە کە هەرە دوایی پەرەیسەندووە. ئەولوی بەشەکانی دیکەی جەستە شوێنپەنجەی ژیری سۆزداری لەخۆوە دەگرێت و پێیەوە بارگاوییە. زاڵبوونی بەشی هزری ئەنالیتیك، کاریگەری خۆی دەکاتە سەر ئەو هزرەش کە شوێنپەنجەی بەتەولوی جەستەوە دیارە. ئەم پەرەسەندنەش هەنگاو بە هەنگاو سەرلەنوێ شێوە بەتەولوی کارەکتەری مرۆڤ دەدات. ئەمە پەرەسەندنێکی سەرسوڕهێنەرە. ئەگەر بەلایەنی ئەرێنی بەکاربهێنرێت، دونیا بۆ جۆری مرۆڤ دەکات بە " شوێنی جەژن"ی بەردەوام. بەڵام بەلایەنی نێگەتیڤیش بەکاربهێنرێت، بۆ زۆرینەی زۆری مرۆڤ و گیانلەبەرەکانی ژینگە، دەیکات بەدۆزەخ. هەروەك هێزی ناوکی وایە. بەو مەرجەی باش کۆنترۆڵ بکرێت، بەکارهێنانی ئەم وزەیە بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا، سوودێکی زۆری دەبێت. کاتێك کۆنترۆڵیش نەکرێت لە نموونە بچووکەکەی چەرنۆبڵ[٢] (بەڵام سامناکترەکەی ئەوەیە کە لەشەڕ بەکاردەهێنرێت)دا دەبینرێت ڕێگا لەپێش کامە ئەنجام دەکاتەوە. من تا رادەیەك مەترسی تەقینەوەی ناوکی بێ کۆنترۆڵ لە ئەقڵی ئەنالیتیکدا دەبینم. لەولاتری مەترسییەوە، لەو بڕوایەدام کە بەشێوەیەکی خەست کۆمەڵگا و ژینگەی خستۆتە ژێر بۆردوومانی ناوکییەوە. بەبێ ئەوەی پێویستی بە بۆمبای ئەتۆمی جیاوازتر هەبێت، بۆمباکانی ئەقڵی ئەنالیتیکی ژێرفەرمان و بەردەستی سیستەمی سەرمایەداری جیهان، هەرلەئێستاوە کۆمەڵگا و ژینگەیان بە دۆخێك گەیاندووە کە دەرفەتی ژیانیان تێدا نییە.

---

[٢] چەرنۆبڵ: وێستگەیەکی ناوکییە دەکەوێتە ئۆکرانیا. لە ٢٦ی نیسانی ١٩٨٦ لەو تەقینەوەی گەورەی لێکەوتەوە، لە ئاکامدا دووکەڵێکی شوعاعی ڕەش بڵاو بوویەوە، تەنانەت ژمارەیەکی زۆری وڵاتانی ئەورووپا، ئەفریقیا و ئاسیای گرتەوە، بەمجۆرە گەورەترین ڕووداوی ناوکی لە مێژوودا ڕوویدا. کوژران و بریندارێ زۆری لێکەوتەوە و زیانێکی زۆریشی بە ژینگە گەیاند.

بێگومـان زمـانی هێمـایی و هـزری ئـەنالیتیك سـەربەخۆ لـەخۆڕا خراپـی بارناکـەن" تـەنیا هەلومەرجی گونجاو پێشکەش بە خراپییەکان دەکـەن. ئـەوەی زنجیرەی سـەرەکی خراپییـەکانی دەست پێکـرد، ئـەو پەرەسـەندنەیە کـە لـەبواری ئامێرەکـانی دەسـەڵات و سـەرمایە بـەدیهاتن. سیستەمی کەڵەکـەکردنی دەسـەڵات و سـەرمایە، کـە بـە زاراوەی شارسـتانی ناویدەبـەین، بـەهۆی کارەکتەری ئەو بوونەوەرەی ناویەوە ناچارە درۆزن و تەڵەکەباز بێـت و لـەژێری سـۆزداری بێبـەش بێت. ئامێرەکانی فشار و چەوساندنەوە لەسـەر خـۆراك و ئاسایشـی خـەڵکانێکی تـرەدا ئـاولکراوە. وەك پێویستیەکی سروشتی ژیان، بەپەرچـەکردار وەڵام دەدرێتـەوە. تـەنیا لەمیانـەی ئەو رێگـاوە بەردەوامکردنی مەیسەر دەبێت" یان بـەهێزی نـەرمی ئایـدیۆلۆژیای دابینکـاری مەشـروعیەت، یـان بەهێزی توندوتیژی رووتی دەسەڵاتەوە. راستییەکی مێژووییە کە کۆنترۆڵ بـە زۆری لەمیانـەی ئـەم دوو رێگایەوە ئەنجامدراوە. سەرمایە و دەسەڵات هەبوونێکن کە تەنیا لەرێگای پەنابردنە بەر فێڵ، درۆ و توندوتیژییەوە پەرەیان پێدەدرێت. تەولو لەم قۆناخەدا، بەشی سـەرەکی زهـن هەلومـەرجی گونجاوی پێشکەش دەکات. دەشێت ئەمە بەکاریگەری شێواندن و لاڕێکردنیش ناوببەین.

کاتێـك لەمیانـەی ئـەم پارادایمـەوە تەماشـای مێـژووی شارسـتانی بکـەین، دەبیـنین کـە قاڵبوونەوەکانی لەبارەی چین، شـار و دەسـەڵات، پێکهاتەیـەکی سەرسـوڕهێنەری بونیـادی هـزری ئەنالیتیکی دروست کردووە. چەند وێستگەیەکی مەزن لە قۆناخەکانی شارسـتانیدا جێگـای باسـە. قۆناخەکانی شارستانی کۆمەڵگاکانی میسر و سۆمەر کـە شارسـتانی رەسـەنن و لەسـاڵانی ٤٠٠٠ ــ ٣٠٠٠ پ.ز دەستیان پێکـرد، بونیـادی مـەزنی زهنییـەتی ئانالیتیکیـان ئـاولکردووە، کـە تـا رۆژی ئەمڕۆشمان کاریگەرییـە ئەفسـووناوییەکەیان بەردەوامـە. دەشـێت شـوێنپەنجەی تـەولوی بونیـادە زهنییە ئاولکراوەکـانی درێـژایی مێـژووی شارسـتانی ناوەنـدی لـەم دوو شارسـتانیەدا ببیـنین. لـە ماتماتیکەوە تا بایۆلۆژیا، لە نووسینەوە تـا دەگاتـە فەلسـەفە، لـە ئایینـەوە تـا هونـەر نموونـەی تەولوی ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتیانەی مۆرکی شارستانییان پێوەیە، لەم شارسـتانیانەدا بەشێوە و نۆخە ئۆرژیناڵەکەی بونیادەکەیانەوە دەبینین. قۆناخی گریك ــ رۆمـا ئـەم پرۆسـەیەی بونیادنـانی دەوڵەمەندتر کردووە و ئەقڵمەنـدێتی بونیـادە ئەنالیتیکەکـەی بـەرەو پێشـتر بـردووە. پرۆسـەکانی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری ئەورووپا، کەدوای هەڵمەتە کورتەکەی رێنسانسـی ئیسـلام دەسـتی پێکرد، هزری ئەنالیتیکی گەیاندۆتە لوتکە.

هەڵبەتە لە تەولوی ئـەم قۆناخـە مێژووییانـەدا پێویسـتە کۆمـەکی شارسـتانییەکانی دیکـەش رەچاو بکرێت، لە سەرووی هەمووشـیانەوە شارسـتانی چـین و هیندسـتان. بـەهۆی لۆژیکەکەیـەوە

دەشێت شارستانی پێنج هەزار ساڵە وەك كۆی ئەو قاڵبە میتافیزیكیانە هەڵسەنگێنرێت كە لە دیالیكتیكی ژیان دابڕاوە و وەك ئەنێكی نەخۆشی گەورە دەبێت. بەڵام ئەو پەرەسەندنانەی لەبیناسازییەوە تا مۆسیقا و ئەدەبیات، لە فیزیا تا سۆسیۆلۆژیا، لە میتۆلۆژیاوە تا دەگاتە ئایین و فەلسەفەوە لە بونیادەكانی تەواوی هونەر، فەلسەفە، ئایین و زانستەكاندا لە ئاستێكی زەبەلاحدا كەڵەكەبوونی دەسەڵات و سەرمایە پیشاندەدات، وەك مێژوو دەیانخوێنین. هەرچی شەڕە بەو سیفەتەی پەلامارە سامناكەكانی زەوتكردن و تاڵانن، نەوّمی زەمینی ئەم شارستانیەیە. ئەو ئەقڵەی لەسەرئەم زەمینە هەڵكشاوە، بەواتا راست و واقیعیەكەی گەورەترین بێ ئەقڵییە. یەكێك لە رۆڵەكانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیش، پەردەپۆشكردنی ئەم بێ ئەقلییەیە: ئەقڵی تاوان و شەڕ، ئەقڵی درۆ وفێڵ، بەكورتی ئەقڵی كەڵەكەكردنی دەسەڵات و سەرمایە دەمامك بدات، بە سەرلوژێركراوی پیشانی بدات، واتە پیرۆزی بكات و بیكات بە ئیلاهی. كاتێك لە نزیكەوە لێكۆڵینەوە لەبارەی تەواوی هونەر، باوەڕی و قاڵبەكانی هزری ئانالیتیكەوە بكەین كە بەشێوەیەكی تێكەڵ لەگەڵ مێژووی شارستانی پەرەی سەندووە، دەستنیشانكردنی ئەم راستیانە زەحمەت نابێت كە رەخنەمان كرد.

تەنیا لەژێر رۆشنایی ئەم راستییە مێژووییانەدا دەتوانین چۆنیەتی دەركەوتنی جانەوەری (لێڤی ئەتهانی هۆبز) سەرمایەداری واتادار بكەین. بە بایەخەوە جەخت لەسەر ئەوە دەكەمەوە كە ئەم جانەوەرە تەنیا لەمیانەی سوود وەرگرتن لە لاوازییەكانی سەدەی شازدەهەم لەقەفەس راینەكردووە.

سەبارەت بە بابەتەكە نموونەی ژن شیكار دەكەین و دەمەوێت خاڵێك بۆ ئەم بەشە دابنێم. بێگومان لێكۆڵینەوە فێمینیستییەكان لەمیانەی پێشكەوتنە نوێیەكانەوە كۆمەكێكی گرنگ بە رۆشنكردنەوە و ئاشكرابوونی راستییەكانی ژنان دەكەن. بەڵام لەو بڕوایەدام كە تا رادەیەكی زۆر ئەم خەباتە لەژێر هەلومەرجەكانی باڵادەستی ئەقڵی پیاوسالاری بەڕێوەدەچێت. بەشێوەیەكی رادەبەدەر ریفۆرمخوازە. نیشاندانی هەڵوێستێكی سەرتاسەر و ریشەدار سەبارەت بە بابەتەكە گرنگ و ژیانییە.

لێتوێژینەوە بایۆلۆژییەكان رۆڵی ژن وەك رەگی جۆری مرۆڤ رووندەكاتەوە. ئەوەی لەقەدی سەرەكی دابڕاوە ژن نییە، بەڵكو پیاوە. سۆزدارێتی ژن، هۆكارەكەی بۆ لانەدانی زێدەڕۆییانەی لەدیالیكتیكی پێكهاتەی گەردوون دەگەڕێتەوە. بەتایبەتی لە سەردەمی شارستانیدا هێشتنەوەی ژن لە پێگەی هەرە خوارەوەدا كاریگەری لە گواستنەوەی ئەم پێكهاتەیەی بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان

هەیە. پیاو بەردەوام خوازیارە لەلایەنی ئەقڵەوە، ئەقڵی پڕ لە سۆزی ژن بە "ناتەولو" پیشانبدات، بەتایبەت ئەمەش وەك کارەکتەری ژن بخاتەڕوو. ئەقڵی پیاو چەندین تۆپەراسیۆنی گەورەی لەسەر ژن بەڕێوەبردووە، تائێستاش بەڕێوەی دەبات.

یەکەمیان، کردوویەتی بەیەکەم کۆیلەی ماڵ. ئەم قۆناخە پڕە لە تۆقاندن، فشار،لاقەکردن، سووکایەتی پێکردن و کۆمەڵکوژیی ترسناك. ئەو ڕۆڵەی بۆی دیاریکراوە و دانی پێنراوە، بەو رادەیەی سیستەمی موڵکداری پێویستی پێیە "وەچە" بخاتەوە. ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی تا رادەیەکی زۆر گرێدراوی ئەم وەچەیەیە. لەناو ئەم ستاتۆیەدا ژن موڵکێکی رەهایە. تارادەیەك موڵك و ناموسی خاوەنەکەیەتی، کە ناتوانێت رووی خۆی پیشانی کەسی دیکە بدات.

دووەمیان، ئامرازی زایەندی (سێکس) یە. لە تەواوی سروشتدا زایەند پەیوەندی بە زۆربوونەوە هەیە. ئامانجی بەردەوامکردنی ژیانە. بەڵام بەتایبەتی لەگەڵ بەندکردنی ژن و بەقورساییش لەسەردەمی شارستانیدا، رەگەزی نێرینە جۆری مرۆڤ رۆڵی سەرەکی بەسێکس داوە، تەقینەوەی ئارەزووی زایەندی و پەرەسەندنە شێوێندراوەکەی بەخۆوە دیوە. ماوەکانی جووتبوون کە لەئاژەڵاندا زۆر سنورداره (زیاتر ساڵانەیە)، لای مرۆڤی نێر کەمێك ماوە ئەم ماوەیە ببێتە (رۆژانە) بیست و چوار کاتژمێر. لە رۆژگاری ئەمرۆماندا ژن ئەو ئامرازەیە کە بەردەوام زایەند، ئارەزووی زایەندی و دەسەڵاتی لەسەر تاقی دەکرێتەوە. ئیتر جیاوازییەکانی نێوان ماڵی گشتی — ماڵی تایبەت هیچ واتایەکی نەماوە. چونکە هەرشوێنێك ماڵی گشتییە — ماڵی تایبەتە، هەر ژنێکیش موڵکی گشتی ـ تایبەتە.

سێیەمیان، کراوە بە رەنجدەرێکی بێکرێ و بێبەرامبەر. ئەنجامدانی قورسترین کاری بەسەردا دەسەپێنرێت. خەڵاتەکەشی" ناچارکردنێتی تاوەکو تۆزێکی تریش بچێتە سەر "ناتەولو"ییەکەیەوە. هێندە سووکایەتی پێکراوە، ئەوەی پەسەندکردووە کە بەبەراورد لەگەڵ پیاو زۆر ناتەواوە، بەهەرچوار پەلییەوە خۆی لە دەستی پیاو و باڵادەستییەکەی دەپێچێت.

چوارەمیان، کراوە بە ناسکترین کاڵا. مارکس پارە بە" شاژنی کاڵاکان" دادەنێت. لە راستیدا ئەم رۆڵە زیاتر لە ژندا دەبینرێت. شاژنی راستەقینەی کاڵاکان ژنە. هیچ پەیوەندییەك نییە کە ژنی تێدا پێشکەش نەکرێت. هەروەها هیچ گۆڕەپانێکیش نییە ژنی تێدا بەکارنەهێنرابێت. ئەویش بەجیاوازییەکەیەوە، هەرچەندە هەر کاڵایەك بەرامبەرێکی پەسەندکراوی هەیە، سەبارەت بە ژنیش ئەم بەرامبەرە لە بێ ئابڕوویی " ئەشق"ەوە بیگرە تا دەگاتە درۆودەلەسەی " رەنجی دایکان بەرامبەرەکەی نادرێت" بریتییە لە بێ رێزییەکی مەزن.

ئەقڵی پیاو ( ئەقڵی هەزار و یەک تەڵەکەبازی، درۆ، هۆفێتی شەڕ، گومڕایی ئایدیۆلۆژی، بەکورتی ئەو ئەقڵەی کۆمەڵگا و ژینگەکەی داڕووخاندووە، ئەقڵی ئەنالیتیك (گریمانەیی) کە جگە لە دەنگی تەنەکە هیچ دەنگێکی دیکە دەرناخات) کە شارستانی کردوویەتی بە هۆڤ و جانەوەر، دوای ئەوەی ئەم مامەڵەیەی لەگەڵ ژن گونجاو بینی، کە بەبێ ئەو هەڵناکات، چی بەرامبەر بە کۆمەڵگای مرۆڤ و ژینگەکەی ناکات! بەربەستکردنی ئەم ئەقڵە، تەنیا لەمیانەی جێگیرکردنەوەی سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا لەشوێنی خۆیدا فەراهەم دەبێت، کە ئەم ئەقڵە رووخاندوویەتی. راستتر، تەنیا لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێت هەنگاوی سەرەتا بهاوێژرێت. بەڵام بەهۆی ئەو ئاست و رەهەندانەی ئەقڵی ئەنالیتیك پێی گەیشتووە و رۆڵ لە تەواوی خراپیەکاندا دەبینێت، جارێکی دیکە گرنگی پێشخستنی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی بەرامبەر بە سیستەمەکانی شارستانی وەك ئەرکێك رووبەڕوومان دەبێتەوە. بەخشینی بەهایەکی مەزن بە ئەقڵ پێش هەمووشتێك دێت. ئەقڵی کۆمەڵایەتی راستییەکە. خودی کۆمەڵگا ئەو گۆڕەپانەیە کە ئەقڵی تێدا چڕبۆتەوە. بۆیە بێ ئومێدی هیچ واتایەکی نییە. دەنگێك کە لە گشت پیرۆزییەکانەوە دەچۆڕێت دەڵێت "ئەقڵمان پێ بەخشین، بۆ ئەوەی لە رێگای چاکە بەکاریبێنن، نەك لەرێگای خراپە، ئەوکاتە هەرشتێکتان دەست دەکەوێت کە پێویستیتان پێیەتی". لەراستیدا پێویستە ئەم دەنگە وەربگرین و لێی تێبگەین. تەنانەت دەنگی ویژدانیش کە بەهۆشمەندی کۆمەڵگا ناودەبرێت، هەروەها دەنگە ئەخلاقییە دەست لێبەرنەدراوەکەشی هەمان شت دەڵێن. هەروەها ئەو دەنگەی خوازیارە پێداویستی بیستنی زایەڵەی هونەری ئازادی جێبەجێ بکرێت کە بە سیاسەتی کۆمەڵگا ناودەبرێت، ئەویش هەمان شت دەڵێت. کار و خەباتی کۆمەڵگای دیموکراتی پراکتیکی ئەم دەنگەیە. سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیش تیۆری ئەم دەنگەیە.

بەشەکانی دواتر زیاتر ئامانجیان ئەوە دەبێت بۆ سەرچاوە بەرجەستەکانی ئەم دەنگانە (ئەو دەنگانەی لەیەکێتی ژێری سۆزداری و ئەنالیتیك دەرکەوتوون) شۆڕببنەوە و ئەو رێگە چارانە رۆشن بکەنەوە کە پیشانیانداوە.

# سەرهەڵدانی کێشەی کۆمەڵایەتی

لەدیالیکتیکی سروشتەکاندا ساتەکانی کێشە وەك ئەو قۆناخانە پێناسە دەکرێت کە کەڵەکەبوونی چەندایەتی قەڵەمبازی چۆنایەتی تێدا ئەنجامدەدات. لەکاتێکدا لە سیستەم و تیۆریەکانی پەرەسەندندا ساتەکانی وەرچەرخان وەك ماوەی زۆر کورت پێناسە دەکرێن، بەڵام لە تیۆرییەکانی کائۆسدا نۆخی کائۆس سەرەکییە، هەرچی سیستەم و بەرەو پێشچوونە وەك ساتی سنووردار جەختی لەسەر دەکرێتەوە. بە ئەندازەی بەردەوامی هزرەکانی کائۆس، هزرەکانی پێشکەوتنی بەردەوامیش ئەقڵی مرۆڤیان زۆر سەرقاڵ کردووە. بێگومان وەك چۆن هەندێك لە راڤەکاران ئەقڵی مرۆڤ وەك ئاوێنەی رەنگدانەوە شرۆڤە دەکەن، ئەو بۆچوونانەش کەم نین کە بناخەی هەر ئەقڵێك لە مرۆڤدا دەبینن.

خوێندنەوەی راڤەی رێژەیی و گەردوونگەرایی رەها لەم بۆچوونانەدا زەحمەت نییە. بەو ئامانجەی تۆزێك بەرجەستەتر نزیکی ئەمجۆرە بابەتانە ببینەوە پێویستی تاوتوێکردن و پێناسەکردنی بەرکەوتنی ئەقڵی کۆمەڵگام بینی. لەم سۆنگەیەوە ئەوەی تائێستا هەوڵی پێشکەشکردنی دەدەم، لەمیانەی ئامادەکارییەکەوە کە ئاستی تێگەیشتنی بەرزە، هەنگاونانە بۆ ناو سەرچاوەی کێشەی کۆمەڵگا.

تەواوی قەڵەمبازە گرنگەکانی هزر بەدرێژایی مێژوو وەك بەرهەمی دوو قۆناخ دیار دەبێت: ئەو قۆناخانەی کەوا سیستەم بەڕێڕەوی ئاسایی خۆیدا دەڕوات، خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا جێگای ئاسوودەییە و کێشەی گەورە لە ئارادا نییە، پەرەسەندنی هزریش بەهەمان ئاراستەدا دەبێت. هزرێکن خۆشگوزەرانی دەبەخشنەوە، پێشکەوتنخوازن و کێشەیان کەمە. متمانە دەچێنن. باسی مانەوە و هەمیشەیی بوون دەکەن. کێشەکانیش بە دەرەکی و کاتی دادەنێن. زیاتر باسی سروشتی یەکەم دەکەن. ناخوازن سروشتی کۆمەڵایەتی بکەنە جێگای باس و گفتوگۆ.

هەرچی لەو قۆناخانەیە کە سیستەم دووچاری بنبەستبوون هاتووە و وەك جاران بەڕێوەناچێت، باری هزر پڕ لە کێشەیە. زیاتر باس لە سروشتی دووەم دەکات. ئەم قۆناخانە سەردەمێکن کە لێگەڕینە ئایینی و فەلسەفییە نوێیەکانی تێدا خێرا دەبێت. رزگاربوون لەکێشەکان لە هزرە نوێکاندا دەبینرێت، واتە لە لێگەڕینە ئایینی و فەلسەفییەکاندا دەبینرێت.

دەشێت لێشاوی هزری ئەم قۆناخانەی خۆشگوزەرانی و کێشە ــ کە لە مێژوودا هەلمەتی گەورەی هزری تێدا ئەنجامدراوە ــ لە تەولوی شارستانییەکاندا ببینرێت. لە قۆناخی خۆشگوزەرانییە شکۆدارەکەی کۆمەلگای سۆمەر دەبینە شاهیدی قەلەمبازێکی سەرسوڕهێنەری هزری میتۆلۆژی، کە کاریگەری کردۆتە سەر تەولوی ئاینە مەزنەکان، فەلسەفە و زانست و قوتابخانەکانی هونەر. هیچ ئاینێکی مەزن، چەمکێکی فەلسەفی، چەمکی زانست و هونەر لەئارادا نییە کاریگەری ئەم قەلەمبازە هزرییەی سۆمەری لەسەر نەبێت. قەلەمبازە هزرییەکەی یۆنانستانی کۆنیش پەیوەندی بە کۆمەلگای خۆشگوزەرانی سەرەتاوە هەیە. لەکاتێکدا جوگرافیای بەپیتی میزۆپۆتامیا سەرچاوەی ئەم خۆشگوزەرانییەی سۆمەر پێکدێنێت، لە یۆنانستانیش لەهەردوو کەناری دەریای ئیجە ئەم بەپیتییە فەراهەم بووە. بەرامبەر بە میتۆلۆژیای سۆمەرییەکان، هزری فەلسەفی لە ئیۆنیا دەرکەوتۆتەپێش. هەرچی پێشکەوتنەکانی بوارەکانی زانست و هونەریشە لە ئاستی شۆڕشدایە، ئەوروپای رۆژئاواش لەمیانەی تەقینەوەی خۆشگوزەرانییەکی هاوشێوە، لەسەدەی شازدەهەمەوە قەلەمبازە هزرییە گەورەکەی خۆی لەسەر ئاستی جیهان بەکاریگەر کرد.

ئەو خالەی جێگای سەرنجە، لەهەرسێ ئەزموونی خۆشگوزەرانیدا شۆڕشەکانی هزر هەنگاوەکانی سەرەتایان سەبارەت بە سروشتی یەکەمە. تەنیا کاتێك خێرایی خۆشگوزەرانی نەما و قەیران و تەنگەژەکان تەقینەوە، گفتوگۆکانی سەبارەت بە سروشتی دووەم قورسایی دەکەوێتە سەر، هزر و لێگەڕینی نوێی لێ بار دەکرێت. بەشێك لە بۆچوون و هزرەکان کە بە یادی قۆناخی سیستەمی خۆشگوزەرانی کۆن بارگاوین، بەردەوام بەدوای رابردوودا دەگەڕێن، نوێخوازەکانیش سەبارەت بە تێکچوونی سیستەم و قورسی تەنگەژەکان سکالا دەکەن و هزری خەیالی دەئافرێنن. زۆر باس لەشێوەی نوێی کۆمەلگا دەکرێت. ژمارەیەکی زۆری کۆمەلگاکان لە ئەنجامی ئەم لێگەڕینانەوە ئاوادەکرێن. لە جڤاتە ئاینی و مەزهەبییەکان تا دەگاتە دروستبوونی تیرەو هۆزەکانەوە، بگرە تا دەگاتە پێکهاتە و بونیادی نەتەوە کە لە نموونەی ئەوروپادا دەیبینین، شێوە جیاوازەکانی کۆمەلگا ئاوا دەکرێت.

چاودێریکردنی مێژوو لە رەهەندی مێژووی هزرەوە هەروەکو چۆن ئاشنای کێشە کۆمەلایەتییەکانمان دەکات، لەکاتی چاودێریکردنی کۆمەلگای ئەمڕۆشمان، ناشێت تا مۆخی ئێسقانمان هەست بە قورساییە مەزنەکەی ئاستی کێشەکە نەکەین.

بەبێ وابەستەبوون بە زانستی جڤاکی ناوەندێتی ئەوروپا، هەولی بیرکردنەوە دەدەم. چونکە ئاگاداری پێویستییە زۆرەکەی ئەم شێوازەم. لەوانەیە هەندێك کەس ئەم شێوازەی بیرکردنەوە

بچووك دەبینن و وەك لادان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان هەڵیدەسەنگێنن. هیچ گوێ بەم هەڵسەنگاندنە نادەم. زانستی کۆمەڵایەتی ناوەندگەرایی ئەورووپا لە راستیدا بۆنی باڵادەستی لێدێت. یان باڵادەستت دەکات، یان دەتخاتە ژێر چەپۆکی زۆرداری و باڵادەستییەوە. کەچی ئەوەی بۆ ئێمە پێویستە، بەسۆبژەبوونێکی دیموکرات و دابەشکردنێکی دادپەروەرانەیە. زانستی کۆمەڵایەتی ئەورووپا لەناوەرۆکدا لیبرالیزمە: واتە بۆخۆی ئایدیۆلۆژیایەکە. بەڵام تا رادەیەك ئەم راستییەی خۆی شاردۆتەوە، تەنانەت توانیویەتی بۆچوونی رەخنەگرە گەورەکانی ئۆپۆزسیۆنیش هەرس بکات. کاتێك ئەمە ئەنجامدەدات بەهرە باڵاکەی گونجاندن و پێکەوەلکاندنی پیشاندلوە. بۆنەوەی خۆم نەکەم بە قوربانی ئەم بەهرەیەی گونجاندن و پێکەوەلکاندن، ئاگادارم کە جگە لە پەرەپێدانی جیاوازی هێزی شیکارکردنم، رێگەچارەیەکی دیکەم نییە. بەڵام ئەم هەڵوێستەم دژە ـ ئەورووپاگەرێتی نییە. دژە ـ ئەورووپاگەرێتیش بەشێکی هزری ناوەندێتی ئەورووپایە. بەڵکو لەمیانەی ئەو بڕوایە هەڵوێست پیشاندەدەم کە ئەورووپا لە رۆژهەڵاتە، رۆژهەڵاتیش لە ئەورووپایە: هەڵوێست بەگوێرەی ناسینی بەها گەردوونییەکان پێشدەخەم. چەندین بەهای ئەورووپا ئەمڕۆی بەهاکانی خۆمانە، واتە دۆخی پەرەپێدراوی ئەم بەهایانەیە. پێویستە ئەم خاڵە زۆرچاك بزانین: زۆربەی ئەوانەی خۆیان بەناقۆڵاترین دژە ــ ئەورووپایی دادەنێن، بوونەتە کۆنەپەرستترین لایەنگیری لیبرالیزمی ئەورووپا. پراکتیکی سۆسیالیزمی بونیادنرلو و بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی پڕە لەم نموونانە.

تاقیکردنەوەی سۆسیالیزمی زانستی مارکس و ئەنگلس، وەك رێگەچارەی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆیان پێشخراوە. لەناخەوە باوەڕییان بەمە هێنابوو. واتە باوەڕیەکی تەواویان بەپێناسەکردنی کێشەکان هەبوو: چونکە لەمیانەی پێشخستنی زاراوە و تیۆریەوە، سەرمایەدارییان وەك سیستەمێك پێناسە کردبوو کە بەردەوام نابێت، کاتێك سەرەی سیستەمی سۆسیالیستیش بێت باوەڕییان تەواوبوو کە دەبێتە چۆن چارەسەرییەك. چونکە " سۆسیالیزمی زانستی" گەرەنتی ئەمەبوو کە لەژێر دەستی خۆیان پێشخراوە. بەڵام ئاراستەی مێژوو و پەرەسەندنەکەی بەجۆرێکی دیکە بوو. تۆباوییەکانی پێشووتریش چاوەڕوانییەکی هاوشێوەیان هەبوو. چاوەڕانییەکانی لینین لە شۆڕشی روسیا جیاوازتربوو. چەندین شۆڕشگێڕی فەرەنسیش دووچاری ئائومێدی هاتبوون. شۆڕش چەندین رۆڵەی خۆی خواردبوو. قووڵاییەکانی مێژوو پڕ لە نموونەی هاوشێوەیە. کەچی شیکارکارانی کێشەکان هەم زۆر بە باوەڕ هەم بە ئاگاییەوە جموجۆڵیان دەکرد.

کەواتە هەندێك شتی هەڵە و ناتەواو لە پێناسەکانی کێشەی کۆمەلایەتی و ئەزموونەکانی شیکارکردندا هەیە، بۆیە لادانی گەورە و تەنانەت پەرەسەندنی پێچەوانەش روودەدەن. هەروەکو زۆرجار جەختی لەسەر کراوەتەوە، مەسەلە کەمی کۆشش، یاخیبوون و شەڕەکان نییە. ئەمانە هەن، لەوانەیە گەلێك زۆریشن. ئەم چەشنە بروبیانوانە ناچارم دەکات سەبارەت بە بابەتی پێناسە و چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەلایەتی زۆر بەتەگبیربم. ئەگەر بزانین پەند لە ئەزموونەکان وەربگرین و بەرامبەر بە قارەمانێتییە شکۆدارەکان رێزدار بین، پێویستە ئەو هەنگاوانەی دەیهاوێژین پڕ لە وانە و رێز بارکرابێت.

## أ ـ پێناسەکردنی کێشەی کۆمەڵگای مێژوویی

یەکەمین دووبەشە گەورەکەی بەرگرینامەکەم بەگشتی دەسەلات، بەتایبەتیش سەبارەت بە پاوانی دەسەلاتی سەرمایەداری چڕکردۆتەوە. هەرچەندە کەموکوڕی لەخۆوەبگرێت، بەلام لەو بڕوایەدام کە وەك رێباز زۆرباش سیستەمی شارستانی ناوەندییان روونکردۆتەوە. ئەوەی گرنگ بوو خستنەڕووی ئەلقەکانی پەرەسەندنی بنەڕەتی بوو. هەم بابەتەکان پێناسەکرابوون هەمیش پەرەسەندنی زنجیرەیی کەڵەکەبوونی دەسەلات خرابەڕوو، کە بەشێوەیەکی چڕموەبوو کەڵەکەبوونی سەرمایەش لەخۆوە دەگرێت. کاتێك ئەم دوو بەشەم دەنووسی هێشتا پەرتووکە کۆکراوەکەی (ئەندری گوندەر فرانك)م نەخوێندبوویەوە کە بەناوی سیستەمی جیهانە. ئەوەی خستمەڕوو هەم باسکردن و گواستنەوەیەکی جیاوازی ئەم کۆکراوەیە بوو، هەم بە زیادەوە مەیلی بەستنەوەی چارەسەری بەسیستەمێکەوە بوو، واتە مەیلی بەستنەوەی بوو بە شارستانێتی دیموکراتییەوە. ئەگەر ئێستا بینووسمەوە لەوانەیە کاملتر بکرێت. بەلام وەك پێویستییەکی رێزگرتنی مێژوو بەمجۆرە بمێنێتەوە بەهادارترە.

بابەتی کێشەی کۆمەلایەتی سەرە دێرێکی جیاوازترە. نە ئامانجی پێشکەشکردنی مێژووی دەسەلات ـ پاوانە، نە گفتوگۆ لەبارەی چارەسەری دیموکراتیانە دەکات. ئەوەی هەوڵی تاقیکردنەوەی دەدرێت خستنەڕووی کێشەی کۆمەلایەتییە لەناو ئەزموونە تیۆری و کردارییەکانییەوە. لەو بڕوایەدام کە کۆمەك بە چارەسەرکردنی کێشەکە دەکات. نالێم تائێستا هیچ ئامارەم بە بابەتەکە نەکردووە. چونکە بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ زۆر باسکرا. بەلام بە نۆخێکی یەکپارچەییەوە سەرلەنوێ خستنەڕووی تا بڵێی ئەزموونبەخش دەبێت.

پرسیاری" چۆن کێشەی کۆمەڵایەتی پێناسە بکەین جێگای تێرامانە. هەندێك هزر هەژاری کۆمەڵگا بە کێشە دادەنێن، هەندێکیان بێ دەوڵەتی، بەشێکی دیکەش لاوازی سەربازی، کەسانێکیش هەڵەکانی سیستەمی سیاسی، هەندێکیشیان ئابووری و ئاڵوودەبوونی ئەخلاقی بەکێشە دادەنێن. لەوانەیە تاکە بوارێکی کۆمەڵگاش نەمابێت بە کێشە دانەنرابێت. دەشێت تەواوی ئەم بۆچوونانە لایەنی راستیان هەبێت. بەڵام لە پیشاندانی گەوهەری کێشەکە دوورن. بەبڕوای من خستنەڕووی کێشەی کۆمەڵگا وەك پێشێلکردنی دینامیکی سەرەکی کۆمەڵگا، واتادارترە.

بەبڕوای من دەرخستنی کۆمەڵگا لە ناوەڕۆکی خۆی پێویستە بە کێشەی سەرەکی دابنرێت. لێرەدا بابەتی یەکەم، هەبوونی ئەو بەهایانەیە کە کۆمەڵگایەك دەستنیشان دەکات و هەبوونەکەی بونیاد دەنێت. باسی ئەو بابەتە دەکەم کە خودی هەبوونی پێدەڵێین. دووەمیان، باس لەو پەرەسەندنە دەکەم کە ئەم خودێتییە، هەبوونەکەی لە خودێتی (ناوەڕۆکی) خۆی دەردەخات، بناخەی هەبوونەکەی لەبەین دەبات. ئەگەر ئەم دوخاڵە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەناویەکدا لەئارادا بێت، واتە کێشەی کۆمەڵگا لە ئارادایە و گەورەشە. لەم سۆنگەوە ئەگەر لەسەردەمی کلاندا قۆناخێکی سەهۆڵبەندان تەواوی کلانەکانی لەناوبردبایە، نەماندەتوانی ئەمە بە کێشە ناوببەین. چونکە کارەساتی سروشتی لەدەرەوەی ئیرادەمانە. بۆئەوەی ببێت بەکێشە پێویستە زادەی دەستی مرۆڤ بێت. تەنانەت کێشەی ئیکۆلۆژیش تەنیا کاتێك بە دەستی مرۆڤ پێکهات، وەك کێشە پێناسەی کراوە. لە دۆخێکی وەهادا بەستنەوەی کێشەی کۆمەڵگا بەو هێزانەی کۆمەڵگا لەبناخەوە دەڕووخێنن و هەڵیدەوەشێننەوە، بەرەو پێناسەیەکی راستمان دەبات.

پاوانی دەسەڵات و سەرمایە لەسەرووی تەواوی ئەم هێزانەوەی دەبینم. چونکە هەردووکیشیان لەگەوهەردا وەك زەوتکەری زێدە ـ بەها، هێزێکن کۆمەڵگا لەبناخەی خۆی دەترازێنن. لەمە بەدواوە پاوانی سەرمایە و دەسەڵات بەیەکەوە بە پاوان ناودەبەم. بۆئەوەی بابەتەکە زیاتر رۆشن بێتەوە پێناسەکردنی دۆخی سروشتی، ئاسایی و بێ کێشەی کۆمەڵگا، سوود بەخشە و کۆمەکمان دەکات. کۆمەڵگایەك لە ئاستی کامە جڤات و شێوەدا بژیت بابژیت، ئەگەر بتوانێت بەشێوەیەکی ئازادانە بونیادی ئەخلاقی و سیاسەتەکەی ئاوابکات، دەتوانین ئەم دۆخەی کۆمەڵگا بە کۆمەڵگای ئاسایی یان سروشتی ناوببەین. دەشێت ئەمە بە کۆمەڵگای کراوە یان کۆمەڵگای دیموکراتیش ناوببرێت. لەبەرئەوەی لە بەشەکانی دواتردا زۆرجار باسی دەکەین، بەکورتی دەیڵێم: چارەسەری تەولو وەك کۆمەڵگای لیبرال، سۆسیالیست، دەوڵەت ـ نەتەوە، کۆمەڵگای خۆشگوزەرانی، بەکاربردن، پیشەسازی یان کۆمەڵگای خزمەتگوزاری پێشکەش ناکەم.

چونکە ئەم چەشنە زاراوە و گووتانە تا رادەیەکی مەزن قەبلاندنن. پێناسەیەکن، لە کۆمەڵگای راستەقینەدا هیچ بەرامبەرێکیان نییە. ئەگەر بڵێین هەندێك سیفەتن راستتر دەبێت.

لە رەوشێکی بەمجۆرەدا" دەتوانین بێبەشکردنی کۆمەڵگای ئەخلاق و سیاسەتی ئازاد لەم خەسڵەتە بنەرەتیانە بەسەرەتای کێشەکە دابنێین. هێزی دەستپێکەری کێشەکەش پاوانە. پێویستە چوارچێوەی پاوانیش پێناسە بکەین. ئەگەر لە رێگای کشتوکاڵ، بازرگانی و پیشەسازییەوە زێدە ـ بەها کۆکرابێتەوە کەواتە پاوان دروست بووە، ئینجا ئەمە بە دەستی دەوڵەت بێت یان تایبەت. بێگومان سێیینەی راهیب + پیاوی بەهێز + شێخ کە لەناو گرووپی پاواندا سەرکێشن، پلەدارین. بەرادەی هێزەکانیان سوود لەپاوان دەبینن. ئەم پاوانە سێیینە بەدرێژایی مێژوو بۆ دەزگای زۆر جیاواز و جۆراوجۆر دابەش دەبێت. هەر دەزگایەکیش لەناوخۆیدا دابەش دەبێت، بەڵام لەبواری خەسڵەت و ناوەرۆکەوە کاریگەرییە زنجیرەییەکەیان زیاد دەبێت و تا رۆژگاری ئەمرۆمان دەگوازرێتەوە.

پێویستە بەردەوام کارەکتەری کەڵەکەبوون و زنجیرەی لێشاوی مێژووی پاوان بەرچاو بگرین. شارستانی ناوەندی هەم ئەنجام هەمیش هۆکاری پەرەسەندنی زنجیرەی پاوانە. بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەم بابەتە دەکەمەوە" کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا هزری مۆدێرنیتە تەنگەتاوکردنێکی ترسناکی زەمەن دەسەپێنێت. هەمووشتێك تەنگەتاو کراوە و " لە ئێستا"دا دەخنکێنرێت. کەچی لە بنەرەتدا "ئێستا" مێژووە، داهاتووە. لەمیانەی سەپاندنی ئەم هزرە مۆدێرنیتە لە خۆڕا کۆمەڵکوژی مێژوو ناکات. چونکە بە پێی داخوازیەکانی خۆیەوە ئاراستەکردن و بەرێوەبردنی کۆمەڵگایەکی دابڕاو لە نەریت زۆر ئاسانە. هیچ مێژوویێك هێندەی مێژووی پاوان خاوەنی ئەو بەختەنەبووە، بەشێوەی چڕبوونەوەو زنجیرەیی و گەورەبوونەوە بەردەوام بێت. لەکاتێکدا پاوان بەم چەشنە خۆی دەکات بەخاوەن مێژوو، گرنگییەکی مەزن بە بێ مێژووکردنی جڤاتەکانی تەولوی کۆمەڵگاکان دەدات، راستتر لەناواخنی خۆیدا دەیتوێنێتەوە و دەیانکات بە کۆڵۆنی. لەم پێناوەشدا بونیادە میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستییەکان ئاوادەکات. لەکاتی داڕووخاندنی جڤاتەکان لەبواری ئەخلاقی و گەیاندنیان بەلوتکێك کە نەتوانن سیاسەت ئەنجامبدەن، هەمان هەوڵوکۆشش دەدات.

کاتێك بەشێوەیەکی بەردەوام زاراوەی پاوان بەکاردێنین پێویستە لەبیر نەکەین کە ئەمە لەچوارچێوە ئابووری، سەربازی، سیاسی، ئایدیۆلۆژی و بازرگانیەکەیدا بەکاردێنین. چونکە بەجۆرێك لەجۆرەکان ئەم گرووپانە زێدە ـ بەها لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. شێوە و رادەی

دابەشکردنەکە چۆن و هەرچییەك بێت، ناوەڕۆك ناگۆڕێت. هەندێکجار ئەوانەی بەرهەمی ئابووری دەستەبەر دەکەن، جارانێکیش سەربازەکان، یان ئەوانیتر ـ توێژی سیاسی، گروپی ئایدیۆلۆژی، دەستەی بازرگانی ـ بەرادەی گرنگییان لەبەدەستهێنانی بەشەکانیان خاوەن ران. زاراوە رەها و گشتگیرییەکانی لەجۆری چین و دەوڵەت دەشێت تەمومژ بنێنەوە. هەروەها پاوانیش بەشێوەیەکی روونتر وەك کۆمپانیایەکی فشار و چەوسانەوە رۆڵ دەبینێت. لەدوای ئەو، پێکهاتەکانی چین و دەوڵەت دێن کە بەهایەکی داتاشراون و نەوەی نووەمینن.

ئاواکردنی شار ریزی سێیەمی وەچەخستنەوە(دەرهاوێشتە)کانی پاوانی بەردەکەوێت. شار وەك بڕیارگای چەوساندنەوە و فشاری پاوان سەرهەڵدەدات. هەرچی تێکەڵبوونێتی لەگەڵ پەرستگا، بەهۆی گرنگی لێکەڕینی مەشروعیەتی ئایدیۆلۆژییەوەیە. کەواتە بەو نۆخەی لەمێژوودا ئاواکراوە، بەرلەهەموو شتێك شار وەك پەرستگا، بڕیارگای سەربازی و ناوکی بونیادەکانی جێنشینی بۆرژوازی (بەواتای "شار"، دەتوانین سەرجەم توێژە چەوسێنەرەکانی شار بە بۆرژوازی ناوببەین) دەردەکەوێتە سەر شانۆ. هەرچی قەرەباڵغیەکەی دەوروبەرێتی وەك نووەمین ئەڵقەی دەوروبەری ناوکی قەلاّن، رۆڵی بەندە خزمەتکارەکان دەبینن. هەروەها دەشێت بە چینی کۆیلەش ناو ببرێت.

راستینەی قەلاّ و شوراکان کە لەمێژوودا بەردەوام رووبەڕوومان دەبنەوە، روونترین بەڵگەی سەلمێنەری بونیادی شارەکانی پاوانە. لەنۆخێکی بەمجۆرەدا فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی کێشەی کۆمەڵگامان یەکلاکردۆتەوە: بونیادەکانی شار، چین و دەوڵەتن کە لە دەوروبەری خودی پاوان پێکهاتوون. بەواتایەك لە واتاکان مێژووی شارستانییەکان بڵاوبوونەوەی ئەم پێکهاتە سێیینەیە لەناو زەمەن وکاتدا. لۆژیکەکەی سادەیە: چەندەی دەرفەت و تواناکانی زێدە ـ بەها زیاد بکات، ئەوەندەش پاوانەکان زیاد دەبن، یەك بەدوای یەك بونیادەکانی شار، چین و دەوڵەتی نوێ ئاوا دەکرێن. ئەم بونیادە سەرەکیانە لەهەمانکاتدا نەریتی زۆر وشك دادەهێنن. چیرۆکی شارەکان، نەریتەکانی دەوڵەت و مێژووی خانەدانەکان بابەتێکن هەرگیز باسکردنیان تەواو نابێت. تەواوی ئەوانەی مێشکیان کاردەکات و توانایەکی باشی قسەکردنیان هەیە، وەك سوپای زاناکان بەشێوەیەکی رۆژانە مەشروعیەتی ئایدیۆلۆژی دابین دەکەن. هەموو جۆرە ئەفسانە، داستان و چیرۆکێك هەڵدەبەستن. لە ئاواکردنی خودلوەندەکانەوە ( خودلوەندەکانی شار، خودلوەندەکانی شەڕ) تا دەگاتە ئافراندنی شەیتان و جنۆکە، لە تابلۆکانی بەهەشت ـ دۆزەخەوە تا دەگاتە داستانە ئەدەبییەکان، بوارێك ناهێڵنەوە کە دروستی نەکەن و هەڵینەبەستن. بونیادە سامناکەکانی

گۆڕستان، کۆشک، پەرستگا، شانۆ و ستادیۆم کە لە زیادەی رەنجی مرۆڤ ئاوادەکرێت، لە نمایشکردنی هێزی پاوان زیاتر شتێکی تر نییە. جگە لە دیلە بریندارەکان، لەناوبردنی تەولوی گەلێك، هۆزێك، شار و گوندێك بەسەرجەم دانیشتوانەکانییەوە لە ئاکامی شەڕەکاندا، یەکێك لە نەریتەکانی پاوانە. هەڵبەتە هەرشتێکی گوزارە لەبەهای ئابووری بکات، لەمێژە وەك غەنیمەتی شەڕە پیرۆزەکان لە پەرتووکی پیرۆزی پاواندا نووسراوە.

گفتوگۆیەکی گرنگی سەرهەڵدانی کێشەی کۆمەڵگا، سەبارەت بە شێوازی پاوانی شارستانی دوای شۆڕشی کشتوکاڵە، واتە شێوازی بەرهەمە سێیینەکە ( شار، چین، دەوڵەت ). بەگوتەیەکی دیکە، ئایا دوای قۆناخی کۆمەڵگای نیولیتیك، بەم شێوازەی ئێستای قۆناخی شارستانی (ئەو پەرەسەندنەی بە کۆمەڵگای کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی و سەرمایەداریش ناودەبرێت ) ناچارییەك بوو؟ ئایا بەبێ ئاواکردنی شارگەرایی دەوڵەتی ـــ چینایەتی کۆمەڵگای نیولیتیك دەرفەتی قەڵەمبازی بۆ قۆناخێکی سەرووتر نەبوو؟ ئەگەر دەرفەت هەبوو، ئەی بۆچی بەرەوپێشەوە نەچوو؟ هەرچەندە ئامانە وەك پرسیاری گریمانەیی و قەبلاندن هەڵسەنگێنرێت، بەڵام سەرنج رادەکێشێتە سەر بابەتی گرنگ. لەبەرئەوەی بابەتەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان لەبەشی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت، ئەو وەڵامە کورتەی بیدەمەوە ئەوەیە: گرێدراوی شێوازی لێکۆڵینەوەمانە سەبارەت بەسروشتی کۆمەڵایەتی. بەگوێرەی پارادایمەکانی شارستانی زاڵ، پێویستە پەرەسەندنەکان بەگوێرەی هێڵی لەچارەنووسرلو بێت. هەرشتێك بەگوێرەی پێویستی قەدەرە. چی لە چارە نووسرابێت ئەوە روودەدات. تەولوی گریمانە میتافیزیکییەکان ئەم بانگەشەیە دەکەن.

هەرچی ئەنالیزەکانی شارستانێتی دیموکراتییە، راڤەکانی سەبارەت بە شارستانی و شێوەی کۆمەڵگاکانی ناواخنی، هەروەها هەڵوێستەکانی دەرهەق بەردەوامی و وەرچەرخانی کۆمەڵگای نیولیتیك جیاوازترە. بەکورتی" راستینەی کۆمەڵگا بەوچەشنە نییە کە زانستی کۆمەڵایەتی ناوەندێتی ئەوروپا روونی کردۆتەوە. دەشێت راڤە و شرۆڤەی نزیکتر لە راستی پێشبخرێت. کۆمەڵگا زۆر لەوە جیاوازتر پێکدێت کە هەوڵی باسکردنی بدەرێت. بینینی جیاوازی نێوان چیرۆك و راستی، هەروەها دەرککردن بە پەیوەندی نێوان چیرۆك و شارستانی ناوەندی باڵادەست، بایەخێکی مەزنی هەیە. چەندین شیکاری پۆلێنکاری کە بەناوی زانستی کۆمەڵایەتییەوە پێشکەش دەکرێن و وەك راستی سەلمێنرلو بێ گفتوگۆ دەسەپێندرێن، لایەنی پروپاگەندەیان لەپێشە. ئامانجیان پەردەپۆشکردن و شاردنەوەی راستییەکانە. چەندین رەوت و قوتابخانەی زانستی

کۆمەڵایەتی، بگرە ئەوانەش کە لەژێرناوی سۆسیالیزمی زانستی پێشکەش دەکرێن، لەژێرکاریگەری قورسی لیبرالیزمدان. تاکو ئەم بابەتانە ڕۆشن نەکرێنەوە، ئەو وەڵامانەی بشدرێنەوە لایەنی هەڵەیان لە پێشتر دەبێت.

بەمجۆرە پێناسەکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان لە شوێنە راستەقینەکەی دەرکەوتنیدا، شانسی شرۆڤەیەکی واقیعیتر بۆ قۆناخەکانی پەرەسەندنی دەرەخسێنێت. بەبێ ئەوەی بەشێوەی پۆلێنە سەرەکییەکان دابەش بکرێت، خستنەڕووی کێشەکە بەشێوەی قۆناخە سەرەکییەکان، چونکە کێشەکە لەناو گشتێتیدا پیشاندەدات، فێرکەر و ئەزموونبەخشترە.

أ ـ دەشێت یەکەمین قۆناخی کێشەی گەورەی پاوانی شارستانی لەنێوان ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز ـ ٥٠٠ ی زایینی جێگیر بکەین. پاوان ڕێکخستنی تاڵانکردنی زێدە ـ بەهای زۆری کۆمەڵگایە لە هەلومەرجە جیاوازەکانی کات و شوێندا، کە لەمیانەی پەیڕەوە جیاوازەکانەوە ئەنجامدەدرێت. لەمیانەی ئەو پەیڕەوانەی (ڕێکخراوە) کە دەکرێت بە سۆسیالیزمی فیرعەونی ناوی ببەین لە ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز بەدواوە لە کۆمەڵگاکانی سۆمەر، میسر و هەراپا زێدە بەهایەکی سەرسوڕهێنەر بەدەست دێنێت. یەکەمین مۆدێلی کەڵەکەبوونە گەورەکەی سەرمایەیە. بەگوێرەی کۆمەڵگای نیولیتیك بەپیتییەکی بێ وێنە بەدەستهاتووە. بەم بەرهەمە بەپیتە شار، چین و دەوڵەتی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئاراوە. ئەگەر لەڕێگای پەیڕەوەکانی توندوتیژییەوە بێت یان لەڕێگای پاوانی بازرگانییەوە یەکەمین سەردەمی چەوسانەوە لەسەر تواناکانی زێدە ـ بەرهەمەوە دەست پێدەکات کە لەمێژە لەکۆمەڵگای نیولیتیك دەستی پێکردووە. بێگومان لە سۆسیالیزمی فیرعەوندا بەرامبەر بە سك تێرکردنیان چەوساندنەوەی ئەو کۆیلانە مەرجە کە وەك جۆرێکی جیاوازی ئاژەڵان کاریان پێدەکرێت. بەکورتی بەم شێوەیە یەکەمین ئەڵقە ڕەسەنەکەی چەوسانەوەی ناوەند ـ کەناری ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دادەنرێت. لەژێر ڕۆشنایی ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان دەشێت بە داپۆشراوی و بەهەموو ڕووتییەکەیەوە پەرەسەندنی بەم جۆرەی کۆمەڵگای سۆمەریش ببینرێت.

بێگومان ئەم شێوازەی زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم و بەرهەمهێنان وەك ئەو خەنجەرەی لەهەناوی کۆمەڵگا دراوە ڕێگای لەپێش کێشەی قورس کردۆتەوە. مێژووی ئایین و میتۆلۆژیاکان پڕ لە چیرۆکی ئەم کێشانەیە. ئەگەر نموونە بێنینەوە، یەکەمین داستانی گلگامیش، تۆفانی نوح، ئەفسانەکانی ئادەم ـ حەوا ، هابیل ـ قابیل[1]، گریمانی بەهەشت ـ دۆزەخ و خودلوەندی پیاو

---

[1] ئەفسانەی هابیل و قابیل: دوو کەسایەتین لە پەرتووکە پیرۆزەکاندا ناویان هاتووە. یەکەمین دوو کوڕەکەی ئادەم و حەوان. قابیل جووتیار بووە، هابیلیش شوانکارە. ڕۆژێکیان بڕیاری عیبادەتکردنی خوداوەندیان داوە، قوربانییان پێشکەش کردووە. قابیل

ئەنکی ـ خوداوەندە ژن ئینانا، لەکاتێکدا لەژێر باسی ناکۆکی نێوان شوان ــ جووتیار پێشکەش دەکرێت، زۆر ئاشکرایە خوازیارە ئەو خەنجەرلێدانانە پیشانبدات کە پاوانی بێ بەزەیی ڕێگای لەپێش کردۆتەوە، واتە خوازیارە زەوتکردنی ئەو زێدە ــ بەهایە پیشانبدات کە لەڕێگای چاودێریکردنی زۆردار و هۆڤانەدا دێنە ئاراوە.

لەکاتێکدا چەندین چیرۆکی لەژمار نەهاتووی هاوشێوە کارپێکردن و تالآنە مەترسیدارەکە دەگێڕنەوە، هەڵبەتە زمانێکی شاراوە بەکاردەهێنرێت. پێویستە باش بزانرێت کە لەو قۆناخەدا زاڵبوونی ئایدیۆلۆژی بەلانی کەم هێندەی زاڵبوونی جەستەیی بەکاریگەربووە. ئەگەر بە ڕاستی مێژوو بە زمانی تاڵانکراو و چەوساوەکان نووسرابایە، هیچ گومانێکی تێدا نەبوو ئەوکاتە ڕووبەڕووی ڕابردوویەك دەبووینەوە زۆر لەوە جیاوازتر بێت لەوەی کە پێشکەشمان کراوە.

تەنیا ئەو کۆیلانەی لە ئەهرامەکانی فیرعەونی میسر(ئەمە گۆڕەکانیانە، ئەی دەبێ کۆشکەکانیان چۆن بووبێت) کاریان پێکراوە ژمارەیان ملیۆنێك تێپەڕ دەکات. ئەمانە لەکاتێدا بەکۆمەڵ لەشوێنێکی وەك کێڵگە(ئاخوڕ) ی ئاژەڵاندا دەهێڵرانەوە، هێندەی ئاژەڵیش سکیان تێر نەدەکرا، بەزەبرە کوشندەکانی قامچییەوە لەئاولکردنی ئەو بونیادە مەترسیدارانەدا بەکاردەهێنران. کاتێك کۆیلە ـ ئاژەڵەکانی موڵکی خۆیان بەمجۆرە بەکاردەهێنا، لقی سەربازی پاوانیش هێرشی بۆ سەر جڤاتەکانی دیکەی دەرەوە ڕێکدەخست، تەنیا بە زەوتکردنی زەوی و شتومەکەکانی ئەم جڤاتانە نەدەوەستان، لەدەرەوەی ئەوانەی دەیانکوشتن، ئەوانەی سوودبەخشیان دەبینین بە دیلی دەیانبردن. تەواوی بونیادی ئەو قەڵا، شورا، گۆڕستان، ئارانا، کۆشك و پەرستگا سەرسوڕهێنەرانەی بینەرانی ڕۆژی ئەمڕۆشمان واقی وڕ دەهێڵێت، بەمجۆرە بیلانە ئاواکراوە. ئەگەر بەملیۆنانیان لە کشتوکاڵی ئاودێری ( لە ڕێگای یەکەمین جۆگەلەکانی ئاو ) نەخرابانایە ناو کارەوە، بەدەستهێنانی زێدە ــ بەرهەمێکی هێندە زۆر و، ئاواکردنی بونیادە زەبەلاحە بەردینەکان ئاستەم بوو، هەروەها ژیانی بەهەشتییانەی پاوانیش نەدەخرایە ژێر گەرەنتییەوە.

بەڵام ئەو باسانەی ڕیشەکەیان بۆ شارستانی ناوەندی ( لە هەژموونگەرایی شارستانی سۆمەر لەمیزۆپۆتامیا تا شارستانی هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان)

---

یەکێك لە بەرووبوومەکانی زەوی وەك قوربانی پێشکەش کردووە. هابیلیش مەڕێکی کردۆتە قوربانی. خوداوەند خێرەکەی قابیلی پەسەند نەکردووە، چونکە پێچەوانەی داواکاریەکەی (سەربڕین و خوێن ڕشتن) بووە. بەمجۆرە قابیل تووڕە دەبێت و هابیلی برای دەکوژێت.

دەگەڕێتەوە، بەو ئامانجەی ئەم قۆناخە ترسناکە بەشێوەیەکی جیاوازتر پیشانبدەن، بەهەمان سەرسامییەوە چەندین دامەزراوی سەرخان پێشدەخەن لەسەررووشیانەوە ئایدیۆلۆژیاکان. بەتایبەتیش ئەقڵی ئەنالیتیك بەپیتترین قۆناخی بەخۆیەوە بینیوە. لەژێر پێشەنگایەتی پاواندا راهیب لە ئۆتۆپیاکانەوە تا دەگاتە پێشخستنی تابلۆکانی بەهەشت ـــ دۆزەخ: ئەگەر بەس نەبووبێت، لەروونکردنەوە فەلسەفییەکانەوە تا دەگاتە زانست و رووخسارەکانی سروشت و ئەو زانیاری و دانایانەی چاك وەڵامدەدەنەوە، وەلامیان پێشخستووە. بۆ ئەوەی بە ئاسانی بەڕێوەبەرایەتی بکەن، یەکەمین هەنگاویان بۆ نووسین، ماتماتیك، ئەسترونۆمی و بایۆلۆژی هاویشتووە. لەپێناو فەراهەمکردنی ئاسوودەیی زیاتری چینی پاوان، لەمیانەی لێگەڕین بەدوای دەرمانەوە بناخەی زانستی پزیشکی دانراوە. گەڕانی گلگامێش بەدوای " رووەکی نەمری" بەجۆش و خرۆشترین بەشی داستانەکەیە. بیناسازی بونیادی بەردین، تەکنیکی ئاوالکردنی بونیادە نەمرەکانی لەپێناو نەمران پێشخستووە. کاتێك میتۆلۆژییەکان کورتیان هێناوە، قۆناخی ئایینە دۆگماتیك و وشکەکانیان دەست پێکردووە. بۆ دڵدانەوەی ئەو مرۆڤانەی ئاخێنراونەتە ناو رەوشێکی مەترسیدارەوە ئەو خوداوەندانە ئافرێنراون کە خەیاڵی پاشا ـــ خوداوەندەکان پیشاندەدات. لەوانەیە ئەقڵی ئەنالیتیك گەورەترین شاکاری خۆی لەمیانەی تێپەڕبوون بۆ ئەم ئایینە تاکخوادییانە پێشکەش کردبێت.

هەر تەنیا رێگا لەپێش کێشەی کۆمەڵگا نەکراوەتەوە: بەڵکو بە ترسناکترین شێوەکانیەوە کێشە خوڵقێنراوە. وەك دێوەزمە بەسەر کلتووری ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگا داتەپیوە. هەر لەو قۆناخەوە زمانی سۆمەری واتای "گەڕانەوە بۆ سروشت ـ دایکی پیرۆز"ی لە گوتەی " ئەمارگی" بارکردووە. مرۆڤایەتی رووخێنرا و بەدۆخێك گەیەنراوە بەحەسرەتەوە بە مۆم بە دوای رابردوودا بگەڕێت. ساتێك زووتر مردن بۆ گەیشتن بەبەهەشت، بۆ پایەی ئایدیۆلۆژی هەڵکشاوە. ژیانی بەهەشتانەی قۆناخی نیولیتیك کە لەسەر ئەرزی واقیع پێکهێنرابوو، ئیتر کراوەتە بابەتی ئۆتۆپیاکان و دونیاکانی دیکە. چەمکی سکۆلار و دونیایی جێگای خۆی بۆ ئەو چەمکانە بەجێهیشتووە کە جگە لە ئاخیرەت بیر لەشتێکی دیکە ناکاتەوە. بەرامبەر بەم کێشە ترسناکە دونیا تەواوی دەوڵەمەندێتی و هەمەڕەنگیەکەی ناوی لەدەستداوە، خراوەتە دۆخێکەوە وەك شوێنی ئەشکەنجە و ئازارکێشان ببینرێت.

لەمیانەی ئەم کێشەیەی پاژانەوە ئەخلاقی کۆمەڵگا و سیاسەت یەکەمین زەبری کوشندەیان بەرکەوتووە. لەکاتێکدا بوارەکانی ئەخلاق و سیاسەت وێران دەکرێت کە بەردی بناخەی کۆمەڵگای

کۆمینـالێن، لەسـەرەوە سیاسـەت (دەوڵـەتی خـودایی) و ئـەخلاق (لەراسـتیدا بـێ ئـەخلاقی) ی باڵادەسـتی تایبـەت بـە جڤاتـە سـنووردارەکانی ئەندامانی پـاوان زاڵکـراوە. مسـۆگەرە بەرلـەوەی سیاسەت و ئـەخلاقی کۆمـەڵگا بەرەوپێشـەوە بچێت دووچـاری رووخـان هـاتووە. سەرشـێتی یـان چلێسـی ژیـانی باڵادەسـتەکان و بانگەشـە ئیلاهییـەکانیان وەك سیسـتەمی خـودایی لـەجێگایان دانراون. تەنیا ئەو مافە بۆ کۆمـەڵگا هێڵراوەتـەوە کـە ئـەم باسـانە وەك بـاوەڕی پـیرۆزی پەسـەند بکات.

وەك دەبینرێـت تـەنیا کێشـەی کۆمـەڵگا نـە ئـافرێنراوە، بـەڵکو لەمـەش زیـاتر، کۆمـەڵگا لەناوەڕۆکی خۆی خبڵێکراوەتەوە، کراوە بە کێڵگەی ئاژەڵانی تایبەت بە پاوان. هەڵبەتە بەندایەتی ــ کۆیلایـەتی وەك رژێمێکـی وابەسـتە سـەپێنراوە و پەسـەندکراوە. هەرچـی کۆیلایـەتی ژنـە کـە رەگەکانی بۆ کۆن بۆ سەردەمی پلەداری سەرەتایی درێژدەبێتەوە بـووە بـە بـەرفراوانترین بابـەتی ژیان. هەروەك بڵێی تۆڵە لە کۆمەڵگای نیولیتیکی دایکانە و دایکی پیرۆز دەکاتەوە، سیستەمەکانی خوداوەندە پیاوە باڵادەستەکان ئاواکراوە. لەکاتێکدا هێدی هێدی خوداوەندێتی ژن شوێنپەنجەی خـۆی ونـدەکات، سـەردەمی باڵادەسـتییە سەرسـوڕهێنەرەکەی خوداوەنـدە پیاوەکـان دەسـتی پێکراوە. هەر لەو قۆناخەوە ژن هەم لەتەوڵوی پەرستگا، هەم لەماڵە گشتییە ئاساییەکاندا ناچاری سۆزانێتی کراوە، بەندکراوەو کراوە.

وەك تێبینی دەکرێت ئەو قۆناخە بەپێتەی لەمیانەی ئامرازەکانی ئاودێری ئەوکاتە بـەدیهاتبوو لە کۆتاییەکانی سالانی ٢٠٠٠ پ.ز کەوتۆتە ناو تەنگەژەیـەکی قورسـەوە. هـەمیش وشـکبوون هـەم خوێداربوونی خاك کاریگەریان لەسەر ئەم قۆناخە هەبووە. بەڵام لەبنەڕەتدا دوای دووهـەزار سـاڵ، قرتانی بنەماکانی دامەزراندن بەهۆی پراکتیکی کۆمەڵگاوە، سروشتییە. هەراپا لەمێـژە پەرتـەوازە و بێدەنگ بووە: میسریش بەهۆی ناکۆکییە قووڵەکانیـەوە بـە دۆخێـك گەیشـتووە چیتر بـەردەوام نابێـت: هەرچـی سـۆمەرییەکانن وەك گرووپـی ئـەتنیکی دەسـەڵاتدار لەمێـژە جێگـای خۆیـان بـۆ شارستانی گروپە ئەتنیکییەکانی دیکە بەجێهێشتووە.

سیستەمی شارستانی ناوەندی ئەو قۆناخە، بۆ چارەسەرکردنی ئـەو کێشـە قورسـانەی خـۆی رێگای لەپێشکرتۆتەوە دوو رێگای گرنگی تاقیکردۆتەوە: یەکـەمیان" پەلهاوێشـتن بـەرەو دەرەوە. قۆناخی کۆلۆنیکردن و ئیمپریالیست بوون کە دواتر زۆرجار رووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەمـەش تـەنیا چارەسەری کاتی بۆ کێشەکان دێنێت. بەڵام لە خولقاندنی کێشەی نوێش رزگاری نابێت. نـەك هـەر کێشەکان چارەسـەر نەکراون، بەپێچەوانەوە بەڵکو زیـاتر بڵاوبۆتـەوە و چڕبۆتەوە. هـەناردەکردنی

کێشە قاڵبووەکانی ناوەند و مەترەپۆلەکان بۆ دەرەوە، دوای ئارامییەکی ڕێژەیی بە زیادەوە بۆخۆی دەگەڕێتەوە. لەمێژوودا بەردەوام لەمیانەی جێگۆڕکێی ناوەند و کەنار ئەم خەرەکە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

بەبڕوای من مەترەپۆلەکانی سۆمەر (ناوەند) لە سێ لایەنەوە، تەنانەت ئەگەر دەریاشی بخەینەسەر لەچوارلاوە هەناردەکردنی جێگای باسە. یەکەمین بەرهەمی پەلهاوێشتنەکەی بەرەو ڕۆژئاوای میسری نیلە. ئەگەری چاوەڕوانکراو ئەوەیە سەرەتا میسر وەك کۆلۆنییەك پەرەیسەندووە، دواتریش بە شێوەیەکی سەربەخۆ پەرەیسەندووە. بەبێ یارمەتی دەرەوە، لە جوگرافیایەك کە هەرچوارلای داخراوە سەرهەڵدانی شارستانییەکی لەجۆری میسر شیمانەیەکی زەحمەتە. پەلهاوێشتنی سۆمەرییەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتیش لەکەنارەکانی ڕووباری سند هەراپای خولقاندووە. هەمان هەڵوێستمان سەبارەت بە هەراپاش لەجێگای خۆیدایە. ئەگەر یارمەتی دەرەوە نەبێت، هەراپا تەنیا دەبووە پەرجوویەکی بیابان. لەمیانەی هەڵوێستێکی هاوشێوەوە ڕوونکردنەوەی یەکەمین پادشایەتی چین لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز واقیعی و ئاقڵانەترە. هەر لە یەکەمین دەرکەوتنیدا پەیوەندی ناوەند ــ کەنار لە کردەوەی شارستانیدا خەسڵەتێکی بنەڕەتییە. گۆڕەپانێکی گرنگی پەلهاوێشتن بەرەو ڕۆژهەلات ، شارستانێتی ئیلام ــ سوسە کە درلوسێی سۆمەرییەکانە و دەکەوێتە سوسیاناى ئێرانی ئەمڕۆمان. بەڵام پەلهاوێشتنی بەرەو باکوور، لە ڕێگای بابل و ئاشووری نزیك بە ناوەندەوە، لەلایەن دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی شۆڕشی نیولیتیکەوە، واتە لەلایەن ئاریان ــ هۆرییەکانەوە بەرەو میزۆپۆتامیای سەروو ئەنجامدراوە.

بەردەوام لەلایەن سۆمەر، ئەکەد (قۆناغی گرووپی ئەتنیکی بە ڕیشە سامی)، بابل و ئاشوور هەوڵی کۆلۆنیکردن و داگیرکردنی هۆرییەکان دەدرێت، لەوانەیە یەکەمین و گەورەترین بەرخودانی خۆیان بەرامبەر ئەم یەکەمین شارستانییە ناوەندییە ڕەسەنە ئەنجامدابێت. دەشێت ئەم قۆناغە لە تابلێتەکانی سۆمەردا ببینرێت. تەنانەت داستانی گلگامێشیش بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا باس لەوە دەکات کە پەلاماری یەکەم بۆ ناوچە دارستانییەکانی باکوور ئەنجامدراوە. هەڵبەتە ئێراق ــ ئورووکی سەردەم کە تائێستا دەکوڵێت، بەشێوەیەکی زەق و بەکاریگەر بەردەوامی ئەم ڕاستی و نەریتە پیشاندەدات. ناکۆکی نێوان کوردی بەڕیشە هۆری و عەرەبی بەڕیشە سامی لەوانەیە ڕەنگدانەوەی ئەو تایبەتمەندێتیانە بێت کە لە سەردەمی " پێغەمبەر نوح"ەوە تائێستا ماوەتەوە. بەڵام تاکە شتی گۆڕلوە جیاوازی ناوەند ــ کەنار، هەژموون و تەکنیکە.

لەبەرئەوەی هۆرییەکان هۆزە رەسەنەکانی هیلالی بەپیت بوون، هەروەها لە قولآییدا شۆڕشی کشتوکاڵیان بەخۆیانەوە دیبوو، ماتەوزە بەرخودان و پێشخستنی شارستانیەتی تایبەت بەخۆیان هەبووە. چەندین بەڵگە و پێدرلوی شوێنەوارناسی روونی دەکەنەوە کە بەبێ ئەوەی پێویستی بە ناوەندی سۆمەر ببینن لەسالآنی ٣٠٠٠ پ.ز دا یەکەمین ناوەندی شارستانییان ئاواکردووە. بەتایبەتیش کۆتەڵی ئەو بەردە گەورە و چەقێنراوانەی بەر لە شۆڕشی نیولیتیك لە نزیك ئورفا (گۆبەکلی تەپە ١٠٠٠٠ ـ ٨٠٠٠ پ.ن) دۆزراوەتەوە سەبارەت بە پیشاندانی رەگی شارستانێتی ئەم ناوچەیە، تائێستاش دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە دونیای زانستدا هەیە. شیمانەی شەخسی خۆم، ئەو سۆمەرییانەی بۆ یەکەمین جار لەمیزۆپۆتامیای خواروو نیشتەجێبوون کۆلۆنی هۆرییەکان بووبن. لەم سۆنگەیەوە" لە سالآنی ١٦٠٠ پ.ز بەدواوە ئاولکردنی ئیمپراتۆرییەت لە ئەنادۆڵی ناوەوە و باشووری رۆژهەلآت لەلایەن هیتیت و میتانییە بەریشە هۆرییەکان بابەتێکی مایەی تێگەیشتنە. لەم ناوچانەدا دەرفەتی پێشکەوتنی شارستانی دیکەش جێگای باسە. شیکردنەوەی گۆبەکلی تەپە دەشێت لەبارەی بابەتی شارستانییەکانەوە رێگا لەپێش بۆچوونی جیاواز بکاتەوە. پەلهاوێشتنی سۆمەرییەکان لە رێگای دەریاوە (کەندلوی بەسرە) لە عومان، یەمەن تەنانەت حەبەشە(ئەمرۆ بەم ناوانە دەناسرێن) رێگای لەپێش کۆلۆنییەکانی شارستانی کردۆتەوە. بەلآنی کەم هەبوونی شارێکی گەورەی لە شێوەی هەراپا لە عومان دەزانرێت.

دووەمین رێگای تێپەڕاندنی تەنگەژە لەلایەن بابل و ئاشوور تاقیکراوەتەوە. بابلییەکان لە رێگای بەرەوپێشەوە بردنی پیشەسازی و زانست، ئاشوورییەکانیش لەمیانەی ئاواکردنی پاوانی بازرگانی، بەبێ پچڕان درێژەیان بە هەوڵەکانی رزگارکردنی شارستانی سۆمەر لەکێشە قورسەکان و بەردەوامکردنی پەلهاوێشتن داوە. لەبواری زانست و پیشەسازییەوە بابل:لەندەن، پاریس، ئەمستردام و ڤێنسیای سەردەمی خۆی بووە. تەنانەت لەقۆناخی هەلکشاندا هەزارجار هێندەی نیویۆرکی رۆژگاری ئەمرۆمان بەناوبانگ بووە. هەڵبەتە ئەسکەندەریش لەخۆڕا دواهەناسەی خۆی لەبابلی کوژلوەدا نەداوە. تەنانەت لەوانەیە سەدامیش دوا قوربانییە تراژیدییەکەی ئەشقی بابل بووبێت. بەهەزارانی دیکەش هەن کە لەم نووسینەدا جێگایان نابێتەوە. کاتێك هەوڵی شیکارکردنی پاوانی بازرگانی ئاشوورمدا، یەکسەر پاوانە بازرگانییەکانی ڤێنسیا، هۆڵەندا و ئینگلیزم بەبیردا دێت. لەوانەیە لەگەڵ فینیقیەکان، پاوانە بازرگانییەکانی ئاشوور لە راستیدا خولقکارترین و چوست و چالاکترین کۆمپانیاکانی مێژوو بوون. هیچ گومانی تێدا نییە کە لە ئاسیای ناوینەوە ( دەڵێن کە تا چینیش رۆیشتوون) تائەنادۆڵی رۆژئاوا، لەعەرەبستانەوە تا دەگاتە کەنارەکانی دەریای رەش

تۆڕی بازرگانی ( قارومە بەناوبانگەکان، واتە جێگای قـازانج، خانـەکانی قازانج)یـان پێشخسـتووە. مسـۆگەرە کـە یەکـەمین ئیمپراتۆریـەتی بازرگانیـان ئـاولکردووە. ئـەو هەشـتپێ (ئەختـەبووت) یـە بازرگانییەی بەشێوەی سـێ قۆنـاخ لەساڵەکانی ۲۰۰۰ ــ ۱٦۰۰ پ.ز، ۱٦۰۰ ــ ۱۲۰۰ پ.ز و ۱۲۰۰ ــ ٦۰۰ پ.ز خـۆی پیشـانداوە لـەم لایەنـەوە یەکەمینـە. بـەڵام بازرگـانیش جگـە لـە قووڵکردنـەوە و بڵاوکردنەوەیەکی سنووردراوی شارستانی ناوەندی سۆمەر بەولاوە، هیچ بەهایـەکی چارەسـەرکردنی نییـە. کەچـی هـەموو کاتێـك پـاوانی بازرگـانی شـەریکی پـاوانی سـەرەکی راهیـب + سـەرباز + بەڕێوەبەرە. بەڵام هـەرگیز نابێـت ئـەوە بچـووك بکرێتـەوە کـە نزیکـەی هـەزار و پێـنج سـەد ساڵ ئاشوور شارستانی ناوەندی سۆمەری لەسەر پشتی خـۆی هـەڵگرتووە و گواسـتوویەتیەوە. یـەکێك لەئەڵقە هەرە بەهێزەکانی شارستانییە.

لەبەرئەوەی هەراپا، عومان، هیتیتەکان، میتانییـەکان و میسـر هـەمان سـەرکەوتنیان پیشـان نـەداوە بەئاسـانی لەناوەخۆیانـدا هەڵوەشـاونەتەوە. ناتوانرێـت نکوڵی لـەو خاڵانـەش بکرێـت کـە ئاشوورییەکان لەرێگای فینیقییەکان، ماد ــ پارسەکان و دواتریش لە رێگـای هیتیتـەکان لەمیانـەی بازرگانییـەوە کاریگـەریان کردۆتـە سـەر شارسـتانی گریـك، بـەمجۆرەش رۆڵێکـی دیاریکـەریان لـە نەپچڕان و بـەردەوامکردنی شارسـتانی ناوەندیدا بینیـوە. پـاوانی بازرگـانی کێشـەکان چارەسـەر ناکـات. بـەڵام چـەندین بەرهـەمی شارسـتانی (فکـر و باوەڕییەکانیشـی لـەناودا) بەهەرلایەکـدا بڵاودەکاتەوە، لەمیانەی پەرەپێدانیەوە بۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن دەرفـەتی لەسـەرپێمانەوەی بـۆ دەرەخسێنێت. چونکە لە دۆخێکی پێچەوانەدا دووچاری هەمان رەوشی هەراپا دەهـات. بـەمجۆرە مێژوو چەند هەزار ساڵێك لەناو دووبارەبوونەوەدا دەژیا. بەڵام پێویستە ئەوەش بـزانین کـە پـاوانی بازرگانی زۆردارتـرین و بـێ بـەزەییترین پـاوانی کەڵەکـەبوونی سـەرمایەیە" هـەروەکو لـە نموونـەی شوراکاندا دەبینین نوێنەرە سیاسییەکان لەجێبەجێکردنی ستەمکارانەترین مامەڵـە (دروسـتکردنی دیوار و قەڵا لە کەللەسەری مرۆڤ)دا دوودڵی ناکەن. لەوەش زیاتر، جیاوازی نرخ و جیـاوازی بـەهای بەکاڵابوونی موڵك بەکاردێنن، لەرێگای کەمترین رەنجەوە قازانج بەدەست دێنن.

لێرەدا باس لەکڕین و فرۆشتن و بازرگانی کـردن بـەو کـاڵا بچـووکانە ناکـەین کـە بـە ئامـانجی بەکاربردنن نەك قازانج. پێویستە ئەوە رەچـاو بکرێـت کـە باسـی بازرگـانی پـاوانخواز دەکـەین کـە ئامـانجی قازانجـە. شـیمانەیەکی بـەهێزە کـە هۆکـاری هەرەسـی هـەراپا بـۆ نەکرانـەوەی بـەڕووی دەرەوە و پێشنەخسـتنی بازرگـانی دەگەڕێتـەوە. هـەروەکو دەزانرێـت لەبەرئـەوەی خاوەنـە نوێیەکـەی (۱٦۰۰ ـــ ۱۰۰۰ پ.ن) میسـریش توانـای ئـاوالکردنی پـاوانی بازرگـانی و ئەنجامـدانی

کرانەوەیەکی سەرکەوتووانەی بەرووی دەرەوە نەبوو، لە ئاکامی پێکدادانە ناوخۆییەکان و پەلامارە دەرەکییەکان کوژایەوە. ئەگەر هێندەی سۆمەرییەکان بڵاوبووبایەوە، لەوانەیە دونیاکەمان جیاوازتر دەبوو. هەرچی چینە، پێویستی بە گواستنەوە بۆ دەرەوە نەبینی. لەوانەیە خۆشی هێندەی پێویست فراوان بووبێت. ئاشکرایە ئەو کێشە قورسانەی یەکەمین تەقینەوەی شارستانی ناوەندی رێگای لەپێش کردەوە لەمیانەی بڵاوبوونەوەی بە دونیادا بە قۆناخێکی جیاوازتر گەیشتووە.

ئەو بیرمەندانەش هەن کە دەڵێن: لە قۆناخی ١٦٠٠ ــ ١٢٠٠ پ.ز مێژوودا لەمیانەی تێکەڵ بوونی شارستانییەکانی میسر، میزۆپۆتامیا و ئەنادۆڵ کارەکتەری هەژموونگەرایی ناوەندی بەدەستهێناوە. ئەگەر بە قۆناخی زێرینی شارگەرایی، بازرگانی و ئەرستۆکراسیش ناو ببرێت، ئاشکرایە کە قەڵەمبازێکی ئەنجامدراوە. ئاشکرایە کە بەربڵاوبوونی کێشەکە و جێگۆڕکێی بەردەوامی هەژموونگەرایی ناوەندی، کۆمەکی بە درێژکردنەوەی تەمەنی سیستەم کردووە. رێککەوتنە بەناوبانگەکەی کادەش (لە ساڵانی ١٢٨٠ پ.ن) ئەم راستییەی قۆناخەکە پیشاندەدات.

ئەو تەنگەژەیەی شارستانی ناوەندی لە ساڵانی ١٢٠٠ ــ ٨٠٠ پ.ز دووچاری هاتبوو تەنیا کاتێك تەکنیك (ئامراز)ی ئاسنین جێگای مسی گرتەوە (٣٠٠٠ ــ ١٠٠٠ پ.ن) سووك بووە. ئەو پێشکەوتنەی لە ئامرازەکانی شەڕ و بەرهەمهێناندا بەدیدێت بەردەوام جیاوازییەکانی قۆناخی خۆیان دەئافرێنن. بێگومان ئەوەی دیاریکەرە پەرەسەندنی کۆمەڵگایە، بەڵام ئەم پەرەسەندنەش لەنزیکەوە پەیوەندی بە ئامرازەوە هەیە. بۆیەکەمجار ناوەندی هەژموون دەچێتە دەرەوەی میزۆپۆتامیا. بەم جۆرە ئەمە بە یەکەمین هەنگاوەکانی خزان بەرەو رۆژئاوا، واتە بەرەو ئەورووپا دادەنرێت. لەمەدا لەرێگای وشکانییەوە ئیمپراتۆرییەتی ماد ـ پارس (٦٠٠ ـ ٣٣٠ پ.ن)، لە رێگای دەریاشەوە فینیقییەکان (١٢٠٠ ــ ٣٣٠ پ.ن) قۆناخی تێپەڕبوونی پێکدێنن. ئورارتووییەکانیش (٨٥٠ ـ ٦٠٠ پ.ن) رۆڵێکی هاوشێوە دەبینن. هەرچەندە تەنگەژەی کۆمەڵگا لەمیانەی تەکنیکی ئاسن و رێگا بەربڵاوو ئارامەکانی بازرگانی بەتەواوی تێپەڕیش نەکرابێت، سووککراوە و دەرفەتی بەردەوامکردنی بۆ رەخساوە. ئەو هەڵمەتەی ئیمپراتۆریەت (هەژموون)ی ماد ــ پارس لە رێگای نهێنییەکانی بازرگانی و فینیقییەکانیش لە رێگای دەریای سپییەوە ئەنجامیاندا گرنگە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن گریکەکان لە دۆخی کۆلۆنی ئەم دوو شارستانییەدا ژیاون. هەرچەندە مێژوو (مێژووی ناوەندگەرێتی رۆژئاوا) شارستانی گریك ــ ئیۆن بەرەسەن دابنێت، بەڵام لێکۆڵینەوە واقیعییەکان پیشانیدەدەن کە هەمووشتێکی خۆیان لەپەلهاوێشتنی ئەم دوو شارستانییە

وەرگرتووە. کاتێك کاریگەری میسر، بابل و گریت بخەینە سەر کاریگەری ماد ــ پارس و فینیقییەکان، ئەوکاتە دەردەکەوێت کە شارستانییە بەناوبانگەکەی گریك تارادەیەکی مەزن ماڵێکی هاوردەیە و کەسیش ناتوانێت نکوڵی لێبکات.

بێگومان ناتوانرێت نکوڵی لە سەنتێزی گریك ـ ئیۆن بکرێت. بەڵام زۆر ئاشکراشە کە رەسەن نییە. چونکە لەبنەڕەتدا هیچ شارستانییەك ئۆرژینالْ نییە. هەمووشیان لەسەر بنەمای وەرگرتن و خستنەسەریەکی(بەیەکەوەلکاندنی) بەهاکانی کۆمەڵگای نیولیتیك ئاواکراون: یان لە رێگای زەوتکردن یان پاوانی بازرگانییەوە یاخود لەمیانەی بەکارهێنانی هەرلوو پەیڕەوەوە ئەنجامیانداوە. دەشێت گۆڕیبێتیان و سەنتێزی نوێیان لێ ئافراندبێت. بەڵام هەروەکو گۆردن شیڵدیش ئاماژەی پێکردووە، ئەو دۆزینەوە و داهێنانە تەکنیکیانەی کۆمەڵگای نیولیتیك لە کەوانەی زاگرۆس ـ تۆرۆس لەقۆناخی ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز خولقاندوویەتی، تەنیا دەتوانرێت لەگەڵ دۆزینەوەکانی دوای سەدەی شانزدەهەمی ئەوروپا بەراورد بکرێت. بۆ یەکەمین جار شارستانی ناوەندی لەساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز بەدواوە لەگەڵ هەڵکشانی شاری ئوروك لەچواردەوری ئەم ئامرازانە ئاواکراوە. سەرەکیترین بابەتی پێکدادانی نێوان خوداوەندە ژن ئینانا و خوداوەندە پیاو ئەنکی بابەتی ما (Me تەکنۆلۆژیای نیولیتیك کە لەلایەن ژنەوە رێکخراوە، بەواتای دۆزینەوەی ئامراز دێت)کانە. لێرەدا جەخت لەسەر پەیوەندی نێوان باڵادەستی پیاو کە لەمیانەی شارستانییەوە بەرەوپێشەوەچوو لەگەڵ زاڵبوون بەسەر ئامرازەکاندا دەکرێتەوە. بە تەنیا ئەم نموونەیەش پیشانیدەدات میتۆلۆژیای سۆمەر بەهای فێرکارییەکەی چەندە بەرزە. لەبنەڕەتدا زمانی قۆناخ بەمیتۆلۆژیا بارکراوە. ناشێت وەك زمانی رۆژگاری ئەمرۆمان بەکاربهێنرێت.

بێگومان شارستانی گریك ـ ئیۆن کە لەهەرلوو کەناری ئیجە بەرزبۆتەوە ( ٦٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز ) ئەڵقەیەکی گرنگی زنجیرەی مێژووە، هەڵمەتێکی مەزنە لەبواری پەرەسەندنی کۆمەڵگادا. هەم لەبواری زهنییەت، هەم لەبواری تەکنیك ــ پراکتیکدا کۆمەکێکی مەزنی هەیە. ئەو میراسەی لەبواری گواستنەوەی دەریاییەوە لە فینیقییەکانی وەرگرتبوو زیاتر بەرەو پێشەوەی برد. لەکەنارەکانی ئەوروپا بەشێوەیەکی بەرفراوان هەنگاوی بۆ پێکهێنانی کۆلۆنی هاوێشتووە. دیسان لە رێی میراسی فینیقییەکانەوە تەکنیکی نووسینی بەرەوپێشەوە بردووە، ئەمەش کۆمەکێکی گرنگی لە ئەلف و بێی رۆژگاری ئەمرۆماندا هەبووە، لە سەرجەم زانستە ناسراوەکانی قۆناخی خۆیدا پێشکەوتنی شۆڕشگێڕانە بەدیهاتووە. شۆڕشێکی تەواو لەبواری فەلسەفەدا روویداوە. هەروەها لەمیانەی خوداوەندەکانی ئۆلیمپۆسەوە خاڵی دوایی بۆ خوداوەندەکانی قۆناخی سۆمەر

دانراوە. لە ڕێگای هۆمیرۆسەوە نەریتی داستانی گلگامێش گەیەنراوەتە لوتکە. لەبوارەکانی شانۆ، بیناسازی و مۆسیقاشدا پەرەسەندنی شۆڕشگێڕانەی هاوشێوە بەدیهاتووە. شاری جوان بونیادنراون. ئەو گۆڕانکارییانەی پەرستگا، کۆشک، شانۆ، ستادیۆم و ئەنجوومەن لە تەکنیکی تەلار و بیناسازیدا ڕێگایان لەپێش کردەوە، تائێستاش بەها کلاسیکیەکەی خۆی دەپارێزێت. هەروەها هەڵمەتی بەرهەمهێنان ـ بازرگانی بچووک ناکرێتەوە، پەرەسەندنی پیشەسازیش گرنگە. لەبواری سیاسیشدا نموونەی ئەو دیموکراسییەی پێشکەشکردووە کە ببێتە مولکی مێژوو. هەرچەندە لەچوارچێوەی شارستانیشدا بێت، بەڵام دیموکراسی باڵابوونی خۆی بەرامبەر شێوەکانی دیکەی بەڕێوەبەرایەتی سەلماندووە.

بەڵام تەواوی ئەم چەسپاندنانە ئەو ڕاستییە ناگۆڕن کە قۆناخی شارستانی گریک ــــ ئیۆن ئەڵقەیەکی سیستەمی شارستانی ناوەندییە کە بە سۆمەرییەکان دەستی پێکردووە. بەپێچەوانەوە پشتگیری دەکات.

کاتێک سەبارەت بە بابەتەکەمان ڕۆڵی شارستانی گریک لەچارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵگا، ڕاستتر ڕۆڵ و بەشی لە بەرەوپێشچوونی کێشەکە هەڵسەنگێنین، بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شارستانیەکانی دیکەدا نییە. تەواوی ئەو پێشکەوتنانەی بەدیهاتووە، لەسەرووشیانەوە دیموکراسی ئەسینا، چارەسەرکردنی کێشەکانی شارستانی ناوەندی لەولاوە بمینێت، بەڵکو قورستری کردووە. ئەگەر ریزیان بکەین:

چەندەی کراوە ڕەوشی دیلێتی ژن قووڵکراوەتەوە. ژن تەنیا بەوە ئەرکدارکراوە لەماڵەوە منداڵ زیاد بکات و وەک قورسترین کۆیلە خزمەت بەپیاو بکات" بەشداریکردنی لە سیاسەت، وەرزش، زانست و بەڕێوەبەرایەتی قەدەغەیە. بۆ تەواوی کارە قورسەکانی بەرهەمهێنان بەکارهێنراوە. ئەفلاتوون لەو بۆچوونەدایە کە ژیان لەگەڵ ژن ڕەسەنایەتی پیاو تێکدەدات. لەبەرئەم هۆکارەشە هۆمۆسێکسی بڵاوبۆتەوە. لەدەرەوەی ژنیش، کۆیلایەتی وەک هەرەسی بەفر گەورەبووە. بۆیەکەمین جار ژمارەیەکی زۆری کۆیلەی بێکار بەکۆمەڵ سەرهەڵدەدەن. دەزگای سەربازی بەپارە دامەزراوە. نەک تەنیا موڵک، بەڵکو کۆیلەش بۆ هەر لایەک هەناردە دەکرێت. لەبەرامبەر ئەمەشدا مشەخۆرترین چینی کۆیلەدار دروستکراوە، بەم جۆرە زارلوەی ئەرستۆکراسی بەدەست هێنراوە. گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی پڕ لەفاکتەری مشەخۆری بووە. توێژە هەرە نزیکەکان بەچینی بۆرژوازی، بەرهەمی شارستانی گریکە. بەکورتی هەروەکو چۆن کێشەکانی گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی کێشەی نوێتری هاتۆتەسەر، کێشە کۆنەکانیش قورستربوون و بەردەوامییان پێدراوە.

لەبواری گەشەکردنی شاردا شکۆمەندی بەدەست هاتووە، شار بووە بەخاوەنی بونیادێکی تۆرگانی. بەڵام ئەم پەرەسەندنانە باجەکەی قورسترکردنی کێشەی کۆمەڵگابووە. هەروەك بلێی بونیادی زەقورە و ئەهرامەکان بۆ چەند بەشێك جیاکراوەتەوە و بەقەبارەیەکی دیکەی مەزن دووبارە بۆتەوە. چۆن یەکەمین قۆناخی ئاواکردنی شار لە پەرستگا و بەشەکانی پێکهاتووە، قۆناخی دووەمیش لە قەڵاکانی ناوەوە و یەکەمین و دووەمین شورلکانی دامێنی پێکهاتووە، بەڵام لە قۆناخی سێیەمدا ئەم جیاوازیانە هەڵگیراوە، پاشکۆی نوێی بەدەستهێناوە، دەوڵەمەندێتی شوێن و رەونەقەکەی فەراهەم کراوە. لێرەدا پەرەسەندنێکی هاوتەریبی گەورەبوونی پاوان جێگای باسە. بەڵام لەم رێگایەوە کێشەکان چارەسەر ناکرێت، بەڵکو گەورەتر دەکرێت. چونکە سوپای کۆیلەکان چەندین قات ژمارەی جارانی تێپەڕکردووە. جگە لەمە ئیتر کۆیلەی بێکاریش دروستبووە. بۆ یەکەمین جار مرۆڤ خۆی لە پێگەی ناپەسەندیدا بینیوە. ناشێت کێشەی کۆمەڵگا لەوە قورستربێت. ئەو سیستەمەی بێکاری بەرهەم بێنێت زۆردارترین سیستەمە.

دەشێت گەورەبوونێکی هاوشێوە لە ئامێرەکانی دەسەڵات و دەوڵەتیشدا ببینرێت. لەنهۆمەکان(ئاستەکان)ی سەرەوە بەرەو نهۆمەکانی خوارەوە، دەسەڵات دڵگیرکاری خۆی گەورەکردووە. لە میانەی خنکاندنی سیاسەت لەلایەن دەوڵەتەوە و حوکمکردنی بەسەر کۆمەڵگادا، زیادبوونی بەخۆیەوە بینیوە. بیرۆکراسی دەوڵەت دروست بووە. چینی سەربازیش تایبەتبوونی خۆی پتەوتر کردووە. بەشێوەیەکی گشتی زۆربوونی دەستڕۆیی دەسەڵات بەسەر ژنان، منداڵان و لاوان، کۆیلە، لادێیی و پیشەکارانی ناو بونیادی کۆمەڵگا جێگای باسە. بەئازارترین لایەنی دیموکراسی ئەسینا ئەوەیە، بەهەموو رووتییەکەیەوە کۆتایی هاتنی سیاسەتی بەرامبەر بە دەوڵەت خستەڕوو. لەنموونەی ئەسینادا وەك بلێی دیموکراتی کۆمینالْ بەدەستی ئەرستۆکراتەکان دواهەناسەی خۆیداوە. پێویستە ئەمە گرنگترین وانە بێت کە لە دیموکراسی ئەسینای وەربگرین.

پاوانی شارستانی رۆما ( ٧٥٠ پ.ز ــ ٥٠٠ زایینی) بەردەوامی نەریتی گریك ــ ئیۆنە و لەچوارچێوەی یەکپارچەیی ناوەڕۆکەکەیدایە. وەك ئەو نموونەیەن کە لە نیمچە دوورگەیەکەوە بۆ نیمچە دوورگەیەکی دیکە گواسترابێتەوە. گرنگترین خاڵی لەم بارەیەوە بگووترێت ئەوەیە" ئەگەر گریکەکان سەردەمی منداڵی و لاوێتی ئەم شارستانییە بن، ئەوا رۆما سەردەمی پێگەیشتن و بە ساڵاچوونە. بۆیەکەمین جار زانیویانە لەمیانەی شێوازێکی هەرسکردن و سەنتێزکردنی ئەو بەهایانەی لە رۆژهەڵات وەریانگرتبوو، بەرامبەر رۆژهەڵات باڵابوون بەدەست بێنن. سەرکەوتنی

رۆما ئەمەیە: لەمیانەی کۆلۆنیکردن و داگیرکردنێکی بێ بەزەییانە بەشێکی ئەورووپای تەقلی شارستانی کرد. جگە لەمە، لەهەموو لایەکەوە رۆما تۆخی گەورەبوونی زێدەڕۆییانەی پێوانەکانی گریکە. لەبوارەکانی شار، چین و دەسەڵاتەوە ئاستێکی مەزنی بەدەستهێناوە. لەپادشایەتییەوە بۆ کۆمارێکی ئەرستۆکراتی پەڕیەوە، لەوێشەوە بە بەرفراوانترین و بەهێزترین ئیمپراتۆرییەتی مێژوو گەیشتووە. بەمجۆرە لەهەموو لایەکەوە شێوازی ژیانی رۆما بووە بە مۆدێل. هەروەکو مۆدێرنیتەی (بۆرژوازی )ی رۆژی ئەمڕۆمان، ئەرستۆکراسییەکەی هێزە یەکلاییکەرەوەکەی هاوچەرخێتییە. ئەرستۆکراتی مشەخۆر و پرۆلیتاریای لۆمپەن رەمزی کێشە هاربووەکانی رۆما بوون.

دەتوانرێت بگوترێت کە سەردەمی رۆما، لوتکەی کێشەی کۆمەڵگایە. ئەمەش شتێکی سەیری تێدا نییە. چونکە پەیوەندی نێوان پاوانی شارستانی ناوەندی کە بەشێوەی کەڵەکەبوون گەورە دەبێت لەگەڵ گەورەبوونی ئەو کێشە بونیادییەی رێگای لەپێش کردۆتەوە، راستەوخۆیە. روونترین نیشانەی ئەمە: سەرباری سزا تۆقێنەرەکانی رۆما ( لەخاچدان، دەرخواردانی شێرەکان، وێرانکردن هەر وەکو نموونەی قەرتاجە) دیسان بە شەپۆڵ کۆچکردنی پارتی کرستیانی ــ پارتی هەژاران و هۆزە بەربەرەکان ــ بەرەو رۆما، بە واتای تەقینەوەی یەکەیەکەی کێشەکان دێت بەشێوەی هێزی جەستەییەوە ( لە ناوەڕۆکدا تەقینەوەی رۆحی ئازادییە). ئەمەش دیاری دەکات کە رۆما بەربەری راستەقینەیە، ئاشکرایە کە هۆکاری رووخانەکەشی بۆ ئەو کێشە کۆمەڵایەتییە زەبەلاحانە دەگەڕێتەوە کە هەم لەناوەوە هەم لەدەرەوە گەورەی کردبوون. لە کەسایەتی رۆمادا تەنیا شاری رۆما، دەسەڵات و ئەرستۆکراسییەکەی نەڕووخاوە. بەڵکو رووخانی سیستەمی جیهانی شارستانییە کە بە چیرۆکی شاری ئوروك دەستی پێکردووە و بونیادەکەی خاوەن کارەکتەری ناوەند ـ کەنار، کێبڕکێ ـ هەژموون و هەڵکشان ـ داکشانە. لەمیانەی ئەو کێشانەی رێگای لەپێش کردەوە و هەروەها لەرێگای بەرخودانە ناوخۆیی ـ دەرەکییەکانەوە لەکەسایەتی و سیمای رۆمادا یەکێك لە هەرە درندانەترین قۆناخەکانی سیستەم داخرلوە.

ب ـ دەشێت دووەمین قۆناخی گەورەی کێشەی کۆمەڵگا لەماوەی نێوان رووخانی رۆما تا هەڵکشانی ئەمستردام جێگیربکەین، واتە قۆناخی نزیکەی ساڵانی ٥٠٠ ــ ١٥٠٠ زایینی. خەسڵەتی دیار و بەرچاوی ئایینە ئیبراهیمییەکان مۆرکی خۆیان لەم قۆناخە داوە کە وەك پەیامی چارەسەرکردنی کێشەکان دەرکەوتوون. پێویستە بە بایەخەوە راوەستە لەسەر ئایینە

ئیبراهیمییەکان بکرێت، چونکە لە کاتێکدا بانگەشەی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگایان دەکرد، بەڵام زیاتر ڕێگایان لەپێش کردنەوە.

کاتێك سەبارەت بە پەیامی کۆمەڵایەتی ئایینە ئیبراهیمیەکان قاڵدەبمەوە، لای من بەشێوەی وەرچەرخانی بونیادی کێشە مادییەکەی سیستەمی شارستانی ناوەندی بۆ بونیادی کێشەی مەعنەوی واتادار دەبێت. بە گوتەیەکی دیکە" ڕەنگدانەوەی کێشەکانی کلتووری مادییە بەشێوەی کێشەی کلتووری مەعنەوی. لەپەرتووکە پیرۆزەکاندا بەروونی ئاماژەی پێکراوە کە حەزرەتی ئیبراهیم بەهۆی ستەمەکانی نەمرود (بەڕێوەبەری شار)ی نوێنەری بابل، واتە بەهۆی ئەو کێشە قورسانەی ڕێگای لەپێش کرئۆتەوە لە ئورفا رایکردووە یان کۆچی کردووە. تەنانەت چۆنیەتی دەربازکردنی مەترسییەکانی سووتاندن وەك پەرجووی ئیلاهی باس بکرێت. لێگەڕینی خودلوەندێکی نوێ، وەك هۆکاری سەرەکی ئەم رووداوە پیشاندەدرێت. دەشێت لێگەڕینی خوداوەند وەك لێگەڕینی بەڕێوەبەرایەتی نوێش دەرکی پێبکرێت. چیرۆکەکە چەندین تایبەتمەندێتی دیکەی بونیادی کێشە قورسەکانی ئەو قۆناخەمان پێشکەش دەکات. مێژووەکەی شیمانەی ساڵانی نزیك بە ١٧٠٠ پ.ز دەکرێت. حەزرەتی ئیبراهیم لە شارستانییەکانی میزۆپۆتامیا بۆ شارستانییەکانی میسر کۆچی کرد. واتە ڕێگای نێوان هەردووکیان کرلوەیە. لەوانەیە بۆخۆی بەدوای پەناگە و هاوپەیمانی نوێدا گەڕابێت. ژیانی لە وڵاتی کەنعان ( فەلەستین و ئیسرائیلی ڕۆژی ئەمڕۆمان ) ئەم تێزە پشتڕاست دەکاتەوە. وەك بنەماڵە لە هۆزێکی بچووك جیادەبێتەوە. لە وڵاتی کەنعان دەبێت بە هۆز و قەبیلەیەکی نوێ.

نەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم، یوسف وەك کۆیلە دەفرۆشرێتە میسر. بەهرەکانی لە کۆشکی فیرعەون تا ئاستی وەزیر بەرزی دەکاتەوە. ڕۆڵی ژنانی کۆشکیش لەمەدا گرنگە. لەمێژووی عیبرانییەکاندا بەردەوام ژن ڕۆڵی گرنگ دەبینێت. لە میسریش قەبیلەیەکی عیبرانی پێکدێت. بەڵام لەنۆخی کۆیلایەتی نیوە چڵدایە. زۆر لەو نۆخە نیگەرانن. ئیتر فیرعەون شوێنی نەمرودی گرتۆتەوە. هەر بۆیە دەخوازن لەویش ڕزگار بن. ئەوجارە موسا سەرکێشی کۆچەکە دەکات. مێژوو نزیکەی ساڵانی ١٢٠٠ پ.ز. لەپەرتووکی پیرۆزدا دەرکەوتنەکە بەشێوەیەکی پڕ لە پەرجوو باسدەکرێت. لە دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم دەچێت. دیسان گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی کەنعانە. بەگوێرەی میسر کەنعان وەك **"بەهەشتی بەڵێن پێدرلو"** وایە. ئەو خودلوەندەی لێی دەگەڕێن لە کێوی توری سینا بەشێوەیەکی ئاشکرا و مسۆگەر لەڕێگای دە فەرمانەکە بانگەوازی لە هۆزەکە دەکات. لە ڕاستیدا دە فەرمانەکە پرەنسیپەکانی ڕێکخستن و بەرنامەی سیاسییە کە هۆزەکە

لەمیانەی ئەزموونێکی درێژخایەن بەدەستی هێناوە. دەستبەردانی تەواو لە ئایینەکانی نەمرود و فیرعەون، ئاولکردنی ئایینی ( تێڕوانینی جیهان و پرۆگرامەکەی) ئەتنیکی جێگای باسە. پەرتووکی پیرۆز بەدەنگێکی ئیلاهی و بەشێوەیەکی دووروودرێژ باسی قۆناخەکانی دواتر دەکات. چیتر وەك ئەوەی سۆمەر و میسر چیرۆکە میتۆلۆژییەکان جێگای باس نین، رێسا ئایینییەکان (ئورتۆدۆکس) لە ئارادان کە راستی رەهان.

لەمێژووی ئایینەکاندا ئەم رەوشە بە واتای شۆڕش دێت. بە واتای شۆڕشە هزرییە گەورەکەی قۆناخی خۆی دێت. لێکۆڵینەوەکان پیشانیدەدەن کە نەریتی عیبرانی(ئیبراهیمی) یەکێك لەپێگەیشتووترین سەرچاوەکانی یادگای رۆژهەڵاتی ناوینە. بە بڕوای شەخسی خۆم، عیبرانییەکان بەشێوەیەکی گەوهەری میتۆلۆژیای سۆمەر و میسریان بەشێوەی "ئایین" بۆ چیرۆك(رەوانبێژی) گۆڕیوە. بەدرێژایی مێژوو لەمیانەی سەرچاوەکانی زەردەشت، بابل (بە تایبەتی لەقۆناخی دوورخستنەوەی سالآنی ٥٩٦ پ.ز)، فینیقی، هۆری و گریکەکان شتی نوێیان خستۆتە سەر ئەم باسانە و بەردەوام پەرتووکی پیرۆزیان بەرەو پێشەوە بردووە. پێویستە لەبیری نەکەین یەکەمین کۆکردنەوەکانی پەرتووکی پیرۆز لە قۆناخی ٧٠٠ — ٦٠٠ پ.ز دایە. پێشتر هیچ سەرچاوەیەکی نووسراو نییە.

پێویستە بەگرنگییەوە ئاماژە بەم خاڵە بکەم" بە درێژایی مێژوو یەهودییەکان تەنیا سەرمایە و پارە کۆناکەنەوە. بەڵکو بەشێوەیەکی بوێرانە ئایدیۆلۆژیا و زانست — مەعریفەش کۆدەکەنەوە. لەمیانەی ئەم دوو کەڵەکەکردنە ستراتیژییەوە، لەئاستی دونیا لاوازی چەندایەتیان (کەمی ژمارە) دەکەن بەهێز. ئەتنیکی یەهودی (سەرەتا هۆز، لە رۆژی ئەمرۆشماندا نەتەوە) نەك تەنیا لە رۆژگاری ئەمرۆماندا، بەڵکو بەدرێژایی مێژوو لەسایەی ئەم دوو کەڵەکەکردنە توانیویانە لە پێگە ستراتیژییەکان و تەنیشت دەسەڵات، لەئاستێکی بەرزی ژیاندا بمێننەوە. بەڵام ئەو کارەسات و کێشە ترسناکانەی دووچاریشی هاتن لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم واقیعانەیە. بێگومان ئەگەر سەرمایە و زانیاری بە پاوانکاری هێز و دەسەڵات دابنێین، هەروەها دەسەڵاتیش وەك پاوانێکی سەرمایە و مەعریفە ببینین" کاتێك بەردەوام ئەمەش وەك میتۆدێکی خوێندنەوەی مێژوو و ئێستا پەیرەو بکەین، ئەوا بەشێوەیەکی روون و واقیعیتر دەرك بە کێشەی کۆمەڵایەتی دەکرێت. لەبەرئەوەی لەبەشی شارستانێتی دیموکراتی رۆڵی ئایینە ئیبراهیمییەکان لە ئاستی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییە — مێژووییە زەبەلاحەکاندا تاوتوێ دەکەین، لێرەدا بەکورتی رێگاخۆشکردنیان بۆ کێشە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگای مێژوویی شیدەکەینەوە.

پەیمانی کۆن (ناوەکەی دیکەی پەرتووکی پیرۆز) رێبەرەکانی دوای حەزرەتی موسا بەمجۆرە ریز دەکات: راهیبەکان (لیڤلەکان) یان لوییەکان، حوکمدارە ــ پێغەمبەرەکان، پێغەمبەران و نووسەرە(کاتب)کان. دەشێت بەشەکانی رۆشنبیر و داناکان(لەمیانەی ناوی لێکچوو) لە قۆناخی دواتر زیادبکرێت. لێرەدا روونده‌بێتەوە کە تەواوی داناکانی سەرچاوەکانی میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر بەپێغەمبەر ناودەبرێن. پەیمانی کۆن بەمجۆرە شرۆڤەی دەکات. ئەرکی سەرەکی پێغەمبەران چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کۆمەڵگایە کە پاوانی شارستانی خوڵقاندوویەتی. ئەگەر بەردەوام رەچاوبکرێت کە کەڵەکەکردنی زێدە ـ بەرهەم و سەرمایە لەمیانەی رێگای سەربازی و کارپێکردنی زۆرەملێیانە بەدیهاتووە، ئەوکاتە کەڵەکەبوونە مەزنەکەی کێشەکانیش باشتر دەرکی پێدەکرێت. پێغەمبەرایەتی رەنگدانەوەی ئەم راستینەیەیە لەناو ئەو توێژانەی بەدەست ئەم کێشە قورسانەوە دەناڵێنن. بەمجۆرە تێگەیشتن و دەرککردن بە ناوەرۆکی دەزگاکەی، خوێندنەوەمان بۆ مێژوو سادەو رۆشنتر دەکاتەوە.

نزیکەی سێ سەد ساڵ دوای کۆچی دوایی حەزرەتی موسا ئایدیۆلۆژیا و پرۆگرامە سیاسییەکەی لە دەوروبەری ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بە حوکمرانێتی پێغەمبەران ساوڵ ــ داود ــ سولێمان دەوڵەتێکی بچووکی لێکەوتەوە. دوای ئەو تێکۆشانە مەزنە، ئەو رێگەچارەیەی بۆ کێشە کۆمەڵایەتییە قورسەکان دۆزیانەوە کە دووچاری هاتبوون، گەیشتنیان بوو بە ئامرازێکی دەسەڵات ـ دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان. ئاشکرایە کە ئەم دەوڵەتە هێندەی ئەسینا دیموکرات نەبووە. هەروەها بەگوێرەی نەریتی دەوڵەتی میسر و بابل ـ ئاشوور کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەناویدا ژیان، ئاشکرایە کە ئەم دەوڵەتە زۆر لاوازە و بێچارەیە. لە دۆخێکی وەهادا، بۆچی لەنەریتی ئیبراهیمی هێندە هەڵوەستە لەسەر دەوڵەت دەکرێت؟ لەبەرئەوەی داهێنانێکی پێغەمبەرە. یان "خاکە بەڵێن پێدراوەکان (بەهەشت)"ی پێشکەش بە ئەندامان و شوێنکەوتووانی کردووە.

هەروەکو دەزانرێت یەکەمین دەوڵەتی یەهودی دوای ماوەیەکی زۆر کورت بەهۆی ململانێکانی دەسەڵات و داگیرکاری (شەڕی نێوان کوڕان و نەوەکانی داود و سولێمان، هەڕەشە و داگیرکاری ئاشوورییەکان) هەرەسی هێناوە. تا بڵێی لەو ئیسرائیلە دەچێت کە سێ هەزار ساڵ دواتر لەهەمان شوێندا ئاوالکراوە. بەڵام دیسان پێویستە ئەم دامەزراوەی پێغەمبەرایەتی گرنگ ببینرێت. بەدرێژایی مێژوو کاریگەرییەکەی لەسەر دەسەڵاتەکانی شارستانی ناوەندی کەم نەبۆتەوە. بە تایبەتیش لە رێگای سەرمایەی پارە و ئایدیۆلۆژیاوە زۆر بەکاریگەر بووە.

نەریتی حەزرەتی عیساش دەبێتە دووەمین ئایینی گرنگی ئیبراهیمی. پێشکەشکردنی پەیامێکە بۆ گرێی ئەو کێشە و وێرانکارییانەی داگیرکاری رۆما رێگای لەپێش کردبۆوە. ناوەکەی دیکەی حەزرەتی عیسا مەسیح (فریادرەس)ە. ئەو رەوتەی زایین و مێژوویان لەخۆیانەوە دەستپێکردووە، ناوبردنیان بە یەکەمین پارتی گەردوونی توێژە هەژار و لۆمپەن پرۆلیتاریاکانی رۆما لەجێگای خۆیدایە. لەکارەکتەری ملیتانی بزووتنەوەی حەزرەتی موسا دوورە. هەروەکو دەزانرێت پێهەلگرتنەکەی لەناو چین و توێژی خوارەوەی هۆزی عیبرانی بوو. بەرهەمی ئەو هەلومەرجانەیە کە رێکخستنی قەبیلە توانای چارەسەری لەدەستداوە، جیابوونەوەی چینایەتی، شارگەرایی و دەسەلاتگەرێتی بەها کۆمیناڵەکانیان تێکدابوو. ماهیەتی گەردوونی و چینایەتی خۆی لەم هەلومەرجانەوە وەردەگرێت. لەو قۆناخەدا هەڵوەشاندنەوە هاوشێوەکانی هۆز و قەوم لە رۆژهەلاتی دەریای سپیش خێرا دەبێت. بزاوتەکانی داگیرکاری گریک، ئاشوور ــ بابل و هەرە دوایش هی رۆما بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ، بێ قەبیلەکان، بێکاران و هەژاران، بێ خاوەن دەهێلێتەوە. ئەمانەش لێگەڕینیان بەدوای خاوەن و فریادرەسدا بەهێزە. وەکو ئاشکرایە بزووتنەوەی حەزرەتی عیسا گوزارشتی هاوبەشی ئەو لێگەڕینانەیە. هەربۆیە لە بنەڕەتدا خۆی بە"پەیام" ناودەبات. پەیمانی کۆن بەشێوەی پەیمانی نوێ (عەهدولجەدید)، نوێ دەکرێتەوە. کلتوور و زمانی شارستانی قۆناخی ئاشوور ــ ئارامییە، بابل ــ کلدانییە، گریک ــ هێلینییە، هی یەهودییش ــ عیبرانییە. هەرچی لاتینییە تازە لە رۆما پێشدەکەوێت. وەك دەڵێن زمانی حەزرەتی عیسا ئارامی بووە. زمانی هێلینیش لە قۆناخی شارستانی هێلینیدا لەناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە. ئارامیش هەزار ساڵ زمانی بازرگانی و کلتووری ناوچەکەیە. زمانی هێلینیش دواتر ئەم تایبەتمەندێتییانە بەدەست دێنێت. وەك دەرکی پێدەکرێت زمانی عیبرانیش زمانی دەقی پیرۆزە. هەرچی لاتینییە، تازە وەك زمانی بەڕێوەبەرایەتی جێی خۆی دەکاتەوە.

هێشتا سێبەری زمانی عەرەبی نابینرێت. وەك تێبینی دەکرێت لەناو هۆزەکانی بیاباندا بەربڵاو بووە، لەگەڵ قۆناخی ئاواکردنی شار لەنیمچە دوورگەی عەرەبستان بەرەو بوون بەزمانی شارستانی هەنگاوی هاوێشتووە. لەرێگای شۆڕشی ئیسلامەوە دەست بەسەر ناوچەکەدا دەگرێت. شانبەشانی شوێنپەنجەی شێوە زارەکانی فارسی، بونیادە پێشکەوتووەکانیان لە زنجیرە شاخی زاگرۆس ــ تۆرۆس و ناوەندی شارستانی پارس ــ ساسانیدا هەیە. هەروەها ژمارەیەکی زۆری کلتوور و زمان جێگای باسن کە بەهۆی کاریگەری شارستانی ناوەندی هەڵوەشاونەتەوە و لەئارادا

نەماون، کە زمانی سۆمەری و قیبتی[٢] ـ میسر لەسەرووبانەوە دێن. زمانی ئەرمەنیش پێبەپێ ـەناوچەکەدا بڵاودەبێتەوە.

ململانێـی نێوان هـەردوو دەسـەڵاتی هەژموونگـەرایی کـە بەرِیشـە خۆیـان وەك رۆژهـەڵاتی و رۆژئاوایی نیشـاندەدەن، بەهـەموو خێراییەکەیـەوە لەناوچـەکەدا بەردەوامـە" ئـەو ئیمپراتۆریەتـەی ناوەندەکەی رۆما ـ ئیتاڵیایە، لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ساسانی کە ناوەندەکەی ئێران ـ قەفقاسیایە. ئەو شارستانییەی ناوەندەکەی میزۆپۆتامیا بـوو، بـۆ یەکـەمین جـار دەکەوێتـە دەرەوەی ناوچـە و میراسە دابەشکراوەکەی لەنێوان هەردوو شارستانی هەژموونگەرایی مەزندا بـەردەوام دەبێـت. ئـەو شەرانەی نێوانیان لەگەوهەردا لەسەر میراسی شارسـتانی میزۆپۆتامیایـەو زۆر دژواریشـە. لەوانەیـە هەمیشەییترین و خەستترین ململانێـی هەژموونگـەرایی مێـژوو لـەم قۆناخـەدا روویـدابێت. دەشـێت ئەسکەندەر و قۆناخی دواتری وەك یەکەمین خولی ئەم شەرە شـرۆڤە بکرێـت. هیشـتا زۆری مـاوە ناوەندی شارستانی بۆ رۆژئـاوا بگوازرێتـەوە. بـەڵام دیسـان ئاشـکرایە کـە یەکـەمین هـەنگاوەکانی هاوێژراوە.

وەك تێبینی دەکرێـت فەلسـەفەی گریکـی لـە ئیمپراتۆرییـەتی رۆمـا، هـەروەها بیروبـاوەری زەردەشتی (ئەخلاقییە و زیاتر سیکۆلارە) ئیمپراتۆرییەتی پارس ـ ساسـانیش نـەیانتوانیوە ببنـە چارەسـەری بـۆ ئـەو کێشـانەی سەرچـاوەی خۆیـان لـە پاوانـەکانی هـەردوو شارسـتانی دەگـرت. لەبنەرەتدا واقیعی شەرِ بێچارەیی پیشاندەدات و جەختی لەسەر دەکاتەوە. توانـا سـنووردارەکانی زێدە ــ بـەها، شـەرِ دەکاتـە بەرچـاوترین پـەیرەوی کەڵەکـەکردنی نێـوان ئـەو پاوانانـەی لـەبواری چۆنایەتی گەورەبوون و ژمارەیان زیادی کردووە. لەمێژووی شارستانیدا شـەرِ جۆرێـك لـە ئـامرازی کەڵەکەکردنی سەرمایەو دەسەڵاتە. واتـە پەیوەنـدییان بـەو داسـتانانەی قارەمانێتییـەوە نییـە کـە کـراون بـە ئەفسـانە. ئەمـە لایـەنی پروپاگەنـدەیی مەسـەلەکەیە. واتـادارترین پێناسـە، ئەوانـەی رۆژگـاری ئـەمرۆشمانی لـەناودا، شـەرِ لـەدوا شـیکاردا ئـامرازی دەسـتگۆرکێ کردنـی سـەرمایەو دەسەڵاتە. لەم سۆنگەیەوە کاتێك مێـژوو دەخوێنینـەوە پێویسـتە ئـەم خاڵـە رەچـاو بکـەین کـە لەناوەنـدی پەیوەنـدی و هێزەکـانی بەرهەمهێنانـدا رۆڵ دەبیـنن. هەڵبەتـە هەرچـی شـەرەکانی بەرگریکردنە ئامانجی پاراستنی خاك، پەیوەندی و هێزەکانی دیکەی بەرهـەمهێنان و ئازادییـە، بـە

[٢] قیبتی: بە زمانی گریکی واتای میسر دەبەخشێت. لە دووەمین سەدەی زایینی ئەلف بێی قیبتی جێگای ئەلف بێی دیموتییەی گرتوتەوە. قیبتی زمانێکی میسری کۆنە.

کورتی ئامانجی پاراستنی ناسنامەی کۆمەڵگا، بونیادە سیاسی و ئەخلاقییەکەی، ئەگەر هەبێت پاراستنی دیموکراسییەکەشی دەکات بە ئامانج. ڕەوابوونی خۆی لەم ڕاستییەوە وەردەگرێت.

زۆرجار باس لەوە دەکرێت کە شەڕەکانی پاوان ڕۆڵی داینەمۆ لەمێژووی شارستانیدا دەبینن. ئەمە لەولایەنەوە ڕاستە کاتێك کە ڕێگا لەپێش نوێبوونەوەی ڕێکخستنی ـ چالاکی و تەکنۆلۆژی بەتواناتر بکاتەوە. بەڵام پێویستە بزانرێت کە لەناوەڕۆکدا دیاردەیەکن لە دەرەوەی کۆمەڵگا، بگرە لەدەرەوەی سروشتن و لەوپەڕی هۆڤێتیدان. دیسان لەبەرئەوەی ئامرازی پاوانخوازین، سەرچاوەکەیان کۆمەڵگایە. بەڵام بەئامانجی دەرخستنی کۆمەڵگا لە دۆخی کۆمەڵگایی ئەم سەرچاوانەیان وشك کرد.

دەستەواژەی "ئەگەر لە ڕوویەکیان دایت، ڕووەکەی تریان بۆ بسووڕێنە" کە کراوەتە موڵکی حەزرەتی عیسا، بێگومان گوزارشت لە لێگەڕینە مەزنەکەی قۆناخ بۆ ئاشتی دەکات. چونکە تێدەگەن چەندە شەڕ لەدەستدانی بەرهەم بێت، ئاشتیش بەوڕادەیە واتای بەرهەمهێنانە. چونکە باش ئاگادارن کە بێکاری و هەژاری سەرچاوەی خۆیان لە شەڕە بەردەوامەکان وەردەگرن، ئاشتی بە قووڵایی مۆرکی خۆی لە بزووتنەوەی عیسایی دەدات. بەدرێژایی سێ سەد ساڵ بزووتنەوەکە ئەم گەوهەرەی خۆی دەپارێزێت. بۆ هەرشوێنێك دزە دەکات کە ڕۆما پێی گەیشتووە یان پێی ساسانییەکانی بەرکەوتووە. ناوو بانگەکەی تا چین و هیندستان دەڕوات. پێویستە بە بایەخەوە باسی بزووتنەوەی مانی یش بکرێت، کە لەو قۆناخەدا سەریهەڵداوەو خاوەن هەمان کارەکتەرە، بەڵام زیاتر ناوەندەکەی لە جوگرافیای ساسانییەکان بووە. بەتایبەت حەزرەتی مانی دەڵێ " تا ڕۆما دەڕۆم، تا ئاشتی لەنێوان ڕۆما و ساسانییەکان بەرقەرار بکەم". ئەو بیروباوەڕییەی تێکەڵەی زەردەشتی ـ عیسایی بوو و تایبەتمەندێتی قووڵتری هەبوو، ئەگەر لەلایەن حوکمدارە ستەمکارە ساسانییەکانەوە سەرکوت نەکرابایە، لەوانەیە ڕێگای لەپێش ڕێنسانسی ڕۆژهەڵاتی ئاوین کردبایەوە.

کرستیانی کە لە دامەزراندنی قوستەنتین پۆلیس(ئەستەنبۆل) تا پایەی ئایینی فەرمی بەرزکرایەوە، لەم مێژووە (٣٢٥ زایینی) بەتەواوە بە خێرایی بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی تەواوی ڕۆمای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. بابەتەکەمان مێژووی کرستیانی نییە. لایەنی پەیوەندیداری بە بابەتەکەمانەوە، کێشەی کۆمەڵگا و پەیوەندییەکەیەتی لەگەڵ پاوانەکانی دەسەڵاتەوە. ئاشکرایە هەروەکوچۆن دۆخی ڕەسەنی بزووتنەوەی موسایی بەدەوڵەت ئەنجامگیربوو، نموونە (نوسخە)ی دووەمی، واتە بزووتنەوەی عیساییش بەلانی کەم، زۆربەی ڕەوتەکانی بەدەسەڵات ـــ دەوڵەت

ئەنجامگیر بووە. هەر تەنیا ئایدیۆلۆژیای فەرمی بێزەنتییەکان نییە، بە تایبەتی لە ساڵانی ١٠٠٠ زایینی لە رۆما دەوڵەتێکی بەهێزە. لەوەش زیاتر، کۆی ئامێرەکانی دەسەڵاتی فراوانتر و بەهێزترە کە هەزاران کۆمەڵگا سەرچاوەکەی پێکدێنن. لەوانەیە دەوڵەت سیمبۆلیترین گوزارشتە فەرمییەکەی بێت.

ململانێ ناوخۆییەکانی کرستیانی، پێکدادانەکانی کاسۆلیك ــ ئۆرتۆدۆکس و جیابوونەوەی مەزهەبە بەناوبانگەکانی دیکە، تەنیا لایەنی بەکێشەبوونیان سەبارەت بە بابەتەکەمان واتایەکی دەبێت. لەکاتێکدا ئامانجی ئەوەبوو ببێتە ئایینی ئاشتی ، بەڵام بوونی بە ئایینێکی هێندە شەڕانگێز کە مرۆڤ لەناو ئاگردا بسووتێنێت، پیشانیدەدات کە چەندە مۆرکی شارستانی ناوەندی لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت لەئایدیۆلۆژییەکانی شەڕی بەرپشە میتۆلۆژی زیاتر رێکردنەوەی لەپێش شەڕ، چۆن روون دەکرێتەوە؟ لەرۆژهەڵات شەڕی موسڵمان و کرستیانەکان، لە ئەوروپا سەرەتا شەڕی بەرامبەر ئایینی قەبیلەکان و جادووەکان، دواتر شەڕە مەزهەبییە سەرسوڕهێنەرە ناوخۆییەکان، هەروەها لەمیانەی رۆڵی لەشەڕەکانی داگیرکاری ئەمریکا، ئەفریقیا، ئوسترالیا و ئاسیای رۆژهەڵات، کرستیانی تەواو کەوتۆتە دەرەوەی ئامانجی خۆی و ناتوانێت رێگری بکات. هەرچی ئاشووری، ئەرمەنی، کلدانی و هێلینییەکانی ئەنادۆڵن کە یەکەمین قەومن بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییە قورسەکانیان بوون بە کرستیانی. بوونەتە قوربانی پەیوەندی ئایین بە شارستانی ناوەندییەوە. ئەو کرستیانییەی وەك جۆرێك لە میللیگەرایی راڤەیان کردووە، بەخێرایی رووبەڕووی پاوانی دەسەڵاتی قەومەکانی دیکەی کردوونەتەوە. لەکاتێکدا کرستیانی رۆژئاوا بووە بە دەسەڵات و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە (باجەکەشی لەدەستدانی پەیامەکەی بووە)، هەرچی کرستیانی رۆژهەڵات و ئەنادۆڵە لەلایەن جۆرێك لە میللیگەرایی (عەرەب، تورك، کورد)وە لەژێر دەمامکی ڤێرسیۆنی یەکەم (موسەوی) و سێیەم (ئیسلام) دووچاری پاکتاوکردنی مەزن هاتوون. لێرەدا سەبارەت بەچۆنیەتی گەورەکردنی کێشەی کۆمەڵگا رووبەڕووی نموونەی سەرنجڕاکێش دەبینەوە.

پێویستە دیسان تێزی خۆم دووبارە بکەمەوە" نەریتی ئیبراهیمی، لەو قۆناخەدا کرستیانی، نوێنەرایەتی کلتووری مەعنەوی دەکات کە رەنگدانەوەی کلتووری ماددی شارستانی ناوەندییە. راستتر، لە رووخساردا ئامانجیان چارەسەرکردنی ئەو کێشە قورسانەی کۆمەڵگایە کە کلتووری ماددی و پاوان رێگایان لەپێش کردۆتەوە. هەروەکو داخوازی سۆسیالیزمی بونیادنراو بۆ چارەسەرکرنی ئەو کێشانەی سەرمایەداری سەرچاوەکەیان پێکدێنێت. بەڵام لەبەرئەوەی زانست و

قاڵبەکانی ژیانیان هێندەی قاڵبەکانی سەردەم ـ مۆدێرنیتەی پەیوەندیداریان تێپەڕ نەکردووە، لەدەرەنجامدا لە بوون بە ڤێرسیۆنێکی نوێی شارستانی ناوەندی، هێزێکی هەژموون یان هێزێکی لاوازی گرێدراو رزگاریان نەبووە. ئەوانەی کە رادیکاڵن و بەسووربوونەوە تا دوایی دڵسۆزی دۆزەکەن، هەرچەندە میراسێکی گرنگ بەجێبێڵن، بەڵام لە پاکتاوبوون رزگاریان نابێت. لەبەرئەم هۆکارەیە بەردەوام نەریتی ئیبراهیمی بەبزووتنەوەی سۆسیال ـ دیموکراتی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچوێنم. هەروەکو چۆن سۆسیال ـ دیموکراسی بۆ ئەو کێشە قورسانەی شارستانی سەرمایەداری رێگای لەپێش کردوونەتەوە لە راچێتەی تیمارکردن بەولاوە تێپەڕی نەکردووە، ئایینە ئیبراهیمییەکانیش رۆڵە گەردوونییەکەیان لە ماوەیەکی درێژخایەنی مێژوودا وەك چارەسەری کێشەکانی شارستانی کە بێکاری، برسێتی و ئێش و ئازارێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا، لەهەندێك هەوڵی ریفۆرم بەولاوە تێپەڕی نەکرد. لە ئاکامدا خۆشیان لەبوون بەکێشە رزگاریان نەبووە. وەك بەرنامەیەکی سیاسی ـ ئایدیۆلۆژی پێویستە زۆرباش رێبازی نەریتی ئیبراهیمی شیکاربکەین. بۆ تێگەیشتنی سەرجەم سیستەمی جیهانی سەرمایەداری ئەم هەوڵە گرنگ و بایەخدارە.

کاتێك ئیسلام شیکار دەکەین کە سێیەمین ڤێرسیۆنی گرنگی نەریتی ئیبراهیمییە، ئەو ناوەڕۆکەی لە بونیادەکەیدا هەیە باشتر دەرکی پێدەکرێت. وەك رێبازی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسی ئیسلام تۆکمەترە. کاتێك سەبارەت بە حەزرەتی محەمەد قاڵدەبمەوە، هەوڵدەدەم وەك نوێنەرە گەورەکەی دوا نەوەی راهیبەکانی سۆمەر شیکاری بکەم کە یەکەمین زارلوە ئیلاهییە مەزن و شکۆدارەکانیان ئاواکردووە. راهیبەکانی سۆمەر کاتێك لەپێشکەوتووترین زارلوە میتۆلۆژییەکانی قۆناخ خودلوەند دەئافرێنن، کاملترین نەریتی میتۆلۆژی ـ ئایینی ئەو قۆناخە لەبەردەستیاندایە. هەرچەندە زانیارییە ئایینی و میتۆلۆژییەکان، تەنانەت زانیارییە فەلسەفی و زانستییەکانیش لەجوگرافیا و قۆناخی حەزرەتی "محەمەد"دا سنووردار بوون، بەڵام پێویستە باش بزانرێت کە هەرسی کردوون. بەئەندازەی ناسینی سیستەمی هۆزایەتی، بەهۆی رەنگدانەوەی ئیمپراتۆرییەتەکانی ساسانی و بیزەنتی کە وەك دوو هێزی هەژموونگەرایی گەردوونی لە تەنیشتیانەوە بوو ئاشنای شارستانیش بوون. ئەو راستییەی دەستنیشان کردووە: ئەو کێشە قورسانەی کۆمەڵگا بەدەستیانەوە دەناڵێنێت سەرچاوەی خۆی لەم دوو سیستەمەوە وەردەگرێت. بە ئەندازەی کاریگەری پرۆکێنەری هۆزگەرایی عەرەبەکان لەسەر کۆمەڵگا، لەنزیکەوە کاریگەری بونیادی فشار و چەوسانەوەی پاوانی دەسەڵاتی ساسانی و بیزەنتی لەسەر پەرتەوازەکردن و بنبەستکردنی کۆمەڵگای بینیوە و تێیدا ژیاوە. هەنگاونانی بۆ دلبڕانێکی

ـسەڵاتە لەهەردوو سیستەم مایەی تێگەیشتنە. خۆشی وەك حەزرەتی عیسا زیاتر لەچینەکانی خوارەوە نزیکە. لەخۆنزیك پیشاندانی بە کۆیلەو ژنان دوودڵی نەکردووە. واتە شانبەشانی تێکەڵبوونی بە جڤاتی سریانی و موسەوییەکانی نزیکی، شاهیدی ئەو راستیەشە کە نەیانتوانیوە کێشەی کۆمەڵگا چارەسەر بکەن. هەرچی ئایینە پاگانەکانە (بتەکانی مەککە) وەك نەریتێك ـسەنگێنێت کە لەمێژە کاتیان بەرسەرچووەو لە دەرەوەی سەردەمن. بەڵام پەیامی "لوا ـبەر"ی نەریتی ئیبراهیمی تا بڵێی سەرنجی حەزرەتی محەمەدی راکێشاوە. لەرەوشێکی ـوەدا ئاستی هەرە بەرزی تواناکانی خۆی خستۆتەگەڕ، بوێری ئەنجامدانی سێیەمین گەورە ـرە (دەشێ بەشۆڕشیش ناوببرێت)ی نەریتەکەی ئەنجامداوە.

هەڵوێستی مارکس و ئەنگلس بەرامبەر بە ئۆتۆپیاگەرلکان و هەڵوێستی حەزرەتی محەمەد بەرامبەر موسەوی و عیساییەکان، تەنانەت بەرامبەر بە سابئیەکان[٢] (گروپێکی تاکخودایین)یش ـیە. لەکاتێکدا ئەوان سۆسیالیزمی واقیعی لەسۆسیالیزمی خەیاڵی جیادەکەنەوە، خودی حەزرەتی محەمەدیش لەمیانەی هەنووکەیی (نوێ)کردنەوەی نەریتی ئیبراهیمی کە کاتیان بەسەرچووە، کرداوییەتی بە حەقیقەت. بە گوزارشتێکی دیکە، شرۆڤە و راڤە واقیعییە ئایینییەکەی خۆی پێشخستووە. قورئان و فەرموودەکان لەبەردەستدان. تەنانەت یاساکانی شەریش سەرلەنوێ ڕێکخراونەوە. لەبەشی پەیوەندیدار بەزانستەوە بەشێوەیەکی بەرفرەوانتر ئەم پەیرەوە شیکار ـکەین کە دەتوانین بەشێوازی پێغەمبەرایەتی ناوی ببەین.

زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە ئیسلام لەبۆچوونە رەسەنەکانی موسەوی و گرستیانی زیاتر پێگەیشتووە و شارستانیترە. هەر لە دە ساڵی یەکەمی سەرهەڵدانیدا توانیویەتی ـیە میراتگری تەواوی شارستانییە کۆنەکانی رۆژهەڵاتی ناوین. لە ساڵانی ٦٥٠ زایینی ئیسلام توخیویەتی سیستەمی دەسەڵاتێکی هەژموونگەرایی بەهێز لەناوچەکە دابمەزرێنێت. لەبەرئەوەی ـکردنی چیرۆکەکەی پێویستییەکی بابەتەکەمان نییە، زیاتر سەبارەت بە کێشە

---

[٢] ـسینە: بە زمانی ئارامی بە واتای پاکبوونەوە لەناو ئاودا دێت، ئەمەش سەرەکیترین رێورەسمی ئایینییانە. هەروەها مەندائی ـیدەگوترێت کە بە واتای (مەعریفەت و زانست) دێت، لە کۆنترین ئایینە تاکخودایییەکانە، بەر لە دەرکەوتنی ئایینی کرستیانی لە میزۆپۆتامیادا بڵاو بۆتەوە، تا ئێستاش لە ئێراقدا بوونیان هەیە. "کنزا ربا" پەرتووکی پیرۆزیانە.

کۆمەڵایەتییەکانی ناوچە و جیهان (چونکە خۆی بۆ تەواوی گۆی زەوی مژدە بەخش دەکات) درێژە بە شیکارکردن دەدەین.

لەوە دڵنیاین کە زاراوەی ئەڵڵای لای حەزرەتی محەمەد لەبەرزترین ئاستدا دەرهەست (ئەبستراکت) کردنی کۆمەڵگا و گوزارشتی ناسنامەکەیەتی. بە بروای من، لەم بارەیەوە تیۆلۆژیای ئیسلام زۆر تەمبەڵە و نەیتوانیوە شایستەی حەزرەتی محەمەد بێت. بەرامبەر بە پەرەسەندن و دەوڵەمەندێتی تیۆلۆژیای کرستیانی، وەك بڵێی ئەمە لە ئیسلامدا وەستێنراوە و بەستوویەتی. لەبەرئەوەی دواتر هەڵوەستە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین، لێرەدا زیاتر لەسەری ناڕۆم. تا ئەم رادەیە رلوەستەکردنی حەزرەتی محەمەد سەبارەت بە ئەڵڵا و بارگاویکردنی بە پیرۆزییەکان، تائێستاش بابەتێکی بایەخداری تێگەیشتنە. بەگوێرەی من سەبارەت بە هەبوونی ئەڵڵا(خودا) حەزرەتی محەمەد لە گفتوگۆیەکی تیۆری زیاتر، بەناوەرۆکی کۆمەڵگاکەیەوە خەریك بووە. لەم لایەنەوە هەوڵێکی زۆری داوە. کاتێك ئایەتی بۆ هاتوتە خوارەوە، سوور هەڵگەڕلوەو لەناو ئارەقەدا ماوەتەوە، هەروەها پێویستە لە هۆشخۆچوونیشی لەچوارچێوەی ئەم هەوڵانەدا بژمێردرێت. پێویستە بتوانین و بزانین بەهەندی وەربگرین. ریزکردنی ٩٩ سیفەت سەبارەت بە خودا (ئەڵڵا) ئۆتۆپیایەکی کۆمەڵگا و پێغەمبەرێکە لە پێگەیشتووترین ئۆتۆپیای کۆمەڵگاوە بەرفرلونترە. تا بڵێی واقیعیانەیە و بەشێوەیەکی بەرپرسیارانە وابەستەی دەبێت. بێ شانسی ئەوەیە کە بە ئەندازەی جاهیلی دوای حەزرەتی محەمەد ، بەخێرایی دەکەونە ناو ئارەزووی دەسەڵاتەوە.

وەك شۆڕش، لەوانەیە ئیسلام لەسەرووی ئەو شۆڕشانەوە نێت کە دووچاری خیانەت هاتوون. ئەوە لەولاوە دابنێین کە بەرنامە، شێوازێکی ژیان و ئاسۆی حەزرەتی محەمەد، خەلیفەکانیشی لەناودا، لەلایەن ئەوانەی دوای خۆیەوە پراکتیزە نەکرلوە، بگرە دەرکیان پێنەکرلووە و لەبواری پراکتیکیشدا دووچاری خیانەتی گەورە هاتووە. لەکاتێکدا هەوڵەکانی حەزرەتی عەلی سەرکەوتوو نەبووە، ناتوانین پسشبینیەکی بەمجۆرە بکەین کە تا چ رادەیەك پراکتیزەکردنی هێڵی محەمەدی مایەی تێگەیشتنەو جێبەجێکرلوە. هەوڵەکرداری و راڤەو شرۆڤەکانی سەرجەم مەزهەبەکان، لەسەرووی هەموویانەوە سوننەگەرایی، لە رێبازی محەمەدی دوورن. هەرچی نەریتەکانی سەڵتەنەت (دەسەڵات)ە کە بەئەمەوییەکانەوە دەستی پێکرلووە، بە قەبەترین دەستەواژە جگە لەپاوانەکانی دەسەڵات کە لەهی کۆن زۆر خراپترن، هیچ بەهایەکی دیکەیان نییە. دڵنیام لەوەی کە ئیسلامی رادیکاڵ نەخۆشییەکی دەسەڵاتە، زیندووکردنەوەی ئیسلام لەولاوە بمێنێت، بەجۆرێك نووقمی دەکات کە هیچ شایستەی نییە. تەنیا ناوی ئیسلامی گێرەشێوێن لەم ئیسلامە نەزانانە

دەوەشێتەوە. ئەگەر پەیامێك لە ئیسلام وەربگیرێت، دەشێت تەنیا لەژێرناو و شێوەیەکی جیاوازەوە واتادار بێت. ئەم مەسەلەیەش بۆ دواتر بەجێدێڵم.

ئەو پاوانە راستەقینەی دەسەڵات لای من جێی بایەخە کە لەژێر ناوی ئیسلامدایە. بەڵام نەك وەك ئیسلام: چونکە شتێك بەناوی ئیسلام لەم پاوانەی دەسەڵاتدا بوونی نییە. جگە لە سیمبۆڵی دەوڵەت و ئەو دەسەڵاتانەی لەسەر رێبازی ئاشوور، پارس، رۆما و بیزەنتی بەرێوە دەچن، هیچ شتێکی دیکە جێگای باس نییە. وەك دەسەڵات سەبارەت بە ئیسلام ئاماژە بەم خاڵە دەکەم. هەڵبەتە هەندێك خاڵ هەن کە بەشێوەی فاکتەری کلتووری مەعنەوی تێیدا بەکاریگەرن. لەمبارەیەوە پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، گرێدرا و بە ئایدیۆلۆژیاوە ناولێنانی کۆمەڵگاکان راست نابینم. بۆ نموونە ناولێنانەکانی لە جۆری کۆمەڵگای کرستیانی، ئیسلامی و هیندۆسی لەبەرئەوەی کۆمەڵگا لەچوارچێوەی ئایین تاوتوێ دەکات و میتۆدی بچووککردنەوەی لەسەرپەیڕەو دەکات، رێگا لەپێش چەندین ناتەواوی و هەڵە دەکاتەوە. ئەم زاراوانە سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا پەردەپۆش دەکەن و تێگەیشتنی بەربەست دەکەن. هەمان خاڵ بۆ زاراوەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری و کۆمەڵگای سۆسیالیستیش لە جێگای خۆیدایە. دواتر روونکردنەوەی ئەم بابەتە سوودبەخش دەبینم. دەستنیشانکردنی راسترین ناولێنان وەك کۆمەڵگای شارستانێتی دیموکراتی و کۆمەڵگای شارستانی پاوانخواز، لەبەرئەوەی دەرفەتی بینینی سەرتاسەری و هەمووێتی کۆمەڵگا دەدات، دەشێت واتادارتر بێت.

رۆژهەڵاتی ناوین کە لە ماوەی نێوان سەدەکانی پێنجەم ـ پازدەهەمی زایینی زیاتر دەسەڵاتە ئیسلامییەکان حوکمڕانیان کرد، خاوەن باڵادەستی هەژموونی سیستەمەکانی شارستانی ناوەندییە. لە رێگای ئەو میراسەی دەسەڵات کە لە بیزەنتی و ساسانیەکانی وەرگرت، دەسەڵاتە ئیسلامیەکان قووڵتر و بەرفراوانتر بوون. لەگەڵ تەواوبوونی سەدەی پازدەهەم لە رێگای ڤێنسیاوە ناوەندی هەژموونی شارستانی ناوەندی بۆ ئەورووپای رۆژئاوا، ئەمستردام و لەندەن دەخزێت. رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ماوەی چوار هەزار و پێنج سەدساڵ قۆناخی نیولیتیك (١٠٠٠٠ ــ ٣٠٠٠ پ.ن) و شارستانی ناوەندی (٣٠٠٠ پ.ز ــ ١٥٠٠ زایینی) ناوەندێتی کردووە. لەم مێژووە بەدواوە لەژێر ئەم کێشە زەبەلاحانەی شارستانی رێگای لەپێش کردوونەتەوە ئیتر شرپبووە، پووکاوەتەوە، لەخۆنوێکردنەوەدا ماندووبووە، هەروەك بڵێی بووە بە زبڵدانی کۆمەڵگا.

کاتێك لەسیستەمی شارستانی ناوەندی رۆڵی نەریتی ئیبراهیمی پەیوەست بەکێشەکان هەڵسەنگێنرێت دەبینرێت کە یەکەمیان، دەسەڵاتی سنووردارنەکردووە، بەپێچەوانەوە زیادی

کردووە. دەوڵەت لەبواری گەورەیی و ژمارەوە زیادی کردووە. لەم سۆنگەیەوە ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆیان لە پاوانی دەسەلات ــ دەوڵەت وەردەگرن قات بەقات زیادیان کردووە. گرێدرلو بەم لۆخەوە، بەزیادەوە درێژە بەرۆڵی شەڕ دراوە کە وەك ئامرازی ئاولکردنی پاوان بەکارهێنرلوە، ئاشنای زاراوەکانی دیموکراسی و کۆمار نەبوون. بەقورسایی حوکمڕانییەکانی جۆری خانەدانێتی نەریتی زیادیکردووە و بەردەوام بووە.

دووەمیان ، قورسایی کۆمەڵگا بەرامبەر بە دەوڵەت و دەسەڵات کەم بۆتەوە. سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی چەندەی بڵێی بەرتەسك بۆتەوە. مەزهەبەکانیش زیاتر پەرچەکردارێکن بەرامبەر ئەم بەرتەسکبوونەوەیە. هەروەها پیاوسالاری سەر ژنان و لاوانیش بە زیادبوونەوە بەردەوام بووە. لەگەڵ ئەوەی کۆنترین کۆیلایەتی جۆری فیرعەونی تێپەڕکراوە، بەڵام لەمیانەی شێوە نوێیەکانییەوە (بەتایبەتیش ئەوانەی لە ئەفریقیا و لە باکوور لەسلاڤەکان کۆدەکرانەوە) کۆیلایەتی هیچی لەخێرایی خۆی کەمنەکردووە.

لەگەڵ ئەوەی بازرگانی و شار پەرەسەندنیان بەخۆیانەوە دیوە، بەڵام زۆر لە شکۆدارییەکەی جاران دووركەوتوونەتەوە. هەرگیز بەئاستی ژیانی بازرگانی و شارەکانی گریك ــ رۆما نەگەیشتوون.

سێیەمیان، نەرێنیترین کاریگەریان ئەو کێشانەیە کە بەهۆی دەرکەوتنە پێشی میللگەرایی قەوم و قەبیلەی نەریتی ئیبراهیمی رێگایان لەپێش کرلۆتەوەو تەنانەت بەئاستی جینۆساید گەیشتووە.

دەستەواژەی " بەندە و قەومی هەڵبـژێردراوی خوداوەند" بناخەی ئەو میللیگەراییەیە. سەرەتا عیبرانییەکان بە " قەومی هەڵبـژێردراوی خودلوەند" لەقەڵەمدراون، دواتر عەرەبەکان ناوونیشانی " قەومی نەجیب"یان شایستەی خۆیان بینیوە. هۆزە تورکەکانیش لەسایەی جەنگاوەرێتی ئیسلام هەنگاوێکی دیکە بەرەوپێشچوون و ئیسلامیەتیان کردووە بە ناسنامەیەکی ریشەیی. ئاشوورییەکانیش وەك یەکەمین قەوم کە ئایینی مەسیحییان پەسەندکردووە خۆیانیان پیرۆز کردووە، دوای ئەوان گریك و ئەرمەنیەکانیش لەخۆ بەپیرۆز لەقەڵەمدان درەنگ نەکەوتن. لەکاتی بلاوبوونەوەی ئایینی کرستیانی لە ئەورووپا رۆڵی لەبەرەوپێشچوونی میللیگەرایی مەزنە. دەتوانین بڵێین لە گەردوونیبوون زیاتر میللیگەرایی خێراکردووە. بە واتایەك لە واتاکان میللیگەرایی رووسیش بەرهەمێکی مەزهەبی ئۆرتۆدۆکسی کرستیانییە.

بەهۆی ئەم کاریگەرییەی لەسەر قەومەگەراییەوە هەیەتی، نەریتی ئیبراهیمی قەومە دێرینەکانی تەنیا تووشی کێشە نەکردووە، بەڵکو کارەساتی تراژیدیشی بەسەردا باراندوون. ئاشووری، ئەرمەنی، پۆنتۆس[٤] و ئیۆنەکان کە لەکۆنترین قەومەکانن و بوونەتە کرستیان لەلایەن دەسەڵاتدارانی عەرەب، تورك و کورد کە ببوونە موسڵمان، رووبەرووی پاکتاوکردنی کۆمەڵایەتی بوونەوە. هەروەها ناتوانرێت رۆڵی یەهودیش لەمەدا بچووك بکرێتەوە. لەناوبردنی ئەو کلتوور و گەلە ناموسڵمانانەی لەجۆری ئەرمەنی، ئاشووری، ئیۆن، پۆنتۆس و ئێزیدییەکان، بەگشتی رۆژهەڵاتی ناوین بە تایبەتیش ئەنادۆڵی کرد بە بیابانێکی کلتووری. بێبەشبوونی ناوچەکە لەم کلتووره دێرینانەی لەهەناوی خۆی هەڵیگرتبوون، تووشی دواکەوتنێکی زۆری کرد. ئەمە سەبارەت بە تەولوی گەلانی ناوچەکە زیانێکی تراژیدییە. پاکتاوکردنی گەلان و کلتوورەکان تەنیا بەقورسترکردنی کێشەکان نەوەستاوە، بەڵکو ئارادەیەکی زۆر هێزدەکانی چارەسەریشی لاوازکردووە. بێبەشبوون لەم کلتوورو گەلانەی پێشەنگایەتیان لەچەندین هونەرو زانستدا کردووە، بەواتای لەدەستدانی بەهرەو یادگای زانست و هونەری کۆمەڵگای ناوچەکەیە.

لەژێرکاریگەری ئایینی کرستیانی تراژیدیای هاوشێوە لە ئەمریکا بەسەر هیندییە سوورەکان، ئازتەکەکان و ئینکاکان هات، لە ئوستralیاش خۆجێییەکان و ئەسکیمۆکان دووچاری هاتوون. هەرچەندە ئایینی بن، بەڵام ئەو رژێمانەی بەدەسەڵات هەوێنکراون و هیچ خراپییەك نییە نەیکەن، کێشە و تراژیدیایەك نییە رێگای لەپێش نەکەنەوە. پێویستە دیسان ئاماژەی پێبکەمەوە، ئاسۆی نەریتی ئایینی ئیبراهیمی، بەرنامە و کردارەکەی کە لەژێر کاریگەری قورسی کلتووری ماددی شارستانی ناوەندیدایە، لە تێپەڕاندنی ئەم شارستانییە زیاتر، بریتییە لە نەرمترکردنی و کەمێك راکێشانێتی بەلای دادوەریدا. واتە ریفۆرمی وەرگرتنی بەشە لە زێدە ـ بەها، مافی بەشداریکردنە لە تاوان. لەکاتێکدا لەم پێناوەدا خۆیان ئایدیۆلۆژیا پێشکەشدەکەن و مەشروعیەت بۆ دەسەڵات بەدەست دێنن، بەشی خۆشیان لە دەسەڵاتداران داوا دەکەن. کاتێك وەرینەگرن بەرخودان دەکەن، کاتێك وەریاندەگرت بێدەنگ دەبوون. هەمان چیرۆك لە سۆسیالیزمی ئەورووپاشدا دەخوێنینەوە. لە راستیدا وەك دەبینین هەردووکیان بەردەوامی یەکترن. بێگومان رۆڵێکی

[٤] پۆنتۆس یان پنتس (Pontos):بە واتای دەریا دێت. ناوێکە کۆن بەو ناوچانە گوتراوە کە باکوری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك و باشووری دەریای رەش دەگرێتەوە. لە کۆندا پادشایەتییەك بووە. دواتر بەشێکی کەوتۆتە ژێر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، دواتریش بۆتە هەرێمێکی دەوڵەتی عوسمانی. بنەچەی گەلی پۆنتۆس یۆنانییە، لە ساڵی ١٩١٤ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کۆمەڵکوژی و تاوانی شەڕی لە بەرامبەریاندا ئەنجامداوە.

گەورەیان لە بەردەوامکردنی شارستانی دێرین و گەرلوونیبوونیاندا هەیە، لەم سۆنگەیەوە لەم بوارەوە شوێن و زەمەنیشیان هەبوو. بەڵام ئەم رۆڵە کێشە کۆنەکانی فشار و چەوساندنەوەی کۆمەڵگایان کەم نەکردۆتەوە، بەپێچەوانەوە بەڵکو زیاتری کردووە و کردوویەتی بەهەمیشەیی.

ج ـ دواقۆناخی قورسبوونی کێشەی کۆمەڵگا، قۆناخی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی هەڵکشاوی شارستانییە کە ناوەندەکەی ئەورووپایە. ئەو شارستانییەی لە ساڵانی ١٥٠٠ زایینی بەدواوە لەهەڵکشاندایە ناوزەدکردنی بە "سەرمایەداری" کراوە بە پەیرەوێك. هەروەها بانگەشەی ئەوە کراوە کە تاقانەیە و هاوشێوەکەی نابینرێت. بەبایەخەوە باس لەوە دەکرێت کە چەندین خەسڵەتی دەگمەن ( دەوڵەت ـــ نەتەوە، پیشەسازی، مەعریفە)ی تایبەت بەخۆی هەیە. بەهۆی هەژموونگەرایی رۆشنبیری بانگەشەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان کە ئەورووپا ناوەندەکەیەتی، وەك راستی ئەرێنی پێشکەشدەکرێت. ئەم راستییە ئەرێنیانەی کە خوازیارن لە دۆگما ئایینییەکان زیاتر وەك راستی رەها و مسۆگەر پەسەند بکرێت، لەراستیدا دۆگماکانی مۆدێرنیتەی تازەن.

بێگومان ناتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت کە شارستانی ناوەندی ئەورووپا خاوەن بونیادێکە وەرچەرخانی بەخۆیەوە بینیوە و جیاوازی هەیە. بەڵام بەدرێژایی مێژوو شارستانی ناوەندی بەرەوپێشەوە چووە، ئاشنای چەندین زەمەن وشوێن بووە. بەردەوام هەمان بچم دووبارە نەبۆتەوە بەڵکو جیاوازی جێگای باس بووە. هەڵبەتە بەگوێرەی پێویستی لێشاوی گەردوونی ناچارە بەمجۆرە بەرەوپێشەوە بچێت. هەرچی بانگەشەی تاقانەییە، زێدەرۆییە. هەرچی خەسڵەتە سەرەکییەکانن کە لەسەرەتاوە تا دوایی مۆرکی خۆی لە شارستانی ناوەندی داوە و کارەکتەرەکەی دیارکردووە، بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ وەك خۆی ماوەتەوە و ناوەرۆکەکەی نەگۆڕاوە. دەشێت جیاوازی لە رادە و بواری تەکنیکی لە ئارادا بێت. دەشێت رێکخستنی، بەرهەمەکەی، ئایدیۆلۆژیا و بەڕێوەبەرایەتییەکەی شێوەی جیاواز وەربگرێت. بەڵام ئەو تایبەتمەندێتییەی لەژێر تەولوی ئەم جیاوازی و شێوانەیدا درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات، هەژموونگەرایی پاوانە لەسەر زێدە ـــ بەهاکان. دەشێت ناوەرۆکی پاوان بگۆڕێت، بەڵام خۆی ناگۆڕێت. هەموو کاتێك سێینەی راهیب + سەرباز + بەڕێوەبەر لە ئارادایە. بەگوێرەی کات و شوێن دەشێت قورساییەکەیان بگۆڕێت. بەڵام پاوان ناچارە بەردەوام ئەم توێژانە چاودێری بکات. هەروەها دەشێت پەیرەوەکانی بەدەستهێنانی بەهاکان و زێدە ـ بەرهەمیش جیاوازبن، بەڵام خۆی ناگۆڕێت. زێدە ـ بەرهەم یان لە رێگای زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی، یان لە

ـایەی بازرگانی و فەتحی سەربازییەوە کۆدەکرێتەوە. لەوانەیە یەکێك لەم پەیڕەوانە لەپێش بێت. بەڵام دیسان کەڵەکە بوون کۆی ئەنجامی ئەم پەیڕەوانەیە.

پێویستە گرنگییەکی زۆر بە تێگەیشتنی پاوان بدەین. هەروەکو چۆن تەنیا سەرمایە نییە، بەهەمان شێوە دەسەڵاتیش نییە. تەنیا لەبوارەکانی بازرگانی، سەربازی و کارگێڕی پێکنایەت. بەڵکو گوزارشتی گشتی کۆی تەواوی ئەم گۆڕەپان و بەهایانەیە. لە بنەڕەتدا پاوان ئابووریش نییە. لەمیانەی ئەو توندوتیژی، ئامراز و رێکخستنانەی بە دەستیەوەیە هێزی زەوتکردنی گۆڕەپانی ئابوورییە، واتە کۆمپانیایە. بەڵام هەروەکو لێی راهاتووین و لامان باوە کۆمپانیای ئابووری نییە، بەڵکو لە دواشیکاردا هاوبەشێتی کەڵەکەکردنی سەرمایەیە. هەندێکجار وەك ئامێرێکی دەسەڵات رووبەڕوومان دەبێتەوە کە نەبووە بەدەوڵەت، هەندێکجاریش وەك دەوڵەت رووبەڕوومان دەبێتەوە. بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا زیاتر سیفەتی "کۆمپانیای ئابووری" بەکاردەهێنرێت. هەروەکو باسمکرد لە ئابووری زیاتر، ناوبردنی بە " کۆمپانیای زەوتکردنی ئابووری " راسترە. دەشێت هەندێکجار وەك سوپا، لەزۆر جێگاش وەك یەکێتی بازرگان و پاوانی پیشەسازی خۆی پیشانبدات. وەك هەشتپێ (ئەختەبووت) دەشێت پاوانیش چەندین لقی هەبێت. لەوانەیە هەندێکجار وەك کاریگەری یەکگرتووی چەندین ماتەوزە و هێزی جیاواز سەرهەڵبدەن. لای هەمووشیان خاڵی گرنگ ئەوەیە کە زێدە ـــ بەهای کۆمەڵگا وەك سەرمایە لە دەستیاندا کۆببێتەوە. ئەمە ئەو راستییە بنەڕەتییەیەتی کە پێنج هەزار ساڵە نەگۆڕاوە، بەبێ پچڕان بەردەوامە و بەشێوەی کەڵەکەبوون گەورە دەبێت. پێکهێنانی ناوەند ـــ کەنار، هەڵکشان ـــ داکشان و کێبڕکێ ـــ هەژموون لەکات و شوێنی جیاوازدا لەپێناو بەردەوامی ئەم راستییە نەگۆڕەیە و بەڕێوەچوونێتی وەك ئەڵقەی زنجیرێکی نەپچڕاو.

پێویستە سەرنجی ئەم خاڵە بدرێت کە وشەکانی " سەرمایەداری" ، " سیستەمی سەرمایەداری" زاراوەیەکن بە ئامانجی پڕوپاگەندە بەکاردەهێنرێن. وەك ناوەڕۆك دەشێت هەندێك هاوتای ئەم زاراوانە دیاریبکرێن. بەڵام کاتێك وەك سیستەمی دیاردە، رووداو و پەیوەندییەك راڤە بکرێت کە گوزارشت لە حەقیقەتی تەواو دەکات، زاراوەیەکن رادەی شێواندنی سروشتی کۆمەڵگا و کێشەکانی بەرزە. لێشاوی ژیانی کۆمەڵگا جیاوازە. لەمیانەی ئاست و رەهەندەکانی ئەو کێشانەی بە دەستییەوە دەناڵێنێت، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەرکی پێدەکرێت کە زانست و زمانێکی نوێ بۆ ئەم لێشاوە پێویستە.

ئەگەر سەرمایەداری سیستەمێکی کەڵەکەکردنی سەرمایە بێت، ئەوا بە بەڵگە سەلمێنراوە کە یەکەمین کرداری بەرفراوان لەم بارەیەوە لە دەوڵەتشارەکانی سۆمەر ئەنجامدراوە. ئەگەر بەشێوەیەکی سەرەتاییش بێ کۆمپانیاکانی سەرمایە، پارەکانیان، کۆگا، ڕێکخستن و بەڕێوەبەرایەتییەکەی بناخەی ئەم دەوڵەتۆکانەی شارە. لەوانەیە خودی شاریش یەکەمین کۆمپانیای سەرمایە و خودی پاوان بێت. هەر لەو قۆناخەوە راهیبە بەڕێوەبەرەکان و کارکەر — کۆیلەکان، لەگەڵ سوپای هونەر، زانست، سەربازی و بازرگانی چینی کۆمەڵایەتی سەرەکین. پەرستگا (زەقورە) لەهەمانکاتدا کارگە بوو، پەناگەی لەخۆوەگرتنی کارکەر — کۆیلە، هەروەها ناوەندی بەڕێوەبەر — فەرماندەی سەربازی و بەڕێوەبەرایەتی راهیب بوو. هەڵبەتە نهۆمی هەرە سەرەوەی جێگەی چاودێری و کۆنترۆڵی خوداوەندەکان بوو. هەمووی بەشێوەیەکی تێکەڵاو و کامڵ رێکخرابوو. من ئەم نموونەیە زۆر سەرسوڕهێنەرو سەمەرە دەبینم. وەك "منداڵدانی" شارستانییەکەمان (تەواوی بونیادەکانی دەوڵەت، چین و شار) هەڵیدەسەنگێنم. چیرۆکی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە جگە لە راستینەی ئەم پەرستگایە کە بۆ زەمەن و شوێنی دیکە کراوەتەوە و بڵاوبۆتەوە هیچ شتێکی دیکە نییە.

باوەڕ ناکەم کۆمپانیا، خستنەگەڕ و پاوانێکی سەرمایەداری لەوەی رێکخستنی پەرستگا رەسەن و کامڵتر بئافرێنرێت. هەروەکو چۆن سەرچاوەی سەرەکی سەرجەم شانەکان خانە بنچینەییەکانن، خانەی بنچینەیی بونیادی تەواوی پاوانەکان (بەڕێوەبەر، سەرباز، ئابووری، بازرگانی، زانستی — هونەری)یش ئەم راستینەی پەرستگایە. تەواوی هەڵکۆڵینە ئەنجامدراوەکانی شوێنەوارناسی ئەم راستییە دەسەلمێنن. نموونەی بەردە چەقێنراوەکانی گۆبەکلی تەپەی ئورفا کە هەرە دوایی ئۆزراوەتەوە و بە " ئەستێرە درەوشاوەکەی" مێژووش ناودەبرێت، بەگوێرەی زانیارییەکان شیمانە دەکرێت کۆنترین پەرستگا بێت (١٠٠٠٠ — ٨٠٠٠ پ.ز). بۆچوونی شوێنەوارناسە ناسراوەکان بەمجۆرەیە. لە هەر هەڵکۆڵینێکدا نموونەی ئاشکرا و سەلمێنەری ئەو راستییە دەردەکەوێت کە یەکەمین کەڵەکەکردنی سەرمایە بەرلە مێژوو، بەمجۆرە دەستی پێکردووە.

ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە " سەرمایەی" ناوەندێتی ئەورووپا نوێنەرایەتی لوتکە و شێوەی هەرە دوایی پاوان دەکات. ئاشکرایە کە لەشێوازی بەرهەمهێنان و کەڵەکەکردنەوە تا رێکخستن و بونیادی بەڕێوەبەرایەتی، لە پێکهاتەی سەربازییەوە تا دەگاتە پاوانەکانی زانست و تەکنیك و هونەر جیاوازی دروستکردووە. بەڵام بانگەشەی بێ هاوتابوونی، زێدەڕۆییەکی مەزنە.

ئەمە پڕوپاگەندەیەکە ناوەندەکەی ئەوروپایە: بەگوتەیەکی دیکە بانگەشەی چینە نوێکەی ڕاهیبەکانی پەرستگای ئەوروپا (سوپای زانستی ئەکادیمی، هونەر، زانکۆ)یە کە دەمامکی مۆدێرنیتەیان پۆشیوە. بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە ئەمانە لە کڵێسای کرستیانی زیاتر خزمەتی مەشروعیەت پێدانی " سیستەمی سەرمایەداری " نوێ دەکەن.

بابەتەکەمان نووسینی مێژووی هەڵکشانی شارستانی ئەوروپا نییە کە لەسەر بنەمای "سیستەمی سەرمایەداری" بەدیهاتووە. بەڵام ئەوەش یەکێکە لە ڕاستییە زانراوەکانی مێژووی نوێ کە ئەم شارستانییە لەسەر شوێنپەنجەی شێوازی بەڕێوەبەرایەتی، تەکنیک، زانستی، بازرگانی و ئیۆلۆژیای کرستیانی سەدەکانی پێنجەم و شەشەمی زایینی و ئیسلام (بە تایبەتیش لە ڕێگای نیمچە دوورگەی بەڵقان، ئیتالیا و ئیبریک)ی سەدەکانی نۆیەم و دەیەمەوە هەڵکشاوە. تەواوی مێژووناسەکان هاوڕان کە لە ساڵانی ١٢٥٠ زایینییەوە لە ناوەندی هەژموونگەرایی شارستانی خزاندنێك جێگای باسە، ناوەندەکانی شارستانی کە لە ڕۆژهەڵات لە دابەزیندایە، لە ئەوروپا لەهەڵکشاندایە. هەروەها ئەو سەدەیە (سێزدەهەم) بە سەدەی شۆڕشی بازرگانیش ناودەبرێت. لەسەدەی یازەدەهەمەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەم بە تایبەتیش بە پێشەنگایەتی ڤێنسیا، جەنەوا و فلۆرەنسا تەنیا کاڵاکان لە ڕۆژهەڵاتەوە نەگوازراونەتەوە، بەڵکو بەهەموو قورساییەکەوە نەریتەکانی تەواوی شارستانی هەزاران ساڵە، فیکر و ئامرازەکانیان، شێواز و پەیڕەوەکانیان، بەکورتی" ڕاستییەکی مێژوویی زانراوە کە گشت بەها "بەرجەستەکان"ی کۆمەڵگا گواستراوەتەوە. ئاشکرایە کە ناوەندی شارستانی لەسەر ئەم بنەمایە گواستراوەتەوە. ئەوەش ڕاستییەکی مێژووییە کە کرستیانی، تەنانەت شارستانی گریك ـــ ڕۆما، دوورتریش شۆڕشی نیولیتیکیش (٥٠٠٠ ـــ ٤٠٠٠ پ.ز) لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئەوروپا گواستراوەتەوە و کەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات. بەبڕوای شەخسی خۆم، کلتووری کۆمەڵگای کیشوەری ئاسیا بەتایبەتیش کلتووری پازدە هەزار ساڵی دوایی ڕۆژهەڵاتی نزیکی ئاسیا بۆ نیمچە دوورگەی ئەوروپا گواستراوەتەوە، بەمجۆرە سەرسوڕهێنەرترین سەنتێزی ئەم پێنج سەد ساڵەی دوایی پێکهاتووە. بە تاکە ڕستەیەك ئەمەیە شرۆڤەی من بۆ مێژوو.

کێشەیەکی بەمجۆرەم نییە کە ڕۆژهەڵاتگەرێتی یان ڕۆژئاواگەرایی بکەم. تاکە ئەندێشە، ئامانج و هەوڵم لەوپێناوەدایە کە لەناو یەکێتیدا شرۆڤەیەکی ڕاست لەبارەی جیاوازی بەردەوامی، نەپچڕان و یەکگرتوویی کۆمەڵگای مێژوویی بکرێت.

بێگومان ئەوەی گواستراوەتەوە تەنیا بونیاد و پەیڕەوە سەرەکییەکانی شارستانی ناوەندی نییە. بەڵکو بەهەمان شێوە کێشەکانی کۆمەڵگاش گواستراوەتەوە. بەکورتی باسی ئەو کێشانەمان کردبوو کە کرستیانی گواستبوونییەوە. بەهاکانی شارستانی ماددی ڕۆژهەڵات (بازرگانی، بەرهەم، دراو، دەوڵەت) بەلانی کەم هێندەی بەها مەعنەوییەکان (کرستیانی، زانست) بەکێشەبوون. بە واتایەك لە واتاکان ئەوروپا بەهۆی کێشەکانەوە خنکابوو. هەروەها پێویستە شێمانەی ئەو بوومەلەرزانەش بکرێت کە لە ئاکامی گواستنەوەی سروشتی ناکۆکی کۆمەڵگای ئاڵۆزی ڕۆژهەڵات بۆ کۆمەڵگای کشتوکاڵی — نیولیتیکی ئەوروپا دێتە ئاراوە کە هێشتا تێکنەچووە و بە لاوی ماوەتەوە. پێشبڕکێی بەدەستهێنانی پاوان کە بەهەزاران ساڵ ڕۆژهەڵاتی لە شەڕەوە گلاند، هەڵبەتە ئەو وێرانکارییانەی لە ئەوروپای ئاناماده ( خەباتەکانی بۆ ئامادەباشی سەرەتا ناتەواو بوو)دا ڕێگای لەپێش بکاتەوە، جەرگبڕ و رووخێنەرتر دەبێت. پێکدادانەکانی ناوخۆی سیستەم کە لە سەدەی شازدەهەمەوە بڵێسەی گرت، شوێنپەنجەی میراسی هەزاران ساڵەی ڕۆژهەڵاتی پێوەیە. ئەو پێکدادانەی لە سەردەمی ڕۆماشەوە لە ئارادایە شوێنپەنجەی هەمان کلتوور لەخۆوە دەگرێت. بەبێ زێدەڕۆیی دەتوانم بڵێم" تەنیا بەها ئەرێنییە ماددی و مەعنەوییەکانی شارستانی ناوەندی بۆ ئەوروپا نەگواسترایەوە، بەڵکو ناکۆکییە قورس، کێشە، پێکدادان و شەڕەکانیشی گواسترایەوە. تەنانەت بە زیادیشەوە شوێنپەنجەی جینۆسایدە جەرگبڕەکان لە نەریتی شارستانی ڕۆژهەڵاتدا دەبینرێت. پادشا ئاشوورییەکان شانازییان بەوە دەکرد کە شورا و قەڵایان لە کەللەسەری مرۆڤ دروستکردووە. تەواوی ستەمکارەکانی ڕۆژهەڵات، بە سەرفرازییەوە باس لەوە دەکەن کەچۆن چەندین جڤاتی هۆز، گوند و شاریان لەناوبردووە و مرۆڤەکانیان وەك دیل بردووە. بەتایبەتیش وەك داستانەکانی قارەمانێتی باسی دەکەن.

زانا کۆمەڵایەتییەکانی ئەوروپا لەخۆڕا لەپێناو بەدواداچوونی ڕۆژهەڵات نەکەوتوونەتە گەڕ. ئەم هەوڵانەیان واتادار دەبینم. هەرچی ئەو ڕۆژهەڵاتناسییەیە کە لە بەردەستاندایە زۆر لە باسکردنی ڕاستییەوە دوورە. بەڵام دیسان بە بەراورد لەگەڵ ئەم مێشکەی ڕۆژهەڵات کە وەك بەرد ڕەق هەڵاتووە، پێویستە بڵێم، سوپاسگوزاریکردنیان قەرزێکی سەرشانمانە. هەرچەندە ئەم هەوڵانە پێشینە نیازی داگیرکاریش لەخۆوە بگرێت، بەڵام ئەگەر بڵێین" ئامانجە بنەڕەتییەکەی ئەمە نییە، بەڵکو ئامانجی تێگەیشتنی چیرۆکی شارستانیبوونی ئەوروپایە گوزارشتێکی ڕاسترە. چونکە ڕێگای تێگەیشتنی ئەوروپا بە تایبەتیش تێگەیشتنی ناکۆکی، کێشە و شەڕەکانی

بەشیکارکردنی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا تێپەڕ دەبێت. ئامانجێکی دیکەی ئەم هەوڵە سەبارەت بەو بابەتە، پێشکەشکردنی کۆمەکێکی خاکیانەیە دەرهەق بە بابەتی پەیڕەو و شێوازەوە.

زۆربەی زۆری مرۆڤە ڕۆژهەڵاتییەکان، ئەورووپاییەکان بە مرۆڤی ژیر و بەخۆ باوەڕ تێدەگەن. هەرچی منم، هەر ئەورووپاییەکی چاوم پێی دەکەوێت بە ناشارەزا و هێندە ناسک، ساف و ڕووتی دەبینم کە ناتوانێت لە کلتووری ڕۆژهەڵاتدا بژیت!

لەو بڕوایەدام کە نەریتی کۆمەڵگای نیولیتیکی ئەورووپا کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر شارستانیبوونەکەی دوای سەدەی شازدەهەم هەبووە. شۆڕشەکانی شاری دوای سەدەی دەیەمیشی لەناودا، تا سەدەی شازدەهەم مرۆڤی نەریتی ئەورووپا ئایینی کرستیانی پەسەندکرد، بەڵام یەکسەر ڕاڤەی تیۆلۆژی خۆشی پێشخست. ئەمەش بەرەو ڕینسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری و شۆڕشی زانستی ــ فەلسەفی برد. بەرامبەر بە بڵاوبوونەوەی دواترین نەریتی شارستانی (ئیسلام) ڕۆژهەڵاتی نزیك، ڕۆژهەڵات پەرەسەندنێکی هاوشێوەی کۆمەڵگای نیولیتیکی پیشان نەدا. بێگومان چەندین زانا، ڕاڤەکار و هونەرمەندی سەرکەوتووی بەڕیشە تورك، فارس و کورد پێگەیشتن. ڕێنسانسێکی سنووردار (سەدەی ٨ ــ ١٢ زایینی) ڕوویدا. بەڵام دەستپۆتیزمی باوی ڕۆژهەڵات لە ڕێگای بونیادە ڕەق و دۆگماکەیەوە دووبارە خۆی بەسەر تەواوی شانەکانی کۆمەڵگادا سەپاند. یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی شەڕی ناوخۆیی ئیسلامیش ئەوەبوو. هەڵبەتە ئامانجی سەرەکی دەستبەسەرداگرتنی پاوان بوو. هەروەها نزیکەی پێنج هەزار ساڵ بوو نەریتی کۆمەڵگای نیولیتیکی ڕۆژهەڵات لەژێر داسەپاندنەکانی دەسپۆتیزمی پاوان ماندوو، نەزان و بێچارە کەوتبوو. بەرامبەر بەمەش نەریتی نیولیتیکی ئەورووپا زیندوو، ئازاد و ئافرێنەر بوو. چونکە وەك ڕۆژهەڵاتییەکان زۆرداریيەکی پێنج هەزار ساڵییان لەسەر بەڕێوە نەچووبوو. جگە لەمەش هەروەکو باسمانکرد لایەنە ئەرێنییەکانی ئەزموونە گەورەکەی ڕۆژهەڵاتی وەرگرتبوو. ئەم دوو خاڵە سەرەکییە سەبارەت بە تێگەیشتنی هەڵکشانی مێژووی ئەورووپا وەك کلیل بایەخدارە.

ئەم ڕوونکردنەوە کورتانە بەگوێرەی پێویست ڕوونی دەکەنەوە شرۆڤە و ڕاڤەکانی والرشتاین و گرووپی ئەو زانا کۆمەڵایەتیانەی لێیەوە نزیکن لەبارەی " سیستەمی جیهانی سەرمایەداری" کە لەسەدەی شازدەهەمەوە دەستی پێکرد، خەباتێکن لەبنەمای مێژوویی دابڕاون و سەرمایە وەك نوێنەوەیەکی کۆن نابینن، بەلانی کەم لەم لایەنەوە ناتەواوی و کەموکوڕی جددیان هەیە. تەنانەت شێوازی ڕوونکردنەوەی کەڵەکەبوونی سەرمایەی کاپیتالیزم کە لە سێگۆشەی ڤێنسیا، ئەمستردام و لەندەن چڕبۆتەوە، هەمان کەموکورتی لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر فشارە قورسەکانی

کارلۆسی پێنجەم[٥] و کوڕەکەی فلیپی دووەم[٦] بە درێژایی سەدەی شازدەهەم بۆسەر دوورگەی ئینگلتەرا، هۆڵەندا و ئیتالیا نەبوایە ئایا خستنەگەڕی پارە ـــ سەرمایە لەبواری بەرهەمی کشتوکاڵی و مانیفاکتۆرا بەم چڕییە دەبوو؟ رابوونی نەتەوەیی و گەشەسەندن کە لە کەسایەتی ڤێنسیا لە ئیتاڵیا نەیتوانی سەرکەوتنی تێدا بەدەست بێنێت، هۆڵەندا لە رێگای ئەمستردام دەستی پێکرد، هەروەها ئینگلتەرا ـ لەندەنیش بەسەرکەوتنیان گەیاند، ئەی بەتایبەت بەرامبەر بە فشارە سیاسی ـــ سەربازییە دەرەکییەکان لەرێگای بەرخودانی ناوخۆ ئەم سەرکەوتنەیان بەدەست نەهێنا؟ ئەو وەڵامەی بدرێتەوە هەردوو پرسیار، گوتەکەی فرناند برۆدل دەسەلمێنێت: " ئەوەی چڕدەبێتەوە تاڵانە، ئەوەی سوودمەندە دەوڵەت ـ دەسەڵاتە، سەرمایەداری دەردەداتەوە". بڕوای من لەپێشترە: دەسەڵات ـــ دەوڵەت خودی پاوان و سەرمایەیە. هەڵبەتە ئەگەر ئەوانە پاوانی سەرمایە نەبوونایە، نەدەشیا سەرمایە دەردەنەوە. ئەگەر بەلێکچواندنێك گوزارشتی لێبکەین چۆن "تەگە" نائۆشرێت و شیر بەرهەم ناهێنێت، سەرمایەش لەئامێرێکی دەوڵەت ـــ نەتەوەدا فەراهەم ناکرێت ئەگەر پاوان نەبێت.

هەم فشارەکانی دەوڵەت ـ دەسەڵاتی دەرەوە، هەم بەرخودانی دەوڵەتی ناوەوە، هۆکاری راستەقینەی ئافراندنی راستینەی ئینگلتەرا و هۆڵەندان. ئەو ئیمپراتۆرییەتەی کە ناوەندەکەی ئیسپانیا بوو، لەبەرئەوەی باش هەڕەشەکەی سەرخۆی بینیبوو، سەرەتا دوای ئەوەی پێهەلگرتنی شارەکانی ئیتاڵیای سەرکوتکرد (رووبەڕووبوونەوەکەی میری ماکیافیللی سەرکەوتوو نابێت) بەهەموو هێز و توانایەکیەوە هێرشی کردە سەر پێکهاتە میللیگەرایی ـــ پاوانخوازییە نوێیەکەی دوورگەی ئینگلتەرا و ئەیالەتی هۆڵەندا. ئەگەر سەرنەکەوتبوایە ئەوا خۆی هەڵدەوەشایەوە و لەناودەچوو. بەرخودانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا بەرفراوان و درێژخایەنە. ئەمەش لەبوارەکانی دیپلۆماسی، ئابووری، سەربازی، بازرگانی، زانستی ـــ فەلسەفی، تەنانەت لەبواری ئایینیشەوە (بزووتنەوەی پرۆتستانێتی ) واتە لەچەندین بەرەوە پێشخرابوو. زۆر باش دەزانرێت ئەم بەرخودانە ستراتیژییەی لە تەکنۆلۆژیای سەربازی و رێکخستنە ستراتیژی و تەکتیکیەکانەوە، تا

[٥] شارلی پێنجەم(V.Carlos): یەکێك لە کەسایەتییە مەزنەکانی مێژووی ئەورووپییە (١٥٠٠–١٥٥٨). بە ناوی کارلۆسی یەکەم بووە بە پادشای ئیسپانیا.

[٦] فیلیپی دووەم(II.Philip): کوڕی شارلی پێنجەمە (١٥٢٧–١٥٩٨) لە پێناو بە هێزکردنی پێگەی سیاسی و سەربازی ئیسپانیا کاری کرد. لە سەردەمی حوکمڕانیکردنیدا دادگاکانی ئەنگیزاسیۆن بە لوتکەی خۆی گەیشت. لە ساڵی ١٥٦١ناوەندی پاشایەتی لە تولیدو بۆ مەدرید گواستۆتەوە.لە ساڵی ١٥٨٠ پورتوگالیشی خستۆتە سەر سنوورەکانی ئیسپانیا.

رادیکاڵترین راڤەی پرۆستانێتی کرستیانی(کالیفانیزم[٧]، ئەنگلیکانیزم[٨])، رێکخستن و خۆ تەیارکردنی بە تەکنیکێك کە ئابووری بەرزترین ئاستی بەرهەم بەدەست بێنێت، تا دەگاتە دیبلۆماسییەك کە بیر لە رێککەوتن لەگەڵ عوسمانییەکان بکاتەوە و دەوڵەتی بروسیای ئەڵمانیا بەلای خۆیدا راکێشێت، بەشێوەیەکی زۆر فراوان بەڕێوەچوو، لەکۆتاییەکەیدا تەنیا بە بەدەستهێنانی سەرکەوتن نەوەستان، بەڵکو رێگای لەپێش ئەوە کردەوە ئەمستردام و لەندەن ببنە ناوەندە نوێکەی هەژموونی شارستانی.

هەروەکو دەزانرێت لەم نێوانەدا چالاکییەکانی سەرمایە زۆر زیادی کرد، بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا ئیتر پارە ــ سەرمایە (هەروەکو دەزانرێت زۆربەی زێڕ ــ زیو لە ئاستی جیهاندا هێزی فەرمانڕەوایی بەپارە دەدات) رۆڵی سەرەکی دەبینێت، چەندین بنەماڵەی پارەدار ( بەڕیشە یەهودییەکان شایانی باسکردنن) لەرێگای قەرزپێدان بە دەوڵەتەوە، سەرمایەیەکی زۆر گەورەیان کۆکردەوە، هەروەها ئەمجۆرە پەرەسەندنانە رۆڵێکی دیاریان بینی کە بۆرژوازی وەك چینێك رێکبخرێت. دیسان پێویستە ئەوەش پشتگوێ نەخرێت کە لەقۆناخی ئەم بەرخودانە ــ نەتەوەییە گەورەیە، چینێکی کۆمەڵایەتی لەچەشنی چینی کارکەر پێکهات. ناڵێم بە تەولوی ئەم قۆناخە ئاوایکرد، بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لە گرنگی رۆڵ و کۆمەکەکەی بکرێت. ناخوازم گفتوگۆیەکی لەوجۆرە بکەم: بناخەی ئابووری (ژێرخان) و بونیادە سیاسی ــ سەربازی (سەرخان)یەکان کامەیان لەپێشترە؟ لەوبڕوایەدام کە ئەمە گفتوگۆیەکی واتادار نییە. بیرۆکەکانی ئابووری ــ سیاسی بۆرژوازی (سەرمایەی مارکسیشی لەناودا ) کە بۆنی پڕوپاگەندەیان لێوەدێت، لە روونکردنەوەی راستییەکان زیاتر پەردەپۆشیان دەکات. ئیتر لەمێژە کاتی هاتووە کە نەبن بە ئامرازیان.

---

[٧] کالڤینیزم یان کالفینی (Calvinizm): مەزهەبێکی پرۆتستانێتی ئایینی کرستیانییە، ریفۆرمخوازی فەرەنسی جۆن کالفن دایمەزراندووە کە خاوەن پەرتووکی (بنەماکانی باوەڕی کرستیانی) یە، کە بە گرنگترین پەرتووکی سەبارەت بە بزووتنەوەی پرۆتستانێتی دادەنرێت، لە سەدەی حەڤدەهەم لە ئەورووپا و ئەمریکای باکوور بڵاوبۆتەوە، لە سەرهەڵدانی ئەقڵیەتی سەرمایەداری ئەورووپا رۆڵێکی گرنگی بینیوە.

[٨] ئەنگلیکانیزم (Anglikanizim): زاراوەیەکی چاخەکانی ناوینە، بە واتای کلێسای ئینگلیزی دێت. بۆ وەسفکردنی ئەو کەس، دامەزراو، کلێسا، نەریتی ئایینی، رێورەسم و چەمکانە بەکار دەهێنرێت کە لە کلێسای ئینگلتەرادا ئاواکراون و شێوەیان گرت. لە هەندێك بەشی جیهان بە ئەسقفی دەناسرێت. یەکێك لە تائیفە گەورەکانی پرۆتستانێتییە. گرنگی بە ناسنامەی تایبەتی خۆیان دەدەن.

ئاشـكرایە كـە پێهـەڵگرتنی سـەدەی شـازدەهەم لەمێـژووی شارسـتانیدا بـە سیسـتەم و هەژموونگەرایە. هەروەها ئەمەش ئاشكرایە كە لـە ڕێگـای ڤێنسـیاوە (تـەولوی شـارەكانی ئیتاڵیـا) ناوەند بۆ ئەمستردام و لەندەن خزاوە، یەكەمین مۆدێلەكانی دەوڵەت ـ نەتـەوەش بەپێشـەنگایەتی ئینگلتەرا و هۆڵەندا پێشخراوە. ڕاستییەكی حاشا هەڵنـەگرە كـە شارسـتانی هەڵكشـاو لـە تـەواوی ئەوانەی پێشخۆی جیاوازترە و وەرچەرخانێكی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بـەڵام ئەگـەر تـەواوی ئـەم پەرەسـەندنانە لـە كـاروانی شارسـتانی ناوەنـدی پێـنج هـەزار سـاڵە دابـبڕین، بـۆ نموونـە ئەگـەر ئەكەدییەكان لە سۆمەر، ئاشوور و بابلییەكانیش لـە ئەكەدییـەكان دابـبڕین، مـاد ـــ پارسـەكان لـە ئاشوورییەكان، میسر و هۆرییەكان و هیتیتەكانیش لـە شارسـتانی میزۆپۆتامیـا دابـبڕین، هـەروەها شارستانی گریـك ـــ ڕۆمـا لـە تـەواوی ئـەم پەرەسـەندنانە دابـبڕین، ئایینـە ئیبراهیمییـەكانیش لـە هەموویان دابـبڕین، ئایا دەتوانرێت باس لەشارستانی ئەورووپا بكرێت؟ تەنیا ئەگەر ئـەو گواستنەوە دەریاییـە نەبوایـە كـە شـارەكانی ئیتاڵیـا پێشـەنگایەتیان كـرد ( ١٠٠٠ ـــ ١٣٠٠ زایـینی )، ئـەم گواستنەوە تا كەنارەكانی ئەورووپای ڕۆژئاوا (١٣٠٠ ـ ١٦٠٠ زایینی) بەردەوام نەبوایە، ئایـا دەشـیا پەرجووەكانی ئەمستردام و لەندەن ڕووبدەن؟

ئەگـەر دەرك بـە هـەموویێتی و بـەردەوامبوونی سیسـتەمی شارسـتانی جیهـان نـەكرێت، ئـەوا ڕوونكردنەوەكانی كۆمـەڵگای مێـژوویی، شـیكردنەوەكانی زانسـتی كۆمەڵایـەتی و تیۆرییـەكانی لـە بەهەڵەداچوون و كەموكوڕی گەورە ڕزگـاری نابێـت. لەكاتێكـدا سروشـتی یەكـەمیش پێویسـتی بـە ڕوونكردنەوەی مێژوویی سـەرتاپاگیر هەیـە، ئـەوا شـیكردنەوەی سروشـتی كۆمەڵایـەتیش لـەبواری مێژوویی، فەلسەفی ـ زانستییەوە كە بەشێوەی ئەڵقە بنچینەییەكانی زنجیرێك بەناویـەكتردا چـووە، لەناو هەموویێتی و سەرتاپاگیریەكی چڕتردا پەیرەوێكی گـرنگ و دەسـت لێبەرنـەدراوە. هـەژموونی زانستی كۆمەڵایەتی ئەورووپا بۆ ماوەیـەكی درێـژ لـە ڕێگـای میتـافیزیكێكی پۆزێتیڤیسـتی ڕەهـاوە نكوڵی لەم ڕاستییە كرد، لەوانەیە بەمجۆرە خزمەتی بە هەژموونگەرایی شارستانی كردبێـت. بـەڵام لەبواری زانستی كۆمەڵایەتیشەوە ڕێگای لەپێش ئاڵۆزییـەكی مەزن كردەوە. سـەبارەت بـەم بابەتـە شیكارەكانی سەرمایە (پەرتووكەكەی ماركس) بەرپرسیارێتییەكی گـەورەی كەوتۆتەسـەر. بـەهۆی كەڵەكەبوونی ئەو كێشە قورسانەی لە ئارادان، ناتوانرێت نكوڵی بكرێت كە بەشـێكی زۆری باسـەكە لەجیاتی ئەوەی سیستەمەكەی ڕوون بكاتەوە، خزمەت بەپەردەپۆشكردنی دەكات.

هاوفیكرییەك لەو بارەوە هەیە كـە پاوانـەكانی سـەرمایەداری بەدرێـژایی مێـژوو ئاراسـتەیەكی ناوەندی، قەیراناوی و هەژموونییان هەبووە، لە قۆناخی ئـەورووپادا لەسـەدەی پازدەهـەم ڤێنسـیا،

لەسەدەکانی شازدە و حەڤدەهەمیش هۆڵەندا ـــ ئەمستردام ناوەندەکەی بووە، بەدرێژایی سەدەکانی هەژدەهەم و نۆزدەهەمیش بە قورسایی ئینگلتەرا ـــ لەندەن ناوەندەکەی بوون. ئەو شەڕانەی پاوانی شارستانی فەرەنسا بەدرێژایی سەدەکانی پازدەهەم ـــ هەژدەهەم بە ئامانجی بەدەستهێنانی هەژموونگەرایی بەرامبەر بە ئیسپانیا، هۆڵەندا و ئینگلتەرا هەڵیگیرساند(خەیاڵەکەی ئەوەبوو ببێتە رۆمای نوێ) بە ژێرکەوتنی کۆتایی هات. ئەو پێهەلگرتنە شارستانیانەی ئەڵمانیا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەنجامیدا، لە ساڵی ١٩٤٥ لەئەنجامی ژێرکەوتنێکی تەواو، دووچاری کارەسات هات. سەدەی بیستەم بووە شاهیدی هەڵکشانی شارستانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەدوای ساڵی ١٩٤٥یشدا باڵادەستی خۆی بەهێزکرد، هەروەکو تێبینیش دەکرێت لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا (دوای ٢٠٠٠) درزدانی دەستی پێکردووە. تاقیکردنەوەی هەژموونگەرایی روسیای سۆڤێت لەنێوان ساڵانی ١٩٤٥ ـــ ١٩٩٠ سەرکەوتوو نەبووە. بانگەشەی ناوەندی نوێی هەژموونگەرایی کە بۆ داهاتوو سەبارەت بە چین پێشدەخرێت، ئەمە ئێستا قەبڵاندنێکە. هەر وەکو زۆرجار نموونەکەی لەمێژوودا بینراوە، دەشێت سەردەمێکی هەژموونگەرایی فرەناوەند قۆناخی داهاتوومان دیاربکات. دەشێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، چین و ژاپۆن ببن بە ناوەندی بەخۆباوەڕ. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە ئێستا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێزی هەژموونگەرایی سوپەرە.

بەکورتی ئاماژەم بە شرۆڤە و راڤە بێ هاوتاکانی کۆمەڵناسی ئینگلیزی ئەنتۆنی گیدنس کردبوو کە سەبارەت بە مۆدێرنیتەی ئەوروپا ئەنجامیدابوو. لەگەڵ ئەوەی بەڕێزە و لەژێر سەرەدێڕی جیاواز ئاماژە بەکێشەکان دەکەم، بەڵام لەمیانەی روانگەیەکی گشتییەوە پێویستە بڵێم" ئەم بانگەشەیە زیاتر ناوەندەکەی ئەورووپایە و لەمێژوو دابڕاوە. هەڵسەنگاندنەکانی گیدنس ـــ پێویستە وەك شرۆڤەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئاماژەی پێبکەین ـــ لەکاتێکدا بەتەواوی سەرمایەداری بە سیستەمێکی ئەورووپایی دادەنێت و پیشەسازیش زیاتر بەشۆڕشێکی ئەورووپایی لەقەڵەم دەدات، دەوڵەت ـ نەتەوەش وەك سێیەمین پێچکەی سیستەم، بەشێوەی رژێمێکی نوێ پێشکەشی دەکات. ئەگەر دووبارەش بێت پێویستە ئامارەی پێبکەم، سەرمایەداری لە تەواوی شارستانییەکاندا تێبینی دەکرێت. لەهەرشارستانییەکیشدا کەم زۆر پەرەسەندن و شۆڕشە پیشەسازییەکان جێگای باسن. هەرچی دەوڵەت ـ نەتەوەشە، دەشێت وەك ئۆخی دەوڵەتی قەوم و خانەدان لە کۆمەڵگای نەتەوە(ئوممەت) دیاربکرێت و بەمجۆرەش پێناسەبکرێت. بەمەرجێك

زێدەڕۆیی لێنەکرێت، دەشێت ئەم پۆلێنانە سەبارەت بە تێگەیشتنی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگ بەشێوەیەکی واتادار بەکاربهێنرێت.

کێشە کۆمەڵایەتییەکانی شارستانی ئەورووپا، ڕاستتر بڵێین قۆناخی شارستانی ئەورووپا کە بەشێوەی ناکۆکی و پێکدادان و شەڕ، تەنانەت بەشێوەی جینۆسایدیش ڕەنگیدەدایەوە، وەك سەرجەم گۆڕەپانەکانی پەرەسەندن، ئەویش بە لوتکە گەیشتووە. گەورەیی و ئاستی بڵندی کێشە زهنی، ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری، سەربازی، دیموگرافی، ڕەگەزگەرایی، میللیگەرایی، ئایینگەرایی و ئیکۆلۆژییەکان بابەتی سەرەکی زانستە کۆمەڵایەتییەکانن. لەم چوارسەد ساڵەی دوایی ئەورووپا لەکۆی مێژوو زیاتر شەڕی بەخۆیەوە دیوە. هەموو جۆرەکانی شەڕ ڕوویداوە. هیچ جۆرە شەڕێکی ئایینی، ئەتنیکی، ئابووری، بازرگانی، مەدەنی، نەتەوەیی، چینایەتی، ئایدیۆلۆژی، ڕەگەزگەرایی، سیاسی، دەوڵەتی، کۆمەڵایەتی، سیستەم، جەمسەری، دونیایی.. هتد نەماوە تاقی نەکرێتەوە. لە هەمووشیاندا پێوانە شکێنراوە. بێگومان لەبواری کوژراو، ئێش و زیانە ماددییەکانەوە !

بێگومان ناشێت ئەم ڕاستیانە لەکاروانی درێژخایەنی مێژوودا بەرهەمی ئەم ماوە کورتەی چوارسەد ساڵەی دوایی بێت. ئەم لێکۆڵینەوە کورتەمان پیشانیداوە کە ناشێت بەمجۆرە بێت. ئەگەر بڵێین ئەم شەڕانە تەقینەوەی ئەو کێشانەیە کە لە سەردەمی نیولیتیك و کۆمەڵگای پێنج هەزار ساڵی شارستانییەوە کەڵەکەبووە، تەقینەوەیەتی بەسەر کۆمەڵگای نیمچە دوورگەی ئەورووپا، ڕاستترە و ڕاڤە و شرۆڤەیەکی شایستەیە. ئەگەر تەولو سەرکەوتووش نەبێت، کۆمەڵگای ئەورووپا، بەشێوەیەکی لێهاتووانە لەگەڵ کۆی ئەو کێشانە کەوتۆتە شەڕەوە کە لە کۆمەڵگای کۆنەوە ماوەتەوە. بەتێگەیشتنێکی بەرزەوە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کردووە و بەشێوەیەکی واتادار شەڕەکەی بەڕێوەبردووە. لەم پێناوەشدا پرۆسەکانی ڕێنسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری ئافراندووە، داهێنانی زانستی سەرسوڕهێنەری ئەنجامداوە، قوتابخانە فەلسەفەکانی پەرەپێداوە، پرۆسەی دەستووری دیموکراتی فەراهەم کردووە. ڕژێمە پادشاییەکانی ئاولکردووە، دواتر ڕووخاندوویەتی و لەجێگای ئەودا ڕژێمە کۆمارییەکانی ئاولکردووە. سیستەمی ئابووری ئەوتۆی ڕێکخستووە کە بەرهەم و بەپیتییەکەی هاوتاکەی نەبینراوە، گەورەترین شۆڕشی پیشەسازی ئەنجامداوە. لەبواری هونەر و مۆدێلدا ڕکابەری نەناسیوە. شاری جوانی بونیادناوە. خانەی شکۆداری تەندروستی و زانستی ئاولکردووە. سیستەمی شارستانی لە تەولوی جیهاندا بڵاوکردۆتەوە. بەرفراوانترین سیستەمی جیهانی لەمێژوودا بونیادناوە.

بەڵام ئەم پێشکەوتنە مەزنە لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا، بەدۆخێکی ئاڵۆزتری گەیاندووە، ئەمەش لە کێشە جیهانییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا دیار دەبێت کە لەجۆری بێکاری، پێکدادان و وێرانبوونی ژینگەییەوە تادەگاتە رووکەشانەترین کێشەکان دەردەکەوێتە مەیدان. هۆکاری سەرەکیشی ئەوەیە، کێشەکان سەرچاوەیان بۆ شارستانی پێنج هەزار ساڵە دەگەڕێتەوە: خودی شارستانی بریتییە لە گرێیەکی کێشەکان. بە بڕوای من گەورەترین کۆمەکی ئەورووپا ئەوەیە کە" بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە توانی ئاوێنەی زانست بەرامبەر کێشە زەبەلاحەکانی شارستانی دابنێت. هەرچەندە لاوازیش بێت و لەچەندین لایەنیشەوە بەهەڵەدا چووبێت، لەم ئاوێنانەوە دەرفەتی باشتربینینی کێشەکان رەخساوە. پێویستە هەرگیز کۆمەك و رۆڵی گەورەی جەنگاوەرە ئازاکان (چەندە ئایدیۆلۆژیاکان فریودەریش بن) پشتگوێ نەخرێت. بەتایبەتیش قارەمانەکانی ئەو شەڕانەی بەناوی یەکسانی، ئازادی و برایەتی بەڕێوەبراون کە خاوەنی کۆمەکی سەرەکین.

پێویستە دەستنیشانکردنی کێشەی بنەڕەتی کۆمەڵگا بچووك نەکەینەوە. بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگاکان بە هەزاران ساڵ شەڕیان کرد، خرانە شەڕەوە. بەڵام زۆر جێگای داخە کە ئەم کۆمەڵگایانە نەیاندەزانی شەڕیان بۆکێ کردووە. لەلایەن زۆردار و چەوسێنەرەکانیانەوە تەنیا نەدەخرانە کارەوە، بەڵکو ژمارەیەکی زۆریشیان لە شەڕدا لەنێو دەبران.

بێگومان دانایی رۆژهەڵات ئاگاداری کێشەکانی کۆمەڵگابوو. لەبەرئەوەش بیروباوەڕی مەزن، سیستەمی ئەخلاقی، ئایین و مەزهەبیان ئاواکردبوو. لەجیاتی هەنگاونان بەرەو دۆخی شارستانی و دەوڵەت، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ژیانی خێڵ و هۆزایەتییان بە گونجاوتر زانیوە. کۆمەڵگای رۆژهەڵات بەکەلاکە سەرەکییەکەی لە دەوڵەت و شارستانی نامۆبووە. شورا و قەڵای مەزن لەنێوانیاندا بەرزکرابوونەوە. ئاواز و داستانەکانی رۆژهەڵات بەهەموو وردەکاری و ناسکایەتییەکی هونەرییەوە ئەم راستیانەیان گێڕاوەتەوە. مرۆڤی رۆژهەڵات هێندە لە دونیای شارستانی نامۆ و بێ هیواببوو کە لەدونیای دیکە بەدوای رزگاریدا بگەڕێت. گەورەیی کۆمەڵگای ئەورووپا لەوەدابوو، بەبێ ئەوەی هێندە بکەوێت، لەلایەك فاکتەرە ئەرێنییەکانی پەسەندکرد، لەلایەکی دیکەشەوە بەرامبەر بە فاکتەرەکانی نامۆکردن بەرخودانی کرد. کێشەی کۆمەڵگای چارەسەر نەکرد، بەڵام دەرفەتیشی پێنەدا کە بە تەواوەتی دایڕوخێنێت و بێچارەی بکات.

ئەگەر کێشەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان، یان کێشە باوەکانی کۆمەڵگای چین، هیندستان، ئەمریکای لاتین و تەنانەت ئەفریقیاش بخەینە سەر کێشەکانی لقی رووباری سەرەکی شارستانی،

ناوەرۆکەکەیان ناگۆڕێت. هەندێك کێشەی رووکەشی سەرنجراکێش تەنیا باسەکە بەهێزتر دەکات. کەچی سیستەمی جیهانی رۆژگاری ئەمڕۆمان (سیستەمی فرە ناوەندی و سوپەر هەژموونگەرایی ئەمریکا) کێشەکانی تەواوی کۆمەڵگای جیهانی وەك خۆی بەسیستەم و سەرتاپاگیر کردووە.

کورتکردنەوەی کێشەی کۆمەڵگای مێژوویی ــ کە هەوڵی پێشکەشکردنیمدا ــ بەشێوەی سەرەدێری سەرەکی رۆژانەیی (هەنووکەیی) بابەتەکە تەواو و بەرجەستەتر دەکات.

## ب ــ کێشە کۆمەڵایەتییەکان

### ١ ــ کێشەی دەسەڵات و دەوڵەت

بەردەوام ناچارم دووبارەی بکەمەوە" هەروەکو چۆن مێژوو "ئێستایە"یە، هەر فاکتەرێکی ئێستاش مێژووە. هەرچی پچڕان و دابڕاندنی مەزنە لەنێوان مێژوو و ئێستاکە، ئەنجامێکی پروپاگەندەکانی هەر هەلکشانێکی نوێی شارستانییە کە یەکەمین هەنگاوی سەرەتایەتی و بە ئامانجی بەدەستهێنانی مەشروعییەت و داخوازی بە " ئەزەلی ـــ ئەبەدی"کردنی خۆی ئەنجامدەدات. لە ژیانی کۆمەڵگای راستەقینەدا دابڕانی بەمجۆرە بوونی نییە. خاڵێکی دیکەی جەختی لەسەر دەکرێتەوە، تا مێژوو نەکرێت بەگەردوونی، نووسینەوەی مێژوویێکی خۆجێیی یاخود تاقانە هیچ واتایەکی نابێت. لەم سۆنگەوە کێشەکانی دەوڵەت و دەسەڵات لەمیانەی ئۆخی ئاولکردنی یەکەمینیاندا، بەجیاوازییەکی زۆر کەمەوە کێشەی رۆژگاری ئەمڕۆشمانە. هەرچی جیاوازی نێوانیانە، ئەو بەشەیە کە هەلومەرجەکانی کات و شوێن لێی زیادکردووە. کاتێك ئەم واتایە لە زاراوەکانی جیاوازی و وەرچەرخان باربکەین، ئاشکرایە بەشی راستی شرۆڤەکانمان زیاد دەکات. پێویستە بچووککردنەوە یاخود گرنگی نەدان بە جیاوازییەکان، وەرچەرخان و پەرەسەندنەکان لەناو چوارچێوەی هەمان مەترسیدا ببینرێت. چەندە بێبەریبوون لەمێژووی گەردوونی پروکێنەر بێت، تاوتوێکردنی پەرەسەندنی مێژووی وەك دووبارەبوونەوە و بێبەش بینینی لەجیاوازی و وەرچەرخان، بەو ئەندازەیە راستی پەردەپۆش دەکات. ئەخزانە ناو ئەم دوو شێوەیەی مۆدێلی بچووککردنەوە بایەخێکی زۆری هەیە.

یەکەمین دەستنیشان کردنێك کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا سەبارەت بە دەوڵەت و دەسەڵات بکرێت ئەوەیە کە" لەسەر کۆمەڵگا و لەناوەوەشی قەبارەیەکی نائاساییان پەیداکردووە. تا سەدەی شازدەهەم حوکمڕانێتی زیاتر لە دەرەوەی کۆمەڵگا، بەشێوەیەکی تۆقێنەر و چاوترسێنەر

ئاوا دەکران. بە درێژایی چاخ و سەردەمەکان شارستانی شاهیدی شێوەی زۆر بەکاریگەری لەمجۆرەیە. دەوڵەت کە گوزارشتی فەرمی دەسەڵاتە، بەوردییەوە هێڵەکانی سنووری خۆی دەکێشا. چونکە چەندە جیاوازی نێوان دەوڵەت ـ کۆمەڵگا بەتیژی بکێشرێت، بەو ئەندازەیە هیوا و چاوەڕوانییان بۆ سوود وەرگرتن زیاد دەبوو. وەك دیاردەیەکی ناو کۆمەڵگا هێڵەکان لەگەڵ دەسەڵاتیش زۆر ئاشکرا و بژاردە بوون. هێڵەکانی راوەستەی ژن بەرامبەر پیاو، لاوان بەرامبەر بەساڵاچووان، ئەندامە ئاساییەکانی خێڵ بەرامبەر بە سەرۆك خێڵ، دەستەی باوەڕمەندان بەرامبەر بە نوێنەری ئایین و مەزهەب لەمیانەی ئاداب و رێسای زۆر روونەوە دیاریکراون. لەبەرزی و نزمی دەنگەوە، تا دەگاتە شێواز و چۆنیەتی بەڕێوەچوون و دانیشتنەوە دەسترۆیی دەسەڵات و بابەتی بەڕێوەبراو رێسای وردیان هەبوو. بێگومان ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتانەی کەمترن، لەپێناو پیشاندانی هەبوونی خۆیان ئاواکردنی دەسترۆیی دەوڵەت و دەسەڵات لەم لایەنەوە مایەی تێگەیشتنە که کەمینەن. بەگوێرەی ئەوەش ئامرازەکانی مەشروعیەت، پەروەردە و خزمەتیان پێشکەش دەکرد.

جیاوازی ئەو وەرچەرخانە ریشەییەی کە لە قەڵەمڕەوی دەوڵەت و دەسەڵاتەکانی شارستانی ئەورووپا هاتەئاراوە، بەشێوەیەکی خێرا پێویستی بە دزەکردن بۆ ناو تەواوی مەمیلەکانی کۆمەڵگا بینی. لەمەدا دەتوانین باس لە دوو هۆکاری سەرەکی بکەین: یەکەمیان" گەورەبوونی جەماوەرە چەوساوەکەیە کە دەچەوسێنرێتەوە. چونکە بەڕێوەبەرایەتی گەورە نەکرابوایە چەوساندنەوەش بەدینەدەهات. هەروەکو ئەو مێگەلە گەورەیەی پێویستی بەچەندین شوان هەیە، هەڵئاوسانی بیرۆکراسی دەوڵەتیش بەڵگەی ئاشکرای ئەم دیاردەیەیە. هەروەها پێویستە بەشی سەرکوتکردنی کۆمەڵگای ناوەوە لەلایەن ئاسایشی دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتی بخەینە سەر کە بەشێوەیەکی زەبەلاحانە گەورەبووە. هەموو کاتێك شەڕ بیرۆکراسی خولقاندووە. خودی سوپا گەورەترین رێکخستنی بیرۆکراتییە. هۆکاری دووەم، زیادبوونی مەعریفەی کۆمەڵگا و بەرخودانەکەیەتی. لەبەرئەوەی کۆمەڵگای ئەورووپا لە قووڵاییەوە چەوسانەوەی بەخۆوە نەبینیوە، هەروەها بەهۆی بەرخودانی بەردەوامی، ناچاری کردووە ئاواکردنی دەسەڵات ــ دەوڵەت قەبارەی گەورە بێت. تێکۆشانی بۆرژوازی بەرامبەر بە ئەرستۆکراسی، هەروەها تێکۆشانی چینی کارکەر بەرامبەر بە هەردووکیان، لە ئەورووپا ئاواکردنی دەسەڵات و دەوڵەتی ناچاری قووڵبوون کردووە. هەرچی بۆ یەکەمین جار بە دەوڵەتبوونی چینی ناوینە لەمێژوودا کە بەشێوەی بۆرژوازی بەدیهات، گۆڕانکاری گەورەی بۆ پێگەی دەوڵەت و دەسەڵات هێناوە. بە دەوڵەتبوونی کۆمەڵێك مرۆڤ کە لەناواخنی

کۆمەڵگا دەرکەوتوون، لەم سۆنگەیەوە بوویەری دەسەڵات کە لەزیادبووندایە، ناچاری کردووە خۆی لەناو کۆمەڵگادا رێکبخات.

بۆرژوازی جیابوونەوەیەکی چینایەتی هێندە مەزنە کە لەدەرەوە حوکمڕانی خۆی بەسەر دەسەڵات و دەوڵەتدا ناسەپێنێت. چەندە خۆی دەکات بە دەوڵەت، ئاشکرایە لە ناوەوەش دەکەوێتە نێو ململانێ و پێکدادانی کۆمەڵایەتییەوە. ئەو دیاردەیەی بە ململانێ یان پێکدادانی چینایەتی ناودەبرێت گوزارە لەم راستییە دەکات. لیبرالیزم کە ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازییە بۆ ئەوەی چارەسەری بۆ ئەم کێشەیە بدۆزێتەوە هەزارویەك فرت و فێڵ دەکات. بەڵام ئەوەی لەماوەی رابردوو روویداوە، زیاتر گەورەبوونی دەوڵەت و دەسەڵات و شێرپەنجەی بیرۆکراسییە. چەندە دەوڵەت و دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا گەورە بێت، واتا بەوڕادەیە شەڕی ناوخۆیی لە ئارادایە. سەرەکیترین کێشەی لە کۆمەڵگای ئەورووپا پەرەیسەندووە، لەسەرەتاوە ناوەرۆکێکی بەم چەشنەی هەبووە. تێکۆشانە شکۆدارەکانی دەستوور، دیموکراسی، کۆمار، سۆسیالیزم و ئەنارشیزم لە نزیکەوە گرێدراوی شێوازی پێکهاتنی دەوڵەت و دەسەڵاتە. بەرچاوترین چارەسەری کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا راست دەبینرێت، مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ و دیموکراسییە کە بە رێسای رەهای دەستوورەوە بەستراوەتەوە، لەجیاتی چارەسەرییەکی هەمیشەیی، دەوڵەت و کۆمەڵگا ناچار دەکات لەسەر دەسەڵات رێکبکەون و بەمجۆرە هەوڵدەدات قۆناخی شەڕە گەورەکانی جاران تێپەڕبکات. واتە کێشەی دەوڵەت و دەسەڵات چارەسەر نەکراوە، تەنیا بە پێگەیەك گەیەنراوە توانای بەردەوامکردنی هەبێت.

کاتێك لە نزیکەوە سەیری بکەین، دەبینین لە رێگای میللیگەرایی، رەگەزگەرایی، ئایینگەرایی و زانستگەرایی هەمەجۆرەوە بەناویەکداچوون و تێکەڵکردنی کۆمەڵگا و دەوڵەت و دەسەڵات پێشدەخرێت، واتا بۆ پارادایم(پارادیگما)ی " هەمووکەسێك هەم دەسەڵات هەم کۆمەڵگایە، هەم دەوڵەت هەمیش کۆمەڵگایە" رابکێشرێت، بەمجۆرەش هەوڵی درێژەدان بە دەوڵەت ـــ نەتەوە دەدرێت. لەم چوارچێوەیەدا لەناوەوە شەڕی چینایەتی سەرکوت دەکرێت، بەرامبەر بە دەرەوەش بەردەوام نۆخی بەرگری بەکراوەیی دەهێڵرێتەوە، بەمجۆرە بۆرژوازی شیمانەی ئەوە دەکات کە چارەسەری دەوڵەت ـــ نەتەوەی نۆژیوەتەوە. ئەمە سەرەکیترین پەیڕەوە لە ئاستی جیهاندا تاقیکراوەتەوە، کە لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەکان سەرکوتیان دەکات. کاتێك دەوڵەت ـــ نەتەوەش بۆخۆی دەبێتە گەورەترین دەوڵەت و دەسەڵات، ناوەڕۆکە فاشیزمیەکەی بەدەردەکەوێت، ئەمەش بە روونترین شێوە لە فاشیزمی ئەڵمانیادا تێبینی کراوە.

یەکەمین نموونەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەقۆناخی بەرخودانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی سەریهەڵداوە. دەوڵەت ـ نەتەوە تەولوی کۆمەڵگا بەرامبەر بە دەرەوە دەخاتە ناو سەفەریەرییەوە و بیانووی رەوابوونی خۆشی دەئافرێنێت. لە میانەی ئاراستەی راستینەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانییەوە لە سەرەتادا بەشێوەیەکی رێژەیی فاکتەری ئەرێنی لەخۆوە دەگرت. بەڵام ئاشکرایە کە هەر لەسەردەمی لەدایکبوونیەوە ئەرکی پەردەپۆشکردنی فشار و چەوساندنەوەی چینایەتی جێبەجێدەکات. دەوڵەت ـ نەتەوە مسۆگەر نیشانەی چینی بۆرژوازی هەڵدەگرێت. مۆدێلی دەوڵەتی ئەو چینەیە. دواتر پەلامارەکانی ناپلیۆن ئەم مۆدێلەی لە فەرەنسا بەهێزتر کرد، لە ئاستی ئەوروپا رێگای لەپێش بڵاوکردنەوەی کردەوە. بەهۆی دواکەوتوویی بۆرژوازی ئەڵمانی و ئیتالی و زەحمەتییەکانی مەسەلەی یەکێتی، سیاسەتی نەتەوەپەرستانەتری لەگەڵ خۆیدا هێنا. دلگیرکاری دەرەکی و بەرخودانەکانی چینی کارکەر و ئەرستۆکراسی، لەناوەوە بۆرژوازی ناچاری مۆدێلی دەوڵەتێکی میلیگەرایی و شۆڤێنی زێدەرۆکرد. دۆڕاندن و تەنگەژە، لەسەروویانەوە ئەڵمانیا و ئیتالیا، چەندین وڵاتی بۆ دوورپانی یان شۆڕشی کۆمەڵایەتی یان فاشیزم راکێشکرد. ئەوەی تای تەرازووی بەلادا شکایەوە مۆدێلی دەوڵەتی فاشیستی بوو. راستە هیتلەر، مۆسۆلۆنی و هاوشێوەکانی تێکشان، بەڵام سیستەمەکەیان سەرکەوت.

لەناوەرۆکدا دەتوانرێت دەوڵەت ـ نەتەوە وەك هاوواتاکردنی کۆمەڵگا بەدەوڵەت، دەوڵەتیش بە کۆمەڵگا پێناسە بکرێت، ئەمەش خودی پێناسەی فاشیزمە. بەشێوەیەکی سروشتی نە کۆمەڵگا دەبێت بە دەوڵەت، نە دەشێت دەوڵەتیش ببێت بە کۆمەڵگا. تەنیا دەشێت دۆزی ئایدیۆلۆژیا تۆتالیتارەکان بەمجۆرە بێت. ناوەرۆکی فاشیستانەی ئەم دروشمانە دەزانرێت. وەك شێوەیەکی دەوڵەت بەردەوام فاشیزم جێگایەکی لەگۆشەی دەیوەخانی لیبرالیزمی بۆرژوازیدا هەیە. شێوەی بەرێوەبەرایەتی قۆناخەکانی قەیرانە. لەبەرئەوەی قەیران بونیادییە، شێوەی بەرێوەبەرایەتیش بونیادییە. ناوەکەشی، بەرێوەبەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. بە لوتکە گەیشتنی قەیرانی قۆناخی سەرمایەی فینانسە. پاوانی سەرمایەداری کە لە رۆژگاری ئەمرۆمان لەبواری جیهانگیریدا بەلوتکە گەیشتووە دەوڵەتەکەشی لە کۆنەپەرستترین و زۆردارترین قۆناخی خۆیدا بەشێوەیەکی گشتی فاشیستانەیە. هەرچەندە باس لە داڕووخانی دەوڵەت ـ نەتەوە بکرێت، بەڵام بانگەشەی، ئەوەی لە جێگایدا بونیاد دەنرێت دیموکراسی دەبێت، دەبێتە خۆشباوەڕی. لەوانەیە هەم پێکهاتەی سیاسی فاشیستانەی گەورەی جیهانگیری، هەمیش پێکهاتەی سیاسی فاشیستانەی خۆجێیی لە رۆژهەڵدابێت. ئەو بوویەرانەی لە رۆژهەڵاتی ناوین، بەلقان، ئاسیای ناوین و قەفقاسیا روودەدەن

سەرنج راكێشن. ئەمریكای لاتین و ئەفریقیا بەدوای ئەزموونی نوێوەن. ئەورووپا لە رێگای پەرەسەندنەوە بەدوای رزگار بوون لە فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوەدا دەگەڕێت. دیارنییە كە روسیا و چین چیان لێدێت. هەژموونگەرایی سوپەری وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش دانوستاندن لەگەڵ هەرشێوەیەكی دەوڵەتدا دەكات.

ئاشكرایە كە كێشەی دەسەڵات و دەوڵەت جارێكی دیكە لەیەكێك لە قۆناخە هەرە قورسەكانی خۆیاندا دەژین. دووریانی یان شۆڕشی دیموكراتی یان فاشیزم بایەخە ژیانیەكەی لە رۆژەڤدایە. تەواوی رێكخراوە هەرێمی و ناوەندیەكانی نەتەوە یەكگرتووەكانی تایبەت بە سیستەم ناتوانن چالاك بن. لەكاتێكدا سەرمایەی ـ فینانس لە جیهانگیرترین قۆناخی مێژوودا بەلوتكە گەیشتووە، رۆڵی ئەو بەشەی سەرمایە دەبینێت كە هەرە زێدە قەیرانەكەی هاركردووە. بەرامبەرو هاوتا سیاسی ـ سەربازییەكەی پاوانی سەرمایەی فینانس، ئەو شەڕەیە كە بەرامبەر بە كۆمەڵگا چڕكراوەتەوە. ئەمە ئەو راستییەیە كە لە زۆر بەرەی دونیا لەئارادایە. ئەو پێكهاتە سیاسی و ئابوورییەی لە قەیرانی بونیادی سیستەمی جیهانی دەردەكەوێت، لەمیانەی ئاستی كار و خەباتی رۆشنبیری، سیاسی و ئەخلاقییەوە دەستنیشان دەكرێت، نەك لە رێگای كەهانەتەوە.

لەسەردەمی سەرمایەی ـ فینانس كە پاوانی سەرمایەی وەهمی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە، كۆمەڵگا بەجۆرێك رووبەرووی پەرتەوازەبوونە كە لە هیچ قۆناخێكی مێژوودا روونەداوە. شانەی ئەخلاقی و سیاسی كۆمەڵگا پارچە پارچە كراوە. ئەوەی بەڕێوە دەچێت "كۆمەڵگاكوژی" یە، كە دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە و لە جینۆساید قورسترە. باڵادەستی میدیایی سەرمایەی وەهمی چەكێكە كە كۆمەڵگاكوژییەكی زۆر قورستر لە شەڕی دووەمی جیهانی بەڕێوەدەبات. تۆپەكانی میللیگەرایی، ئایینگەرایی، رەگەزگەرایی، زانستگەرایی و هەژموونگەرایی (زنجیرەی تەلەفزیۆنی) بیست و چوار كاتژمێر بەسەر كۆمەڵگادا دەڕشێتەوە، بەرامبەر بەم چەكەی میدیا، چۆن كۆمەڵگا دەپارێزرێت؟

میدیاش وەك جۆرێك لەدووەمین ئەقڵی ئەنالیتیك لەسەر كۆمەڵگا چالاك و دەست بەكارە. هەروەكو چۆن ئەقڵی ئەنالیتیكیش سەربەخۆ باش یان خراپ نییە، میدیاش بەتەنیا ئامرازێكی نۆترە (خاڵی سفرە). وەك هەر چەكێك ئەوەی بەكاری دێنێت رۆڵەكەی دیاری دەكات. هەروەكو چۆن هێزە هەژموونگەراكان هەمووكاتێك خاوەنی بەكاریگەرترین چەكن، هێزەباڵادەستەكەی چەكی میدیاشن. لەبەرئەوەی میدیا وەك دووەمین ئەقڵی ئانالیتیك بەكاردێنن، لە شكاندنی هێزی بەرخودانی كۆمەڵگادا زۆر بەكاریگەرن. لەمیانەی ئەم چەكەوە كۆمەڵگای وەهمی بونیاد دەنرێت.

کۆمەڵگای وەهمیش شێوەیەکی دیکەی کۆمەڵگاکوژییە. دەشێت دەوڵەت ــ نەتەوەش بە یەکێك لە شێوەکانی کۆمەڵگاکوژی لەقەڵەم بدرێت. لە هەردوو شێوەشدا کۆمەڵگا لە ناوەرۆکی خۆی دەردەخرێت و بۆ ئامرازێکی پاوانی ئاراستەکار وەردەچەرخێنرێت. هەروەکو چۆن بچووك بینینی سروشتی کۆمەڵگا زۆر مەترسیدارە، دەرخستنی لەناوەرۆکی خۆشی بەواتای ئاوالاکردنی دێت لەپێش هەڕەشە و مەترسییەك کە سنوورەکانی دیار نییە. هەروەها سەردەمی پاوانی وەهمیش وەك سەرمایەی ــ فینانس تەنیا لەمیانەی ئەو کۆمەڵگایانەوە مسۆگەر دەبێت کە لەناوەرۆکی خۆیان دەرچوون. سەرهەڵدانی هەردووکیان لەهەمان قۆناخدا رێکەوت نییە، لەگەڵ یەکتر لەناو پەیوەندیدان. کۆمەڵگای دەوڵەت ــ نەتەوە کە لە ناوەرۆکی خۆی دەرکەوتووە (خۆی بە دەوڵەت ــ نەتەوە دادەنێت) لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەی میدیا فریویداوە و شێواندوویەتی، بە تەواوی مانای وشەوە کۆمەڵگای تۆراوە و شتی جیاوازتر لەپاشماوەکانیان بونیاد دەنرێت. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە لەسەردەمی کۆمەڵگایەکی بەمجۆرەدا دەژین.

تەنیا لەناو بەکێشەترین کۆمەڵگادا ناژین، بەڵکو لەهەمانکاتدا لەناو کۆمەڵگایەکدا دەژین کە هیچ شتێك بە تاکەکەی نابەخشێت. ئەو کۆمەڵگایانەی لەناویاندا دەژین تەنیا متمانەی سیاسی و ئەخلاقییان لەدەست نەداوە، تەنانەت هەبوونەکەشیان لەژێر هەڕەشە و مەترسیدایە. نەك هەڕەشەی کێشە، بەڵکو لەژێر مەترسی قڕکردندا دەژین. ئەگەر سەرباری ئەو هێزە زانستییەی لەئارادایە لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام کێشەکان گەورە دەبن و دەبن بەشێرپەنجە، ئەوکاتە قڕکردنی کۆمەڵگا تەنیا گریمانێك نییە، بەڵکو مەترسییەکی واقیعییە. هەرچی ئەو بانگەشەیەیە کە گوایە دەسەلاتی دەوڵەت ــ نەتەوە کۆمەڵگا دەپارێزێت، هەڵخەڵەتاندنێکی مەزنە بۆئەوەی هەنگاو بە هەنگاو هەڕەشە و مەترسییەکەی بکات بە واقیعی. کۆمەڵگا تەنیا رووبەڕووی کێشەکان نییە، بەڵکو رووبەڕووی قڕبوونیشە.

### ٢ ــ کێشەی سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا

ئاگاداری مەترسییەکانی رێبازی پارچەکردنی کێشەکانم. ئەم پەیڕەوە کە لەمیانەی بەکارهێنانی سنوورنەناسانەی ئەقڵی ئەنالیتیکەوە لەلایەن زانستی ناوەندگەرێتی ئەورووپاوە پراکتیزە دەکرێت، ئەگەر لە رووخساردا هەندێك دەسکەوتیشی هەبێت، بەڵام پێویستە ئەوەش

لەبیرنەکرێت کە مەترسی لەدەستدانی یەکپارچەیی حەقیقەت لەخۆوە دەگرێت. بەمەرجێك بەردەوام لایەنە مەترسیدارەکانی ئەم پەیڕەوە ببینرێت، سەرباری ئەوەی دەزانم کە تاوتوێکردنی کێشەی کۆمەڵگا وەك " کێشەکان" مەترسی پارچەبوون لەخۆوە دەگرێت، دیسان ئەم پەیڕەوە بەکاردێنم. لەبەشی ئەبستمۆلۆژیا هەوڵی گفتوگۆکردنی هەڵوێستە جیاوازەکان دەدەم.

لەخۆڕا دەوڵەت و دەسەڵاتمان لەبەشی یەکەمی کێشەکانی کۆمەڵگادا جێگیرنەکرد. هۆکارە سەرەکییەکەشی: چونکە سەرچاوەی سەرەکی کێشەکان پێکدێنێت. یەکەمین ئەرکی پەیوەندی و ئامێرە(دامەزراوە) سەرەکییەکانی دەسەڵات و دەوڵەت کە لەمیانەی رێگەچارەکانی سەدەی شازدەهەم بەشێوەیەکی چڕ لەناو کۆمەڵگادا جێگیر بووە، بەهەموو توانایەکی کۆمەڵگا لاواز دەکات و بێ بەرگری دەهێڵێتەوە، بەمجۆرەش ئامادەی دەکات تا لەلایەن پاوانەوە بچەوسێنرێتەوە. بەم شێوەیە پێناسەکردنی دەوڵەت و دەسەڵات زۆر بایەخدارە. تەنیا ناوبردنی دەسەڵات و دەوڵەت بەکۆی پەیوەندی و ئامێرەکانی توندوتیژی، کەموکورییەکی جددییە. لەو بڕوایەدام کە گرنگترین رۆڵی دەسەڵات و دەوڵەت بێبەشکردنی کۆمەڵگایە لەبەرگری و لاوازکردنێتی. ئەم رۆڵەشیان لەمیانەی لاوازکردنی بەردەوام و لەکارخستنی شانە ئەخلاقی و سیاسییەکان جێبەجێی دەکەن کە ئامرازی "هەبوونی" کۆمەڵگان. کۆمەڵگا تا هەردوو گۆڕەپانی ئەخلاق و سیاسەت ئاوا نەکات ناتوانێت درێژە بەهەبوونی خۆی بدات.

رۆڵی سەرەکی ئەخلاق، هێزی بەردەوامکردنی کۆمەڵگایە، خاوەندارێتیکردنی رێساکانی لەسەرپێمانەوە و جێبەجێکردنێتی. ئەو کۆمەڵگایەی رێساکانی هەبوون و هێزی جێبەجێکردنی ئەم رێسایانەی لەدەستداوە، واتە بووە بە جڤاتی ئاژەڵان. لەدۆخێکی وەهاشدا چەندەی بخوازن دەتوانن بەکاری بێنن و بیچەوسێننەوە. هەرچی رۆڵی سیاسەتە، لەناوەڕۆکی خۆیدا فەراهەمکردنی رێسا ئەخلاقییەکانی پێویستی کۆمەڵگایە ، هەروەها گفتوگۆی بەردەوامە بۆ نوێزینەوەی پەیڕەو و رێگاکانی دابینکردنی پێداویستییە زهنی و ماددییە بنەڕەتییەکان و گەیاندنێتی بە ئاستی بڕیار. لەسەر بنەمای ئەم راستیانە سیاسەتی کۆمەڵگا بەردەوام هێزی گفتوگۆ و بڕیاروەرگرتن بەرەوپێشەوە دەبات، کۆمەڵگا بەزیندوویی دەهێڵێتەوە و دەیکات بە خاوەن بوچوونێکی کراوە: بە بەهرە و توانای خۆ بەڕێوەبردن و رێکخستنی کاروبارەکانی دەگەیەنێت، واتە سەرەکیترین بواری هەبوونی دەرەخسێنێت. کۆمەڵگای بێ سیاسەت وەك مریشکی سەربڕاو وایە، کۆمەڵگایەکە بەر لە روحدان خۆی بەلای راست و چەپدا دەدات. بەکاریگەرترین رێگای لاوازکردن و بێ رۆڵکردنی کۆمەڵگایەك بێبەشکردنێتی لە سیاسەت کە نۆرگانی هەرە ژیانی گفتوگۆکردن و بڕیار وەرگرتنە

لەبارەی پێویستییە ماددی و مەعنەوییە بنەڕەتییەکان و هەبوونی خۆی. هیچ ڕێگایەك وەك ئەمە مەترسیدار نییە.

هەر لەبەرئەمەشە کە بەدرێژایی مێژوو پەیوەندی و ئامێرەکانی دەوڵەت و دەسەڵات لەیەکەم هەنگاودا "یاسا" لەجێگای ئەخلاقی کۆمەڵگا دادەنێن، دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی " دەوڵەت"یش لەجێگای سیاسەتەکەی جێگیر دەکەن. بەرپەستکردنی هێزی سیاسی و ئەخلاق کە ڕۆڵی ستراتیژی هەبوونی کۆمەڵگا دەبینن، هەروەها دانانی یاسا و بەڕێوەبەرایەتی حوکمڕان لەجێگایاندا، لەهەموو قۆناخێکدا ئەرکی سەرەکی دەوڵەت و دەسەڵاتە. ئەم دوو ئەرکە نەبن، کەڵەکەبوونی سەرمایە و پاوانەکانی چەوسانەوە بوونیان نابێت. تەواوی لاپەڕەکانی مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی، پڕ لەتێکشکاندنی هێزی سیاسی و ئەخلاقی کۆمەڵگا و دانانی بەڕێوەبەرایەتی و یاسای پاوانەکانی سەرمایەیە لە جێگایاندا. بەهۆی فاکتەرە ڕووت و ئاشکراکانەوە مێژووی شارستانی بەمجۆرەیە، ڕاست نووسینەوەشی تەنیا لەمیانەی ئەم فاکتەرانەوە واتادار دەبێت. ئەم ڕاستیانە لە گەوهەری تەواوی پێکدادانە کۆمەڵایەتییەکاندا شاراوەیە. ئایا کۆمەڵگا لە ڕێگای سیاسەت و ئەخلاقی خۆیەوە دەژێنرێت، یاخود لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتی و یاسای پاوانە هارو چاوسوورەکانی چەوساندنەوە وەك مێگەل دەژێنرێت؟ کاتێك دەڵێم سەرچاوەی سەرەکی کێشەکان " گەورەبوونی شێرپەنجەیی" ناماقووڵانەی بەڕێوەبەرایەتی و یاسای دەوڵەت و دەسەڵاتە، خوازیارم ئاماژە بەم ڕاستییە بکەم.

ڕوونکردنەوەی خاڵێکی دیکەش سوودبەخش دەبینم. لەو قۆناخانەی کەیەکەمین پلەداری تێدا ناولکراوە، لەو دۆخانەی کە " ئەزموون" و "پسپۆڕی" بەناوی کۆمەڵگاوە بایەخداربووە، هەرچ ناوێکی بۆ دابنێین دەوڵەت یاخود دەسترۆیی هیچ جیاوازییەکی نابێت، ئەوەی چاوەڕوانی دەکرێت کەڵك لێوەرگرتنە. ئەگەر کۆمەڵگا بەتەواوەتی دەوڵەت و دەسترۆیی (دەسەڵات) بەخراپ نانەناوە، بەهۆی چاوەڕوانیکردنی ئەم دوو کەڵکەبووە. واتە لەو بڕوایە دایە کە لەمیانەی چاوەڕوانیکردنی ئەزموون و پسپۆڕی لە دەوڵەت و دەسترۆییەوە کارەکانی ئاسان دەبێت. ئەم دوو فاکتەرە گرنگترین بیانووەکانی دان بەخۆدا گرتنیەتی بەرامبەر بە هەبوونی دەوڵەت. ئەزموون لای هەرکەسێك نییە. هەروەها پسپۆڕیش کاری هەرکەسێك نییە. بەڵام دەسترۆیی و دەوڵەت بەدرێژایی مێژوو ئەم دوو چاوەڕانییە مافدارەیان قۆستەوە، ترسنۆکە بێئەزموون و ناشارەزاکان لەجیاتی حقوق تەڵەکەبازی، لەجیاتی ئەزموون کردیان بە گۆڕەپانی بەتاڵی و بێکاری. تێکچوون و کارەساتە گەورەکان لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم سەرلوژێرکردن و لادانە گەورەیەیە.

بۆرژوازی کە لەمێژوودا گوزارشت لە پەرەسەندنی شێرپەنجەیی چینی ناوین دەکات، کارەساتە راستەقینەکە کاتێك لەسەر سك "ورگ"ی کۆمەڵگا دادەنیشێت و بەرژەوەندییە خۆپەرستانەکەی خۆی بەناوی "حقوق" ، نارەسەنترین بەڕێوەبەرایەتییەکەشی بەناوی "بەڕێوەبەرایەتی دەستووری" پێشکەش دەکات، لەم پێناوەشدا دەسەڵات و دەوڵەت بۆ گۆڕەپانە سنوور نەناسەکانی "ئامێر" و گوایە "پسپۆڕی " دابەش دەکات، بەم جۆرەش زیادیان دەکات. واتە کۆمەڵگا " لەباران رایکردووە، تووشی تەرزە هاتووە". گفتوگۆکانی "کۆمار"، "دیموکراسی"، "دەستوور" ، "بچووککردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی" ، " سنووردارکردنی دەوڵەت و دەسەڵات"ی لیبرالیزم کە وردەکاری ئەقڵی بۆرژوازییە، بەو رادەیەی پێویستە وەك پەردەپۆشکردنی راستی ببینرێت، پێویستە بەپێچەوانەی واتا بارکراوەکان هەڵسەنگێنرێت. بۆرژوازی چینی ناوین تەنانەت بەقەدەر چاخی کۆنیش بەهرەی دەستوور، کۆمار، دیموکراسی، بچووکردنەوەی ئیدارە و سنووردارکردنی دەسەڵات و دەوڵەتی نییە. چونکە ئەوەی ئەم زاراوە راستەقینانەی بێ رۆڵ کردووە، بونیادی ماددی چینی ناوینە، شێوازی هەبوونەکەیەتی. لەکاتێکدا لەچاخەکانی یەکەمین کۆمەڵگا بەزەحمەتەوە پادشایەك یان خانەدانێکی خۆی هەڵدەگرت، چۆن خانەدان و ئامێرە(دەزگا) لە ژمار نەهاتووەکانی بۆرژوازی هەلگرێت؟ بەئەنقەست زاراوەی "بنەماڵە و خانەدانی بۆرژوازی" بەکاردێنم، چونکە لەهەمان سەرچاوەوە دێن. بۆرژوازی سەرجەم هونەری بەڕێوەبەرایەتی و رێساکانی لە ئەرستۆکراتە نەجیبزادە و پادشا گەورەکانی پێشووتری وەرگرتووە. خۆی هێزی ئافراندنی نییە. کاریگەری شێرپەنجەیی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و دەوڵەت لەسەر کۆمەڵگا سەرچاوەی خۆی لەم سروشتە چینایەتییەی وەردەگرێت. سروشتی چینی ناوین بەفاشیزم بارکراوە.

لەم سۆنگەیەوە سەقەتکردنی شانە سیاسی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا و لەکارخستنی لە سەرووی کێشە بنەڕەتیەکانەوەیە. بێگومان ناتوانرێت گۆڕەپان و شانە ئەخلاقی و سیاسییەکان بە تەواوی لەناوببرێت. تا کۆمەڵگا هەبێت، ئەخلاق و سیاسەتیش هەر دەبێت. بەڵام لەبەرئەوەی دەسەڵات و دەوڵەت لە نۆخی گۆڕەپانی پسپۆڕی و ئەزموون دەرکەوتوون، یان لەم رەوشە دەرخراون، بەهرە و توانا چالاك و ئافرێنەرەکەیان جێبەجێ ناکەن. لە رۆژگاری ئەمڕۆمان پەیوەندی و ئامێرەکان ( میدیا، هەموو جۆرە یەکینە تایبەتەکانی هەواڵگری و یەکینە پەلاماردەرەکان، رێکخستنە ئایدیۆلۆژییەکان ..هتد)ی دەسەلات و دەوڵەت بگرە دزەیان کردۆتە ناو وردترین شانەو مەمیلەکانی کۆمەڵگاش، بەمجۆرە کۆمەڵگا خراوەتە ناو نۆخێکەوە، کە

هەناسەی لەبەر براوە، لەخۆی نامۆ بووە، توانای جێبەجێکردنی هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی خۆی نییە، تەنانەت لەپێناو بنچینەترین پێویستییەکانیشیەوە ناتوانێت گفتوگۆی سیاسی بکات و بڕیار ( سیاسەتی دیموکراتییانە ) وەربگرێت. هەروەها لەم قۆناخەدا فەراهەمکردنی گەورەترین تەقینەوەی سەرمایە لەمێژوودا لەلایەن هێزە راستەقینەکانی حوکمڕانی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گفتوگۆیەکی زۆری لەبارەوە دەکرێت " کۆمپانیا جیهانگیرییەکان " واتە پاوانەکانی " ئەزەل ــ ئەبەد " ، لەنزیکەوە گرێدراوی تێوەگلاندنی کۆمەڵگایە بۆ ناو ئەم دۆخەوە. ئەگەر کۆمەڵگا دووچاری داڕووخان و پەرتەوازەبوون نەکرابایە، لەمیانەی هێندە ڕێگای وەهمییەوە، واتە بەبێ ئەوەی دەست لەهیچ ئامرازێکی بەرهەمهێنان بدرێت، نە دەتوانرا پارە بە پارە قازانج بکرێت. تەواوی دەستکەوت و قازانجی پاوانەکان بەدرێژایی مێژوو، بەتایبەتیش قازانجە زۆرەکانی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە ئاسمانەوە(لەخۆڕا) بە دیهاتووە[١]، لەسەربنەمای خاڵیکردنی هەبوون و مێشکی کۆمەڵگا بەدەستیان هێناوە. چونکە "پارە لە ئاسمان نییە".

پێویستە دووبارەی بکەمەوە، پەیوەندی و ئامێرەکانی دەوڵەت و دەسەڵات کە بێ سنوور زیادیانکردووە بەتەنیا کۆمەڵگا ناخەنە ئەم رەوشەوە. بەڵکو لە ڕێگای سەرچاوە بنەڕەتییەکەی دیکەی هەژموون کە بەلانی کەم هێندەی ئەمە بەکاریگەرە، واتە لە ڕێگای میدیاوە فەتحی ئایدیۆلۆژیانەی کۆمەڵگا ئەنجامدەدرێت. تا لەڕێگای چەواشەکاری و شێواندنەکانی میللیگەرایی، ئایینگەرایی، رەگەزگەرایی، زانستگەرایی و هونەرگەرایی (بەپیشەسازیکردنی هونەر، بەتایبەتی وەرزش) دوە سەرسام نەکرێت، تەنیا لەڕێگای پەیوەندی و ئامێرەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە کۆمەڵگا هێندە داڕووخێنرێت. کۆمپانیا وەهمییە جیهانگیرییەکان (مەبەست سەرمایەی ــ فینانس، پارە ــ سەرمایەیە)، پاوانە مێژووییەکان کاتێك کۆمەڵگا لەناوەڕۆکی خۆی دەردەخەن، دووچاری چەوسانەوەیەکی سنوورنەناسی دەکەن کە وەك پەیڕەوکردنی کۆمەڵگا قڕان بێت.

### ٣ ــ کێشە زهنییەکانی کۆمەڵگا

بێگومان یەکێك لە مەرجەکانی ئاوالاکردنی کۆمەڵگا بەڕووی چەوسانەوە بێبەشکردنێتی لە ئەخلاق و سیاسەت، ئەمەش بە داڕووخاندنی زهنییەتی کۆمەڵگا بەدیدێت، کە بناخەی هێزی ئەم دوو شانەیەن. لەبەرئەم هۆکارەیە کە بە درێژایی مێژوو باڵادەستان و پاوانەکانی چەوساندنەوە لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانیان یەکەمین کاریان ئاواکردنی"هەژموونگەرایی زهنی" بووە. بۆ

---

[١] بە دەستهێنانی دەسکەوت لە ئاسمانەوە: مەبەست بە دەستهێنانی دەستکەوتە بە بێ رەنج.

ئەوەی کۆمەڵگای سۆمەر بەڕووی بەرهەم کراوە بێت، لەم ڕێگایەشەوە بەڕووی چەوسانەوە کراوە بێت، وەك یەکەمین کار ئاوالکردنی پەرستگا (زەقورە) لەلایەن راهیبەکانی سۆمەرەوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم راستییە دەسەلمێنێت. لەبەرئەوەی پەرستگای سۆمەر سەرچاوەی راستەقینەی فەتحکرن و چەواشەکردنی زهنی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە لەمێژوودا و تائێستاش کاریگەرییەکەی بەردەوامە، ئەمە گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە.

بەگرنگییەوە هەوڵی ئاماژەپێکردنمدا کە سروشتی کۆمەڵایەتی لەنەرمترین بونیادەکانی زهن پێکهاتووە. تا باش دەرك بەم راستییە نەکرێت کە کۆمەڵگا ژیرترین سروشتە، ناتوانرێت سۆسیۆلۆژیایەکی واتادار پێشبخرێت. لەم سۆنگەوە ئەو زۆردار، باڵادەست و تەڵەکەبازانەی وەك یەکەمین سەرچاوەی چەوسانەوە چاویان بڕیوەتە کۆمەڵگا، یەکەمین کاریان لاوازکردنی توانا و دەرفەتەکانی هزراندن و ژیری کۆمەڵگایە، ئاوالکردنی پاوانی یەکەم، پاوانی زهنییەت، واتە داهێنانی پەرستگایان کردووە بە ئەرکی سەرەکی خۆیان. بەشێوەیەکی بنەڕەتی پەرستگا بەیەکەوە دوو ڕۆڵ دەبینێت. یەکەمیان" وەك ئامرازی باڵادەستی و هەژموونگەرایی زهنی، زۆر گرنگە. دووەمیان" بۆ دابڕاندنی کۆمەڵگا لە بەها زهنییەکانی خۆی، زۆر لەبارە.

وەك زاراوە زهنییەتی خودی کۆمەڵگا پێویستی بەحاڵیبوونێکی باش هەیە. مرۆڤایەتی کاتێك یەکەمین داروبەردی بەدەستەوەگرت، لەڕێگای بیرکردنەوەوە ئەم کارەی ئەنجامداوە. لێرەدا یەکەمین تۆوەکانی هزری ئەنالیتیکی جێگای باسە، نەك غەریزەی خۆڕسك. چەندە ئەزموون کەڵەکە دەبێت کۆمەڵگاش پێشدەکەوێت، ئەمەش لەناوەڕۆکی خۆیدا قاڵبوونەوەی هزرە. کۆمەڵگایەك چەندە ئەزموون بەدەست بێنێت، لەم سۆنگەوە چەندە هزر قاڵبکاتەوە، بەو ڕادەیە بەهرەو هێز بەدەست دێنێت. لەسەر ئەم بنەمایە باشتر خۆی دەپارێزێت، باشتر خۆی بەخێودەکات و بەرهەم بەدەست دێنێت. ئەم قۆناخە ماهیەتی پەرەسەندنی کۆمەڵگا و هۆکاری گرنگیەکەی ڕووندەکاتەوە. کاتێك کۆمەڵگا بەردەوام بیرلەخۆی دەکاتەوە، ئەریتی ئەخلاقی خۆی ئاوادەکات کە ئەقڵی هاوبەش یان ویژدانی پێدەڵێن" واتە هزری هاوبەشی خۆی پێکدێنێت. لەبەرئەم هۆکارە ئەخلاق زۆر گرنگە. چونکە گەورەترین گەنجینەی کۆمەڵگایە، کەڵەکەبوونی ئەزموونەکانێتی، بیانووی لەسەرپێ مانەوەیەتی، ئۆرگانی سەرەکی بەردەوامکردن و بەرەوپێشبردنی ژیانێتی. بەهۆی ئەزموونی ژیانییەوە کۆمەڵگا باش دەزانێت دەزانێت ئەگەر ئەمە لەدەستبدات پەرتەوازە دەبێت. هەربۆیە لەمیانەی مسۆگەری رەمەکی ناوەوە(خۆڕسك) ئەخلاقی پەسەندکردووە. لەکۆمەڵگاکانی کلان ـ قەبیلەکانی کۆندا پێشلکاری ڕێسا ئەخلاقییەکان مردن

بوو، یاخود لە کۆمەڵگا بەدەر دەنراو رووبەرووی مردن فڕێدراوە. هەرچەندە زۆر چەواشەش کرابێت ئەم ڕێسایانە رەگی " تاوانەکانی ناموس" پێکدێنێن.

لەکاتێکدا ئەخلاق نوێنەرایەتی ئەریتی هێزی هاوبەش دەکات، رۆڵی سیاسەت تۆزێک جیاوازترە. بۆ گفتوگۆکردن و بڕیار وەرگرتن سەبارەت بەکارە هاوبەشە هەنووکەیی یان رۆژانەییەکان پێویستی بەهێزی هزر هەیە. هزری رۆژانەیی ئافرێنەر بۆ سیاسەت مەرجە. هەروەها کۆمەڵگا زۆر باش دەزانێت وەك سەرچاوە، ئەگەر پشت بە ئەخلاق نەبەستێت کە کەڵەکەبوونی هزرە، نەهزری سیاسی، نەخودی سیاسەتیش ئەنجامنادرێن. بۆ کارە هاوبەشە رۆژانەییەکان ( بەرژەوەندی هاوبەشی کۆمەڵگا) سیاسەت گۆڕەپانێکی دەست لێبەرنەدراوی چالاکییە. هەر چەندە سەبارەت بە کارەکان هزر و بۆچوونی جیاواز، تەنانەت هی دژ و پێچەوانەش جێگای باسبن، بەڵام دیسان بۆ گفتوگۆ و بڕیاردان مەرجە. کۆمەڵگای بێ سیاسەت یان وەك مێگەل ملکەچی ڕێسای خەڵکانی دیکە دەبێت، یان وەك ئاژەڵە سەربڕاوەکە پەلەقاژەیەتی و خۆی بە راست وچەپدا دەدات. هێزی هزری خودی کۆمەڵگا دەزگایەکی سەرخان نییە"بەڵکو مێشکی کۆمەڵگایە. ئۆرگانەکانیشی ئەخلاق و سیاسەتن.

ئۆرگانی دیکەی کۆمەڵگا، هەڵبەتە پەرستگایە کە شوێنێکی پیرۆزە. بەڵام ئەمە پەرستگای هێزی هەژموونگەرایی (پلەداری و دەوڵەت)نییە، بەڵکو جێگە پیرۆزەکەی خۆی بوو. لێگەڕینی کۆمەڵگا بۆ شوێنە پیرۆزەکانی خۆی، جێگای سەرەکی دۆزینەوە شوێنەوارناسییەکانی گرتووە. لەوانەیە تاکە بونیادی گرنگ بێت کە تا رۆژی ئەمڕۆمان لەسەرپێیان ماوەتەوە. ناشێت ئەم راستییە بەڕێکەوت لەقەڵەم بدرێت. یەکەمین جێگای پیرۆزی کۆمەڵگا ئەو شوێنەیە کە نوێنەرایەتی تەواوی رابردوو، ناسنامە و هاوبەشێتییەکەی دەکات. شوێنی یادکردنەوەی بەکۆمەڵ و عیبادەتکردنە. جێگەی یادکردنەوەی خۆیەتی، نیشانەی گواستنەوەیە بۆ داهاتوو، هۆکار و بیانوویەکی گرنگی بەیەکەوەبوونە. کۆمەڵگا دەیزانی پەرستگا لەشوێنێکی چەندە سەرنجڕاکێش، شکۆمەند و گونجاو بۆ ژیانێکی نەخشین بونیادبنرێت بەو رادەیە توانای نوێنەرایەتیکردن و بەهای ژیانی دەبێت. لەم سۆنگەیەوە شکۆمەندی هەرە زۆر لە پەرستگاکان پیشاندرا. هەروەکو لەنموونەی سۆمەریشدا دەبینرێت، پەرستگا لەهەمان کاتدا کۆگای ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و شوێنی حەوانەوەی رەنجدەرانە. واتە شوێنی کاری شێوازی هەرەوەزی بوو. تەنیا جێگای عیبادەت نەبوو، بەڵکو شوێنی گفتوگۆی بەکۆمەڵ و بڕیار وەرگرتن بوو. ناوەندی سیاسی بوو. خانەی پیشەکاران بوو. ئەو ناوەندە بوو کە دانا و بیناسازەکان هونەری خۆیان تێدا

تاقیدەکردەوە. یەکەمین نموونەی ئەکادیمیا بوو. ڕێکەوت نییە کە ناوەندی تەواوی کەهانەتەکانی چاخی یەکەمین لە پەرستگاکاندایە. تەواوی ئەم فاکتەرانە و سەدانی دیکەش گرنگی پەرستگا پیشاندەدەن. بەدڵنیاییەوە کۆکردنەوە و ناوبردنی ئەم نۆخە بە ناوەندی زهنییەت و ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگا واقیعی دەبێت.

ئەو وێرانەیەی ئورفا کە بەردە چەقێنراوەکان داپۆشیوە هی دوازدە هەزار ساڵ بەرلەئێستایە. هێشتا شۆڕشی کشتوکاڵ ئەنجام نەدرابوو. بەڵام ئەم بەرد داتاشین و چەقاندنە پێویستی بە مرۆڤی پێگەیشتوو هەیە. لەم سۆنگەوە پێویستی بە هەبوونی کۆمەڵگایەك هەیە. ئەوانە کێ بوون، چۆن قسەیان دەکرد، چۆن دەژیان و زیانیان دەکرد؟ فکر و نەریتەکانیان چی بوون؟ چۆن پێویستییەکانی گوزەرانیان دابین دەکرد؟ هیچ شوێنپەنجەیەك لە ئارادا نییە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە. بەڵام شیمانەی مەزن ئەوەیە کە کۆتەڵی بەردە چەقێنراوەکان وەك شوێنپەنجەیەکی پاشماوەی پەرستگا ماوەتەوە. بەگوێرەی ئەوەی لادێیە ئاساییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەو هێزەیان نییە بەمجۆرە بەردەکان بتاشن، بەشێوەیەکی واتادار بیکوڵن و بیبەنە ئەو شوێنە و بیچەقێنن، کەواتە ئەو مرۆڤانە و کۆمەڵگاکەیان لە لادێیی و کۆمەڵگای گوندەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان دواکەوتووتر نەبوون. بابەتی لەم شێوەیە تەنیا دەتوانین شیمانەی بۆ بکەین. پیرۆزی ئورفا (هەرچەندە شێوێندرابێت) لەوانەیە وەك نموونەی رووبارێك لەم نەریتەی بەر لە مێژووەوە دەپاڵێورێت و تا ئەمڕۆ هاتووە. لەم چوارچێوەیەدا هەبوون و گرنگی پەرستگای کۆمەڵگا جێگای گفتوگۆکردن نییە. بەڵکو هەبوون و ڕۆڵی پەرستگای هەژموونگەرایی تاوتوێ دەکەم.

راهیبەکانی میسریش بەلانی کەم هێندەی نموونەکەی سۆمەر لە ئاولکردنی پەرستگای هەژموونگەراییدا خاوەن ڕۆڵن. براهمانەکانی هیندستانیش ڕۆڵیان لەوان جیاوازتر نەبوو. ڕۆژهەڵاتی دوور هەمووی رەوشەکەی لەوە جیاوازتر نەبوو. پەرستگاکانی ئەمریکای باشووریش هەژموونگەرا بوون. لەخۆڕا لاوان وەك قوربانی دەستنیشان نەدەکران. پەرستگا دەسەڵاتدارەکانی تەواوی سەردەمەکانی شارستانی هەژموونگەرابوون، وەك کۆپی ئۆرژیناڵەکە بوون. ئامادەکردنی کۆمەڵگا بەگوێرەی سوود و بەرژەوەندی باڵادەستان ڕۆڵی سەرەکی ئەم ناوەندانە بوو. لەکاتێکدا لقی سەربازی پاوان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر کەللە سەری مرۆڤی دەپەڕاند و قەڵا و شورای لێ دروستدەکردن، لقە ڕوحانییەکەشی لەمیانەی فەتحی زهنییەوە هەمان کاری تەواو دەکرد. هەردوو کردەوە شانبەشانی یەکتر ڕۆڵیان لە بەکۆیلەکردنی جڤاتەکاندا بینی. یەکێکیان ترس،

ئەویتریشیان ڕەزامەندی( ئیقناع)ی پێشخست. کێ دەتوانێت نکوڵی لەبەردەوامبوونی هەزاران ساڵەی ئەم شێوازەی کۆمەڵگای شارستانی بکات؟

شارستانی هەژموونگەرایی ئەوروپا لەمبارەیەوە گۆڕانکارییەکی مەزنی لە بواری شێوەدا ئەنجامدا. بەڵام گەوهەرەکەی وەك خۆی هێشتەوە، پاراستی. دەزگا زەبەلاحەکانی دەوڵەت ـــ نەتەوەی سەر کۆمەڵگا هەر بەمەوە نەوەستان، بەڵکو تا داتاکانیەوە مەمیلەکانی ناوەوەی کۆمەڵگایان کۆنترۆڵ کرد و بەخۆیانەوە بەستنەوە. ئەگەر ئەوەی ناوەندەکانی ئاواکردنی زهنییەت، واتە زانکۆ، ئەکادیمیا، خوارتر دواناوەندی، قوتابخانەی ناوەندی و سەرەتایی و باخچەی ساوایان دەیدات، کڵێسا، حەورا و مزگەوت تەولوی دەکات، سەربازگەش تەختی دەکات: ئەگەر ئەمە فەتح، داگیرکردن، ئاسیمیلاسیۆن (تواندنەوە) و کۆڵۆنیکردنی پاشماوەکانی شانەی سیاسی و ئەخلاقی زهنی کۆمەڵگا نییە ئەی چییە؟ کەواتە کاتێك هەندێك ڕاڤەکاری هێژا دەڵێن " بەجەماوەرکردنی " کۆمەڵگا بەمێگەلکردنێتی، لەخۆڕا قسە ناکەن. لەهەمانکاتدا یەکێك لە بیرەوەرییە تازەکەمانە کەچۆن لەمیانەی دلگیرکردنی زهنەوە بەرەو کۆمەڵگای فاشیزم ڕۆشتن. بەخوێن شوشتنەوەی مێژووی نزیکیش ئەنجامی ئەم فەتحەی زهن بوو.

دووبارەکردنەوە هیچ زیانێکی نییە" ئەگەر ڕەمز و وێنەکانی میللیگەرایی، ئایینگەرایی، ڕەگەزگەرایی، وەرزشگەرایی و هونەرگەرایی بهەژێنی دەتوانی جەماوەر، کۆمەڵگا ـ ببورن، مێگەل ـ بۆ هەر ئامانجێك ئاراستە بکەیت کە مەبەستتە. فەتحکردنی زهن بناخەی ئەو دۆخەیە کە کۆمەڵگا بۆ سەرمایە ـ فینانسی جیهانگیری ڕۆژی ئەمڕۆمان ئاواڵایە، هیچ توندوتیژییەك ناتوانێت بەمجۆرە سەرکەوتوو بێت. پێویستە جارێکی دیکەش لەئاست ڕاهیبەکانی سۆمەر و دۆزینەوەی پەرستگا لە ئامادەباشیدا سڵاو بکەین! فەتحکارێکی چەندە نایاب و ترسناکن، سەرباری ئەوەی پێنج هەزار ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، دوا دوێنەر و پەرستگاکانیان لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا بەبێ ئەوەی دەستیان بخەنە ناو ئاوی ساردوگەرمەوە دەتوانن گەورەترین سەرمایەی مێژوو بەدەست بێنن! تەنانەت بەهێزترین ڕەمز و سێبەرەکانی خودلوەند نەیانتوانی هێندە قازانج بەدەست بێنن. کەواتە کەڵەکەبوونی چڕ و بەردەوامی سەرمایە دەستەواژەیەکی بێ ناوەڕۆك و لەخۆڕا نییە. پێکدادان و ململانێ زهنییەکان ئۆپەراسیۆنی سادە نین. لەکاتێکدا دکتۆر حیکمەت قفلجملی[10] و

---

[10] د.حیکمەت قفلجملی: لە مەکەدۆنیا لە دایك بووە(١٩٠٢-١٩٧١). گرنگی بە سۆسیالیزم داوە، لە ساڵی ١٩٢٥ وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا هەڵبژێردراوە. لە ڕۆژنامەکانی تورکیا دەینووسی، بەهۆی نووسینەکانیەوە چەندین جار زیندانی کراوە. لە ساڵی ١٩٤٥ پارتی نیشتیمانی دامەزراندووە، لەساڵی ١٩٥٧ بەڕێوەبەرایەتیەکەی دەستگیرکراو پارتەکەشی

ئەنتۆنیۆ گرامشی ئیتاڵی پێناسەی هاوشێوەیان دەربەق بەفەتحی هەژموونگەرایی ئەنجامدەدا لە بەندیخانەکانی ئەو قۆناخەدابوون کە هەرە زۆر دەوڵەت ــ نەتەوەی تێدا شکۆدارکراوە. ئەوەی دەیانزانی لە ژیانیانەوە فێری ببوون. منیش لە لواشیکاردا "مەحکوم (بەندکراو)" ێکی سەرمایەی جیهانگیریم. بەشێوەیەکی راست نەمناسیبوایە، لەکەسایەتی (ناسنامەی) زهنی خۆمدا دەبووە خیانەت بەرامبەر خودی زهنی کۆمەڵگا.

## ٤ ــ کێشە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا

کاتێك باسی کێشە ئابوورییەکان دەکرێت مێروولەم بەبیردا دێت. تەنانەت زیندەوەرێکی بچووکی وەك مێروولەش کێشەی ئابووری ( بۆ هەر زیندەوەرێك ئابووری بریتییە لە بەخێوکردن) نییە چۆن بوونەوەرێکی خاوەن ئەزموون و ئەقڵێکی پێگەیشتووی وەك مرۆڤ کێشەی ئابووری دەبێت، بگرە دووچاری دۆخێکی شەرمەندەی وەك بێکاری دەبێت؟ چی لە سروشتدا هەیە ژێری مرۆڤ کاری لەسەر بکات و نەتوانێت بیکات بە ئیش؟ مسۆگەر گرفتەکە نە لە میکانیزمی سروشتدایە، نە پەیوەندیشی بە ژینگەوە هەیە. گورگە زۆردارەکەی مرۆڤ لەناو خۆیدایە. هەرکێشەیەکی ئابووری، لەسەرووی هەموشیانەوە بێکاری، پەیوەندی بەسەرمایەکردنی کۆمەڵگاوە هەیە.

بێگومان شیکارەکەی مارکس سەبارەت بەسەرمایە هێژایە. پەیوەست بە قۆناخی قەیرانەوە هەوڵی روونکردنەوەی بێکاریش دەدات. ئەوەی جێگای داخە، نەخۆشی پۆزێتیڤیزمگەرایی لە دۆخێکی زۆر خراپدا تووشی ئەویش بوو. نەخۆشی زانستگەرایی لە ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مێژوویی بەربەستی کردووە. ئەوەی من هەوڵی ئەنجامدانی دەدەم ئەوەیە: سەرمایە ئابووری نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئامرازە بەکاریگەرەکەی دەرخستنی ئابوورییە لەناوەڕۆکی خۆیەوە. بیانو و هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم پێناسەیەشم، هیچ کاتێك لەپەرەسەندنی کۆمەڵگادا ئامانج قازانج و سەرمایە نەبووە، بگرە جێگاشی نەبۆتەوە. دەشێت بیر لە کۆمەڵگایەکی دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانی بکرێتەوە. ئەخلاق و سیاسەت بۆ ئەمە کراوەن. بەڵام لە دۆخێکدا کە کۆمەڵگا لەناو نەبوونی پێوستییەکان و بێکاریدا گرمۆڵە بوویێت، لە دەورووبەردا باسکردنی سەرمایە و دەوڵەمەندێتی تاوانیشی تێپەڕکردووە و پەیوەندی بە قڕکردنی کۆمەڵگاوە هەیە.

داخرا. لە بەرهەمەکانی: هەڵپەرستی چییە؟، نەخشەکانی شەڕی گەلەری، راستی تورکیا و سۆسیالیزم، پەرەسەندنی سەرمایەداری لە تورکیا و هێزی کۆمۆن.

پێناسەکردنی شارستانی وەك خودی گرێی کێشەکان، بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەپاوانی سەرمایە کۆڵەکەکەیەتی.

رۆزا لوکسمبورگ کاتێك ئەنجامگیربوونی سەرمایە بە هەلومەرجی کۆمەڵگا ناسەرمایەدارییەکان دەبەستێتەوە، نزیکی راستییەکی زۆر گرنگ بۆتەوە. ئەگەر لەکەنارەوە بیتوانیبایە کەمێکی تر بەرەو ناوەوە بچێت، ئەوکاتە دەبیبینی کە تەنیا گرێدراوی کۆمەڵگا ناسەرمایەدارەکان نییە، بەڵکو وەك گەنە کۆمەڵگا دەمژێت و بەمجۆرە دەناوسێت، دڵۆپێك لەو خوێنەشی دەرخواردی کارکەراندەدا و بەمجۆرە کردوونیەتی بە هاوبەشی تاوانەکەی. بەشێوەیەکی روون وناشکرا دەڵێم: نکوڵی لەهەوڵەکانی کارکەرانیش ناکەم، بەڵام بەشێوەیەکی رێژەیی دەتوانرێت پێکهاتنی سەرمایە بە رەنجی کارکەرانەوە ببەسترێتەوە، تەنانەت ئەگەر لەچوارچێوەیەکی فەلسەفی ــ مێژوویی ــ کۆمەڵایەتی بیری لێبکرێتەوە ئەم بڕە رێژەییەش واتای خۆی لەدەستدەدات. بەهۆی کێشە ئیکۆلۆژییەکانەوە رۆژ بە رۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێت کە ئیندوستریالیزم تاڵانێکە لەسەر پشتی کۆمەڵگا و ژینگە ئەنجامدەدرێت. کامە مرۆڤی بینا و خاوەن زانیاری دەتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە لە رۆژی ئەمڕۆماندا بەڕێوەبەرەکانی کار (خستنەکار) و کارکەرە وەستاکان نەبوونەتە توێژێکی هەرە تایبەتی کۆمەڵگا و لەبەرامبەر ئەمەشدا بێکاری وەك هەرەسی بەفر لەزیادبووندایە؟ چینە پێشکەوتووەکانی پیشەسازی، بازرگانی پاوانخواز و توێژەکانی پارەدارکردن (فینانس)، واتە پاوانەکانی سەرمایە لەمیانەی پرۆژەکانی "شەراکەتی فرەبەش" چاك زاراوەی کارکەریان بێواتاکردووە. ببینین ئەو راستییە گرنگە کە رۆڵی کارکەر بۆ ئەو قایشە بچووککراوەتەوە کە پاوانی سەرمایە بەکۆمەڵگاوە دەبەستێتەوە. هەروەکو چۆن رۆڵی سەرمایەداری دەوڵەت، واتە رۆڵی سۆسیالیزمی بونیادنراو وەك "کارکەری سازشکار" پێناسە دەکرێت، سەرمایەداری تایبەتی کلاسیکیش کارکەرێکی سازشکاری هاوشێوەی هەیە. ئەمانە هەمووکاتێك بەیەکەوە لەناو کۆمەڵگا گەشەیان کردووە. ئەو کۆمەڵگایەی دەمێنێتەوە، ئەو کۆمەڵگا ناسەرمایەدارییەیە کە بەبیری رۆزادا هاتووە.

ئەگەر سەرنج بدرێت لێرەدا جیاوازی نێوان سەرمایەداری و ناسەرمایەداری پێناسە دەکرێت. لای رۆزا هەردووکیان شێوەیەکن لە شێوەکانی کۆمەڵگا. هەڵسەنگاندنی من زۆر جیاوازترە، سەرمایەداری وەك شێوەیەکی کۆمەڵگا نابینم، بەڵکو وەك رێکخستن و تۆڕێکی بەرفراوانی هەڵدەسەنگێنم کە زێدە ــ بەها لەسەر پشتی کۆمەڵگا تاڵان دەکات، ئابووری وشك دەکات، بێکاری دەئافرێنیت، لەگەڵ دەوڵەت و دەسەڵات رێکدەکەوێت و ئامرازە بەهێزەکانی

هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی بەکار دێنێت. لە قۆناخی دواییدا توێژی کرێکارە شارشکارەکانیشیان خستە ناو ئەم ڕێکخستنەوە. کاتێك دیسان بەمجۆرە ناوەڕۆکی تۆڕی پاوانخوازی پێناسەدەکەم، ئامانجم بەلاوەنانی چەندین تێگەیشتنی هەڵەیە. بەتایبەتیش پێویستە کارەکتەری تەڵەکەبازی زاراوەی "کۆمەڵگای سەرمایەداری"ئاشکرا بکەم. چونکە پێشکەشکردنی خەسڵەتێکی بەمجۆرە بەپاوانی سەرمایەداری بە زیادەوە چاکە کردنە. سەرمایە دەتوانێت تۆڕی ڕێکخستنی ئاوا بکات. پێویستە زۆر باش بزانرێت کە مافیاش تۆڕێکی ناقۆڵای سەرمایەی هەیە. تاکە هۆکاری ناونەبردنی تۆڕی سەرمایە بەمافیا، هێزە هەژموونگەرایییەکەی لەناوکۆمەڵگا و پەیوەندییەکەیەتی بە دەسەڵاتی فەرمییەوە. ئەگەر وەها نەبوایە وەك تۆڕێك دەمایەوە کە هێندەی مافیاش خاوەن ڕێسای ئەخلاقی نەبێت.

بە بایەخەوە پێویستە ئەم خاڵەی لەسەر زیاد بکەم: کشتوکاڵ، بازرگان و پیشەسازی قەبارە ناوین بە سەرمایەدار دانانێم. ئەمانە تا ڕادەیەکی مەزن لەپێناو پێداویستییە ئابوورییە ڕاستەقینەکانن، هەرچەندە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە بخرێتە ژێر مەقاشی سەرمایەوە، بەڵام توێژێکی کۆمەڵایەتین کە هەوڵی بەرهەمهێنان دەدەن. هەروەها کڕین و فرۆشتنی کاڵا بچووکەکانی بازاڕ و ئەوانەی ئەم کاڵایانە لەخستنەگەڕ و کارە بچووکەکاندا بەرهەمدێنن، ئەوانیش بەسەرمایەدار دانانێم. چونکە ئەوانەی خاوەنی پیشەی جیاوازن بە سەرمایەدار دانانرێن. جگە لە توێژە سارشکارەکان، تەواوی کارکەران، لاتییەکان، خوێندکاران، فەرمانبەران، پیشەکارانی دەست، منداڵان و ژنان بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگا پێکدێنن. هەوڵی پێشخستنی ئەم پێناسەیە بۆ کۆمەڵگای ناسەرمایەداری دەدەم. واتە هەروەکو زۆربەی مارکسیستەکان ئاماژەی پێدەکەن لە کۆمەڵگا ناسەرمایەدارەکان مەبەستم زاراوەکانی فیوداڵ، چەشنی ئاسیا و نیو ـــ فیوداڵ نییە. بەبڕوای من ئەم زاراوانە هەروەکو چۆن پیشاندەری ڕاستی نین، بەڵکو زیاتر پەردەپۆشی دەکەن. ئەم شیکردنەوانە تەنیا سەبارەت بەو تۆڕانەی سەرمایەوە ناکەم کە لەدوای سەدەی شازدەهەم لە ئەورووپا بەناوەند بوو، بەڵکو لەچوارچێوەی تەواوی تۆڕەکانی سەرمایە (پاوانە بازرگانی ـ سیاسی ـ سەربازی ـ ئایدیۆلۆژی، کشتوکاڵی و پیشەسازی ) پێشی دەخەم کە بەدرێژایی مێژوو زێدە ـــ بەهایان زەوتکردووە. ئاشکرایە بۆ بینینی ڕاستی ئەم شیکارەمان لە ڕاستینەی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پێویستییەکی زیاتری بە لێکۆڵینەوە نییە.

بینینی کارەکتەری دژە ـ سەرمایەی سروشتی کۆمەڵگا زۆر بایەخدارە. لەکاروانی هەزاران ساڵەی خۆیدا کۆمەڵگا ئاگاداربووە کە کەڵەکەبوونی سەرمایە کاریگەرییەکی پووکێنەرانەی هەیە.

بۆ نموونە" هیچ هێزێك نەماوە سوو (ربا) ریسوا نەکات کە یەکێك لە پەیڕەوە بەکاریگەرەکانی کەڵەکەکردنی سەرمایەیە.

ئەو بانگەشەیەی دەڵێت ئەو بێکارییەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا وەك هەرەسی بەفر گەورە دەبێت بە ئامانجی دابینکردنی کرێکاری هەرزان و نەرم لەلایەن سەرمایەوە پێشخراوە، هەڵسەنگاندنێکی زۆر ناتەواوە. لەگەڵ ئەوەی ئەمە لایەکی راستییە، بەڵام هۆکارە سەرەکییەکەی، بۆ ئەوەیە کە سەرمایە کۆمەڵگا بەو چالاکیانە ببەستێتەوە کە بەدوای قازانجدا رادەکات. چالاکییەك لەپێناو قازانج ـ سەرمایە بێت مسۆگەر لەگەڵ پێداویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا یەکناگرێتەوە. ئەگەر ئەو بەرووبومەی لەپێناو تێرکردنی کۆمەڵگا بەرهەم دەهێنرێت قازانجی نەبێت کەواتە سەرمایە هیچ گرنگی بەوە نادات کە کۆمەڵگا لەبرسان و بەهۆی هەژاری دەشکێت ـــ لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بە ملیۆنان مرۆڤ لەم رەوشەدان ـــ. بۆ نموونە کەمێك لەبری ئەو سەرمایەی هەیە بۆ کشتوکاڵ بخرێتە کار، هەرگیز کێشەی برسێتی نامێنێت و روونادات. بەڵام بەپێچەوانەوە سەرمایە بەردەوام بواری کشتوکاڵ چۆڵ دەکات و تێکیدەدات. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە رادەی قازانج لەکشتوکاڵدا یان هیچ نییە یاخود زۆر کەمە. لەکاتێکدا پارەیەکی بەکجار زۆر بەپارە قازانج دەکات، هیچ شەرمایەدارێك بیر لە کشتوکاڵ ناکاتەوە. هەرگیز ئەمجۆرە بیرکردنەوە لەکارەکتەری سەرمایەدا جێگای نابێتەوە. جاران وەك پاوان دەوڵەت پارمەتییەکی باشی بواری کشتوکاڵی دەکرد. بەڵام بەرامبەرەکەشی بەشێوەی بەرووبووم یاخود پارە ـــ باج وەردەگرت. بازاڕی سەرمایەی ئێستاکە ئەمجۆرە چالاکیانەی دەوڵەتیان بێواتا کردووە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ئەو دەوڵەتانە لە ئیفلاسکردن رزگاریان نابێت.

کەواتە بەهۆی سیاسەتە رۆژانەیی و کاتییەکانەوە نییە کە سەرمایە پێبەپێ جەستەی سەرەکی کۆمەڵگا بەبێکاری و هەژاری دەهێڵێتەوە، بەڵکو بەهۆی کارەکتەرە بونیادییەکەیەتی. بەبێ ئەنجامدانی هیچ لێکۆڵینەوەیەك و تەنیا لە رێگای تێروانینێکی ئاساییەوە دەتوانرێت ببینرێت ئەگەر بە کرێیەکی زۆر هەرزانیش خوازیاری کارکردن بن، دیسان بێکارییەکەی ناو کۆمەڵگا چارەسەر نابێت،. دووبارە دەیڵێمەوە پێویستە باش بزانرێت تا سیستەم و سیاسەتەکانی بەدەستهێنانی قازانج لەبەین نەبرێن کە لەسەر زێدە ـ بەها ناولکراوە، کۆمەڵگا لە بێکاری و هەژاری رزگاری نابێت.

ئەگەر نا ئەو شوێنەی بەدرێژایی مێژوو چەندین کۆمەڵگای تێرکرد، پانزدە هەزار ساڵ دایکایەتی بۆ کۆمەڵگای نیولیتیك کرد، واتە بۆچی لە پێدەشتەکانی میزۆبۆتامیا بێکاری و برسێتی

بڵاوبۆتەوە؟ ئەگەر بەرنامەیەکی بەرهەمهێنانی بۆ دابنرێت کە ئامانجی قازانج نەبێت، هەڵمەتی بۆ بکرێت، بەگوێرەی پێوانەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆر بە ئاسانی دەتوانێت بیست و پێنج ملیۆن کەس بەخێوبکات و زیادەش دەمێنێتەوە، تاکە پێویستی ئەم دەشتانە و مرۆڤەکانی ئەو دەستەی سەرمایە نییە کە نایانخاتە ناوکارەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم دەستە (دەستی تایبەت بێت یان دەوڵەت هیچ جیاوازی نییە) یەخەی بەربدات کە تاکە هۆکاری بێکاری، برسێتی و هەژارییە. تاکە شتی پێویست، بەیەکگەیشتنی خاك و دەستی ڕەنجدەری ڕاستەقینەیە: لەبەرئەم هۆکارانەیە کە پێویستە سیاسەتی دیموکراتییانە بەچوار پەل و چاو و مێشکێکی ڕاستەوە ئەرکەکانی خۆی ڕاپەڕێنێت.

### ٥ ـ کێشەی ئیندوستریالیزمی کۆمەڵگا

شۆڕشی پیشەسازی کە هێندەی شۆڕشی کشتوکاڵ بایەخدارە، لەسەر بنەمای توانای کەڵەکەبووی هەزاران ساڵەی مێژوو لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم قەڵەمبازێکی چۆنایەتی ئەنجامداوە و تارۆژگاری ئەمڕۆمان درێژە بەئاراستەی هەڵکشان ـ دابەزینی خۆی دەدات. نازانرێت لەکوێ، کەی، چۆن دەوەستێت، یان دەوەستێنرێت. ئەم شۆڕشە تایبەتمەندییەکی بەمجۆرەی هەیە: وەك بڵێی تەقینەوەی ئەقڵی ئەنالیتیکە، خۆشی بەرهەمی ئەم ئەقڵەیە. لەژێر حوکمڕانی مسۆگەری سەرمایە دایە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە سەرمایە خۆی داهێنەری زۆربەی ئامرازەکانی پیشەسازی نییە. هەموو کاتێك بە بایەخەوە هەڵوەستەی لەسەر کردووە، بەڵام بۆ ئەوەی بۆ ئامرازی سەرمایە بیانگۆڕێت، ئەوانەی پێویستی بینیون کردوونیەتی بەموڵکی خۆی. بەرهەمهێنانی خێرا و هەرزان، دەرفەتێکی مەزنی پەرەسەندنی کۆمەڵگایە. ئەو پیشەسازییەی لەخزمەتی کۆمەڵگا دابێت وەك ئەقڵ هێژاو بەنرخە. کێشە لەخودی پیشەسازیدا نییە، بەڵکو لەشێوازی بەکارهێنانیدایە. پیشەسازیش وەك توانای ناوکییە. کاتێك لەبەرژەوەندی پاوانەکان بەکاربهێنرێت، بۆ ئامرازێك دەگۆڕێت کە شەڕ و کارەساتی ئیکۆلۆژی لەگەڵ خۆیدا دێنێت و ژیان دەخاتە ژێر مەترسییەوە. لەبەرئەوەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بە ئامانجی قازانج بەکاردەهێنرێت، وێرانکاری ژینگەی خێراکردووە. هەروەها بەخێرایی بەرەو کۆمەڵگای وەهمی مەودا دەبرێت. بەخێرایی ڕۆبۆتەکان جێگای ئۆرگانەکانی مرۆڤ دەگرنەوە. بەمجۆرە بەردەوام بێت، تەنانەت خودی مرۆڤیش بێواتا دەبێت.

بۆچوونێكی هاوبەشە كە لەدۆخی ئەمڕۆی ژینگەدا نەك تەنیا كۆمەڵگا بەڵكو ژیانی تەواوی گیانلەبەران لەژێر مەترسیدایە. پێویستە بە بایەخەوە جەختی لەسەر بكرێتەوە، بەتەنیا ڕاگەیاندنی دیاردەی پیشەسازی وەك بەرپرسیاری ئەم دۆخە شێواندن و چەواشەكردنێكی تەواوە. سەربەخۆ بەتەنیا پیشەسازی فاكتەرێكی نۆترە (سفرە). پیشەسازییەك كە لەگەڵ بیانوو و پێویستییەكانی هەبوونی كۆمەڵگا بێت بە یەك، ڕۆڵێكی دیاریكەر دەبینێت لەوەی بۆ مرۆڤ و تەواوی گیانلەبەران، ژیان بۆسروشتی سێیەم وەرچەرخێنێت. خاوەن ماتەوزەیەكی لەم چەشنەیە. ئەگەر بەمجۆرە بێت دەشێت پیشەسازی پیرۆزیش بكرێت. بەڵام ئەگەر بەقورسایی بكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی قازانج ــ سەرمایە، جگە لە گروپێكی پاوانخواز، دونیا بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دەكات بە دۆزەخ. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا بارودۆخەكە بەم ئاراستەیەدا دەڕوات. ڕاستییەكی حاشاهەڵنەگرە كە ئەم ڕەوشە مرۆڤایەتی خستۆتە ناو ترس و دڵەڕاوكێیەكی قووڵ و مەزنەوە. پاوانی پیشەسازی ئیمپراتۆرییەتێكی ڕاستەقینەی لەسەر سەری كۆمەڵگا ئاواكردووە. بەرامبەر بەتاكە سوپەر هەژموونگەرایی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، بەدەیان هەژموونی پیشەسازی لە ئارادایە. تەنانەت ئەگەر هەژموونی سیاسی ــ سەربازی بوەستێنرێت، هەژموونەكانی پیشەسازی بە ئاسانی ناوەستێنرێن. چونكە ئیتر ئەوانیش بوونەتە جیهانگەرا. ئەگەر وڵاتێك كە وەك ناوەند بەكاری دێنێت، داهاتەكەی سنووردار بێت، دەتوانن یەكسەر جێگایەكی دیكە، وڵاتی نوێ بكەن بە ناوەندی خۆیان. كێ دەزانێت لەوانەیە ئیمپراتۆییەتێكی پیشەسازی ئەمریكا، سبەینێ چین وەك ناوەند هەڵببژێرێت! تەنانەت لە ڕۆژی ئەمڕۆشمان دەتوانرێت تێبینی بكرێت كە دوای ئەوەی هەلومەرجەكان لەبارترین هەنگاو بەهەنگاو ئەمە بەدیدێت.

پیشەسازی زەبرێكی كوشندەی لە شادەماری كشتوكاڵ داوە. فاكتەری بنەڕەتی كۆمەڵگای مرۆڤ و ئامرازی هەبوونەكەی، واتە كشتوكاڵ، بەرامبەر بە پیشەسازی دووچاری داڕووخانێكی مەزن هاتووە. ئەم چالاكی و كردە پیرۆزەی پێنج هەزار ساڵە مرۆڤایەتی لەسەرپێیان هێشتۆتەوە، ئەمڕۆ فەرامۆشكراوە. بۆ هێشتنەوەی لەژێر باڵادەستی پیشەسازیدا ئامادە كراوە. وەك مەزەندە دەكرێت پێویستە بەكارهێنانی پیشەسازی لەكشتوكاڵدا وەك بەرهەمهێنانی زۆر و خێرا شرۆڤە نەكرێت. لەمیانەی یاریكردن بە بۆهێڵەكان و پیتاندنی دەستكردەوە لەلایەن پاوانەكانی پیشەسازییەوە زەوی دەخرێتە ڕەوشی دایكایەتییەكی ساختەوە. هەروەكو چۆن ناشێت لە ڕێگای سپێرمێكی بیانی دووگیانی و دایكایەتییەكی تەندروستانە فەراهەم ببێت، ئەوا پیتاندنی زەویش لەمیانەی ئەو تۆوانەی یاری بە بۆهێڵەكانیان كراوە نایخاتە ناو ڕەوشی دایكایەتییەكی

باشەوە. پاوانکارەکانی پیشەسازی سەبارەت بە کشتوکاڵ خۆیان بۆ سەرشێتییەکی لەمجۆرە ئامادە دەکەن. لەوانەیە گەورەترین دژە شۆڕشی مێژووی مرۆڤایەتی لەبواری کشتوکاڵدا رووبدات، تەنانەت دەستیشی پێکردووە. زەوی و کشتوکاڵ، هەردووکیان ئامرازی بەرهەمهێنان نین، هەریەکە و بەشێکی کۆمەڵگان کەلێی جیانابنەوە و یارییان پێناکرێت. کۆمەڵگای مرۆڤ بەگرانی پاڵپشت بە خاك و کشتوکاڵ ئاوالکراوە. دابڕاندنی لەم جێگا و بەرهەمهێنانە، بە واتای بەرکەوتنی زەبرێکی کوشندە لە هەبوونەکەی دێت. راستینەی شار کە وەك شێرپەنجە زیاد دەکات، هەر لە ئێستاوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم مەترسییە پیشاندەدات. تارادەیەکی بەرز و بەشیمانەیەکی مەزنەوە رزگاری لە بزووتنەوەیەکی پێچەوانەدا دەبینرێت: ئەویش بزووتنەوەی گەڕانەوەیە لە شارەوە بۆ خاك و کشتوکاڵ. بەهەرحاڵ وەك دیار دەبێت لەوانەیە دروشمی سەرەکی ئەم بزاڤە بە شێوەی " کشتوکاڵ و خاك لەپێناو هەبوون، یان لەناوچوون " دەستنیشان دەکرێت. قازانج ـ سەرمایە، پیشەسازی و خاك و کشتوکاڵ لەگەڵ یەکتردا ناکاتە یەك، لە رێگای پەیوەندی ژیانی و ئۆستایەتییەوە بە یەکتریان نابەستێتەوە. بەڵکو ناکۆکی گەورەیان لەنێواندا دروست دەکات، دەیانکات بە دوژمنی یەکتری.

ناکۆکییە چینایەتی، ئەتنیکی، نەتەوەیی و ئایدیۆلۆژییەکانی ناو کۆمەڵگا بە ئاستی شەڕ و پێکدادان دەگەن. بەڵام ئەمانە ناکۆکییەك نین دەرفەتی بەلاوەنانیان نەبێت. هەروەکو چۆن بەدەستی مرۆڤ ئاواکراون، بەهەمانشێوە دەتوانرێت نەهێڵدرێت. بەو سیفەتەی ئامرازی سەرمایەیە ناکۆکی پیشەسازی، لەگەڵ خاك و کشتوکاڵی کۆنترۆڵی مرۆڤ تێپەڕ دەکات. خاك و کشتوکاڵ بەملیۆنان ساڵ لەبواری ئیکۆلۆژییەوە خۆیان ئامادەکردووە. ئەگەر دووچاری خراپبوون و تێکچوون ببن، بەدەستی مرۆڤ ئاواناکرێنەوە. هەروەکو چۆن دروستکردنی خاك (زەوی) بەدەستی مرۆڤ نییە، بەرووبوومە کشتوکاڵیەکان و گیانلەبەرانی دیکەشی بەهەمانشێوەیە، بۆ نموونە ئافراندنی رووەکێش ئێستا بەدەستی مرۆڤ نییە، شتێکی لەمجۆرەش چاوەڕوان ناکرێت. لەبنەڕەتدا ئەم توانا و دەرفەتە بەشێوەی مرۆڤ خولڤێنراوە. دووبارەکردنەوەی ئەوەی لە ئارادایە دەرفەت و واتای نییە.

لەبەرئەوەی بابەتێکی فەلسەفی قووڵە هێندە شۆڕنابمە ناویەوە. هەروەکو چۆن فیرعەون تەنیا لەمیانەی گۆڕستانەکانی شێوازی ئەهرامەکانەوە خوازیاربووە ئایندەی خۆی ئامادە بکات، شێوازی خولڤاندنی رۆبۆتیش لەلایەن ئیندوستریالیزمەوە داهاتوویەك نائافرێنێت دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت. بەڵکو ئەمە بەرامبەر بە مرۆڤیش بێڕێزییە. لەکاتێکدا هەبوونێکی شکۆدار و

سەرسوڕهێنەری وەك سروشت لە ئارادایە، ڕۆبۆت و کۆپییەکانی چی واتاو بایەخێکیان دەبێت؟ لێرە جارێکی دیکە سەرشێتی و هاربوونی قازانجی سەرمایە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. با بڵێین ڕۆبۆتەکان هەرزانترین بەرهەمهێنانیان فەراهەمکرد. ئەی ئەگەر کەس نەبێت بەکاریان بێنێت ئەمانە بەکەڵك چی دێن؟ لەملایەنەوە ئیندوستریالیزم فاکتەری سەرەکی بێکاری کۆمەڵگایە: گەورەترین چەکی سەرمایەیە بەرامبەر بەپێتی بەرهەمهێنەری کۆمەڵگا. هەم لە بەکارهێنانی کەمترین ژمارەی کرێکاران، هەم لە ڕێگای نرخە هەرزانەکانەوە کاتێك وەك دەبخوازێت بازاڕ کۆنترۆڵ دەکات، سەرمایە بەردەوام چەکی پیشەسازی بەکاردێنێت. لەدەرەنجامدا بەملیۆنان مرۆڤی بێکار، برسی و هەژار و کاڵای ڕزیوو دەبنە قوربانی ئەم قەیرانانە.

سروشتی کۆمەڵگا تەنیا لەمیانەی وابەستەبوونێکی توند بەژینگەوە کە بەرهەمی ملیۆنانساڵ و شوێنی گونجاوە دەتوانێت بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. هیچ هەبوونێکی دروستکراوی پیشەسازی ناتوانێت شوێنی ژینگە بگرێتەوە کە سەمەرەیەکی گەردوونە. هەر لە ئێستاوە لەسەر زەوی، ئاسمان، دەریا و فەزا ڕووداوەکانی هاتووچۆ و گواستنەوە بەئاستی کارەسات گەیشتوون. پیشەسازی کە بە پاشماوەی سووتەمەنییەکان کاردەکات، بەردەوام کەش و ژینگە ژەهراوی دەکات. تەواوی ئەم کارەساتانە، بەرامبەرەکەی کەڵەکەکردنی قازانجی نووسەد ساڵەیە. ئایا ئەم کەڵەکەبوونە هێژای ئەم هەموو کاولکارییە بوو؟ هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەو کاولکارییەی لەئارادایە کۆی شەڕەکان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە، ئەو زیانە گیانییەی لێی کەوتۆتەوە هیچ ڕووداوێکی دیکەی سروشت یان دەسکردی مرۆڤ لەگەڵ خۆی نەهێناوە.

ئیندوستریالیزم وەك ئامێرێك و ئایدیۆلۆژیایەکی پاوانخواز یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی کۆمەڵگایە. بۆیە پێویستە لە قووڵاییدا لێپرسینەوەی لەبارەوە بکرێت. تەنیا ئەو مەترسیانەی خولقاندوویەتی بۆ ئەنجامدانی ئەم لێپرسینەوە بەسە. ئەگەر جانەوەرەکە گەورەتر بێت و لەژێر کۆنترۆڵ دەرکەوێت، ئەوا لەوانەیە ئەم لێپرسینەوە و تەگبیرانەی بەرامبەری وەربگیرێت درەنگ و بێواتا ببێت. بۆئەوەی نەهێڵێن کۆمەڵگا لەناوەڕۆکی خۆی دەربخرێت و بەنۆخی کۆمەڵگای وەهمی بگەیەنرێت، پێویستە ئەم جانەوەرە لە دەستی پاوانەکان دەربهێنرێت، سەرەتا ماڵیبکرێت، دواتر کاتی ئەوەیە بکرێتە دۆستی سروست.

کاتێك تێکۆشان بەرامبەر بە ئیندوستریالیزم دەکەین، جیاکردنەوەی بەکارهێنان و بونیادی ئایدیۆلۆژی پاوانخوازی تەکنۆلۆژیای پیشەسازی لەگەڵ شێوازی بەکارهێنان و بونیادە گونجاوەکانی بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگا، گرنگترین ئەرکی خەباتی زانستی و

تێکۆشانی ئایدیۆلۆژییە. ئەو گروپانەی دابڕاو لەپێگە کۆمەڵایەتی و چینایەتییەکەی لەسەرینەمای مرۆڤپەروەرییەوە بانگەشەی تێکۆشان بەرامبەر ئیندوستریالیزم دەکەن، چاوەڕوانی گەیشتن بە ئامانجەکانیان لێناکرێت. ئەم گروپانە بەشێوەیەکی بابەتی بەپێچەوانەی ئامانجەکانیان دەکەونەوە، دەکەونە نۆخێکەوە خزمەت بە ئیندوستریالیزمی پاوانخواز بکەن. چونکە لەمەزندەکان زیاتر ئیندوستریالیزم خاوەن کارەکتەرێکی ئایدیۆلۆژی، میلیتاریستی و چینایەتییە. چونکە زانست و تەکنۆلۆژیایە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا. تەنانەت نوێنەرایەتی ترسناکترین رەهەندەکانی ئەو زانست و تەکنۆلۆژیایە دەکات کە لەم لایەنەوە بەکاردەهێنرێت. هەروەها جانەوەری پیشەسازی لەخۆیەوە سەریهەڵنەداوە. پێویستە بە یادی خۆمانی بێنینەوە: کاتێك بۆرژوازی ئینگلتەرا لە دوورگە، ئەوروپا و جیهان هەڵمەتە مێژووییەکەی ئیمپریالیزمی ئەنجامدا، چینێکە کە هەم ئیندوستریالیزمی رێکخستووە، هەم بەشێوەیەکی خێرا و بەرفراوان بەکاریهێناوە. دواتر بە ریزە ئیندوستریالیزم بۆتە چەکی هاوبەشی بۆرژوازی تەولوی وڵاتان. هەروەها فەراهەمبوونی باڵادەستی چینی بۆرژوازی لەئاستی جیهاندا لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم کە لەناو سێیینەی فینانس ـ بازرگانی ـ پیشەسازیدا زیاتر سەردەمی پیشەسازییە، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم راستییە دەسەلمێنێت.

چەندە جێگای داخ و پەژارەیە کە کارل مارکس و بزووتنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو کۆمەڵگا ناسەرمایەدارەکانیان بەکۆنەپەرست راگەیاندووە و رێککەوتنی ستراتیژییان لەگەڵ بۆرژوازی پیشەسازی پەسەند کردووە، ئەگەر بە ئەنقەست و بەئاگاییشەوە نەبێت، تراژیدیترین بزووتنەوەیە، بگرە لەسەرووی ئەو بزاڤانە دێت کە لە مێژوودا پێچەوانەی ئامانجەکانی خۆیان بوونەتەوە و تەنانەت لەلایەنی بابەتییەوە بە واتای خیانەت دێت. ئەمەش هەروەکو ئەو نۆخەیە کە بەسەر کرستیانەکانیش هات: بەدرێژایی سێسەد ساڵ ئایینی ئاشتی بوو، لە ئاکامی رێککەوتنەکەی لەگەڵ دەوڵەت و دەسەڵات، بەشێوەیەکی بابەتی، زیاتریش بە ئاگاییەوە پێچەوانەی ئامانجەکانی خۆی بوویەوە و خیانەتی کرد. کرستیانیش لە دواشیکاردا شەیدای سەرنجراکێشی پاوانی دەسەڵات بوو، پێچەوانەی ئامانجەکانی سەرهەڵدانی خۆی کەوتەوە و لەبوون بە ئایینی شارستانی رزگاری نەبوو. هەرچی ئیسلامە، هێشتا حەزرەتی محەمەد زیندوو بوو دەستی پێکرد. لە دەرەنجامدا بەرامبەر بە پیشەسازی دەسەلات تێکدەشکێن و چۆکدادەدەن.

هەروەك بڵێی کاتژمێرەکانی قیامەت لێدەدات ئەگەر ئەمڕۆ سەرجەم مرۆڤایەتی دەستی بە هاوار کردووە، پێویستە لەژێر رۆشنایی نموونەی بزووتنەوەی هاوشێوەوە دەرك بە رەهەندەکانی

چین و کۆمەڵگای مێژوویی ئەم رووداوە بکرێت، وەك بزووتنەوەی هەبوونی کۆمەڵگا پەسەند بکرێت و هاوشێوەی بزاڤێکی ئایینی نوێ و پیرۆز تێکۆشان بکرێت. هەروەکو چۆن مەحاڵە ئاگر بە ئاگر بکوژێنرێتەوە، تا ژیانی ناو زەلکاوی ئیندوستریالیزم لێپرسینەوەی لەبارەوە نەکرێت و دەستبەرداری لێنەکرێت، ناتوانرێت تیکۆشانی ئیکۆلۆژیش بەرێوەببرێت. ئەگەر ناخوازین دووچاری هیچ تراژیدیایەکی دیکەی بە مۆرك کرستیانی، ئیسلامی و سۆسیالیزمی بونیادنراو ببین، ئەوکاتە پێویستە پەند و ئەزموون وەربگرین و بەشێوەیەکی راست و تەندروستانە تێکۆشانی زانستی ـ ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی ـ سیاسی تاوتوێ بکەین.

### ٦ ـ کێشە ئیکۆلۆژییەکانی کۆمەڵگا

ئاشکرایە کە ئیندوستریالیزم هەم بەشێکی کێشەی ئیکۆلۆژییە، هەمیش هۆکارە سەرەکییەکەیەتی. شرۆڤەکردنی لەژێر سەرە دێڕێکی جیاوازدا لەوانەیە دووبارەبوونەوە بێت. بەڵام ئیکۆلۆژی دۆخێکە لە ئیندوستریالیزم واتادارترە، کۆمەڵایەتی و بەکێشەترە. هەرچەندە وەك زاراوە واتای زانستی دەوروبەر بێت، لەبنەڕەتدا زانستی شیکارکردنی پەیوەندی توندی نێوان پەرەسەندنی کۆمەڵگا و ژینگەکەی دەوروبەرێتی. کاتێك کێشەکانی ژینگە زەنگی کارەساتی لێدا، بەگرانی بوو بە رۆژەڤ: هەرچەندە واتای مەترسیداریش لەخۆوە بگرێت، بەڵام کرا بەڵقێکی جیاوازی لێکۆڵینەوە. چونکە ئەویش وەك ئیندوستریالیزم کێشەیەك نییە کۆمەڵگا ئافراندبێتی، بەڵکو وەك دوا کردەوەی پاوانەکانی شارستانی، بەشێوەی بەرفراوانترین کێشە لەرۆژەڤی مێژوو، جیهان و کۆمەڵگادا جێگیر بووە.

لەوانەیە هیچ کێشەیەك هێندەی کێشە ئیکۆلۆژییەکان سەبارەت بە جێگیرکردنی رووی راستەقینەی ناوەوەی سیستەمەکانی (تۆڕە رێکخراوەکان) قازانج ـ سەرمایە لە رۆژەڤی تەواوی مرۆڤایەتیدا گرنگ و خاوەن قورسایی نەبووە. ئاماری سیستەمی شارستانی قازانج ـ سەرمایە (وەك کۆی تەواوی پاوانە سەربازی، ئابووری، بازرگانی و ئایینەکانی درێژایی مێژوو) تەنیا هی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا نییە لەهەموو لایەکەوە ( بێ ئەخلاقی، بێ سیاسەتی، بێکاری، هەڵاوسانی ئابووری، لەشفرۆشی ...هتد)، بەڵکو بۆتە ئاماری هەڕەشە و مەترسی سەر ژینگە و

ژیانی تەواوی ئەو زیندەوەرانەی تێیدا دەژین. لەم راستیانە زیاتر، بەچی لۆژمنایەتی پاوانخوازی بەرامبەر بە کۆمەڵگا بسەلمێنین؟

هەرچەندە بەگوێرەی تەواوی زیندەوەرەکانی دیکە کۆمەڵگای مرۆڤ وەك سروشتێك بناسرێت کە بەشی ژیری و نەرمایییەکەی بەرزترە، بەڵام لەدوا شیکاردا دیسان هەبوونێکی زیندووە، دونیاییە. بەرهەمی پەرەسەندنی جیهانی رووەك و گیانلەبەران و ئاتمۆسفەری کەشێکە کە زۆر بەوردی و هەستیارانە رێکخراوە. لەبەرئەوەی ئاتمۆسفەر و کەشوهەوای دونیاکەمان کۆی تەواوی ئەو سیستەمانەیە کە جیهانی رووەك و ئاژەڵان پێیەوە گرێدراوە، بۆ کۆمەڵگای مرۆڤیش پەسەندکراوە. ئەم سیستەمانە زۆر هەستیارن. زۆر بەتوندی گرێدراوی یەکترن، وەك بڵێی زنجیرێك پێکدێنن. وەك چۆن لە کاتی پچرانی ئەڵقەیەك بێ رۆڵ دەبێت، کاتێك ئەڵقەیەکی گرنگی پەرەسەندنیش بپچڕێت، کاریگەرییەکەی بۆ سەر تەواوی پەرەسەندن دەست لێبەرنەدراو و ناچاری دەبێت. ئیکۆلۆژیا زانستی ئەم پەرەسەندنانەیە. لەبەرئەم هۆکارانەشە کە زۆر گرنگە. بەهۆی هەر فاکتەرێکەوە سیستەمی ناوەوەی کۆمەڵگا بشکێنرێت، سەرلەنوێ دەتوانرێت بەدەستی مرۆڤ رێکبخرێتەوە. چونکە راستینەی کۆمەڵگا راستییەکە بەدەستی مرۆڤ ئاولکراوە. بەڵام ژینگە بەمجۆرە نییە. بەهۆی رەفتاری هەندێك گروپ کە لە کۆمەڵگا دەرکەوتوونە و لەمیانەی پاوانی قازانج ـ سەرمایە لەسەر کۆمەڵگا خۆیان رێکخستووە دلبڕانی جددی لە ئەڵقەکانی ژینگە روودەدات، زنجیرەی کارەساتە سروشتیەکان، کۆمەڵگاشی لەناودا، لەوانەیە تەواوی ژینگە رووبەرووی قیامەت بکاتەوە.

پێویستە لەبیر نەکەین کە ئەڵقەکانی ژینگە لەمیانەی پەرەسەندنێکی ملیۆنان ساڵییەوە پێکهاتوون. بەگشتی وێرانکارییەکانی پێنج هەزار ساڵەی ئەم دواییە، بەتایبەتیش هی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی، لەم ماوە زەمەنییە کورتەدا بەهەزاران ئەڵقەی پەرەسەندنی ملیۆنان ساڵییان پچڕاندووە. پەرچەکرداری شکاندن دەستی پێکردووە. بەڵام نازانرێت چۆن دەوەستێنرێت. ئەو پیسبوونەی زیادبوونی رادەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ($CO_2$) و گازەکانی دیکە لە ئەتمۆسفەردا خولقاندوویانە، وەك پێشبینی دەکرێت بەم دۆخەی ئێستای سەدساڵ تەنانەت هەزار ساڵیش پاك نابێتەوە. لەوانەیە وێرانکارییەکانی جیهانی رووەك و ئاژەڵان هێشتا ئەنجامەکانی تەولو بەدەرنەکەوتوون. بەڵام ئاشکرایە بەلانی کەم هێندەی ئاتمۆسفەر زەنگی مەترسی لێدەدات. بەهۆی پیسبوونی دەریا و رووبارەکان هەرلەئێستاوە چۆلەوانی و وشکەڵاتنی خاك بەسنوورەکانی کارەسات گەیشتووە. تەولوی نیشانەکان ئەوە دەخەنەروو کە بەم دۆخ و

ئاراستەی ئێستاوە، قیامەت لە ئاکامی ناهاوسەنگی سروشتی روونادات، بەڵکو بەدەستی گروپێکەوە کۆمەڵگای تێدەئاخنرێت کە بەشێوەی چەند تۆرێك خۆیان رێکخستووە. هەڵبەتە سروشتیش وەلامی ئەم رووداوانە دەداتەوە. چونکە ئەویش زیندووە و خاوەن ژیرییە. چونکە توانا و هێزەکانی بەرگەگرتنی سنووریکی خۆیان هەیە. لەکات و شوێنی خۆیدا بەرخودانی خۆی پیشاندەدات. بەلام کاتێك شوێن و کاتی وەلامدانەوەی هات سەیری فرمێسکەکانی مرۆڤ ناکات. چونکە هەموویان بەرپرسیارن بەرامبەر بەو خیانەتەی لەو بەها و بەهرەیان کردووە کە پێشکەشیان کراوە. ئایا بەمجۆرە پێشبینی قیامەت نەکرابوو؟

لێرەدا ئامانجم زیادکردنی سیناریۆیەکی نوێی کارەسات نییە" بەلام وەك هەر ئەندامێکی ئەو کۆمەلگایەی مسۆگەر پێویستە بەرپرسیارێتی هەبێت و لەمیانەی چەمکی ئەرکی ئەخلاقی و سیاسیمان کە هۆکاری هەبوونمانە، بەگوێرەی بەهرە و توانامان ئەرکمان گووتن و ئەنجامدانی پێویستییەکانە.

لەمێژووی مرۆڤایەتیدا زۆر شت سەبارەت بەچارەنووسی نەمرود و فیرعەونەکانەوە دەگووترێت کە خۆیان لەقەلا و ئەهرامەکانیاندا قایم کردبوو. هۆیەکەی ئاشکرایە. هەرچۆنێك بێت نەمرود و فیرعەونیش وەك کەس و سیستەم، هەریەکە پاوانێك بوون کە خاوەن بانگەشەی ئیلاهی بوون. بەلێ شکۆدارترین نموونەی پاوانەکانی سەرمایەداری چاخی یەکەمین(کۆن) بوون کە بەردەوام بەدوای قازانجدا هەڵپەیان بوو. ئای کە چۆن بەو پاوانانە دەچن کە ئێستا لە پلازای شارەکاندا جێگیربوون! بێگومان ئەگەر لەناوەرۆکیشدا نەبێت، بەلام لەشێوەدا جیاوازییان هەیە. سەرباری تەولوی شکۆمەندییەکەیان بەلام قەلا و ئەهرامەکان ناتوانن کێبرکێ لەگەل پلازاکانی رۆژی ئەمرۆمان بکەن. هەڵبەتە لەبواری ژمارەوە هەرگیز ناتوانن پێشبرکێ بکەن. ئەگەر کۆی بکەنەوە، ژمارەی تەولوی نەمرود و فیرعەونەکان چەند سەدێك تێپەرناکات: بەلام ژمارەی نەمرود و فیرعەونە هاوچەرخەکان هەرلەئێستاوە سەدان هەزاری تێپەرکردووە. لەچاخە کۆنەکاندا مرۆڤایەتی قورسایی چەند نەمرود و فیرعەونێکی پێ هەلنەگیرا، هێندەی بە دەستیانەوە نالاند. کەواتە تاکەی قورسایی سەدان هەزارانیان هەلدەگرێت کە ژینگە و کۆمەلگایان تووچاری هەلوەشانەوە کردووە؟ ئەو ئاخ و ئێشوئازارانە چۆن سارێژدەکەنەوە کە شەر، بێکاری، برسێتی و هەژارییەکەی رێگایان لەپێش کردەوە و لەگەل خۆیاندا هێنایان؟

کاتێك دەلێین کۆمەلگای مێژوویی یەکپارچەیە، لەژێر رۆشنایی پەرەسەندنەوە ویستمان ئاماژە بەم راستییانە بکەین. ئایا ئەمانە راستییەکی بێبایەخ و کەم ناوازەبوون؟

زانستی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە رێگای بونیادە پۆزێتیڤیستەکەیەوە بروای زۆری بەخۆی هەبوو. تۆژینەوە دیاردەییە مەزنەکانی خۆی بەهەموو شتێك دانا. حەقیقەتی رەهای بە زلنارییە رووکەشییەکانی سەبارەت بە دیاردەکان دانا. لەوە دڵنیابوو کە قۆناخی پێشکەوتنی ناکۆتا دەستی پێکردووە. بەڵام پێشبینی نەکردنی کارەساتەکانی ژینگە کە لەبەر چاوانی بوو بەچی شرۆڤە دەکرێت؟ ئەی نەتۆژینەوەی چارەسەری ریشەیی و پراکتیزە نەکردنی سەبارەت بەتەواوی کارەساتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم چوارسەد ساڵەی دوایی کە تەواوی مێژوویان تێپەڕکردووە، لەسەرووی هەموویشیانەوە شەڕ، بە چی شرۆڤە دەکرێت؟ ئەمە لەولاوە دابنێین شەڕی بەربەست نەکردووە کە بەسیفەتی دەسەڵات بۆ ناو تەواوی مەیلەکانی کۆمەڵگا دزەی کردووە، ئەی سەبارەت بە ئەنجامنەدانی دەست نیشانکردن و چەسپاندنێکی راست چی دەڵێت؟ ئاشکرایە کە لەسەردەمی گەورەترین هەژموونگەرایی باڵادەستی پاواندا بەپێچەوانەی مەزندەکان لەمیانەی ئەو بونیادەی کە هەرە زۆر لەژێر گەمارۆی ئایدیۆلۆژیدایە و بۆ خزمەتکردنی سیستەم گونجاوە، زانست نەیدەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە. ئەو زانستەی بونیاد، ئامانج و شێوازەکەی لەپێناو راگەیاندنی مەشروعیەتی سیستەم بوو، بگرە هێندەی ئایینەکانیش بەکاریگەر نەبوون. بەڵام پێویستە ئەوەش مایەی تێگەیشتن بێت کە هیچ زانستێك نییە ئایدیۆلۆژی نەبێت. بەڵام ئەوەی گرنگە پێویستە بزانرێت مەعریفە و زانستی کامە کۆمەڵگا و چینە تا بەگوێرەی ئەوە پێگەی خۆی دیاریکات. ئیکۆلۆژی وەك یەکێك لە زانستە نوێکان ئەگەر پێگەی خۆی لەم چوارچێوەیەدا دیاربکات، نەك تەنیا هی ژینگە، بەڵکو دەشێت ببێتە هێزی چارەسەری سروشتی کۆمەڵگاش.

### ٧ ـ کێشەی دانیشتوان، خێزان، ژن و رەگەزگەرایی کۆمەڵگا

بینینی ژن وەك رەگەزێکی مرۆڤیی کە جیاوازی بایۆلۆژی هەیە، لەسەرووی هۆکارەکانی نابینایی سەبارەت بە راستینەکانی کۆمەڵگا دێت. جیاوازی رەگەز بەتەنیا سەربەخۆ نابێتە هۆکاری هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا. هەروەکو چۆن دوالیزمی هیچ گەردیلەیەکی ناو هەبوونەکانی گەردوون وەك کێشە تاوتوێ ناکرێت، دوالیزمەکەی هەبوونی مرۆڤیش وەك کێشە نابینرێت. بەڵام ئەو وەڵامەی بدرێتەوە پرسیاری "بۆچی هەبوون و ژیان دوالیزمە؟" تەنیا دەشێت فەلسەفی بێت. دەشێت شیکاری ئۆنتۆلۆژی (زانستی هەبوون) لە وەڵامی ئەم پرسیارە (کێشە نییە) بگەڕێت. وەڵامی من بەم جۆرەیە: لەدەرەوەی دوالیزم، بەچەشنێکی دیکە هەبوون و ژیان نەدەبوو. دوالیزم شێوازی فەراهەمکردنی هەبوونە. ئەگەر ژن و پیاو لەدۆخی ئێستادا نەبن، تەنانەت ناتوخم (بێ

هاوتا)بن، لەم دوالیزمە رزگاریان نابێت. ئەمەیە ئەو بوویەرەی بەجووت رەگەزی (نێرەمووك) ناودەبرێت. پێویستە نەشلەژێین و سەرسوڕماو نەبین. بەڵام دوالیزمەکان بەردەوام مەیلیان بەلای دروستکردنی جیاوازییەوەیە. هەروەها لەم مەیلە دوالیزمەدا دەتوانرێت بەدوای بەڵگەی ژێری رەهای گەردوون (geist)دا بگەرێین. هەردوولایەنی دوالیزم نەباش، نەخراپن: تەنیا لەیەکتر جیاوازن، ناچارن جیاواز بن. ئەگەر دوالیزمەکان وەك یەکتریان لێبێت، هەبوون فەراهەم نابێت. بۆ نموونە: لەرێگای دوو ژن بەیەکەوە، یان دوو پیاو کێشەی زۆربوونی هەبوونی کۆمەڵگا شیکار ناکرێت. لەم سۆنگەیەوە پرسیاری" بۆچی ژن یاخود پیاو؟" بێ بەهایە یاخود هەر بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا بگەرێین، دەتوانرێت وەڵامێکی فەلسەفی بەم جۆرەی بدرێتەوە، گەردوون ناچارە ( ئارەزووی وەهایە، مەیلی وەهایە، ئەقڵی وا دەخوازێت) بەمجۆرە پێکبێت.

لەم چوارچێوەیەدا لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی ژن وەك چڕبوونەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، تەنیا واتادارنییە، بەڵکو سەبارەت بە شیکارکردن و تێپەڕکردنی گرێکوێرەکانی کۆمەڵگاش بایەخێکی مەزنی هەیە. لەبەرئەوەی روانگەی پیاوسالاری جۆرێك لە لێخۆشبوونی بەدەستهێناوە، شکاندنی ئەو نابینابییەی سەبارەت بە ژن لە ئارادایە، بە واتایەك لە واتاکان هاوشێوەی پارچەکردنی ئەتۆمە. بۆ شکاندنی ئەم کوێرایەتییەش پێویستی بە هەوڵێکی گەورەی رۆشنبیری و رووخاندنی پیاوێتی باڵادەست هەیە. هەرچی لەبەرەی ژندایە، بەو رادەیەی شیکارکردنی ئەو ژنە پێویستە کە لەبنەڕەتدا بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی ئاولکراوە، تەنانەت کردوویەتی بە شێوازی هەبوونی خۆی، لە هەمانکاتدا رووخاندنیشی پێویستە. ئەو بێ ئومێدی ( پراکتیزەنەبوونی ئۆتۆپیا، بەرنامە و پرەنسیپەکان)یەی لەسەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی تەواوی تێکۆشانەکانی ئازادی، یەکسانی، دیموکراتی، ئەخلاقی، سیاسی و چینایەتییەکان جێگای باسە، شوێنپەنجەی شێوەی پەیوەندی (نێوان ژن و پیاو) باڵادەستی (دەسەڵاتداری) لەخۆوە دەگرێت کە نەشکێنراوە. ئەو پەیوەندییانەی تەواوی نایەکسانی، کۆیلایەتی، ستەمکار، فاشیست و ملیتاریستەکان تێر خۆراك دەکات، سەرچاوەی بنەڕەتی خۆی لەم شێوەیەی پەیوەندی وەردەگرێت. ئەگەر خوازیارین ئەو لایەنە پەسەند و ماقوڵانە لە زاراوەکانی یەکسانی، ئازادی، دیموکراسی و سۆسیالیزم باربکەین کە بێ هیوایی ناخولقێنێت، پێویستە تۆڕی ئەو پەیوەندییانە شیکار و پارچەپارچە بکەین کە لەدەوروبەری ژن چێنراوە و هێندەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا ــ سروشت کۆنە. جگە لەمە هیچ رێگایەکی دیکە بەرەو دیموکراسی، یەکسانی و ئازادییەکی راستەقینە و ئەخلاقێکی دوور لە دووڕوویی ناچێت.

لەسەردەمی سەرهەڵدانی پلەدارییەوە واتای ئایدیۆلۆژیای دەسەڵات لە رەگەزگەرایی بارکراوە. ئەمەش لەنزیکەوە گرێدراوی جیابوونەوەی چینایەتی و دەسەڵاتدارێتییە. تەواوی لێتوێژینەوە شوێنەوارناسی، ئەنترۆپۆلۆژی و تێڕوانینە هەنووکەییەکان پیشاندەدەن کەقۆناخێك هەبووە ژن سەرچاوەی کاریگەری (دەسەڵات)بووە و ئەم قۆناخانەش درێژخایەن بوون. ئەم کاریگەرییە، کاریگەری ئەو دەسەڵاتە نییە کە لەسەر زێدە ـ بەرهەم ئاواکراوە، بەپێچەوانەوە کاریگەرییەکە سەرچاوەی خۆی لە سوودبەخشی و وەچەخستنەوە (زاوزێ) و هێزەکانی هەبوون (ژیان) وەردەگرێت. ژیری سۆزداری کە کاریگەرییەکەی لە ژندا زیاترە، رایەڵەی بەهێزی لەگەڵ ئەم ئافراندن (هەبوون)ە دا هەیە. بەشێوەیەکی زەق و بەرچاو جێنەگرتنی ژن لەناو شەڕەکانی ئەو دەسەڵاتەی لەسەر زێدە ـ بەرهەم ئاواکراوە، هەروەها شێوازی هەبوونە کۆمەڵایەتیەکەشی پەیوەندییان بەم پێگەیەوە هەیە.

توێژینەوە مێژوویی و تێبینییە هەنووکەییەکان روونیدەکەنەوە کە پیاو رۆڵی پێشەنگایەتی پەرەپێدانی دەسەڵاتی گرێدراو بە سیستەمی دەوڵەتی و پلەداری بینیوە. لەم پێناوەشدا پێویستی بەتێپەڕاندن و شکاندنی کاریگەری ژن هەبوو، کە تا دوا قۆناخی کۆمەڵگای نیولیتیك بەهێزبوو. دیسان توێژینەوە مێژوویی و چاودێرییە رۆژانەییەکانمان دەیسەلمێنن کە لەم بارەیەوە تێکۆشانی درێژخایەن، هەمەلایەن و مەزن ئەنجامدراوە. بەتایبەتیش میتۆلۆژیای سۆمەر کە وەك بانگای مێژوو و سروشتی کۆمەڵایەتییە لەم لایەنەوە تابلێی رۆشنکەرەوەیە.

مێژووی شارستانی لەهەمانکاتدا مێژووی تێڕاندن و ونبوونی ژنیشە. ئەم مێژووە بە خودلوەند و بەندەکانییەوە، حوکمڕان و رەعییەکانییەوە، ئابووری، زانست و هونەرەکەیەوە مێژووی پتەوبوونی کەسایەتی پیاوی دەسەڵاتدارە. لەم سۆنگەیەوە تێڕاندن و ونبوونی ژن، بەناوی کۆمەڵگاوە کەوتن و تێڕانێکی مەزنە. کۆمەڵگای رەگەزگەرا بەرئەنجامی ئەم کەوتن و تێڕاندنەیە. پیاوی رەگەزپەرست کاتێك فەرمانڕەوایەتی کۆمەڵایەتی خۆی لەسەر ژن ئاوا کرد، هێندە ئارەزوومەندە کە هەمووجۆرە پەیوەندییەکی سروشتی دەکات بە نمایشێکی بالادەستی. دیاردەیەکی بایۆلۆژی وەك پەیوەندی زایەندی بەردەوام پەیوەندی دەسەڵاتی لێ بارکراوە. هیچ کاتێك لەبیر ناکات کە لە توخمی سەرکەوتن بەسەر ژندا پەیوەندی زایەندی ئەنجامدلوە. لەم لایەنەوە خوو و راهاتنێکی بەهێزی ئاواکردووە. چەندین پەند و گوتەی لەم بارەوە داهێناوە، چەندین چیرۆك و وشەی وەك "خراپم کرد" ، " نیشیم تەواوکرد"، "ماچە (حولخولی)"، "جاشولکە لە سکی و قامچی لەسەر پشتی کەم مەکە!"، "لەشفرۆشی، قەحپە"، " کوڕێکی

کچانە"، " ئەگەر کچەکەت سەربەست کەیت یان رادەکاتە لای دەهۆڵچی یان زوڕنا ژن"، "زوو سەری گرێدە" باس دەکرێت. زۆر ئاشکرایە کە پەیوەندی زایەندی و دەسەڵات چۆن و تا چ رادەیەك لەناو کۆمەڵگا بەکاریگەرە. راستییەکی سۆسیۆلۆژییە کە لە رۆژی ئەمڕۆشماندا "مافی کوشتن"یشی لەناودا، هەر پیاوێك خاوەن مافێکی بێ سنوورە لەسەر ژن. ئەم "ماف"انە رۆژانە جێبەجێدەکرێن. پەیوەندییەکان زیاتر کارەکتەری دەست بۆ بردن و لاقەکردنی هەیە.

لە چوارچێوەی ئەم روانگە کۆمەڵایەتییەدا خێزان وەك دەوڵەتە بچووکەکەی پیاو ئاواکراوە. بە درێژایی مێژووی شارستانی بەردەوام تۆکمەکردن و بەکاریگەرکردنی شێوازی کاملکردنی ئەو دەزگایەی خێزانی پێدەڵێن، هۆکارەکەی بۆ ئەو هێزە گەورەیە دەگەڕێتەوە کە بە ئامێرەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی دەگەیەنێت. یەکەمیان" خێزان لەلایەن پیاوەوە دەکرێت بەدەسەڵات و بۆ خانەیەکی کۆمەڵگای دەوڵەت وەردەچەرخێنرێت. دووەمیان" کارکردنی بێ سنوور و بێ بەرامبەری ژن دەخاتە ژێر گەرەنتییەوە. سێیەمیان" منداڵ بەخێو دەکات و پێویستییەکانی ژمارەی دانیشتوان فەراهەم دەکات. چوارەمیان" وەك مۆدێلی رۆڵ بینین، ئاڵوودەبوون و کۆیلایەتی لەناوتەواوی کۆمەڵگادا بڵاودەکاتەوە. بەم ناوەرۆکەیەوە لە راستیدا خێزان ئایدیۆلۆژیایەکە. ئەو دەزگایەیە کە ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی تێیدا چالاك بووە. لەهەر خێزانێکدا پیاو خۆی بەخاوەنی خانەدانێك دادەنێت. ئەم ئایدیۆلۆژیایەی خانەدانێتی زۆر بەکاریگەرە لەوەی وەك راستینەیەکی گرنگ دەرك بەخێزان بکرێت. خێزانێك چەندە ژمارەی ژن و منداڵەکانی زیاد بێت، پیاو بەوڕادەیە سەربەرزە و دڵنیایە. بەم دۆخەی ئێستایەوە هەڵسەنگاندنی خێزان وەك دەزگایەکی ئایدیۆلۆژی بایەخدارە. بەم رەوشەی ئێستایەوە ژن و خێزان لەژێر سیستەمی شارستانی، واتە لەژێر دەسەڵات و دەوڵەت بکێشنەوە، بەناوی سیستەمەوە شتێکی زۆرکەم دەمێنێتەوە. بەڵام باجەکەی ئەم شێوازە، شێوازی هەبوونێکی ناکۆتای ژنە کە لەژێر ئازار، هەژاری، ئاڵوودە و ئۆزلوی دۆخی شەڕێکی بەردەوامی چرو ئاست نزمی ئاشکرلو راگەیەنراودا دەناڵێنێت. "پاوانی پیاو" کە وەك زنجیرەی دووەمی پاوان بەسەر جیهانی ژندا سەپێنراوە، وەك بڵێی هاوشێوە و هاوتەریبی پاوانەکانی سەرمایەیە کە بە درێژایی مێژووی شارستانی لەسەر کۆمەڵگا بەڕێوەیان بردووە . لەهەمانکاتدا کۆنترین و بەهێزترین پاوانێتی. لەم خاڵەوە هەڵسەنگاندنی هەبوون (ژیانی)ی ژن وەك کۆنترین جیهانی داگیرکرلو بەرەو ئەنجامی راست و واقیعیترمان دەبات. ئەگەر لەبارەیانەوە بڵێین: کۆنترین گەلی کۆلۆنیکرلو کە نەبووە بە میللەت (ئوممەت) راستترە.

سەرباری تەولوی رازاندنەوەکانی لیبڕالیزم، وەك چۆن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ستاتۆ کۆنەکەی بۆ یەکسانی و ئازادی نەگۆڕی، ئەرکی دیکەشی لێ بارکردووە و ژنی خستۆتە ژێر ستاتۆیەکەوە کە زۆر لەهی جاران قورسترە. ستاتۆکانی لەجۆری هەرزانترین کرێکار، کرێکاری ماڵەوە، کرێکاری بێ بەرامبەر، کرێکاری نەرم و خزمەتکاری پیشانیدەدات کە رەوشی قورستر بووە. لەسەر ئەمەشەوە بەکارهێنانی وەك ئامرازێکی ریکلام و کەرەستەیەکی مەگازنی راگەیاندن قووڵترکراوەتەوە. تەنانەت جەستەکەشی وەك ئامرازێکی هەمەلایەنی بەکارهێنان و قۆستنەوە کاڵایەکە سەرمایە دەستبەرداری نابێت. بەردەوام ئامرازی ورووژاندن و هاندانی ریکلامکردنە. بەکورتی، بە بەرهەمترین نوێنەری کۆیلەی مۆدێرنە. ئایا دەتوانرێت بیر لە کاڵایەکی بەمجۆرە بکرێتەوە کە هەم لەو کۆیلەیە بەهادارترە کە زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت، هەم ئامرازێکی ئارەزووە ناکۆتاکانە؟

کێشەی دانیشتوان لەنزیکەوە گرێدراوی رەگەزگەرایی، خێزان و ژنە. زۆری ژمارەی دانیشتوان، واتای سەرمایەیەکی زیاترە. "ژنێتی ماڵەوە" کارگەی زیادکردنی دانیشتوانە. دەتوانین بەکارگەی بەرهەمهێنانی ئەو موڵکە "منداڵ" بەنرخانە ناوی ببەین کە سیستەم پێویستییەکی زۆری پێیەتی. بەداخەوە لەژێر سایەی سیستەمی باڵادەستی پاوانخوازدا خێزان خراوەتە ناو ئەم رەوشەوە. لەکاتێکدا تەولوی ئێش و ئازارو زەحمەتیەکان بەسەر ژندا دەسەپێنرێت، هەرچی بەهای موڵکەکەیە بەهادارترین دیاری سیستەمە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان هەرە زێدە ژن پەرێشان دەکات. لە ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتیشدا رەوش بەمجۆرەیە. بەرچاوترین و شیرینترین ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتە خێزانگەراییە، کە دواقۆناغە خانەدانێتی پێی گەیشتبێت. تەولوی ئەم بابەتانە بەزیادیشەوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتگەرایی ــ نەتەوە دەبێت بەیەك. چی لەپێگەیاندنی بەردەوامی منداڵ بۆ دەوڵەت ــ نەتەوە بەهادارترە؟ چونکە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەت ـ نەتەوە، واتای هێزی زیاترە. ئەمەش بەو واتایە دێت کە بەرژەوەندی ژیانی پاوانەکانی پیاو و سەرمایەی بەرتەسك لەژێر تەقینەوەی ژمارەی دانیشتواندا شاراوەیە. زەحمەتی، خەم و پەژارە، سووکایەتی پێکردن، ئێشوئازار، تاوانباری، هەژاری و برسێتی گشتی بەشی ژنە: هەرچی قازانجە دڵخۆشکەرەکەیە هی "بەگ"ەکەی و سەرمایەدارەکەیە. هیچ سەردەمێك لەمێژوودا وەك رۆژی ئەمڕۆمان هێز و ئەزموونی ئەوەیان پیشاننەداوە کە ژن وەك ئامرازێکی قۆستنەوەی هەمەلایەن بەکاربێنێت. ژن وەك یەکەمین و دواترین کۆڵۆنی لە هەستیارترین ساتی مێژووی خۆیدا دەژیت.

لەکاتێکدا ژیانێکی هاوبەش کە لەمیانەی فەلسەفەیەکی بارکراو بە دیموکراسیخوازی، یەکسانخوازی و ئازادیخوازییەکی ریشەیی لەگەڵ ژن رێکبخرێت، لە بەرکەماڵترین ئاستدا توانای بەرقەرارکردنی جوانی، چاکی و راستی هەیە. من خۆم لەژێر سایەی ئەم ستاتۆیەی لە ئازادایە ژیان لەگەڵ ژن، شانبەشانی ئەوەی زۆر بەکێشە دەبێت، لە هەمانکاتدا زۆر قێزەون، خراپ و هەڵەی دەبینم. لەژێر ئەم ستاتۆیەدا ژیان لەگەڵ ژن بابەتێکە لەمنداڵییەوە جەسارەتم بۆی نەکردووە. ئەوەی لە ئازادایە و جێگای باسە ژیانێکە تەنانەت رەمەکێکی بەهێزی وەك زایەندیش دەخاتە ژێر لێپرسینەوە. رەمەکی زایەند لەپێناو بەردەوامکردنی ژیانە. یەکێك لەسەمەرەکانی سروشتە و شایستەی پیرۆز بینینە. بەڵام پاوانی پیاو و سەرمایە تا رادەیەك ژنیان پیسکردووە، تەنانەت ئەم توانا سەمەرەیەی سروشتیشیان بۆ دەزگایەك "کارگەی منداڵ" گۆڕیوە کەوتووترین کاڵا بەرهەمدێنێت. لەکاتێکدا لە رێگای ئەم کاڵایانەوە کۆمەڵگا سەرلوبن دەکرێت، ژنیکەش لەژێر قورسایی ژمارەی دانیشتوان (ئێستا شەش ملیارە: بەم خێراییە بەردەوام بێت، دە یان پەنجا ملیار بێت ژینگە چی دەکات) سات بە سات لەناو داڕووخاندا دەژیت. بێگومان ژیان لەگەڵ ژن و منداڵ لەناوەڕۆکدا بوویەرێکی پیرۆزە، نیشانەی کۆتایی نەهاتنی ژیانە. وا دەکات هەست بەنەمری بکەیت. ئایا سۆز و هەستێکی لەمە بەهادارتر هەیە؟ لەژێر ئەم راستینەیەدا بە هەموو جۆرێك لەناوجۆشی هەنگاونان بۆ نەمری دەژیت. بەتایبەتیش ئەم رەوشە لەمرۆڤی رۆژی ئەمرۆماندا هەروەك شاعیرێك دەڵێت "وەچەکانمان بەڵای سەرمانن" بەئاستێکی بەمجۆرە گەیشتووە. لێرەوە ناتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت: جارێکی دیکە رووبەڕووی هەڵە، قێزەونی و بێ ئەخلاقییە گەورەکەی پاوانخوازێتی پیاو و سەرمایەین کە پێچەوانەی سروشتی یەکەم و دووەمە.

ئەوەی بەدەستی مرۆڤ ئاوەدانکراوە، دەتوانرێت بەدەستی مرۆڤیش بڕووخێنرێت. لێرەدا نە یاسایەکی سروشت، نەچارەنووسێك، هیچیان جێگای باس نین. ئەوەی باس دەکرێت رووخاندنی دڵبەشکردن و هەڵاواردنی پاوانەکانە کە دەستێکی هۆرمۆنی و شێرپەنجەیی ژیانی سیستەمەکانی تۆڕ، پیاوی بەهێز و فێڵباز و پاوانەکانە. بەردەوام لەناخەوە هەستم بەقووڵایی واتاداربوونی سەمەرەترین جووتی (هێندەی کە زانراوە) ژیانی گەردوون کردبوو. بوێری ئەوەم پێشاندا سەرەتا لەگەڵ ژن بیر بکەمەوە، دواتر لەبارەی کات و شوێن و رادەی خراپەکاریەکانی سەری و چۆنیەتی بە لاوەنانی، گفتوگۆم لەگەڵ کرد" ئەوەشم خستە پێشەوەی تەواوی پەیوەندییەکانم لەگەڵ ژندا. بێگومان تەنیا ئەو ژنەی بەهێزە، ژیرە، باشە، جوانە و دەتوانێت بڕیاری راست بدات، بەمجۆرە کاتێك منیش تێپەڕدەکات و شەیدام دەکات و دەتوانێت ببێتە موخاتەبم، هەڵبەتە لەسەرووی

بژارەکانی لێگەڕینی فەلسەفیمەوە دێت. بەردەوام لەو بڕوایەدا بووم کە نهێنییەکانی لێشاوی ژیانی گەربوون لەگەڵ ئەم ژنەوە لەمیانەی باشترین، جوانترین و راستترین لایەنەوە واتاداریێت. بەڵام بەڕادەیەك کە هیچ پیاوێك تێیدا سەرکەوتوو نەبووە، بڕوام بەئەخلاقی خۆم هەبوو کە هەرگیز هورمزی نەوەد هەزار مێردە و موڵکی "پیاو و سەرمایە" ناکاتە هاوبەشی شێوازی هەبوون و ژیانم. لە دۆخێکی وەهادا لەفێمینیزم بەولاوە دەشێت زاراوەی "ژنۆلۆژی" (زانستی ژنناسی) باشتر وەڵامی ئامانجەکە بداتەوە.

## ٨ ـ کێشەی شارگەرایی کۆمەڵگا

ناوەکەی دیکەی شارستانی مەدەنیەتە، بە زمانی عەرەبی واتای شارگەراییە. ئەو کێشانەی شارگەرایی سەرچاوەکەیانە لەکێشە ئیکۆلۆژییەکان کەمتر و کەمبایەختر نین. لە رۆژگاری ئەمڕۆمان یەکێك لەسەرچاوە سەرەکییەکانی هەڕەشەی سەر ژیانی کۆمەڵگایە. چییە ئەوەی شاری بەم دۆخە گەیاندووە؟

لە رێگای چەمکێکی راستەهێڵیەوە دەشێت هاوکێشەکانی شار - چین - دەوڵەت ئاسانکار بێت. بەڵام قووڵایی و هەمەلایەنی واتا دەکوژێت. هاوشێوەی ئاوا‌کردنی گوند، بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگا مرۆڤایەتی بیری لە ئاوالکردنی شاریش کردۆتەوە. شار لەسەرووی ئەو جێگایانەوە دێت کە ژیری کۆمەڵگای تێدا چڕبۆتەوە. شار بەهرەی ژیری مرۆڤ هاندەدات، دەیهێنێتە دەرەوە. ئەقڵ تا بڵێی گرێدراو بەشار ئاراستەی پەرەسەندنی گرتۆتەبەر. شار ئەو شوێنەیە کەمرۆڤ هەست دەکات هێزەکەی توانای چی هەیە. ئارامی لەگەڵ خۆی دێنێت. چونکە ئەوەی متمانە بە خۆی دەکات واقیعیانەتر بیردەکاتەوە. هزریش رێگا لەپێش داهێنان و نۆزینەوەی نوێ دەکاتەوە. هەروەها زیادبوونی بەرهەمیش پەیڕەو تەکنۆلۆژیاکانی بەرەوپێشەوە دەبات. ئەو مرۆڤەی ئەمانەی تاقیکردۆتەوە، شاری وەك سەرچاوەی رووناکی ناسیوە و بەردەوام خواستوویەتی رووی تێ بکات. گەشەکردنی شار لە دەوروبەری پەرستگادا، گرێدراوی ئەوەیە کە لەقۆناخی خۆیدا پەرستگاکان شوێنی کۆبوونەوەی رۆح و ئەقڵە پیرۆزەکان بوون. کۆمەڵگا زیاتر لەوێدا ئەقڵ و ناسنامەی خۆی دەدۆزێتەوە، دەیخولقێنێت. ئەوەی باسمکردن گریمانێکی بەهێزن لە بەرژەوەندی شاردا.

وەك هەر راستییەکی دیکە، ڕوویەکی دیکەی شار کە هەر لەگەڵ لەدایکبوونییەوە دەردەکەوێت، جیابوونەوەی چینایەتی و ئاوالکردنی دەوڵەتە. بێگومان بناخەی ماددی جیاوازی چینایەتی زیادبوونی بەرهەمهێنانە. هەندێك لە ئاقڵمەندەکانی شار لە رێگای ئەزموونەوە فێربوون

ئەگەر ژمارەی خەڵکەکە (مرۆڤ) زیادبکرێت و لەخاکە بەپیتەکاندا بخرێنە کارەوە، دەتوانن نووهێندەی تر مرۆڤ تێربکەن. ئەوەی مابوویەوە، تەنیا ئاواکردنی سیستەمەکەی بوو. سیستەمیش دەوڵەتە کە جۆرێك لە جۆرەکانی پاوانە. ئەگەر لەئاستی شاریشدا بێت، ئاشکرایە کە رێکخستنی ئەم سیستەمە بە شێوەی پاوانی کشتوکاڵ لەدایك بووە. لەم بارەیەوە شارەکانی سۆمەر هەمووشتێك روون دەکەنەوە. زۆربەی شارستانییەکانی لەجۆری میسر و هەرابا، لەکاتی لە دایکبوونیان پاوانی کشتوکاڵ بوون. ئامێرەکان(دەزگاکان)ی رێکخستنی بەرهەمهێنانن. کاتێك بەرهەمی پێویست بەو ئاستە گەیشت کە نوو هێندەی خەباتکاران زێدە ـــ بەرهەم پێشکەش بکات، واتە بناخەی ماددی دەوڵەت ئامادەبووە. هەرچی ئەو بوویەرەیە کە بە دەوڵەت ناودەبرێت، لە راستیدا ئەوانەن کە لەسەر زێدە ـ بەرهەم دەژین. ناوبردنی دەوڵەت بە رێکخراوی کۆکردنەوەی زیادەکان واتادارتر دەبێت. بۆ ئەمەش شار شوێنێکی گونجاوە. ئەمجۆرە پەیوەندیانە لە کۆمەڵگای گوند و هۆزدا تا دوارادە زەحمەتە، چونکە بونیادی گوند و قەبیلە بۆ ئەمە لەبار نییەو پەسەندی ناکات ئەم راستینەیە لەژێر لەدایکبوونی دەوڵەت لە شاردا شاراوەیە. بەمجۆرە مرۆڤایەتی لەشاردا رووبەرووی دیاردەی چاوسانەوە دەبێتەوە. واتە ئاشنای شێوەیەکی پەیوەندی دەبێت کە تا ئەوکاتە نەیناسیبوو. ئا لێرەوە ئیترناوی پیشە نوێیەکە دەبێتە " دەوڵەتگەرایی". ئەوەی دەیخاتە دەستی خۆیەوە توانای چی نابێت! دەبێتە دەرگایەکی سەرسوورهێنەری بەرژەوەندی. تەنانەت رەنجدەری کۆیلەش تێگەیشتووە کە لەمیانەی بێکاری دەوڵەتەوە لەجاران دڵنیاو ئاسوودەترە. چونکە بەتەواوی بەستنەوەی کارەکەی بەتوندوتیژییەوە زێدەرۆییە. تا رادەیەك چیرۆکی لەدایکبوونی شار بەمجۆرەیە.

ئەگەر هەندێك کێشەشی هەبێت (چونکەرێکخراوی چەوسێنەران و خاوەن هێزەکانە)، ئاشکرایە کە لە پەرەسەندنی راسیۆناڵانەی کۆمەڵگادا شار هەنگاوێکی شۆڕشگێڕانە پێکدێنێت. بۆ گەورەیی شار وەك ژمارەیەکی نموونەیی ئەرستۆ بیر لە پێنج هەزار دانیشتوان دەکاتەوە. شارەکانی قۆناخی دامەزراندن زۆربەیان ژمارەی دانیشتوانیان هێندەیە. جڤات و پێکهاتەیەکی نوێی خەڵك (مرۆڤ) جێگای باسە. ئیتر کۆمەڵگای قەبیلە تێپەڕکراوە. ئەوانەی لە رەچەڵەك و قەبیلەی جیاوازەوە هاتوون بە رایەڵەی هاوڵاتێتی شارەوە بەیەکتر دەبەسترێنەوە. واتە"خەڵکی شار" ، "هاوشارییەکان" ، "بازێرییەکان" پێکدێت. ئەم پێشکەوتنەش نیشانەی دەوڵەمەندێتی کۆمەڵگایە. بەم لۆخەیەوە شار ئامرازی پێشکەوتنە. سەرچاوەی کێشەیەکی جددی ئەوتۆ نییە. لەتەواوی چاخی یەکەمدا، ناوەناوە جگە لەبابل و رۆما، هیچ شارێك تێبینی ناکرێت کێشەی

ژمارەی دانیشتوانی هەبێت. هەروەها لە ڕێگای بالآبوونی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکەیەوە بەردەوام سەرنجراکێشییەکەی خۆی بەهێزتر دەکات. لەکاتێکدا مۆدێلی سۆمەر وەك هەرەسی بەفر لەزیادبووندایە، بەڵام میسر ژمارەیەکی کەم و پوختی شار ئاوا دەکات. لە ڕاستیدا شارستانی میسر بەو سیفەتەی شارستانییەکی نیو ــ شاری و لادێییە لەمێژوودا بێ هاوتایە. بازرگانی و پیشەی سەربەست زۆر پێشدەکەوێت. شانبەشانی بونیادەکانی دەوروبەری پەرستگا، بونیادی کۆشك، هونەر، وەرزش، بیناسازی و ڕێگاکان گشتییان بەرەو شانەی نوێ فراوانتر دەبن. زۆربەی شارەکان لەدەوروبەری سەربازگەکان ئاوادەکرێن. بەتایبەتیش سەربازگەکانی ڕۆما هەریەکە و ناوکی شارێکن. مێژووناسەکان باس لەوە دەکەن لەم قۆناخەدا بەلانی کەم دە گوند شارێکیان بەرکەوتووە. واتە پەیوەندییەکی سیمبیۆتیك (سوودی دوولایەنە) لەنێوانیاندا هەیە. هێشتا کێشە لەنێوان شار ـ گوند لە ئارادا نییە.

هەرچی دواترین شارە شکۆدارەکەی چاخی کۆن ڕۆمایە، لەوانەیە تەواوی کێشەکانی ئەو سەردەمەی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتبێت. ئەمەش وایکردبوو لە هەمانکاتدا ببێتە شکۆدارترین و کێشەدارترینی شاری شارستانی. سەرجەم چین و جڤاتەکانی (ئەرستۆکراسی، بۆرژوازی، کۆیلە، پرۆلیتارە لۆمپەنەکان، هەموو جۆرە گروپێکی ئەتنیکی، هەرجۆرە گروپێکی ئایین، هەر نەژادێك) تێیدا دەبینرێت. چین و جڤاتە کۆنەکان بەدۆخی پاشماوەیی، هەرچی نوێیەکانن بەدۆخی کۆرپەییەوە نوێنەرایەتییان دەکرێت. لەلایەکی دیکەوە دەشێت هەر شێوەیەکی ئیدارە، سیاسەت و ئەخلاقی تێدا ببینرێت. تەواوی نموونەکانی پادشایەتی، کۆمار و دیموکراسی ( لە ئاستی ئیمپراتۆرییەتدا) تاقیکرانەوە. دەکرێ تەواوی نموونەکانی زانست، هونەر، فەلسەفە و ئایینەکان لەدۆخی پاشماوە و چەکەرەکردن تێیدا ببینرێت. بەڕاستی ڕۆما شارێکی گەردوونی بوو. ئەم ڕاستییەش یەکێك لە واتاکانی دەستەواژەی هەموو ڕێگاکان دەچنەوە ڕۆما بوو. لوتکەی شارستانی سێ هەزار و پێنج سەدساڵی پیشاندەدا. ڕووخاندنەکەشی بەشێوەیەکی شایستەی شکۆدارییەکەی بوو. کرستیانەکانی چینی هەژاران و گروپە ئەتنیکییەکانی هێشتا هێزی خۆیان پاراستبوو کە دووهێزی گەورەو بەڵای سەر شارستانی بوون، لەناوەوە و دەرەوە شەپۆل بە شەپۆل هێرشیان کرد و کۆتاییان بە شارەکە هێنا. ڕێکەوتی ٤٧٦ زایینی تەنیا مێژووی ڕووخانی شارێك یان ڕۆما نییە، بەڵکو لەکەسایەتی شارێکدا پووکانەوە، هەرەس و ڕووخانی شارستانی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵەی چاخی یەکەم و کۆنە.

ئەو سەردەمەی بەچاخی ناوین ناوبراوە لەبواری شارگەراییەوە هیچ کاتێک نەیتوانیوە بەچاخی کۆن بگات. چونکە شارەکانی چاخی ناوین لە رێگای قەڵا و شوراکانییەوە بەشێوەیەکی چۆنییەك و قەبارە بچووك دەستی پێکرد. شارەکانی چاخی ناوین جۆرێك لە بڕیارگەکانی دەرەبەگایەتی و میرنشینەکان بوون. لەمیانەی کۆکردنەوەی هەندێك پیشەکاری دەست و خزمەتکار لەدەوروبەریدا، ماتەوزەی فرلوانبوونی لەخۆوە دەگرت. هەرچەندە چینی بازرگان تاودانی یەکەمی لەپێناو گەورەبوون و شکۆداری شار دەست پێدەکات، بەڵام زەحمەتە ئاواکردنی شارێکی نوێ ببینرێت کە بە نموونەی شارەکانی رۆما، ئەسکەندەرییە، ئەنتاکیا، دار ــ ئەلنوسەیبین، ئورفا ــ ئەدیسا بگات کە لەسەردەمی پێشووتر مابوونەوە. ئەگەر لەبواری چەندایەتییەوە گەورەییان تێپەڕیش بکەن، بەڵام لەبواری بیناسازی و کارابوونەوە (پەرستگا، شانۆ، ئەنجوومەن، ئاگۆرا، هیپۆردۆم، ئامفیتیاتر، گەرماو، زێراب..هتد) هەرگیز بەشکۆمەندی شارە کۆنەکان ناگەن. چاخی ناوین شتێکی لەوجۆرەیە: شاروشارستانی چادرێکە و لەسەر پاشماوەکانی چاخی یەکەم و کۆن ئاواکراوە. هێشتا شار بەرامبەر بە گوند زۆر لەپێگەیەکی وەها نووره باڵابوون بەدەست بێنێت. بەرامبەر بە زەریای پێکهاتەی گوندەکان لە دەریا دەچوو. سەرباری ئەوەی ناکۆکی دەسەڵات و چینایەتی لەبونیادیاندا هەبوو، بەڵام لەرەوشێکی وەهادا نەبوون کەوا کێشەی ژینگەیی دروست بکەن. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی پاوانەکانی سەرمایەوە سیستەمی شارستانی هێدی هێدی ژینگەی دەکراند. چونکە خوێدارکردنی خاك پەیوەندی بە پاوانەکانی کشتوکاڵەوە هەبوو. ئەم رەوشە تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم بەردەوام بوو و کێشەکانیشی قورسترکرد.

قەیرانی سەرەکی شارگەرایی وەك بەرهەمی شۆڕشی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەم و ئیندوستریالیزم سەریهەڵدا. ئەمە رێکەوت نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بەسروشتی دژە ــ کۆمەڵگای ئیندوستریالیزمەوە هەبوو. گرنگترین لایەنی شار کە لەبواری ئیکۆلۆژییەوە هۆکاری کێشە بوو" پەیرەوکردنی دیالیکتیکێکی دابڕلو لەدەوروبەر بوو. هەرچی گوندە لەگەڵ ژینگەدا راستەوخۆ بەیەکەوە دەژیا. بەهەموو شتێکیەوە پێیەوە بەسترابووەوە، هەروەها باشی دەزانی کە خۆشی بەرهەمێکی ژینگەیە. هەروەك بڵێی بە زمانی ژینگە(سروشت) قسە لەگەڵ ئاژەڵ و رووەکەکان بکات، بەمجۆرە ژیانیان لەگەڵ بەسەردەبات. وەك زمانێکی هاوبەش لە نێوانیاندا پێکهاتبوو، ئەویش زمانی کشتوکاڵ بوو. ئاواکردنی کۆمەڵگا بەکاریگەری قورسی ئەم زمانە بارگاوی ببوو. بەڵام لەشاردا رەوشەکە پێچەوانەیە: چەندەی دەچێت شار لە کشتوکاڵ و ژینگە دادەبڕێت.

زمانێکی نوێ، زمانی شار پێشدەخرێت. عەقڵانیەتێکی جیاوازی خۆی هەیە. هەنگا و بەهەنگاو مەیلی بەرامبەر بە عەقڵانیەتی ژینگە لاواز دەبێت. زمانی شار زمانێکە پەیوەندی بە ئیشەکانی پارە، پیشەسازی، پیشەی سەربەست و بازرگانییەوە هەیە. ئەقڵ و زانستی ئەمانە پێکدێنێت: لەلایەن ئەمانەوە پێکدەهێنرێت. ئەمە رێرەوی دیالیکتیکی پێشکەوتنی زمانی نوێیە. ئاشکرایە کە لێرەدا زمان و زهنیەتێکی بارکراو بە نامۆبوون و پڕ لە ناکۆکی جێگای باسە. ئاولکردنی شار لەو قۆناخەدا کلتوور و شێوەزار و جڤاتەکانی کلان، قەبیلە، خێڵ، قەوم و لانیی پێدەشتەکانی دەگرتەخۆ. زمانێکی زانست، هونەر، ئاین و فەلسەفەی تایبەت بە خۆشی ئاواکرد. لەئاستی چینایەتیشەوە دووپۆلێنی دیکە بەناوی ئەرستۆکراسی و ئەوانی دیکە پێکهاتبوو. شارگەرایی، بازرگەرایی هێشتا نەببوو بە خاوەن کەسایەتی. بەڵکو لەرەوشی پاشکۆیەکی کۆمەڵگای گشتی دابوو.

سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم ئەم هاوسەنگییە مێژووییەی بەتەواوی تێکدلوە. بێگومان بەیەکجار لەناکاو بەم دۆخە نەگەیشتبوو. لەسەدەکانی دەیەم ـ شازدەهەمدا سەرلەنوێ هەڵکشانی شار (ڤێنسیا، جەنەوا، فلورەنسا، میلانۆ..هتد) لە نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا، لەسەدەی سێزدەهەم گوزارشت لە گواستنەوەی شۆڕشی بازرگانی دەکات لە رێگای ئیتاڵیاوە بۆ ئەورووپا. شارەکانی ئیتاڵیا پێشەنگایەتی پرۆسەکە دەکەن. لە رێگای رێنسانسەوە دەخوازن دیسان لەسەر شوێن پێی رۆما گەورەبن. کێبڕکێیەکی توند لەنێوان شارەکان و ناوخودی شاردا روودەدات. ئەوەی روودەدات شەڕە لەپێناو پێشەنگایەتیکردنی قۆناخی نوێی شارستانی. وەك بڵێی تەواوی ژیانی کۆن سەرلەنوێ زیندوودەبێتەوە. بەڵام هەلومەرجە نوێکان دەیگۆڕێت. لە رێگای لاساییکردنەوەوە ناتوانرێت رۆما بنافرێنرێت. بەم جۆرە تەنیا بە ئاستی کۆپییە لاوازەکانی رۆما دەگەیشتن. ئەزموونی پادشایەتی ناوەندی و دەوڵەت ــ نەتەوەش بەسەرکەوتن نەدەگەیشت. بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە کە شارەکانی ئیتاڵیا لەسەدەکانی دەیەم ـ شازدەهەم لە رێگای رێنسانسەوە رێبەرایەتی شارستانی ئەورووپایان کردووە. هەم وەك کڵێسا (کاسۆلیکی گەردوونی) هەم وەك مەیلی عەلمانی (سیکۆلار) ئەم رۆڵەی بینیوە.

شۆڕشی شار لە ئەڵمانیا لە یەکەمین قۆناخدا لەرێگای یەکێتی شارەکانی هانساتیك[11] (نزیکەی ١٢٥٠ ـ ١٤٥٠ زایینی) دەستی پێکردووە و شۆڕشی بازرگانی خۆیان ئەنجامداوە. قۆناخی دووەم

---

[11] هانستیك یان هنسا(Hansatik): شاری سەربەخۆ و ئازادی ئەڵمانیان، هەروەها وەك زانکۆ دەناسرێن. باڵادەستی خۆی بەسەر بازرگانیدا سەپاندبوو، هەروەها ببوو بە بنکەی بازرگانەکانی رێگای دەریایی.

(١٤٠٠زایینی) لەمیانەی پرۆسەی مانیفاکتۆراوە بەکاریگەر بووە. کۆنفیدڕالیزمی شار تێکۆشانێکی دژوار بەرامبەر ناوەندیبوون دەکات. ئەو تێکۆشان و راپەڕینانەی چەندین گروپی لادێیی و کرێکارە نیوەچڵەکان، لەبنەڕەتیشدا گروپەکانی پیشەکارە سەربەستەکان رۆڵیان تێدا بینی، نزیکەی چوارسەد ساڵ بەردەوام بوو. دوای قۆناخێکی زۆر خوێناوی لەبەر هۆکاری هەمەجۆر (ئایدیۆلۆژی، رێکخستنی، پێشەنگایەتی) یەکەمین ئەزموونی کۆنفیدڕالیزمی دیموکراتی شار و پێدەشتەکان بەرامبەر مەیلی مۆنارشی ناوەندی و دەوڵەت ــ نەتەوە تێکشکا. ئەگەر تێکنەشکابایە مێژووی ئەوروپا بەشێوەیەکی جیاوازتر دەنووسرا. لە ئەڵمانیای فیدراڵی رۆژی ئەمرۆماندا بەشێوەی پلەبەپلە (تدریجی) و زۆر لەسەرخۆ لە فاشیزمی دەوڵەت ــ نەتەوەوە گەڕانەوە بۆ ئەم مۆدێلە کۆنە جێگای باسە.

شارەکانی هۆڵەندا و ئینگلتەرا تەقینەوەی بنەڕەتییان ئەنجامدا. ناوەندێتی کردنیان بۆ سێ شۆڕش و بە قووڵی ژیانکردنیان تێیدا رۆڵی لەمەدا بینی. شۆڕشەکانی بازرگانی، فینانس و پیشەسازی لەبنەڕەتدا لە ئەمستردام و لەندەن گەیشتنە سەرکەوتن. لەهەرلوو وڵاتیشدا زۆر بەئاسانی کۆنفیدڕالیزمی کۆمیناڵ سەرکوتکرا. خەڵکی گوندەکان و شارەکانی دیکە بە ئاسانی رادەستی ناوەند و دەوڵەت ــ نەتەوە نەبوون. هەر بۆیە شۆڕشی سەدەکانی شازدەهەم و حەڤدەهەمی هۆڵەندا و ئینگلتەرا بوو بە پێویستییەك. ئەمستردام لەسەدەکانی ١٧ و ١٨، لەندەنیش لە سەدەکانی ١٩ و ٢٠ شارە پێشەنگەکانی ئەم قۆناخە شۆڕشگێڕیانە بوون. هەرلوو شاریش ناوەندی جیهانی سەردەمی نوێ بوون. سیستەمی شارستانی ناوەندی جیهانیان بەڕێوە برد کە وەرچەرخانێکی مەزنی بەخۆیەوە بینیبوو. ناوەندەکانی هێزی هەژموونگەرایی بوون. ژمارەی دانیشتوان و ناکۆکییەکانیان بەخێرایی گەورەبوون. بونیادە بنچینەییەکەی شێرپەنجەی شار لەبنەڕەتدا لەم قۆناخەوە دەستی پێکرد. بەڕێزە لەمیانەی بونیادە نەخۆشەکەیانەوە بۆ فەرەنسا، وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوروپای رۆژهەڵات، روسیا، رۆژهەڵاتی دوور، ئەمریکای لاتین، رۆژهەڵاتی ناوین و ئەفریقیا گوازرایەوە. سەدەی بیستەم ئەو "ماوە"یەیە کە لە مێژوودا باڵابوونی شار دەستی پێکرد. ئیتر پارادایمی شاری سەرمایەداری رۆڵی پێشەنگایەتی جیهانی پارادایمیی دوازدە هەزار ساڵی جیهانی کۆمیناڵی پێدەشتەکان و شارستانی کۆنی وەردەگرت. چیتر شار تەنیا ناوەندی پیشەسازی، فینانس و بازرگانی نەبوو. بەڵکو لەهەمانکاتدا ناوەندی هەژموونگەرایی بۆچوونێکی جیهانیش بوو. ئەم پارادایمە کە لەسەرووی هەموویانەوە لە رێگای زانکۆ و خانەکانی زانستی ئەکادیمی، نەخۆشخانە و بەندیخانەکانی، چین و بیرۆکراسییەکانی بوو

بەخاوەنی دامودەزگا ، لەجیاتی بۆچوونی ناوەندی جیهانی ئاخیرەتگەرایی[١٢] کۆن، لەمیانەی تێڕوانینی پۆزەتیفی رەها هەولێدا خۆی زاڵ بکات. بەڵام خۆپێشکەشکردنی لە ڕێگای دەمامکی "زانستگەرایی" (لەمیانەی سوود وەرگرتن لەو زانستانەی بەشێوەیەکی نائاسایی زیادیان کردووە) کرداری و سەرکەوتووتری دەبینی.

لە راستیدا بەهۆی ئەم بونیادانەی شارەوە کۆمەڵگا تووشی شێرپەنجەی کۆمەڵایەتی بووە. تەنانەت ئەرستۆش بیری لە شارێکی دەهەزار کەسی نەکردۆتەوە. سەد هەزار، ملیۆن، پێنج ملیۆن، دە ملیۆن، پازدە ملیۆن، تەنانەت ئامانج شاری بیست، بیست و پێنج ملیۆنییە! ئەگەر ئەمە گەورەبوونێکی شێرپەنجەیی نەبێت، ئەی چییە؟ تەنیا بۆ بەخێوکردنی شارێکی بەمجۆرە لەوانەیە لەماوەیەکی کورتدا وڵاتێکی قەبارە ناوین بەخۆی و ژینگەکەیەوە لەناوببات. ئەم گەورەبوونە هیچ لۆژیکێکی نییە. ئاشکرایە کە شانبەشانی تێکدانی سروشتی شار و کۆمەڵگا، جگە لە تێکدانی سروشتی یەکەم هیچ ئەنجامێکی دیکەی نابێت. هیچ وڵات و ژینگەیەك لەگەڵ گەلەکەی ماوەیەکی درێژخایەن ناتوانن ئەم هەڵاوسان و زەبەلاحییە هەڵگرن. هۆکاری راستەقینەی وێرانبوونی ژینگە ئەم گەورەبوونە شێرپەنجەییەیە. ئیتر شارێك بەیەکەوە وڵاتێك و گەلەکەی داگیردەکات، دەستیان بەسەردا دەگرێت، وێرانیان دەکات و وەك بڵێی دەیانکات بە کۆڵۆنی. هێزی نوێی داگیرکەری، شارە" پاوانە جیهانگیرییەکانی بازرگانی، فینانس و پیشەسازییە لەشارەکاندا، بارەگای پلازاکانیانە. تەگبیرە ئاسایشییەکانی ئەم پلازایانەی لە قەڵا و شوراکان کەمتر نین، ئەم راستییە دەسەلمێنن.

چیتر ئیمپریالیزم و داگیرکارییەکەی سەدەی ٢١ لەدەرەوەی وڵاتان نییە بەڵکو لەناوەوەیدایە. داگیرکەرەکان تەنیا بیانییەکان نین، بەڵکو زیاتر هاوبەشەکانیانن. تەنیا پاوانەکانی سەرمایە نەبووە بە جیهانگیری، بەڵکو دەسەڵات و دەوڵەتیش بوون بەجیهانگیری. چیتر جیاوازی ناوەوە و دەرەوەی دەسەڵاتی جیهانگیری نەماوە. ئینتیمای نەتەوەییش هیچ گرنگییەکی نییە، هەمووی بە هاوبەشییە. چیتر جیاوازی نێوان بوارەکانی سەربازی، ئابووری و کلتووری واتای نەماوە. زمانی هاوبەشیان ئینگلیزییە، کلتوورەکەیان ئەنگلۆ ــ ساکسۆن، رێکخراوی سەربازییان ناتۆیە، رێکخستنی نێو دەوڵەتیشیان (UN). چیتر یەك و دووان نین، بەڵکو چەندین نیویۆرك (ناوەندی هەژموونگەرایی ئەمریکا: لە ساڵانی سییەکانی سەدەی رابردوو لە لەندەنی وەرگرت) و لەندەن لە ئارادایە. ئێمە لەسەردەمی شارە جیهانگیرییەکاندا دەژین. شارەکانی سەردەمی

---

[١٢] ئاخیرەتگەرایی (Eschotology): باوەڕهێنان بە ئاخیرەت و زیندووبوونەوە و حیساب.

جیهانگیری بەخێرایی خانە شێرپەنجەییەکان هەر تەنیا ژینگە لەناو نابات. ئەگەر لەبواری زهنییەت و شێوازی ژیاندا یەکێکی خەڵکی مەریخ هەبووایە، بەهەرحاڵ بە بەراورد لەگەڵیدا زیاتر خەڵکی دونیا دەبوو و لەویش سەیرتر نەدەبوو. ئەو رەسەنێتییەی هێندە لەخەڵکانی شار پێشنەکەوتووە، بەرلە لەدایکبوون پووکاوەتەوە و بەسەرچووە. خوازیارە لەرێگای نمایشەکانی هاوچەرخێتی و مۆدێلەوە راستینەی هۆڤێتییەکەی بشارێتەوە. بەربەری راستەقینە شارە (فاشیزم، جینۆساید، کلتوورکوژی بێ سنوور، هەرەلوایی قرکردنی کۆمەڵگا). ئیتر هەرتاك و گروپێکی درندە ( لەفاناتیکەکانی وەرزشەوە تا تووشبوونی ئایدز، لەپارتە سەرشێتەکانەوە تا گروپە بێناوەرۆکەکانی مۆسیقا، لەبیرۆکراسی کۆمەڵکوژ تا تاڵانکارەکانی بازار، لەوانەی گرێدرلوی هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاق نین تا ئەوانەی بوونەتە رۆبۆت، سەرشێتەکانی وەهم و چۆنیەکسازی و کۆمەڵگای میدیاتیك) کە بەربەرە کۆنەکان (هیچ بروا ناکەم قەومە کۆچبەرەکان بەرپەربووبن)یان تێپەڕکردووە، چیتر ناوەندەکەیان ناوچە پێدەشتەکان نییە، بەڵکو ناوەندەکانیان شارە، تەنانەت شار خۆیەتی.

بابلی چاخی مۆدێرن لەئارادان (حەیفە بۆ بابل، چونکە تا رووخانیشی هێشتا هەر رەسەن و پیرۆز بوو، خراپبوون سنووردار بوو). نازانرێت کە چۆن کۆتایی پێدێدێت. بەڵام تەولوی پێدراوە زانستییەکان پیشانیدەدەن کە هەسارەکەمان ناتوانێت ئەم دونیایە (ئەو دونیا سەیرەی خیانەتی لەخۆی کردووە، بۆ لەناوبردنی ئیکۆلۆژیا دونیا بە بڕیارە) هەڵگرێت. تەنانەت ئەگەر دووبارە بۆ پێدەشتەکانیش بگوازنەوە، هەم شوێن تەسکە هەم هەرشوێنێکیان پڕ لەنەخۆشییە. پێویستە زۆر باش دەرکی پێبکرێت کە کۆمەڵگای شار بە سنووری "قرکردنی کۆمەڵگا" گەیشتووە.

هیچ گومانی تێدا نییە کە دەسەڵاتی چینایەتی و بونیادە دەوڵەتییەکان بەرامبەر بەم رەوشەی شار بەرپرسیارن. قازانج و داهاتە سەرسوڕهێنەرەکانی شار کردیانی بە بەرپەری بێرەحم، بەمجۆرە جانەوارێتی (لێڤی ئەتهانی نوێ) شاری ئافراند. ئاشکرایە کە پێویستە تەولوی کۆمەڵگا و خەڵکی شار بەرامبەر بەم رەوشە بە بەرپرسیار نەبینرێن. بەڵام تەریش لەگەڵ وشك پێکەوە دەسووتێت. لەم سۆنگەیەوە گەرەکەکانی تەنیشت شار و "کرستیانە نوێکانی "شار ناچارن رێگایەك بدۆزنەوە. ئەگەر نا، لەلایەن هەزاران نیرۆنی لەنیرۆن ترسناکتر دووچاری دۆخێکی خراپتر لەسووتان دەبنەوە. پێویستە بیر لە رزگارکردنی ئەو ئەقڵ و ئەخلاق و جوانییەی شار بکرێتەوە کە بەشێوەیەکی سنووردار ماوەتەوە. ئیتر هەر پرۆژەیەکی کۆمەڵگا ناچارە ئەو کێشانە لەناوەندی ئەجندای خۆی دابنێت کە لەشارەوە سەرچاوە دەگرن (لەمێژە بوونە بەنەخۆشی).

هەرگیز ناتوانرێت ئەم ڕاستییە پشتگوێ بخرێت کە تەنیا لەم چوارچێوەیەدا دەتوانین چارەسەری واتادار سەبارەت بە تەواوی کێشەکانی ئیکۆلۆژی و کۆمەڵگا پێشبخەین. سەبارەت بە وێرانبوونی دونیا و کۆمەڵگا با چیتر لەهۆکاری دیکە نەگەڕێین، تەنیا ئەوانەی سەرچاوەی خۆیان لەشار وەردەگرن، هەرلەئێستاوە بە زیادیشەوە ئەم ڕۆڵە دەبینین.

## ٩ ـ کێشەی چین و بیرۆکراسی کۆمەڵگا

ئەوانەی وەك دوو مەرجی هەبوونی کۆمەڵگا سەیری چین و بیرۆکراسی دەکەن، لەوانەیە سەبارەت بە کێشەبوونی ئەم بابەتە سەریان سوڕ بمێنێت. ئەوان لەو بڕوایەدان کە: دەشێت چین و بیرۆکراسی ڕێگا لەپێش کێشە بکەنەوە، بەڵام وەك هەبوونێك خۆیان نابن بەکێشە. بەڵام پێویستە دەرکی پێبکرێت کە بونیادێکن بەلانی کەم هێندەی شار بەکێشەن. هەروەك شار، لەوانەیە لەقۆناخە یەکەمینەکانی شارستانیدا بیرۆکراسی و چین زۆر نەبن بە قورسایی و کێشە. لەوانەیە لەگەڵ گەیشتن بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بونیادە بەکێشەکانیان زیاتر ئاشکرا ببێت. بەڵام دیسان وەك هەبوونێك چین، گرێدراوی ئەویش بیرۆکراسی، پێکهاتە و هەبوونێکی بەکێشەن: هەبوونێکن کەلەبواری سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا پێویست نین. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کۆمەڵگا بەرامبەر بەم دوو بونیادە بەرخودانی کرد. هەردووکیانیشی بە ئاسانی پەسەند نەکرد. ڕووبەڕووی بەرخودانی توندبووەوە. مێژووش پڕ لە داستانی ئەم بەرخودانانەیە.

هەروەك لەبەشەکانی داهاتوودا بەشێوەیەکی بەرفراوان ڕاوەستەی لەسەر دەکەین، لەبواری جیاوازییەکانەوە دەشێت سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا شێوە و گۆڕانکاری مەزن بەخۆیەوە ببینێت. ئەمانە گۆڕانکارییەکی ئاساین و بەگوێرەی ڕۆحی سروشتن. وەك هەندێك شانەی کە لەجۆری ئاژەڵ و ڕووەکەکاندا گەشەیان نەکردووە، یان پێویستی بە گەشەکردنیان نەبینراوە، بە بڕوای من جگە لەو چین و جیابوونەوە چینایەتییانەی کە لە سروشتی کۆمەڵگای مرۆڤدا هەمەڕەنگی و جیاوازییەکان واتادار دەکات، وەك بەشێکی سنووردار، کاتی و کارایە، ئەو چین و توێژانەی وەك تەنێکی نەخۆشی تا ناو شانەکانی کۆمەڵگا بڵاو دەبنەوە، زێدەڕۆن، بێ ڕۆڵن (هیچ سوودێکیان نییە) و پێویست نین. پەرەسەندنی چینایەتی لەجۆری ڕاهیب، ئەرستۆکراسی و بۆرژوازی کە بۆماوەیەکی درێژ سوودیان هەبوو دەشێت مایەی تێگەیشتن بێت. بەڵام بە پێزانینەوە ئەو هێزە هەژمونگەراییە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری و سەربازیەی بە درێژایی مێژووی شارستانی خاوەن کارەکتەری دائیمی، سەرکوتکار و چەوسێنەری زێدەڕۆن،

پەسەندنکردنیان لەبواری سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگاوە مەحاڵە. لەم بارەوە ناکۆکی لەناوبەرانە و دوژمنانەیە. چونکە بەم دۆخەیانەوە چین و بیرۆکراسی بەواتای نکوڵیکردن لەسیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا دێت. ئەو مەرجەی باسمکرد زۆر گرنگە. وەك جیاوازی یان کۆمەککردن بە جیاوازی دەشێت چین و بیرۆکراسیەك جێگای باس بێت. بۆ نموونە ئەو پەرستگایەی چینی راهیبی سۆمەر ئافراندوویەتی ناشێت بە تەواوی بێ رۆڵی ببینین. راهیبەکان بناخەیەکی سەرەکی زانست، بەرهەمهێنانی بەپیت، ئاواکردنی شار، ئایین، کاری دەست و سیستەمیان لەم پەرستگایە دانا. لە دەرکەوتنی چەندین کلتووردا راهیب رۆڵێکی هاوشێوەی بینی. پیشاندانی پێزانینێکی مەرجدار بەرامبەر راهیبەکان بەهۆی ئەم رۆڵە ئەرێنیانەیانە. بەڵام لە دۆخێکدا ببن بەچینێکی جێگیر(کاست)، بێ رۆڵن و گەورەبوونێکی لە رادەبەدەر بە خۆیانەوە ببینن، بەردەوام مەشروعیەتی چین و بیرۆکراسی لەژێر پرس و گفتوگۆ دایە و پێویستە بەلاوەبنرێن.

خاڵێکی بەمجۆرە بۆ ئەرستۆکراسیش لەجێگای خۆیدایە. ئەوانیش سەرکەوتنی بەرێوەبەرایەتی، کارکردنی بەپیت و سیستەمیان پێشکەش بە پەرەسەندنی کۆمەڵگا کردووە، رۆڵ و کۆمەکیان لەهونەرو زانستدا هەبووە. حاڵیبوون و پێزانین لەم چوارچێوەیە دایە. بەڵام ئەو کاستبوون، ستەمکاری، خانەدانێتیانەی رێگایان لەپێشکردەوە و ئەو پادشایەتیانەی ئاوایانکرد، تەنانەت خۆکردنیان بە خوداوەند گشتی نەخۆشییەو پەسەند ناکرێت. چونکە سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانەدا لەناو ناکۆکییەکی لەناوبەر و دوژمنانەدایە. تێپەڕکردنیان لەرێگای تێکۆشانەوە پێویستییەکی ئەخلاق و سیاسەتێکی راستە.

ئەوانەی باسکران زیاتر بۆ بۆرژوازی لەجێگای خۆیدایە، گەشەکردنی ئەم چینە و ئامێرە(دەزگا) بیرۆکراسییەکانی لە قۆناخەکانی شۆڕشدا کۆمەکی بە پەرەسەندنی کۆمەڵگا کردووە. بەدەستەوەگرتنی دەستپێشخەری لە بازرگانی و ئامرازەکانی هەڵسوڕان (پارە و دەستاوێژ) و پەرەپێدانی پیشەسازی، هەروەها جاربەجار تاقیکردنەوەی دیموکراسی و کۆمەکە سنووردارەکانیان بۆ زانست و هونەر، ئەو لایەنەیانە کە جێگای پێزانینن. بەڵام بونیادە بەردەوامە زێدەڕۆکەی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی لە سەرجەم قۆناخی شارستانی چینایەتی زیاتر رێگای لەپێش جیاوازی چینایەتی و بیرۆکراسی کردەوە، وەك خانەکانی شێرپەنجە زیادی کردن، لە ئاوابوونی سەرجەم چینەکانی سەروو زیاترە و مەترسیدارترە. واتە ئەو بیرۆکراسی و بۆرژوازییەی لەمێژووی چینایەتیدا پێگەی ناوینیان داگیرکردووە، لە پارادایمی مندا رۆڵی شێرپەنجە دەبینن. سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بۆ هەڵگرتنی ئەم چەشنە چین و بیرۆکراسییە لەبار و گونجاو نییە.

بەڵام ئەگەر بخوازن لێی بار بکەن، ئەو کاتە منیش دەڵێم " فەرموو فاشیزم بۆ تۆ". بەبڕوای من پێناسەیەکی دیکەی فاشیزم بەم جۆرەیە: پەرچەکرداری چینی ناوینە (کۆی بۆرژوازی و بیرۆکراسی) بەرامبەر سروشتی کۆمەڵایەتی. فاشیزم کاستی چینی ناوینە بۆ کۆمەڵگا. ئەوەی لێرەدا سەلمێنراوە، کۆمەڵگا و چینی ناوین بەیەکەوە بەڕێوە ناچن. هەندێك رۆشنبیر چینی ناوین وەك بنکەی چینایەتی رژێمی دیموکراسی و کۆمار پێشکەش دەکەن. یەکێك لە پروپاگەندە بە درۆ و دەلەسەکانی لیبرالیزم ئەمەیانە. چونکە چینی ناوین چینێکە کە زۆرترین رۆڵی لەنکوڵیکردنی دیموکراسی و کۆماردا بینیوە. رۆڵی چینەکانی دیکە لەمەدا سنووردارە، تەنانەت لە فاشیزمیش بێ ئاگان. لەمیانەی ئەم رۆڵەوە، چینی ناوین لەگەڵ ئاولکردنی زێدەڕۆییانەی شار، هەمان رۆڵ دەبینن، ئەویش گەورەبوونی شێرپەنجەییە. چونکە پەیوەندییەکی توندی ئۆرگانی و بونیادی لەنێوان هەردووکیاندا هەیە. هەروەکو چۆن شار ئەم نەخۆشییەی بەهۆی چاوبرسێتی و گەورەبوونی چینی ناوین وەرگرتووە، ئەمجۆرە شارانەش بەردەوام چینی ناوین گەورە دەکەن.

لەبواری زهنیەتەوە چینی ناوین پۆزێتیڤیستە. واتە بونیادێکە لە گەوهەرێکی قووڵ بێبەشە، رووکەشییە، لەپێوانەکردنی دیاردەکاندا ئەولاتر نابینێت، تەنانەت وەك پێویستییەکی بەرژەوەندییەکانی ناخوازێت ببینێت. سەرەڕای ئەوەی پۆزێتیڤیزمی لەژێر رووپۆشی "زانستگەرایی" پێشکەشکرلووە، بەڵام چینی هەرە بتپەرستە ( لەقۆناخی ئەم چینەدا زیادبوونی پەیکەر هەرەس ئاسا گەورەبووە) لەمێژوودا. لەرووخساردا عەلمانی و دونیاییە، بەڵام لەگەوهەردا ئایینی و خەیاڵپەرستێکی توندە. لێرەدا ئایینگەراییەکەی، هزر و باوەڕییە "دیاردەگەرا"ییەکانێتی کە لە ئاستی دەمارگیریدایە. وەك دەزانین هەرگیز دیاردەگەرایی هەمووێتی و یەکپارچەیی راستی نییە. بەڵکو بە شێوەیەکی بێشەرمانە ئەو پرۆژە خەیاڵییانەی بە گوتە عەلمانین و لەگەوهەریشدا دژی عەلمانییەتن (جۆرێك لە پرۆژەکانی ئاخیرەت) یەك بەدوای یەك پێشکەش بە کۆمەڵگایان دەکات. ئەو چینەیە کە لە ئاستی جیهانگیریدا پاوانە ئابووری، سیاسی، سەربازی، ئایدیۆلۆژی و زانستییەکانی سەرمایەداری بەرەو پێشەوە بردووە. هەربۆیە چینێکە کە دژایەتی کۆمەڵگای لەلا بەهێزە. لە دوو رێگاوە دژایەتی کۆمەڵگا دەکات، واتە بەشێوازی جینۆساید و قڕکردنی کۆمەڵگا بەڕێوەی دەبات. لەناوبردنی گەلێك یان چڤاتێك بەهۆی رەچەڵەك، نەژاد و ئایینەکەیەوە، تەنیا لەمیانەی کارەکتەری چینی بۆرژوازییەوە ئەنجامدراوە. لەوەش مەترسیدارتر قڕکردنی کۆمەڵگایە. لەدوو رێگاوە قڕکردنی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات: رێگای یەکەم، لەرێگای ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت — نەتەوە و دامەزراوەکانی دەسەڵاتەوە وەك ملیتاریزم و شەڕ خۆی بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت و

بۆ ناو سەرجەم مەمیلەکانی تەشەنە دەکات و بڵاودەبێتەوە. ئەمەش تەنیا شەڕێکی سەرتاسەری ڕاگەیێنراوی دەسەلات و دەوڵەتی یەکگرتووە دژی کۆمەڵگا . لەڕێگای ئەزموونەکانییەوە بۆرژوازی باش دەزانێت کە بەشێوەیەکی دیکە ناتوانێت کۆمەڵگا بەڕێوەببات. دووەمیان، مەیلی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی وەهمی و خەیاڵییە لەجێگای کۆمەڵگای واقیعییەوە کە لەمیانەی تەقینەوەی شۆڕشی "میدیا و گەیاندن" لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد. ڕاستتر بڵێین شەڕی بۆردوومانی میدیایی گەیاندنە. لە ڕێگای ئەم شێوەیەی دووەمی شەڕەوە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم پەنجا ساڵەی دوایی بەڕێوەبراوە. کاتێك کۆمەڵگای خەیاڵی، وەهمی (شاشەیی) و چۆنیەکسازی (سیمیلاسیۆن) جێگای سروشتی کۆمەڵایەتی گرتەوە، یان بەم جۆرە مەزەندەکرا، ئەوا ڕۆڵی قرکردنی کۆمەڵگا دەبینێت.

لایەنگری ئەوەم کە بەشێوەیەکی جیاوازتر پۆلێنەکانی کۆیلە، جووتیار و کارکەر تاوتوێ بکەین کە لەمێژووی شارستانی وەك چینی چەوساوە و سەرکوتکراو پێشکەش دەکرێت. ڕۆڵی سۆبژەیی و دیموکراسیخوازیی ئەم چینانە زۆر سنووردارە: چونکە بەهەموو شتێکیانەوە لەناو بونیادی پێکهاتەی زهنی سەردارەکانیاندان. لەدۆخی پاشکۆ یان بەشێکی بێکەڵکدان. لەمێژوودا هیچ چینێکی سۆبژە نەبینراوە کە سەردارەکەی خۆی رووخاندبێت. ئەم ڕەوشە ڕاستییەکی گرنگ پیشاندەدات. تەنانەت ئەگەر زوڵم لێکرلو و چەوساوەش بێت، ئەم چینانە وەك لقێکی جەستەی گشتی کۆمەڵگان. چونکە لق چەندە بهەژێت و تەنانەت لێشبێتەوە کاریگەری لەسەر قەد نابێت یاخود ئەم کاریگەرییە سنووردار دەبێت. لەبەرئەم هۆکارە ناوبردنی کۆمەڵگا بە شێوەی کۆمەڵگای کۆیلە، کۆیلەدار، جووتیار، ئەرستۆکراسی، کارکەر یان بۆرژوازی بۆ دروستکردنی زاراوەناسییەکی چەوت کراوەیە. لەمبارەیەوە زانستی کۆمەڵایەتی ناچارە پێناسە و ناولێنانێکی نوێ بدۆزێتەوە. هەروەکو چۆن دار بە لقەکانییەوە پێناسە ناکرێت، ئەوا کۆمەڵگاش بەناوی ئەو چینانەوە ناونابەین کە لە ناخییەوە دەرچوون. لەمەش جیاواز و گرنگتر، هەروەکو زۆرجار لەمێژووی ئەنارشیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراویشدا بینراوە بەسۆبژەکردنی چینەکانی کۆیلە، جووتیار، کارکەر و وردەبۆرژوازی، پیاهەڵدانیان و بارکردنیان بە ڕۆڵی شۆڕشگێڕی گرنگ، ئەنجامێکی سوود بەخشی لێناکەوێتەوە، لەو بڕوایەدام کە هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەهەڵە بەهای سۆبژە و ڕۆڵی شۆڕشگێڕی لەم چینانە بارکراوە. هەڵوێستی ڕاستیش ڕکابەرایەتیکردنی هەموجۆرە جیابوونەوەیەکی چینایەتییە. لەوانەیە چینی کۆیلە، جووتیارو کارکەریش لەسەرەتادا کاتێك لەدۆخی کۆمەڵگایەکی نیوەچڵدا بوون (زیاتر نیو ــ لادێیی و

پیشەکاری دەست) رۆڵی شۆڕشگێڕی و سۆبژێتی ئەرێنیان بینیبێت: ئەم رۆڵەی بینیوە. بەڵام ئەویش بەو ڕادەیەی بەردەوام (دائمی) و گەورە بێت تێکدەچێت، لەگەڵ چینەکانی سەروو سازش دەکات و رۆڵی خۆی لە دەستدەدات.

لەوەش گرنگتر، تێڕوانینێکی ئازادیخواز، یەکسانیخوازو دیموکراسیخواز جگە لەواتای ئەو جیاوازییەی سەبارەت بە هەردوو جیاوازی چینایەتییەوە باسمکرد، بە ئەرێنی تەماشای بە سۆبژەکرنیان، بارکرنیان بە بەهای سیاسی و مۆراڵی ناکات. بەڵکو ناچارە لەهەردوو لایەنەوە جیابوونەوەی چینایەتی پێچەوانەی سروشتی کۆمەڵگا و دژە ـ کۆمەڵگای ببینێت و لەبەرامبەریدا تێکۆشێت. چونکە پێکهاتنی ئەمانە، هەڵسەنگاندنیان وەك بەهای کۆمەڵایەتی واقیعی و رەوا، ناکات بەپێویستییەك. هەروەکو چۆن تەنە نەخۆشەکانی جەستەیەك بە بەشێکی سروشتی جەستە دانانێین، دەتوانین راڤەیەکی هاوشێوە سەبارەت بەم دیاردە کۆمەڵایەتییانەی بەرامبەریشمان بکەین. چونکە تەواوی چینە چەوساوەو سەرکوتکراوەکان لەمیانەی توندوتیژی دەوڵەت ــ دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیا هەژموونگەراکان ئافرێنراون. ئەو کۆیلایەتی، جووتیاری و کرێکارییەی لەسایەی ئەم هەلومەرجانەوە ئاولکراون، تەنیا دەتوانین مەحکوم و ریسوایان بکەین. ئەگەر بڵێین " بژی کۆیلە، جووتیار و کرێکاری شکۆمەند"، بەشێوەیەکی بابەتی واتای پیاهەڵدان و رەوالکردنی هێزەکانی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی دەبەخشێت. راڤەی چینایەتی بەم جۆرە هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی چەندین رەوت و قوتابخانەیە، مارکس و شوێنکەوتووەکانیشی لەناودا. لەوانەیە ئەوەی چینەکانی سەروو تا رادەیەك واتایان هەبێت، بەڵام ئەو جیاوازییە چینایەتییانەی لەناو ئارەق و خوێندان، لەبەرئەوەی لە رێگای توندوتیژی و رازیکردنی ئایدیۆلۆژییەوە ئاولکراون، راستترین هەڵوێست ئەوەیە بەردەوام مەحکوم بکرێن، پەسنیان نەدرێت و تێکۆشان لەپێناو بەلاوەنانیان بکرێت. هەروەکو چۆن لەمێژووی تێکۆشانی کۆمەڵایەتیدا نموونەی زۆری لەم چەشنە بینراوە، سەرباری ئەوەی سۆبژە نین و ناتوانن رۆڵی شۆڕشگێڕی ببینن، رۆڵی سۆبژێتی و شۆڕشگێڕێتیان لێ بارکراوەو لەتێکشکان رزگاریان نەبووە. هۆکاری شکستیان، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەراستی لەکێشەکە تێنەگەیشتوون و رۆڵی چەوتیان بەچینەکان بەخشیوە. تێکۆشانە کۆمەڵایەتییەکانی قۆناخی نوێی سەدەی بیستویەکەم بەو رادەیەی لەم هەڵە ریشەییە بگەڕێنەوە سەرکەوتوو دەبن.

راستە کە دەڵێین بۆرژوازی کێشەی چینایەتی قورستر کردووە. بەدەسەڵاتدار (باڵادەست) کردنی ــ بە دەسەڵاتدارکردن، شەڕکردنە لەگەڵ کۆمەڵگا ــ بەرژەوەندییەکانی چین بەسەر

کۆمەڵگاوە و تا دەگاتە وردترین مەمیلەکانییەوە و بەفەرمیکردنی لە ڕێگای دەوڵەتەوە، دەیسەلمێنێت کە لە پێگەیشتووترین قۆناخی خۆیدا دەژیت. زۆرجار دەبینرێت کە لەژێر ناوی " هاوبەشێتی سەرمایە" لەسەرووبانەوە سازشکارێتی کرێکار، چەندین توێژی دیکەیکۆمەڵگا بۆخۆیان دەکەن بە ئامراز. تەنانەت دەتوانرێت بگوترێت کۆمەڵگای قووتداوە. بەڵام ئەم حەقیقەتە بەزیادیشەوە ڕاستە، کە بەکێشەترین چینە، تەنانەت چینێکە هەرە زێدە کۆمەڵگای خستۆتە دۆخی پڕ بەکێشەوە.

چەندە ڕاست بێت کە بەدرێژایی مێژوو بیرۆکراسی ئامرازی دامەزراوەی کردەیی چینە باڵادەستەکان بووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت لەمیانەی شێوەگرتنی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوە تا ڕۆژی ئەمرۆمان ئاست و ڕەهەندی جیاوازتری بەدەستهێناوە، وەك بڵێی ڕۆڵی چینێکی سەربەخۆ دەبینێت، قورسایی خۆی لەناو دەوڵەت و دەسەڵاتدا زیادکردووە، تەنانەت خۆی بەخودی دەوڵەت دادەنێت. ئەمەش ڕاستییەکی دژوارو حاشاهەڵنەگرە کە بووە بەهێزێك کۆمەڵگا دەخاتە ناو قەفەسی ئاسنینەوە، دەستی خۆی بۆ تەولوی بوارو گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگا (پەروەردە، تەندروستی، دادوەری، گەیاندن، ئەخلاق، سیاسەت، ژینگە، زانست، ئایین، هونەر، ئابووری) درێژکردووە و ئەم ڕۆڵەی خۆی پتەوکردووە. لە کۆمەڵگای ڕۆژگاری ئەمرۆماندا (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) تەنیا بیرۆکراسی دەوڵەت گەورەنەکراوە: بەڵکو لەسەر ڕێگای ئەو و لەژێرناوی "خێزان لەدۆخی کۆمپانیا دەرکەوتووە، با ببین بە کۆمپانیایەك کە بەشێوەیەکی پرۆفشیۆناڵ بەڕێوە دەبرێت" جیهانی پاوان بەشێوەی هەرەسی بەفر بیرۆکراسی خۆی گەورە دەکات. گەورەبوونی زێدەڕۆییانەی بیرۆکراسی گرێدراوی ئەم ڕاستینە نوێیەی کۆمپانیاکانە. دەتوانرێت ئەمەش بە جۆرێك لە جۆرەکانی "دەوڵەتبوون"ی کۆمپانیاکان ناو ببرێت. لەهەلومەرجێکدا کە ئیتر دەوڵەت ـــ نەتەوە کورت دێنێت و ئاواکردنی دەوڵەتی نوێ لەڕۆژەڤدایە، بەدەوڵەتبوونی کۆمپانیا خۆجێیی و جیهانگیرییەکان وەك مەیلێکی زاڵ بەرەوپێشەوە دەچێت.

کێشەکانی کۆمەڵگا کە سەرچاوەی خۆیان لەم دوو مەنگەنە وەردەگرن هەنووکەیین. وەك بڵێی **"ئێستای"** هەموو مێژووە. بەڵکو دەتوانین لەوەش زیاتر بڕۆین و بڵێین: ئەم دووانەیە وەك هەشتپێ سروشتی کۆمەڵگا (کۆمەڵگای نەریتی)ی خستۆتە نێو لەپەکانییەوە، خنکاندوویەتی و تواندوییەتییەوە. ئەو ئەنجامەی لێرەوە هەڵدەهێنجرێت: قۆناخێکی قەیراناوی و کائۆس لە ئارادایە، دیموکراسیخوازی، یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگاش تەنیا لەمیانەی سیستەمێکی خاوەن بونیادی

شارستانێتی دیموکراتی مسۆگەر دەبێت، ئەمەش پێویستی بەتێکۆشانێك هەیە کە لەرێگای زانستێکی راستەوە ئاواکرابێت.

### ١٠ ـ کێشەکانی پەروەردە و تەندروستی کۆمەڵگا

هەرچەندە وەك بابەتێکی زیاد لە پێویستیش دیاربێت، بەڵام هەروەك ئەو لۆخەی بەسەر زانستدا هاتووە، تێگەیشتنی ئەو کێشانە گرنگە کە لە ئاکامی زەوتکردنی پەروەردە و تەندروستی لەلایەن پاوانی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە رێگای لەپێش کراوەتەوە. وەك چۆن زانستێك بووبێت بەموڵکی دەوڵەت یان بووبێت بە دەوڵەت لە پێگەی بەکاریگەرترین ئامرازی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیدا دەبێت، ئەوا ئەو پەروەردە و تەندروستییەی لەگەڵ دەسەڵاتیشدا بۆتە یەك هەمان کارەکتەر پیشاندەدات.

دەشێت پەروەردە وەك ئەو هەوڵانە پێناسە بکرێت کە لە رێگایەوە ئەزموونەکانی کۆمەڵگا بەشێوەی زانیاری تیۆری و کرداری دەرخواردی ئەندامەکانی دەدات، بەتایبەتیش دەرخواردی لاوانی دەدرێت. پەروەردەکردنی منداڵان کاری دەوڵەت نییە، بەڵکو گرنگترین ئەرکی کۆمەڵگایە. چونکە منداڵان و لاوان هی خۆیەتی. هەم وەك ئەرك، هەم وەك ماف پێگەیاندنی منداڵان و گەنجان بەگوێرەی نەریتەکانی خۆی و خەسڵەتەکانی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا، هەروەها وەرچەرخاندنی بۆ لای خۆیەوە بابەتێکی ژیانییە: کێشەی بەردەوامکردنی هەبوونی خۆیەتی. هیچ کۆمەڵگایەك ناتوانێت مافی هەبوونی خۆی بە کەسی تر بسپێرێت، لەم چوارچێوەیەشدا ئەرکی پەروەردەکردنی لاوانی بەهێزێکی دیکە بسپێرێت یان هاوبەشێتی لەگەڵ بکات. لەرەوشێکی پێچەوانەدا، بە واتای خۆڕادەستکردن بەهێزە پاوانخوازەکان دێت. چونکە پیرۆزی مافی پەروەردە سەرچاوەی خۆی لە هەبوون و ژیانەوە وەردەگرێت. هیچ هێزێك لەسەرووی هەمووشیانەوە دایك و باوك، وەك کۆمەڵگاکەی نەهێندە نزیکی منداڵان و لاوان دەبن، نەهێندەی ئەویش پێویستی نزیکبوون دەبینن. بەدرێژایی مێژوو یەکێك لە گەورەترین دژایەتی شارستانییەکان بۆ کۆمەڵگا، کردەی بێبەشکردنی کۆمەڵگایە لەلاوان و منداڵان. ئەم کردارەیان لە دوو رێگاوە ئەنجامدەدەن: یان گەورەکانیان لەناو دەبەن و دەیانکەن بە کۆیلە، یاخود گوایە بە ئامانجی پەروەردەکردن و بۆ هەڵسەنگاندنیان دەبرێنە نهۆمی دەسەڵات.

یەکێك لەئامانجە هەرە گرنگەکانی شەڕ ئاوارکردن و کردنەوەی خانەکانی کۆکردنەوەی منداڵان، کچان و کورانی لاوە کە وەك بە نرخترین موڵك و کاڵا سەیریان دەکات، تا لەمیانەی ئەم

دوو ڕێگایەوە لەناو خۆیاندا بیانتوێنێتەوە. هەروەکو چۆن بەم شێوەیە زەمینەکانی بیرۆکراسی سەرەتایی دانراوە، لەهەمانکاتدا مێژووی شارستانی لەم لایەنەوە هەم کرداری لاوازکردنی کۆمەڵگایە، هەمیش کرداری ئاواکردنی هێزی دامودەزگاکانی بیرۆکراسییە: ئەمە ئاواکردنی کۆمەڵگایە بەرامبەر بە کۆمەڵگا، واتە ئاواکردنی کۆمەڵگای دەوڵەت و دەسەڵات بەرامبەر بەکۆمەڵگای سروشتی. لەم پێکهاتەیەدا دەرهەست ( ئەبستراکت) لەکۆمەڵگای خۆیان منداڵان و لاوان فێری زمان، کلتوور و مێژوویکی جیاواز دەکرێن. ئامانجی سەرەکیش نامۆکردنیانە بەگەوهەری خۆیان. بەبێ دەسەڵات ژیانیان مەحاڵ دەبێت. هەم لەبواری ماددی هەم مەعنەوی ناسنامەی هەرە دەوڵەتگەراییان پێدەدرێت. دەوڵەت و دەسەڵات دەکرێنە تاکە ڕێگای پەسەندکراوی ژیان و هەبوونیان. بەمجۆرە هەم خۆیان بەخودی دەوڵەت و دەسەڵات دادەنێن، هەم دەکرێن بەدژی کۆمەڵگای سروشتی. هەندێکجار کۆمەڵگای دەوڵەت و کۆمەڵگای سروشتی بەیەك شت دادەنرێن. ئەمە هەڵەیە و پڕ لە ناکۆکییە. مێژووی شارستانی لەسەر ئەم ناکۆکییە ئاواکراوە. ئەم ڕاستینە مێژووییانە لەژێر زەوتکردنی پەروەردە لەلایەن دەسەڵاتەوە شاراوەیە. ئەگەر وانەبێت، بەهیچ جۆرێك ئەرکی پەروەردە لە ئاست کۆمەڵگا بەبیریاندا نایەت. سەرمایەدارێك چەندە کرێکارەکانی پەروەردە بکات، دەسەڵاتیش بەهەمان لۆژیك، وەك بەندە ــ کرێکارەکانی پەروەردەیان دەکات. هەرچەندە ناویان بیروکراتیش بێت، لەژێرەوە تا دەگاتە سەرەوە ئەندامەکانی وەك بەندە پێدەگەیەنرێن.

بەتایبەتیش دەسەڵاتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، بەر لە هەموو شتێك لەڕێگای پەروەردەوە پاوانەکانی خۆیان لەسەر تەواوی منداڵان و لاوانی کۆمەڵگا جێگیر دەکەن. چیتر ئەو کەسانەی لەمیانەی مێژوو، هونەر، زهنییەتی ئایینی و فەلسەفی خۆیان شێلاویانن، منداڵی خێزانە کۆنەکانیان نین، بەڵکو منداڵی ڕاستەقینە و موڵکی خاوەنەکانی دەسەڵاتن. نامۆبوونە ترسناکەکە بەمجۆرە دەکرێت بە دامەزراوە. لەبواری پەروەردەوە بۆرژوازی ئەو چینەیە کە پاوانی هەرە بەرفراوان لەسەر کۆمەڵگا ئاوا دەکات. کاتێك پەروەردەی سەرەتایی و ناوەندی دەکەن بەناچاری، هەروەها بروانامەی زانکۆش بەبیر ئەوانە دێننەوە کە بەدوای کاردا دەگەڕێن، ئیتر مەنگەنەی بە پاشکۆکردن و نامۆکردنی سەر لاوانی کۆمەڵگا قۆناخی خستنە ناو قەفەسی ئاسنین دەکات بە ناچارییەکی سەپێنراو. ئەمەش بەو واتایە دێت کە توندوتیژی، هێزی ماددی و پەروەردە بوونەتە چەکێکی داگیرکردنی کۆمەڵگا و بەرگەگرتنیان سەختە.

لەم سۆنگەوە" بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت بە درێژایی مێژووی شارستانی و لەمیانەی ئەو شەڕەوە کە دەوڵەت و دەسەڵات رایانگەیاندووە لەرێگای پەروەردەوە کۆمەڵگا زەبری هەرە کوشندەی بەرکەوتووە. مافی پەروەردەکردنی کۆمەڵگا یەکێك لەو مافانەیە کە جێبەجێکردنی سەختە. چونکە بەرامبەر بە هێزە زەبەلاحەکانی پاوانە هەژموونگەراکان و دەوڵەت ـــ نەتەوە دەستەبەرکردنی بوونی کۆمەڵگا لەرێگای پەروەردەوە کەوتۆتە سەختترین قۆناخی مێژووەوە. هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لەمیانەی نواترین شۆڕشی گەیاندنەوە و لەرێگای ئەو شەڕە میدیاییەی (لەبەرئەوەی بەئەندازەی لایەنی سەربازی و ئابووری داگیرکاری، بەڵکو لەویش چڕتر و بە بێدەنگی بەڕێوەی دەبات) لەسەر تەواوی کۆمەڵگا بەڕێوەی دەبات، بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە سەرلەنوێ داگیرکاری کلتووری بەڕێوەدەبات. بەرخودانی کۆمەڵگا بەرامبەر ئەم فەتحکاری و داگیرکارییە کلتوورییە لەمیانەی تێکۆشانی سیاسی و ئەخلاقی کە بنچینەییترین ئامرازەکانی هەبوونێتی تاکە رێگای رزگاری و ئازادییە. کۆمەڵگایەك لاوانی خۆی لە دەستدابێت، یاخود بەپێچەوانەوە لاوان کە کۆمەڵگای خۆیان لە دەستدابێت، نەك هەر نۆڕاوە، بەڵکو بەو واتایە دێت کە مافی ژیانی لەدەست داوە و خیانەتی لێکراوە. چونکە دوای ئەویش پووکانەوە، پەرتەوازەبوون و لەناوچوونە. بەرامبەر بەم نۆخە سەرەکیترین ئەرکی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) پێشخستنی دامەزراوە پەروەردەییەکانی خۆیەتی کە ئامرازە بنچینەییەکانی هەبوونێتی. لەناوەڕۆکدا جیاکردنەوەی راڤە زانستی، فەلسەفی، هونەری و زمانەوانییەکانێتی لەبونیادی زانست ـــ دەسەڵاتەوە. سەرخستنی شۆڕشی واتایە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا مەحاڵە شانە سیاسی و ئەخلاقییەکانی هەبوونی کۆمەڵگا کارا بکرێت.

لەم چوارچێوەیەدا لەکاتێکدا کێشەی پەروەردە لەناوەڕۆکدا دامەزراوە (شانە) سیاسی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا دەکات بە پێویستیەکی ژیانی، ئەوا لەبنەڕەتدا ئەرکی سیاسەت و ئەخلاقیش جێبەجێکردنی ئەرکی کۆمەڵگایە. هەروەکو چۆن ئەو کۆمەڵگایەی خۆی پەروەردە ناکات، توانا و دەرفەتی پێشخستن و پاراستنی دامەزراوی سیاسی و ئەخلاقی خۆی لەئارادا نامێنێت، ئەوا لە هەمانکاتدا هەبوونەکەشی لە هەڕەشە، پووکانەوە و پەرتەوازەبوونی بەردەوام رزگاری نابێت.

کێشەی تەندروستی کۆمەڵگاش تا بڵێی بابەتێکی هەستیارە. هێندەی پەروەردە بایەخدارە، ئەو کۆمەڵگایەی بەتوانا و دەرفەتەکانی خۆیەوە نەتوانێت تەندروستی خۆی بپارێزێت، بناخەکەی هەبوون و ئازادییەکەی یان لەژێر مەترسیدایە یاخود بە تەواوەتی لەدەستیداوە.

وابەستەیی تەندروستی نیشانەیەکی پاشکۆیەتی گشتییە. ئەو کۆمەڵگایەی کێشەی تەندروستی جەستەیی و رۆحی خۆی چارەسەر کردووە، واتە دەرفەتی ئازادبوونی لە دەست خۆیدایە. نەخۆشییە بەربڵاوەکانی کۆمەڵگا کۆلۆنییەکان، گرێدراوی رژێمە داگیرکەرەکانە کە تێیدا دەژین. پێویستە ئاواکردنی دامەزراوی تەندروستی و پێگەیاندنی پسپۆری تەندروستی تایبەت بەخۆی وەك ماف و ئەرکێکی سەرەکی کۆمەڵگا ببینرێت. زەوتکردنی ئەم ئەرکە لەلایەن دەسەڵات و دەوڵەتەوە و کردنی بە پاوان، زەبرێکی گەورەیە بەر تەندروستی کۆمەڵگا دەکەوێت. هەر بۆیە تێکۆشانی لەپێناو مافی تەندروستی، هەستیاربوونێتی بەرامبەر بە ئازادی و رێزگرتن لەخۆی.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە دەوڵەت ــ نەتەوەکردنی پەروەردە و تەندروستی بە بابەتێکی ژیانی دادەنێت. تا ئەم دوو گۆڕەپانە نەخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە و باڵادەستی هەژموونگەراییان لەسەر ئاوانەکرێت کە پەرەسەندنی هەبوون، رۆشنگەری و تەندروستانەی کۆمەڵگای پێوە گرێدراوە، بەڕێوەبردنی داگیرکاری و هەژموونگەرایی گشتی زۆر ئاستەمە. لەبەرئەوەی زۆر باش ئاگادارن کە تەنیا لەرێگای توندوتیژی سەربازی رووتەوە ناتوانرێت کۆمەڵگا بکرێت بە موڵك، بەڵکو کۆنترۆڵ و چاودێریکردنی پەروەردە و تەندروستی بایەخێکی نائاسایی بۆ پاوانەکان هەیە.

جارێکی دیکەش دەبینین کە دەسەڵات و دەوڵەتی پاوانخواز بناخەی تەواوی کێشەکانی هەبوونی کۆمەڵگا پێکدێنن. چونکە بەبێ ئەم پاوانەی دەسەڵات قازانج ــ سەرمایە بەردەوام نابێت. لەم چوارچێوەیەشدا ئەگەر تێکۆشانی سیستەماتیکی شارستانێتی بەرامبەر ئەمە جێگای باس نەبێت هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا بەچارەسەرییەکی هەمیشەیی ناگات.

### ١١ ــ کێشەی میلیتاریزمی کۆمەڵگا

دەکرێ میلیتاریزم وەك پێشخراوترین پاوانخوازی دژە – کۆمەڵگا پێناسە بکرێت. هەروەها دەتوانین بڵێین، هەوڵەکانی ئاواکردنی یەکەمین دەسەڵات لە دەرەنجامی ئەقڵی ئەنالیتیك و چالاکی "پیاوی بەهێز و تەڵەکەباز" پێشکەوتووە کە لە نەریتی نێچیروانییەوە دەهات و بەئامانجی قۆستنەوە و فشار خستنەسەر سروشتی کۆمەڵگابوو. هەوڵدەدات دەسەڵاتی خۆی لەسەر دوو گروپی بنەڕەتی ئاوابکات کەهێزەکەی بارتەقایان دەکات: گروپە نێچیروانەکەی تەنیشتی و ژن کە لە ماڵەوە هەوڵی بەندکردنی دەدات. لەچەندین کۆمەڵگادا دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە لەرێگای بەشداریکردنی ئەندامە شامانە (راهیبی سەرەتایی)کان و تەمەندارەکان بۆ پرۆسەکە لەژێر

شێوەی جیاوازدا یەکەمین دەسەڵاتی پلەداری پێکدێنێت. لەگەڵ هەنگاونان بۆ مێژووی شارستانی دەبینین پیاوی بەهێز و فێڵباز بەیەکەوە لەگەڵ دەستوپێوەندەکەی وەك دەسەڵاتێکی فەرمی بەشێوەی لقی سەربازی دەوڵەت (یەکەمین پاوانخوازی سەر ئابووری لەسەرینەمای زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم) خۆی کردووە بە دامەزراوە. خانەدانەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی ئور کە یەکسەر دوای قۆناخی پادشا ـ راهیبەکانی کۆمەڵگای سۆمەر دەستی پێکرد بە دیهاتنی ئەم هەنگاوە نیشاندەدات. راستینەی هاوشێوە لەچەندین کۆمەڵگادا جێگای باسە. لە داستانی گلگامێشدا دەتوانرێت هەنگا و بەهەنگاو بەدواداچوونی بۆ بکرێت کەچۆن پادشایەتی لە نەریتی خوداوەندە ژن ئینانا (راهیبی ــ نەریتی خوداوەندە ژن) دابڕێنراوە، بەمجۆرە لاوازکراوە و خراوەتە ناو ماڵەکان (تایبەت ـ گشتی).

ئەگەر گلگامێش وەك نیشانەی یەکەمین فەرماندەی سەربازی تاوتوێ بکەین ئەوا دەتوانین باشتر پێکهاتنی نەریتی سەربازی ـ ملیتاریست ــ شیکاربکەین. کاریان هێرش و پەلاماردانە بە ئامانجی راوکردنی مرۆڤی کۆیلە ( لە باکووری ئێراقی رۆژی ئەمڕۆمان بە یارمەتی "ئەنکیدۆ"ی نۆکەر) بۆ جێبەجێکردنی پێویستیەکانی شارو، راوکردنی قەبیلەکانی (خومبابا) کە بە درندە ــ بەربەر ناوی دەبەن. لێرەدا بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەبینرێت کە لەبنەڕەتدا زۆرداری شار لە ژێر بەربەریتی و هۆڤێتیدا شارلوەیە. گوتەی "بەربەر"ی نەریتی کلتووری گریك وەك چەواشە و پروپاگەندەیەکی درۆزنانەی شار پێشخراوە. لەپێناو ئاولکردنی بالادەستی ئایدیۆلۆژییە. قەبیلەکانی پێدەشت و ناوچە شاخاوییەکان کە بە بەراورد لەگەڵ رێکخستنی شار لاوازتر و رێکخراو نەبوون، ئاشکرایە کە بەو واتایە هۆڤ نەبوون. زاراوەی هۆڤێتی لەسەرووی چەواشەکاری و درۆ گەورەکانی مێژووی شارستانی دێت. دووەمین ئەرکی زۆرداری شار " ئاسایش"ە. لەم پێناوەشدا ئەو رێبازەی هەرە زۆر پەنای بۆ دەبات بەرزکردنەوەی قەلا و شورلکان و پێشخستنی چەکی بەهێز و کوشندەترە. لەم پێناوەشدا بەملیۆنان مرۆڤ کراون بە کۆیلە، جووتیار و کرێکار، ئەوانەی ئەم نۆخەشیان پەسەند نەکردووە کوژراون. ئەمەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ئەم چالاکییانە وەك مێژوو پیشاندراوە.

بەگوێرەی رادەی هێزەکەیان لقی سەربازی گەورەترین بەشی زەوتکردنی بەهای ئابووری بۆخۆی جیادەکاتەوە. ئەو پەلامارانەی لەمێژوودا بە ئامانجی غەنیمەت ئەنجامدراون بەشێوەیەکی روون و بەرچاو ئەم راستییە ئاشکرا دەکات. هەروەها ئەمەش لەبەرچاوانە کە موڵك بناخەی دەوڵەت پێکدێنێت، دەستبەسەرداگرتن و فەتحی سەربازیش بناخەی موڵکە. ئەوەی فەتحکاری

دەکات خاوەنێتی. ئەمە وەك مافێکی ئاسایی و دەست لێبەرنەدراوی چالاکییەکەی دەبینێت و بەمجۆرەش رایدەگەیەنێت. دەوڵەت کۆی ئەو موڵك و غەنیمەتە (موڵکی گوازراوە)یە کە لەلایەن هێزەکانی دەسەڵاتەوە دەستی بەسەردا گیراوە، لەسەرووی هەموشیانەوە زەوی (خاك). بۆ نموونە پرەنسیپی " تەواوی موڵکەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هی پادشایە" گوزارشت لەم خاڵە دەکات. دەوڵەت و فەتحی سەربازی جگە لە بەردەوامی ئەم پرەنسیپ و نەریتە هیچ واتایەکی دیکەیان نییە. نەریتەکە بەمجۆرە ئاواکراوە، لەبونیادنانی هەردەوڵەتێکیشدا فۆرمی حقوقی ــ یاسایی پێدراوە و بەردەوام بووە. هەر لەبەر ئەوەشە کاتێك دەستەی سەربازی خۆی بەخاوەنی سەرەکی دەوڵەت و موڵك دادەنێت و خۆشی بەمجۆرە پێناسە دەکات، نەریتی مێژوویی بەرچاو دەگرێت. وەك پێویستییەکی سروشتی دەوڵەت و دەسەڵات بەهێزترین لقی پاوانە. هەڵبەتە ئەو هێزە مرۆیی و چەکانەی لەبەردەستیدایە زۆر بەئاسانی دەتوانێت ئەمە ئەنجامبدات. هەوڵەکانی بیرۆکراسی مەدەنی کە ناوە بەناوە بەئامانجی زیادکردنی بەشی (پاوان) هەنگاوی بۆ دەهاوێژێت، ئەنجامگیربوونی بە کودەتای سەربازی، لەژێر رۆشنایی ئەم راستیانە باشتر دەرکی پێدەکرێت. بێگومان رۆڵی پاوانی بیرۆکراسی و ئایدیۆلۆژی ناوبراو بە "زانستی" و "قەڵەم" لە دامەزراندنی دەوڵەت و دەسەڵات دەست لێبەرنەدراوە. بەڵام هێندەی رۆڵی سەربازەکان یەکلاکەرەوە نییە. رووکەشانەترین لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ئامێرەکان(دەزگاکان)ی دەوڵەت و دەسەڵات لەمێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم راستیانە دەسەلمێنێت.

یەکەمین خاڵی گرنگ و بنەڕەتی سەبارەت بە بابەتەکەمان لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە باڵی سەربازی پێگەپشتووترین و دیاریکەرترین پاوانە. هەروەك لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە پروپاگەندەی بۆ دەکرێت و سەرباز ــ سوپا وەك شکۆ، شەرەف و قارەمانێتی پێشکەشدەکرێت، وا نییە (ئەمانە بۆ پەردەپۆشکردن و چەواشەکردنی ناوەڕۆکی مەسەلەکەیە) بەڵکو وەك فاکتەرێکی دەست لێبەرنەدراوی پاوانی دەسەڵات لە ئارادایە. لەگەوهەری خۆیدا ئابوورییە. سوپا ئەو پاوانەیە کە پشت بە ئابووری دەبەستێت، لەرووخساردا دووری ئابووری دەوەستێت، بەڵام داهات (موچە)ی خۆی خستۆتە ژێرگەرەنتییەوە، دژایەتیکردنی زەحمەتە و تەواوی بەشەکانی دیکەی پاوان ناچارن سازشکاری و هاوبەشێتی لەگەڵدا بکەن. بەدرێژایی بناخە و پەرەسەندنە مێژووییەکەی، پاوان و نەریتێکە کە بەدەزگابوونەکەی تا ئەم رادەیە ریشەییە. پاوانی ئەو چینەیە (بیرۆکراسی) کە لەناوەڕۆکدا لەنزیکەوە بە پەرەسەندنی ئابوورییەوە پەیوەندیدارە، بەڵام پێویست دەبینێت خۆی لەم مەسەلەیە دووربپیشانبدات. لەم لایەنەوە خۆی وەها پیشاندەدات کە دووری کۆمەڵگا

وەستاوە. راستتر، ئەو گروپە پاوانخوازەیە کە لەمیانەی باشترین چەکی سەربازی و ئابووریەوە خۆی ئامادە و پڕچەک کردووە. ئەگەر شیکارێکی راست بۆ پاوانی سەربازی نەکەین، ناتوانین بە تەواوی دەرك بە پاوانەکانی ئابووری و پاوانەکانی دەسەلاٽ و دەوڵەت بکەین. هەرسێکیان یەکپارچەن، واتە لەسەر هەمان ناوەڕۆك، واتە لەسەر هەمان زێدە ـــ بەهاکانی کۆمەڵگا تێرخۆراك دەبن. بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە لەبەرامبەریدا ئاسایش، پەروەردە، تەندروستی و بەرهەمی کۆمەڵگا رێکدەخەن. دەوڵەتگەرایی، واتە دەوڵەتی ئایدیۆلۆژی بەمجۆرە خۆی پێشکەش دەکات. بەلاٌم راستی بەچەشنێکی دیکەیە و بەمجۆرەیە کە خستمانەڕوو.

بەگوێرەی ئەوەی ملیتاریزم دژوارترین هێزی رێکخراوەیی سەرمایە و دەسەلاتە، بۆیە وەك پێویستییەکی سروشتی مەسەلەکە دەزگایەکە هەرە زێدە کۆمەڵگا دەخاتە ناو قەفەس و ژێر رکێفی دەسەلاتی خۆیەوە. سەرباری ئەوەی لەتەواوی مێژوو و دەوڵەتەکاندا ملیتاریزم(عەسکەرتاریەت) ئەو هێزەیە کە دزە دەکاتە ناو کۆمەڵگا، کۆنترۆڵ و حوکمڕانی دەکات، بەلاٌم لەقۆناخی چینی ناوین (بۆرژاوازی)دا لەپاوانی دەوڵەت ـ نەتەوە بە ئاستی هەرە بڵندی خۆی گەیشتووە. لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا بێ چەککردنی سەرجەم کۆمەڵگا و گواستنەوەی تاکە پاوانی چەك بۆ سوپای دەوڵەت وەك تایبەتمەندییەکی دیاریکەر رووبەڕوومان دەبێتەوە. لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا کۆمەڵگا بەم رادەیە بێچەك نەکراوە کە چینی بۆرژوازی ئەنجامیداوە. هۆکاری ئەم واقیعە گرنگە، چڕبوونەوەی داگیرکاری و پێشکەوتنی بەرخودانی مەزنە لەبەرامبەریدا. تاوەکو بەشێوەیەکی بەرفراوان و بەردەوام کۆمەڵگا بێ چەك نەکرێت، تا دەسەلاٽ بۆ مەمیلەکانی ناوەوەی تەشەنە نەکات و نەخرێتە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵەوە بەڕێوەنابرێت. وەك بڵێی تا کۆمەڵگا نەخرێتە ناو " قەفەسی " ئاسنینی مۆدێرنیتەوە جڵەو ناکرێت. هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا تا لەلایەن سوپای میدیایی سەردەمی پاوانی فینانسەوە گەمارۆ نەدرێت کۆمەڵگا بەڕێوە نابرێت. رەهەندەکانی پاوانەکانی داگیرکاری وەك خۆیان لە پێکهاتنی پاوانەکانی ئایدیۆلۆژی ـــ میدیایی و بیرۆکراتی ـ سەربازی رەنگدەداتەوە. لەناو پەیوەندی و رایەڵەی نەپچڕاودا یەکتری دەبەستنەوە. بەگوێرەی پاوانەکانی دیکە لەپێشینەیی سەرمایەی پیشەسازی چەك لە سەردەمی دوا شارستانی ناوەندی مەزن، واتە لە سەردەمی هەژموونگەرایی سوپەرو هەژموونگەراییەکانی دیکەی هەرێمی و تەواوی نۆکەرە خۆجێییەکانیان کە لەناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای ملیتاریزمێکی زۆر بەڕێوە دەچێت، سەرچاوەی خۆی لە ناوەڕۆکی ئەم رێگە مێژوویی و هەنووکەییەیان وەردەگرێت.

هەروەها هاوواتابوونی پاوانی سەرمایەداری لەگەڵ فاشیزم مانای خۆی لەناو ئەم راستییەی ملیتاریزمدا دەدۆزێتەوە.

هەڵبەتە بەدرێژایی تەمەنی تەواوی کۆمەڵگای سروشتی و مێژووی نووسراو کۆمەڵگاکان لەناو شێوەی جیاوازدا بەرامبەر بە پەرەسەندنی ملیتاریزمی شارستانی بەردەوام خۆیان پاراستووە. ئەو نەریتەی بە بەرگری گەوهەریش ناودەبرێت، لەناو پێشکەوتنێکی هەزاران ساڵیدا بەشێوەی بەرخودان، راپەڕین، گەریلا و سوپاکانی رزگاری نیشتیمانی بە دەزگابووە و شەڕی گەورەی بەرگری بەڕێوەبردووە. هەڵبەتە پێویستە هەرگیز شەڕەکانی بەرگری و شەڕەکانی پاوانی ملیتاریستی وەك یەك نەبینین. جیاوازی ماهییەت و ناوەڕۆك لەنێوانیاندا هەیە. یەکێکیان دژە ـــ کۆمەڵگایە (داگیرکەر، رزێنەرو لەناوبەرە)، ئەویتر کۆمەڵگاگەراییە (کۆمەڵگا ئاوادەکات، توانا ئەخلاقی و سیاسییەکانی ئازاد دەکات). لەسەر بنەمای بەسیستەمکردنی بەرگری گەوهەری (رەوا) شارستانێتی دیموکراتی بەرامبەر بە ملیتاریزمی شارستانی ناوەندی پاراستن و بەرگریکردنە لەکۆمەڵگا.

### ١٢ ـ کێشەی دیموکراسی و ئاشتی کۆمەڵگا

لە یازدە سەرە دێڕەکەی پێشووتر بەشێوەی پێشەکی پێناسەیەکی پوخت هەوڵی پێناسەکردنی چۆنیەتی ئەو کێشانە دراوە کە سروشتی کۆمەڵگای خنکاندووە. تەنیا کاتێك پشتبەستوو بەم پێناسانە شیکار پێشبخرێت و وەڵام بدرێتەوە دەشێت پارادایم و زانستی کۆمەڵایەتی واتا و بەهایەکی هەبێت. لە دۆخێکی پێچەوانەدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئاوازە نەریتی و لیبراڵەکان نامێنێت. ئەو ئەنجامە هاوبەشەی پێیگەیشتووم: کاریگەری، باڵادەستی و داگیرکەری هاوبەشی پاوانەکانی فشار و چەوسانەوە بۆ قۆستنەوەی سروشتی کۆمەڵایەتی (هەبوونی کۆمەڵگا) بەگشتی و بەتایبەتیش توانا ئابوورییەکانی زێدە ـــ بەها بەرهەمدێنن سەرچاوەی کێشەکانی کۆمەڵگا پێکدێنن. لەسەرچاوە زیاتر، زۆرزانترین هەبوون جێگای باسە. واتە کێشەکان سەرچاوەی خۆیان لە سروشت (سروشتی یەکەم) یان هەر فاکتەرێکی دیکەی کۆمەڵگا(سروشتی دووەم) وەرناگرێت.

بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا نەبێت کە وەك هۆکارەکانی هەبوونی کۆمەڵگا و لەپێناو بەڕێوەبردنی کارە هاوبەشەکان بوونەتە خاوەن شانە، ئەوا کۆمەڵگاکان ناتوانن بەردەوامی بەهەبوونی خۆیان بدەن. دۆخی ئاسایی کۆمەڵگا و هەبوونەکەی،

بەبێ ئەخلاق و سیاسەت نابێت. ئەگەر کۆمەڵگایەك شانەی گەوهەری ئەخلاق و سیاسەتەکەی بەرەوپێشەوە نەچووبێت، یاخود پووکێنرابێتەوە، چەواشە و ئیفلیجکرابێت، ئەوکاتە دەتوانرێت بگووترێت ئەم کۆمەڵگایە دووچاری داگیرکاری و چەوسانەوەی پاوانە هەمەجۆرەکانی سەرمایە، دەوڵەت و دەسەڵات هاتووە. بەڵام بەم دۆخەوە درێژەپێدانی هەبوون، واتای خیانەتی خۆیی و نامۆبوونە بەرامبەر بە هەبوون و ژیان" لەژێر سایەی باڵادەستی پاوانەکاندا هەبوونێکە بەشێوەی مێگەل، شتوومەك و کاڵا ـ موڵك. لەم رەوشەدا کۆمەڵگا سروشتی خۆی لەدەستداوە، تولناکانی کۆمەڵگای سروشتییان لەدەستداوە، یان دووچاری رووخان هاتووە. کراوە بەکۆلۆنی، تەنانەت لەوەش خراپتر بەهەمووشتێکەوە وەك بابەتێکی موڵکایەتی خۆی رووبەرووی رزین و لەناوچوون کرێتەوە و دووچاری گرگنی هاتووە. لە رۆژگاری ئەمرۆمان و مێژوودا چەندین کۆمەڵگا بینراون کە بەگوێرەی ئەم پێناسەیەن. تائێستاش ئەوانەی رزێنراون و لەناوبراون چەندین قات لەوانە زیاترن کە ماونەتەوە.

ئەگەر کۆمەڵگا کەوتبێتە دۆخێکەوە لەپێناو بەردەوامبوونی خۆیدا نەتوانێت دامەزراوە سیاسی و ئەخلاقییە پێویستەکان ئاوا بکات و کارایان بکات، واتە خراوەتە ژێر فشاری چەوسانەوە و سەرکوتکردنەوە. ئەم رەوشەش "دۆخی شەڕە". دەشێت مێژووی شارستانییەکان وەك " دۆخی شەڕ" بەرامبەر کۆمەڵگا پێناسە بکرێت. کاتێك سیاسەت و ئەخلاق ناتوانێت رۆڵ ببینێت، تەنها کارێك دەمێنێتەوە کە کۆمەڵگا ئەنجامی بدات، ئەویش بەرگری گەوهەری (رەوا)یە. دۆخی شەڕ، رەوشی نەبوونی ئاشتییە. لەم سۆنگەوە ئاشتی تەنیا لەسەر بنەمای بەرگری گەوهەرییەوە واتادار دەبێت. ئەو ئاشتییەی بەرگری گەوهەری(خۆیی) نەبێت، تەنیا گوزارشت لەرادەستبوون و کۆیلایەتی دەکات، نەك شتێکی تر. هەر ئاشتییەك کەوا بێبەش بێت لە بەرگری گەوهەری و بەتایبەتیش ئەو بارییە بێت کە لیبرالیزم لەژێر ناوی سەقامگیری و تەباییەوە بەسەر گەلان و کۆمەڵگاکانیدا دەسەپێنێت، بەتایبەتیش ئەو بارییەی بە سەقامگیری دیموکراسی و تەبایی ناوی دەبات، هەموو ئەمانە جگە لە رەوشی پەردەپۆشکردنی ئەو شەڕە چەکدارییە یەکلایەنەی لەلایەن چینی بۆرژوازی باڵادەستەوە بەڕێوەدەچێت و بەڕێوەبردنی لەژێر دەمامکێکی جیاوازدا، هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بەم شێوەیە پێناسەکردنی ئاشتی، وەك گەورەترین هەوڵی هەژموونگەرایی سەرمایەی ئایدیۆلۆژی رووبەروومان دەبێتەوە. بەڵام لەمێژوودا بەشێوەی جیاوازتر و لەژێر ناوی " دەستەواژە پیرۆزکراوەکان" گوزارشتی لێکراوە. لەم لایەنەوە ئایینەکان بە زاراوە و دەستەواژەی بەمجۆرە بارکراون. بەتایبەتیش ئەو ئایینانە بەمجۆرەن کە کراون بەشارستانی.

تەنیا کاتێك کۆمەڵگاکان خاوەن بەرگری گەوهەری بن، واتە لەدۆخێکدا کارەکتەری کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بپارێزرێت و گەرەنتی بکرێت ئەوکاتە ئاشتی بەواتای راستەقینەی خۆی دەگات. پێناسەی ئاشتی کە لەلایەن میشێل فۆکۆوە هەوڵێکی زۆری لەبارەوە دراوە، تەنیا بەمشێوەیە بە گوزارشتێکی کۆمەڵایەتی پەسەندکراو دەگات. جگە لەمە تەواوی واتا بەخشین و بارکردنەکانی دیکە، لە تەڵەزگە و بەردەوامبوونی دۆخی شەڕ و شێوە داپۆشراوەکانی بەولاتر هیچ واتایەکی دیکەیان نییە. وشەی ئاشتی لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا وشەیەکە پڕ بە تەڵەزگە بارکراوە. ئەگەر راست پێناسە نەکرێت، ئەوا بەکارهێنانی زۆر مەترسیدارە. ئەگەر جارێکی دیکە پێناسەی بکەین، ئاشتی، نەتەواو نەمانی دۆخی شەڕە، نە دۆخی نەبوونی شەڕو سەقامگیرییە لەژێر بالادەستی لایەنێك. لە ئاشتیدا لایەنەکان جێگای باسن. بەلام بالابوونی لایەنێك جێگای باس نییە و پێویستە نەبێت. هەروەها لەسەر بنەمای رەزامەندی میکانیزمی دامەزراوە سیاسی و ئەخلاقییەکانی خودی کۆمەڵگا پێویستە چەك بێدەنگ بکرێت. ئەم سێ مەرجە بناخەی ئاشتی بە پرەنسیپانەیە. ئاشتییەکی راستەقینە پشت بەم مەرجە بنەڕەتییانە نەبەستێت، واتای نابێت.

ئەگەر تۆزێکی تر ئەم سێ مەرجە روون بکەینەوە، یەکەمیان،" بە تەواوی بێ چەککردنی لایەنەکان بە بنەما ناگرێت. بانگەشەکانیان هەرچییەك بێت، پەیمانی ئەوە بەیەکتری دەدەن کە لەژێر هیچ بڕو بیانوویەکدا هێرشی چەکداری ناکەنە سەریەکتر. هەروەها بەدوای بالابوونی چەکدارییەوە نین. بەرامبەر بە مافی بەرگری و پێداویستییەکانییەوە بەڕێزن و پەسەندی دەکەن. دووەمیان" بالابوونی کۆتایی لایەنێکیان جێگای باس نییە. لەوانەیە سەقامگیری و ئارامییەك جێگای باس بێت کەلەژێر بالابوونی چەك بەدیهاتبێت، بەلام ئەم رەوشە بە ئاشتی ناو نابرێت. لە دۆخێکدا لایەنەکان (مافدار یان ناهەق) بەبێ ئەوەی بەسەریەکتردا زاڵ بن (بەچەك) دوولایەنە وەستاندنی شەڕ پەسەند بکەن، دەشێت ئاشتی بکەوێتە رۆژەڤەوە. سێیەمیان" لایەنەکان رێزگرتن لە کاروباری دامەزراوە سیاسی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگاکان (دیسان هەر پێکەیەکیان هەبێت، کۆمەڵگا یان دەسەلات) پەسەند دەکەن. ئەو مەرجەی بە " چارەسەری سیاسی" ناودەبرێت لەم چوارچێوەیەدا پێناسە دەکرێت. ئاگربەستێك چارەسەری سیاسی و ئەخلاقی لەخۆوە نەگرێت ناشێت وەك ئاشتی شرۆڤە بکرێت.

لەژێر ئەم مەرجە بنەڕەتیانەی ئاشتیدا سیاسەتی دیموکراتی بەشێوەیەکی ژیانی بایەخدار دەبێت و دەکەوێتە رۆژەڤەوە. کاتێك دەزگا سیاسی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا دەستبەکاربێت،

بەشێوەیەکی سروشتی ئەو قۆناخەی بێتە ئاراوە پرۆسەی سیاسەتی دیموکراتییە. پێویستە ئاوەندە ئاشتیخوازەکان باش بزانن، تەنیا کاتێك سیاسەت لەسەر بنەمای ئەخلاقی رۆڵی خۆی ببینێت سەرکەوتن بەدەست دەهێنرێت. لەدۆخی ئاشتیدا بەلانی کەم پێویستە لایەنێك لەپێگەی سیاسەتی دیموکراتییانەدا بێت. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ئەوەی روودەدات لە " گەمەی ئاشتی" بەولاوە تێپەڕناکات کە بە ناوی پاوانەوە ئەنجامدەدرێت. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا سیاسەتی دیموکراتی رۆڵێکی ژیانی و چارەنووسساز دەبینێت. تەنیا لەمیانەی دیالۆگەوە دەشێت قۆناخێکی واتاداری ئاشتی هێزەکانی سیاسەتی دیموکراتی بەرامبەر بە هێزەکانی دەسەلات یان دەوڵەت بێتە ئاراوە. هەروەها ئەو دۆخەش جێگای باسە کە لایەنەکانی شەڕ (پاوانەکان) بەشێوەیەکی کاتی و دوولایەنە دەوەستن و رەوشەکە بۆ ماوەیەك بەمجۆرە بەردەوام دەبێت. لەشەڕدا ماندووبوون و زەحمەتییەکانی لۆجستیك و ئابووری دێتە ئاراوە. لەدۆخی چارەسەرکردنی ئەم کێشانەدا تا بالآبوونی لایەنێك بە تەواوی بەدەست دەهێنرێت، شەڕ بەردەوامی پێدەدرێت. ئەم شێوانە بە پرۆسەی ئاشتی ناونابرێن، بەڵکو بە ئاگربەستێك ناو دەبرێن کە لەپێناو شەڕێکی دژوارتر ئەنجامدەدەرێن. بۆ ئەوەی ئاگربەستێك ئاشتیخوازانە بێت، پێویستە رێگا لەپێش ئاشتی بکاتەوە و وابەستەبوونیشی بەم سێ مەرجە بنەڕەتییەی ریزمان کردن، بایەخێکی زۆری هەیە.

هەروەکو بینراوە" هەندێکجار لەشەڕدا لایەنی بەرگری رەوا ( ئەوانەی لە پێگەی مافخوراودان) بەسەرکەوتنی دوایی گەیشتووە. بەلام لەدۆخێکی وەهاشدا دیسان سێ مەرجەکەی ئاشتی ناگۆڕێت. هەروەك لەچەندین شەڕەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و رزگاری نیشتیمانی رەوادا بینراوە، یەکسەر ئاواکردن و گەیشتنیان بە دەسەلات و دەوڵەتی خۆیان و بەرقەرارکردنی ئارامی لەژێر سایەی ئەم دەسەلات و دەوڵەتەدا ئاشتی نییە. ئەمجارە لەجیاتی هێزە بیانییەکە (پاوانخوان) ئاواکردنی هێزێکی (سەرمایەی دەوڵەت یان ئەو توێژەی بە بۆرژوازی ناودەبرێت) خۆجێیی جێگای باسە. هەر چەندە بە دەسەلاتی سۆسالیستیش ناوبرێت، بەلام راستییە سۆسیۆلۆژییەکەی ناگۆڕێت. وەك پرەنسیپ ئاشتی دیاردەیەك نییە کە لە ئاکامی بالآبوونی دەسەلات و دەوڵەت بەدیهاتبێت. دەسەلات و دەوڵەت لەژێر هەرچی ناوێك بێت (بۆرژوازی، سۆسیالیست، میللی.. هیچ جیاوازییەکی نییە) کاتێك بەشداریکردنی هێزە دیموکراتییەکان لە ئارادا نەبێت ئاشتی ناکەوێتە رۆژەڤەوە. لە دوا شیکاردا" ئاشتی رێککەوتنی مەرجداری نێوان دیموکراسی و دەوڵەتە: چیرۆکەکانی ئەم رێککەوتنە رووبەرێکی زۆری جێگەو زەمەنی مێژوویان داپۆشیوە. لەچەندین جێگەو ماوەدا تاقیکراونەتەوە. هەیە کە درێژخایەن و بە پرەنسیپە.

هەندێکیشیان هەن بەرلەوەی مەرەکەبی سەر کاغەز وشك بێتەوە تێکچوون. کۆمەڵگاکان تەنیا لە رێگای ئاواکردنی هێزەکانی دەسەڵات و دەوڵەتدا نازین. چەندەی گۆڕەپانەکەیان بەرتەسك و سنوورداریش بکرێت، ئەگەر بەتەواوی لەنێو نەبرێن، ئەوا دەزانن چۆن لەژێر ناسنامە سیاسی و ئەخلاقییەکەی خۆیان درێژە بە ژیان بدەن. لەوانەیە ئەمە لەمێژوودا نەنووسرابێت، بەڵام ئەم راستییە لۆخی سەرەکی ژیانە.

تەماشانەکردنی کۆمەڵگا وەك پێکهاتەی چیرۆکەکانی دەوڵەت و دەسەڵات، بەڵکو بە پێچەوانەوە شیمانەکردنی وەك سروشتێکی دیاریکەر دەشێت کۆمەك بە پێکهاتنی زانستێکی کۆمەڵایەتی واقیعیانەتر بکات. دەسەڵات و دەوڵەتەکان و پاوانەکانی سەرمایە چەندە گەورە و دەوڵەمەند (وەك فیرعەون و قارون[١٢])یش بن، یان وەك رۆژگاری ئەمڕۆمان ببن بەجۆرێك لە ئەژدیها و جانەوەری هۆز (لێڤی ئەتهانی نوێ) کە کۆمەڵگا قووتبدەن، هیچ کاتێك ناتوانن کۆمەڵگا لەناوببەن. چونکە ئەوەی لەدواشیکاردا دیاریان دەکات کۆمەڵگایە. چونکە هیچ کاتێك دیاریکراوەکان شوێنی دیاریکەرەکان ناگرنەوە. تەنانەت هێزی پروپاگەندەیی میدیایی بە رەونەقدارترین دەسەڵاتیش توانای پەردەپۆشکردنی ئەم راستییەی نییە. ئەوان کلۆڵترین هێزن کە خۆیان خستۆتە ناو پۆشاکی دێوەوە. بەرامبەر بەمەش هەر لە سەردەمی پێکهاتنییەوە کۆمەڵگای مرۆڤ وەك سەمەرەترین بوونەوەری سروشت واتادار دەبێت.

سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی وەك سیستەمی راڤەکردن، بەزانستیکردن و سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگا لەژێر ئەم پارادایمە بە لۆخە هەنووکەیی و مێژووییەکەیەوە بابەتی ئەم بەشەی دواترە.

---

[١٢] قارون:چیرۆکی قارون بە یەکێك لە ئایەتەکانی قورئان دادەنرێت. دواترین پادشای لیدیا بووە، بە دەوڵەمەندێتی ناوبانگی دەرکردووە وخاوەن گەنجینەیەکی زۆر بووە، لە سەردەمی حەزرەتی موسادا ژیاوە. بەڵام باوەڕی بە حەزرەتی موسا نەهێناوە.

## هزراندنی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی

لەوکاتەوە کەخۆم ناسیوە گومان بەجێی نەهێشتووم و وەك شەوە بەدوامەوەیە. ئەم رەوشە هەندێکجار بە دۆخی نەخۆشی دەگەیشت. کاتێك هەندێك لەباوەڕییە دۆگماییەکانم دەهەژان، هەستم بە لاوازترین ساتی خۆم دەکرد. لەو کاتەدا کەوتنە ناو بێ بانگەشەترین دۆخی ژیان جێگای باس بوو. ئەو گومانگەراییەی تەنانەت لەو بابەتە جددییانەش خۆی پیشاندەدا کە بەهیچ جۆرێك ناکرێ بەرگری لێبکرێت، گرنگترین کۆمەکی بۆ کەسایەتی من ئەو وانەیە بوو: حەقیقەت بە سانایی نادۆزمەوە. لەو بڕوایەدام کە بەکێشەکردنی هەر شتێك تا دەگاتە رەمەکەکانیشم، هێزی دابڕانی لەشێوازی هزری دۆگماتیکی پێبەخشیم کە تائێستاش لەنەریتی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناویندا زۆر بەهێزە. لەدواشیکاردا" لەبەر ئەوەی شێوازی هزری هەژموونگەرایی ناوەندێتی ئەورووپا تا ئێستاش لەسەر دۆگماتیزمی پۆزێتیڤیزمی مۆدێرنیتە و هزری پۆست مۆدێرنیزم بە کاریگەرە، گرنگی بابەتەکە پیشاندەدات. لەمیانەی بەراوردکردنی توانای هزری رۆژهەڵاتی پشتبەستوو بە باوەڕی لەگەڵ هێزی هزری رۆژئاوایی پشتبەستوو بە لێپرسینەوە، هەوڵی دیاریکردنی پێگەی خۆممدا. ئاشکرایە کە لەهەردوولاش جێگام بۆخۆم نەدۆزیییەوە. کاتێك هزرم بەمجۆرە بووە، بەشێوەیەکی سروشتی ژیانیشم رۆژ لەدوای رۆژ کەلێن و دابڕانەکەی لەگەڵ ئەمانە قووڵتر بۆوەو بەردەوام بوو.

ئەو کێشانەی وەك باوەڕی یان هزری لێپرسینەوە پێشکەشکران هیچ منیان رازینەکرد، رەخنەی بنەڕەتیم ئەوەیە، ئەم هزرانە بەرپرسیارێتیان لەگەورەبوونی کێشەکانی کۆمەڵگادا زۆرە. ئەمەش رلوەستەی رەخنەگرانە سەبارەت بە سیستەمی باوەڕی رۆژهەڵات و سیستەمی راسیۆنالی رۆژئاوا دەکاتە پێویستییەك، دەرهەق بەم بابەتە بوێری پێدەبەخشیم.

تایبەتمەندێتی دووەمم" هەرگیز مەعریفە بەئاگاکەم لەکرداری کۆمەڵایەتیم دانابڕێت. لەم چوارچێوەیەدا هەر لە زووەوە پێکهاتەی کارەکتەرێکی نائاسایی هاوبەشێتی لەکەسایەتی مندا بەدەرکەوت. کاتێك هێشتا لەقۆناخی سەرەتایی کاتێك بەپێ بەرەو قوتابخانە (گوندی "جەبین" ی دراوسێ) دەڕۆیشتین، لەمیانەی چەند نزایەکەوە (دوعایەکەوە) کە دەرخمکردبوون نەخشەدانانم و خۆ دەرخستنم وەك ئیمامی گرووپی خوێندکارە بچکۆلەکان بە سانایی مایەی تێگەیشتن نەبوو. وەك یارییەك بوو، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر برشت ئەنجامدەدا. وابزانم داخوازی هاوبەشێتی کردنی

سەنگینی دەستپێکردنی هزراندن لەژێر ئەمەدا شاراوە بوو کە لەرێگای ئەم دوعایانەوە بەدیهات کە بەزەحمەتییەوە دەرخمکرابوون. واتە ئەو شتەی فێربوویت، زەحمەت و گرنگە: لەدۆزەخێکی وەهادا مسۆگەر لەگەڵ دەوروبەردا هاوبەشێتی بکە! دیارە کە لێرەدا ئاشنای پرەنسیپێکی جددی ئەخلاق دەبووم. لەبەرئەوەی لە بەرگەکانی پێشووتری بەرگرینامەدا بەکورتی باسی چیرۆکی یەکەمین تیشکەکانی مۆدێرنیتەم کردبوو کەچۆن لەچاومی داوە، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام کاتێك لەماراسۆنە هزرییە گەورەکەمدا بە شێوەیەکی ژیرانە دەرکم بەوە کرد کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریی هێزی تێکدانی راکردنی سەرشێتانەیە، وەستام. زۆر سەیرە کە ئیتر پارچەکردنی خودلوەندەکانی ئەم چوارسەد ساڵەی دوایی (سیستەمی ـ جیهانی سەرمایەداری) منی بۆ هێزی سۆزێکی وەك ئەو دڵخۆشییەی حەزرەتی ئیبراهیمی ئورفایی برد کە لەکاتی قەڵەمبازەکەیدا " شکاندنی بت" پێی بەخشیبوو. ئیتر هەم بەئاسانی دەمتوانی گومانەکانم کۆنترۆڵ بکەم، هەم ژوانی شایستە لەگەڵ " حەقیقەتەکانم"دا رێکبخەم کە بەدواییدا دەگەڕام.

مرۆڤ بەتەواوی لاواز بووە. جێگای داخ و ئازارە کە لەمێژووی خۆیدا وادەی ژوانی لەگەڵ حەقیقەت بۆ نزمترین ئاستی رەمەك و غەریزە داخستووە. ئەمڕۆ ئەو تاکە زۆر دەگمەنە کە رادەستی پێوانەکانی ژنێك، مندالێك و مووچەیەك نەبێت. نالێم نکوڵی لەم دیاردەیە دەکەم. خوازیارم ئاماژە بە کلۆڵی پەرستنی ئەو هزرە بکەم کە وەك راسیۆنالترین هزر دەبینرێت و لەجێگای فەلسەفە دانراوە. ئەمەیە ئەو دونیایەی خودلوەندێتی دەوڵەت – نەتەوە پێشکەشی بەندە بەختەوەرەکانی خۆی کردووە. ئایا دەتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت کە لەدونیایەکدا دەژین بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار بەرتەسك کراوەتەوە؟ من بۆخۆم ژیان لەژێر سیمبۆلی خودلوەندێکی چاخە کۆنەکان هەزاران جار لەژیانی خودلوەندێتی دەوڵەت– نەتەوەی رۆژگاری ئەمرۆمان واتادارو پیرۆزتر دەبینم. هەڵبەتە ئاگادارم کە باس لەپووچترین خودلوەندگەرێتی پاوانخوازێتی سەرمایە دەکەم کە بێ ناوەرۆککراوە. بەڵام بە ئێشەوە پێشوازی لە رەوشی ئەوانە دەکەم کە کوشندەترین زەبری ئەم خودلوەندێتییەیان بەرکەوتووە، بەڵام دیسان لەژێر کاریگەرییەکەیدان و بیر لە رزگاربوون ناکەنەوە. باش ئاگادارم کە ئەمە رەوشێکی هەنووکەیی مرۆڤایەتییە. رووداوی جینۆسایدی یەهودییەکان کە ئەم دۆخە بەباشترین شێوە پیشانیدەدات، رەهەندە تراژیدییەکانی رەوشەکەش دەخاتەڕوو. چەندە جێگای داخ و پەژارەیە کە بەسەرهاتی هۆزی عیبرانی لە رووداوی ئەم رەوشە و لە قوربانیدانیشدا بەشێکی گرنگی هەیە. وەك پەندی "چ بچێنیت ئەوە دەدوورێتەوە"یە. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە هێزی هزری یەهودی خاوەن

کارەکتەرێکی هەژموونگەرابییە. لە ئەزیەرەکردنی نژاکانەوە تا دەگاتە بت شکێنەریم لەکەسایەتی خۆشمدا نکوڵی لە گرنگی کاریگەریەکەی ناکەم و هەرگیز بچووکی نابینم. بەڵام تەنیا تراژیدیای ئەو جینۆسایدەی بەسەریاندا هات ئەنجامدانی لێپرسینەوەیەکی ریشەیی ئەنۆرنۆییانە دەرهەق بەخۆیان دەکاتە قەرزێکی سەر شانیان. من خۆشم بەو رادەیەی کاریگەربووم، بەنیازیی دانەوەی کەمێك لەم قەرزە، بیرم لە سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی کردەوە.

. لەم لایەنەوە ئێمە ئیبراهیمین. بەڵام کاتێك تۆزێك زەردەشتیشی لەگەڵدابوو، راڤەی جیاواز بەهێز دەبێت. چەمکی زاڵی مێژوو کە بەشێوەی گێرانەوەی چیرۆکەکانی شارستانییە، دووچاری شکاندنی گرنگ هاتووە. بەشێوەیەکی گشتی پەسەندکراوە کە کاروانی دەوڵەت و دەسەڵات وەك مێژووی فەرمی جێگای خۆی دەگرێت، بەڵام مەحاڵە ببێتە مێژووی کۆمەڵگا. لەناو راستی و حەقیقەتی مێژوودا شێوازی بوون بە دەسەڵات و دەوڵەت دەشێت تەنیا خاڵێکی گزی لوتکەی رەمزی لایەنی پاوانەکانی سەرمایە بێت. ئەوەی مێژووی ناخۆش کردووە و وەڵامی نەریتی کۆمەڵگای نەدلوەتەوە دیسان ئەم گێرانەوە ئەوپەرگەریانەیە. وەك پێویستییەکی بونیادی ئەم مێژووە کە لەناوەرۆکی خۆیدا دژە ـ کۆمەڵگاییە، ئاشکرایە کە لە بواری نەریتەوە گوزارشت لە کۆمەڵگا ناکات، بەپێچەوانەوە سووکایەتی پێدەکات و لە زۆر لایەنەوە چەواشەی دەکات. چیرۆکی خانەدانەکانیش هاوشێوەیەکی ئەم گێرانەوانەیە. هەرچی گێرانەوەی مێژووی ئایینیشە کەئاستی نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵگا تا دوارادە رووکەشییە، بە تایبەتیش کاتێك دەکەوێتە قۆناخی شارستانیبوون جگە لەمێژووی دەسەڵات و دەوڵەت هیچ واتایەکی دیکەیان نییە.

هەروەها راڤە و شرۆڤە چینایەتی و ئابووریەکانی سەبارەت بە مێژوو، ئەگەر لە روانگەیەکی دیکەشەوە بێت مێژووی دەوڵەت نێنێتەوە بیری مرۆڤ، چونکە بەگوێرەی خەسڵەتەکانی راستی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی دابڕاو لە گشتی تاوتوێ دەکات و بە ئاستی میتۆدی بچووککردنەوەی مۆدێل دەگات. چونکە روانگەی پۆزێتیڤیستی رێژەیی بەرادەی مێژووی ئایینەکانیش هێزی بەخشینی واتای نییە. تەواوی ئەم گێرانەوانەی مێژوو هەرچەندە لە رواڵەتدا وەك دژی یەکتر دیارین، بەڵام لەوخاڵەدا یەکدەگرنەوە کە هەموویان ریشەکەیان شارستانییە.

لەو بروایەدا نیم کە مێژووی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا هەم لەبواری پارادایمی هەمیش لەبواری ئەزموونییەوە واتادار بووە. هەرچی ئەو نووسینانەن کە بەمێژووی کۆمەڵگا ناودەبرێت جگە لە بەشە پارچەکراوەکانی کۆمەڵناسی پۆزێتیڤیست بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەیان نییە. لەوێنە و دیمەنی بەشێکی جەستە بەولاوە تێپەر ناکەن.

دەتوانرێت بەشێوەیەکی درێژ و تێروتەسەل باسی ئەم دەستنیشان کردنانە بکرێت. بەڵام کۆمەك بە بابەتەکەمان ناکات.

ئەگەر باجەکەی دووبارەکردنەوەیەکی بەردەوامیش بێت، قاڵبوونەوەم سەبارەت بە مێژوو وەك باسی شارستانێتی دیموکراتی، بەهۆی ئەرزۆکی و بێچارەیی کێشەکانی کۆمەڵگایە کە تائێستاش لە واتاپێدانیدا زەحمەتی دەبینم. بێچارەیی تەنیا لەژیانی کرداریدا نییە، بەڵکو لە گێڕانەوەشدا بێچارەییەکی زۆر بارکراوە. کاتێك هەردوو رەوش دەبن بەیەك، باسەکانی شارستانی فەرمی دەورویەر دەتەنێتەوە. هەرچی جێگیرکردن و تێئاخنینی هەندێك بەشە لەژێر ناوی مێژووی کۆمەڵگاوە، لەئاڵۆزکردنی دۆخەکە زیاتر هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێت.

بەردەوام ئاماژە بەوخاڵە دەکەم: سەرەڕای ئەوەی سۆسیالیزمی زانستی ئەم رەوشەی لەمیانەی کارەکتەری چینایەتی مێژووەوە روون کردۆتەوە و تەنانەت هەندێك راستیش رۆشن دەکاتەوە، بەڵام هەروەك چۆن نەیتوانیوە کێشەکە چارەسەربکات، تەنانەت خۆشی بووە بە بەشێکی کێشەکە و بۆی نەکراوە لەم دۆخە رزگاربێت.

هەر لەبەر ئەم خاڵەشە چەندین جار دووبارەی دەکەمەوە" تا پارادایمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە تەواوی تێپەڕ نەکرێت، نەك تەنیا دەرك بەحەقیقەتی مێژوویی ناکرێت، بەڵکو لەمێژووی ئایینەکان زیاتر پەردەپۆش و بێواتای دەکات. لە رۆژگاری ئەمرۆماندا باشتر دەرك بە ئەنجامە مێژووییەکانی ئەم تێڕوانینە پارادایمییەی مارکس دەکرێت. چونکە مێژووی چەوت، واتای پراکتیکی چەوتە. بەگشتی شارستانی، بەتایبەتیش تا هەڵوێستە ئەزموونی و پارادایمیەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تێپەڕنەکرێت، بە هەڵوێستی ئەزموونی و پارادایمی سروشتی کۆمەڵایەتی ناگەین. هەر چەندە ئامادەکاریشی بۆ نەکرابێت، ئەوەی لێرە هەوڵی ئەنجامدانی دەدەم دەستپێکردنی تاقیکردنەوەیەکە.

### أ ـ پێناسەی شارستانێتی دیموکراتی

ئەو قوتابخانەیەی زانستی کۆمەڵایەتی کە لێکۆڵینەوەی دۆخی دەرکەوتنی سروشتی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی لەسەربنەمای کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەگریمانێك دادەنێت، دەشێت وەك سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی پێناسەبکرێت. رەوتە جیاوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، یەکینەی هەمەجۆری لێکۆڵینەوەیان هەیە: تیۆلۆژیا و ئایین کۆمەڵگا بەبنەما دەگرن. هەرچی سۆسیالیزمی زانستییە بنەماکەی چینایەتییە. یەکینەی سەرەکی لیبرالیزمیش

تاکە. وەك ئەوانەی دەوڵەت و دەسەڵات بەبنەمادەگرن، ئەو هەڵوێستانەش کەم نین کە شارستانییەکان بەبنەما دەگرن. هەروەکو زۆرجار ئاماژەم پێکردووە، تەولوی هەڵوێستەکانی لەسەربنەمای یەکینەن، لەبەرئەوەی هەڵوێستی مێژوویی و هەموویێتی گشتگیر نەبوون رەخنەکران. بێگومان هەر لێکۆڵینەوەیەکی واتادار ناچارە سەبارەت بە خاڵە ژیانییەکانی کۆمەڵگا چڕببێتەوە. لەبنەڕەتدا پێویستە مێژوو و ئێستاکەش لەم خاڵانەدا باسەکانیان بدۆزرێتەوە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا لێکۆڵینەوەکان فۆرمی چیرۆك تێپەڕ ناکەن.

کاتێك یەکینە سەرەکییەکەمان وەك کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی دەستنیشاندەکەین، لەبەرئەوەی رەهەندەکانی مێژوویی و هەموویێتی لەخۆوە دەگرێت بایەخدارە. چونکە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی، باسی چیرۆکی مێژووییترین و گشتگیرترین کۆمەڵگایە. دەشێت خودی سیاسەت و ئەخلاق وەك مێژووش بخوێندرێتەوە. ئەو کۆمەڵگایەی رەهەندی سیاسی و ئەخلاقی لەخۆوە بگرێت، کۆمەڵگایەکی هەرە زۆر نزیکی گشتگیری تەولوی هەبوون و پەرەسەندنێتی. چونکە بەبێ بوونی دەوڵەت، چین، چەوسانەوە، شار، دەسەڵات و نەتەوەش، کۆمەڵگا هەر دەبێت. بەڵام ناشێت بیر لە کۆمەڵگایەکی بێبەش لە سیاسەت و ئەخلاق بکرێتەوە. لەوانەیە ئەو کاتە وەك کۆلۆنی و سەرچاوەی کەرەستەی خاو بۆ هێزەکانی دیکە بەتایبەتیش بۆ پاوانەکانی دەوڵەت و سەرمایە، بوونیان هەبێت. لەدۆخی بەمجۆرەشدا میرات و پاشماوەی کۆمەڵگایەك جێگای باسە کە لەناوەڕۆکی خۆی دەرکەوتووە.

لکاندنی سیفەت و ئەتەکێتی لەجۆری کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیستی بە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییەوە کە دۆخی سروشتی کۆمەڵگایە بێواتایە. بە واتایەکی تر، پێناسەکردنی کۆمەڵگا لەژێر ئەم سیفەتانە بە واتای پەردەپۆشکردنی راستی کۆمەڵگا و پەیرەوکردنی میتۆدی مۆدێل لەسەر کۆمەڵگا و بچووککردنەوەی بۆ فاکتەرەکان (چین، ئابووری، پاوان)دێت. ئەو بنبەستبوونەی لە بناخەی زاراوەکانی کردار و تیۆری پەرەسەندنی کۆمەڵگا دەبینرێت، سەرچاوەی خۆی لەو ناتەولوی و هەڵانە وەردەگرێت کە لە ناوەڕۆکیاندا هەیە. دوای ئەوەی سەرجەم شیکارەکانی کۆمەڵگا کەوتنە ئەم رەوشەوە کەنزیك بە ماتریالیزمی مێژوویی بوون و بەم سیفەتانە دەناسرێنەوە، هیچ گومانێکی تێدا نییە ئەم باسانەی بەهای زانستییان زۆر لاوازە، بێچارەتر دەمێنن. سەرەڕای ئەوەی ئەو گێڕانەوانەی خاوەن رەهەندی ئایینین بەردەوام باسی گرنگی ئەخلاق دەکەن، بەڵام لەمێژە رەهەندی سیاسییان بۆ دەوڵەت حەواڵەکردووە. هەرچی هەڵوێستە لیبراڵەکانی بۆرژوازییە تەنیا کۆمەڵگای خاوەن رەهەندی

سیاسی و ئەخلاقی پەردەپۆش ناکات، بەڵکو لەهەمانکاتدا لە هەر شوێن و خاڵێکدا دەرفەت ببینێت لەهەڵگیرساندنی شەڕ بەرامبەر بە کۆمەڵگا نوو دڵی ناکات. تاکرەوێتی بەلانی کەم هێندەی دەوڵەت و دەسەڵات دۆخی شەڕی ڕاگەیەنراوە بەرامبەر کۆمەڵگا. لەبنەڕەتدا لیبرالیزم بە واتای بێ هێزکردنی (کۆمەڵگای بێ سیاسەت و بێ ئەخلاق) کۆمەڵگا و ئامادەکردنی دێت بۆ هەموو جۆرە هێرشێکی تاکرەوێتی. واتە لیبرالیزم ئایدیۆلۆژیاو کردارێکی هەرە زێدە دژی کۆمەڵگابوونە.

زاراوەکانی کۆمەڵگا و سیستەمی شارستانی لە کۆمەڵناسی ڕۆژئاوا (تائێستا زانستێك بەناوی کۆمەڵناسی ڕۆژهەلات جێگای باس نییە)دا زۆر بەکێشەیە. پێویستە لەبیر نەکرێت کە کۆمەڵناسی بە ئامانجی دۆزینەوەی چارەسەری ئەو کێشە، ناکۆکی، پێکدادان ـــ شەڕ و قەیرانە گەورانە دەرکەوتووە کەپاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات ڕێگایان لەپێش کردەوە، واتە سەرچاوەی خۆی لەم پێویستییەوە وەردەگرێت. ئەو کاتە لەپێناو ڕزگارکردنی سیستەم و ژیان بە بەرکردنییەوە لەلایەن هەر لقێکەوە تێز لەدوای تێز پێشدەخران. سەرباری ئەولوی ڕاڤە مەزهەبی، تیۆلۆژی و ریفۆرمیستییەکانی باوەڕی کرستیانی، بەهۆی قورسترببوونی زیاتری کێشەکانی کۆمەڵگا، شرۆڤە و ڕاڤە زانستییەکان (پۆزێتیڤیست)ی کێشەکانی کۆمەڵگا دەرکەوتە پێش. لەبنەڕەتدا شۆڕشی فەلسەفە و قۆناخی ڕۆشنگەری (سەدەکانی ١٧ و ١٨) بەرهەم و ئەنجامی ئەم پێویستییەیە. لەجیاتی ئەو چارەسەرییەی لە شۆڕشی فەرەنسی چاوەڕوان دەکرا، کاتێك کە کێشەکان ئاڵۆزتر بوون، مەیلەکانی پەرەپێدانی کۆمەڵناسی وەك لقێکی سەربەخۆی زانست زیاتر چڕکرایەوە. بەم ئاراستەیەدا سۆسیالیستە خەیاڵییەکان (سان سیمۆن، فۆریە، پرۆدۆن) و ئاگۆست کۆمتە و دورکهایم نوێنەرایەتی قۆناخەکانی سەرەتا دەکەن. هەموویان منداڵی ڕۆشنگەرین. باوەڕییەکی ناکۆتایان بە زانست هەبوو. هەروەها لەو بڕوایەدابوون لە ڕێگای زانستەوە دەتوانن بەگوێرەی داخوازی خۆیان سەرلەنوێ کۆمەڵگا بخولقێننەوە. خۆیان خستبووە جێگای خوداوەندەوە. بەگوتەی هیگل، هەرچۆنێك بێت خوداوەند دابەزیبوو بۆ سەر ڕووی زەوی. وەك دەوڵەت ـــ نەتەوە. ئەوەی دەبوایە بکرێت، "ئەندازیارێتی کۆمەڵگا" و پرۆژەو پلاننامە وردەکەی بوو. هیچ پرۆژە و پلاننامەیەك نەبوو لەڕێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە سەرکەوتووانە جێبەجێنەکرێت. تەنیا "زانستی پۆزێتیڤست" بێت و دەوڵەت ـ نەتەوە پەسەندی بکات!

لەکاتێکدا زانا کۆمەڵایەتییە ئینگلیزەکان ( ئابووریناسە ـــ سیاسییەکان) لەمیانەی ڕێگەچارەی ئابوورییانەوە کۆمەکیان بە کۆمەڵناسی فەرەنسی دەکرد، ئایدیۆلۆگە ئەڵمانەکانیش

لە ڕێگای فەلسەفییەوە کۆمەکیان پێشکەش دەکرد. ئادەم سمیس[1] و هیگل لەسەرووی ئەو کۆمەککارانەوە دێن. ئەو راچێتانەی لە راستڕەو و چەپڕەوەکانەوە سەبارەت بەوکێشانەوە پێشکەش دەکران کە سەرچاوەی خۆی لە قۆستنەوە بێ سنوورەکەی کۆمەڵگا لەلایەن سەرمایەداری پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەمەوە وەردەگرت، زۆر هەمەڕەنگ بوو. هەرچی لیبرالیزمە کە ئایدیۆلۆژیای ناوەندی پاوانخوازی سەرمایەدارییە، لە هەمووان کرداریتر بوو، لەمیانەی خستنەسەریەك(پێکەوەلکاندن)ەوە توانی سوود لەهەر هێزێك وەرگرێت و وەك بوخچەیەکی پینەکراو سیستەم بنافرێنێت. هەرچی کۆمەڵناسیەکانی هێڵەکانی قالبگەرا راستڕەو و چەپڕەوەکانیشن لەکاتێکدا یان سەبارەت بەرابردوو (لێگەڕینی راستڕەوەکان بۆچاخی زێڕین) یان داهاتوو (کۆمەڵگای خەیاڵی) پرۆژە پێشدەخەن، وەك بڵێی لە سروشتی کۆمەڵایەتی، مێژوو و هەنووکە بێئاگان. کاتێك لەگەڵ مێژوو و ژیانی رۆژانەییش رووبەڕوو دەبوونەوە پارچەپارچە دەبوون. هەرچی ئەو راستییەیە کە هەموویان دیلی بوون " قەفەسی ئاسنین " بوو کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هێدی هێدی ئامادەیکرد و لەمیانەی زەین و شێوازی ژیانی کردارییەوە هەموویانی تێئاخنی. لەکاتێکدا نیچەی فەیلەسوف هەموویان وەك " میتافیزیکگەرلکانی پۆزێتیڤیزم " و "گرگنە خەسێنراوەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری" هەڵدەسەنگێنێت، زیاتر نزیکی حەقیقەتی کۆمەڵگا دەبوویەوە. لەسەرووی ئەو فەیلەسوفە دەگمەنانەوە دەهات کە بۆ یەکەمجار سەرنجیان راکێشایە سەر قووتدانی کۆمەڵگا لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە. سەرباری تاوانبارکردنی، گوایە بە بۆچوونەکانی خزمەتی بە فاشیزم کردووە، ئەو شرۆڤانەشی سەرنجراکێشن کە هەواڵی هاتنی فاشیزم و شەڕە جیهانییەکان دەدات.

زیادبوونی قەیرانە گەورەکان و شەڕە جیهانییەکان بەس بوو بۆ ئیفلاسکردنی کۆمەڵناسی پۆزێتیڤیست و لقی راستڕەو و چەپڕەوی ئەوەرەی لیبرالیزم. خودی ئەندازیارێتی کۆمەڵگاش لەمیانەی فاشیزمی تۆتالیتار و دەسپۆت ناسنامە راستەقینەکەی خۆی ئاشکرا کرد، کە هەرە زێدە وەك میتافیزیکی رووکەشی رەخنەی دەکرد. قوتابخانەی فرانکفۆرت وەك بەڵگەی فەرمی ئەم

[1] ئادەم سمیس (Adam smith): فەیلەسوف و پێشەنگێکی ئابوری - سیاسی و رۆشنگەری ئوسکوتلەندییە، لە ساڵانی(١٧٢٣–١٧٩٠) ژیاوە.بە باوکی ئابوری نوێ دادەنرێت. خاوەنی پەرتووکی "تیۆری هەستە ئەخلاقیەکان"ە.

ئیفلاسەیە. هەروەها قوتابخانەی ئەنالێس و سەرهەڵدانی لاوانی ١٩٦٨ ڕێگای لەپێش چەندین هەڵوێستی کۆمەڵناسیانەی پۆست مۆدێرنیزم کردەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە چەمکی سیستەمی ــ جیهانی سەرمایەداری والرشتاین. قۆناخی زانستێکی کۆمەڵایەتی پارچەپارچەی لەجۆری ئیکۆلۆژی، فێمینستی، ڕێژەگەرایی، چەپگەرێتی نوێ و سیستەمی جیهانی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بێگومان کارەکتەری هەژموونگەرایی سەرمایەی فینانسی دوای حەفتاکانی سەدەی رابردوو هاتە ئاراوە رۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینی. لایەنی ئەرێنی رووخانی هەژموونگەرایی هزری ناوەندگەرایی ئەوروپا بوو. لایەنی نەرێنیشی، مەترسییەکانی پێکهاتنی کۆمەڵناسییەکی پارچەپارچە بوو.

ئەگەر رەخنەکانمان سەبارەت بە کۆمەڵناسی ناوەندێتی ئەوروپا کورت بکەینەوە:

أ ـ سەرباری داوەری و رەخنە پۆزێتیڤیستەکانیان دەرهەق بە ئایین و میتافیزیک خۆشیان لەبوون بەجۆرێك لە ئایین و میتافیزیك زیاتر تێپەریان نەکردووە. پێویستە بەرامبەر ئەمە سەر سوڕماو نەبین. خودی کلتووری مرۆڤ ناچارە میتافیزیك بێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە، دەست نیشانکردنی جیاوازی نێوان میتافیزیکی باش و خراپە.

ب ـ خستنەرووی کۆمەڵگا لەشێوەی دوالیزمەکانی سەرەتایی ــ مۆدێرن، سەرمایەدار ــ سۆسیالیست، پیشەسازی ـ کشتوکاڵی، پێشکەوتوو ـ دواکەوتوو، چینایەتی ـ بێ چین و خاوەن دەوڵەت ــ بێ دەوڵەت زیاتر مەیلی پەردەپۆشکردنی ئەو پێناسەیەی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای هەیە کە نزیك لە راستییە. ئەمجۆرە دوالیزمانە لەڕاستینەی کۆمەڵایەتی دووردەخاتەوە.

ج ـ سەرلەنوێ ئافراندنەوەی کۆمەڵگا، جگە لە خودلاوەندگەرێتی مۆدێرن هیچ واتایەکی دیکەی نییە. راستتر، لەژێر هەر هەڵمەتێکی ئافراندنی نوێدا مەیلی ئافراندنی پاوانێکی نوێی سەرمایە و دەسەڵات ــ دەوڵەت شاراوەیە. هەروەکو چۆن خودلاوەندێتی چاخی ناوین پەیوەستبوونی ئایدیۆلۆژی لەگەڵ مۆنارشییە رەهاکان (پاشایەتی، سەڵتەنەتی، شاهنشاهی)هەیە، ئەندازیارێتی کۆمەڵگای مۆدێرنیش کە وەك سەرلەنوێ ئافراندن هاتۆتە مەیدان، لە راستیدا مەیلی خودلاوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، ئایدیۆلۆژیاکەیەتی.لەم واتایەدا فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم خودلاوەندێتی هاوچەرخە.

---

[٢] قوتابخانەی ئەنالێس(Anneles Ecole): قوتابخانەی پەڕاوە مێژووییەکانە لە گۆڤارێکی ئەکادیمی فەرەنسیدا. بە شێواز و پەیڕەوەکانی سەبارەت بە زانستە کۆمەڵایەتیەکان ناوبانگی دەرکرد و دەرهەق بە زانستی مێژووش جێبەجێی کرد. بە ئامانجی داڕشتنی هەڵوێست سەبارەت بە زانستی مێژوو لە ساڵی ١٩٢٩ لە زانکۆی ستراسبۆرگ دامەزراوە.

د ـ ناشێت شۆڕشەکان وەك چالاكی سەرلەنوێ ئافراندنەوەی كۆمەڵگا شرۆڤە بكرێت. لەنۆخێكی پێچەوانەدا لە خودلوەندگەرێتی پۆزێتیڤیست رزگاریان نابێت. هەڵبەتە بەو رادەیەی كۆمەڵگا لە بارە قورسەكەی سەرمایە و دەسەڵات پاك بكەنەوە دەشێت وەك شۆڕشی كۆمەڵایەتی پێناسە بكرێن.

هـ ـ ناشێت ئەركی شۆڕشگێران وەك ئافراندنی مۆدێلی كۆمەڵگایەك دیاری بكرێت كە پرۆژەیان بۆ داناوە. تەنیا بە رادەی ئەو كۆمەكەی كەوا پێشكەش بە پەرەپێدانی كۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی دەكەن، شایستەی پێناسەكردنی ئەركی تەندروست دەبن.

و ـ ئەو پەیرەو و پارادایمانەی لەسەر سروشتی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا جێبەجێ دەكرێت، ناكرێت لەگەڵ ئەوانە بكرێت بە یەك كە سەبارەت بە سروشتی یەكەم جێبەجێ دەكرێت. لەكاتێكدا هەڵوێستی گەردوونی رەها سەبارەت بە سروشتی یەكەم رێگا لەپێش ئەنجامی (بەڵام بیر لە حەقیقەتێكی رەها ناكەمەوە) نزیك بە راستی دەكاتەوە، ئەوا هەڵوێستی رێژەگەرایی دەرهەق بە سروشتی كۆمەڵگا زیاتر نزیك بە راستییە. چونكە گەردوون نە لەمیانەی باسە گەردوونییە رەهاو ناكۆتای هێڵە راستەكان، نە لەرێگای خڕەكە بازنەییە هاوشێوەو ناكۆتاكان روون دەكرێتەوە.

ز ـ پێویستە رژێمی حەقیقەت لەسەر بنەمای ئەو رەخنانەی پێشدەخرێت سەرلەنوێ رێكبخرێتەوە. بێگومان باس لە ئافراندنی خوداوەندێتییەكی نوێ ناكەم. بەڵام لەو بڕوایەدام كە لێهاتووترین خەسڵەتی ئەقڵی مرۆڤ هێزی بەلوادلگەران و ئاواكردنی حەقیقەتی هەیە.

لەژێر رۆشنایی ئەم رەخنانەدا پێشنیارەكانی خۆم سەبارەت بە سیستەمی زانستی كۆمەڵایەتی پێشكەش دەكەم كە خوازیاری پێناسەكردنی بووم:

(أ) لەجیاتی ئەوەی لەمیانەی پۆلێنەكانی واتای میتۆلۆژی، ئایینی، میتافیزیك و زانستییەوە سروشتی كۆمەڵگا وەك حەقیقەتێكی رەهای گەردوونی پێشكەش بكرێت، واتاداركردنی وەك نەرمترین شێوە هەبوونە بنەڕەتییەكانی گەردوون و هەمەڕەنگییە دەوڵەمەندەكانی گرێدراو بە هەلومەرجی شوێن و كاتەوە، رێگا لەپێش خستنەڕوویكی نزیك لە راستی دەكاتەوە. بەبێ ئاشنابوونێكی چاك بە سروشتی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگاوە هەر شرۆڤە و هەڵمەتێكی گۆڕانكاری كرداری و زانستێكی كۆمەڵایەتی كە ئەنجامبدرێت دەشێت رێگا لەپێش پەرچەكردارو ئەنجامی پێچەوانە بكاتەوە. لە هەڵوێستە ئیلاهییەكانەوە، تا دەگاتە هەڵوێستە پۆزێتیڤیستەكانەوە ئەو گێرانەوەو باسانەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی پێشخراون ئەگەر نەیانتوانیوە بە لوتكە گەیشتنی پاوانەكانی دەسەڵات و سەرمایە بەربەست بكەن، ئەوا پێویستە سەبارەت بە

خزمەتکردنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی ئەرکی دەست لێبەرنەدراویان ئەوەبێت لە ڕێگای ڕەخنەدانێکی ڕیشەدار خۆیان بەشرۆڤەیەکی مرۆییانەتر بگەیەنن.

(ب) کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی فاکتەری بنەڕەتی سروشتی کۆمەڵایەتییە، کە لەلایەك واتای مێژوویی و هەموویێتی پێدەدات، لەلایەکی دیکەشەوە لەناو جیاوازێتیدا نوێنەرایەتی یەکێتییەکەی دەکات کە تایبەتمەندێتی ژیان و هەبوونە بنەڕەتیەکەیەتی. واتە پێناسەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی کارەکتەر بە سروشتی کۆمەڵگا دەبەخشێت، لەناوجیاوازیدا درێژە بە یەکێتییەکەی دەدات، هەروەها گوزارشت لە یەکگرتوویی بناخە و مێژووییبوونەکەی دەکات و ڕۆڵی فاکتەری دیاریکەر دەبینێت. هەرچی سیفەتەکانی سەرەتایی، مۆدێرن، دەرەبەگ، کۆیلەدار، سەرمایەدار، سۆسیالیست، پیشەسازی، کشتوکاڵ، بازرگانی، دراوی، دەوڵەتی، نەتەوایەتی، هەژموونگەرایی..هتد کە سەبارەت بە کۆمەڵگا بەکاردەهێنرێت هیچ یەکێکیان گوزارشت لە چۆنایەتی دیاریکەری سروشتی کۆمەڵگا ناکەن. بەپێچەوانەوە پەردەپۆشی دەکات و دەرەنجامێکی پارچەکراوی واتای لێدەکەوێتەوە، ئەمەش ناوەڕۆکی هەڵوێست و کرداری چەوت سەبارەت بە کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

(ج) گوتەکانی لەجۆری نوێکردنەوە یان سەرلەنوێ ئافراندنی کۆمەڵگا، لەپاڵ ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژییەکەیدا ئۆپەراسیۆنی ئاوالکردنی پاوانە نوێکانی سەرمایە و دەسەڵاتە. مێژووی شارستانی بەو سیفەتەی مێژووی ئەم نوێبوونەوانەیە، مێژووی کەڵەکەبوونی دەسەڵات و سەرمایەیە. ئەو چالاکییە سەرەکییەی پێویستە لەجیاتی ئافراندنی خودلوەندێتی سەبارەت بە کۆمەڵگا دابنرێت، تێکۆشانە بەرامبەر ئەو فاکتەرانەی ڕۆڵ و پەرەسەندنی شانە سیاسی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا بەربەست دەکەن. چونکە ئەو کۆمەڵگایەی بەشێوەیەکی ئازادانە ڕەهەندەکانی سیاسەت و ئەخلاق دەخاتە کار، بەباشترین شێوە بەردەوامی بە پەرەسەندنی خۆی دەدات.

(د) شۆڕش شێوەیەکی چالاکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە تەنیا کاتێك بەشێوەیەکی دژوار بەردەوامبوونی ڕۆڵی ئازادانەی سیاسەت و ئەخلاقی کۆمەڵگا بەربەست بکرێت پەنای دەبرێتەبەر. شۆڕش لەپێناو ئافراندنی کۆمەڵگا، نەتەوە و دەوڵەتی نوێ نییە، تەنیا کاتێك لەپێناو گەیشتنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بە ڕۆڵی ئازادانەی خۆی کەوتەگەڕ، دەشێت لەلایەن کۆمەڵگاوە ڕەوا ببینرێت، پێویستە ڕەوا ببینرێت.

(ھ) بەرادەی ئەو کۆمەکەی پێشکەش بە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی دەکات دەشێت قارەمانێتی شۆڕشگێڕی واتادار بێت. هەر چالاکییەکی ئەم واتایە لەخۆوە نەگرێت، قەبارە و ماوەکەی هەرچییەك بێت، وەك قارەمانێتی شۆڕشگێڕی کۆمەڵگا پێناسە ناکرێت. ئەوەی بەشێوەیەکی ئەرێنی رۆڵی تاکەکان لەکۆمەڵگادا دیاردەکات، کۆمەکیانە لەبەرەو پێشبردنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی.

(و) ئەو زانستە کۆمەڵایەتییەی پێویستە بەقووڵی ئەم تایبەتمەندێتییە بنەڕەتییانەی بکرێتە بابەتی لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوە و پەرەی پێبدرێت، نە دەتوانێت پێشکەوتنی راستەهێڵی گەردوونی رەها، نە خرەکی بازنەیی ناکۆتایی تاقانەیی رێژەیی بەبنەمابگرێت. لەجیاتی ئەم هەڵوێستە قالبگەرا دۆگماییانەی لەدواشیکاردا خزمەت بە رەواکردنی کەڵەکەبوونی چڕبوونەوەی دەسەڵات و سەرمایەی مێژووی شارستانی دەکات، پێویستە زانستێکی کۆمەڵایەتی بەرەوپێشەوە بیات کە گوزارشت لەتەبایی ژیری سۆزداری و ئەنالیتیکی بکات، قالبە وشکەکانی ئۆبژێتی و سۆبژێتی تێپەڕکردبێت و پەیرەوێکی دیالیکتیکی بە بنەمابگرێت کە لەناوبەر نەبێت.

سیستەمی شارستانێتی دیموکراتییە کەبەشێوەی ئەم گریمانانە چوارچێوە پارادایمیی و ئەزموونی (تیۆری و کرداری) یەکەمان پێشەکەشکرد، ئەگەر سەبارەت بە یەکینە بنەڕەتییەکەی جارێکی دیکە تایبەتمەندێتییەکانی وەك سەرەدێڕی کورت پێشکەش بکەین:

١ ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، سەرەکیترین تایبەتمەندێتی کۆمەڵگای مرۆڤە کە پێویستە لە سەرەتایەوە تا کۆتاییهاتنی بەردەوام بەدوایدا بگەڕێن. لەبنەڕەتدا کۆمەڵگا ئەخلاقی و سیاسییە.

٢ ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەجەمسەری دژ بە سیستەمەکانی شارستانی جێگای خۆی دەگرێت کە لەسەر سێیانەی شار ــ چین ــ دەوڵەت ( پێشتریش بونیادی پلەداری ) هەڵکشاون.

٣ ـــ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بەو سیفەتەی مێژووی سروشتی کۆمەڵایەتییە، بە شێوەیەکی تەبا لەگەڵ سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیی گەشە دەکات.

٤ ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ئازادترین کۆمەڵگایە.

بە ئەندازەی کارکردنی شانە و ئۆرگانە سیاسی و ئەخلاقییەکان هیچ میکانیزمێکی دیکەی دیاریکەر جێگای باس نییە کە کۆمەڵگا ئازاد بکات و لەناو ئازادیدا بهێڵێتەوە. هەروەها هیچ یەکێك لە شۆڕش و قارەمانەکان هێندەی رەهەندی سیاسی و ئەخلاقی توانای ئازادکردنی کۆمەڵگایان

نییه. چونکه بەو رادەیەی کۆمەك بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بکەن شۆڕش و قارەمانەکانی دەتوانن رۆڵی دیاریکەر ببینن.

٥ ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگایەکی دیموکراتە. دیموکراسی تەنیا لەسەربنەمای هەبوونی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی واتادار دەبێت کە کۆمەڵگایەکی ئازاد و کراوەیە. کۆمەڵگای دیموکراتی کە تاك و گروپەکان تێیدا بوونە بە سۆبژە، لەبەرامبەردا شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتییە کە هەرە زێدە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەرەوپێشەوە دەبات. راستتر، خۆی لەخۆیدا کارابوونی کۆمەڵگای سیاسی بە دیموکراسی ناودەبەین. بە واتا راستەقینەکەی سیاسەت و دیموکراسی زاراوەی هاوواتان. ئەگەر ئازادی وەك کەش و زەمینەیەك تاوتوێ بکرێت کە تێیدا سیاسەت گوزارشت لەخۆی دەکات، ئەوا دیموکراسیش شێوازی جێبەجێکردنی سیاسەتە لەم گۆڕەپانەدا. هەر بۆیە ناشێت سێیانەی ئازادی و سیاسەت و دیموکراسی لە بناخەی ئەخلاقی بێبەش بن. هەروەها دەتوانین ئەخلاق بەنۆخی بەدامەزراوە بووی نەریتی ئازادی، سیاسەت و دیموکراسیش ناوببەین.

٦ ـ کۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییەکان لەگەڵ گوزارشتی فەرمی هەرشێوەیەکی دەسەڵات، موڵکایەتی و سەرمایە، واتە لەگەڵ دەوڵەت لەناو دژایەتی و ناکۆکییەکی دیالیکتیکی دان. بەردەوام دەوڵەت دەخوازێت لەجیاتی ئەخلاق یاسا، بەڕێوەبەرایەتی بیرۆکراتیش لەجێگای سیاسەت جێگیر بکات. لەهەرنوو جەمسەری ئەو ناکۆکییەی کە بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بووە" سیستەمی شارستانی فەرمی دەوڵەتی و سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی نافەرمی پێشدەکەوێت. دوو نموونەی جیاوازی توێژینەوەی هێماکانی واتا دەردەکەون. ناکۆکییەکان یان زۆر دژواردەبن و شەڕ لەگەڵ خۆیاندا دێنن، یانیش لە رێگای رێککەوتنەوە رێگا لەپێش ئاشتی دەکەنەوە.

٧ ـ ئاشتی لەمیانەی ئیرادەی بەیەکەوە ژیانێکی بێ کوشتن و بێ چەکی نێوان هێزەکانی پاوانی دەوڵەت و هێزەکانی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەدیدێت. لەوە زیاتر کە کۆمەڵگا دەوڵەت لەناوببات یان بەپێچەوانەوە دەوڵەت کۆمەڵگا لەناوببات، نۆخی ئاشتی مەرجدار کە بەرێککەوتنی دیموکراتییانە ناو دەبرێت رەوشێکە لەمێژوودا لە ئارادا بووە. مێژوو نە بەتەواوی وەك سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی دەژیت کە گوزارشتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە، نە بەتەواویش وەك سیستەمی شارستانی دەژیت کە گوزارشتی کۆمەڵگای چینایەتی و دەوڵەتییە. بەشێوەی نۆخێك دەژیت کە پەیوەندی و ناکۆکی چڕ و رەوشەکانی شەڕ و ئاشتی لەناویەکتردان.

لەگەڵ ئەوەی بەلاوەنانی یەکسەری ئەم رەوشە کە بەلانی کەم پێنج هەزار ساڵە بەردەوامە لەمیانەی شۆڕشی بە پەلەوە ، خەیاڵییە، لە هەمانکاتدا ئەم لێشاوە بەردەوامەش وەك قەدەرێك ببینرێت و دەستێوەردانی بۆ نەکرێت، نۆخێکی راستی سیاسی و ئەخلاقی نییە. لەمیانەی دەرککردن بەدرێژ خایاندنی تێکۆشانی سیستەمەکانەوە، ئەو هەڵوێستە تەکتیکی و ستراتیژیانەی گۆڕەپانی دیموکراسی و ئازادی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەرفراوان دەکات، واتادار و ئەنجامگیرە.

٨ ـ پێناسەکردنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی لەرێگای سیفەتەکانی کۆمیناڵ، کۆیلەدار، دەرەبەگ، سەرمایەدار و سۆسیالیست کە بەدوای یەکتردا دێن، لەجیاتی ئەوەی رۆشنکەرەوەبن، رۆڵی پەردەپۆشکردن دەبینن. بێگومان لەگەڵ ئەوەی سیفەتەکانی کۆیلەدار، دەرەبەگ، سەرمایەدار لەکۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیدا جێگایان نابێتەوە، بەلام لەناو رێککەوتنی بە پرەنسیپانەدا دەشێت بەمەودا، سنووردار و بەکۆنترۆڵ نزیکی ئەم سیفەتانە ببێتەوە. ئەوەی گرنگە، نە لەناویان ببەیت، نە لەلایەن ئەوانەوە قووت بدرێیت" بەڵکو لەمیانەی بالابوونی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییەوە بەردەوام هێز و گۆڕەپانەکەیان سنووردار بکرێت. سیستەمە کۆمیناڵ و سۆسیالیستەکانیش بەو رادەیەی دیموکرات بن دەشێت لەگەڵ کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی هاوواتابن. بەلام بە نۆخی دەوڵەتی هاوواتابوون جێگای باس نابێت.

٩ ــ ناشێت کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی ئامانجی بە پەلەی لەجۆری بوون بەدەوڵەت ــ نەتەوە، یان هەڵبژاردنی بژارێکی ئایینی، یاخود لە دەرەوەی دیموکراسی بە دوای رژێمێکی دیکەوە بێت. تەنیا ئیرادەی ئازادی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی مافی دەستنیشانکردنی ئامانج و چۆنییەتی کۆمەڵگای هەیە. هەروەك گفتوگۆ و بریارە رۆژانەییەکان، بریارە ستراتیژییەکانیش ئیرادە و گوزارشتی سیاسی و ئەخلاقی کۆمەڵگا دیاریان دەکات. ئەوەی بنەڕەتییە، توانای گفتوگۆکردن و هێزی بریاردانە. ئەو کۆمەڵگایەی ئەم هێزەی بەدەستەوە بێت، بەتەندروستانەترین شێوە دەتوانێت بژارەکانی خۆی دەستنیشان بکات. هیچ تاك و هێزێك دەسەلاتی ئەوەی نییە بەناوی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییەوە بریاربدات. لەکۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییەکاندا ئەندازیارێتی کۆمەڵگا پەسەند ناکرێت.

کاتێك لەژێر رۆشنایی ئەو پێناسانەوە سەیر بکرێت کە لەزۆر لایەنەوە بەفراوانی پێشکەشم کردن، دەبینرێت کە سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی لەناوەرۆکی خۆیدا وەك بە یەکگرتوویی ئەخلاقی و سیاسی سروشتی کۆمەڵگا وەك رووەکەی دیکەی مێژووی شارستانی فەرمی هەر

هەبووەو بەردەوامی بەبوونی خۆیداوە. واتە سەرباری تەواوی شێوەکانی زوڵم و چەوسانەوەکانی سیستەمی فەرمی جیهان، بەڵام نەتوانراوە رووەکەی دیکەی کۆمەڵگا لەناو ببرێت. هەڵبەتە مەحاڵە لەناوببرێت. چونکە هەروەکو چۆن کاتێك کۆمەڵگای ناسەرمایەداری لە ئارادا نەبێت، سەرمایەداری ناتوانێت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات، ئەوا سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیش نەبێت سیستەمی فەرمی جیهان واتە شارستانیش ناتوانێت بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. پێچەوانەکەی ئەمە راست نییە. واتە بەبێ هەبوونی شارستانی فەرمی، شارستانێتی دیموکراتی وەك سیستەمی لێشاوی مێژوویی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەبێ کۆسپ و تەنانەت بەشێوەیەکی ئاسانتر درێژە بە هەبوونی خۆی دەدات.

وەك پێویستیەکی پێناسەکەی، من شارستانێتی دیموکراتی لەلایەك بە سیستەمێکی هزری و کەڵەکەبوونی فکری دادەنێم، لەلایەکی دیکەشەوە وەك یەکپارچەیی و یەکێتی ئۆرگانە سیاسی و رێسا ئەخلاقیەکان گوزارشتی لێدەکەم. تەنیا باس لە مێژووی هزر یان واقیعە کۆمەڵایەتییەکەی ناو پەرەسەندنی سیاسەت و ئەخلاق ناکەم. بەڵکو بەشێوەیەکی تێکەڵ گفتوگۆی هەردوو بابەتیش لەخۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی یەکپارچەیی بونیاد و باسێکن کە لەلایەن شارستانی فەرمییەوە بەربەرستکراون، هەر بۆیە لەلایەنی مێژوویی و فاکتەرەکانییەوە پێویستی رۆشنکردنەوەیم بینی. سەرە دێڕەکانی دواتر ئەم بابەتانە لەخۆوە دەگرێت.

### ب ـ هەڵوێستی بە پەیڕەو سەبارەت بە شارستانێتی دیموکراتی

پەیڕەوی هەڵوێستی پەرەسەندنی راستەهێڵی گەردوونی رەها لەزانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەلانی کەم هێندەی دۆگماتیزمی ئایینی رێگا لەپێش کێشەکانی تێگەیشتنی راستی دەکاتەوە. دلوەرییەکانی هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ موتڵەقیەتی ئایینی نییە، چونکە دەڵێت: تا ئەبەدو ناکۆتا گەردوون لە دۆخی پێشکەوتندایە، هەرچیەکی لە لەوحی مەحفوزدا تۆمارکراوە تاکە شتە کە رووبدات. هەمووشتێك وەك ئەوەی پێشبینی کراوە روودەدات. بەپێچەوانەی مەزەندەکان پۆزێتیڤیزم دژە ـــ میتافیزیك و دژە ـــ ئایین نییە، بەڵکو قەبەترین ئایینی ماتریالیستییە کە ئارایشتێکی سووکی زانستی بۆ کراوە. راستتر، بتپەرستی مۆدێرنیتەیە. لێکچوونی سەرەکی نێوان هەردوو پەیڕەوی دۆگماتیك، سەبارەت بە هەبوونی هێزێکە کە بە یاسای حوکمڕانی سروشت ناو دەبرێت. تەنیا گوتەی یاساکانی زانست جێگای یاساکانی خوداوەندی گرتۆتەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە گێرانەوەی هەمان باسە. مەترسیدارترین لایەنی پەیڕەوی هزری پۆزێتیڤیستی،

هەڵوێستە داوەریەکانێتی کە هێزی یاسای هەیە. شرۆڤە بوونی نییە. چونکە ئەو تێروانینە حوکمڕانییە پێشوەختەکەی رەهایە، بابەتییە و بۆ هەرکەسێك هەمان واتا دەدات، لەناوەڕۆکدا پێچەوانەی زانستیشە. وەك دەرەنجامی پشتبەستن بە دوالیزمی تیژی سۆبژە ـ ئۆبژە، جێگا بۆ ئەگەری بەهەڵەداچوونیش ناهێڵێتەوە.

هەوڵی چینی بۆرژوازی مایەی تێگەیشتنە کە ئیدیۆلۆژیای چاخی ناوین بە پۆزێتیڤیزم جلوە (ئارایشت) دەکات و خوازیارە وەك فەلسەفەیەکی زانستی و سیکۆلار پێشکەشی بکات. هەڵبەتە شوێنپەنجەی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی پێوەیە کە لە مندالدانییەوە هاتۆتە دونیاوە. تا لەو هەڵوێستە خەیاڵییانە رزگارمان نەبێت کە لەچاخی ناوینەوە تەنانەت بەدرێژایی مێژووی شارستانی لە زهنمان بارکراوە، ئەوا رزگردن لەدیلێتی زهنمان بەدەست شەپۆلی پۆزێتیڤیزمەوە ئاستەمە. ئەم رەوشە جگە لەوەی رەوانبێژیەکی(شارەزایی قسەکردن و چەنەبازی) وشك، بێ ناوەڕۆك و دووبارەبوویەکی زێدەڕۆییانە، بەراستی دادەنێت، دەرفەتی بە پەردەسەندنێکی دیکە نەدا. بەم جۆرە گوتەی " مامۆستا و فەیلەسوف چی بڵێن راستە" جێگای " مەلا چی بڵێت راستە"ی جارانی گرتەوە. ئەم واقیعەیە کە لەژێر بێبەرهەمی و نەزۆکی زهنماندا شاراوەیە. لەم سۆنگەوە" لە ئەنجامدانی تاکە راڤەیەکیش سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵایەتی خۆمان بێبەش بووین. ئەمە رەوشێکی زۆر مەترسیدارە. هەر لەخۆیەوە نابینایی و دیلی فیکرییە. هەرچۆنێك بێت دۆگماتیزمی نابینی لەمیانەی جۆرێك لە هێزە هەلگرەکەی نەریت، هەندێك راستی مێژووییمان بەبیر دێنێتەوە. بەڵام لە پۆزێتیڤیزمدا ئەمەش جێگای باس نییە. دیوارێکی گەورەی نامۆبوون لەنێوان ئێمە و راستییەکانماندا بەرزدەکاتەوە. ئەمەش بەوە دەچێت کە بەبێ بەکارهێنانی چەك (بەبێ بەکارهێنانی مێشك)، هێزی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی رۆژئاوا تەسلیم بگریت. ئاشکرایە تا ئەم دۆگماتیزمە نەشکێندرێت، بەگشتی شارستانی، بەتایبەتیش ناکرێت پارادایمی سەرمایەداری مۆدێرن بشکێندرێت. هەربۆیە بەهێزی شرۆڤەی ئازاد نەگەیشتن. بڕوام بەم بۆچوونەم هەیە: ئایدیۆلۆژیاکان لە چەکە سەربازییەکان زیاتر رۆڵی قەدەخەکاری دەبینن.

کاتێك پرسیاری " ئایا دەتوانرێت شارستانێتی دیموکراتی بکرێت بەسیستەم؟" لەخۆم پرسی، کەم سەرقاڵی ئەم زنجیرە پەیڕەویانە نەبووم. بەڵام کاری هەرە زەحمەتیش، شکاندنی دۆگماکانی سەبارەت بە سۆسیالیزمی زانستی بوو کە باوەڕییەکی زۆرم پێی هەبوو. هەروەك بڵێی شەڕ لەگەڵ خۆتدا دەکەیت و لەدیلێتی دۆگماتیزم رزگارت دەبێت. بەشی هەرە زۆری ژیانم بەم هەوڵ و کۆششانەوە بەسەرچوو.

لەناو ناکۆکییەکی بەمجۆرەدا بووم: لەکاتێکدا هێشتا لەژێر کاریگەری کلتووریکی هەزاران ساڵەی وڵاتی دایکی شۆڕشی کشتوکاڵدا دەژیام، لەلایەکەی دیکەشەوە تێکۆشانی ئاواکردنی کۆمەڵگای دوای سەرمایەداریم دەکرد. ئەگەر بۆشاییە دوازدە هەزار ساڵییەکەی نێوان هەردووکیان شیکار نەکەین، چۆن کۆمەڵگای نوێمان ئاوادەکرد؟ سیستەمی هزرمان بۆ جۆرێك لە زانستی ئاخیرەت گۆڕابوو. ئاشکرایە کە ئەمەش پەیڕەوێکی بەرهەمداری لەهزرمدا جێگیر نەکردبوو. چونکە تەنیا لە ڕێگای کاریگەری دۆگماتیزمەوە دەتوانرێت نەخۆشی بیرنەکردنەوە و چەقین لەبۆچوونە نووسراوەکان، روونبکرێتەوە. هێشتا لە موریدێتی قاڵبە ئایینییەکان رزگار نەببووین، دووچاری بۆرددوومانی پۆزێتیڤیزم بووین کە دەڵێت: تەنیا ئەوەی من دەیڵێم راستە. ئەوکاتە تێگەیشتم کە هێزی بنەڕەتی پاراستنی سیستەمەکان سەرچاوەی خۆی لەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییان وەردەگرێت. لەبەرئەم هۆکارەیە باشتر دەرك بە "نیچە" دەکەم کە تا شێتبوون ململانێی لەگەڵ هێزی ئایدیۆلۆژی ئەڵمانی کرد. ئەگەر چەند حەقیقەتێکی روون سەبارەت بە رۆژئاوا دەزانین، بەهەرحاڵ لەمەدا قەرزداری ئەم ململانێ سەرشێتانەین.

یەکەمین دۆگمایەك کە بەباشی لەژێر کاریگەرییەکەی رزگارم بوو، سەبارەت بەو بۆچوونەی سۆسیالیزمی زانستی بوو کە: کۆیلەداری و کۆمەڵگا چینایەتییەکانی دیکەی وەك پێویستی و ناچارییەکی دوای کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی دەبینێت. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەم دۆگمایەم وەك یاسایەك پەسەندکردبوو. هەروەها لەشکاندنی دۆگمای دووەم درەنگ نەکەوتم کە ناولێنانی کۆمەڵگایە بەچینەکانیەوە و لەگەڵ دوگماکەی تر تێکەڵە. چونکە پێناسەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی لەهەستیارترین شوێنیدا راستی دەشارێتەوە، کۆمەڵگا لەگەڵ سەردارەکانی دەکات بەیەك. بێگومان روون و ئاشکرابوو کە ئەمانە پاشماوەی زەمانێکی دەسەڵاتدار بوون. هەروەها لەهەڵوەشاندنەوەی دۆگمای سێیەمیش زەحمەتیم نەبینی کە گرێدراوی دووانەکەی پێشترە. باس لەو دۆگمایە دەکەم کە قۆناخەکانی کۆمەڵگای چینایەتی بەناچاری و پێشکەوتنخواز دادەنێت. تێگەیشتم کە قۆناخەکانی کۆمەڵگای چینایەتی هەرگیز ناچاری و پێشکەوتنخواز نین، بەڵکو بەپێچەوانەوەیە، بوێری ئەوەم نواند کە وەك گۆڕانکارییەکی هەرە دولکەوتووخواز و کۆت و بەند هەڵیسەنگێنم. ئەنجام، دەرفەتی ئەو باس و گێڕانەوانەی مێژوو رەخسا کە زیاتر لە راستی نزیکمان دەکاتەوە. گونجاوترین پەیڕەو ئەوەبوو کە دوودڵی لەشرۆڤە جیاوازەکان نەکەم، بەڵکو بەپێچەوانەوە وەك هەوڵێکی دەوڵەمەندکردنی واتا هەڵیسەنگێنم. کاتێك لە زۆر بواردا دۆگماتیزمم (پێشداوەری) شکاند، هەڵبەتە هێزی شرۆڤە و

دەوڵەمەندی واتا بەرەوپێشەوە دەچوو. راشکاوانە دەتوانم ئاماژە بەم خاڵە بکەم: مرۆڤ لە کوێ و لە کامە تۆخ و پێگەدابن، ئەگەر نەتوانن کێشەکانی بەردەمیان چارەسەر بکەن، هۆکاری سەرەکی ئەمە بۆ ئاستی سەرەتایی هزریان دەگەڕێتەوە کە بوێری رزگاربوون لە دۆگمای هەزاران ساڵەی و رەمەکەکانیان نیشان نادەن. ترسنۆکێتی هزر لەبناخەی تەواوی ترسنۆکییەکانی دیکەدا هەیە.

کاتێك شارستانێتی دیموکراتیم دەکرد بەهزر، دووەمین خاڵی گرنگ ئەو کەرەستە ئەزموونییە چڕو بەرچەستەیەی دەوروبەرم بوو. بە بەراورد لەگەڵ تێبینیەکان ئەم کەرەستە چەندین قات زیاتر گەواهییان سەبارەت بە مێژوو دەدا. بۆچی خانەدانێتی، تاڵانەکانی زێدە ــ بەرهەم و ناوەندەکانی دەسەڵات بە سیستەم دابنرێت، بەڵام خانە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا خێزان، هۆز، خێڵ، گوندوچینەکانی دەرەوەی دەسەڵات لەناوشار، گەل و نەتەوەکانی نەبوونەتە دەوڵەت بەشێوەیەکی سیستەماتیك هەڵنەسەنگێنرێن؟ بۆچی ئەمانە خۆیان سیستەم پێکنەهێنن، وەك ئایدیۆلۆژیا و بونیاد واتادار نەبن؟

ئەگەر ئەوانەی جێگای هیوامان بوون وەڵامی پێویستی ئەم پرسیارانەیان نەداوەتەوە ، لەوانەیە هۆکار و بیانووی خۆیان هەبێت. چونکە ئاشکرایە ئەم پرسیارانە لەحەقیقەت بێبەش نین. هەرچەندە بەشێوەیەکی سیستەماتیك نەبێت، بەڵام ئەم وەڵامانەش کەم نین کە پارچەپارچە دراونەتەوە. تەنیا ئەوە پێویستە کە بزانین چۆن بەدوای وەڵامدا بگەڕێین.

کاتێك بەرەو لێگەڕینی تازەگەری و شارستانێتییەکی جیاوازدا هەنگاوم هاوێشت، سێیەمین فاکتەر سەبارەت بە پۆتانسێلی ئاواکردنی ئازادانەی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بوو. ئەگەر کێشە زەبەلاحەکان لەسەر یەکتر کەڵەکەبوونە، هەروەها بە هۆی بێکاری و برسێتییەوە مرۆڤ هێزی لەبەربڕاوە، ئەوا دەرفەتی ئاواکردنی سیستەم (ئافراندن، نەك ئەندازیارێتی کۆمەڵگا) لە ئارادایە، تەنانەت پێویستییەکی ژیانی گرنگە: ئەرکێکی ئەخلاقییە. هەڵبەتە لە بنەڕەتدا رەهەند و ئاستی کێشەکان پێویستی شۆڕش دەکەنە رۆژەڤ، شۆڕشیش ئەو بونیادانە دەخاتە رۆژەڤەوە کە دەبنە وەڵام.

چوارەمین فاکتەری لێگەڕینەکەم ئەوەبوو: ئەگەر سیستەمی زاڵ هیچ هیوایەکت پێنابەخشێت، تەنانەت لەجێگای مرۆڤیشت دانانێت و گرنگی بە سادەترین کێشەی ناسنامەکەت نادات و نابێتە چارەسەری، وەك مەرجەکانی بەمرۆڤبوون ئەوەی پێویستە بیکەیت، رێزو ئومێدت بەهێزی ئاواکردنی سیستەمی خۆتەوە ببەستیتەوە. ئەگەر نا لە سفرەی گورگاندا نەك تەنیا ئێسك و پروسکەکانت بۆ نامێنێتەوە، لەوانەیە خۆشت ببیت بەخۆراکیان.

فاکتەری دوایی کە لەوانەیە تایبەت بەخۆم بێت، بەڵام لەو بڕوایەدام کە گشتیشە. ئەویش ئەوەیە: ئەو کەسەی هیوات پێی هەیە ــ تەنانەت دایکیشت بێت ــ لەدۆخێکی وەهادا نەبێت هیچ شتێکت پێشکەشبکات، ئەوا وەك تاکێك لەپشتبەستن بەهێزی خۆت دوودڵی ناکەیت. رادەستی راست و چەپ و رەمەکەکان نابیت. ئەگەر رەوشێکی شایستەی ژیان لەئارادا نەبێت، ئەو کاتە بزانە کە وەك مرۆڤ دەتوانی هێزی ئاواکردنی باشترین، راسترین و جوانترین پیشانبدەیت!

بەگوێرەی شرۆڤە راستەهێڵیەکەی مێژوو" کۆمەڵگای شار کە دوای کۆمەڵگای کشتوکاڵی گوند هەڵکشاوە "دواکوتە" یە. چیرۆکەکانی شارستانی کە لە دەوروبەر و تەوەرەی شار پێشخراوە خودی راستییە. ئەوهێزەی لەشاردا دەستی بەسەر بەڕێوەبەرایەتیدا گرتووە و وەك دەوڵەتی ئایینی خۆی رێکخستووە، وەك چینی دەسەڵاتدار هێزی بزوێنی مێژووە. هەرچییەکی کردوویەتی راست و پیرۆزە: رووداني قەدەرە لەچارەنووسرلوەکەیە. لەم پێناوەدا هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای ئیلاهی بەرزدەکرێتەوە. هەر دەنگێکی جیاوازو پێچەوانە بەخیانەتکردن لە گوتە ئەزەلی ــ ئەبەدییەکان و گوزارشتی ژیانەکەی لە قەڵەمدەدرێت و دووچاری " غەزەبی خودلوەند" دەکرێت. تەواوی کردەوە بێ ئابڕووییەکان (سیستەمە هەرە ریسواکانی فشار و چەوسانەوە)ی زۆرداران، وەك پیرۆزترین گوتەی خودلوەند یان خودلوەندەکان لەزاری راهیبەکانەوە دەبەشێتەوە. ئیتر لەبەرامبەر یاساکانی خودلوەند ملی بەندەکان لە موو باریکترە. تەنانەت سەریشی ببڕدرێت نایەشێت.

رێکخستنی سەرمایە و توندوتیژی کە بەدۆخە ئۆرژیناڵەکەیەوە وەك میتۆلۆژیا یاخود ئایین بەشێوەیەکی قەبە دەکرێتە چیرۆك و پێشکەش دەکرێت، وەك چاخی شار و شارستانی بە گۆڕانکاری و وەرچەرخانی جیاوازدا تێدەپەڕێت و تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. لەگەڵ ئەوەی ناوەرۆك هەمان شتە، بەڵام لەبەرئەوەی لەمیانەی گۆڕینی فۆرم و رەوانبێژیەکەی و پێشکەشکردنەوەی چەند بارەی تەواوی جلوە و دەمامکەکانی کەوتوون، لەبەرامبەر ئەمەدا دوودڵ نییە بە شێوەی فاشیزمی دەوڵەت ـــ نەتەوە خۆی بە ئەبەدی رلگەیەنێت. قەفەسی ئاسنینی بیرۆکراتی کە رێکخستنی توندوتیژی و سەرمایەی شارە و لەگەڵ ئەوانەی لەناویدان، شانبەشانی ئایدز و شێرپەنجە جەستەییەکان، لەمەش مەترسیدارتر تەولوی بونیادەکانی ناوەوەی سروشتی کۆمەڵگا و ژینگە سروشتەکەی بە ئاستی شێرپەنجە گەیەنراوە. هەروەها بۆئەوەی تێبگەین کە ئەم باسانەی لەمیانەی هێڵە پان و گشتییەکەیەوە ئاماژەمان پێکرد زێدەڕۆیی نییە، تەماشاکردنی شەڕەکانی ئەم چوارسەد ساڵەی سیستەمی جیهان (هەرە دووریش پێنج هەزار ساڵ)، داگیرکاری،

نۆخی ئەو شەڕەی تەواوی کۆمەڵگای گرتۆتەوە و رەوشی رۆژانەیی کارەساتەکانی ژینگە بەسە و رۆشنکەرەوەیە.

ئەگەر تەماشای تەواوی شێوەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم بکەین، بە تایبەتیش کاتێك تەماشای گۆڕەپانە فەرمییەکانی بکەین ( ئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەت) دەبینین کە بەمجۆرە خاڵی کۆتایی مێژوو دانراوە. بە واتایەکی تر، سیستەمی سەرمایەداری کە لوتکەی سەردەمی جیهانگیرییە نۆخی ئەبەدی دوا گوتەیە. هەروەکو دەزانین ئەم باسە نوێ نییە، چونکە لەکۆتایی سەردەمی هەر زۆرداری و سەرمایەیەکی گرنگ راگەیاندنەکانی "ئەبەدێتی" لەمجۆرە جێگای باسە. ئەمە ئەو حەقیقەت و راستییەیە کە " زانستەکانی" شارستانی پێنج هەزارساڵە هەزاران کراسییان بە بەردا کردووە و کردوویانە بەپەیرەو. پەیرەو بۆتە حەقیقەت، حەقیقەتیش بۆتە پەیرەو.

کاتێك گوێیان لەچرپەی بانگەشەی هەبوونی دونیا، زانست و میتۆدی جیاوازتربوو، ئەوا شانبەشانی گوتەکانی دۆزەخی، لادەری و کافرێتی، هەرشێوەیەکی سنوورنەناسی " تیرۆر" دەستبەکارە (سەر بڕین شێوازی هەرە سادەیەتی. لەخاچدان، سووتاندن، لەسێدارەدان، ئەشکەنجەی تامردن، کارپێکردنی تامردن، رزاندنی لەبەندیخانەکاندا، کردنی بەژن، شێوە ناکۆتاکانی چەوسانەوە و ئاسیمیلاسیۆن..هتد).

شارستانی ناوەندی هەروەك بڵێی تۆڵە لەکۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند دەکاتەوە و پێنج هەزار ساڵە هەوڵی رووخاندنی دەدات، شاهیدی ئەو راستیەین کە لە ساڵانی ٢٠٠٠دا هەوڵدەدات دوا شوێنپەنجەکانی بسڕێتەوە و بەتەواوی ئەم کۆمەڵگایە لەناو ببات. لە راستیدا وێرانکردنی ژینگە دواترین شێوەی تۆڵەسەندنەوەیە لە کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ. زۆرسەیرە لەجیاتی سروشتی کۆمەڵگای سەرکوت و کپکرلو، لە رێگای کارەساتە هەمەجۆرەکانەوە( بەرزبوونەوەی پلەی گەرما، بێ ئاوی، بەخێرایی توانەوەی جەمسەرە بەستەڵەکەکان و لەناوچوونی جۆرەکان، کارەساتەکانی لافاو و گەردەلوول) سروشتی یەکەم وەڵامی ئەم وێرانکارییانە دەداتەوە. هەندێك جار مرۆڤایەتی (مرۆڤایەتی کپکرلو) دەبێتە لاڵترین سروشت. کێ دەتوانێت نکوڵی لەوە بکات سەرباری ئەوەی تاڵە بەلام راستییەکە؟

بنچینەییترین گۆڕانکاری پارادایمی مێژوو پێویستە لەمبارەیەوە بێت: کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند نەبێت (١٠٠٠٠ پ.ز تا رۆژی ئەمڕۆمان) پاوانخوازێتی دەسەلات و سەرمایەی پشتبەستبوو لە شار پەرە ناسەنێت. لەم خاڵەوە دەتوانرێت بەرەو سەرەکیترین گۆڕانکاری پەیرەو بڕۆین.

پێناسەی " کۆمەڵگای ناسەرمایەدار نەبێت، سەرمایەداری، کەڵەکەبوون و پاوانخوازی سەرمایەداریش نابێت" کە رۆزا لۆکسەمبۆرگ بەشێوەیەکی زۆر رووکەشیانە ئاماژەی پێکردووە، گشتگیرکردنی بەسەر تەواوی مێژوو و شێوەکانی سەرمایە، شێوازێکی راستتری باس و گێرانەوەیە. ئەمە گوزارشتی شیکاری سەرمایەی درێژخایەنی کۆمەڵگای ـ مێژوویییە. مۆدێلی کۆمەڵگای سەرمایەداری پەتی کارل مارکس، سەرەکیترین هەڵەیە کە کردوویەتی. چونکە کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە لەبواری تیۆری و کرداریش مەحاڵە. سەلماندنی سادەیە: بابڵێین لە کۆمەڵگایەکدا تەنیا سەرمایەدار (لەگەڵ بیرۆکراتەکانی) و کرێکار (لەگەڵ بێکاران)هەن. چونکە کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری پەتی بەمجۆرە دەبێت. گریمان سەد یەکینەی کاڵا لەکارگەی سەرمایە بەرهەم هات. بیست و پێنج یەکینە بەرامبەر بە کرێکەیان دەدرێتە کرێکاران. بیست و پێنج یەکینەش بۆ بەکارهێنانی چینی سەرمایەدار بمێنێتەوە. ئەی یەکینەی ئەو پەنجا کاڵایەی ماوەتەوە چی بەسەردێت؟ ئەوانەی دەمێنێتەوە یان دەرزێت یاخود بەخۆرایی بڵاودەکرێتەوە. بەگوێرەی مۆدێلی کۆمەڵگای سەرمایەداری پەتی بەجۆرێکی دیکە نابێت.

رۆزا کاتێك لەم خاڵەود هەڵدەستێت دەڵێت، تەنیا ئەگەر ئەم پەنجا کاڵایە بەئامانجی قازانج بفرۆشرێتە کۆمەڵگا ناسەرمایەدارەکان دەشێت سیستەم هەبێت و بەردەوام بێت، لەکەنارەکانی راستیدا دەخولێتەوە. بەڵام راستینەی کۆمەڵگا لەمە فرلوانترە. هەروەها پێویستە زۆرباش بزانرێت و لەبیرنەکرێت کە قازانج و کەڵەکەبوونی سەرمایەی پشتبەستوو بە قازانج زێدە بەهایەکی کۆمەڵگایەکە بەرامبەرەکە (هەقەکە)ی نەدرلوە. کۆمەڵگای ناسەرمایەدار کێیە؟ لەسەرووی هەمووانەوە کۆمەڵگای مێژوویی کشتوکاڵ ـ گوندە: کۆمەڵگای ژنانە کە لە ماڵەکاندا بەندکراون: توێژی بێکار، هەژار و پیشەکاری شارە کە بەرەنجی خۆی گوزەران دەکات. کاتێك راستییەکان بەمجۆرە بچەسپێنرێت، دەرفەتی شیکارێکی باشتر بۆ شارستانی پێنج هەزار ساڵە و سیستەمی جیهانی ئەم چوارسەد ساڵە دەرەخسێت کە سیستەماتیکترین قۆناخێتی. بەدرێژاریی مێژوو ژمارەی ئەو تورەی وەك دەسەڵات و سەرمایە خۆی رێکخستووە هیچ کاتێك لەناو کۆمەڵگا رێژەی ١٠٪ تێپەڕنەکردووە. لەم سۆنگەوە هەموو کاتێك جەستەی سەرەکی سروشتی کۆمەڵگا لەسەرووی ٩٠٪ بووە.

لەنۆخێکی وەهادا پێویستە سەبارەت بەپەیڕەوەوە بپرسین ئایا بەمێژووکردن و سیستەمکردنی ١٠٪ و دانانی بەسۆبژەی سەرەکی هزر رێگایەکی زانستی و راستترە، یاخود بەمێژووکردن و بەسیستەمکردنی ٩٠٪ زیاتر و دانانی بە سۆبژەی سەرەکی هزر پەیڕەوێکی زانستی

راستترە؟ ئەمە سەرەکیترین واقیعە کە پێویستە بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێین. لەوانەیە بڵێین لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری هێز، زانست و پەیرەو لەژێر پاوانی ١٠٪ دایە زەحمەتە ردوشەکە بەجۆرێکی دیکە بێت. بەڵام لە دوا شیکاردا ئایا ئەم پاوانە لەسەربنەمای خراپکردن و تاڵانکردنی زێدە ـ بەهاکانی کۆمەڵگا ئاوانەکراوە؟ لەبەرئەوەی ڕێکخستەترین و ئایدیۆلۆژییترین گروپە، ئایا ئەم تایبەتیبوونە مافێتی؟ تەنانەت ئەگەر ١٪ پش بێت توندوتیژییەك کە باش خۆی ڕێکخستبێت دەتوانێت بەملیۆنان کەس بخاتە ژێر حوکمڕانی خۆی و بەڕێوەیان ببات. لەوانەیە گوتەکانی خۆی وەك سەرەکیترین زانست و پەیرەو بسەپێنێت. ئایا دەشێت ئەم واقیعە بە واتای حەقیقەت بێت؟ کێ تاقمێك زۆردار و پاوانخواز وەك حەقیقەت رادەگەیەنێت؟ ئەوانەی ئەمە رادەگەیەنن و وەك میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە، زانست و هونەر پێشکەشی دەکەن، بە دەسەڵاتی تۆڕی ستەم و سەرمایەی دەبەستنەوە، ئایا دەتوانن حەقیقەتی (راستی لە ٩٠٪) کۆمەڵگا بگۆڕن؟ زۆر ئاشکرایە کە پێویستە کێشەکە بەمجۆرە بخرێتەڕوو. هیچ هەژموونێکی ئایدیۆلۆژی، زانستی، ئایینی، فەلسەفی و هونەری هێزەکەی بەشی گۆڕینی ئەم راستییە ناکات، پێویستە هێزی بەش نەکات.

کاتێك لەژێر رۆشنایی ئەم پەیرەوە بنەڕەتییە لەبواری بونیادییەوە لە کۆمەڵگای مێژوویی بکۆڵینەوە، بخوازین لە ڕێگای شێوە جیاوازەکانی هزرەوە ( میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی، زانستی و هونەری) بە گوزارشتێکی بگەیەنین، ئەوا رەهەندەکانی حەقیقەت باشتر دەبینرێت و واتادار دەبێت. وەك گێڕانەوەی دوو لایەنەی کۆمەڵگای مێژوویی(واتە لەناو بونیادییەکەیدا لەگەڵ ئۆبژێتی و شێوازی گوزارشت کردن) دەتوانرێت شارستانێتی دیموکراتی بە سیستەمێکی پێگەیشتووتر بگەیەنرێت. هەروەها دەتوانرێت، تەنانەت زەرورەتێکە کە سروشتی کۆمەڵایەتی لەناو مێژوو و گشتگیرییە بەرفراوانەکەیدا بکرێت بە سیستەم. پێویستە ئەم شیکارە سیستەماتیکە لەبناخەی شۆڕشی زانستی و پارادایمی زانستی کۆمەڵایەتیدا جێگیربکرێت.

هەڵوێستێکی بەمجۆرە سەبارەت بە کێشەی پەیرەو سروشتی کۆمەڵگا زیاتر لەناو تەواوی دەوڵەمەندێتی و یەکگرتوویی مێژوویی پێشکەش دەکات. لەتێڕوانینی یەکەمدا دەبینرێت کە:

أ ـ دەشێت کۆمەڵگای بەبێ سەرمایە و دەسەڵات هەبێت، بەڵام سەرمایە و دەسەڵاتی بێ کۆمەڵگا مەحاڵە.

ب ـ دەکرێت ئابووری بێسەرمایە هەبێت، بەڵام سەرمایەی بە بێ ئابووری مەحاڵە.

ج ـ دەشێت کۆمەڵگای بێ دەوڵەت هەبێت، بەڵام دەوڵەتی بە بێ کۆمەڵگا مەحاڵە.

د ـ دەشێت کۆمەڵگای بێ سەرمایەدار، بێ دەرەبەگ و بێ کۆیلەدار هەبێت: بەڵام ناشێت سەرمایەدار، دەرەبەگ و کۆیلەدار بە بێ کۆمەڵگا هەبن.

هـ ـ دەشێت کۆمەڵگای بێ چین هەبێت، بەڵام چینی بێ کۆمەڵگا مەحاڵە.

وـ دەشێت کشتوکاڵ ـ گوند بەبێ بوونی شار هەبێت، بەڵام شار بەبێ گوند و کشتوکاڵ مەحاڵە.

ز ـ دەشێت کۆمەڵگا حقوقی نەبێت، بەڵام کۆمەڵگای بە بێ ئەخلاق مەحاڵە.

خ ـ وەك نموونەی ئەو کەسەی زۆرنا لێدەدات و هەڵیشدەپەڕێت، دەشێت کۆمەڵگا بخرێتە رەوشێکی بێ سیاسەتی و بێ ئەخلاقی. بەڵام ئەو کاتە کۆمەڵگا لەلایەن لێڤی ئەتهانی نوێ (فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە ) پارچەپارچە دەکرێت، بەمجۆرەش ساتی مردنی کۆمەڵگا و مرۆڤ نمایش دەکرێت. ئەمەش ئەو ساتەیە کە جینۆسایدی تێدا ئەنجامدراوە. ئەمە ئەو ساتەیە کە میشێل فۆکۆ مردنی مرۆڤی تێدا راگەیاندووە. هەروەکو فریدریك نیچە گوتوویەتی" ئەمە ئەو ساتەیە کە کۆمەڵگا و مرۆڤی تێدا خەسێنراوە و کراون بەگرگن و مێرووله، واتە ئەو ساتەیە کە کۆمەڵگای وەك جەماوەری مێگەل راگەیاند. ئەمە ئەو ساتەیە کە کۆمەڵگا لەناو " قەفەسی ئاسنین"ی ماکس وێبەردا بەندکراوە !

لەم ساتەدا پێویستە و ناچارییە کە پارادایمی شارستانێتی دیموکراتی بکەوێتە گەڕ:

١ ـ بەگوێرەی ئەوەی کۆمەڵگا بەبێ گوند و کشتوکاڵ بەردەوام نابێت، ئەوا بەرخودانی ئەم توێژە بەرامبەر بەو چەوسانەوە و فشارەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی فەرمی بەردەوامە، تەنیا کاتێك بۆ دۆخی کۆمەڵگای سیاسی وەرچەرخێت بە ئامانجی خۆی دەگات.

٢ ـ بە بێ ئەوەی ببێتە بنکەی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات، دەشێت شار هەبێت. شارەکان کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی ناچاری بینینی رۆڵی بنکەی فشار و چەوسانەوە کراون، رزگاری راستەقینەیان لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتییەکی دیموکرات و گەیشتن بە دۆخی کۆمەڵگای سیاسی شار بەدیدێت. کاتێك شارە زۆر دەوڵەمەندەکانی مێژوو بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی و کۆنفیدراڵی بەرەو پێشتر دەبەن، لە کەڵەکەبوونی بونیادە شێرپەنجەییەکان رزگاریان دەبێت.

٣ ـ پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات کە لەسەر ئابووری ئاولکراون تا بەرتەسك نەکرێنەوە و لەناو نەبرێن، قەیران و کێشە ئابوورییەکان کۆتاییان پێنایەت. چونکە هۆکاری سەرەکی بێکاری، برسێتی، وێرانکردنی ژینگە، جیاوازییە چینایەتییە بێ واتاکان، نەخۆشییە کۆمەڵایەتی و شەڕەکان بۆ هەوڵی گروپەکانی سەرمایە و دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ زەوتکردنی بەشیان لە زێدە ـ بەهاکانی

کۆمەڵگا و دواتریش زیادکردنیان. بەرامبەر تەواوی ئەم کێشە و نەخۆشیانە سروشتی کۆمەڵگاش خۆی بەزەبری نەرمەوە ئامادە کردووە، هەر بۆیە ئەگەر ئامێرەکانی سەرمایە و دەسەڵات سنووردارێش بکرێن، دەتوانێت سەرکەوێت. ئەگەر مێژوو لە روانگەی ئابووری و چینایەتییەوە بنووسرێت و بخوێندرێتەوە، تەنیا لەمیانەی ئەم پارادایمەوە بە واتای راستەقینەی خۆی دەگات.

٤ ـ ئەگەر پاوانی سەرمایە و دەسەڵات لەئارادا نەبێت، لۆخی ئاسایی کۆمەڵگا کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییە. تەواوی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی لەکاتی لەدایکبوونیانەوە تا دەگاتە قۆناخی کزبوون و کوژانەوە ژیانیان لەناو ئەم چۆنایەتییەدا دەست لێبەرنەدراوە. هەرچی قاڵبەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیستییە کە خوازیارن وەك پۆشاکێك بە بەر سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایدا بکەن، گوزارشت لە راستی ناکات. دەشێت بانگەشەی بەمجۆرە هەبن، بەڵام کۆمەڵگای بەمجۆرە بوونیان نییە. چونکە لۆخی بنەڕەتی کۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییە، بەڵام لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژوو لەلایەن پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵاتەوە تەنگەتاوکراوە، چەوسێنراوەتەوە و داگیرکراوە دەرفەتی پێشکەوتنی تەواوی نەبووە.

٥ ـ دەشێت ئەرکی سەرەکی سیاسەتی دیموکراتییانە، لەسەر بنەمایەکی ئازادانە گەیاندنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بێت بە رۆڵ و کارابوونی خۆی. ئەو کۆمەڵگایانەی بتوانن بەمجۆرە چالاك بن، کۆمەڵگای دیموکرات، کراوە و شەفافن. چەندە کۆمەڵگای دیموکراتی بەرەوپێشەوە بچێت، کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیش بەو رادەیە دەتوانێت کارا بێت. ئافراندنی کۆمەڵگاکان لەلایەن "ئەندازیارێتی کۆمەڵگا"وە ئەرکی سیاسەتی دیموکراتییانە نییە. چونکە ئەندازیارێتییەکی بەمجۆرە چالاکی لیبرالیزمە لەپێناو پێکهێنانی پاوانی سەرمایە و دەسەڵات.

٦ ـــ تەواوی پادشایەتی، ئیمپراتۆرییەت، کۆمار، دەوڵەت ـــ نەتەوە و دەوڵەتشارەکانی بەدرێژایی مێژوو بەناوی شارستانی ئاواکراون، بەتاك و کۆش لەناوەرۆکدا شێوەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی سەرمایەن، کە لۆخی سازشکاری و کێبڕکێ یان رلوەستەی یەکسان و هەژموونگەراییان هەیە.

هیچ کاتێك ئامانجی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی گەیشتن بە لۆخی ئەمجۆرە پاوانانە نابێت. بەڵام یان بە شێوەیەکی سەربەخۆ یاخود لەناو ئاشتییەکی مەرجدار دەتوانێت بەتەبایی لە گەڵیاندا بژیت. لەرەوشێکی وەهادا شارستانێتی دیموکراتی و شارستانی دەسەڵاتە فەرمییەکان دەتوانن لەژێر شێوەی جیاوازدا رێککەون. لەبەرئەوەی قۆناخەکانی ئاشتی پشت بەم تەبایی و

ڕێککەوتنە مەرجدارانە دەبەستێت، تەواوی زەمەنەکانی دیکەی مێژوو یان لەناوەوەی کۆمەڵگا یان لەسەرووی بەردەوام لەناو تۆخی شەڕدایە.

٧ ـــ لەبەرئەوەی کۆمەڵگا ناچار نییە بەردەوام پشت بەشەڕەکانی چەوسانەوەی پاوانخوازەکان ببەستێت (لەناوەوە و دەرەوەی) هەر بۆیە پێویستە لەژێر شێوەی جیاوازدا شارستانێتی دیموکراتی خۆی (هەم لەزەمینەی گوند ـ کشتوکاڵ، هەم لەناو ڕەنجدەرانی شار)دا پەرەپێدەدات. مێژوو تەنیا کۆی کەڵەکەبوونی دەسەڵات و دەوڵەتەکان نییە (بەردەوام ٩٠٪ زیاتری هەبوونی سروشتی کۆمەڵگا) بەڵکو چەندین جار لەو زیاتر پڕ لە نموونەکانی شارستانێتی دیموکراتییە. تەواوی سیستەمەکانی خێڵ، هۆزایەتی، خێزان و کۆنفیدراسیۆنەکان، کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی و دیموکراسی شارەکان ( وەکو دەزانرێت بەکاریگەرترین نموونە ئەسینایە)، مانێستەرەکان، تەکیەکان، کۆمینەکان، پارتە یەکسانیخوازەکان، کۆمەڵگا مەدەنییەکان، تەریقەت، مەزهەب، جڤاتی ئایین و فەلسەفەکانی نەبوونەتە دەسەڵات، کۆمەڵەکانی پشتگیری و هاوکاری ژنان، گروپ و ئەنجومەنە لەژمار نەهاتووەکانی هاوکاری کە ناویانمان نەهێناون و تەواوی گروپە کۆمەڵایەتییەکان، پێویستە لەخانەی شارستانێتی دیموکراتی تۆماربکرێن. چەندە جێگای داخە کە مێژووی ئەم جڤاتانە بەشێوەیەکی سیستەماتیك نەنووسراوە. کەچی لە ڕاستیدا گوزارشتی سیستەماتیکی ئەم گروپانە دەشێت مێژووی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بێت.

٨ ـــ لەبەرئەوەی شارستانییەکانی دەسەڵاتی فەرمی پاوانەکانی چەك و سەرمایە و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لەناو یەکتردا بەڕێوە دەبەن، ئایدیۆلۆژیای شارستانێتی دیموکراتی بەردەوام لاواز و بێ سیستەم ماوەتەوە. چونکە لەلایەن دەسەڵاتەوە بەردەوام سەرکوت کراون و شێوێندراون، زیاتریش لەناوبراون. چەندین دانا، زانا، فەیلەسوف، باوەڕمەند و هونەرمەند لەبەرئەوەی ڕادەست نەبوون، بەڵکو گوێڕایەڵی دەنگی ویژدانی ئازاد بوون، قورسترین سزایان بۆ براوەتەوە و بێدەنگکراون. لە ئارادا نەبوونی ئەم مێژووە بەنووسراوی بە واتای نەبوونی نایەت. گەیاندنی شارستانێتی دیموکراتی بە گوزارشتێکی سیستەماتیکی کۆمەڵگای ـ مێژوویی لەسەرووی ئەرکە ڕۆشنبیرییەکانمانەوەیە.

٩ ـ تەواوی بزووتنەوەکانی کۆنفیدراسیۆن (لەئەڵمانیا) و دیموکراسییەکانی شار (لە ئیتاڵیا)، کۆمین و یاخیبوونی لادێییەکان، یاخیبوون و کۆمینەکان (کۆمۆنەی پاریس)ی کرێکاران، ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو (یەك لە سێی دونیا)، پرۆسەکانی ڕزگاری نیشتیمانی (تۆخی نادەوڵەتی و نەبوونی بە دەسەڵات)، پارتە دیموکراسیخوازە لەژمار نەهاتووەکان، کۆمەڵە

مەدەنییەکان، دواترین بزووتنەوە ئیکۆلۆژی و فێمینستیەکان، تەواوی بزاڤە دیموکراتییەکانی لاوان، فێستیڤاڵە هونەرییەکان تا دەگاتە بزاڤە ئایینییە نوێیەکانی دەسەڵات ناکەن بە ئامانج کە تایبەت بە شارستانێتی دیموکراتین، بەرامبەر بە سیستەمی شارستانی دەوڵەت ــ نەتەوەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی ئەم چوارسەد ساڵەی دوایی کە پاوانی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژی، ئیداری، سەربازی و ئابوورییە، لەژێر چەترێکی بەرفراواندا جێگای خۆیان دەگرن، ئەگەر بەتەواوی یەکیشیان نەگرتووە، بەڵام خاوەن سیستەمێکن کە پێویستە بچووک نەبینرێت.

١٠ ــ هەرچەندە سیستەمی دەوڵەت ــ نەتەوەی رۆژگاری ئەمڕۆمان دووچاری کێشەی قورس هاتبێت و درزی تێکەوتبێت، بەڵام لە گۆڕەپان و بواری نەتەوەیی ــ نیشتیمانی، هەرێمی و جیهانگیریدا هێشتا خاوەن سیستەمێکی بەهێزە. لەکاتێکدا دەوڵەت ــ نەتەوەکان (ژمارەیان لە دووسەد زیاترە) لەمیانەی یەکێتییە هەرێمییەکان (یەکێتی ئەورووپا، ئەمریکا ــ کەندا ــ مەکسیک، باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا) و نەتەوە یەکگرتووەکانی جیهانگیری نوێنەرایەتی دەکرێت، بەڵام یەکینەکانی لەجۆری فۆرمی کۆمەڵایەتی جیهانی شارستانێتی دیموکراتی، یەکینە هەمەجۆرەکانی گەلان و زەحمەتکێشان کە نادەوڵەتین، خاوو ناتەواون. ناتەواوی لەبناخەی بونیادی و ئایدیۆلۆژیدایە. لەپێناو نەهێشتنی ئەم ناتەواوییانە پێویستە کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی جیهان، کۆنفیدراسیۆنە دیموکراتییە نیشتیمانیی، هەرێمی و خۆجێییەکان، پارتی و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەمانە ئاوا بکرێت و پێشبخرێت.

### ج ــ گەڵاڵەنامەی مێژووی شارستانێتی دیموکراتی

سەرەکیترین خەسڵەتی سروشتی مرۆڤی ئازاد ئەوەیە کە دەتوانێت مێژووی خۆی ببژێرێت و دەزانێت چۆن لەگەڵ مێژوودا بژیت. چونکە مێژوو شرۆڤە و راڤەی هەبوون و پرۆسەی دروستبوونێتی. چەندە قەوارەو هەبوونی جیاواز هەبێت، ئەوەندە مێژووەش هەیە. بەڵام جیاوازی مێژوو بە واتای نەبوونی یەکێتی مێژوو نایەت. چونکە یەکێتی نەبێت، جیاوازیش هیچ واتایەکی نابێت. واتە جیاوازییەکان گرێدراو بە یەکێتییەوە لەئارادا دەبێت. ئەوەی گرنگە چی نوێنەرایەتی یەکێتی دەکات. کاتێك جۆری مرۆڤ جێگای باس بێت، بێگومان دەشێت بەهرەو تواناکانی ژیری و بەکارهێنانی ئامراز بکرێتە بناخەی یەکێتی. چونکە ئەمانە نەبن، هیچ جیاوازییەکیان لەنێواندا نییە. هەندێك جار دەوڵەت، جارانێك دیموکراسی، رەهەندە ئەخلاقی و سیاسییەکان، شێوەکانی

هزر و رەوشی ئابووری بناخە جیاوازەکانی یەکێتین. ئەوەی گرنگە، دەستنیشانکرنی ئەو خاڵەیە کە کامە جیاوازی لەسەر بنەمای کامە یەکێتی پێشکەوتووە.

کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیمان بە بنەما گرت کە یەکێتی بنەڕەتی شارستانێتی دیموکراتییە. بە ئامانجی روون کردنەوە و دەرك پێکردنی هەوڵی دەستنیشانکردنی پەیرەو و پێناسەکەیماندا. ئێستاش بە کورتی هێڵکاری پەرەسەندنە مێژووییەکەی بکێشین:

أ ـ هەروەکو دەزانین نزیکەی ٩٨٪ ژیانی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بەشێوەی یەکینە ٢٠ ـ ٣٠ کەسییەکان بەردەوام بووە کە کۆمەڵگای کلانی پێدەڵێن. دەتوانین کلان وەك خانەی بنەڕەتی کۆمەڵگا پێناسە بکەین. کۆمەڵگای کلان لەناو تەواوی کۆمەڵگاکانی خێزان، قەبیلە، خێڵ، قەوم و نەتەوە بەشێوەی جیاوازی خانە تائێستاش درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. بەگوێرەی پێناسە سەرەکییەکەمان بۆ سروشتی کۆمەڵگا، کلان کۆمەڵگایەکی ئەخلاقی و سیاسییە ئینجا ئەگەر بەشێوەی زمانی خێڵ یان بەشێوەی زمانی سیمبۆلی لە ئارادا بێت. هەڵبەتە ئەخلاق و سیاسەتێکی زۆر سادە لەکلاندا جێی باسە. بەلام ئەوەی گرنگە هەبوونێتی. چونکە سادەبوون گرنگییەکەی بێواتا ناکات. بەپێچەوانەوە گرنگی و بایەخەکەی دەسەلمێنێت. تەنانەت دەتوانرێت بگووترێت کە بەهێزترین گوزارشتی ئەخلاق لەکۆمەڵگای کلاندا جێگای باسە. وەك بڵێی رۆڵی گوزارشتی غەریزەی خۆرسك دەبینێت. ژیان بەگوێرەی ئەو (ئەخلاق) مەرجێکی ژیانی هەبوونە. ئەو کلانەی ئەخلاقی خۆی لەدەستداوە، پەرتەوازەبووە، پەرتەوازەکراوە یاخود لەناوبراوە. بەلام لەمیانەی رێسا سادەکانەوە تەنیا دەتوانرێت شرۆڤە لەبارەی گرنگییە ژیانییەکەیەوە بکرێت. لەبواری بەراوردکردنەوە دەتوانرێت بگووترێت" سەرباری ئەوەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بەردەوام رێساکانی حقوق پێشێل دەکرێت، بەلام کۆمەڵگا هیچی لێنایەت. بەهۆی محافەزەکاری حقوقەوە لەوانەیە ئەم پێشێلکردنە رۆڵێکی ئەرێنیش ببینێت. بەلام لەکلاندا، تێکچوونی رێسا یان پێشێلکردنی، مانای کۆتایی جڤاتە.

سەبارەت بە سیاسەتیش دەتوانرێت ئاماژە بە هەمان تایبەتمەندێتی بکرێت. کلان دوو کاری سادەی لەجۆری نێچیروانی و کۆکردنەوەی خواردەمەنی هەیە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە تەواوی ئەندامانی کلان هەزار جار لەناوخۆیان گفتوگۆ و دانوستاندیان لەبارەی نێچیروانی و کۆکردنەوەی خواردەمەنی کردووە کە بۆ ئەوان ژیانی بوون، ئەزموونەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتر گۆڕیوەتەوە و هەندێك لەئەندامەکانیان ئەرکدار کردووە، بەمجۆرە هەوڵیانداوە بەرهەمدارترین سیاسەتەکانی نێچیروانی و کۆکردنەوەی خواردەمەنی دەستنیشان و جێبەجێ بکەن. چونکە لەدۆخێکی

پێچەوانەدا ژیان بەردەوام نەدەبوو. چۆنییەتی دیارکردنی خواردەمەنییە گونجاوەکان و کۆکردنەوەیان سەرەکیترین سیاسەت بوو، واتە کارێکی هاوبەش بوو ( سیاسەت وەك کاری هاوبەش پێناسە دەکرێت). لە دۆخێکی وەهادا کۆمەڵگای کلان زۆر سادەیە، بەڵام جڤاتێکی سیاسی ژیانی بوو. یەك رۆژ سیاسەتی نەکردبایە دەمرد. لەبەرئەم هۆکارەیە کە سیاسەت رۆڵی شانەیەکی ژیانی دەبینێت. لەوانەیە سەرجەم تایبەتمەندییەکانی دیکەی هاوشێوەی پریماتەکان (ئاژەڵەکانی نزیك بەمرۆڤ)ی دیکە بێت. تاکە جیاوازی گرنگییان، شانە سادەکەی سیاسەت و ئەخلاقیان بەرەو پێشەوە بردبوو. تەنانەت ئامرازەکانیش، تەنیا لە دۆخی بوونی سیاسەتدا دەکەوێتە گەڕ. گەشەکردنی زمانیش تەنیا لەسەر بنەمایەکی سیاسی و ئەخلاقی بەدیدێت. پێویستە لەبیر نەکەین کە ئەو فاکتەرانەی پێویستی قسەکردنیان خێرا کرد، گفتوگۆ و بڕیاردانی سەبارەت بە جێبەجێکردنی کاربوو. لێرەدا گوتەی" پێویستی خۆراك لەژێر بناخەی سیاسەت و ئەخلاقدا شاراوەیە، لای من بێواتایە. هەڵبەتە ئەمیبیا تاك خانەکانیش پێویستییان بە خۆراك هەیە. بەڵام ناتوانین باس لە ئەخلاق و سیاسەتی ئەمیبیا بکەین. جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ ئەمیبیا، ئەو خەسڵەتەیەتی کە بەردەوام لەمیانەی هەڵوێستە ئەخلاقی و سیاسییە جیاوازەکانەوە پێویستی خواردەمەنی بەرەوپێشەوە دەبات. لەم چوارچێوەیەدا گوزارشتی " ئابووری هەرشتێك دیاری دەکات"ی باوەڕی مارکسیستی هێندە رۆشنکەرەوە نییە. ئەوەی گرنگە، چۆنیەتی دەست نیشانکردنی ئابوورییە. لەجۆری مرۆڤدا ئەم دۆخە پێویستی بە شانەی سیاسی و ئەخلاقی و گۆڕەپانی کۆمەڵگا هەیە.

بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتییە سەرەکیەوە دەتوانین کۆمەڵگای کلان لەسەرووی مێژووی سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی دابنێین و وەك بەردی بناخە جێگیری بکەین. لەملایەنەوە مێژووی سیستەم ٩٨٪ تەمەنی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. هەروەها وەك ئاماژەمان پێکرد تائێستاش کلان بەشێوەی خانەی بنەڕەتی لەجڤاتەکانی خێزان، قەبیلە، خێڵ، قەوم، نەتەوە، نێونەتەوەیی و تەنانەت جڤاتەکانی بان نەتەوەش بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات.

کۆمەڵگای میزۆلیتیك (قۆناخی ناوبەری نزیکەی ١٥٠٠٠ ـ ١٢٠٠٠ ساڵ بەرلەئێستا) و نیولیتیك ( لە ١٢٠٠٠ ساڵ بەرلەئێستا تا رۆژی ئەمرۆمان) بە شێوەیەکی شکۆمەندانە نزیکەی ٢٠٠٠٠ساڵ بەرلەئەمڕۆ لە دەرەنجامی توانەوەی چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندان لە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ــ تۆرۆس پێکهاتن، لەکۆمەڵگای کلان پێگەیشتووتر بوون. ئامرازەکانی دەستیان و سیستەمی نیشتەجێبوونیان بەرەوپێشەوە چووبوو. هەربۆیە یەکەمین شۆڕشی کشتوکاڵ و گوند

لەم قۆناخەدا روویدا. لەگەڵ ئەوەی سیستەمی زاگرۆس ـ تۆرۆس پێشەنگە، لەچەندین جێگەی ئەفرۆ ـ ئۆراسیا کە جڤاتەکانی مرۆڤی تێدا ژیاوە (بەگوێرەی شرۆڤەی من، ئەم پێشکەوتنە لەئاکامی پەلهاوێشتنی کۆمەڵگای نیولیتیکی زاگرۆس ـ تۆرۆس هاتۆتە ئاراوە) پێکهاتەی کۆمەڵگای هاوشێوە دەستپێدەکات. ئەم قۆناخە سەردەمێکی شکۆدارە لە مێژووی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا. چەندین پێشکەوتنی مێژوویی لەجۆری پێکهاتنی شێوە بنەڕەتییەکەی زمانی هێمایی کە تائێستا بەکاردەهێنرێت تا دەگاتە شۆڕشی کشتوکاڵ ( بەئاگاییەوە چاندنی تۆو چنینەوەی،ماڵیکردنی ئاژەڵان)، دروستکردنی گوند، ریشەی بازرگانی، لەخێزانی دایکانەوە تا دەگاتە رێکخستنەکانی هۆز و خێڵەوە هاوکاتی ئەم سەردەمەیە. بێگومان ناوبردنی ئەم قۆناخە بە بەردینی نوێ ئاماژە بەهەبوونی ئامرازەبەردینە پێشکەوتووەکان دەکات. هەروەها کرانەوەی ژیری مرۆڤیش ئەو کاتە سەرسورهێنەرە. هەروەك بڵێی ریشەو بنەماکانی بەکارهێنانی تەواوی ئەو ئامراز و ئامێرانە دانراوە کە تا رۆژی ئەمرۆمان بەکاردەهێنرێت. دووەمین قۆناخی درێژخایەنی مێژووە. ئەو ٢٪ ی ماوەتەوە، یەکیان تایبەت بەم قۆناخەیە. دیسان لەبنەڕەتدا کۆمەڵگا، کۆمەڵگایەکی سیاسی و ئەخلاقییە. هێشتا حقوق و دەوڵەت سەریانهەڵنەداوە. واتە ئاشنای دەسەڵات نەبوون، نایناسن. دایك بەپیرۆز دادەنرێت، سیمبۆلی خوداوەندە ژنیش لەهەلکشاندایە. هەروەها هەنگاو بۆ قۆناخی گۆڕستان و پەرستگا پیرۆزەکان هاوێشتراوە. هێندە بەشێوەیەکی مێژوویی دەژیان، تەنانەت لەگەڵ مردووەکانیان بە یەکەوە لەهەمان شوێن دەژیان. پاشماوەکان ئەم راستییەیان گەیاندۆتە رۆژگاری ئەمرۆمان. چیتر سەرەتایی نین، بەڵکو رووبەڕووی مرۆڤی راستەقینەین.

دەتوانرێت بەمجۆرە دووەمین قۆناخی بنەڕەتی مێژووی شارستانێتی دیموکراتی دەستنیشان بکرێت. ئەم قۆناخە لەمیانەی بەها ساف و پەتییەکانی شارستانێتی دیموکراتی نوێنەرایەتی دەکرێت. لەوانەیە لەلایەن هەندێك هزرەوە هەرس نەکرێت کە لەگەڵ پەرەسەندنی زمانی هێمایی و ئەقڵ کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی لە ئاستی گوند و قەبیلەدا بەشکۆدارترین شێوە دیموکراسی بەخۆیەوە بینیوە. بەڵام راستی بەمجۆرەیە. قۆناخێکی سیاسی و ئەخلاقییە کە دیموکراسییەکەی هەرە ساف و پەتییە. بەڵام کاتێك توانا و دەرفەتەکانی زێدە ـ بەرهەم زیاد دەبێت، ئەم رەوشە سەرەتا رێگا لەپێش فشار و چەوسانەوەی هێزەکانی پلەداری بۆ سەر کۆمەڵگا دەکاتەوە، دواتریش رێگا بۆ فشار و چەوسانەوەی سیستەماتیکی هێزەکانی شارستانی ناوەندگەرایی شار دەکاتەوە.

ب ـ لە چیرۆکەکانی شارستانی (هەموو جۆرە باسێکی میتۆلۆژی، ئایینی، زانستگەرایی) کە بەمێــژووی نووســراو ناودەبرێــت، مێــژوو بــە فــەرمانی خولقێنــەر دەســت پێــدەکات. مێــژووی ئامازەپێکراو مێژووی نزیکەی ئەم پێنج هەزار ساڵەی دواییە. دەتـوانم بڵێم کاتێـك شـیکردنەوەی کۆمەڵناسـی قووڵدەکەمـەوە و لەمیانـەی هەڵوێسـتی هاوشـێوەوە تۆکمـەتری دەکـەم، ئـەوا ـــ بـە دڵنیاییەوە ـ روون دەبێتەوە کە ریشە ئایدیۆلۆژییەکـەی ئـەم گەڵاڵەنامانـەی سـەبارەت بـە مێـژوو پشــت بــە پیرۆزکردنــی فشــار و چەوســانەوە دەبەســتێت. ئــەو کــارەی کــە لەلایــەن رەوتــە زانسـتییەکانەوە کـراوە، بـەناو ئـابووری ـــ سیاسـی رۆژی ئـەمڕۆشمانی لـەناودا ، ئـاواکردن و پەرەپێـدانی ئایدیۆلۆژیایەکـە لەسـەر ئـەو زێـدە ـــ بەرهەمـەی کـە چـۆنایەتی رەنجـی کۆمـەڵگا بەدیهێناوە، تەنانەت لەسەر بەهاکانی ژیانی کۆمەڵگا ئاولکراوە. لێرەدا دەرکـی پێـدەکرێت کـە بـۆ شـاردنەوەی راسـتی هـەوڵێکی مـەزنی ئایـدیۆلۆژی و دژوارتـرین ئاسـتی توندوتیـژی بـەکارهاتووە. ئاولکردنی شار ـ چین ـ دەوڵەت لەهەمانکاتدا سەردەمی بونیادە ئایدیۆلۆژییە مەزنەکانە. ئـەرك و رۆڵـی سـەرەکییان بـە شـێوەیەکی جیـاواز پیشـاندانی ئافرانـدن و پێکهـاتن (تکـوین)ە، لـەناو وێناکردنێکی ئیلاهیدا سەرکەوتنی راهیب، پیاوی بەهێز و بەڕێوەبەر(فەرمانڕەوا) پیشانبدات.

بـەر لـە هەمووشـتێك پێویسـتە مێـژووی شارسـتانێتی دیمـوکراتی ئـەم پـەردەو بەنـدوە ئایدیۆلۆژیانە بەلاوە بنێت. ئەوکاتـە نـەك تـەنیا باشـتر لـەخێزان، کۆمـەڵگای کشـتوکاڵ ـــ گونـد، بونیادەکانی هۆز و خێڵ تێدەگەین، بەڵکو باشتر دەرك بە شـار ـــ چـین ـــ دەوڵـەت و دەسـەڵاتی پلەداری دەکەین کە پێشـتر ئـاواکراوە و تائێسـتا بەردەوامـە، هـەروەها باشـتر دەرك بـە یەکـەمین دڵگیرکردنی ژن دەکەین. گۆڕانکاری پارادایمیش تا رادەیەکی زۆر ئـەم هێـزەی واتـا بەرەوپێشـەوە دەبات.

بێگومان لەدەرەوەی جڤاتەکانی سەرمایەداری پاوانخواز کە بـەدۆخی تـۆڕی شارسـتانی وەك سـێیینەی شـار ـــ چـین ـــ دەوڵـەت گـۆڕاوە، ئەگـەر بەشـێوەیەکی نـاکۆکیش بێـت لەگەڵیانـدا شارستانێتی دیموکراتی لەمیانەی قۆناخێکی نوێ بەردەوام دەبێت.

ئەو کاتە ناکۆکی لەنێوان شار و لادێ دروست بـووە. بـەڵام مـەیلی یـەکتر تـەواوکردنی شار و لادێ لـەپێش و قورسـترە. لـەپاڵ هـەبوونی بـەردەوامێتی شارسـتانێتی دیمـوکراتی لەشـارەکاندا (کۆیلەکان، پیشەکاران، ژنان)، شاریش بەردەوامی خۆی لە لادێکاندا هەیە. بەتایبـەتیش بونیـادی پلەداری کە بەهێزبووە، بەکرێگیراوی دەوڵەت ـ شارن لەلادێکاندا. لە راستیدا نـاکۆکی و پێکـدادان لـەنێوان ئـەم دوو جەمسـەرە کۆمەڵایەتییـە بەڕێوەدەچـێت کـە بەرژەوەندییـە ماددییـەکانیان

جیابۆتەوە. ئیتر پێکدادانە ئایدیۆلۆژی، سەربازی و ئیدارییە دژوارەکانی نێوان شارستانێتی دیموکراتی کە گوزارشت لە هێزەکانی کۆمینال، کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی دەکات، لەگەڵ شارستانی پاوانی دەوڵەت و سەرمایە کە لەسەر بنەمای غەنیمەت و تاڵانکردنی گوند و هۆزەکانی لادێ و کرێکاری کۆیلەکانی شار ئاواکراوە، بەشێوەیەکی چڕ و بەردەوام بەرچاو دەکەوێت. جگە لەمەش بەردەوام شەڕی زەوتکردنی بەشی یەکتر لەناو بەڕێوەبەرانی خودی شار لە ئارادایە. هەروەها شیوەنی شار و ئاوازی داستانەکانی سۆمەر ئاگادارمان دەکەنەوە کە ئەم پێکدادانانە چەندە بە دژواری روویانداوە. دەتوانرێت بگووترێت تارادەیەکی مەزن بونیادی هۆز و خێڵەکان لەژێر پەلاماری شارستانییە بە ریشە شارییەکان شێوەیان گرتووە. واتە بونیادە ئەتنیکییەکانی لەساڵانی ٤٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ پ.ز ئاشنای هەبوونەکەی بووین، شیمانە دەکرێت بەرهەمێکی ئەم قۆناخە بێت. هەروەك زانراوە سۆمەری و میسرییەکان ناویان لەمانە ناوە. سۆمەرییەکان ئەوانەی باکووری باکووری رۆژهەڵاتی خۆیان بە ئۆریان، ئاریان (خەڵکی گرد، شاخ وخاك، جووتیارەکان) ناو دەبەن. ئەوانەی رۆژئاواش بە ئامۆریت، ئامۆری (بە ریشە سامییەکان، عەرەبە ــ سەرەتاییەکانی نەبوونەتە سۆمەری )، گۆت، کاسیت (کاشی) ناودەبەن، میسرییەکانیش ئەوانەی لەبیابانی "سینا"وە هاتوون بە ئاپیرۆ (مرۆڤە تۆزاوییەکانی لەبیابانەوە هاتوون) ناودەبەن. ئەوەش پەسەندکراوە کە ناوی عیبرانی لە ئاپیرۆوە دروستکراوە. بەرزکردنەوەی شورا و دیوار لە دەوروبەری شار و قوللەکان باشترین بەڵگەیە کە هەبوونی کۆمەڵگای بەرامبەر دەسەلمێنێت.

لەدژواری پێکدادانەکانەوە تێدەگەین کە کۆمەڵگا بە ئاسانی شارستانی چینایەتی پەسەند نەکردووە. هەندێك جار سووتاندنی گوند، تەنانەت سووتاندنی ناوەندەکانی شارستانیش بەرچاو دەکەوێت (تۆمارە ئەرکۆلۆژییەکان نموونەی زۆرمان لەوبارەیەوە پێشکەش دەکەن). میزۆپۆتامیا پڕ لەو گرد و تەپۆلکە چەند قاتیانەیە کە ناوەندی نیشتەجێبوون بوون و چەندین جار سووتێنراون. ئەو ئەدەبیات و میتۆلۆژیایەی لەو قۆناخەدا ماوەتەوە، بەشێوەیەکی بەرچاو ئەم راستیانە پیشاندەدات. ئیلیادای هۆمیرۆس وەك ڤێرسیۆنێکی پلە سێ، نەریتی داستانی بەریشە میزۆپۆتامیایی پیشاندەدات. هیسیۆدۆسیش ڤێرسیۆنێکی هاوشێوە پێشدەخات، پەنتائۆنی خودلوەندەکانی سۆمەر بۆ پەنتائۆنی ئۆلیمپۆس دەگۆڕێت. لەنەریتی تەولوی داستانەکانی ئەم قۆناخەدا ئەو شەڕانەی لەکەسایەتی پادشاکاندا بەڕێوەدەچێت شەڕی خودلوەندەکانە. یەکسانبوون و هاوواتابوونی خودلوەند ـ پادشاکان زۆر بەکاریگەرو بەرچاوە. ناو و نازناوەکانی فیرعەون و نەمرود نموونە بەکاریگەرەکانی ئەم هاوواتابوونەن. لەکاتێکدا ئەوەی لەشەڕەکاندا

جوەروانی دەکرا تالآنی ئابووری کۆمەڵگای گوند و بەدیلگرتنیان بوو، بەڵام پەلاماری هاوشێوە بەرامبەر بە هۆزەکانیش جێگەی باسبوون کە بە ئامانجی دیل و شتوومەکی غەنیمەت بوو. هەروەها شارستانییەکان تالآنکردن و بەدیلگرتنی یەکتریان وەك رێگای سەرەکی قازانج و داهات دەبینیەوە. رێککەوتن و جیاوازییەکان تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامی بەو بونیادە داوە کە سەرچاوەی بەرژەوەندی مادیین. هەمووشتێك پشت بە لێکدانەوەی " کێ گەورەترە ؟" دەبەستێت. زۆر ئاشکرایە کە یەکینەیی خوداوەندەکەی ئاسمان لەبنەڕەتدا وەك ئۆخی خەیاڵی گەورەترین پادشایەتی سەر رووی زەوی وێناکراوە. تەنانەت سوڵتانەکانی عوسمانیش کاتێك خۆیان وەك سێبەری خودا (ظل الله) بەناو دەکەن، ئەم راستییە دەسەلمێنێت.

لەم قۆناخە مێژووییەدا پێشکەشکردنی کێشەکان وەك ئەوەی تەنیا بنەمای چینایەتی هەیە، کەموکورییەکی گەورەیە. چینی کۆیلە وەك خزمەتکارە گوێڕایەڵەکانی پەرستگا و تەنانەت وەك پشکۆی جەستەی سەردارەکانیان دەجووڵێنەوە. ئەوانەی شەڕدەکەن جڤاتی خێڵ و هۆزەکان و ئەو کۆیلانەن کە کۆیلایەتی پەسەند ناکەن. هەروەها بەردەوام شەڕی نێوان پاوانخوازەکانیش ئامادایە کە لەپێناو دەستبەسەرداگرتنی بەشی زیاترە. هەروەکو زانراوە لە سالآنی ١٥٠٠ پ.ز ململانێی هەژموونگەرایی نێوان شارستانییەکانی هیتیت، هۆری ــ میتانی و میسر دەستی پێکردووە. سالآنی ١٥٠٠ پ.ز قۆناخی ئاوابوونی یەکەمین شارستانییە ناوەندییەکانە لە رۆژهەلآتی ناویندا. قۆناخی سالآنی ١٥٠٠ ــ ١٢٠٠ پ.ز نموونەی هەڵکشانی یەکەمین هەژموونگەرایی و پێشبڕکێی نێوان شارە شکۆدارە زیادبووەکانمان پێشکەش دەکات. ئەم قۆناخە بەقۆناخێکی زۆر شکۆدارو بەجموجۆڵی مێژوو لە قەڵەمدەدرێت. کۆمەڵگاکانی هۆز، خێڵ و گوندیش بەردەوامی بە پێشکەوتنی خۆیان دەدەن. بۆیەکەمجارە بازرگانی هێندە بایەخدار بووە کە ئیمپراتۆریەتی لە دەوروبەر ئاوابکرێت. ئاشووری و فینیقییەکان لەبنەڕەتدا هێزی خۆیان لەپاوانی بازرگانی وەردەگرت. لەسالآنی ١٥٠٠ پ.ز کاتێك شارستانییەکانی هیندستان و چین یەکەمین هەنگاوەکانی خۆیان هاوێشت، تەولوی ئەوروپا، بەشەکانی دیکەی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمریکا هێشتا لە ئۆخی ئاشنابوون و ژیانکردنی کۆمەڵگای نیولیتیك دابوون. ئەو دوو قۆناخەی کە هەرە زێدە لەمێژوودا مەراقم کردووە" کۆمەڵگای کشتوکاڵ ــ گوندی نیولیتیکی ٦٠٠٠ ــ ٤٠٠٠ پ.ز ، لەگەڵ کۆمەڵگا و ژیانی شاری سالآنی ١٥٠٠ ــ ١٢٠٠ پ.ز. ئافرێنەری، ئۆرژینی چیرۆکە ئەفسانەییەکان و تامپۆی پێکهاتنی ئەم قۆناخە زۆر سەرنجڕاکێشە. لەو بڕوایەدام کە زۆربەی قارەمانێتییە ئەفسانەیی و زلراوەکانی سەبارەت بە خوداوەندێتی لەم قۆناخەوە ماونەتەوە.

ئەو هەڵسەنگاندنانەی بەردەوام سەبارەت بە قۆناخەکانی پێشکەوتن و کات و شوێنی پەلهاوێشتنی شارستانییەکان ئەنجامیدەدەم، بەکورتی دەتوانم بەمجۆرەی خوارەوە ئاماژەی پێبکەم:

١ ـ لەو گۆڕەپانانەی کە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆسی سەرچاوەی دیجلە و فورات لەگەڵ دەشتەکانی بەیەکتر دەگەن خاوەن کەشوهەوای ناوبژییەکی سروشتی و جۆرە دەوڵەمەندەکانی رووەك و ئاژەڵن، کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند کە لەساڵانی ١٥٠٠٠ ــ ١٢٠٠٠ پ.ز دوای کۆمەڵگایەکی شکۆداری نێچیروانی و خۆراك کۆکردنەوە دەستی پێکرد(پەرستگاکەی ئورفا تیشك دەخاتە سەر ئەم قۆناخە کە خاوەن ستوونی چەقێنراوە)، تاساڵانی ٦٠٠٠ پ.ز لەقۆناخی گواستنەوە بۆ رەنجدەری و نیشتەجێبوونی تەواودایە. لەساڵانی نێوان ٦٠٠٠ ــ ٤٠٠٠ پ.ز کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند لە خولقکارانەترین قۆناخی خۆیدایە. لە ٥٠٠٠ پ.ز بەدواوە خۆی هەناردەی هەر لایەك دەکات. کۆچبەرییەکی کەم، بەڵام زیاتر هەناردەی کلتووری جێگای باسە. کلتووری ئەلعوبێد کە لە قۆناخی ٥٠٠٠ ــ ٤٠٠٠ پ.ز لەدەوروبەری کشتوکاڵی ئاودێری لەمیزۆپۆتامیای خواروو لە هەڵکشاندایە هێندە بەهێزبووە سیاسەتی کۆلۆنی لەسەر میزۆپۆتامیای سەروو دەست پێدەکات. ئەو پاشماوە شوێنەوارناسییانە ئۆزراونەتەوە کە هەبوونی پەلهاوێشتنی کۆلۆنییانەی ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز لە میزۆپۆتامیای سەروو دەسەلمێنن. بەڵام کلتووری خودی ناوچەکە هێشتا تایبەتمەندێتی پێشەنگایەتی خۆی دەپارێزێت. سەردەمی ئوروك لەقۆناخی ٤٠٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز هەڵدەکشێت. نوێنەرایەتی لەدایکبوونی شار دەکات. داستانی گلگامێش ئەم پێشکەوتنە ئەفسووناوییە باسدەکات، هەروەها پەلهاوێشتنێکی هاوشێوە بەرەو باکووری ئوروك پیشاندەدات. شیمانە دەکرێت هەردوو قۆناخیش بەرهەمی رستن، دەفر، نیزە و کشتوکاڵیان بەپیت کردووە، بەمجۆرە هەڵمەتی باڵابوونییان خستۆتە دەست خۆیانەوە. قۆناخی ٣٠٠٠ ــ ٢٠٠٠ پ.ز سەردەمی سولالە کلاسیکەکانی ئورە. تایبەتمەندێتییە جیاوازەکەی، زۆربوونی شارەکان و شەڕی بەردەوام و دژواری نێوانیان بوو لەپێناو بەدەستهێنانی بەش.

٢ ـ دەشێت بیر لەوە بکرێتەوە کە قۆناخی نیولیتیکی ناوەندێتی میزۆپۆتامیا بەرەو ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز هەڵمەتی بۆ چین، هیندستان، ئەولوی ئەورووپا و باکوور و رۆژهەڵاتی ئەفریقیا ئەنجامداوە. قۆناخی ٤٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ پ.ز سەردەمی جێگیربوونی تەواوی کۆمەڵگای نیولیتیك بوو لەم گۆڕەپانانەدا. هەروەکو تێبینی دەکرێت جڤاتە نیولیتیکییەکانی بەرەچەڵەك ئەورووپی و قەفقاسیایین لەساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەدواوە شەپۆلێکی پێچەوانە ئەنجامدەدەن. لێشاوی

شەپۆلئاسای مرۆڤە موو زەردو چاوشینەکانی باکوور، بەشێوەی یەکەمین کۆچ و پەلاماری تیرە گەورەکان لەئەنادۆڵەوە تا دەگاتە هیندستان، قۆناخێکی گرنگی سەراوژێربوونی مێژووییە. لێشاوەکان تا ناوەندی شارستانییەکانی میسر و میزۆپۆتامیا درێژبۆتەوە. هەروەها لە ساڵانی ٤٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ پ.ز هەم هۆزە بە ڕیشە سامییەکانی عەرەبستان، هەم هۆزە ئارییانییە شاخاوییەکان شەپۆل بەشەپۆل هێرشیان کردۆتە سەرناوەندەکانی شارستانی.

لەم بزاوتەی پەلهاوێشتنی یەکەمین کۆلۆنیالیزم و دژە ـ کۆلۆنیالیزمی مێژوودا پەرەسەندن لەهەردوو چەشنی شارستانیەت لەئارادایە. لەکاتێکدا توێژە پلەدارەکانی هۆز دەکەونە ناو قۆناخی دەوڵەتبوونەوە، زۆرینەی ئەندامانی هۆزیش دەخرێنە ناو چوارچێوەی چینی کۆیلەوە. جیاوازی لەناو ڕیزی هۆز و خێڵەکاندا دێتە ئارلوە. لەلایەکەوە شارە نوێکانی شارستانی سەرهەڵدەدەن، لەلایەکی دیکەشەوە ڕێکخستن و هاوکاری نێوان هۆز و خێڵەکان بەهێز دەبێت.

٣ ـ لەکاتێکدا لە ساڵانی ٢٠٠٠ ـ ١٥٠٠ پ.ز قۆناخی کلاسیکی سۆمەر و میسر کۆتاییان پێهات، لەقۆناخی خانەدانە نوێکانی بابل، ئاشوور، هۆری ـ میتانی ـ هیتیت و میسردا سەردەمێك جێگای باسە کە پەیوەندی و ناکۆکی نێوان شارستانییەکان زۆر چڕبۆتەوە. بۆ یەکەمین جار قۆناخی شارستانی هەژموونگەرایی ناوەندی دەستی پێکراوە. قۆناخێکی جیاوازی جیهانگیری جێگای باسە. هۆزەکانی بیابان و شاخییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و هێزی هۆزەکانی باکوور کە ئەو فێربوون و ئامرازانەی لەشارستانیان وەرگرتبوو بەرامبەر ناوەندەکانی شارستانی بەکاریان هێنان، بە بێ وچان بەردەوامی بە هێرشەکانیان دەدەن. بۆیەکەمین جار گەڕان بەدوای کانزاو بازرگانی پێکردنی بایەخدار دەبێت. زیادبوونێکی زۆر لە دروستکردنی قەڵا و شوراکان لە ئارادایە. یەکەمین نموونە شکۆدارەکانی قەڵا بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. هەروەها ڕۆڵی بازرگانیش بەلوتکە گەیشتووە. هەڵکشانە مەزنەکەی ئاشوور و فینیقیەکانیش بەرهەمی پاوانە بازرگانییەکانە. لەئاکامی پەلاماری هۆزە شەرکەرەکانی ئیسکیت و دۆرەکان لەباکوور، ئارامییەکان لەباشوور لەماوەی نێوان ساڵانی ١٥٠٠ ـ ١٢٠٠ پ.ز شارستانی زەبرێکی بەهێزی بەرکەوت. قۆناخی ساڵانی ١٢٠٠ ـ ٨٠٠ پ.ز زیاتر سەردەمی دولکەوتنە. تاکە هێزی کە لەسەرپێیان ماوەتەوە ئیمپراتۆریەتی ئاشوورە.

٤ ـ هەرچی گریك ـ ڕۆمایە وەك دواترین گەورە شارستانی چاخی کلاسیك، وەك بڵێی تەواوی میراسی هەردوو شارستانییەکەی (میزۆپۆتامیا و میسر) تا قۆناخی خۆی هەرسکردووە. ئەم قۆناخەی شارستانی کە سەردەمی ١٠٠٠ پ.ز ٥٠٠ زایینی لەخۆوە دەگرێت پەلهاوێشتنی خۆی بەرەو ئاسیا، ئەفریقیا و ئەورووپا بەردەوام کردووە و بەپێکهێنانی چاخێکی کلاسیکی کۆمەکی

خۆی پێشکەش کردووە. لەکاتێکدا سەردەمی میتۆلۆژیا گرنگی خۆی لەدەستدەدات، قەڵەمبازی ئۆرژینی نوێی پێشکەوتنە ئایینی، فەلسەفی، تەنانەت زانستیەکانیش سەریهەڵداوە. ئیمپراتۆریەتی رۆما کە لوتکەی پاوانەکانی دەسەڵات و سەرمایە پێکدێنێت، لەناکامی هێرش و بەرخودانەکانی کرستیانەکانی پارتی هەژاران لەناوەوە و پەلاماری هۆزە کۆچبەرەکانی دەرەوە، لە دەرەنجامی گورزی هێزەکانی شارستانێتی دیموکراتیدا، قۆناخی خۆی و تەواوی چاخی یەکەمی داخستووە.

ج ــ لەناو قۆناخی مێژووییدا ئەوەی بەهۆی پێگەکەیەوە زەحمەتی هەرە زۆری بۆ شارستانییەکان دەخوڵقاند نەریتی ئایینە ئیبراهیمییەکان بووە. تائیستاش جێگای گفتوگۆیە کە ئەم سێ ئایینە بنەڕەتییە لەشارستانییەکی چۆندا جێگیر دەکرێت.

لەسەربنەمای ئەو شیکارانەی دەرهەق بە شارستانی ئەنجامدان زۆر هەوڵی قاڵبوونەوەم سەبارەت بەم نەریتانە دابوو، وەك بزووتنەوەیەکی پارچەپارچە و سازشکار پێناسەیان دەکەم کە لەنێوان هەردوو هێزی سەرەکی شارستانیەتدا هەوڵی پەیڕەوکردنی ڕێگایەکی ناوین دەدەن (هەروەکو بزاڤی سۆسیال دیموکراتی رۆژگاری ئەمڕۆمان). هەرچەندە بەشێوەیەکی سیمبۆلی بڵێم بزووتنەوەیەك بەپێشەنگایەتی هۆزی عیبرانی بەڕێوە دەبرێت، بەڵام لە واتا نەژادییەکەی زیاتر، هەڵسەنگاندنی ئەم ئایینانە وەك بزاڤێك کە لایەنە ئایدیۆلۆژییەکەی بەهێزە لەجێگای خۆیدا دەبێت. لەگەڵ ئەوەی نەریتی ئیبراهیمی لە رووخساردا وەك بزاوتی هۆزایەتی دەخرێتە ڕوو، بەڵام هەڵسەنگاندنی ڕێگای ناوینی تەواوی شارستانییە دەوڵەتی و دیموکراتییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لەگەوهەریدا شاراوەیە. نە تەواو بزاڤێکی چینایەتییە، نە تەواو هۆزایەتییە. هەروەها نە بە تەواوی ئایدیۆلۆژییە، نە تەواو ئەخلاقی و سیاسییە. لەهەموو لایەنێکەوە ڕێگای ناوینە. لە دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیمەوە ( ١٧٠٠ پ.ز، ئەگەر بۆ حەوا ـ ئادەم بگەڕێینەوە، دەتوانین بۆ سەردەمی دەرکەوتنی شارستانی سۆمەر و میسری ببەین) تا دەگاتە شوێنپەنجەکانی لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام ئەم تایبەتمەندێتییەی خۆی پاراستووە. بەڵام هەم بەردەوام ئیلهامبەخشی هەردوو شارستانییەت بووە، هەمیش هێزی خۆی لەمیراسی ئەوان ( مەبەستم هێزە مادی و مەعنەوییەکەیانە) وەرگرتووە. لەم سۆنگەیەوە هەم ئۆستایەتی هەم دوژمنایەتی ئەوانی بەدەست هێناوە و بەم جۆرە ڕێگایان لەبەردەم گۆڕانکاری مێژوویی کردۆتەوە.

ئایینە ئیبراهیمییەکان کە سەردەمی باسە میتۆلۆژییەکانی شارستانییان داخست و ڕۆڵی پێشەنگایەتی چاخی ئایینیان گرتە ئەستۆ، لەژێر رۆشنایی پارادایمی شارستانێتی نوێمان دەتوانرێت باشتر روونبکرێتەوە و دەرکی پێبکرێت. دیارترین باسی چاخی میتۆلۆژی چیرۆکی

پادشا ــ خوداوەندە. پێویستە لەبیر نەکرێت کە زمانی گێڕانەوەی چاخەکانی یەکەمین بە میتۆلۆژیا بارکرابوو. وەك رۆژی ئەمڕۆمان لەم زمانەدا گەڕان بەدوای راسیۆنالیدا هەوڵێکی بێ هوودەیە. میتۆلۆژیای سەردەمی سۆمەر کە لەژێر کاریگەری قوولی ئانیمیزم (ئەو باوەڕییەی لەسەر زیندوویێتی سروشت ئاولکراوە) پێکهاتووە، تۆزێك زیندوویێتی سروشتی (دەشێت بڵێین ئایینی کلانەکان) وەرچەرخاندووە و بۆیەکەمین جار جیاوازییەکی بەشێوەی ئیلاهی و نائیلاهی لە سروشتدا کردووە. لەجیاتی چیرۆکەکانی دایکە ــ خوداوەند کە تەواوی ناوەڕۆکی خۆی لە کۆمەڵگای نیولیتیکی میزۆپۆتامیای سەروو وەردەگرت، راهیبەکانی سۆمەر قورساییان خستەسەر میتۆلۆژیاکانی باوك و خوداوەندی پیاو. لەدەرکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکەی ئەنکیدا رەنگدانەوە ئایدیۆلۆژییە میتۆلۆژییە نوێیەکەی وەرچەرخانە( سەرەتا سیستەمی پلەداری کە قورساییەکەی پیاوە، دواتر دەسەڵاتی بەشێوەی دەوڵەت ) ماددیە گەورەکەی ناو کۆمەڵگا دەبینین. ململانێی نێوان خوداوەندە ژنی ئوروك ئینانا ( رەگی خۆی لە دایکە ــ خوداوەند ستار ــ عەشتاری میزۆپۆتامیایی سەروو وەردەگرێت) و خوداوەندە پیاوی ئەریدۆ ئەنکی (یەکەم خوداوەندی پیاوی شار) لەملایەنەوە زۆر بەکاریگەرە. ئینانا هەوڵدەدات بسەلمێنێت چۆن و لەبەرچی تەواوی مافە ئیلاهییەکان هی دایکە ــ خوداوەندە (١٠٤ ما بەناوبانگەکە، ٩٩ فەزیلەتەکە، بەهرە، داهێنان) بەرامبەر بەمەش ئەنکی وەعزی ئەوە دەدات کە ئەمە گرنگی خۆی لەدەست داوە، وەك بەڵگەی گوێڕایەڵیش داوا دەکات گوێ لەباوکی ( لەکاتێکدا خۆی وەك خوداوەندی ــ باوك ــ پیاو رادەگەیەنێت، ئیتر ئینانای کۆنە خوداوەندەژنی کردۆتە کچ ــ ژنی خۆی ) بگرێت. چەندە بەتەواوی وەعز و ئامۆژگارییە سیکۆلار (عەلمانی)، ئایینی و زانستییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت! من خۆم لەو بڕوایەدام کە یەکەمین خوداوەندی تەواوی ئەم توێژانە ئەنکییە. ئەنکی ئۆرژینالە، ئەوانەی دیکە ڤێرسیۆن (کۆپیا)ی ئەون. بەتایبەتی لەکاتێکدا خوداوەندەکانی ئۆلیمپۆس کە جێگەی خۆیان لە ریزی سێیەم و چوارەمدا دەگرن، لەگەڵ خوداوەندەکانی رۆما چیرۆکەکانی شێوازی میتۆلۆژی دەکوژێنەوە.

هەروەکو دەزانرێت بەگوێرەی ئەو چیرۆکەی لەبارەی حەزرەتی ئیبراهیم دەیگێڕنەوە، لەئەنجامی شکاندنی ئەو بتە ــ خوداوەندانەی لە پەنتانۆنی نەمرودی نورفا هەبوون دەهاوێژرێتە ناو ئاگرەوە، دواتر بەهۆی پەرجوویەکی ئیلاهی گۆلی پیرۆز لەشوێنی ئاگرەکە دروست دەبێت، کاتێك دەرفەتەکانی مانەوە و حەوانەوەی زەحمەت دەبێت بەرەو وڵاتی کەنعان کۆچ دەکات (لە راستیدا لە گۆڕەپانی شارستانی بابل بۆ گۆڕەپانی ژێر کۆنترۆڵی میسر). شیمانە دەکرێت

بوویەرێکی نموونەیی پەنابەری روویدابێت. هەروەها شیمانە دەکرێت ئیبراهیمی رێبەری هۆزێکی خۆجێیی لەگەڵ نەمرودی بەڕێوەبەری شار کەوتۆتە نێو ناکۆکی و ململانێوە. ئاشکرایە کە موڵك و بازرگانی بابەتی ناکۆکی و ململانێ بوون. لەو سەردەمەدا بۆ یەکەمین جار لەنێوان شارستانییەکانی بابل و میسر هەم پێشبڕکێ هەمیش قۆناخی دانوستاندنێکی زیندووی بازرگانی دەست پێدەکات. بەهۆی ئەم کێبڕکێیەوە بەرژەوەندی باوی بەهەزارانی وەك حەزرەتی ئیبراهیم زەبری بەردەکەوێت. ئەمەیە بناخەی ماددی پەنابەرێتییەکە. لەنێوان هەردوو شارستانیدا وڵاتی کەنعان تارادەیەك لەڕۆخی نیمچە سەربەخۆییەك دابوو. لەو قۆناخەی کە چڕبوونەوەی هەژموونگەرایی سەری زیاد دەکات، دەستپێکردنی کۆچ جێگای باسە. شیمانە دەکرێت بوویەرەکە بەسیمبۆلکردنی هەزاران کۆچی هاوشێوەیە بۆ چیرۆکێکی هاوبەشی زمانی قۆناخەکە. سەرجەم نیشانەکانی چیرۆکی ناکۆکی و پێکدادانی میرنشین و هۆزە خۆجێییەکانی گۆڕەپانی نێوان هەردوو شارستانی مەزن ( خانەدانی نوێی بابل و میسر) دەگێڕنەوە کە لەسەردەمی پادشا ــ خوداوەندەکانی نەمرود و فیرعەن بەرژەوەندییەکانیان شڵەژا. هەروەکو چۆن خۆپێشکەشکردنی نەمرود و فیرعەونەکان وەك خواوەند پەسەند ناکەن، کاتێك دەرفەتیش ببینن لەمیانەی شکاندنی بتەکانیان شەرمەزاریان دەکەن. بەکورتی" پێکدادانی بەرژەوەندییە ماددییەکان وەك تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی رەنگدەداتەوە.

تێکۆشانی لە بەرامبەر ئایدیۆلۆژیای بەلانی کەم سێهەزار ساڵەی پادشا ــ خوداوەند ئاسان نییە: بەڵکو پێویستی بەبوێری و بەهرەیەکی مەزن هەیە. گێڕانەوە پەرجوویەکەی چالاکی بەرخودانی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا، گرنگی خۆی لەم راستییەوە وەردەگرێت. چونکە بۆ یەکەمین جارە بەندەکان رووبەڕووی خوداوەند دەبنەوە. ئەمەیە بوویەرە بێ هاوتا و پەرجووەکە. هەم چالاکی ماددی، واتە شکاندنی بت لەئارادایە، هەمیش لێکەڕینی ئایدیۆلۆژیای نوێ جێگای باسە. چۆنیەتی و جێگای نوێبوونەوەی خوداوەندی نوێ، لە بنەڕەتدا چۆنیەتی پێکهێنانی هێلکاری و پرۆژەی ئایدیۆلۆژی هزری خۆی، بابەتی گفتوگۆیەکی زۆر و گەورەیە. ئەمە گفتوگۆیەکە چەندین سەدە بەردەوام بووە. حەزرەتی ئیبراهیم ئەو دەنگەی ئیلهام بەخشێتی یەکەمجار بە " واهەوە (ئەمە ئەوە)" (یاهۆواه) ناودەبات، بەم جۆرە بانگەشەی نوێبوونەوەی خوداوەندی خۆی دەکات. وشەکە لە ریشەی ئاریانی دەچێت. چونکە لەو قۆناخەدا هۆزە ئاریانییەکان لە ئورفا زۆرینەن و دەستپێشخەرییان بە دەستەوەیە. تائێستاش پەیوەندی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ ئەم هۆزانە جێگای گفتوگۆیە. ئەگەرێکی بەهێزە گوتبێتی "واهەوە Wa hewe" و بۆ یاهۆڤا

Yehovaگۆڕابێت. یاهۆڤا یەکەمین خوداوەندی حەزرەتی ئیبراهیمە، شیمانەیەکی بەهێزە ریشەکەی بۆ کلتووری ئاریان بگەڕێتەوە. هەروەکو دەزانرێت ماوەیەکی زۆر دوای چوونیان بۆ وڵاتی کەنعان وەرچەرخان بۆ خوداوەندێتی ئەل، ئولا، ئەڵڵا ئەنجامدراوە.

ئەل بەڕیشە سامییە، لە زەمینە بەرفراوان و بەرینەکەی بیاباندا تایبەتمەندێتی و حەسرەتی یەکێتی و چۆنییەکی هۆز پیشاندەدات. دووەمین ئیلهامی گەورە لای حەزرەتی موسا بە دە فەرمانەکە گوزارشت دەکرێت. بە یەکگەیشتنە ئیلاهییەکەی کێوی توری سینا، لە راستیدا گوزارشت لە لێگەڕینی موسا دەکات سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشە قورسبووەکانی ئەو هۆزەی رێبەرایەتی دەکات. ئەگەر ئەو خاڵە رەچاو بکەین کە دە فەرمانەکە ئەو رێسا نموونەییەن کە هۆزەکە رێکدەخات ئەوا دەتوانین زیاتر شیکارەکە بەرەوپێشەوە ببەین. نەریتەکە لە حەزرەتی عیساشدا نوێ دەبێتەوە. حەزرەتی محەمەدیش بەیەکگەیشتنێکی هاوشێوە لەهەلومەرجی مەککەدا ئەنجامدەدات (یەکەمین سروشی لە ئەشکەوتی "حەڕا"دا وەرگرت). لەپەرتووکە پیرۆزەکاندا باس لە بەیەکگەیشتنی هاوشێوەی چەندین پێغەمبەر دەکرێت. ئاشکرایە کە لەقۆناخە گرنگەکانی ئەو سەردەمەدا رووبەڕووی چیرۆکە نەریتییەکانی هزر و چالاکییە رێپیشاندەرەکان بووینەتەوە. باسەکە بەمجۆرەیە. ئەو دیاردە و رووداوە سروشتی(هەردوو سروشتی یەکەم و دووەم) و کۆمەڵایەتییانەی بەدەقی پیرۆز و شێوازی پێغەمبەرانەی ناودەبەم، بەزمانی گێڕانەوەی قۆناخ گوزارشت دەکرێت.

بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین سەبارەت بە بابەتەکەمان گوزارشت لەقۆناخێکی مێژوویی دەکەن.

١ ــ بەرامبەر بەو دوو شارستانییە سەرهەڵدەدەن کە لەلایەن یەکەمین دوو پادشا ــ خوداوەندی قۆناخ و مێژوو بەڕێوە دەبرێن. یەکەمین یاخیبوونی ئیلاهی بەندەکانە.

٢ ـ گوزارشتێکی ئایدیۆلۆژی نوێ دەخولقێنرێت. بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە پادشا ــ خوداوەندەکانیش مرۆڤی سادەن، هەرچی خوداوەندە مرۆڤ نییە و ئافرێنەری هەمووشتێك ئەوە ( گوتە بەناوبانگەکەی "ئەمە ئەوە" گوزارشت لەم ئیلهامە مەزنە دەکات)، تەنیا ئەو دەبێتە خودا و رەب (سەردار).

٣ ـ ملکەچی تەنیا بۆ ئەو دەکرێت، نەك بۆ پادشا ـ خوداوەند.

پرەنسیپە سەزەکییەکانی ئایدیۆلۆژیای نوێ بەمجۆرەیە. گوزارشتە کورتکراوەکەی ئەم سێ ماددەیە بناخەی تەولوکارییە سەرسوڕهێنەرەکە پێکدێنن کە ئاینی ئیبراهیمی پێدەڵێن. کاتێك

چینی سەروو تەنیا بە ئاواکردنی پاوانی خۆیان نەوەستان، بەڵکو خۆیانکرد بەخوداوەند، توێژە بەرفراوانەکانی کۆمەڵگا، دوای چەندین ئەزموونی مێژوویی لەدژیان دەرکەوتن، پیرۆزی و خوداوەندێتییەکی نزیکتر بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەرەوپێشەوە برد.

روونکردنەوەی ئەم گۆڕانکارییە لە روانگەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییەوە بایەخدارترە. چونکە لەکۆمەڵگای سەردەمی پادشا ـ خوداوەندێتی دووهەزار ساڵ پێشتر (٣٥٠٠ ــ ١٥٠٠ پ.ن)دا کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی زەبرێکی گەورەی بەرکەوت. بەتایبەتیش کاتێك لەجیاتی دایکە ــ خوداوەند و "خوداوەندێتی سروشت" کە لەقۆناخی کلان و هۆزدا گوزارشتی لە پەیوەندییە زیندوو و یەکسان، دڵسۆزی و یەکبوونیان لەگەڵ سروشت دەکرد، میتۆلۆژییای خوداوەندی پیاو باڵادەستکرا کە لێبڕاوانە گوزارشت لەجیاوازی بەندە ـ خوداوەند دەکات و بەخوڵقکارە گەورەکەی زەوی، ئاسمان و دەریا دادەنرێت، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پیشانیدەدات کە لەگۆڕەپانی ئایدیۆلۆژیشدا زەبرێکی گەورە جێگای باسە. وەرچەرخانێکی مەزن لە کلتووری ماددی و مەعنەویدا جێگای باسە. باسە میتۆلۆژییەکان پڕ لەم گوزارشتانەیە، بەڵکو پڕکراوە.

ئاشکرایە کە سێیانەی راهیب ــ پادشا ــ فەرماندە کە بەدرێژایی ئەم قۆناخە مێژووییە تۆڕێکی گەورەی بەرژەوەندی ماددی و پەردەی ئایدیۆلۆژییان لەسەر سروشتی کۆمەڵگا بڵاوکردۆتەوە، زەبرێکی گەورەش لە سروشتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیش دەدات. کاتێك لەمیانەی ئەم پارادایمەوە تەماشای بکەین، ئەوا دەتوانین باشتر دەرك بە کۆمەڵگای قۆناخی دوو هەزار ساڵیش بکەین. چونکە دروستکردنی زارلوە کارێکی زەحمەتە و پێویستی بەرەنجێکی گەورە هەیە. بێگومان ئەو پارادایمەی ئەریتی ئیبراهیمی پێکیهێناوە، لەکاتێکدا سەر لەنوێ بەزارلوەکردنی قۆناخی دووهەزار ساڵەی نەمرود و فیرعەونەکان بەکردەیی دەکات، هەنگاو بۆ باس (ئایین)ێکی مرۆیی و ماقووڵتر دەهاوێژێت. هەڵبەتە باسە ئایینییە نوێیەکەش میتافیزیکە. لە راسیۆنالیزم و زانستی کۆمەڵایەتی رۆژی ئەمڕۆمان زۆر دوورەو جیاوازترە. بەڵام دیمان قەڵەمبازێکی مێژوویی زۆر گرنگە. گەڕانەوەی تەواو بۆ کۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییە بەهێزەکەی سەردەمی کۆن ناکرێتە جێگای باس. بەڵام لەمیانەی دە فەرمانەکەشەوە باش دەرکی پێدەکرێت کە ئایین تەواو وەك ئەخلاق پێشکەشدەکرێت. دە فەرمانەکەی موسا پرەنیسیپی روون و ئاشکرای ئەخلاقین کە بەئایین داپۆشراوە. لایەنی باوەڕییان لەپلەی دووەمدایە و لاوازە. کەواتە ئەو وەرچەرخانە گەورەیەی سەبارەت بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ئەنجامدراوە، لەم قۆناخەدا ئایین لەجێگای ئەخلاق دانراوە. ژیانە سیاسی و ئەخلاقییە سادەکەی جاران بەچەمکی

خودلوەندێك داپۆشراوە كە هەموو لایەكی گەمارۆداوە. لێرەدا داپۆشینی ژیان بە پەردەیەكی ئایینی كاملتر جێگای باسە.

بابەتی سەرەكی كە پێویستی بە لێپرسینەوەو پرسیاركردن هەیە، ئەو سیاسەت و ئەخلاقەی كرلوە بەئایین چەندە دژی شارستانی (دەوڵەت ـ چینایەتی ـ شار)، یاخود خۆی شارستانییەكی نوێی پێكهێناوە یان نا. ئەم رابردووە مێژووییە لەژێر گفتوگۆی شارستانی ئیسلامی ـ عەلمانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا شاراوەیە كە بەتایبەت لە توركیا و رۆژهەلاتی ناوین لەئارادایە. كاتێك ئەو پەرەسەندنانە رەچاوبكەین كە ئایینە ئیبراهیمییەكان تا رۆژگاری ئەمڕۆمان پێیدا تێپەڕیون، دەتوانین وەڵامێكی دوولایەنە بدەینەوە.

ئەو چینەی لەژێر پەردەی ئایدیۆلۆژی نوێ (لەجیاتی ئەوەی خۆیان ببن بەخودلوەند، وەك پەیامبەر، سێبەر و وەكیلی خودلوەند) لە قۆناخی یەكەمدا بەردەوامكردنی راستینەی دەسەلاتی نەمرود و فیرعەون (تەولو وەك باڵی راستڕەوی سۆسیال دیموكراتەكان) بە بنەمادەگرن، بەدوای ئاواكردنی پادشایەتی و میرنشینی خۆجێییدان. بەیەكەوە ئەنجامدانی رێبەرایەتی بازرگانی و هۆز لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە پێگەكەی رۆشندەكاتەوە. دەستنیشانكردنی ئەو خاڵە هێندە زەحمەت نییە كە هەوڵەكانی لەپێناو میرنشین یان پادشایەتییەكی خۆجێییدایە. نایەوێت وەك بەندەیەكی سادەی نەمرود بمێنێتەوە. هەم لەبواری ئایینی هەمیش لەلایەنی سیاسی و ئەخلاقییەوە ئەمە بەسووكایەتی پێكردن دادەنێت. ئەگەری ئەوە بەهێزە كە خودی موسا شازادەیەكی ركابەر بووبێت. لەرێگای پشتبەستن بەو هەزارانەی لەئۆخی نیمچە كۆیلایەتیدا دەژیان، تەولو نەببوون بە میسری و بەریشە عیبرانی بوون، یاخی دەبێت. بەگوێرەی باسەكانی پەرتووكی پیرۆز لەدوای گفتوگۆ و دانوستاندنە سەختەكانی لەگەڵ فیرعەون توانیویێتی لەمیسر جیابێتەوە یان بەنهێنی كۆچ بكات (وەك پێهەڵگرتنە هاوشێوەكەی حەزرەتی محەمەد). چیرۆكی چل ساڵەی بیابان بە ئاواكردنی میرنشینێكی نوێ تێپەڕدەبێت. رێساكە دەگۆرێت. بەدوای "خاكە بەڵێن پێدراوە" خەیاڵكرلوەكاندا دەگەڕێن. هەروەكو دەزانرێت ئەم خەیاڵە لەدەوروبەری ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز لەلایەن پێغەمبەران سامۆیل، داود و سولەیمان لەناوچەی ئیسرائیل ـ فەلەستینی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەكرێت بە واقیع. "سامۆئیل"ی راهیب رێبەرایەتی ئایدیۆلۆژی دەكات. لەدوای ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز چەندین میرنشین و پادشایەتی هاوشێوە ئاوادەكرێن. ئەمەش نموونەی دەوڵەت ـ نەتەوە بچووكەكەی نێوان هەردوو بلۆكە گەورەكەی رۆژگاری ئەمڕۆمان دێنێتەوە یاد. ئەم مەیلە

به دۆخی نموونەیی هاوشێوە بەتایبەتی ئەمرۆ لە ئەمریکای لاتین و چەندین ناوچەی دیکە بەشێوەیەکی جیاوازتر بەردەوامە.

مەیلی دووەم، مەیلی دژە ـ شارستانی توێژە رادیکاڵ و زۆرهەژارەکانە. چونکە ئاگادارن کە شارستانیبوون رەوشی ئەوانی قورستتر کردووە. تەنانەت لەیەکەمین پادشایەتی ئیسرائیل ـ یەهوداش ئەم ناکۆکییە بەشێوەیەکی دژوار روویداوە. رکابەرێتی توندی سامۆئیلی راهیب و شوێنکەوتووەکانی بەرامبەر ئەو رێبەرانەی دەبن بە پادشا تا رادەیەك ئەم راستییە پیشاندەدات. لە دەرکەوتنی حەزرەتی عیسادا رەوشەکە رۆشنتر دەبێتەوە. تەنانەت لەقۆناغی خۆیدا جیابوونەوەی چینایەتی لەناو قەومی عیبرانیشدا قووڵبۆتەوە. نوێنەرانی چینی سەروو کە نۆکەری رۆمان وەك خاوەن تاجی پادشایەتی رۆما، عیسا بەوە تاوانبار دەکەن کە خوازیارە ژێریان بکۆڵێت، هەم بەگرتنی دەدەن (ئەوەی عیسای بەدەستەوەدا، یەهودا ئیسکاریۆت، یەهودییەکی بەکرێگیراوی رۆمایە. سێزدەهەمین حەوارییە) هەمیش دووچاری لەخاچدانی دەکەن. والی نوێنەری رۆما هێندە پێداگری لەسەر لەخاچدانی عیسا ناکات، نوێنەرانی پادشایەتی یەهودا زیاتر داواکاری لەخاچدانن. ئاشکرایە کە عیسا نەك تەنیا لەلایەن عیبرانییەکانەوە، بەڵکو لەلایەن تەولوی ئەو قەومانەی رۆمایی و فارسەکان نەداریان کردوون ( لەسەروویانەوە گریك، ئاشوور و ئەرمەنییەکان کە لەو سەردەمەدا شارستانییان ئاواکردبوو) وەك سیمبۆلی یەکەمین پارتی نێو ـ قەومەکان دەبینرێت کە نوێنەرایەتی هەژاران دەکات. پەرەسەندنی بزاڤێکی نوێ بەرامبەر بەشارستانی کلاسیك جێگای باسە. ئەندامانی ئەم بزووتنەوەیە تەولو بەدرێژایی سێسەد ساڵ بەنهێنی ژیانێکی دژە ـ رۆما، دژە ـ ساسانییان درێژە پێداوە و هەموو جۆرە برسێتی و ئەشکەنجەیەکشیان رەچاوکردووە. دواتر بەڕێوەبەرایەتی سەروو کە پۆلیتیزە بووە ( کۆنسەی راهیبەکان) لەسەردەمی قۆستەنتینی ئیمپراتۆری رۆما بەشێوەیەکی فەرمی رێککەوتن، بەمجۆرە بوو بە ئۆرگانی ئایدیۆلۆژی دووەمین ئیمپراتۆریەتی رۆمای مەزن لە رۆژهەڵات کە لە بێزەنت ئاواکراوە.

بەرامبەر بەمەش بەرخودانێکی دژواری مەزهەبی توێژە رادیکاڵ و هەژارەکان لە ئارادایە. ئەم دۆخەش چەندین سەدەی خایاندووە. ئاریۆس، سریانی و گریگۆرییەکان[٢] گرنگن. ئاشکرایە کە بەدرێژایی ئەم چەندین سەدەیە تێکۆشانی چینایەتی، تەنانەت تێکۆشانی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی قەوم و هۆزەکانی ژێر فشار و چەوسانەوە لەبن پەردەی ئاییندا بەهەموو خێراییەکییەوە

---

[٢] گریگۆرییەکان (Gregoryan): یەکێك لە گەلە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی خواروون، بە زانا و فەیلەسوفەکانی ناسراوە. ئەم گەلە رۆڵیان لە داهێنانی رۆژژمێری گریگۆری (زایینی و هەتاوی) دا هەبووە.

بەردەوام بووە. هەروەها گفتوگۆکانی کرستیانی لەبارەی حەزرەتی عیسا ئاخۆ لە سروشتی خودلوەندە یاخود سروشتی مرۆیی، فاکتەری سەرەکی جیابوونەوەی مەزهەبییە. هەڵبەتە ئەمەش رەگەکەی بۆ میتۆلۆژیای سۆمەری دەگەڕێتەوە. لەکاتێکدا چینی سەروو خۆی وەك رەچەڵەکی خودلوەند رادەگەیەنێت، گوتەکانی" هەرگیز چینەکانی خواروو لە رەچەڵەکی خودلوەند نین و نابێت (تەنانەت ئەو ئەفسانەیەی دەڵێت لەپیسایی خوداوەندەکان دروستکراون گوزارشت لەم راستییە دەکات) بۆماوەیەکی درێژخایەن کاریگەری لە ئایینە ئیبراهیمییەکان کردووە. هەرچی هەڵوێستی حەزرەتی محەمەدە یەکلایی کراوەتەوە کە: مرۆڤ خودلوەند نییە، تەنیا دەتوانێت ببێتە بەندە و پەیامبەری خودلوەند. لە کاتێکدا مەزهەبی هەزاران(ئاریۆسەکان) بانگەشەی ئەوە دەکات کە عیسا لەرەچەڵەکی مرۆڤە، ئەوانەی رۆڵی بەکرێگیراویێتی دەسەڵاتیش دەبینن زیاتر بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لەرەچەڵەکی خودلوەندە. کرۆکی مەسەلەکە پەیوەندی بە جیاوازی چینایەتییەوە هەیە. چونکە تێکۆشانی دژە ـ شارستانی کە لەسالانی ٣٠٠٠ ـ ١٥٠٠ پ.ز لە رێگای باوەڕییە هەرێمی و باوەڕی میتۆلۆژییە فەرمییە وەرچەرخێنراوەکانەوە بەڕێوەدەبرێت، هەم تایبەتمەندی چینایەتی هەمیش تایبەتمەندێتی ئەتنیکییان هەیە. لێرەدا حەسرەتیان بۆ ئازادی روونە.

تێکۆشانە گەورەکانی خێڵ و هۆزە بە ریشە ئاریانیەکانی ناوچەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس، کە لەسالانی ٢١٥٠ پ.ز بنەماڵەی ئەکەدییەکانیان رووخاند و سولالەی گودیای گۆتییان لەجێگای ئاواکرد، هەروەها لەسالانی ١٥٩٦ پ.ز شانبەشانی کاسیتەکان بەیەکەوە لەگەڵ هیتیتەکان رێککەوتن کە دەستیان بەسەر بابلدا گرت، لەگەڵ کۆنفیدراسیۆنی میتانییەکان کە ناوەندەکەیان سەریێ کانی بوو و لە سالانی ١٥٠٠ پ.ز هێزی خۆی بەسەر تەواوی شارەکانی میزۆپۆتامیا و میسردا سەپاندبوو، گوزارشت لەم راستیانە دەکەن.

لەدوای ئەم قۆناخە و پەرەسەندنە مێژووییە نەریتی بەرخودانی ئیبراهیمی پێشکەوت، بەمجۆرەش تا رۆژگاری ئەمڕۆمان بەشێوەی جیاوازتر لەپێکهاتە و هەبوونە مێژووییەکاندا بەکاریگەربووە. لەگەڵ ئەمەشدا دابڕاندنێکی ریشەیی نەریتی ئیبراهیمی لەمیتۆلۆژیا راست نییە. چونکە بەشێکی زۆری ئەو رووداوانەی لە هەرسێ پەرتووکی پیرۆزدا باسکراون (لەسەروویانەوە چیرۆکی ئادەم و حەوا) لەمیتۆلۆژیای سۆمەر و میسریشدا باسکراون. جیاوازییەکانیش گرێدراوی ئەو وەرچەرخان و گۆرانکارییانەیە کە بەگوێرەی بەسەرچوونی زەمەن و قۆناخ هاتۆتە ئاراوە، لەسەرووی هەموویشیانەوە ئەوانەی سەبارەت بە خودلوەند روویانداوە. گرنگ ئەوەیە کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەمیانەی گوزارشتە ئایدیۆلۆژی و ئایینییە خۆجێییەکاندا خۆی سەپاندووە.

چونکە تارادەیەکی مەزن ئایین بەرخودانێکی ئەخلاقییە. بەتایبەتیش نەریتی زەردەشتی گوزارشت لە وەرچەرخانێکی ریشەیی تر دەکات. نەریتی زەردەشتی کە یەکێك لە سەرچاوە بەکاریگەرەکانی سەر نەریتی ئیبراهیمی بوو، باوەرییەکی نیو ئایین ـ نیو فەلسەفەی ئەخلاقی سیاسی کۆمەڵگای ئاژەڵداری و کشتوکاڵی کێوەکانی زاگرۆس بوو. کاتێك لەمیانەی بانگەوازە بەناوبانگەکەی "پێم بڵێ تۆ کێی؟" لێپرسینەوە دەرهەق بەخوداوەندی بە ریشە سامی دەکات، ئەمە رەنگدانەوەی دابڕانی بنەڕەتییە. بۆ یەکەمین جار زاراوەکانی " چاك" و " خراپ" ، "رووناکی" و "تاریکی" لەجێگای پیرۆزی جێگیر دەکات، بەمجۆرە رێگا لەپێش رەوتە ئەخلاقی و فەلسەفییەکان دەکاتەوە کە دواتر گریکەکان تابلێی بەرەوپێشەوەی دەبەن. لەبەشە گەورەکەی مێژووی هیرۆدۆت کە باسی مادەکان دەکات، دەتوانرێت ئەم راستییە ببینرێت کە گریکەکان لە رێی لقی مادەکانەوە زۆرشت قەرزداری نەریتی زەردەشتین. ئەگەرێکی بەهێزە کە تائێستاش نەریتی زەردەشتی لەهۆزە شاخییەکان و کۆمەڵگای کشتوکاڵی ئاریان راستینەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی پیشاندەدات. گوزارشتکردنی راستینەی سیاسی و ئەخلاقی کۆمەڵگایەك کە هێندە کۆیلایەتی تێدا پێش نەکەوتووە، ژیانی کۆمەڵگای ئازادی تێدا بەهێزە، بابەتێکە مایەی تێگەیشتنە.

د ـ شارستانی گریك ـ رۆما کە لەدوا قۆناخی چاخی یەکەمیندا لە ئارادابوو، بەیەکەوە لەناو هەرسێ نەریتدا ژیاوە. لەبواری میتۆلۆژیدا دواترین نوسخەی میتۆلۆژییە رەسەنەکانی سۆمەر و میسرن. لەسەردەمی پادشایەتی ئیسپارتا و ئەتروسك نەریتی میتۆلۆژی لەدواچاخی مەزنی خۆیدا ژیاوە ( زیۆسی ئۆلیمپیۆس، ژۆپیتەری رۆما). لەکاتێکدا لەقۆناخی کۆماری رۆما (٥٠٨ ـ ٤٤ پ.ز ) و دیموکراسی ئەسینا (٥٠٠ ـ ٢٠٠ پ.ز) هەنگاو بە هەنگاو باسی میتۆلۆژی دەکوژایەوە، نەریتی فەلسەفی دەردەکەوێتە پێش. سوقرات و سیسیرۆ[1] خەتیبە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەن. هاووڵاتیانی ئەسینا و رۆما کە بەئاسانی دەستبەرداری نەریتە ئازادەکەی کۆن نابن، هێشتا گرێدراوی نەریتی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقین. تێکۆشانێکی زۆریان لە بەرامبەر سیستەمی پادشایەتی و ئیمپراتۆریەت کردووە. تێکۆشانی ئەسینا بەرامبەر بە ئیسپارتا و ئەرستۆکراتە لەپێشینەکانی رۆماش لەبەرامبەر قەیسەر ئەم راستییە پیشاندەدات. سوقرات و سیسیرۆ

---

[1] مارکس تلیوس سیسیرون(Marcus Tullius Ciciro): شارەزایەکی بواری دەوڵەتییە لە رۆما (١٦٠-٤٣ پ.ز). سەرقاڵی یاسا بووە، فەلسەفە و هونەری رەوانبێژی خوێندووە، وەك خەتیبێکی بە کاریگەر ناسراوە. لەجیاتی گفتوگۆی رەها لە فەلسەفەکەیدا گرنگی بە ئەگەرەکان دەدات، بەڵام لە بواری ئەخلاقدا دۆگماتیك بووە.

فەیلەسوفی ئەخلاق و فەلسەفەن. ناوە گرنگەکانی یەکەمین باوەڕییەکانی دەرهەق بە تیۆری ئەتیك و سیاسەتی دیموکراتیانەن. ئەگەر هێزی ئەسینا بۆ تەواوی کۆمەڵگاش نەگوازنەوەو بڵاوی نەکەنەوە، بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نییە کە هەندێکیان لە نەریتی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی وەرگرتووە کە تائێستاش رەگی بەهێزیان هەیە. ناتوانرێت دەزگا سنووردارەکەی کۆیلایەتی لەگەڵ جەماوەرە بەهێزەکەی هاوولاتییە ئازادەکانی شار و لادێکان بەراورد بکرێت. لەم سۆنگەیەوە" رۆڵیان لەبەرەوپێشبردنی فەلسەفەکانی سەبارەت بە کۆمار و دیموکراسی گرنگە. شکستهێنانی کۆمارێتی رۆما و دیموکراسی ئەسینا بەرامبەر ئەزموونی ئیمپراتۆریەتەکانی ئەگستۆس و ئەسکەندەر گوزارشت لە دولکەوتنێکی جددی دەکات. پێویستە لەبیر نەکرێت بەها نەریتییەکانی کە لەسەردەمی رۆما و ئەسینای کلاسیکدا مابوونەوە بەشی زۆریان بەرهەمی کۆمار و دیموکراسی بوون. بۆ یەکەمین جار لەمێژووی نووسراودا رووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەگەر تەواوی کۆمەڵگاکانیش نەبێت، بەڵام کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی لەمیانەی کۆمار و دیموکراسییەوە باشتر گوزارشت کراون. بۆئەوەی بەتەواوی گوزارشت بکرێن پێویستە دیموکراسی نوێنەرایەتی تێپەڕبکەن و لەناو دیموکراسی بەشداریکردنی راستەوخۆدا[°] بژین.

کرستیانی کە نەریتی سێیەمە لە یەکەمین قۆناخدا رۆڵی لە ئیمپراتۆریەتدا رووخێنەربوو. تا کاتی رووخانی رۆما (٤٧٦ زایینی) لەگەڵ پەلامارەکانی هۆزی جێرمەن رۆڵی توخمێکی بەهێزی شارستانێتی دیموکراتی دەبینن. بەڵام لەگەڵ هەڵکشانی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی رۆڵی نوێنەرێکی پاشڤەڕۆی شارستانی فەرمی دەوڵەتی دەبینێت. بەڵام نوێنەرایەتیکردنی لەرێگای مەزهەبە رکابەرە بەهێزەکانەوە پیشانیدەدات کە لەپەرەسەندنی شارستانێتی دیموکراتیدا کرستیانی بەردەوامی بە رۆڵی ئەرێنی خۆی دەدات.

ئەنجام" سەرباری ئەوەی سیستەمی شارستانی کلاسیك لەسەرینەمای پشتبەستن بە سێیانەی سێ هەزار و پێنج سەد سالی شار ــ چین ــ دەوڵەت (تۆڕی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات) هەنگاو بە هەنگاو کارەکتەری هەژموونگەرایی ناوەندی خۆی بەهێز دەکات، بەڵام دیسان هەرەسهێنانی لەناکامی بەرخودانی کرستیانی دژە ــ شارستانی و پەلاماری هۆزە

---

° دیموکراسی بەشداریکردنی راستەوخۆ: شێوەیەك لە شێوەکانی دیموکراسییە. تەڵەمرمو و دەسەڵاتی بڕیاردان لەلایەن ئەنجومەنەکانەوە بەڕێوە دەکرێت کە راستەوخۆ هاوولاتیان جێگای خۆیان تێدا دەگرن. ئەم ئەنجومەنە فەرمانی ئیداری دەردەخات، یاسا دادەنێت، بەرپرسان هەڵدەبژێرێت و بێ ئەرکیان دەکات.

(جێرمەن، هون، فرانك[٦]) دژە ـ شارستانییەکان کە پێویستە بەدوو توخمی شارستانێتی دیموکراتی دابنرێن، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئاراستەی رەوڕەوەی مێژوومان پیشاندەدات. خراپبوونەکانی چینی سەروو و دروستکردنی شارستانی کلاسیك لەهەناوی شارستانێتی دیموکراتیدا ئەم راستییە ناگۆڕێت. پێویستە لەبیر نەکەین کە ئێستاش گوڕەپان و شارەکانی شارستانی کلاسیك لەدۆخی دوورگەکانی ناو ئۆقیانووسی هێزەکانی (رێکخستنی هۆز، قەوم، ئایین، مەزهەب و پیشەکارانی شار) دیموکراتیدان. واتە مرۆڤایەتی دەستبەرداری کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی نەبوو. شەڕی هەزاران ساڵیش لەنزیکەوە پەیوەندی بەم راستینەوە هەیە. لەبنەڕەتدا ئەوەی لەژێر دیمەنی ئاییندا دەخوازێت بەردەوامی بەخۆی بدات، راستینەی هەبوونی مەیلی ئازادی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییە سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵگا. ئەم دەستنیشانکردنە گرنگە !

هـ ـ کێشەی سەرەکی سەبارەت بە ئیسلام کە دواترین گەورە ئایینی ئیبراهیمییە ئەوەیە، ئایا بەردەوامییەکی شارستانییە کلاسیکییەکانە، یاخود دەنگێکی بەهێزی شارستانێتی دیموکراتییە، لەو بڕوایەدام کە ئەم گفتوگۆیە تائێستاش چارەسەر نەبووە. ئەو شارەی حەزرەتی محەمەد قەڵەمبازی خۆی تێدا ئەنجامدا واتە مەککە، لەسەربنەمای بازرگانی دامەزراوە. بەگوێرەی خۆی خاوەن چەندین گوڕەپانی بەرفراوانە. لەو شوێنەیە کە رێگاکانی بازرگانی باکوور ـ باشوور، رۆژئاوا ـ رۆژهەڵات بەیەکتری دەگەن. رۆڵی بازارێکی ناوەندیش دەبینێت کە هۆزە عەرەبییەکان تێیدا بەیەکتری دەگەن و دانوستاندنی تێدا دەکەن. تەنیا ئالوگۆڕی کاڵاکان جێی باس نییە، بەڵکو هزر، سیمبۆلی خوداوەندەکان و کۆیلەشی تێدا ئالوگۆڕ دەکرێت. ئەو شوێنەیە کە ئایینی نەریتی ئیبراهیمی، تەنانەت ئایینەکانی نەریتی میتۆلۆژی و رۆحگەراییش تێدا دەنگدەداتەوە. حەج ناوەندی سەرلێدانە. ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی کەیەکێك لەو ئیمپراتۆریەتانەی سەردەمی لەدایکبوونی حەزرەتی محەمەد بوو، لەدۆخی تێپەڕبوونی چاخی یەکەم بۆ چاخی ناویندا بوو و لەباکوور تا شام هاتبووە خوارەوە، لەژێر قەڵەمڕەوی خۆیدا لقی فەرمی کرستیانیشی لەخۆوە

[٦] فەرەنجەکان یان فرانکەکان(Frank): گروپێکی هۆزە رۆژئاواییەکان بوون، رێککەوتنێکیان بە ناوی هاوپەیمانێتی هۆزە جەرمەنیەکان پێکهێنا. لە ساڵانی٢٦٠دەربازی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆما بوون، میرنشینێکی نیمچە سەربەخۆیان ئاواکرد. دواتر بوون بە ئیمپراتۆریەت و بەشێکی گەورەی ئەورووپای رۆژئاوایان خستە ژێر قەلەمڕەوی خۆیانەوە. پەسەندکردنی ئایینی کرستیانی لەلایەن کلوفیسی یەکەمەوە بوو بە خاڵێکی وەرچەرخان لە کیشوەری ئەورووپا. پادشایەتی فەرەنجەکان بوو بە دوو بەش: پادشایەتی فرەنجیای رۆژهەڵات کە دواتر ئەڵمانیای پێکهێنا، هەروەها پادشایەتی فرەنجیای رۆژئاوا کە دواتر فەرەنسای پێکهێنا.

دەگرت. راهیبە سریانییەکانیش زیاتر لەپێگەی رکابەرێتیدابوون و خێراییان بە کرستیانیکردنی ساسانییەکان دابوو. هەرچی ساسانییەکانن لەباکووری رۆژهەڵاتەوە لە رێگای نیمچە دوورگەی عەرەبەوە هەوڵی بڵاوکردنەوەی هەژموونگەرایی خۆیان دەدەن. لەباشووری رۆژئاواش لەرێگای یەمەنەوە کاریگەری حەبەشەی کرستیانی لە بڵاوبوونەوەدایە. یەهودییەکانیش کە خاوەن کۆنترین نەریت بوون لەهەرلایەکی نیمچەدوورگەکەدا بڵاوببوونەوە. سوودیان لەقەیماخی موڵك و بازرگانی دەبینی.

هەرچی هۆزە عەرەبەکانی خەڵکی رەسەنی خۆجێیی ناوچەکەن، لەناو قەیرانێکی قووڵی ئابووری ـ کۆمەڵایەتیدا دەژیان. ئەو کۆچ و لێشاوانەی بەشێوەیەکی بەردەوام لەمێژووی خۆیاندا ئەنجامیانداوە (هەروەکو دەزانرێت بەر لە شارستانییەکانی سۆمەر و میسر، تیرە سامییەکان هێرشیان کردۆتە سەر ناوچە بەپیتەکانی نیولیتیك، دواتریش هێرشیان بردۆتە سەر شارستانییەکانی شار. ئامۆری، ئابیرۆ، ئەکەد، کەنعان و ئارامییەکان ناوی شەپۆلەکانی ئەو قۆناخەن) بەهۆی هێزی ئەو شارستانیانەی لە ئارادان ناتوانن دووبارەی بکەنەوە. قۆناخێك جێگای باسە کە زۆر تەنگەتاو بوونە. وەك ئەو میزەڵدانەی زۆر پڕبووە لەدۆخی تەقینەوەدان. بۆ ئەنجامدانی دواترین گەورە پەلهاوێشتنی سامییەکان وەك بڵێی عەرەبەکان لەچاوەڕوانی پەرجوویەکدان. ئیسلام ناوی ئەم پەرجووەیە. ئاشکرایە کە حەزرەتی محەمەد بەشێوەیەکی زۆر چاك زەمەن و زەمینەکەی خوێندۆتەوە. تەولوی تایبەتمەندێتییە پێویستەکانی قۆناخە نوێیەکەی مێژوو لە کەسایەتی خۆیدا پیشاندەدات، نابێتە موریدی هیچ یەکێك لە نەریتە ئایدیۆلۆژییەکانی لە ئارادان. بەڵکو بە سابئی و زەردەشتی، موسەوی و مەسیحی کاریگەر بووە کە بە ئایینە کتابییەکان ناوی دەبردن. هەڵوێستی بەرامبەر بە بتەکان لەهی حەزرەتی ئیبراهیم دەچێت: ئاگادارە کە ئەمانە خزمەت بە ئامانجەکانی ناکەن. یەکەمین چالاکی پروپاگەندە و سەربازییان بەرامبەر پاوانە بازرگانییەکانی مەککەیە. چونکە ئاگادارە ئەگەر کاریگەرییەکەیان نەشکێنێت ناتوانێت سوود لە دینامیکیەتی هۆز ببینێت. سرووشەکانی ئەو ئەڵلایەی سەرلەنوێ شرۆڤەی کردۆتەوە زۆر لە نەریتی دە فەرمانەکەی حەزرەتی موسا دەچێت. ئاشکرایە کە هەوڵیداوە ئامانجێکی سیاسی و ئەخلاقی نوێ لەهۆزەکاندا موتوربە بکات. ئەگەر ناوەڕۆکی زارلوەی ئەڵلا شیبکرێتەوە (لەسەرینەمای ٩٩ ناوەکە) ئەوکاتە دەرکی پێدەکرێت کە هەوڵی ئاواکردنی دەگمەنترین ئۆتۆپیای کۆمەڵگا دەدرێت. لەسەردەمی مەدینەدا کە بوو بە هێزێکی سیاسی، ئۆتۆپیاکەی خۆی زەلالتر کردووە.

سەرکەوتنی چالاکییەکانی یەکەمین وەك بوویەرێکی پەرجووانە بینراوە و متمانە و باوەڕ بەخۆبوونی زیادکردووە. شێوازی کارکردنی حەزرەتی محەمەد لەمەدینە گرنگییەکی مەزنی سەبارەت بە بابەتەکەمان هەیە. ئەو شوێنەی بەمزگەوت ناو دەبرێت لە راستیدا رۆڵی ئەنجوومەنی دیموکراتی دەبینێت. لەسەرەتادا بەئامانجی گفتوگۆکردنی کێشەکان و گەڕان بەدوای رێگاکانی چارەسەریدا کۆبوونەوەکان لەمزگەوت ئەنجامدەدران. تا کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد ئەم رۆڵەی بینیوە. هەرچی رێورەسمەکانی عیبادەتە (نوێژ، رۆژوگرتن، زەکات) دەکەوێتە چوارچێوەی چالاکییەکانی پەروەردە کە ئامانجی بەهێزکردنی کەسایەتییە. هیچ کەسێك ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە ئیسلام لەناوەڕۆکی خۆیدا قەڵەمبازێکی بەمجۆرەیە. ئەگەر لەژێر پەردەی ئایینیش بێت ئاشکرایە لەمیانەی دینامیزمێکی بەهێزەوە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بە تەواوی زیندووکراوەتەوە. لەم سۆنگەیەوە" ئەگەر باس لە ئیسلام و بزووتنەوەیەکی محەمەدی راستەقینە بکرێت، ئەوا راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە بەسەرلەنوێ ئاولکردنەوەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی دا تێپەڕ دەبێت، کە لەسەر بنەمای دیموکراسی بەشداریکردن بێت و ئامانجی بەلاوەنانی کێشە راستەقینەکان بێت. هەروەك دەزانرێت لەهەندێك چالاکیدا زێدەڕۆیی کردووە، لەملایەنەوە خۆشی کەوتۆتە ناو دوودڵییەوە. بەتایبەتیش مەسەلەی قبیلە و کوشتنی تەواوی پیاوانی تیرەی بەنی قورەیزەی[٧] یەهودی کە هاوکاری ئەرستۆکراتەکانی قورەیشیان کردبوو. ئەگەر سەبارەت بەم بابەتە رێگا چارەیەکی راست دۆزرابایەوە، لەوانەیە هەر لەو قۆناخەدا ناکۆکی عەرەب ـ عیبرانی چارەسەر کرابایە و ئیسلامیش زیاتر پێشکەوتبوایە.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت ئیسلامیەت وەك بزووتنەوەیەکی نزیك بە دیموکراتی، ئازادیخوازی و یەکسانی هەڵسەنگێنرێت. لەماوەیەکی زۆر کورتدا بڵاوبوونەوەی لەبەشی هەرە زۆری ناوچەکانی شارستانیدا ناتوانرێت تەنیا بە زەبری چەك و شمشێر بیەسترێتەوە. بێشانسی ئیسلام لەوەدایە بەبەراورد لەگەڵ بزووتنەوەی موسایی و عیسایی لەماوەیەکی زۆر کورتتر کراوەتە ئامرازی هێزەکانی شارستانی. هێشتا پەنجا ساڵ بەسەر دەرکەوتنیدا تێپەڕنەبیوو، لەشام لەرێگای

---

[٧] هۆزی بەنی قورەیزە: هۆزێکی یەهودییە تا سەدەی حەوتەم لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا ژیاون، بە گرنگیپە سەربازییەکەیان ناسراون، هەروەها لە دروستکردنی چەکیشدا بە ناوبانگ بوون. لە شەڕی خەندەق هاوپەیمانێتییان لەگەڵ قورەیش کرد، دوای ژێرکەوتنیان لەلایەن موسلمانەکانەوە ئابلۆقەدران، دوای بەرخوداتێکی کورت ناچاری خۆ بە دەستەوەدان بوون و لەو بڕوایەدابوون مامەڵەیەکی خراپیان لەگەڵدا ناکرێت. بەڵام سەعدی کوڕی مەعاز فەرمانی کوشتنی پیاوەکانی دا، نزیکەی ٦٠٠–٩٠٠ پیاو کوژران و ژن و موڵکەکانیشیان دەستی بەسەردا گیرا.

سولالەی مەعاویەوە وەك بلێی ڕۆڵی هەوێنی هێزی شارستانی پێدراوە. کوشتنی ئەهلی بەیت[٨]، کوشتنی چەندین خەسڵەتی ئەرێنی ناوەڕۆکەکەشیەتی. بە بڕوای من لەو قوناخەدا کۆتایی بە ئیسلام هێنراوە. ئەو مەزهەبانەی وەك شوێنکەوتووانی ئەهلی بەیت شێوەیان گرت، بەتایبەتی خەواریجەکان[٩] کە ئیسلامی توێژی هەژاران بوون، شایانی باسکردنە. لقی شیعەگەرێتی ئەهلی بەیت لەئێران لەسەردەمی خانەدانێتی سەفەوییەوە[١٠] کەوتۆتە سەر ڕێڕەوی شارستانی فەرمی و دژە ـــ شارستانیگەراییەکەی ناوەڕۆکی خاڵیکراوەتەوە. هەرچی عەلەوییەکانی[١١] کوردستان و ئەنادۆڵن لەژێر کۆنترۆڵی بێ ئامانی سەدان ساڵەی نەریتی دەسەڵاتی سوونەگەرایی[١٢] تەنیا توانیویانە لە ئاستی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیدا بەردەوامی بەهەبوون و ژیانی خۆیان بدەن. لەبەدیهاتنی پێشکەوتنێکی سیستەماتیکانە سەرکەوتوو نەبوون. ڕەوشی لقەکانی دیکەش

---

[٨] ئەهلی بەیت: دەستەواژەیەکی ئیسلامییە، سەبارەت بە گروپێکی خزمانی حەزرەتی محەمەد دەگوترێت کە پاك و بێگەردن. بەهۆی جیاوازی بیروڕای نێوان مەزهەبە ئیسلامیەکان سەبارەت بە ماهیەتی ئەهلی بەیت، گرنگی و ناوبانگی زاراوەکە زیادی کردووە.

[٩] خەوارج: گروپێکی ئیسلامییە لە سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بەهۆی ناکۆکییە سیاسیەکانی ئەوکاتە سەریانهەڵداوە. توندڕەوترین گروپە بۆ بەرگریکردن لە مەزهەبەکەیان و سەبارەت بە بیروباوەڕەکەیان دەمارگیرن. دوای کوشتنی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان، حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبیان بەیعە کردووە. ڕکابەرەکانیان ناوی خەواریجیان لێناون.

[١٠] بنەماڵەی سەفەوی: بنەماڵەی ئال سەفەویانە. لەنێوان ساڵانی ١٥٠١–١٧٨٥ زایینی حوکمڕانی وڵاتی فارسیان کردووە، سەرەتا ناوەندەکەیان تەبریز بووە، دواتر بە سەرە بۆتە قەزوین و ئەسفەهان. شێخ سەفیەدینی ئەردەبیلی لە ساڵی ١٣٠٠ لە ئەردەبیل تەریقەتی سۆفیگەرایی خۆی دامەزراند، بەمجۆرە بوو بە پایەختێکی ئایینی و سیاسی شوێنکەوتووانی کە لە ناوەڕاستی سەدەی پازدەهەم بوون بە مەزهەبی شیعی. لە ساڵی ١٤٩٤ ئیسماعیلی سەفەوی سەرۆکایەتی ڕێکخستنی گرتە دەست، مەزهەبی دوازدە ئیمامی کرد بە مەزهەبێکی فەرمی دەوڵەت. لە سەردەمی عەباسی دووەم شاری ئەسفەهان ناواکراو بوو بە یەکێك لە شارە گرنگەکانی جیهان.

[١١] مەزهەبی عەلەوی: تائیفەیەکی شیعە مەزهەبی ئیمامیەکانە، هەمان باوەڕی ئیمامی جەعفەرییان هەیە، هەمان ڕیزبەندی دوازدە ئیمامیان هەیە، ناکۆکییان سەبارەت بە ئیمامی دوازدەهەمە کە دوای حەسەن عەسکەری دێت، ناکۆکییەکەش سەبارەت بە مەرجەعیەت و سەرکێشی و نەریتەکانی ئیمامییە، عەلەوییە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە نیشتەجێی شاخەکانن. ناوەکەیان بۆ ناوی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دەگەڕێتەوە کە لەسەر ڕێبازەکەی ئەون.

[١٢] مەزهەبی سوننی: دەرکەوتنی مەزهەبی سوننی بۆ سەرەتاکانی ئیسلام بە تایبەتیش بۆ سەردەمی کۆچی دوایی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە. مەزهەبە سوننیەکان ئەمانەن: مەزهەبی مالکی کوڕی ئەنەس، مەزهەبی ئەبو حەنیفەی نوعمان، مەزهەبی شافیعی و مەزهەبی ئەحمەدی کوڕی حەنبل. ئەمانەش قوتابخانەی فیقەن کە سەبارەت بە ڕێساکان هاوڕان، بەڵام جیاوازییان لە وردەکارییەکاندایە.

جیاوازتر نییە. چەندین بزووتنەوەی هاوشێوەی خەواریجەکان و قەرمتییەکان[١٣] خواستوویانە ئیسلام وەك وشكترین بزاڤی چەوساوەكان پراكتیزە بكەن. ئەم خەسڵەتەشیان قركردنێكی زۆر بێ ڕەحمانەیانی لەگەڵ خۆیدا هێنا. هەبوونی میراسێكی دەوڵەمەندی لەمجۆرە لەژێر پەردەی ئیسلامدا، پێویستی بە لێكۆڵینەوە هەیە. لەم پێناوەدا مێژووی دیموكراتیك پێویستە. مسۆگەر ئیسلامییەتەكەی كەسایەتی حەزرەتی محەمەد نەبۆتە جێگای باس. مەحاڵە تەولوی قۆناخەكانی ئەمەوی، عەباسی[١٤]، سەلجوقی[١٥] ، عوسمانی و بابورییەكان بە ئیسلامی محەمەدی ناوببرێت. لەبەرئەم هۆكارەیە كە چەندین مەزهەب و تەریقەت دروستبوون. سەركەوتنێكی جددی لە ئارادا نییە. تاكە سوودی، پاوانی فێڵبازی بازرگانی مەككە (لەكەسایەتی مەعاویەدا) هێزێكی گەورەی بەدەستهێناوە، ئەرستۆكراتی هۆزەكانی دیكە (میر و شێخەكان) بوون بە پاوانی دەسەڵات و بازرگانییەك كەلەخەونیشدا نەیانبینیبوو، بەمجۆرە كرانەوە و قازانجێكی زۆریان بەدەستهێنا. ئاشكرایە كە ئەمەش خیانەتكردنە لە ئیسلام.

هەروەكو دەزانرێت حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیساش هەردووكیان ڕووبەڕووی خیانەت بوونەوە. بەڵام حەزرەتی محەمەد بەشێوەیەكی زۆر بەرفراوانتر ڕووبەڕووی خیانەت بوویەوە. لای هەمووان دەزانرێت كە ئیسلامیەتی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم (ڕەوشی عەرەب بەگشتی، ئێران، تورك، ئەفغانستان، پاكستان، ئەندەنوسیا..هتد) چۆن لەپەلهاوێشتنی داگیركارانەی ئینگلتەرا لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بەكارهێنراوە، هەروەها لە ئاوابوونی دەوڵەت ـــ نەتەوەشدا ڕۆڵی پاشڤەڕۆترین میللیگەرایی پێسپێردراوە. هەرچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندایە شانبەشانی ڕادیكالیزمی ئەلقاعیدە

---

[١٣] قەرمەتیەكان: ناوەكەی بۆ دەوڵەتی قەرمەتی دەگەڕێتەوە كە دوای شۆڕشێكی كۆمەڵایەتی ئاوڵكراو مۆركێكی ئایینی بە خۆوە گرت. حەمدانی كوڕی ئەشعەس دامەزرێنەری مەزهەبی قەرمەتییە. لەساڵی ٨٩١ ی زایینی لە ئەهوازەوە چۆتە كوفە و تێیدا نیشتەجێ بووە. لە سەرەتای ژیانی یەكێك بوو لە شوێنكەوتووانی مەزهەبی ئیسماعیلی، دواتر مەزهەبی تایبەت بە خۆی ئاوڵكرد. ئەم مەزهەبە لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵات بڵاوبۆتەوە.

[١٤] عەباسیەكان: دوای خەلافەتی راشدی و ئەمەوی سێیەمین زنجیرەی خەلافەتن. ناوەندەكەیان لە بەغداد و سامەڕا بووە، بنەچەكەیان بۆ عەباسی كوڕی موتەلیبی مامی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە. لە سەردەمی هارون ڕەشیددا دەوڵەتەكەیان بە لوتكەی خۆی گەیشتووە. لە كۆتایی سەدەی نۆیەم هەڵوەشانەوەكەی دەستی پێكردووە، دوای دەستبەسەرداگرتنی لەلایەن مەغۆلەكان، هۆلاكۆ بەغدای وێرانكردووە و سووتاندوویەتی.

[١٥] سەلجوقیەكان: یەكێك لە هۆزەكانی ئۆغوزە و بەم ناوە ناسراوە، یەكێكە لە لقە سەرەكیەكانی قەومە توركەكان، بە باپیرەی توركەكانی باشوری ڕۆژئاوا دادەنرێن، دامەزرێنەری چەندین میرنشین و ئیمپراتۆریەتی لەجۆری سەلجوقی، عوسمانی و سەفەوین. وشەی ئۆغوز لە ناوی تیر وەرگیراوە، سەلجوقیەكان ئەمەیان وەك هێمایەك بەكارهێناوە، ئاڵاكەیان وێنەی تیروكەوانێكی لەسەر بووە.

کە تائێستاش چییەتیەکەی نازانرێت، لەمیانەی رێکخراوی لەجۆری کۆنگرەی ئیسلامی (باس لە زۆربەی رێکخراوە بەناو ئیسلامیەکان دەکەم. وەك وشە پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیە، بەلاّم رێکخراوی سەرمایەداری، مۆدێرنیتە و میللیگەرایین ) هەوڵی سەلماندنی هەبوونیان دەدرێت، ئەمەش بێواتاترین قۆناخە سەبارەت بە ئیسلامەوە. رێبازی محەمەدی بەهەند وەردەگرم، بەلاّم بەمەرجێك کە لەبواری هزر، ئەخلاق و سیاسییەوە شێواز و هەڵوێستەکانی گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت، ئەوانەی تۆزقاڵێك رێزیان بۆ ناوی ئیسلام هەیە پێویستە بەرامبەر بە راستینەی محەمەدی رێزداربن کە بەشێوەیەکی شەفاف دێتەئاراوە. لەبەشە پەیوەندیدارەکانی دواتردا هەوڵی روونکردنەوەی ئەم بابەتە دەدەم.

پێویستە بەپێزانین و سنگ فراوانییەوە پێشوازی لەهەوڵەکانی شیکارکردنم بۆ چاخی ناوین بکرێت کە لە رێگای ئیسلام و حەزرەتی محەمەدەوە تاوتوێی دەکەم. چونکە مێژووی چاخی ناوین نەك بە واتای پرلکتیزەکردنییەوە، بەڵکو لەبواری خیانەتکردن لەناوو ناوەرۆکەکەیەوە چاخی " ئیسلامی ، محەمەدی"یە. ئەم ئیسلامیەتە لەلایەن سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمرۆمانەوە پێشەنگایەتی دەکرێت. ئەو چاخەیە کە بۆ یەکەمین جار پاوانەکانی بازرگانی تێدا بە لوتکە گەیشت. هێشتا ناوەند رۆژهەلاّتی ناوینە. قۆناخی ئامادەکاری نۆزینەوەی سەرجەم تەڵەکەبازییەکانی سەرمایەداری و جێبەجێکردنیەتی. ڤێنسیا لە رێگای رێککەوتنی سێسەد ساڵە لەگەڵ ئەم شارانە، بوو بەو شارەی کە کلتووری ماددی رۆژهەلاّتی ناوینی بۆ تەولوی ئەورووپا گواستەوە. هەروەها لەنێوان سەدەکانی ٦-١٠ زایینیدا کرستیانی کلتووری مەعنەوی رۆژهەلاّتی ناوینی بۆ تەولوی ئەورووپا گواستبوویەوە. سەدەکانی ٨ ـ ١٢ زایینی کە بە رێنسانسی ئیسلامی ناودەبرێت، وەك ئەو گرگنانە بوون کە لەسەر نەریتی هەزاران ساڵەی شارستانییەوە دەژیان.

بە بڕوای من دۆخی گرێکوێرەی ئەمرۆی رۆژهەلاّتی ناوین و ئەو کەوتنە بەردەوامەی لەسەدەی نوازدە بەولاوە دەستی پێکرد لە نزیکەوە پەیوەندی بەو خیانەتەوە هەیە کە لە ژێر ناوی ئیسلامەوە ئەنجامدراوە. ئەگەر خیانەت قەڵەمبازەکەی لە بزووتنەوەیەکی بەهای زێڕیشدا بێت، تەنیا دەتوانێت خراپترین شت بکات. لەراستیدا ئەوەی لەئیسلامیشدا روویداوە سەلماندنی ئەم رێسایەیە. ئەم خاڵەم لا گرنگە و بڕوام پێیەتی: ئەگەر محەمەدییەکانیش بەلانی کەم هێندەی موسایی و عیسایییەکان گفتوگۆیەکی راستەقینەی تیۆلۆژی، ئەتیك، فەلسەفی، هونەری و سیاسییان بەرەوپێشەوە ببردایە و ئەنجامەکەیان بۆ کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بگواستبایەوە، ناوەندی

هەژموونگەرایی شارستانی کلاسیک بۆ رۆژئاوا نەدەخزا، لەوەش گرنگتر، لەجیاتی شارستانی کلاسیک، لەوانەیە شارستانێتی دیموکراتی بەپێگەی پێشەنگایەتی گەیشتبوایە.

نەریتی موسەوی و عیسایی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەورووپا کشانەوە زیاتر بۆ گفتوگۆ کراوەبوون. بێگومان ئەو دۆگماتیزمەی لەناوەرۆکی نەریتی ئاییندا هەیە بەردەوامی بە رۆڵی کۆسپ و بەربەستێکی جددی داوە. بەڵام کاتێک بەم دەستەواژە پووچ نەبوون و توانییان بەهاکانی کلتووری و مەعنەوی رۆژهەڵاتی ناوین لە ئەورووپا بڵاوبکەنەوە، وەک پێویستییەکی دیالیکتیکی، پێشکەوتنی جەمسەری فەلسەفی و زانستی خێراکردووە. بەڵام ئەوەی لە رۆژهەڵاتی ناوینی ئیسلام ئەنجامنەدراوە، تەنانەت تانێستاش رێگای پێنادرێت، رێزگرتنە بەرامبەر ئەم گفتوگۆ دیالیکتیکییە و ئەنجامەکانی. چونکە بەر لەهەزاران ساڵ لەبواری گەشەکردنی کشتوکاڵ و بازرگانی لەئەورووپا پێشکەوتووتر بوو. هەروەها لەپیشەسازی مانیفاکتۆراش لەدواوەی ئەورووپا نەبوون. بەکورتی دەکرا بزاڤی محەمەدی بکرێتە قەڵەمبازێکی شایستەی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین. هەروەک ئیبن خەلدون لەکاتی خۆیدا شیکردۆتەوە، دەمارگیرە کوێرەکانی قەبیلە لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا مەیلەکانی هاوشێوەی میلیگەرایی و فاشیزمی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەسەپێنن و بەمجۆرە چاخی ناوینیان بەفیڕۆداوە. سیستەمی شارستانی ناوەندی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین لەدۆخی کەوتندایە، لەسەدەی پازدەهەمەوە لە ئەورووپا دووبارە هەڵکشایەوە. توانستی کلتووری ماددی و مەعنەوی کە بە دە هەزار ساڵ پێکهاتووە دوای شۆڕشی کشتوکاڵ هەڵمەتە نوێیەکەی خۆی لەم قۆناخ و جوگرافیایەدا ئەنجامدەدا.

لەمێژووی شارستانێتی دیموکراتی زیاتر، تەنانەت ئەگەر لە ئاستی گەڵاڵەنامەیەکیش بێت مەبەستم تاقیکردنەوەیەکە سەبارەت بە پێویستی چۆنیەتی روونکردنەوەی پێناسە، شوێن، ماهییەت و رۆڵە مێژووییەکەی. لەو بڕوایەدام کە مسۆگەر مێژوو پێویستی بەم روونکردنەوە هەیە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ، واتە هیچ واتایەکمان بەو قەڵەمبازانە نەداوە کە بە پەرجوو ناودەبرێن. تا بونیادی تەواوی ئەو کۆمین، شەڕ و بەرخودانانە شیکار نەکەین کە هەزاران ساڵە لەناو ئاتمۆسفەرێکی دەوڵەمەندی کلتووری بەرامبەر بەوانە بەڕێوەدەچێت کە خۆیان بەخودلوەند داناوە، پیشەی بێ ئابڕووانەی کۆیلایەتی، بەندایەتی و ژنێتی بەسەر ئەوانەدا دەسەپێنن کە خوازیارن رەچەڵەکەکەیان وشک بکەن و هەوڵدەدەن تەواوی بەها ماددی و مەعنەوییەکان تاڵان بکەن، چۆن لەمێژوو تێدەگەین؟ ئەگەر لەمێژوو تێنەگەین، چۆن دەتوانین مرۆڤایەتی پێناسە بکەین؟ ئەگەر رێزمان لەبەرامبەر ئەقڵ، هونەری ئازادی و ئەخلاق هەبێت کە بەسیاسەت

ناودەبرێت و پێویستییە ژیانییەکانی کۆمەڵگان، ناچارین ئەم پرسیارانە بکەین و وەڵامیان بدەینەوە. لە رێگای تەڵەکەبازییەکانی چینایەتی تەسک، یان دەمارگیری قەبیلەوە، هیچ چارەسەرییەك پێشناخرێت. تا بزاڤە مەحشەرییەکانی رووداوەکانی سروشتی کۆمەڵایەتی نەکەین بە سیستەمێك، هۆکار و ئەنجامەکانی نەخەینەروو، ئەوا وەك مرۆڤ ناتوانین هەبوونی خۆمان پێناسەبکەین. ناتوانرێت مێژوویێکی واتاداری مرۆڤایەتی لەمیانەی ئەو تۆڕانەوە گەڵاڵە بکرێت کە لەژێرناوی شارستانی پروپاگەندەی بۆ دەکرێت و پێشکەشمان دەکرێن، چونکە ئەم تۆڕانە لەناوەڕۆکدا ئامانجیان کۆکردنەوەی پاوانی سەرمایە و دەسەڵاتە لەسەر پشتی کۆمەڵگا. هەوڵەکانی کۆمەڵگای مێژوویی لە پێناو شارستانێتی دیموکراتی، هەروەها کۆتاییهێنانی بەچەواشەکاری کۆتایی دونیا و تاکە جیهانی تۆڕی سەرمایەداری، وەك بیری لێدەکرێتەوە تەنیا سەرچاوەی خۆی لە هەبوونی دونیای نوێ وەرناگرێت، بەڵکو سەرچاوەی خۆی لە پێویستییە ژیانی و دەست لێبەرنەدراوەکەی وەردەگرێت.

بەرلەوەی مێژووی دۆگماتیزمی چاخی ناوین بەتەواوی هەڵوەشێتەوە کە مرۆڤی لەناوبردووە، ئەمجارە دۆگماتیزمی مێژووی دەوڵەت ـ نەتەوەکان زهنی داگیرکرد کە لەوەی پێشتر خراپتر بوو. مێژووی نەتەوەکان کەهەزاران جار هێندەی دەمارگیری قەبیلە شوفێنیست بووە، مرۆڤی بەرامبەر بە راستییەکان کوێر دەکرد و بە نەبووی دادەنان و بیابانی نوێی زهنی ئافراند. تەنیا لەپێناو سەلماندنی راستی ئەم مێژووانە و ئافراندنیان وەك لافاو خوێن رژا. هەرچی میللیگەراییە کە لە کۆنەپەرستترین بت بەولاوە هیچی تر نییە، واتە بتی دەوڵەت ـ نەتەوە، تەواوی مرۆڤایەتی رۆژی ئەمڕۆمانی گەمارۆداوە. بەو بڕوایەی کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە تاریکترین قۆناخەکانیشدا خاوەنی زهنی رووکەشی و چۆلکراوی بەمجۆرە نەبووە و نەکەوتۆتە دۆخێکی بەمجۆرەوە، هەوڵی ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێك دەدەم.

پێویستە جارێکی دیکە ئاماژەی پێبکەم: ئەگەر مێژووی سروشتی کۆمەڵایەتی نەزانرێت، ئەوا راستی شتێکە هیچ دەرکی پێناکرێت. ئەو تێڕوانینە رەشبینییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەبارەت بەمێژوو لەمندا خوڵقاندوویەتی هەرگیز لێی نابوورم. چونکە ئەو مێژووە نەناسرێت کە مەحشەرێکی راستەقینەیە، وەك پێویستییەکی ئەمەش نەبێت بە سیاسی و ئەخلاقی، لە بێبایەخترین و کەوتووترین دۆخ رزگارمان نابێت. بەو ئەندازەیەی بتوانی مێژوویی بیت، لەگەڵ راستیدایت. هەرچی مێژووە، تەنیا کاتێك بەواتای تەواوی شارستانێتی دیموکراتی دێت، دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ راستی کۆمەڵگا دروست بکات.

سەبارەت بە هەڵوێستی شارستانێتی دیموکراتی بەرامبەر بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەبەشی دواتردا بەشێوەی سەرە دێڕێکی سەرەکی هەوڵی پێشکەشکردنی دەدەم.

**د. فاکتەرەکانی شارستانێتی دیموکراتی**

ڕۆشنکردنەوەی یەکینەی ئەو جڤاتانەی دەکەونە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەشێ سوودبەخش و فێرکەر بێت. هەروەها پێناسەکردنی فاکتەرە جیاوازەکانی کۆمەڵگاش سەبارەت بە تێگەیشتنی هەموویێتییەکە "گشتگیری"ی پێویستە. چونکە هەموویێتی تەنیا لەناو جیاوازییەکاندا واتادار دەبێت. بەسیفەتی بونیادی دەوڵەتی، شار بە فاکتەرێکی شارستانێتی دیموکراتی دانانێین. بەشێوەیەکی سەریەخۆ، ئەوەی بە ڕەنجی خۆی گوزەران دەکات: پیشەکاری دەست، کارکەر، بێکار و خاوەن پیشە ئازادەکان هەرچەندە لە شاریش بن، بەڵام دەکەونە چوارچێوەی فاکتەرەکانی شارستانێتی دیموکراتییەوە. ئەمجۆرە بابەتانە تاووتوێ دەکەین.

١ ـ **کڵانەکان:** بەکورتی ئاماژەمان پێکردبوو، باسی ئەوەشمان کردبوو کە وەك خانەی بنەڕەتی کۆمەڵگا کڵان لەسەدا ٩٨ ی تەمەنی جەربەزەیی درێژخایەنی جۆری مرۆڤ پێکدێنێت. ژیانی ئەم گروپانە زۆر سەخت بوو کە زمانی ئیشارەتیان بەکاردەهێنا، لە ڕێگای نێچیروانی و کۆکردنەوەی خواردەمەنییەوە گوزەرانیان دەکرد و ژمارەیان ٢٥ ـ ٣٠ کەس دەبوو، دۆزینەوەی خۆراکی تەندروستانە و خۆپاراستن لە ئاژەڵە دڕندەکان، زۆر زەحمەت بوو. هەندێك جار کەش و هەوا زۆر سارد دەبوو، چوار قۆناخی گرنگی سەهۆڵبەندان ڕوویدابوو. پێویستە تەنیا نەڵێین باپیرانمان و بە ئەسپایی تێپەڕین. ئەگەر هەوڵ و کۆششە مەزنەکەی ئەوان نەبوایە ئێمەش نەدەبووین. پێویستە لێرەدا لە هەموویێتی بگەڕێین. تەواوی مرۆڤایەتی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەرەنجامی ململانێی ئەمانەیە کە لەپێناو مانەوە و ژیاندا کردوویانە. هەروەها مێژوو تەنیا بە بەشە نووسراوەکەی نابێت بە مێژوو. ئەگەر مێژووی ڕاستەقینە ئۆخی سروشتی کۆمەڵایەتی(کۆمەڵگا)ی ملیۆنان ساڵی بەر لە ئەمڕۆمان ڕەچاو نەکات، هیچ واتایەکی نابێت. لەوانەیە خەسڵەتە یەکەمینەکانی کۆمەڵگای کڵان یەکەمین ئۆخە کە مرۆڤایەتی کردووە بە یەك. هەوڵماندا کڵان وەك ئۆخی هەرە پەتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی هەڵسەنگێنین. ئەم جڤاتانە کە تا ئێستاش لە لایەنی جەستەییەوە لە چەندین گۆڕەپاندا درێژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن لە سەرجەم فاکتەرەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانیشدا بەردەوامی بە ڕاوەستەی خانەی بنەڕەتی دەدەن.

٢ ـ خێزان: کلان بۆخۆی ئەگەر وەك خێزانیش وەسف نەکرێت، بەڵام زۆر لێی نزیکە. خێزان یەکەمین دامەزراوەیە کە لەناو کلاندا دیار دەبێت. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن وەك خێزانی دایکایەتی ژیاون، دوای شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵ (شیمانە دەکرێت سالانی ٥٠٠٠ پ.ز) لە ژێر دەستڕۆیی پلەداری پیاوسالاری قۆناخی خێزانی باوکسالاری دەستی پێکردووە. بەمجۆرە بەڕێوەبەرایەتی و مندالان کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی گەورەترین نێری خێزانەکە. هەرچی خاوەندارێتیکردنی ژنە، بوو بە زەمینەی یەکەمین هزری موڵکایەتی. دواتر هەنگاو بۆ بە کۆیلەکردنی پیاو هاوێشترا. لە سەردەمی شارستانیدا جۆری خێزانی فراوان و درێژخایەنی لە شێوەی خانەدانێتی دەبینین. بەڵام خێزانە لادێیی و پیشەکارە سادەکان لە هەموو کاتێکدا هەبوون. دەوڵەت و دەسەڵاتەکان کۆپیەیەکی دەستڕۆیی خۆیان لەناو خێزاندا بە باوك ـ پیاو بەخشیوە و رۆڵێکی هاوشێوەی خۆیان پێداوە. بەمجۆرە خێزان کراوەتە گرنگترین ئامرازی مەشروعیەت پێدانی پاوانەکان. بەردەوام رۆڵی سەرچاوەی کۆیلە، جووتیار، کرێکار، رەنجدەر و سەرباز و تەواوی خزمەتەکانی دیکەی بۆ تۆڕەکانی سەرمایە و بالادەستی بینیوە. لەبەر ئەم هۆکارە خێزان گرنگی پێدرا و پیرۆزکراوە. سەرباری ئەوەی تۆڕەکانی سەرمایەداری گرنگترین سەرچاوەی قازانجی خۆیان لەسەر رەنجی ژن لەناو خێزاندا بەدەستدێنن، بەلام ئەمە پەردەپۆش دەکەن و بارێکی زیادە دەخەنە سەر خێزانەوە، وەك بڵێی خێزان کراوەتە زامنی دڵنیایی سیستەم و بەمجۆرە مەحکومی دەمارگیرترین قۆناخی ژیانی کراوە.

رەخنەکردنی خێزان گرنگە. چونکە تەنیا لەسەر بنەمای رەخنەکردن دەتوانێت ببێتە فاکتەری کۆمەڵگای دیموکراتی. تا تەواوی خێزان ـ نەك تەنیا ژن (فێمێنیزم) ـ وەك خانەی دەسەڵات شیکار نەکرێت، ئەو ئایدیال و پراکتیزەکردنی شارستانێتی دیموکراتی لە گرنگترین فاکتەرەکانی بێبەشدەبێت. خێزان دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی نییە کە تێپەڕ بکرێت. بەڵام دەتوانرێت وەرچەرخێنرێت. پێویستە دەستبەرداری بانگەشەکانی موڵکایەتی ژن و مندالان بکرێت کە لە سەردەمی پلەدارێتی(یارارشی) یەوە ماوەتەوە، هەروەها پەیوەندی دەسەلات و سەرمایەش (هەموو جۆرەکانی) لە پەیوەندییەکانی هاوسەرێتیدا رۆڵ نەبینێت. پێویستە هەڵوێستە رەمەکییەکانیشی بەلاوە بنرێت کە بە بیانووی بەردەوامکردنی جۆری مرۆڤ پەیرەو دەکرێت. نموونەییترین هەڵوێستی یەکێتی نێوان ژن و پیاو ئەوەیانە کە گرێدراو بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی فەلسەفەی ئازادی بە بنەما دەگرێت. ئەو خێزانەی لەم چوارچێوەیەدا بە وەرچەرخاندا تێپەڕبێت، دەبێتە تەندروستانەترین زامنی کۆمەڵگای دیموکراتی و یەکێك لە پەیوەندییە

سەرەکییەکانی شارستانێتی دیموکراتی. لە هاوسەرێتی فەرمی زیاتر، هاوسەرێتی سروشتی گرنگە. بەڵام پێویستە هەموو کاتێك هەردوولا بۆ ژیانی جیاواز و بە تەنیاش ئامادەبن. ناکرێ بەشێوەی کۆیلایەتی یان کوێرانە لەماوەی پەیوەندیدا جموجۆڵ بکرێت. وەك ئاشکرایە لەژێر سایەی شارستانێتی دیموکراتیدا خێزان واتادارترین وەرچەرخان بەخۆیەوە دەبینێت. ژن کە بەشێکی زۆری لە ڕێزو قورسایی هەزاران ساڵەی خۆی لەدەستداوە، تا هێزو ڕێزێکی مەزن بە دەست نەهێنێتەوە، یەکینەی خێزانی واتادار پێشناکەوێت. ئەو خێزانەی لەسەر بنەمای جەهالەت و نەزانی ئاواکراوە، جێگای ڕێز نابێت. ئەو ڕۆڵە گرنگە کە لە سەرلەنوێ ئاوەکردنەوەی شارستانێتی دیموکراتیدا دەکەوێتە سەر خێزان.

٣ ـ هۆز و خێڵەکان : گرنگترین فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانن کە خێزانیش لە هەناوی خۆیان هەڵدەگرن، لەناو هەمان کلتوور و زماندا دەژین و زیاتر لە کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند گەشەیان کردووە. یەکینەی کۆمەڵایەتی پێویستن بۆ بەرهەمهێنان و پاراستن. کاتێك کلان و خێزان سەبارەت بە کێشە پەرەسەندووەکانی بەرهەمهێنان و پاراستن کورتیان هێناو ناتەولو مانەوە، پێویستی وەرچەرخانیان بۆ شێوەی قەبیلە یان هۆز بینیوە. تەنیا یەکینەیەك نین لەسەربنەمای پەیوەندی خوێن، بەڵکو فاکتەرەکانی کۆمەڵگای ناوکن کە بەرهەمهێنان و ئاسایش کردوونیەتی بە پێویستییەك. نوێنەرایەتی نەریتی هەزاران ساڵە دەکەن. بەڵام ڕاگەیاندنی وەك دامەزراوەیەکی کۆنەپەرستانە و گوایە پێویستە بەلاوە بنرێت، یەکێك لە گەورەترین کۆمەڵکوژییەکانی نەژادییە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەڕێوەی دەبات، چونکە تاوەکو خەڵکەکە لەناو یەکینەکانی هۆزدا بمێننەوە بە ئاسانی ناکرێن بەکرێکارو ناچەوسێنرێنەوە. هەروەها سەبارەت بە سەردارە کۆیلەدار و دەرەبەگەکانیش هەبوونی هۆز ـ بە تاکە ووشەیەك ـ دوژمنە سەرسەختەکە بوو. چونکە هۆز کۆیلایەتی، بەندایەتی و کرێکاری بە ئەندامانی خۆی ناکات.

قەبیلە (هۆز) ژیانێکی نزیك بە کۆمینالێ(کۆمینە)ی هەیە. ئەو شێوەیەی کۆمەڵگایە کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بە بەهێزترین شێوە تێیدا دەژیت. هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندێتییەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی قەبیلەیە کە هەموو کاتێك وەك دوژمنە سەرسەختەکانی شارستانی کلاسیك دەبینرێن. هەروەها دلگیرکردن و فەتحکردنیشیان مەحاڵ بوو. یان لەناو دەچوون، یان بە ئازادی دەمانەوە. هەروەها ئەمەش بینراوە کە لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا هەڵدەوەشێنەوە و تێکدەچن. بەکرێگیراوە ناوخۆییەکانی، ئینجا ئەمە لەناو بنەماڵە بێت یان هۆز بەردەوام ڕۆڵی نەرێنییان بینیوە. دیسان سەرباری ئەمانەش ئەو هۆزانەی بەردەوام خەسڵەتی کۆچەر

(رەوەند)یان لەپێشە لە هێزە راستەقینەکانی دروستکردنی مێژوون. کۆیلە، بەندە و کرێکاران هیچ کاتێك لە دۆخی ئازاد، یاخیبوون و بەرخودانی مێژوویی هۆزدا نەژیاون بەڵکو زیاتر بەندە دڵسۆزەکانی سەردارەکانیان بوون (جگە لە دۆخی ریزپەڕ). ئەگەر لە جیاتی شەڕی چینایەتی بە تێڕوانینی شەڕی بەرخودانی هۆزەکان تەماشای مێژوو کرابایە، ئەوا هەڵوێستێکی واقیعتر دەبوو. بچووك بینینی رۆڵی قەبیلە، یان بە نێگەتیف لە قەڵەمدانی و بێ رۆڵکردنی یەکێك لە چەواشەکارییە گەورەکانی مێژوونووسانی شارستانییە.

هەرچی خێڵە لەبەر ئەوەی جۆرێك لە جۆرەکانی فیدراسیۆنی جڤاتی هۆز و قەبیلەکانن گرنگییەکی زیاتریان هەیە. تا رادەیەکی مەزن بەرامبەر بە پەلامارەکانی شارستانی کۆیلەداری هاتوونەتە ئاراوە. بۆ خۆپاراستن و لەناونەچوون پێویستی بەرخودان و یەکێتی رێکخستنی خێڵی ئافراندووە. شێوەیەکی کۆمەڵگایە کە رێکخستنە سیاسی و سەربازییەکەی بە خێرایی ئاوابووە. هەر لە خۆیەوە هێزێکی سیاسی و سوپایە. یەکێتی زهنی و رێکخستنی تێیدا مەرجە. رابردوویێکی مێژوویی و کلتوورێکی دێرین لەگەڵ خۆیان بار دەکەن. رۆڵی سەرچاوەی سەرەکی کلتوورەکانی نەتەوە دەبینن. هەروەها ناتوانرێت کۆمەکیان بۆ بەرهەمهێنانیش بچووك بکرێتەوە. چونکە بونیادە کۆمەڵکارییە کۆمەڵایەتییەکانیان هاوکاریکردنی یەکتر دەکات بە بنەما و مەرجێك. رۆحی کۆمیناڵی لە جڤاتەکانی خێڵ و قەبیلەدا پتەو و بەهێزە. هەر بۆیە یەکێکە لە فاکتەرە بونیادنەرەکانی خەسڵەتی نەتەوەیی، بەڵام کاتێك بەکرێگیراوێتی سەرهەڵدەدات زۆر مەترسیدار دەبێت. سەرباری سەرجەم هەوڵەکانی ناوزڕاندنی لەلایەن مێژوونووسەکانی شارستانییەوە، بەڵام دیسان یەکێکە لە هێزە بزوێنەرە سەرەکییەکانی مێژوو. بەرخودانی خێڵەکان لەپێناو نەریتی دیموکراسی، کۆمینالیزم و ئازادی نەبوایە، مرۆڤایەتی لە دۆخی کۆیلایەتی و جەماوەرێکی مێگەل رزگاری نەدەبوو. لەبەر ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندێتیانەیەتی کە لە فاکتەرە سەرەکییەکانی شارستانێتی دیموکراتییە.

مێژووی شارستانێتی دیموکراتی تا رادەیەکی مەزن مێژووی بەرخودان و یاخیبوونی هۆز و خێڵەکانە لەپێناو ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی و سووربوونیانە لەسەر ژیانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بەرامبەر بە هێرش و هەڕەشەکانی شارستانی. ئەوەی رەنگی راستەقینە بە کۆمەڵگاکان دەدات، بونیادەکانی هۆز و خێڵە. لە دەرەنجامی قورسایی گروپێکی ئەتنیکیەوە لەناوبردنی کلتووری سەرجەم خێڵ و قەبیلەکان لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە، بەواتای وشە جینۆسایدێکی کلتوورییە. سەرباری ئەوەی ئەم جینۆسایدە گەورەیەی سەر کۆمەڵگا کەمێك خاو بۆتەوە، بەڵام

تا ئێستاش گەورەترین هەڕەشەیە. لەجیاتی دەوڵەت ـ نەتەوە یان نەتەوەی دەوڵەت، هۆز و خێڵەکان وەك یەکینە بونیادنەرەکان دەتوانن ڕۆڵی سەرەکی لە ئاوالکردنی نەتەوەی دیموکراتدا ببینن. لەبەر ئەم هۆکار و ماهیەتەیان بینینی هۆز و خێڵەکان وەك ئەندام و فاکتەرە بنەڕەتییەکانی شارستانێتی دیموکراتی تا دوارادە مایەی تێگەیشتنە.

٤ ـ قەوم و نەتەوەکان: ژیان و پێکهاتنی کۆمەڵگاکان بەشێوەی قەوم و نەتەوە لە شارستانێتی دیموکراتیدا لەگەڵ شارستانی کلاسیکدا جیاوازە. شارستانییە فەرمییەکان قەوم و نەتەوە وەك پاشکۆ و بەردەوامییەکی خانەدانێتی و گروپی ئەتنیکی باڵادەست دەکەن بە زاراوە. لەسەر بنەمای سوپاسگوزارییەوە قەوم و نەتەوە قەرزاری گروپی باڵادەستی ئەتنیکی و خانەدانی فەرمی دەبینرێت و دەکرێت بە ڕۆمان. بەمجۆرە لەناو مێژوویێکی هەڵبەسترلودا نۆخی کۆمەڵگای سروشتی پەردەپۆش دەکرێت. لەمیانەی بەقارەمان راگەیاندنی ئەو کەسانەی لەناو گروپە ئەتنیکی و خانەدانە فەرمانڕەواکان دەردەکەونە پێش، باوکی قەوم و نەتەوەکان دەئافرێنرێت. هەنگاوێکی پێشتر و دواتر بەخوداوەندکردنە. بەجۆرێك لە جۆرەکان مێژوو وەك هونەری داهێنانی ئەم باوکایەتی (باپیرێتی) ە خوداوەندێتییە تاووتوێدەکرێت. هەرچی راستییە زۆر جیاوازترە. سروشتی کۆمەڵایەتی کە لە نۆخی هۆز و خێڵدا پەرەدەسەنێت و بە بارێکی جێگیرتر دەگات، چەندە زمان و کلتووری هاوبەشی خۆی بەرەو پێشەوە ببات و ناسنامەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ناواخنی درێژە پێبدات، ئەوا وەك قەوم و نەتەوە شێوە دەگرێت. واتە کۆمەڵگاکان لەسەرەتادا بەناسنامەی قەوم و نەتەوە لە دایك نابن، بەڵکو تەنیا لە چاخی ناوین لەناسنامەی قەوم و چاخی نزیکیش لەناسنامەی نەتەوە نزیك بوونەتەوە.

قەوم جۆرێك لە جۆرەکانی ماتریاڵ و کەرەستەی نەتەوەیە، لەگەڵ گەیشتن بە چاخی نوێ دەبینرێت کە لە دوو ڕێگاوە بوونە بە نەتەوە. تێبینی دەکرێت کە شارستانی فەرمی دەمارگیری قەومی بۆ میللیگەرایی مۆدێرن وەرچەرخاندووە و هەوڵیداوە شێوەی کۆمەڵگای نوێی دەوڵەت، واتە بۆرژوازی و شار وەك دەوڵەت ـ نەتەوە دەستنیشان بکات. گروپێکی ئەتنیکی زاڵ و فەرمانڕەوا ڕۆڵی ناوکی سەرەکی دەبینێت. ناسنامەکەی دەکرێت بە موڵکی تەواوی نەتەوە (نومەتەکە). تەنانەت ئەو قەبیلە، خێڵ و قەوم و نەتەوانەی ناسنامەکەیان زۆر جیاوازترە، لە ڕێگای توندوتیژییەوە لەناو زمان و کلتووری ئەم گروپە ئەتنیکیە دەتوێنرێنەوە. ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە بە "بە نەتەوەکردنی هۆڤانە" ناودەبرێت. گەورەترین کۆمەڵکوژی کلتووری مێژوو لەمیانەی ئەم هەڵوێستەی شارستانی فەرمی لە تەولوی نەتەوەکان لەسەر زمان و کلتووری هەزاران

هۆز، خێڵ، قەوم و نەتەوە بەڕێوەبراوە. ئەمجۆرە قەوم و نەتەوانە لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێن کە پێویستە وەك بونیادی سیستەم و مێژووی شارستانێتی دیموکراتی هەڵوەستەی لەسەر بکرێت.

دووەمین ڕێگای بە نەتەوەبوون، گروپە هاوزمان و هاوکلتوورەکان یاخود گروپە زمان و کلتووره لێکچووەکانی لەچوارچێوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیدان لەسەر بنەمای سیاسەتی دیموکراتیانە لە میانەی وەرچەرخانیان بۆ کۆمەڵگای دیموکراتی بەدیدێت. تەواوی هۆز، خێڵ، قەوم و تەنانەت بنەماڵەکانیش وەك یەکینەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی جێگای خۆیان لە نەتەوەبووندا دەگرن. دەوڵەمەندێتی زمان، شێوەزار و کلتووری خۆیان بۆ نەتەوەی نوێ دەگوازنەوە. لە نەتەوەی نوێدا هەرگیز جێگا بەوە نادرێت کە باڵادەستی ئایدیۆلۆژیایەك، باوەڕی، مەزهەب یان گروپێکی ئەتنیکی مۆرکی خۆی لێبدات. دەوڵەمەندترین سەنتێز ئەوەیانە کە خۆبەختانە بەدیدێت. تەنانەت چەندین گروپی زمان و کلتووری جیاوازیش لە میانەی هەمان سیاسەتی دیموکراتییانەوە وەك کۆمەڵگا دیموکراتەکان دەتوانن بە ناسنامەی نەتەوەی نەتەوەکان بژین کە توخی یەکینەی باڵا و هاوبەشی نەتەوەکانە. هەر ئەم ڕێگایەش بەگوێرەی سروشتی کۆمەڵایەتییە. هەرچی بەگوێرەی پەیڕەوی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، لە میانەی هەڵوێستی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە شێوازی ڤێرسیۆنی عەلمانی و نوێی چەمکی یەك ئایین و خودلوەندی جاران بە شێوەی "توخی یەك زمان، یەك میللەت، یەك وڵات، یەك دەوڵەتی (ناوەندی)" کە تا ڕادەیەکی مەزن لە سروشتی کۆمەڵایەتی دەرهەستکراوە و شێوە دەگرێت و لە هەمانکاتدا شێوەی نوێی دەوڵەتی پاوانی دەسەڵات و سەرمایەیە. لە قۆناخی وەرچەرخانی سەرمایەداری پاوانی دەسەڵات و سەرمایە لەکاتێکدا نەتەوەی دەوڵەت لە تەوقی سەرەوە تا دەگاتە نێنۆکەکانی کۆمەڵگا لەناواخنیدا جێگیردەبێت، ئەوا گوزارشت لە کۆلۆنیکردنی کۆمەڵگا و تواندنەوەی لەناو بۆتەی خۆیدا دەکات. باڵاترین دەسەڵات ئەو شێوەیەیە کە زۆرترین دیاردەی چەوسانەوەی تێدا پەیڕەو دەکرێت. بەمجۆرە کۆمەڵگا لەسەرجەم ڕەهەندە سیاسی و ئەخلاقییەکان دەرهەست دەکرێت و ڕووبەڕووی مردن دەکرێتەوە، واتە بە مێروولەکردنی تاك جێگای باسەو کۆمەڵگای مێگەلی فاشیستانە پێکدەهێنرێت. فاکتەرێکی ئایدیۆلۆژی و مێژوویی قوول، چین، سەرمایە و دەسەڵات لەژێر ئەم مۆدێلەدا ڕۆڵ دەبینن کە هەرە زێدە دژ بە سروشتی کۆمەڵایەتییە. جینۆسایدەکان وەك دەرەنجامی کۆی ئەم فاکتەرانە ئەنجامدراون.

لەسیستەمی شارستانێتی دیموکراتیدا پێکهاتنی نەتەوە و بەیەکەوە ژیانیان پانزەهێری پاوانەکانی سەرمایەو دەسەڵاتە، تاکە ڕێگای لەناوبردنی فاشیزم و دەردی جینۆساید (پەتای شێرپەنجەیی کۆمەڵگا) و هۆکارەکانێتی. لێرەدا جارێکی دیکە گونجان و تەبایی سروشتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کارەکتەری شارستانێتی دیموکراتی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

٥ ـ فاکتەرەکانی شار و گوند: بەگوێرەی دیدگا و ڕێنومایی (پارادایم) ی شارستانێتی دیموکراتی واتای شار و گوند دەگۆڕێت. هەروەکو چۆن کشتوکاڵ و پیشەسازی لە سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا دوو گۆڕەپانی بەرهەمهێنانن کە بۆیەکتری پێویستن، گوند و شاریش دوو یەکینەی نیشتەجێبوونن کە بۆ یەکدی پێویستن، هاوسەنگییەك لەنێوانیاندا هەیە کە مسۆگەر پێویستە بپارێزرێت. کاتێك ئەم هاوسەنگییە تێك بچێت، ڕێگای کارەساتی ئیکۆلۆژی، هاربوونی چین و دەوڵەت و بە پاوانبوونی سەرمایە دەکرێتەوە. بازرگانی دەکەوێتە سەر ڕێگای ناڕەوا (جیاوازی نرخ دەقۆزرێتەوە). ئەو خاڵە گرنگە "بەڵێ"بۆ شار، بەلام "نەخێر" بۆ پاوانێتی سەرمایە ـ دەوڵەت ـ چین. بۆ شرۆڤەکردنی مێژوو لە ڕوانگەی پێشکەوتنی شارو گوندەوە بە بنەماگرتنی ئەم پێوانە سەرەکییانە پێویستە. لکاندنی یافتە و تەنتەنەی "شارستانی" بە سێیانەی شار ـ چین ـ دەوڵەت تەواو گاڵتەجاڕییەکی تراژی کۆمێدییە. هەرچی ئەو جڤاتانەن کە لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی سروشتی کۆمەڵایەتیدا دەژین ناوزەدکردنیان بە "درندە، هۆڤ" نموونەی یاهۆزی دز[١٦](ماخۆ بکرێت بە دز) دێنێتەوە بیری مرۆڤ. هۆڤێتی و دڕندێتی ڕاستەقینە تاڵانکردن و تێکدانی سروشتی کۆمەڵایەتییە، کە ئەمەش لە دەرەنجامی ڕێککەوتنی سێینەی شار ـ چین ـ دەوڵەت دێتە ئاراوە، واتە سەرچاوەی خۆی لە بزاوتی یەکگرتووی ئەم ڕێککەوتنە وەردەگرێت. جارێکی دیکە لە میانەی ئەم ڕەوشە تراژی ـ کۆمێدییەدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەبینین کە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی چۆن ڕاستییەکان پێچەوانە دەکاتەوە. سەبارەت بە نزیککردنەوە، یان دوورخستنەوە لە ڕاستی، بە درێژایی مێژوو ئایدیۆلۆژیا گرنگی خۆی هەبووە، تا ئێستاش ئەم گرنگییەی بەردەوامە. شارستانێتی دیموکراتی جموجۆڵی هاوبەشی سێیانەی شار ـ چین ـ دەوڵەت وەك هۆڤێتی و بەربەرێتی ڕاستەقینە هەڵدەسەنگێنێت، هەرچی ئەوانەن کە بەرامبەر ئەم دڕندانە دەوەستن بە گوزارشتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ڕاستەقینەیان دادەنێت، دەیانکات بە ئایدیۆلۆژیا.

---

[١٦] یاهۆزی دز: پەندێکی تورکییە بە ئاماژەکردن بۆ دزێکی ڕیسوا و بێ شەرم، کە تەنیا بە نکوڵیکردن لە تاوانەکەی ناوەستێت، تەنانەت تاوانی دزیەکە دەخاتە سەر خاوەن ماڵەکە.

بەو سیفەتەی کۆمەڵگای گوند یەکەمین دیاردەی نیشتەجێبوونە، گرنگە. نوژەنکردنەوەی و بەردەوامکردنی لەسەردەمی پیشەسازیدا پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراوەی ژیانی ئیکۆلۆژییە. گوند تەنیا دیاردەیەکی کۆنکرێتی و بەرجەستە نییە، بەڵکو یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کلتووریشە. وەك خێزان، ئەویش لە یەکینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگایە. هێرشەکانی شار، پیشەسازی و بۆرژوازی لە بەرگی چین و دەوڵەتدا ناتوانێت ئەم راستییە بگۆڕێت. هەروەها بەو سیفەتەی گونجاوترین و لەبارترین یەکینەی پراکتیزەکردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. هەرچی شارە سەبارەت بەسەرلەنوێ هاوسەنگبوونی لەگەڵ گوند بە مەرجێك پێویستە، هەم لە بواری ژمارەی دانیشتوان هەم لە بواری رۆڵ و کارابووندا بە وەرچەرخانێکی مسۆگەردا تێبپەڕێت. تەنیا لەمیانەی وەرچەرخانێکی ریشەییەوە دەتوانێت لە دۆخی ناوەندی رەوڕەوەی فشار و چەوسانەوە دەرکەوێت و وەك رەهەندێکی بەرکەمالی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی رۆڵ ببینێت. بەڵام رزگارکردنی شار لە پێگەی هەڵایسانی شێرپەنجەیی چینی ناوین و سەرمایە ئینجا ئەمە دەوڵەت بێت یان بیرۆکراتییەتی کۆمپانیاکان" جێگا و واتایەکی تەوەرەیی لە رزگاربوونی کۆمەڵگای ئەم سەردەمەماندا هەیە. بەم دۆخەی ئێستایان بەراستیش شار لە بواری چوارچێوە و واتادا ئەو ناوەندە سەرەکیانەن کە بەخێرایی کۆمەڵگا (بەشێوەی وێرانکردنی ئیکۆلۆژی و کۆمەڵگاکوژی) لەناو دەبەن. هەروەها تەندروستترین بەڵگەن کە ئیفلاسکردنی شارستانی کلاسیك دەسەلمێنن. رۆما تاقانە بوو و نوێنەری سەرجەم/چاخی یەکەم بوو، هەرەسهێنانیشی تەنیا و نوێنەری چاخی یەکەم بوو. هەرچی شارەکانی رۆژگاری ئەمرۆمانە، بەو سیفەتەی ناوەندی قووتدانی تەواوی کۆمەڵگایە (پێدەشت و گوندیشی لەناودا) زۆرینەی کۆمەڵگای شێرپەنجەیی یە، تەنانەت هەموو شتێکێتی. تا کۆمەڵگای مرۆڤ لەم شارە رزگار نەبێت کە لەم دۆخەدایە، ئەوا هیچ گومانێکی تێدانییە کە شار لە رەوشی سروشتی کۆمەڵایەتی دەریدەخات!

یەکێتی تەباییانەی گوند و شار لە سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیدا لەبواری ئایدیۆلۆژی و بونیادییەوە گرنگییەکی لە پێشینەیی هەیە، تەنیا لەسەر بنەمای ئەم تەباییەوە سروشتی کۆمەڵایەتی دەتوانێت هەبوونی خۆی بخاتە ژێر گەرەنتییەوە و بەردەوامی پێبدات.

٦ - **فاکتەرەکانی زەنییەت و ئابووری:** بناخەی ئابووری شارستانێتی دیموکراتی لەگەڵ پاوانەکانی سەرمایەدا کە لەسەر زێدە - بەهای کۆمەڵگا ئاواکراوە لەناو ناکۆکییەکی بەردەوامدایە. بەشێوەیەکی ئازادانە بۆ هەموو جۆرە چالاکییەکی کشتوکاڵی، بازرگانی و پیشەسازی کراوەیە

بەمەرجێك پێداویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا و فاکتەرە ئیکۆلۆژییەکانیان رەچاو بکرێت. قازانجەکانی دەرەوەی قازانجی پاوان بە رەوا دادەنێت. هەروەها دژی بازاڕیش نییە، بەپێچەوانەوە بەهۆی ئەو دەرفەت و زەمینەی دەیرەخسێنێت ئابوورییەکی راستەقینەی بازاڕی ئازادە. نکوڵی لە رۆڵی پێشبڕکێی داهێنەرانەی بازاڕ ناکات. ئەوەی دژایەتی دەکات، پەیرەو و شێوازەکانی قازانجی قەبلاندنە. لە کێشەی مولکایەتیشدا پێولەکەی، بەپێتی بەرهەمە. هەرچی رۆڵی پاوانە کە ئەویش جۆرێك لە مولکە، بەردەوام لەگەڵ بەپیتبوونی بەرهەمدا ناکۆکە. نەمولکایەتی زێدەڕۆییانەی تاکە کەس، نە مولکایەتی دەوڵەت، هیچ یەکێکیان ناکەونە چوارچێوەی شارستانێتی دیموکراتییەوە. لە سروشتی کۆمەڵایەتیدا بەردەوام ئابووری لە لۆخی جڤاتەکاندا بەڕێوەبرلوە. تاکە کەس یان دەوڵەت هیچ پەیوەندییەکی بە ئابوورییەوە نییە جگە لە پاوان. ئەو ئابوورییەی لەژێر قەڵەمڕەو و کردەی تاك و دەوڵەتدایە بەناچاری یان قازانج بەدەست دێنن یان ئیفلاس دەکەن. چونکە ئابووری بەردەوام کاری گروپە. گۆڕەپانێکی دیموکراسی راستەقینەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. ئابووری دیموکراسییە. لەهەر شتێك زیاتر دیموکراسی بۆ ئابووری پێویستە و لەجێگای خۆیدایە. لەم چوارچێوەیەدا ناتوانرێت ئابووری وەك ژێرخان یان سەرخان شرۆڤە بکرێت. بەڵکو شرۆڤەکردنی وەك سەرەکیترین چالاکی دیموکراتیانەی کۆمەڵگا واقیعیترە.

شیکارەکانی ئابووری ـ سیاسی سەرمایەداری و شرۆڤەی مارکسیستی کە پەیوەندییەکانی ئابوورییان دەرهەست کردووە زۆر مەترسیدارن. چونکە هەرگیز ئابووری نابێتە چالاکی خاوەنکار ـ کرێکار. من بۆ خۆم ناچارم دووانەی خاوەنکار ـ کرێکار وەك دوو دژی پاوانخوازی ئابووری هەڵسەنگێنم: ئەو ئابوورییەی چالاکی سەرەکی دیموکراتی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە (ئەگەر سەردەمی کلان و هۆزیشی لەناودا بژمێرین، ئەو کاتە راستترە بڵێین چالاکی یەکەمی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە). لێرەدا کە باسی کرێکار دەکەم مەبەستم ئەو کرێکارە سازشکارەیە کە بەناوی کرێ بەشێکی کەم لەو بەهایە وەردەگرێت کە لە بەشە هەژارەکانی کۆمەڵگا بەتایبەتیش لە ژنان و کچانی بێکرێ دزراوەو تاڵانکراوە. هەروەکو چۆن کۆیلە و بەندە زیاتر لە رەوشی پاشکۆیەتی سەردار و بەگەکەیدایە، کرێکاری سازشکاریش بەردەوام پاشکۆی خاوەنکارەکەیەتی. بەچاوی گومانەوە تەماشاکردنی کۆیلایەتی، بەندایەتی و کرێکارێتی و هەروەها رووبەڕووبوونەوەی، لەسەر ئەم بنەمایەش پێشخستنی چالاکی و ئایدیۆلۆژیاکەی، مەرجی سەرەکی ئەخلاقی و سیاسیبوونە. هەروەکو چۆن سێیانەی کۆیلەدار ـ سەردار ـ خاوەنکار شایانی پیاهەڵدان

نین، هەروەها کۆیلە ـ بەندە ـ کرێکاریش کە بە واتای پاشکۆیەتی ئەمانە دێن پێویستە هەرگیز بەسیفەتی توێژە باشەکانی کۆمەڵگا شکۆدار نەکرێن. راستترین هەڵوێست ئەوەیە، بەزەییت بە رەوشیان بێتەوە کە داڕووخاوترین توێژەکانی کۆمەڵگان و ساتێك زووتر لەپێناو ئازادکردنیان دەستبەکاربین.

بە ماهیەتە سەرەکییەکەیەوە ئابووری چالاکی کۆمەڵگای مێژووییە. هیچ تاکێك (بە سیفەتی کۆیلەدار، سەردار، خاوەنکار، کۆیلە، بەندە و کرێکار) و دەوڵەتێك نابنە نوێنەری چالاکی و کردەی ئابووری. بۆ نموونە هیچ تاکێکی خاوەنکار، بەگ، کۆیلەدار، کرێکار، لادێیی یان شاری ناتوانێت بەرامبەرەکەی کاری دایکایەتی بدات کە دامەزراوێکی کۆمەڵگای مێژووییە، چونکە دایکایەتی ژیانیترین و سەختترین چالاکی کۆمەڵگا فەراهەم دەکات، بەردەوامی ژیان دەستنیشان دەکات. ناخوازم تەنیا باسی وەچەخستنەوە بکەم. بەڵکو لە گۆشە نیگایەکی فراوانەوە سەیری دایکایەتی دەکەم، چونکە کلتوورێکە، دیاردەیەکە بە ترپەکانی دڵی بەردەوام لە خرۆشاندایە و خاوەن کردارێکی پڕ لە ژیرییە. ئەمەش راستییەکەیە. باشە، مادام رەوشەکە بەمجۆرەیە، ژن تا ئەم رادەیە پێویست و ژیانییە، سەرباری ئەوەی زەحمەتییەکی زۆر دەبینێت، بەردەوام لەناو کاردایە، بە ئەقڵ و دڵێکی بەجۆش و خرۆشاو بارکراوە، بە کامە ئەقڵ و ویژدانەوە دەشێت وەك رەنجدەرێکی بێ‌کرێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت؟ کامە زانستی ئابووری کە خۆی بە ئایدیۆلۆژیای زەحمەتکێشان دادەنا، مارکسیزمیشی لەناودا ، کاتێك خاوەنەکانی ئەمجۆرە چالاکییە کۆمەڵایەتییانە بەبیری خۆشیاندا ناهێنن و لە دەرەوەی کرێیان دەهێڵنەوە، خزمەتکار و پاشکۆی خاوەنکار لەگۆشەی سەرەوە جێگیر دەکەن، چۆن دەتوانن رێگە چارەکەیان لەژێر ناوی کۆمەڵایەتی پێشکەش بکەن؟ تا رادەیەکی مەترسیدار ئابووری مارکسی ئابوورییەکی بۆرژوازییە. پێویستی بە رەخنەدانێکی جددی هەیە. چونکە تا رەخنەدانێکی بوێرانە پێشنەخرێت، لە گۆڕەپانی بەرژەوەندی سەرمایەداریدا گەڕان بەدوای سۆسیالیزم، هەر وەکو لە ئیفلاس و هەڵوەشانەوەی (هەم لە خۆیەوە) بزووتنەوە (سۆسیالیزمی بونیادنراو) سەد و پەنجا ساڵییەکەیدا بینرا، بەهادارترین خزمەتە کە بێ بەرامبەر پێشکەش بە سیستەمی سەرمایەداری دەکرێت. لینین کاتێك دەڵێ"رێگای دۆزەخ بە بەردەکانی نیازپاکی بەردرێژکراوە" چەندە راستی گوتووە ! ئایا خۆیشی دەیتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە کردارەکەی ئەم رستەیەی دەسەلمێنێت ؟ لە بەشی پەیوەندیداردا هەوڵی پێشخستنی ئەم شیکارە دەدەم.

دەشێ بابەتی ئابووری وەك چالاکی بنەڕەتی ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگای مێژوویی بیری لێبکرێتەوە، ئەگەر پێویستیش بێت دەکرێ بە نۆخی دەرهەستی و زانست بگەیەنرێت. بەڵام پەسەندکردنی ئابووریناسی ـ سیاسی ناوەندێتی ئەورووپا وەك زانستێك بەو واتایە دێت کە دوای میتۆلۆژیای سۆمەر ئەقڵ دەبێتە دیلی دووەمین میتۆلۆژیای داگیرکەر. هەر بۆیە شۆڕشێکی رادیکالانەی زانست رۆڵێکی ژیانی و چارەنووسساز بۆ ئەم گۆڕەپانە دەبینێت.

پێویستە بە سووربوونەوە بڵێین" هیچ چالاکی و کردەیەکی کۆمەڵایەتی هێندەی ئابووری ئەخلاقی و سیاسی نابێت. بەم خەسڵەتەیەوە وەك لە پێشینەترین بابەتی سیاسەتی دیموکراتیانە واتادار دەبێت. سیستەمی شارستانێتی دیموکراتی کە لەسەر بنەمای ئابوری کۆمەڵگای مێژوویی ئاوالکراوە و هەزار جار لە پزیشکی زیاتر بۆ تەندروستی کۆمەڵگا پێویستە، شانبەشانی شرۆڤەی راست هیوای شۆڕشێکی راستەقینەش دەبەخشێت.

وەك مەزەندە دەکرێت فاکتەری زهنیەت سەرخانێکی دوور لە ئابووری نییە. هەڵبەتە جیاوازییەکانی لەشێوەی سەر ـ ژێر پرۆسەی تێگەیشتنی سروشتی کۆمەڵگا ئاڵۆز و تێکەڵتر دەکات. خودی سروشتی کۆمەڵایەتی ئەو هەبوونەیە کە ژێری سروشتی تێدا خەست دەبێتەوە. بیرکردنەوە لە فاکتەری دیکەی جیاوازی زهنییەت لەوانەیە بێهودە ببینرێت. بەڵام دابڕینی زانست لە کۆمەڵگای مێژوویی و کردنی بە خزمەتکاری شارستانی فەرمی و گەیاندنی بە پێگەیەك کە رۆڵی سەرچاوەی بەرهەمدارترین هێزی دەسەڵات ببینێت، چاو پێدا خشاندنەوەی زهنییەت و بونیادی ژیانی شارستانێتی دیموکراتی بایەخدار دەکات. هەڵوێستێکی رکابەر و مەیلی پێکهێنانی ئەڵتەرناتیفێك بەرامبەر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی شارستانی فەرمی و زهنیەت و بونیادەکەی واتە زانستەکەی، بەدرێژایی مێژوو بەردەوامبووە. تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی و بزلوتەکانی زانستی ئەڵتەرناتیف هەموو کاتێك لە ئارادابوون. شارستانییە کلاسیکەکان ئەو سیستەمانە بوون کە هەرە زێدە پێشکەوتنی ژێری ئەنالیتیکیان قۆستۆتەوە. لەپێناو پەردەپۆشکردنی حەقیقەتی ئیستغلالکاریشیان سوودێکی زۆریان لە هەموو جۆر و ئاستەکانی وێنا و سیمبۆڵە دەمامکدار، ترسێنەر، تۆقێنەر و خەیاڵییەکان بینیوە کە بەریڵاون و هیچ زەبت و رەبتێکیان نییە. بەردەوام خواستوویانە لە گۆڕەپان و بواری میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە و زانستگەراییدا راستییە ماددییەکانی خۆیان وەك راستی کۆمەڵایەتی گشتی پێشکەش بکەن و دەنگۆی ئەوە بڵاوبکەنەوە کە گەڕان بەدوای حەقیقەتی جیاوازتر هەوڵێکی بێهودە و لەخۆڕایە.

ئەم ئامانج و نموونە "تاقانە"یە شوێنپەنجەی خۆسەپاندنی سەرمایە و پاوان لە خۆوە دەگرێت کە خۆیان وەك تاکە راستی دەسەپێنن. وەك بڵێی هەمەڕەنگییە سەرسوڕهێنەرەکەی سروشتی یەکەم و دووەم بە رەنگی خۆڵەمێشی بۆیاخ دەکەن، و هەوڵ دەدەن بیسەلمێنن کە خۆڵەمێشی تاکە رەنگە. بڕێکی کەم لەو زێدە ـ بەهایەی کۆیان کردۆتەوە وەك سەرمایەیەکی رۆشنبیری بەکاردێنن و هیچ کاتێك هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییان کەم نەکردۆتەوە. سیستەمەکانی پەروەردە ـ خوێندنگا بوونەتە ئەو شوێنانەی کە شێوازی ژیانیان تێدا دەرخ دەکرێت. زانکۆ وەك شوێنی پەسەندکردن و هەرسکردنی حەقیقەت و ناسنامەی کۆمەڵگا بەکارناهێنرێت، بەڵکو وەك شوێنی لاتەریککردنی و نکوڵی لێکردنی بەکاردێنن. ناوەڕۆك و بونیادی زانست بەشێوەیەکی تایبەت رێکخراوە بۆ ئەوەی لەژێر ناوی ئۆبژەکتیڤێتی راستینەی کۆمەڵگای مێژوویی سروشتی کۆمەڵایەتی بکەن بە ئۆبژە و لە رۆڵی سۆبژێتی دووری خەنەوە. رێساکانی ئەو رێبازەی لەسەر هێڵی شارستانییەکی تونددایە وەك فۆرم و رێسای نموونەیی گەردوونی رەها پێشکەشکراوە.

گونجان و تەبایی شارستانێتی دیموکراتی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی لەگەشەکردنی زهنیشدا رەنگدەداتەوە. تەنانەت زهنی منداڵانەی کلانیش ئاگاداری پەیوەندییە زیندووەکانی بوو لەگەڵ سروشتدا. هەرچی وێناکردنی "سروشتی مردوو"ە هەڵبەستراوە، تەنانەت خیانەتێکی زهنییەتی شارستانییە کە هەنگاو بە هەنگاو لە سروشت دابڕاوە. ئەگەر ئەوە رەچاو بکەین کە سەردەمی فینانسی جیهانگیری رۆژی ئەمڕۆمان ئەو زیندوویێتی و ئیلاهیبوونەی لە "پارە"دا دەبینێت لە هیچ هەبوونێکی دیکەی سروشتدا نایبینێت، ئەوکاتە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوەی سەبارەت بە پیرۆزی و زیندوویێتی سروشت لە پێشەوەیە پاوانخوازێتی رۆژگاری ئەمڕۆمان نییە بەڵکو راستینەی کلانە. بونیادی هۆز، خێڵ، قەوم و نەتەوە دیموکراتەکان بوونەتە گۆڕەپانی هەبوونی زهنییەتێکی زیندوو. ژیری و بونیاد لەپێناو پەیوەندی بەستنە لەگەڵ ژیاندا. تەنیا لە سیستەمی شارستانێتی دیموکراتیدا دەشێ ژیری سۆزداری و ژیری ئەنالیتیکی بە یەکێتی دیالیکتیکیانەی خۆیان بگەن.

زهنییەتی شارستانێتی دیموکراتی کە بە گومانەوە تەماشای سیستەمە فەرمییەکانی قوتابخانە، ئەکادیمیا و زانکۆکان دەکات، بەدرێژایی مێژوو لە پێشخستنی ئەڵتەرناتیفەکانیان درەنگ نەکەوتووە. لە سیستەمەکانی پێغەمبەرایەتییەوە تا دەگاتە قوتابخانەی فەیلەسووفان، لە تەسەووفەوە تا دەگاتە زانستەکانی سروشت بەشێوەیەکی لەژمار نەهاتوو مەقام، تەکییە، ئۆجاخ، تەریقەت، مەدرەسە، مەزهەب، مانستەر، مزگەوت، کڵێسا و پەرستگای ناواکردووە و

پێشیخستوون. بەمجۆرە دەبینرێت کە شارستانی تاکانە نییە، بەڵکو نۆخی نووانەیی سروشتی کۆمەڵایەتی لەهەر گۆرەپانێکدا خۆی پیشاندەدات. کێشە ئەوەیە بەبێ ئەوەی لەناو بونیادی تاقانەیی فەرمیدا بخنکێیت، لەلایەنی سروشتپەروەریی نووالیزمەکەدا چارەسەری پێویست بەرەو پێشەوە ببەیت و توانای پەرەپێدانی جیاوازییەکانی ژیانی ئازادت هەبێت بەو سیفەتەی بژاری شارستانێتی دیموکراتییە.

**٧ ـ فاکتەرەکانی سیاسەتی دیموکراتی و بەرگری گەوهەری (رەوا)** : فاکتەرەکانی ئاسایش و سیاسەتی شارستانێتی دیموکراتییانە رۆڵێکی سەرەکی لە هەبوون و ژیانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیدا دەبینێت. لەوانەیە هەندێك کەس پۆلێنی سیاسەتی دیموکراتییانە بۆ چەمکی کۆمەڵگا زیاد ببینن کە خۆی پۆلیتیکە. بەڵام جیاوازی لەنێوان هەردووکیاندا هەیە. لە کۆمەڵگای پۆلیتیکدا لەوانەیە هەموو کاتێك سیاسەتی دیموکراتیانە پراکتیزە نەکرێت. کەچی ئەوەی بە درێژایی مێژووی شارستانی فەرمی بەسەر کۆمەڵگای سیاسیدا سەپێنراوە بەزۆری باڵادەستی پاشایەتی زۆردار بووە. ئەو کۆمەڵگا سیاسییەی لەژێر باڵادەستیدایە بەتەواوی لەناوناچێت، بەڵام ناتوانێت خۆی دیموکراتیزەش بکات. هەروەکو چۆن بەردەوام هەبوونی گوێ بۆ بیستن بەش ناکات، بەڵکو پێویستە تەندروستانەش بێت، بەهەمان شێوە بوونی شانەی سیاسی بەو واتایە نایەت کە بەردەوام بەشێوەیەکی ئازاد کار دەکات. کارکردنی تەندروستانەی شانەکە گرێدراوی هەبوونی کەش و هەوا و زەمینەی دیموکراتییە.

بە گشتی دەتوانرێت هەبوونی کەش و هەوای دیموکراتی و بونیادی سیاسی کۆمەڵگای پۆلیتیك بە سیاسەتی دیموکراتی ناوببرێت. سیاسەتی دیموکراتیانە تەنیا شێوازێك نییە، بەڵکو گوزارشت لە گشتگیری و هەمووێتی دەزگا (دامەزراوە)ش دەکات. ئەگەر چەندین بە دەزگابوونی لە چەشنی پارت، گروپ، ئەنجوومەن، میدیا، کۆبوونەوە.. هتد لە ئارادا نەبن پراکتیکی سیاسەتی دیموکراتییانە بەرەو پێشەوە ناچێت. رۆڵی بنەرەتی دامودەزگاکان گفتوگۆ و بریاردانە. لە تەواوی کارە هاوبەشەکانی کۆمەڵگادا گفتوگۆ و بریار وەرگرتن لە ئارادا نەبێت ژیان بەردەوام نابێت. ئەنجام یان کائۆس یان دیکتاتۆریەتە. ئەو کۆمەڵگایەی دیموکرات نییە بەردەوام چارەنووسەکەی بەمجۆرەیە. لەنێوان لوتکەکانی کائۆس و دیکتاتۆرییەتدا دەهەژێن و دێن و دەچن. لەم رەوش و زەمینەیەدا بیر لەپێشکەوتنی ئەخلاقی و سیاسی ناکرێتەوە. لە نۆخێکی بەمجۆرەدا تێکۆشانی سیاسی واتە ئامانجی لە پێشینەی سیاسەتی دیموکراتییانە ئاولکردنی کۆمەڵگای دیموکراتییانەیە،

لەم چوارچێوەیەدا لەرێگای گفتوگۆکردن و بڕیار وەرگرتن دەرهەق بە کارە هاوبەشەکانەوە بە باشترین لۆخ دەگەیەنرێت.

لەو زەمینە و دامودەزگایانەی بە دیموکراسی بۆرژوازی ناو دەبرێت ئەو سیاسەتەی لە رۆڵی راستەقینەی خۆی دوورخراوەتەوە ئامانجی لە پێشینەی دەسەڵاتە. هەرچی دەسەڵاتە وەرگرتنی بەشە لە پاوان. ئاشکرایە سیاسەتی دیموکراتییانە ئامانجی بەمجۆرەی نابێت. گریمان جێگای خۆی لەناو دەزگاکانی دەسەڵاتیشدا گرت (بۆ نموونە حکومەت)، ئەو کاتەش دیسان کارە سەرەکییەکەی هەمان شتە. ئەم کارە بەدەستهێنانی بەش نییە لەپاوان، بەڵکو وەرگرتنی بڕیاری راستە لەپێناو بەرژەوەندییە ژیانیی و هاوبەشەکانی کۆمەڵگا، بەئواداچوونی کردەوەکانە. کاتێك بڵێین وەك رێسا نابێت جێگای خۆی لە دیموکراسی بۆرژوازیدا بگرێت، ئەمە هەڵوێستێکی واتادار نییە. بەڵام پێویستە بزانێت بە مەرج جێگای خۆی تێدا بگرێت. چونکە بێ پرەنسیپی بەردەوام سوودی بۆ سیاسەتمەدارێتی ساختەی چینی دەسەڵاتدار هەیە.

پێویستە هەرگیز ئەو خاڵە پشتگوێ نەخرێت کە سیاسەتی دیموکراتییانە پێویستی بە کادیری بەتوانا، میدیا، رێکخستنی پارتی، رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، خەباتی بەردەوامی پەروەردەی کۆمەڵگا و پروپاگەندە هەیە. دەتوانرێت رێزگرتن لە سەرجەم جیاوازییەکانی کۆمەڵگا، پێویستی تەبایی و یەکسانی لەسەر بنەمای جیاوازییەکان، بە ئەندازەی لێوەشاوەیی شێوازی گفتوگۆکردن گرنگیدان بە ناوەڕۆکەکەی، بوێری سیاسی، لەپێشینەیی لایەنی ئەخلاقی، تواناو لێوەشاوەیی سەبارەت بابەتەکان، مەعریفەی مێژوویی و هەنووکەیی، هەڵوێستی زانستی - گشتگیرانە وەك تایبەتمەندێتییە دەست لێبەرنەدراوەکانی سیاسەتی دیموکراتیانە بۆ ئەنجامیگربوون و سەرکەوتن ریز بکرێت.

بەرگری گەوهەری سیاسەتی ئاسایشی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. راستتر بڵێین" ئەو کۆمەڵگایەی نەتوانێت خۆی بپارێزێت خەسڵەتی ئەخلاقی و سیاسی بێواتا دەبێت. لە رەوشێکی بەمجۆرە کۆمەڵگا کراوە بە کۆڵۆنی، دەتوێتەوەو دەرزێت، یان لە لۆخی بەرخوداندایە و دەخوازێت سەرلەنوێ سیفەتی ئەخلاقی و سیاسی بەدەستبێنێتەوە و کارایان بکات. بەرگری گەوهەری ناوی ئەم پرۆسە و قۆناخەیە. ئەو کۆمەڵگایەی داکۆکی لەسەر ناوەڕۆك و خاوەندارێتی خۆی دەکات، داگیرکردن و هەموو جۆرە وابەستەییەکی یەکلایەنەی سەپێنرلو رەت دەکاتەوە، تەنیا لەمیانەی توانا و دامەزراوەکانی بەرگری گەوهەرییەوە دەتوانێت ئەم هەڵوێستەی بەرەو پێشەوە ببات. بەرگری گەوهەری تەنیا بەرامبەر هەڕەشە دەرەکییەکان پێکنایەت. چونکە هەر

کاتێك دەشێت ناکۆکی و گرژی لەناو بونیادەکانی ناوەوەی کۆمەڵگادا رووبدات. پێویستە لەبیر نەکەین کە لە مێژە کۆمەڵگا مێژووییەکان خاوەن خەسڵەتی چینایەتی و دەسەڵاتدارێتین، هەندێك هێزیش دەردەکەون کە خوازیارن بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەم تایبەتمەندێتییانە بپارێزن. ئەم هێزانە لەپێناو پاراستنی هەبوونی خۆیان بە هەموو هێز و توانایانەوە بەرخودان دەکەن، لەم سۆنگەوە" بەرگری گەوهەری بۆ ماوەیەکی درێژ وەك داواکارییەکی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی جێگایەکی گرنگ لە رۆژەڤی کۆمەڵگادا دەگرێت. ئەگەر هێزی بڕیار لەمیانەی هێزی بەرگری گەوهەرییەوە پتەو نەبێت بە ئاسانی جێبەجێ ناکرێت.

لە رۆژگاری ئەمرۆماندا رووبەڕووی راستی دەسەڵاتێکین نەك تەنیا لە دەرەوەی کۆمەڵگا بەڵکو لەناوەوەش دژەی کردۆتە ناو سەرجەم مەمیلەکانییەوە. ئاواکردنی گروپە هاوشێوەکانی بەرگری گەوهەری لەناو سەرجەم شانە و مەمیلە گونجاوەکانی کۆمەڵگا پێویستییەکی ژیانییە. ئەو کۆمەڵگایانەی بێ بەرگری گەوهەرین، کۆمەڵگایەکن لەلایەن پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵاتەوە دەستەمۆ و داگیرکراون. لە کلانەکانەوە تا هۆز و خێڵەکانەوە، لە قەوم و نەتەوەکانەوە تا دەگاتە گروپە ئایینییەکانەوە، لە گوندەکانەوە تا دەگاتە شار بەدرێژایی مێژوو هەر یەکینەیەکی کۆمەڵگا بەردەوام کێشەیەکی بەرگری گەوهەری هەبووە. پاوانی سەرمایە و دەسەڵات وەك ئەو گورگە هارەیە کە بەدوای نێچیر کەوتووە، وەك مێگەلی مەڕ ئەوانە پەرێشان دەکات کە لە بەرگری گەوهەری بێبەشن و چەندەی ویستووە زەوتی کردوون.

لەپێناو بوون بە کۆمەڵگایەکی دیموکراتی و بەردەوامکردنی هەبوونەکەی بەلانی کەم بەو رادەیەی بتوانێت سنوور بۆ چەوسانەوە و هێرشەکانی پاوانی سەرمایە و دەسەڵات دابنێت، ئاواکردنی بونیادی بەرگری گەوهەری و پێشخستنی چالاکییەکەی، ئامادەکردن و کارلکردنی مەرجە. بەگوێرەی ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بە یەکەوە لەگەڵ دامەزراو و ئامێرەکانی دەسەڵات و سەرمایەدا دەژین، گرنگە نەخزێینە ناو دوو هەڵەوە. هەڵەی یەکەم" وەك ئەوەی جگەر تەسلیمی پشیلە بکرێت، ئاسایشی خۆی رادەستی سیستەمی پاوانخوازی بکات. ئەنجامە وێرانکارییەکانی ئەم دۆخە لە میانەی هەزاران نموونەوە ئاشکرابووە. هەڵەی دووەم" ئەوەیە بەرامبەر بە دەوڵەت لەمیانەی پارولای بەدەوڵەتبوون هەوڵی بوون بە ئامێری دەسەڵات بدرێت. ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەم بارەیەوە بەپێی پێویست رۆشنکەرەوەیە. لەم سۆنگەیەوە" بەرگرییەکی گەوهەری واتادار و کارا لەمێژوو، رۆژی ئەمرۆمان و داهاتووش وەك فاکتەرێکی شارستانێتی دیموکراتی دەمێنێتەوە کە ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت.

بێگومان دەتوانین چەندین فاکتەری دیکەی شارستانێتی دیموکراتی ریز بکەین و روونیان بکەینەوە. بەڵام لەو بڕوایەدام کە سەبارەت بە تێگەیشتنی بابەتەکە و دەرککردن بە گرنگییەکەی ئەم باسەی پێشکەشمانکرد بەسە و تێر دەکات.

# تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

میتۆدەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ناوەندێتی ئەوروپا سەبارەت بەلێکۆڵینەوەی راستی (حەقیقـەت) وەك پێویستییەکی ناوەڕۆکەکەی هەژموونگەرایە. لەمیانەی دوو پەیڕەوی سەرەکییەوە وەك بڵێی رێگای ئەڵتەرناتیفەکانی حەقیقەت ناهێڵن و مەحاڵی دەکەن: یەکەمیان" هەڵوێستی تاکرەوێتی(مۆنیست[1]) رەهای گەردوونییە. هەموو کاتێك حەقیقەتی بۆ "یەك" بچووککردۆتەوە. دووەمیان" مۆدێلی رێژەیی بێ سنوورە. لەکاتێکدا دەڵێت هەر کەسێك حەقیقەتێکی بەگوێرەی خۆی هەیە، لەناوەڕۆکدا هەوڵدەدات ئاماژە بە نەبوونی حەقیقەت بکات. ئەمەش هەر وەك ئەوەیە: بۆ ئەوەی بانگەشەی ئەوە بکرێت کە هیچ شتێك ناگۆڕێت، بڵێیت هەموو شتێك دەگۆڕێت. ئاشکرایە کە هەردوو پەیڕەویش لە مۆدێلی میتۆدی بچووککردنەوەدا یەکدەگرن. ئەگەر چەمکی"یەکانەیی" گەردوونگەرایی رەهایە یان "تاقانەیی" رێژەگەرایی کاتێك حەقیقەت بۆ "یەك" بچووکدەکەنەوە ئەوا خەسڵەت و کارەکتەری هەژموونگەرایی خۆیان دەخەنەڕوو.

بێگومان پاوانخوازێتی شارستانی لەپشت ئەم پەیڕەوانەوەیە. ریشەکەیان بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە کە راهیبەکانی سۆمەر "ئەن" یان وەك گەورەترین خوداوەند ئافراند. هەرچی هۆکاری شکۆدارکردنی" ئەن"ە بۆ پێویستی رەواکردنی پلەداری هەڵکشاو و پاوانخوازێتی شار - چین - دەوڵەت، و باڵادەستی هەژموونگەرایی ( لەو بڕوایەدام کە باڵادەستی و هەژموونگەرایی هەمان ریشەیان هەیە ) بەسەر زهنیەتی کۆمەڵگاوە دەگەڕێتەوە. یەکەمین هۆکاری ئافراندنی خوداوەنی لە فەلسەفەی یۆناندا(چەمکی خوداوەند لای ئەرستۆ و ئەفلاتۆن) ، بەو سیفەتەی گەورەترین داهێنانە هەمووی سەرچاوەی خۆی لە هەمان هۆکارەوە وەردەگرێت. ئەو شێوەیەی "ئەن" لە ئایینە تاکخوداییەکان پێی گەیشتووە "ئەڵلا" ی رەب ئەلعالەمینە. "ئەل"یش لە "ئەڵلاهی" دێت. لە سەردەمی هەڵکشانی رۆماشدا بە ناوی "ژوپیتەر" لەبەرامبەرمان قووت دەبێتەوە. ئەو خەسڵەتەی زۆر جار تێبینی دەکرێت، لەهەر کۆمەڵگایەکی رژێمەکانی پاشا - خودلوەند و

---

[1] یەکانەیی (Monism): تێڕوانینێکی غەیبی و تیۆلۆژییە، لەو بڕوایەدایە کە تاکە پرەنسیپێك هەیە وەك ئەقڵ یان مادە. واتە حەقیقەت تاکە یەکێتیەکی ئەندامییە، هیچ بەشێکی سەرەکی جێگای باس نییە، تەنیا چەند یاسایەك جێگای باسن کەسروشت رۆشن دەکەنەوە و بەڕێوەی دەبەن.

ئیمپراتۆریەتیان تێدا ئاوا دەکرێت لەمیانەی ئەم چەشنە زاراوە ئایینی یان میتۆلۆژیانەی مەشروعیەت پێدان هەوڵی رەواکردنی خۆیان دەدەن. لە هەر رژێمێکی پادشایەتی، ئیمپراتۆرییەت و ستەمکاردا شکۆدارکردنێکی لەمجۆرەی زاراوەکان و هەوڵێکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی دەبینرێت. چونکە هەژموونگەراییەکی زهنی بەمجۆرە نەبێت، زەحمەتە ئەم رژێمانە هەمیشەیی بن.

پاوانخوازی سەرمایەداری ئەورووپا (بە سیفەتی شێوە و ناوەندی نوێی هەژموونگەرایی شارستانی) کاتێك لەسەدەی شازدەهەم لە هەڵکشاندابوو، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا تێگەیشتبوو ئەگەر هەوڵێکی هاوشێوە لە ئارادا نەبێت باڵادەستی بەدەست ناهێنێت. پارە ـ سەرمایە(شێوەیەکی سەرمایەیە و سیفەتی دامەزراوی دەسەڵاتی هەیە و لە سەرمایەی زانراو جیاوازترە) کە تا ئەو کاتە خۆی لە رارەو و کەلێنەکانی کۆمەڵگادا حەشاردابوو بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا وەك هێزێکی هەژموونگەرایی لەسەر کۆمەڵگا و تەواوی شانە و مەمیلەکانی لە ئۆخی هەڵکشاندایە.

فرانسیس باکۆن، رۆجەر باکۆن و دیکارت کە لە میتۆلۆژیای بە ریشە کریستیانییەوە هەڵدەقوڵێن لێکەرینەکانیان سەبارەت بە میتۆدی نوێ لە نزیکەوە گرێدراوی قەڵەمبازی ئەم هەژموونگەرا مادییەیە. چونکە ئەو "حەقیقەت"ەی لەبواری پەیرەو و ناوەرۆکدا بەدوایدا دەگەرێن، لەگەڵ هەڵکشانی هەژموونگەرایی ئەمجۆرە نوێیەی سەرمایە هاوبەشە. کاتێك پاوانی سەرمایەداری هەژموونگەرایی خۆی جێگیر و قایمکرد، هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەکەشی بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵیدا خۆی جێگیر و هەمیشەیی دەکات. تەنیا لەمیانەی کاریگەرییە وەرچەرخێنەرەکانی ئەم هەلومەرجە مادییە دەشێ روونکردنەوە زانستییەکەی میتۆدی نوێی شۆرشی زانست و فەلسەفە) بدۆزرێتەوە. بێگومان بەستنەوەی هەر شتێك بە سەرمایەدارییەوە رێگا لە پێش نابینایی دەکاتەوە. هەڵوێستێکی بەمجۆرە بە واتای کەوتنە تەڵەزگە و قەبەترین میتۆدی بچووککردنەوە دێت. بەڵام کاتێك گرنگی پەیوەندی نێوانیان پشتگوێ بخرێت، لێکەرینەکانی حەقیقەت کورتی دێنێت، لەناو باسە میتافیزییەکاندا بێ واتا دەبێت.

لەکاتی روونکردنەوەی زاراوەی مۆدێرنیتە (تازەگەری) رەچاوکردنی پێکهاتنی ئەم پەیرەو و حەقیقەتە تا ئەوارادە پێویست و ئەزموونبەخشە. چەندین جۆری تازەگەری هەیە کە بەواتای "چاخ (سەردەم)" دێت، جیاوازییەکەی بە گوێرەی قۆناخەکان دەگۆرێت. چەندین نموونەی مۆدێرنیتە (تازەگەری) لە ئارادایە: لە مۆدێرنیتەی سۆمەرەوە تا دەگاتە مۆدێرنیتەی رۆما،

تەنانەت بەر لەوان و دواتریشیان. کێ دەتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە سەردەمانێك لە تەواوی ناوەندەکانی شارستانی بەسەربەرزییەوە مۆدێرنیتەی رۆما شێوازی ژیان بوو؟ ئەی لەمیانەی تەماشاکردنی تۆمارە شوێنەوارناسیەکانەوە بە خرۆشانەوە نابینین کە سۆمەرییەکان و تەنانەت ئەوانەی پێشووتر لە میزۆپۆتامیای سەروو نەوازەترین نموونەکانی مۆدێرنیتەیان پێشکەشکردووە؟ ئایا بەبێ واتادارکردنی کلتووری ماددی ئەم مۆدێرنیتانەی ماهیەتی شۆڕشیان هەیە، دەشێ رۆشن بکرێنەوە؟

ئەنتۆنی گیدنس کاتێك جیاوازی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەگەڵ سەرجەم تازەگەریەکانی دیکە دەخاتە روو، تاڕادەیەك کۆمەك بە روونکردنەوەی حەقیقەت دەکات. بەو سیفەتەی کە کوڕی هەژموونگەرایی ئینگلیزە دەشێ دەرك بەم پێگەیەی گیدنس بکرێت. بانگەشەکانی تاقانەیی، وەك عیبادەت و قەرزێکی رۆشنبیرە هاوچەرخەکانە بەرامبەر وڵاتەکەیان و دەوڵەت - نەتەوە (خودلوەندە نوێیەکە)یان. سەرباری ئەوەی وەك پۆلێنێکی سەرووتر مۆدێرنیتە لە سەرمایەداری جیا دەکاتەوە، جێگیرکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر سێ کۆڵەکە(پێچکە)کەی ئەزموونبەخشە. لەکاتی ئەنجامدانی ئەمەدا ئاشکرایە ئەو هەڵوێستەی تێی کەوتووە زهنییەتی "تاقانەیی"یە کە بەسەر پەیڕەوی زانستی کۆمەڵایەتیدا زاڵە. ناخوازێت شانس و دەرفەت بە جۆرێکی دیکەی مۆدێرنیتە بدات. بە بڕوای ئەو واتە ئەگەر مۆدێرنیتە هەبێت تاکە، لە هەمان قۆناخدا ناشێ دوو جۆر مۆدێرنیتە هەبێت! بەڵێ ئەم بابەتە زهنییەتی هاوبەشە کە بەسەر سەرجەم قوتابخانەکانی زانستی کۆمەڵایەتیدا زاڵە، بە راست و چەپ و ناوەڕاستییەوە. تەواوی رۆشنبیرە چەپەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە کارل مارکس هیچ گومانێکیان لە تاقانەیی مۆدێرنیتە و جۆرە ئەورووپییەکەی نەبوو. هەرچی گروپە راستڕەو و ناوینەکان و رۆشنبیرە لیبراڵەکان بوون لەو بڕوایەدا بوون کە دوا گوتەی راستییە (چەندە بەگوتەی دوا پێغەمبەری ئیسلامی چاخی ناوین دەچێت). هەرچی گوتە جیاوازەکانی قۆناخی پۆست مۆدێرنیتە (پاش تازەگەری) شە تازە دەرکەوتوون.

بێگومان رەخنەکانی نیچە سەبارەت بە مۆدێرنیتە گرنگە. هەرچی رەخنەی ئاینە دەرهەق بە مۆدێرنیتە، تەنیا لەبارەی مۆدێرنیتەی خۆیانەوە (چاخی کۆن کە لە دوای چاخی نوێ بەجێماوە) واتایەکی هەیە. لەگەڵ ئەوەی بانگەشەکەی میشێل فۆکۆ گرنگە کە دەڵێت: مۆدێرنیتە بە مردنی مرۆڤ ئەنجامگیربووە، بەڵام ناتەواوە. هەرچی سۆسیالیزمی بونیادنراوە، سەرەڕای بانگەشە جیاوازەکانی، هیچ کاتێك نە لەبواری تیۆری نەپراکتیکی کێشەیەکی بەمجۆرەی نەبوو کە

ببێتە مۆدێرنیتەیەکی جیاوازتر. ناوەندە فەرمییەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو کاتێك بانگەشەی مەدەنیەتێکی نوێیان دەکرد، بەردەوام لەمەدا مەبەستیان گەشەسەندن و ئەو پێشبڕکێیە بوو کە لە هەموو بوارێکەوە لەگەڵ سەرمایەداری ئەنجامیاندەدا. بڕیان لەوە کردۆتەوە کە لە سەرمایەداری زیاتر لە قاڵبە سەرەکی و کۆڵەکەکانی (ئیندوستریالیزم، دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری دەوڵەت لەجیاتی سەرمایەداری تایبەت) مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نزیکن و پێشکەوتنی لەڕێگای ئەمانەوە کردووە بە ئەرکی سەرەکی خۆی. ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەسەرووی هەموویشیانەوە ئەزموونەکانی روسیاو چین، دەرەنگ نەکەوتن و سەلماندیان کە خوێنی تازەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوون. تاکە ئامانجی سەرجەم بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی، ساتێك زووتر مۆدێرنتەی زاڵ بەدەست بێنن کە وەك لوتکەی سەرکەوتن دەبینرێت و بەمجۆرەش ژیانی بەختەوەرانە بونیاد بنێن. تیۆری و پراکتیك بەمجۆرەبوون. گومانێکی زۆر کەمیان لەو بارەیەوە هەیە.

بەو سیفەتەی مۆدێرنیتەی زاڵی ئەم چوار سەدەیەی دواییە (مەبەست مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە) کاتێك چوارچێوەو شێوەکەی رەخنە دەکرێت، تەنیا دەرك بەوە ناکرێت کە دواترین بچمی (مۆدێرنیتەکانی) چاخەکانی شارستانی پێنج هەزار ساڵییە، بەڵکو ئەو کاتە دەبینرێت کە وەك گۆشت و نینۆك بەیەکەوە گرێدراون و لە ئەڵقە جیاوازەکانی زنجیرێك پێکهاتوون و شیکارکردنیشیان ئاستەم نابێت.

ئەوەی لەرێگای ئەم بەرگە یان بەرگەکانی پێشووتر هەوڵمداوە شکاندنی ئەم چەمکە تاکانەییەی مۆدێرنیتەی گەردوونی رەهایە. کاتێك دەڵێم بیروبۆچوونێکی هەوڵی سەلماندنی ئەوەمداوە کە بەردەوام ئەڵتەرناتیفەکەشی لەگەڵدایە، هەروەها سەرباری تەواوی هەوڵەکانی سەرکوت و پەردەپۆشکردنەوە دیمەن و رووخسارەکانی خۆی نواندووە، بەو سیفەتەی ئەم ئەڵتەرناتیفە جەمسەرەکەی دیکەی دوالیزمی دیالیکتیکیشە، لەمیانەی فراوانی و شێوەکانییەوە بەردەوامی بە هەبوونی خۆیداوە. لەوانەیە وەك ناو شارستانێتی دیموکراتی ناتەواو بێت، لەوانەیە پێویستی بە رەخنەکردنێکی زۆریش هەبێت ـ شارستانی لەزمانی تورکیدا هاوواتای وشەی چاخ "سەردەم"ە و بە واتای مۆدێرنیتە دێت ـ . بەڵام کاتێك جۆنایەتی کۆمەڵگای مێژوویی کۆمەڵگا رەچاو دەکەم، نە دڵم نە زەنم هەرگیز رازی نەدەبوو کە ئەو بزاوتانەی مێژوویان بارکردووە لە کۆمەڵگای کلانەوە تا دەگاتە جڤاتەکانی خێڵ، قەبیلە، قەوم، گوند، گروپە ئایینییەکان و... هتد لەچوارچێوەی هەڵوێستی هەمان شارستانی"شار ـ دەوڵەت ـ چین" بەشێوەی سووکایەتی پێکردن بە "بەربەر"

یاخود "کۆنەپەرستی ئایینی" ناوبرێن. دوای ئەوەی باش تێگەیشتم کە بەردەوام دیالیکتیك بە شێوەی جەمسەرە لەناو بەرەکان کار ناکات، هەر وەکو لە ئاواکردنی گەردوونی گشتیدا دەبینرێت، ئەوا بۆ منیش دەستنیشانکردنی ئەو راستییە زەحمەت نەبوو، لە رەوتی پێشکەوتنی دیالیکتیکی لەناونەبەرانەی کۆمەڵگای مێژووییدا شارستانی تاکانە نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی دوالیزمییە. هەرچەندە لەناو هەلومەرجێکی دژوار و نەبوونی ئامادەکاری و دەرفەتیشدا بێت، ئەوەی مایەوە لەرێگای ئەم بەرگانەوە هەوڵی ئاماژەپێکردن و تاقیکردنەوەی دەدەین. ئەو خاڵەی لام سەیرە و تووڕەشم دەکات، سەرباری ئەو توانا و ئامادەکارییانەی بەدەستیانەوەیە، بۆچی زاناکانی زانستی کۆمەڵایەتی ئەوەری ئەوروپا هەوڵیاننەداوە ئەم دوالیزمەی شارستانی بەشێوەی دوو مۆدێرنیتەی جیاواز بکەن بەسیستەم.

جارێکی دیکە بۆ سێ کۆڵەکە سەرەکییەکەی زاراوەی مۆدێرنیتەی ئەنتۆنی گیدنس بگەڕێینەوە و هەوڵی شیکارکردنی واتاکانی و وەڵامی زاراوەی تازەگەری (مۆدێرنیتەی) دیموکراتی جەمسەری بەرامبەر بدەین.

### أ ـ جیاکردنەوەی سەرمایەداری و مۆدێرنیتە

بەگوێرەی گیدنس بۆ یەکەمجار لەمێژوودا سەرمایەداری لەئەوروپا سەریهەڵداوە(بێگومان زۆرینەی زۆری زانا کۆمەڵایەتیەکانی ئەوروپا لەمبارەوە هاوفیکرن). لە هیچ شوێن و قۆناخێکی مێژوودا هاوشێوەکەی نەبینراوە. ئەو سەرمایەدارییەی باس دەکرێت سەرمایەداری ئەمستردام ـ هۆڵەندا و لەندەن ـ ئینگلتەرایە کە لەسەدەی شازدەهەم وەك ناوەندی هێزی هەژموونگەرایی جیهان هەڵکشاوە. بەشی واقیعی لێرەدا شاراوەیە کە ئەمستردام و لەندەن لەم سەدەیە بەدواوە هەژموونگەرایی شارستانی ناوەندی جیهانی کلاسیکیان وەرگرتووە. هەرچی سەبارەت بە چۆنیەتی گواستنەوەی هەژموونگەراییە، مێژووی جیهان بەرفراوانترین ماتریاڵی دەرهەق بەم قۆناخە لەبەر دەستدایە، تەنانەت بەرفراوانترین تاقیگەی هەیە. نە دەرفەتی دووبارەکردنەوە هەیە، نە پێویستی بەمە دەکات، تەنیا ئاماژەی پێدەکەین. لە بەرگەکانی دیکە تۆزێك باسمان کردبوو. گرنگتریشیان لایەنە هەڵە و ناتەواوەکانی ئەم پێناسەیەیە .

أ ـ بانگەشەی تاکانەیی سەرمایەداری راست نییە، بەشێوەیەکی بەرفراوان ئاماژەم پێکردبوو کە یەکەمین پاوانی سەرمایە لە پەرستگا ( زەقورە لەوانەیە یەکەمین بانك و کارگە بێت )ی راهیبی سۆمەر پێکهاتووە. گرێدراو بەمەوە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین لە پێکهاتنی یەکەمین

هەژموونگەرایی سێیانەی شار ـ چین ـ دەوڵەت بە شێوەی پاوان قەرزداری سۆمەرییەکانن. بەتایبەتیش دوای خوێندنەوە و ئاگاداربوونم بە بۆچوونەکانی ئەندری گوندەر فرانك و هاوڕێ نزیکەکانی دەرهەق بە شارستانی ناوەندی و سیستەمی دونیا، بڕوام بە بۆچوونەکانی خۆم تۆکمە و پتەوتر بوو. هەروەها بە سووربوونەوە ئاماژە بەوە دەکەم کە پاوانی دەسەڵاتیش شێوەیەکی جیاوازتری پاوانی سەرمایەیە. جەختم لەسەر دەرککردن بەو خاڵە کردەوە کە یەکێك لە چوار چەشنە سەرەکییەکانی کەڵەکەکردنە. یەکەمین پاوان لەو کشتوکاڵە ئاوڵکراوە کە بەرهەمەکەی زیادی کردووە. لەبەر ئەوەی ناوچەکە بازرگانی کردووە بە ناچارییەك، دەرفەتی پەرەسەندنی پاوانی بازرگانیش رەخساوە. هەروەها یەکەمین پاوانی پیشەسازی لەسەر پیشەکارەکانی شار ـ پەرستگا جێگای باس بوو. هەرچی فەرمانڕەوایەتی شارە کە لەبواری سەربازی و ئیداری ئەرکی وەرگرتبوو، لە پێگەی بەهێزترین پاوانی دەسەڵاتدا بوو کە لەگەڵ سێیانەکەی سەرەتا لەناو پەیوەندییەکی توند و تۆڵدا بوو. جیاوازی رادە و ئاستی هێزەکانیان پەیوەندی هەژموونگەرایی دەکرد بە ناچارییەك. لەسەرەتا هەژموونگەرایی راهیبەکان بەهێز بوو، بەڕیزە ئەم نۆخە گۆڕانکاری بەسەرداهات. بەکورتی کارلکتەر و خەسڵەتی پاوان وهەژموونگەرایی هەر لە قۆناخی ئاوالکردندا پەسەند و پەیڕەو کراوە. لە بەرگەکانی پێشووتر هەوڵمدا پەرەسەندنە مێژووییەکەی لە شێوەی ئەڵقەی سەرەکی پێشکەش بکەم. هەروەها دەستنیشانکردنێکی زۆر گرنگ سەبارەت بە پاوانەکانی شارستانی ئەوەیە، چەندە لەنێوان خۆیان لەناو ناکۆکی و پێکداداندا بن، بەڵام بەرامبەر دەرەوە (هێزەکانی شارستانێتی دیموکراتی) بە یەکەوەو بە سیفەتی ئەڵقە مێژووییەکانی زنجیرێك دەجووڵێنەوە. ئەگەرمیراسی ئەوانەی پێشووتر لە ئارادا نەبێت هیچ شارستانییەك سەریهەڵنەدەدا. باسی سیستەمێکی شارستانی ناوەندی دەکەم نەك چین و ئینکاکان.

پێشتر بەشێوەیەکی بەرفراوان هەوڵمدا بەدرێژی باسی چیرۆکی پێکهاتنی ئەڵقەی شارستانی ئەورووپا بکەم. بە گرنگییەوە ئاماژەم بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ شارستانی رۆژهەڵات (تەنانەت لەگەڵ نیولیتیکەکەی) و رۆڵی گوێزەرەوەی ڤێنسیا کرد کە نزیکەی سێ سەدە بەردەوام بوو. گرنگترین خاڵی کە دەتوانرێت سەبارەت بە تاکانەیی شارستانی (بە واتای مۆدێرنیتەکەی) ئەورووپای دوای سەدەی شازدەهەم بانگەشە بکرێت ماهیەتی پارە ـ سەرمایەیە کە پێگەیشتووترە. بێگومان لەم سەدەیەوە پاوانی پارە ـ سەرمایە یەکەمین پاوانی هەژموونگەرایی خۆی لە ئەورووپا ئاوالکردووە. لەم لایەنەوە دەشێت باس لە تاکانەیی و بێ هاوتابوونی بکرێت. بەڵام راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ناتوانرێت بگووترێت ئەورووپا لانکەی پارە ـ سەرمایەیەو ئەو

قۆناخەش مێژووەکەیەتی. چونکە یەکەمین شتەکانی لە پارە دەچوون زۆر بەر لە شارستانی بوو. پسپۆرەکانی چاخەکانی یەکەم(کۆن) لەو بارەیەوە هاوفیکرن کە ئۆبسیدیەن و ماددە هاوشێوەکانی رۆڵی یەکەمین پارەیان بینیوە. چەندین ماددە و شتوومەکی بەنرخ تا ئێستاش لە کۆمەڵگاکانی کۆمۆنەی سەرەتاییدا رۆڵێکی هاوشێوە دەبینن. هەر کەسێکی پەیوەندیدار بەم بابەتە دەزانێت لێدانی یەکەمین دراو ـ پارە، بۆ یەکەمین جار بەشێوەی درلوە زێڕییەکانی کریورۆسی پاشای لیدیا بووە کە لەسەدەی حەوتەمی پ.ز لە رۆژهەڵاتی ئیجە ئاواکراوە. دەتوانرێت هەمان شت سەبارەت بە کەڵەکەکردنی پارە– سەرمایەش بگووترێت. چونکە کەڵەکەکردن (کۆکردنەوە) نەریتێکی زۆر کۆنە. لەم چوارچێوەیەدا بەدرێژایی مێژوو کانزا و ماددە بەنرخەکان کۆکراونەتەوە. ژمارە شوێنەوارناسییەکان لەم بارەوە نموونەیەکی زۆری پێشکەش کردووین. گوتەی"هێندەی قارون دەوڵەمەند" ئەم راستییە دەردەبرێت. هیچ شتێك وەك قاروونەکانی ئاشوور (پارە، بازرگانی، بازاڕ، واتایەکی هاوشێوەی کۆگای بەرهەمەکانی هەیە) بەشێوەیەکی رەسەن و سەرنجڕاکێش بەکارهێنانی پارە ـ سەرمایە بە ئامانجی قازانج روون ناکاتەوە. چەندین شاری رۆژهەڵات هەن کە هەزاران ساڵ بەر لە ڤێنسیا، ئەمستردام و لەندەن رۆڵی لانکەی پارە ـ سەرمایەیان بینیوە.

ئەو خاڵەی لە پارە ـ سەرمایەی ئەورووپا تاکانەیە، هەڵکشانێتی و بۆ یەکەمجار ئاواکردنی هەژموونگەراییەکەیەتی. کارل مارکس ئەم چەشنە هەژموونگەراییەی سەرمایە و مۆرك لێدانی لە مۆدێرنیتە بە ئەرێنی و رۆڵێکی پێشکەوتنخواز هەڵدەسەنگێنێت. کاتێك والرشتاینیش ئەم هەژموونگەراییە بەو شێرە دەچوێنێت کە لەقەفەس دەرکەوتووە، بە بایەخەوە پێویستی ئاماژەکردن بە رۆڵە ئەرێنییەکەی دەبینێت. تەنانەت کاتێك هۆکارەکانی سەرهەڵدانی (ئەم هەژموونگەراییە) بە لاوازبوونی کڵێسا و پادشایەتییەکان و داگیرکاری مەغۆلەکان لە رۆژهەڵات دەبەستێتەوە، وەك بڵێی دان بەوە دادەنێت کە رووبەرووی نیشانەی پرسیاری گەورە بۆتەوە. وەك دەرەنجام بە خاڵێك گەیشتووە کە بژارەکەی بۆ مێژوو بەهیچ شێوەیەك باش نییە. ئێرە ئەم شوێنە گونجاوە نییە کە ئامارە تۆقێنەرەکەی چوار سەدەی پارە ـ سەرمایە دووبارە بکەینەوە. بەڵام تەنیا کاتێك ژمارەی کوژراوو برینداری شەڕەکان، ژمارەو ماوەی شەڕەکان، ئەنجامە وێرانکارییەکانی قەیرانە ئابوورییەکان، رادەی بێکاری و هەژاری، گرنگترینیشیان وێرانکردنی ژینگە و کارەساتەکانی وەك بەشی ئەو تۆمار بکرێت، ئەو کاتە شیمانەکردنی چۆنیەتی ئەو هەژموونگەراییە هێندە زەحمەت نییە کە رووبەرووومان بۆتەوە.

ب - هەرچی بانگەشە ناتەولو و هەڵەکەیە، تاکانەیی مۆدێرنیتەی پشتبەستوو بە سەرمایەدارییە. ئەم بانگەشەیەی زانستی کۆمەڵایەتی تەوەرە و ناوەندێتی ئەورووپا زۆر بەرفراوان و ئابلۆقەدەرە. بەو سیفەتەی سیستەمی - جیهانییە ئەویش لە میانەی بە ئەبەدییکردنی هەبوونی خۆی و دانانی گەمارۆدانەکەی بە کۆتایی مێژوو و دواگوتەی حەقیقەت، لەسەردەمەکانی پێش خۆی کەمتر نییە. تەنانەت لەرێگای بانگەشەی زانستییەوە مسۆگەر و رەهاترە. هەرچی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبڕالیزمە لەرێگای پاوانە میدیاییە گرێدراوەکانی خۆی وەك بڵێی هەموو هەوڵوکۆششی خۆی خستۆتەگەڕ بۆ ئەوەی گشتگیرکردنی ئەم بانگەشەیە بەسەر تەواوی مرۆڤایەتی قۆناخێك لەناوچاخدا (سەردەمی راگەیاندن و زانیاری) بئافرێنێت و وەك حەقیقەتێکی هاوبەش بەرێوەی ببات. لەکاتێکدا گرنگی بەوە دەدات کە لەبواری ناوەڕۆك و شێوەدا راستی لەناو رەهەندە مێژووییەکەی پێشکەش بکات، لە ئاولکردنی فوتورۆلۆژی"ئاییندەناسی" یەکی دابڕلو لە رابردوو و رۆژی ئەمرۆمان دوا ناکەوێت. بەشێوەیەکی سەیر، ئێستاگەراییە. دروشمی "ئێستا بژی، ئەوەیتر پووچە" وەك باوەڕییەکی بنەڕەتی پەسەند و جێبەجێ دەکرێت. ئەو لیبڕالیزمە نوێیەی لە میانەی چەمکی بەیەکەوە لکاندن سەرجەم قالبە ئایدیۆلۆژییەکانی فکرە کۆن و نوێکان پێکبهێناوە، بەشێوەیەکی زۆر خراپتر دوا هەلومەرج و کەش و هەوای رۆما بە بیر مرۆڤ دێنێتەوە. سێیانەی - وەرزش، سێکس، هونەر - لە لوتکەی قۆناخی بە ئایدیۆلۆژیابووندان. رەهەندی ئایینی بە هەموویان دراوە. لە رۆژگاری ئەمرۆمان دۆزینەوەی ئایینی دووەم زەحمەتە کە لە رێوڕەسمەکانی ئایینی ستادیۆمی تۆپی پێی رۆژی ئەمرۆمان هۆشبەرتر بێت. لە پیشەسازی هونەریشدا رەوش و پەرەسەندنی هاوشێوە جێگای باسە. تەنانەت هەست و رەمەکێکی خۆرسکی وەك زایەندیش بۆ پیشەسازی سێکس وەرچەرخێنراوە. کاریگەری هۆشبەرانە (ئەفیۆن)ی سێکس بەلانی کەم هێندەی سپۆرو هونەر کراوە بە ئایین. ناوبردنی ئەم سێیانە بە رێوڕەسمی ئایینەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە جێگای خۆیدا دەبێت. ئایینگەرایی رادیکاڵیش کە بە ناوی ئایین جێبەجێ دەکرێت، سەرباری ئەوەی خۆی وەك دژە - مۆدێرن پێشکەش دەکات، بەڵام مەیلێکی مۆدێرنیتەیە.

کاتێك لە قووڵاییەوە تەماشای ئەو مۆدێرنیتەیە بکرێت کە مۆرکی سەرمایەداری پێوەیە، ئەوا دەرکی پێدەکرێت کە بێ باوەڕترین جۆرە بەخۆی. هێندە پێویست بینینی بەخستنە سەر یەك و پەنابردنی بۆ پێکەوە لکاندن ئەم راستییە دەسەلمێنێت. هەر چەندە پۆست مۆدێرنیزم وەك بەرهەمێکی ئەم باوەڕ بەخۆنەبوونە سەریهەڵداوە، بەڵام نەبوو بە ئەڵتەرناتیفی مۆدێرنیتە. تەنیا

داخوازیەکەی کردنەوەی پەنجەرەیەك بوو بۆ ئەو رۆشنبیرانەی لەمۆدێرنیتە بێزار ببوون. لەبواری شێوازی ژیانییەوە تا بینە قاقایەوە کەوتۆتە ناو مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە. دەشێ نموونە جۆرییەکەی لە ئەدۆرنۆی فەیلەسوفدا ببینرێت. ئەدۆرنۆ کاتێك دەڵێت"ژیانی چەوت راست ناژیێنرێت" بە شێوەیەکی زۆر کورت مۆدێرنیتەی روون کردەوە. بەڵام لە پێشکەشکردنی ئەڵتەرناتیفدا سفر بوو. لەبەر ئەم هۆیەش تووشی تووڕەیی و پەرچەکرداری لاوانی شۆڕشگێڕ هاتبوو. لە راستیشدا لیبرالیزمی نوێ دەبویست ببێتە جلوە و مەکیاژە نوێیەکەی مۆدێرنیتە کە جلوەکەی کەوتبوو. بەڵام چەندە نوێبوونەوە و لکاندن ئەنجامبدات پەردەپۆشکردنی ناکۆکییەکانی سەردەمی پاوانی فینانسی جیهانگیری و رزگارکردنی سیستەمەکەی ئاسان نییە.

ئەندرێ گۆندەر فرانك کاتێك لە چوارچێوەی قۆناخی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی پێگە و گرنگی شارستانی ئەوروپا دەستنیشان دەکات زۆر لە راستی نزیکبۆتەوە. بەڵام سەرباری ئەوەی خۆیشی لە قووڵاییدا ئاگاداری کەمووکوڕیەکانێتی، جگە لە هەندێ چوارچێوەی گشتی، رێگە چارەیەك یان ئەڵتەرناتیف پێشناخات و پێشکەشیان ناکات. راستتر بڵێین هێشتا هیوای ماوە. لەگەڵ ئەوەی فۆرمۆڵی " یەکێتی لەناو جیاوازییەکان " لەچوارچێوەی شارستانی کلاسیکدا راستە بەڵام گشتگیرییەکی زێدەرۆییانەیە. هیچ روونکردنەوەیەکی سەبارەت بە چۆنیەتی جێبەجێکردنی پێشکەش نەکردووە. هەرچی هەڵکەیەتی، هێشتا هیوایەکی لەو جۆرەی هەیە کە دەرفەتی ژیانێکی مۆدێرن و جیاواز و باشتر (بە تیۆری و کرداری) لەناو سیستەم لە ئارادایە. لەم لایەنەوە والرشتاین ئەرێنی و رادیکاڵە، هەرگیز باوەڕی بە چارەسەرییەکی ناو سیستەم نییە. راشکاوانە دووبارەی دەکاتەوە کە ئەو قەیرانەی لە ئارادایە سیستەماتیك و بونیادییە، پێشنیار دەکات ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان لە باوەش بگیرێن کە بەشێوەیەکی راست دەستنیشانی کرابوون. بەڵام ناتەواوییەکەی لەوەدایە، چارەسەری بەرفراوانی سەبارەت بە پرسیاری کامە سیستەم پێشکەش نەکردووە. لەم بارەیەوە رەخنەدانێکی دڵسۆزانە دەدات. دەڵێت "هەموومان لە پەرستگا پیرۆزەکەی بۆرژوازیدا هەمان شەربەتمان خواردەوە". هەروەها لەبەر ئەم هۆکارە ئاماژە بەو ترسە دەکات (بە واتا مەجازییەکەی) کە بەرامبەر غەزەب و نەفرەتی خودلوەندەکان هەیەتی. چەندین خاڵ و شتی گرنگ سەبارەت بە رادەی وابەستەیی سەرمایەی رۆشنبیری بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و زەرورەتی دابڕانی رادیکاڵ باس دەکات، کە پێویستە پەند و وانەی زۆری لێوەربگرین.

رەوشی من بەو پەندە وانادار دەبێت کە دەڵێت "راکردن لە ئەجەلی لەچارەنووسراو بێ سوودە". لە "مۆدێرنیتەی سەرمایەداری" رامدەکرد. بەڵام ئەمە بەس نەبوو بۆ ئەوەی لە دەستی رزگارم بێت. لەم سۆنگەیەوە" لەجیاتی ئەوەی بەدەستییەوە بمرم، تاقیکردنەوەی ئەڵتەرناتیفەکەیم زۆر واقیعی و بوێرانەتر بینی. بەمجۆرە نەوەك نیچە تەنیا بە گووتنی راستییەکانەوە وەستام، نەوەك میشێل فۆکۆ بە راگەیاندنی مردنی خۆم (وەك مرۆڤایەتی) رازی بووم، نەوەك ئەدۆرنۆش نیگەران و زوویر بوو بە شێوەیەکی قەدەرگەرایی گووتم " ئەوەی بەسەرت بێت پەسەندی دەکەیت"، نەوەك ئەندرێ گوندەر فرانکیش پەنابردنە بەر دروشمی لێگەڕینی " یەکێتی لەنێو جیاوازیدا "م بەس بینی. تەنانەت وەك والڕشتاینیش بڕوام بەوە نەبوو کە سێیانەی ئەرکی رۆشنبیری، ئەخلاقی (ئەتیك) و سیاسی بەسە. بێگومان تاقیکردنەوەکەم بوێری و کۆمەکێکی گرنگی لەو کەسایەتییانەی فیکر و فەزیلەت وەرگرتووە. بەڵام ئەوەی یەکلابۆتەوە هەرگیز گوتەی "ژیانی چەوت راست نازیێنرێت" بۆ من جێگای باس نابێت. چونکە هیچ کاتێك ژیانم بە گوێرەی ئەم گوتە نەبووە. زۆر رامکرد، بەڵام نە هێزم نە باوەڕیم بەشی گەیشتن بە ژیانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەکرد. چونکە ئەوەی ژیانیی و بەکاریگەرتر بوو بانگەوازی مرۆڤە یاخیبووەکەی ناخم بوو کە دەیگووت"هەراجمان مەکە، لە هەرچییەك دەگەڕێیت لە خۆتیدا بدۆزەوە". یاخیبوونەکانی خۆم دەنووسمەوە.

لەوانەیە بڵێن" بەرامبەر بەم سێیانەی هێزەکانی مۆدێرنیتە چیت بۆ دەکرێت کە پێنج هەزار ساڵە هیچ رۆح و هزرێك نەماوە رەگی خۆیان تێدا دانەکوتابێت، لەم چوار سەد ساڵەی دواییشدا لە دەرەوە و ناوەوە، لە ژینگە و هەواکەیەوە تا دەگاتە ژێر زەوییەکەی هیچ بەهایەکی کۆمەڵگای نەهێشتۆتەوە کە دەستی بۆ نەبردبێت، نەیکردبێت بە کاڵا، نەیکڕیبێت و هەراجی نەکردبێت، هەروەها ملیۆنجار هێندەی سیستەمەکانی فیرعەون و نەمرود خۆی بەهێز کردووە؟ بێگومان بەمجۆرە پرسیارەکە بە هەڵە دەپرسم. بەو شێوازە دەیپرسم کە مۆدێرنیتە گەرەکیەتی. ئامانجم ئەوەیە بێ نرخی ئەو شتانە ئاشکرا بکەم کە ئەم پرسیارەیان هێناوەتە ئاراوە و گریمانەکەی پشت پەردەش روون بکەمەوە.

من نەتازەگەری دیموکراتی دەدۆزمەوە و نە دەیئافرێنم. هەرچەندە سەبارەت بە سەرلەنوێ ئاولکردنەوە شتگەلێك هەبێت کە بیڵێم، بەڵام گرنگی پێنادەم. راستتر، خاڵە گرنگەکە لە شوێنێکی دیکەدا شاراوەیە. ئەویش ئەمەیە و لێرانەدایە: لەو کاتەی کەوا شارستانی فەرمی ئاولکراوە تازەگەری دیموکراتی بەشێوەی دووالیزم لە ئارادایە. لە هەر شوێن و زەمەنێکی ئەم (شارستانی)

هەبێت ئەویش بوونی هەیە. هەرچەندە شارەزا و پرۆفیشۆناڵانەش نەبێت ئەوەی من هەوڵی ئەنجامدانی دەدەم، پێشکەشکردنی نرخ و بەهای شایستەیە بەو شێوەیەی شارستانێتی (شارستانێتی دیموکراتی نافەرمی، ناو گرنگ نییە) کە لە هەر زەمەن و شوێنێکی شارستانی فەرمیدا هەیە، هەروەها پێشخستنی روونکردنەوەی سەرنج راکێشە دەرهەق بە رەهەندە سەرەکییەکانی. جگە لەمەش مەبەست پێشکەشکردنی پێناسەیە دەرهەق بە ماهییەتەکەی و شێوە سەرەکییەکانی زهنییەتەکەی و کۆمەڵگاکەی کە لەمیانەی بونیاد و شێوازێکی ژیان لە ئارادایە.

ئەو شارستانی (مۆدێرنیتەی سەردەمە جیاوازەکان)یەی بانگەشەی تاکانەییەکەی دەکرێت لە هەر شوێنێکی دەستی بەرکەوتووە و هەر زەمەنێکی چەرخەکەی پێدا تێپەڕیوە، دەرکەوتنی بەرامبەر (دژ)ەکەی وەك پێویستیەکی دیالیکتیکی هیچ لایەنێکی نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. بەپێچەوانەوە، ئەوەی دەرکی پێناکرێت بۆچی بەدرێژایی مێژووی شارستانییەت ئەم رکابەرێتییە سروشتییەی پەیڕەوی دیالیکتیکی بەشێوەیەکی سیستەماتیك گوزارشت نەکراوە و دەنگی بەرز نەکراوەتەوە. لەکاتێکدا لە سۆمەرەوە تا میسر و هەڕاپا، لە چین و هیندستانەوە تادەگاتە رۆما هێندە شارستانی ئاولکراون، بۆچی هۆز، خێڵ و گرۆپە ئایینییە لە ژمارنەهاتووەکانی لە بیابانی مەزنەوە تا بیابانەکانی ئاسیا، لە سیبریاوە تا دەگاتە بیابانی عەرەبستان وەك لافاو بەلێشاون، تەنگەتاو و بەکۆیلەکراون نابێت هیچ پەرچەکردار، هزر و بونیادێکی کۆمەڵایەتی رکابەریان هەبێت؟ ئایا ئەمە کارێکە ئەقڵ و ویژدان پەسەندی بکات؟ کاتێك لەلایەن باڵادەستانی ئەو شارانەی هەزاران ساڵە ئاوایانکردووە دووچاری هەر جۆرە فشار و چەوسانەوەیەك هاتن گەلی رەنجدەر بێ دەنگ و دەستەوەستان بێت و سوپاسگوزاری قەدەرەکەی بکات؟ ئایا ئەمە رێی تێدەچێت؟

دەشێت هەزاران پرسیار دەرهەق بە هەزاران ناوچە و قۆناخ بکرێت. بێگومان وەڵامیشیان هەیە. بەڵام ئەوەی نییە، بۆچی لە هۆنینەوە و رستنی ئەم وەڵامانەوە سیستەمی (ئاولکردنی فکر، تیۆری) شارستانییەك ئاوا نەکراوە. هەروەها بونیادە رکابەرەکان (راوەستەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی) یش هەن. ئەو شتەی نەکراوە و نییە، ئەو پەیوەندی و هۆگرییەی بۆ هەزاران زۆردار، ئیمپراتۆر و پاوانەکانی دەسەڵات - سەرمایە پیشاندراوە، دەرهەق بە سەرەکیترین لۆخی راوەستەی سروشتی کۆمەڵایەتی، بەرامبەر رەوشی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی و پێشکەوتنەکەی پیشان نەدراوە.

سەبارەت بە هەر شێوەیەکی خەلیفە، سوڵتان، ئەمیر، شێخ، شاهنشا و فەرماندەیەکی شارستانی ئیسلام کە باش دەیانناسین بە وردەکارییەکانییەوە چیرۆکیان لەبارەوە دەنووسرێت و باس دەکرێت، بەڵام تەریقەت، مەزهەب، بەرخودان، حەسرەت و باوەڕی ئەو باوەڕمەندانەی لە سێ کیشوەردا بڵاوبوونەتەوە یان بەشێوەیەکی شایستە ناکرێت بە مێژوو یان بە چەواشەکراوی دەکرێن بە چیرۆك. ئاشکرایە کە لێرەدا دووالیزم و پێکدادانی ناو شارستانی لە ئارادایە. بەڵام لەکاتێکدا لایەنێکیان بەشێوەیەکی بێ سنوور بە شان و باڵیاندا هەڵدەدرێت و شکۆدار دەکرێن، رکابەرەکانیان ژێر خاك دەکرێن. تەنانەت لە ژیانی خۆشمدا بوومە شاهێدی ئەم دۆخە. چاودێری کوردی عەلەوی، سوونی و ئێزیدیم کرد. پێویستە راشکاوانە بڵێم شارستانێتی پاڵاوتەی هەزاران ساڵ، لە شارستانێتی رکابەر زیاتر کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیم لە کوردە عەلەوی و ئێزیدییەکاندا بینی. کەچی گوتە و چیرۆکەکانی شارستانی کلاسیك سەبارەت بە عەلەوی و ئێزیدییەکان پڕە لە سووکایەتی پێکردن و ئەو ریسوالکارییانەی کە تەنانەت مرۆڤ بە زمانیدا نایەت دووبارەیان بکاتەوە. هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم زەحمەتکێشە سوننییەکان، کلتووری هۆز و خێڵەکانیان نییە. جێگای تەولوی ئەمانە لە قەفەسی شارستانێتی تازەگەری دیموکراتییە. دەشێت لە هەر شوێن و زەمانێك نموونەکانی ئەمە بخرێتەڕوو. وابزانم بۆ رۆشنکردنەوەی ئامانجەکەمان ئەمە بەسە.

پێویستە ئاماژە بە گرنگی روونکردنەوەی خاڵێکی دیکەی سەبارەت بە مۆدێرنیتە بکەم. بە واتایەك لە واتاکان زاراوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری راست نییە. پێویستە سەرنج بدەن کە بەشێوەیەکی مەرجدار زاراوەکە بەکاردێنم. هەر وەکو چۆن زاراوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری نادیارە و مەترسی پەردەپۆشکردنی راستی هەیە، لەوانەیە زاراوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش مەترسییە هاوشێوەکانی زیاتربێت. بەواتا گشتییەکەی مۆدێرنیتە شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی سەردەمێکە. بە سیفەتی کلتووری ماددی و مەعنەوی، تەولوی فاکتەرەکانی تەکنیك، زانست، هونەر، سیاسەت و مۆدێل لە خۆوە دەگرێت کە مۆرکی خۆی لە قۆناخێك داوە. لەم واتایەدا ئەگەر مۆدێرنیتە بکرێتە موڵکی سەرمایەداری هەڵەیەکی گەورەیە، تەنانەت لەمیانەی رۆڵێك لە فاکتەرەکانییەوە دژی سەرمایەدارییە کە پاوانێکە. هەروەکو چۆن کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی شێوازی سەرەکی ژیانی سروشتی کۆمەڵگا بەگشتی دژی شارستانییە و بەتایبەتیش دژی شارستانی سەرمایەدارییە، ئەوا لە مۆدێرنیتە (تازەگەری)شدا رلوەستەیەکی هاوشێوە جێگای باسە. کۆمەڵگای مۆدێرن (هاوچەرخ) کۆمەڵگای سەرمایەداری نییە. ئەی بۆچی دەستەواژەی

مۆدێرنیتەی سەرمایەداریم بەکارهێنا؟ چونکە پاوانی سەرمایەداری لەگەڵ هاوپەیمانە هەژموونگەرلکەی هێندەی بەسەر کۆمەڵگادا زاڵە، بەو ئەندازەیە خوازیارە مۆرکی خۆی لە مۆدێرنیتەش بدات کە وەك شێوازی ژیانی قۆناخ پەسەند کراوە. لەگەڵ هاوپەیمانە ئایدیۆلۆژی، سیاسی ـ سەربازییەکانی وەك بڵێی بەخۆی ئافرێنەر و پێکهێنەری شێوازی ژیانی سەردەمە لەناو هەوڵێکی زۆر بە سیستەمدایە (پەروەردە، سەربازگە، شوێنەکانی عیبادەت و میدیا). زهنییەتێکی باڵادەست دەئافرێنێ کە هەر شتێك پێچەوانە دەکاتەوە، ئەوەی هی ئەو نییە دەیکات بە هی خۆی. ئەگەر هەوڵە پروپاگەندەییەکانی لەم لایەنەوە سەرکەوتوو بێت، ئەو کاتە مۆرکی خۆی لە کۆمەڵگا یاخود لە مۆدێرنیتە دەدات.

کاتێك ئەنتۆنی گیدنس سەرمایەداری بەیەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی مۆدێرنیتە دادەنێت، لەوانەیە ئاگاداری کەوتنە ناو دووالیزمێکەوە نییە. ئەو پرسیارەی پێویستی بە پرسین هەیە: کامەیان ئەوی تریانی ئافراندووە یاخود دەستنیشان کردووە؟ ناشێت بیر لەوە بکرێتەوە کە مۆدێرنیتە سەرمایەداری ئافراندووە، وەك سەردەمێکی تایبەتی سروشتی کۆمەڵگا ژیان دەکرێت. بەڵام کاتێك پاوانەکانی فشار و چەوسانەوە لە ژێر ناو و سیفەتی شار ـ چین ـ دەوڵەت پێکدێت مۆرکی خۆیان لە شێوازی ژیانی قۆناخەکە دەدەن و خوازیارن بیکەن بە موڵکی خۆیان. پێویستە پەسەند بکرێت و دانی پێدا بنرێت کە زیاتر لەم دۆخەدا سەرکەوتوون. ئەوەی روودەدات سەرکەوتنی پروپاگەندەیە. سەردەمێکی زل و زەبەلاح کراوەتە موڵکی حەرامزادەکان. کاتێك زاراوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەکاربێنین پێویستە بەردەوام ئەم مەرجەمان رەچاو بکرێت. بەڵام هیچ کاتێك سروشتی کۆمەڵگا رەنگی تەواو و شێوازی هەبوونی سەرمایەداری یاخود پاوانێکی دیکە وەك ناسنامەی خۆی پەسەند ناکات. تەنانەت لە بواری تیۆرییشەوە سروشتەکانی کۆمەڵگا لە خۆیانەوە بۆ هۆیەیەکی پاوانی فشار و چەوسانەوە وەرناچەرخێن. هەروەکو چۆن سەلماندمان ناشێت سەرمایەداری ساف و پەتی هەبێت، ئەوا ئاوابوونی شارستانی سافیش مەحاڵە. ئەگەر هەندێ کەس بڵێن دەکرێ هەبێت، پێویستە لێیان بپرسین: ئەگەر کۆمەڵگایەك لە ئارادا نەبێت کە بچەوسێندرێتەوە و بەڕێوەببرێت، ئەی سێیانەی شار ـ چین ـ دەوڵەت تەنیا بەخۆیان چۆن دەژین؟ سادەترینیان ئەوەیە، چۆن بەردەوامی بە ژیانی ماددی خۆیان دەدەن؟ ئەمانە مۆرکی خۆیان لە سروشتی کۆمەڵگای قۆناخ دەدەن، لەوانەیە ئیستیغلالیشی بکەن. بەڵام کاتێك ئەوروپا جێگای باس بوو ناتوانین رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری بکەینە موڵکی سەرمایەداری. چونکە هیچ کاتێك سەرمایەدارەکانی ـ پارە و دەسەڵاتەکان ئافرێنەر نەبوون، بەڵام هەموو کاتێك خواستوویانە

بەهێزی دەسەڵات و پارە مۆرکی خۆیانی لێبدەن. چونکە باش دەزانن ئەگەر لەمەدا سەرکەوتووبن ئەوا پارە و دەسەڵاتێکی زیاتر بەدەستدێنن.

کۆمەڵگاش کە بۆتە ئامانجی پارە ـ سەرمایە و دەسەڵاتەکان بە سیفەتی رکابەر دەتوانێت مۆرکی خۆی لە شێوازی ژیانی سەردەم بدات. چەندین رێگا و نموونەی ئەمەش هەن. خودی سروشتی کۆمەڵایەتیش مەیلی بەم لایەنەوەیە. کۆمەڵگا بە زۆری دژە ـ سەرمایەدارییە، چونکە بەشێوەیەکی رۆژانە لەناو زۆرداری و چەوسانەوەی پاوانی سەرمایەدا دەژین و بەدەستییەوە دەناڵێنن. لاوان، ژنان، بێکاران، گەلە کۆلۆنیکراوەکان، چەندین گرووپی ئایینی، هەر جڤاتێکی بە رەنجی خۆی گوزەران دەکات و بەشی بنەڕەتی (DIMOS) کۆمەڵگای مێژوویی ئەو توێژانەن کە رەنگی سەرەکی بە مۆدێرنیتە و شێوازی ژیانی سەردەم دەدەن. بە ئامانجی ئاسانکاری تەواوی ئەم توێژانە بە گەل (DIMOS) ناو دەبەین. هەرچی دیموکراسییە دەبێتە ناوی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کە ئەم توێژانە لەڕێگایەوە خۆیان بەڕێوە دەبەن. سەربارى ئەوەی زاراوەیەکی سیاسین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو گۆڕەپان و توێژانەی لە خۆیەوە دەگرن بەشێکی سەرەکی کۆمەڵگا پێکدێنن، زاراوەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی و تازەگەری دیموکراتی زاراوەیەکن لە راستی و ناوەڕۆکەکەیەوە نزیکترن. هەر بۆیە پێویستە بە سنگفراوانییەوە پێشوازی لە زۆر بەکارهێنانم بۆ ئەم زاراوەیە بکرێت. کاتێك باس لە ئەڵتەرناتیفێتی تازەگەری دیموکراتی دەکەم مەبەستم ئەم راستییەیە. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا مۆدێرنیتەی تاقانەی شێوازی ئەنتۆنی گیدنس، بەتایبەتیش زاراوەی مۆدێرنیتە کە مۆرکی سەرمایەداری پێوەیە، زاراوەیەکی زۆر نادیار و ئاڵۆزن، تا رادەیەکی مەزن پۆتانسێلی چەوتی و هەڵە لەخۆوە دەگرن.

ئەوەی رەنگی مۆدێرنیتەیەك دیاردەکات بانگەشە، بونیاد، تێکۆشان و ئاستی سەرکەوتنی جەمسەرە دژەکانە. بەڵام ئەگەر بگوترێت بە تەواوەتی سەرمایەدارییە یان دیموکراتە دەبێتە مۆدێلێکی قەبە و کوێرانەی میتۆدی بچووککردنەوە. هەڵبەتە کاتێك کۆمەڵگا دەبێتە جێگای باس پێویستە بەشێوەیەکی وشیار و ورد وشەی "تەولو" یان "هەموو" بەکاربهێنرێت. چونکە سروشتی کۆمەڵایەتی زۆر تێکەڵە و هیچ کاتێك یەك شت یان یەك رەنگ پەسەند ناکات. پێویستە لە بیر نەکەین کە ناکۆکی جیاوازی گەرەکە. هەرچی جیاوازییە واتای ژیانە. لەو شان و ساتەی ناکۆکی وەستا، لەم سۆنگەیەوە لەو ساتەوە کە جیاوازییەکان وەستان کەواتە ژیانیش کۆتایی پێهاتووە. تەنانەت خودی مردنیش جگە لە سەلماندنی مانای ژیان گوزارشت لە واتایەکی دیکە ناکات. ئایا دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە ژیانێك مردنی تێدا نەبێت، مەحکومی نەمری ئەبەدی بێت شتێکی

چەندە مەترسیدار دەبێت؟ راستتر، ژیانێکی بەمجۆرە دەبوو بەئەشکەنجەیەکی گەورە. بەردەوام گەڕان بەدوای لێکچوون، ئەگەر ئامانجی سەرکوتکردنی رکابەران لەخۆوە نەگرێت، نکوڵیکردنە لە ژیان. جگە لە مۆدێل (نموونەی مۆدێل فریودەرترین هونەرە کە بۆ پەردەپۆشکردنی دژایەتی سەرمایەداری بەرامبەر بە ژیان داهێنراوە و لەرێگای ئەشکەنجەی لێکچوواندنەوە ئەنجامدەدرێت) هەوڵی فاشیزم و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ لەناوبردنی تەواوی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانی و گۆڕینی بۆ میتۆدی بچووککردنەوەی یەکرەنگی، نموونەیەکی دیکەی سەلمێنەرە بۆ دژایەتیکردنی ژیان.

وەك ئەنجام کاتێك زاراوەی مۆدێرنیتە هەڵدەسەنگێنین کە دەستەواژەیەکی ئاڵۆز و نادیارە، دەستنیشانکردنی چوارچێوە و ماوەکەی گرنگە. یەکتاکردنیان هەڵەی گەورە لەخۆوە دەگرێت. لەکاتێکدا وەك سیفەتی هەنووکەیی و هاوچەرخێتی شارستانی پێناسە دەکرێت، پێویستە بەشێوەیەکی زۆر ورد و هەستیارانە مەغزا و چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکەی دەستنیشان بکرێت. لەم لایەنەوە هەڵە و کەموکوڕییە گەورەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەرچاون. تەنیا لەمیانەی پشتبەستن بە هێزی سەرکوتکردن و پارەی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات دەتوانین ئەمە روون بکەینەوە. هەر وەکو چۆن دەسەڵات زادەی زانستە، سەرمایەش زادەی دەسەڵاتە، پێچەوانەکەشی راستە. سەربارى ئەمە، بەو سیفەتەی بەشە سەرەکییەکەیەتی سروشتی کۆمەڵگا لەسەردەمی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییدا دیموکراتیکە. لەم سۆنگەیەوە وەك شێوازی ژیانی سەردەم دیموکراتیزە نەبوونی مۆدێرنیتە بابەتێکە بیری لێناکرێتەوە. دیموکراتیبوونی تازەگەری لەبواری قەبارەی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) چەندین قات لە سەرمایەداری مۆدێرنیتە و بەکرێگیراوەکانی باڵاترە. تەنیا ئەوەی پێویستە بە ئامانجی تێگەیشتن بزانین بەشێوەیەکی راست بیر بکەینەوە.

### ب ـ رەهەندی ئیندوستریالیزمی مۆدێرنیتە و تازەگەری دیموکراتی

راستییەکی بەرچاوە کە سەردەمەکەمان ( شێوازی ژیانی هاوچەرخمان) تا رادەیەك گرێدراوی پیشەسازییە کە نموونەکەی نەبینراوە. نکوڵی لەوەش ناکرێت کە دوای شۆڕشی کشتوکاڵ، شۆڕشی پیشەسازی سەدەی نۆزدەهەم دووەمین گەورە شۆڕشی کۆمەڵایەتییە. هەروەکو لە کەڵەکەبوونی سەرمایە لە ئارادایە، ئەو بانگەشەش زێدەڕۆییە کە دەڵێ پیشەسازیبوون تاکانەیی و بێ هاوتابوونێکی مۆدێرنیتەمانە. لەوانەیە بە پێوانە و قەبارەی ئەوەی سەدەی نۆزدەهەم نەبێت، بەڵام چەندین هەڵمەتی پیشەسازی بەگشتی لە سروشتی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگای

کشتوکاڵی نیولیتیك و کۆمەڵگاکانی سەردەمی شارستانی ئەنجامدراون. بەو سیفەتەی سەرجەم پێشکەوتنەکانی تەکنیك (ئامراز) جۆرێك لە هەنگاوەکانی پیشەسازین، لەم چوارچێوەیەدا پێشکەوتن بەردەوامە. هەرچی ئەوەیە لە قۆناخەکانی هەڵمەتدا رووددەدات تەقینەوە و قەڵەمبازی چۆنایەتییە. دەتوانرێت هەزاران نوزینەوەی پیشەسازی لە جۆری پیشەسازی دەفر و دیزە، دەستار، دەزگاکانی رستن و چنین، چەرخ، داس، تەور، چەکوش، چەقۆ، شمشێر، ئاش، پاپیرۆس، کاغەز و ئامرازی کانزا هەمەجۆرەکان بژمێردرێت. بەڵام ئەمەش راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە گەورەترین شۆڕشی پیشەسازی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بە رێبەرایەتی ئینگلتەرا هەڵمەتێکی مەزنی ئەنجامداوە. لەگەڵ ئەوەی ئەمە جیاوازییەکی گرنگی مۆدێرنیتەیە، بەڵام تاقانەییەکەی گەرانتی ناکات، جیاوازییەکەی دەخاتەڕوو.

لە پیشەسازییەوە گوزەرکردن بۆ ئیندوستریالیزم رەوشێکی جیاوازترە. ئیندوستریالیزم گوزارشت لەو پیشەسازییە دەکات کە ماهییەتی ئایدیۆلۆژی بەدەستهێناوە. پیشەسازیگەرایی کە لەسەر حیساب و دژی گوند و کشتوکاڵ بەرەو پێشەوەچوو، هەروەها دژایەتی پیشەکارانی شاریشی کرد، لە کاتی سەرهەڵدانیەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان سەرچاوە و ریشەی تەولوی نەخۆشییەکانی مۆدێرنیتە پێکدێنێت، لەسەرووی هەموویشیانەوە وێرانکاری و کارەساتە ئیکۆلۆژییەکان. هەڵبەتە پیشەسازیگەرایی ئایدیۆلۆژیای پاوانەکانی سەرمایەیە، کاتێك لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم گۆڕەپانەکانی بەکارهێنانی ئەو پارە ـ سەرمایەیە تەسك بوویەوە کە بە بڕێکی زۆر لەدەستیاندا کۆببوویەوە، هەنگاونانیان بۆ پیشەسازی بە ئامانجی بەریەستکردنی کەمبوونەوەی رادەی قازانج و تەنانەت بەرزکردنەوەی ئاستی قازانج ( یاسای قازانج )بوو. بەتایبەتیش پیشەسازی رستن و چنین بەمجۆرەیە. کاتێك بەرهەمی میکانیکی لەگەڵ سەرچاوە نوێیەکانی وزە ( خەڵوز ـ هەڵم ـ کارەبا) بە یەکگەیشتن ئەو بەرهەمەی تەقینەوەی بەخۆوە بینی لەناکاو رادەی قازانجی گەیاندە بەرزترین ئاست. دیاردەی دەوڵەت ـ نەتەوە و کێبڕکێ دژوارەکەی نێوانیان پەیوەندی بەم رادە و ئاستە نوێیەی قازانجەوە هەیە. پیشەسازیبوون، واتە ئیندوستریالیزم بە پێش هەموو شتێك کەوتەوە. بۆخۆی بوو بە پیرۆزترین باوەڕی دەوڵەت ـ نەتەوە. ئەم پێشبڕکێیە بەبێ ئەوەی هیچ لە خێراییەکەی ون بکات تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. هاوفیکرییەك لەبارەی ئەنجامەکانییەوە هەیە کە هەر لە ئێستاوە بە ئاست و رەهەندی مەترسیدار گەیشتووە. مەسەلەکە بەواتا تەسکەکەی تەنیا کاولکارییە ئیکۆلۆژییەکان ناگرێتەوە، بەڵکو کۆمەڵکوژییە جەستەیی و کلتوورییە ریشەدارەکانیش دەگرێتەوە، ئەو شەڕانەی لەگەڵ هیچ

قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت و ڕەهەندی جیهانگیری، هەژێمی و خۆجێیی بەدەستهێناوە، ئەو کۆمەڵگایەی هەنگاو بە هەنگاو لەمیانەی ئەو پەیڕەوانەی ئایدیۆلۆژیا ـ میتافیزیك و دەسەڵات زیاد دەکات لەناسنامەی ئەخلاقی و سیاسی خۆی دابڕێنراوە، لەم سۆنگەوە کۆمەڵگاکوژییەکان لە نزیکەوە گرێدراوی مەیل یاخود ئایینی ئیندوستریالیزمە. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ئەو زانست و تەکنۆلۆژیا (ئامراز)یەی پیشەسازی بەکاریدێنێت بەڕادەیەك ماهییەتی ئایدیۆلۆژی بەدەستهێناوە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت.

ئیندوستریالیزم بەو سیفەتەی تاقانە بێهاوتاکەی مۆدێرنیتەیە، گەورەترین هەڕەشەی ناواخن و بەردەمی کۆمەڵگا پێکدێنێت. ئیندوستریالیزم ڕۆڵی فاکتەری سەرەکی دەبینێت لە زیادبوونی هەرەسناسایانەی دەسەڵات کە کشتوکاڵ و گوندی ڕووخاندووە، هاوشێوەی شێرپەنجە شاری گەورەکردووە، سەرجەم کۆمەڵگای خستۆتە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی خۆیەوە و هیچ مەمیلەیەکی نەماوە تێیدا بڵاو نەبووبێتەوە. دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی فۆڕمی سەرەکی هەژموونگەرایی دەسەڵاتی ئیندوستریالیزمە لە تەواوی ئەم قۆناخ و پرۆسانەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت.

مرۆڤایەتی لە کەسایەتی سروشتی کۆمەڵایەتیدا لەمێژە کەوتۆتە ژێر هەڕەشە مەحشەرییەکەی ئیندوستریالیزمی تاقانە بێهاوتاکەی مۆدێرنیتەوە. ئەو کارەساتانەی دەرکەوتوون تەنیا ئەو فیشەکانەن کە نیشانەی هەڕەشەی کارەساتەکانن. لەمەدا زۆر ئاشکرایە کە ئەو سەرمایەیەی ناوی یاسای قازانجی لێنراوە ئارەزووی کەڵەکەکردن و گەورەبوونی بەردەوامی چەندە دژی کۆمەڵگایە. چونکە بەردەوام سەپاندنی یاسای کەڵەکەکردن بەسەر سروشتی کۆمەڵگا خودی کۆمەڵگاکوژییە. جینۆسایدە ماددی و کلتوورییەکان بوونەتە یەکەمین هەنگاوی ئەم قۆناخ و پرۆسەیەیە. ئەو ئەنجامە هاوبەشەی هەر زانایەکی خاوەن ئەقڵ و بە ویژدان پێیگەیشتووە، ئەگەر ڕێگری لێنەکرێت و تەگبیر وەرنەگیرێت ڕاستەوڕاست بەرەو مەحشەر دەچێت. لەم سۆنگەیەوە بە سیفەتی بێهاوتاکەی مۆدێرنیتەیە و وەك دووەمین تاقانەکەی پیشەسازیگەرایی "جمکی سێیانە" و بەیەکەوە لەگەڵ سەرمایەداری تەنیا بەمەوە ناوەستن مۆرکی خۆیان لە مۆدێرنیتە بدەن، لەڕێگای مۆدێرنیتەوە تەنیا ڕێگا لەپێش قەیرانە ئابوورییەکان ناکەنەوە، بەڵکو ڕۆڵی سەرەکی لە شێرپەنجەی تەواوی توخم و شانە ژیانییەکانی ناو کۆمەڵگادا دەبینن.

تەواو لەم خاڵ و چوارچێوەیەدا بە هەموو ڕوونی و پێویستییەکەوە پێگەی تازەگەری دیموکراتی لە هەبوون و ژیانی کۆمەڵگادا دەردەکەوێتە ڕوو. یان کۆمەڵگا بەهەموو خێراییەکەیەوە بەرەو مەحشەر بەردەوامی بە ئاراستەکەی خۆی دەدات، یاخود لە میانەی هەڵمەتی سەرلەنوێ

ئاولکردن، شکۆداری و خۆپێچان لە تازەگەری دیموکراتییەوە بەم راکردنە دەڵێت بوەستە. بەلام خشین لەناوەراستی مەیداندا رۆژ بەرۆژ خەرجی و باجەکەی وەك هەرەسی بەفر گەورە دەبێت.

ئەم دەستنیشانکردنانە بەو مانایە نایەت کە پیشەسازی بە تەواوی واتای نەرێنییە. بەڵکو سەرنج رادەکێشێتە سەر کارەساتەکانی ئیندوستریالیزم کە بەدوای قازانجەوەیە. هەروەك لە پەیوەندی ئەقڵی ئەنالیتیکیشدا بینرا، کاتێك پیشەسازیش بە ئاراستەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بەکاربهێنرێت، دەشێ بەرەو ژیانێکی بەهەشت ئاسات ببات. پیشەسازییەك لەگەڵ ئیکۆلۆژی و کشتوکاڵ دا دەستی یەکتر بگرن، هەڵمەتەکەی تەنیا بەچارەسەرکردنی کێشە ئابوورییە سەرەکییەکان ناوەستێت، بەڵکو دەتوانێت تەواوی کاریگەرییە نێگەتیفەکانی کێشەکان بۆ لایەنی ئەرێنی وەرچەرخێنێت. تەنیا کاتێك بازرگانی زێدەرۆییانەی ئۆتۆمبێل بوەستێت، لە بوارەکانی پەترۆڵەوە تا دەگاتە رێگاکانی گواستنەوە، لە پیسبوونی ژینگەوە تا دەگاتە بایۆلۆژیای مرۆڤ لەچەندین بواردا مەزەندەکردنی بەدەساهێنانی ئەنجامێك کە لە ماهییەتی شۆرشدابێت ئاستەم نییە. ئەگەر ئەوە رەچاو بکرێت لە دۆخێکدا پیشەسازی دەریا بەمجۆرە بەردەوام بێت، ئەوا دەریا و زەمین کەڵکیان نامێنێت، ئەو کاتە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە سنووردانان بۆ بار و گواستنەوە چەندە گرنگییەکی ژیانی هەیە. هەڵبەتە ئەم چەند دێرانە نابنە جێگای باسە درێژ و وردەکارییەکانی دەرەنجامی ئەو گۆرانکارییە ریشەییانەی کە سنووردارکردنی هەزاران لقی پیشەسازیگەرایی رێگای لەپێش دەکاتەوە، لەسەرووی هەموویشیانەوە پیشەسازی ناوەکی و کلتووریشی لەناودا. تەنانەت سەرنج راکێشان بۆ سەر ئەنجامی سنووردارکردنی پیشەسازیگەرایی و تێکەیشتنی رەهەندە شۆرشگێرییەکانی بایەخە مەزنەکەی بابەتەکەمان بۆ روون دەکاتەوە.

هەڵبەتە راوەستاندنی یاسای قازانج پێویستی بە کردە و چالاکییەکی مەزنی کۆمەڵگا هەیە. بەگوێرەی ئەوەی رەمەکی بنەرەتی و فاکتەرە بزوێنەرەکەی تازەگەری دیموکراتی قازانج نییە، لەبەر ئەم هۆکارەیە کە وەك گونجاوترین بژاری شارستانێتی بایەخدار دەبێت. سیستەمی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی کە پشت بە سیستەمی چین - سەرمایە - قازانج نابەستێت نیگەرانییە سەرەکییەکەی ئەوەیە کە چۆن بتوانێت ناسنامەی خۆی بە ئازادی بهێڵێتەوە، لەم پێناوەشدا ئامرازەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە بەزیندوویی بهێڵێتەوە. هەرچی لیبرالیزمە بەشێوەیەکی بێ سنوور حەسرەتی قازانج دەخاتە پێش تاك، لەم پێناوەشدا بەردەوام مژدەی ئەوە دەدات کە سەرمایەداری و مۆدێرنیتەی پیشەسازی تاکە شێوازی ژیانن. وەك جۆرێك لە

ئاینەکانی چاخی یەکەم پێویستی پیرۆزکردنی سیستەم دەبینێت. پیشەسازیگەرایی کلتوور شێوە نوێیەکەی ئەم پیرۆزکردنە سنوور نەناسەیە. لێرەدا ململانێی چینایەتی ئابووری، هەموو جۆرەکانی تێکۆشان بەرامبەر دەسەلات، هەروەها بزاوتە ئیکۆلۆژی و فێمێنیستییەکان تەنیا لەمیانەی تازەگەریەوە دەتوانن مۆدێرنیتە بوەستێنن کە بە رەهەند و ئاستێکی بلند و زەبەلاح گەیشتووە. چوار سەد سالی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەپێی پێویست ئەم راستییەی روونکردۆتەوە.

بۆ تێگەیشتنی ئەو راستییەی کە هەرەسهێنانی ریال سۆسیالیزم سەرچاوەکەی بۆ پێشنەخستنی مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیف دەگەڕێتەوە، پێویست ناکات زانایەکی گەورەی سۆسیۆلۆژی بیت. بە دڵنیاییەوە دەتوانین مەزندە بکەین کە ئەگەر ریال سۆسیالیزم چارەسەری بۆ ئیندوستریالیزم دۆزیبایەوە ئەوا دەیتوانی بالابوونی خۆی بپارێزێت. گروپە سەرەکییەکانی ئۆپۆزسیۆن (ئۆتۆپیاگەراکان، ئەنارشیستەکان، بزووتنەکانی رزگاری نیشتیمانی، بزاوتە ئیکۆلۆژی و فێمێنیستییەکان) لەسەرووشیانەوە ئەوانەی لەسەر رێبازی ریال سۆسیالیزم بوون، بەلانی کەم ئەگەر لەپێناو سەرکەوتنی ئەو شەڕەی کە هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەدوایەوە بوو و هەموو شتێکی تەرخانکردبوو بۆ ئەوەی مۆرکی خۆی لێبدات، لەپێناو تێکۆشانی تازەگەری خۆیان لەبواری تیۆری و پراکتیکی چوارچێوە و ئاراستەیەکی بنەڕەتییان جێگیر کردبوایە، بەهەر حال رووخسار و دیمەنی مۆدێرنیتەی ئەمڕۆی جیهان زۆر جیاوازتر دەبوو. ئەو تاکە خالە هاوبەشەی تێیدا ژێر کەوتن، پرسیاری "کامە مۆدێرنیتە؟" یان لە خۆیان نەپرسی و بەیەکەوە لەپێناو وەلامەکەی بەدوای رێبازێکی تیۆری و کرداری و سیستماتیکدا نەگەڕان" تا بینەقاقا ژیانیان لەناو ئەو شێوەیەی ژیاندا زیانبەخش و خراپ نەبینی کە سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم پێشکەشیان دەکرد. لەوە زیاتر و گرنگتر لەجیاتی ئەوەی وەك فاکتەرێکی مۆدێرنیتە نەتەوەپەرستی ـ دەولەت رەخنە بکەن، دوای ئەوەی وەك فۆرمی سەرەکی شێوەی ژیان پەسەندیان کرد، هەلبەتە ئیتر سەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆن بەگشتی، بەتایبەتیش سەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی چەپ لە دۆزێکی سەرەکی، ناڕیار و زەحمەت دەبێت.

بابەتێك کە لام جێگای سەرسووڕمانە سەبارەت بە دروشمی "دەشێت دونیایەکی دیکە ئاوا بکرێت"ە. پێشکەشکردنی ئەم دروشمە وەك بلێی دۆزینەوە، پەیام یاخود زهنییەتێکی گرنگە سەرسووڕمانەکەم زیاتر دەکات. لەکاتێکدا کێشە زل و زەبەلاحەکانی مۆدێرنیتە ئاشکرابووە، لە هەموو لایەکەوە سیستەم درزی داوە و ئاوی تێچووە و پوول پوول هەلدەوەرێت، تەنانەت کرۆك و

رووی زەمین لەپاخیبووندان، دۆزینەوەیەکی بەمجۆرە مرۆڤ ناچار دەکات بڵێت "هێواش، بەسە".
ئایا لەمرۆڤ ناپرسن لەکاتێکدا مۆدێرنیتەی زاڵ (ئەو مۆدێرنیتەیەی سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم مۆرکی خۆیان لێداوە) بەتەواوی کێشە و سەرشێتییەکانی (مەبەست شێوازی ژیانێتی) لەمەیدانە، تۆ بەکامە ئەڵتەرناتیفەوە سەبارەت بە فاکتەرە سەرەکییەکانەوە تەنیا بەڕەخنەکانتەوە سنووردار نابیت، بەڵکو دەبیت بە وەڵام، یان دەتوانیت وەڵام بدەیتەوە؟

سەرجەم ئایین، فەلسەفە و باوەڕییە ئەخلاقییەکان و دانا فەزیلەتدارەکان لەپێناو وەڵامدانەوەی کێشەکانی مۆدێرنیتەی سەردەمی خۆیان سەریانهەڵداوە و پێشخراون. دەشێت گفتوگۆ لەبارەی بەسبوونیان یان بەسنەبوونیانەوە بکرێت. بەڵام ئەوەی گرنگە هیچ کاتێک هەوڵەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی کەم نەبۆتەوە. تەنیا کاتێک لەژێر ڕۆشنایی تەواوی ئەم ئەزموونانە تازەگەری دیموکراتی لەمیانەی شیکاری بەرفراوان و وەڵامدانەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و کێشە تایبەتەکانی ڕووبەڕووی دەبێتەوە واتایەکی دەبێت. بەپێچەوانەی مەزندەکان مێژوو و ئێستا گۆڕەپانی باڵادەستی ڕەهای هێزەکانی شارستانی نییە. ئەو بانگەشانەی مێژوو بەمجۆرە لە قەڵەمدەدەن، بە پڕوپاگەندە بارکراون، هەروەکو چۆن هەر مێژوویێکی نووسراو ڕاست نییە، ئەوەی زانستی کۆمەڵایەتی لەبارەی مۆدێرنیتەی ڕۆژی ئەمرۆمان گوتویەتی هەمووی ڕاست نییە، تا ڕادەیەکی مەزن ڕەوانبێژی شێواندن، کوێرکردن و نۆگماکردنی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییە. بەواتا بەرتەسکەکەی سیاسەتی دیموکراسی تەنیا ئامرازی کارلکردنی کۆمەڵگای سیاسی نییە، بەڵکو چالاکی ڕوونکردنەوەی تەواوی لایەنەکانی کۆمەڵگای مێژووییە. تەنیا کاتێک ڕوونکردنەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم لەڕێگای سیاسەتی دیموکراتیانە لەگەڵ حەقیقەت بەیەک گەیشتن دەشێت هێزی بڕیار و چالاکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بێتە ئاراوە. ئەو کاتە پرسیاری "چۆن مۆدێرنیتە و ژیانێکی هاوچەرخ؟" بە وەڵامی شایستەی خۆی دەگات. ئەزموونی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی هەژموونگەرایی سەرمایەداری سەلماندوویەتی کە هیچ پەیڕەوێکی دیکە وەڵامێکی پێویست و ئەوتۆی نەداوەتەوە کە سەرکەوتن لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. بەڵام تازەگەری دیموکراتی لەمیانەی کردارە نموونەیی و بە بانگەشەکانی وەڵامێکی بەهێز و تۆکمەی ئەم ئەزموونە مێژووییەیە.

**ج ـ دەوڵەت ـ نەتەوە، مۆدێرنیتە و کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتیك**

دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی سێیەمین و گرنگترین نابەردەوامی مۆدێرنیتەیە سەرەکیترین شێوەی چالاکی و کردەیی دەستبەسەرداگرتن و کۆلۆنیکردنی کۆمەڵگایە لەلایەن سەرمایەدارییەوە. لەکاتێکدا لیبرالیزم خۆی وەك یەکگرتوویی (هەمووێتی) ئامانجەکان (کۆمەڵگای بانگەشەکان) پێشکەش دەکات، دەوڵەت ـ نەتەوەش وەك شێوە و فۆرمی سەرەکی دەسەڵات واتادار دەبێت. ئەگەر فۆرمی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبێت ئەو فەتح و کۆلۆنیکردنە بەرفراوانەی ناوەوە و دەرەوە ئەنجامگیر نابێت کە کۆمەڵگا لەمێژووی خۆیدا دووچاری نەهاتووە.

دیسان ئەو بابەتەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان زیاترین بێنرخکردن، شێواندن و لۆگمای لەبارەوە پێشخستووە دەوڵەت ـ نەتەوەیە. تا ئێستاش زەحمەتە بگوترێت کە شیکارێکی بەرفراوان لەبارەی دەوڵەتەوە کراوە. تەنانەت مارکسیستێکی وەك لینین یش کاتێك بەرەو یەکێك لە گەورەترین شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی مێژوو دەچێت، لە رزگارکردنی شیکارەکانی "کێشەی دەوڵەت و دەسەڵات" لە پێچکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتە سەرکەوتوو نابێت. جگە لەوەی سەرکەوتوو نابێت، سەرباری سەرجەم رەخنەکانی، تەنانەت وەرچەرخان و گۆڕینی سۆڤێتەکان ــ رێکخستنەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی ــ بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە، وەك قایمکردن و پتەوکردنی شۆڕش هەڵدەسەنگێنێت. دەوڵەت ـ نەتەوەی چین کە ئەمڕۆ گەورەترین خزمەت بە سەرمایەداری جیهان دەکات نموونەیەکی گەورەی هەمان هەڵوێستە.

سەرباری ئەوەی هەڵوێستی ئەنتۆنی گیدنس سەبارەت بە یەکانەیی دەوڵەت ـ نەتەوە لایەنی واقیعیش لەخۆوە دەگرێت، بەڵام لەبارەی پەیوەستبوونی زنجیرییانەی بە پاوانەکانی دەسەڵاتی کەڵەکەبووی مێژوو باسێکی زۆر ناتەواوە. لەبەر ئەوەی لە بەرگەکانی پێشوو بە بەرفراوانی هەوڵی پێناسەکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەمان دابوو، لێرە دووبارەی ناکەمەوە. تەنیا لە گۆشە نیگای جیاوازەوە بابەتەکە رۆشن دەکەینەوە، لەرێگای ئەو ئەنجامانەی بەدەستی دێنین باسەکە تۆکمەتر دەکەین.

بەر لە هەموو شتێك پێویستە دەوڵەت ـ نەتەوە وەك گەورەترین (بەرزترین) فۆرم و شێوەی دەسەڵات بیری لێبکرێتەوە. چونکە هیچ شێوەیەکی دەوڵەت هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوە (بە نەتەوەی ـ دەوڵەت ناو ببرێت دەشێ راستتر بێت) چوارچێوە و بەرفراوانی دەسەڵاتی نییە. سەرەکیترین هۆکاری ئەمەش، بە رادەیەکی زیادەوە وابەستەبوونی توێژی سەرووی چینی ناوینە بە قۆناخ و پرۆسەی تاکانەییەوە. پێویستە هیچ کاتێك ئەوە لەبیر نەکەین کە خودی دەوڵەت ـ

نەتەوە سەرتاسەر هەمووی پاوانە. چونکە لە قۆناخی دەوڵەت ـ نەتەوەدا پاوانخوازی بازرگانی، پیشەسازی و فینانس لەگەڵ پاوانخوازی دەسەلات زۆرترین ئۆخی ڕێککەوتنیان هەیە، بگرە پێشکەوتووترین یەکێتی کۆی پاوانەکانە. لەم چوارچێوەیەدا پێویستە وەك بەشێکی دانەبڕاوی پاوانی دەسەلات بیر لە پاوانی ئایدیۆلۆژی بکرێتەوە.

یەکێك لەو گۆڕەپانانەی زانستە کۆمەلایەتییەکان زیاترین گفتوگۆی لەبارەوە دەکات سەبارەت بە پاوانەکانە. گرنگییەکی تایبەت بەوە دەدەن کە ئامێرەکان(دەزگاکان)ی دەسەلات لەسەرووی ـ ئابووری ـ پاوانەکانی بازرگانی، پیشەسازی و فینانس جێگیر بکەن. بەمجۆرە دەخوازن بەگشتی دەسەلات، بەتایبەتیش دەوڵەت وەك دیاردەی جیاوازتر لە دیاردەی پاوان پێشکەش بکەن. ئەمە یەکێك لەو خاڵە سەرەکیانەیە کە زانستە کۆمەلایەتییەکانی پەکخستووە و بە ناتەواوی هێشتۆتەوە. جیاوازی نێوان پاوانەکانی سەرووی ئابووری و پاوانەکانی دەسەلات تەنیا دەتوانرێت لە چوارچێوەی دابەشکردنی کاردا روون بکرێتەوە. جگە لەمە ئەو یەکێتی و یەکپارچەییەی نێوانیان مێژوویيە و مسۆگەرە. ناچارم رستەیەکی فرناند برلودل لێرەدا باس بکەم کە زۆر بەکاریگەرم بینی. برلودل دەڵێت "دەسەلاتیش وەك سەرمایە کەڵەکە دەکرێت". وەك بڵێی بە یەکێتی نێوانیان گەیشتووە. وەك دەزانرێت کەسایەتییەکی دانایەو لەزۆر لایەنەوە روونکردنەوەی دەرهەق بە بابەتەکە کردووە.

دەسەلات تەنیا وەکو سەرمایە کەڵەکە ناکرێت، بەڵکو هەمان ئۆخی هۆمۆژەن، پالاوتە و کەڵەکەبووی مێژوویی سەرمایە لە بەرزترین ئاستدا هەیە. ئەگەر بە پیتی گەورە بینووسم: **دەسەلات ئۆخی سەرمایەیەکی هۆمۆژەن و پالاوتەیە کە بەشێوەیەکی مێژوویی کەڵەکە کراوە.** تەواوی سەرمایەکانی دیکەی سەرووی ئابووری بەشێوەیەکی جیاوازتر کەڵەکە دەکرێت، لە ئۆخی دەستکۆرکێ و ڕێکخستنیدایە. لەبەر ئەوەی هەموویان لەسەرەوەی ئابوورین و ماهییەتی دەست بەسەرداگرتنی بەها کۆمەلایەتییەکان، بەتایبەتیش زەوتکردنی (زەوتکردن = پاوان) زێدە ـ بەهاکانی کۆمەڵگایان هەیە وەك پاوان سەیر دەکرێن و واتادار دەکرێن. ئەگەر قازانج بەشێوەی باج، خستنەکار یان تالانێکی زۆر ئاشکرابێت، تەواوی ئەو دزینەوەیەی لە کۆمەڵگا دەکرێت ماهییەتی پاوانی هەیە. لەبەر ئەم هۆکارە پێویستە زاراوەی پاوان لە شوێنی خۆی و چاك دەرکی پێبکرێت.

پێگەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەمێژوودا؛ بەشێوەیەکی تۆکمە تەواوی ئەم پاوانانەی لە چوارچێوەی خۆیدا کردووە بە یەك. دەبێتە بەرزترین یەکپارچەیی (یەکگرتوویی) سەرمایەو هێزی

خۆیشی لەم پێگەیە وەردەگرێت. هەر لەبەر ئەم پێگەیەشی بووە بە بەکاریگەرترین ئامرازی کەڵەکەکردنی سەرمایە. کاتێك ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەی پارتی بەلشەفیك ئاوایکردبوو دوای حەفتا ساڵ لە دامەزراندنی وەك تەرمێکی زەبەلاحی سەرمایەی یەکگرتوو رووبەڕوومان بوویەوە، بۆ هەمووشمان جێگای حەپەسان بوو. کەچی کاتێك لە روانگەی شیکاری دەوڵەت ـ نەتەوە تەماشای بابەتەکە بکەین، ئەم رەوشە تا دوارادە مایەی تێگەیشتنە. چونکە رێکخستنی دەوڵەت ـ نەتەوە، قەدبڕترین دۆخ و نموونەییترین رێکخستنی سەرمایەیە بەشێوەی دەوڵەت. تایبەتترین سەرمایەداری لە رێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە رێکدەخرێت نەك سۆسیالیزم. چەندە دەرفەت هەیە هێستر بکرێت بە ئەسپ، هێندە دەشێت دەوڵەت ـ نەتەوە بکرێت بە سۆسیالیست یان وەها لە قەڵەمبدرێت.

سەرباری ئەمەش لەمیانەی دابڕاندنی لە فۆرمە مێژووییەکان ناتوانرێت تاکەنەبی دەوڵەت ـ نەتەوە روونبکرێتەوە. جیاوازییەکەی لەگەڵ فۆرمە مێژووییەکانی دەوڵەتانی پێشووتر چەندە پێشکەوتووش بێت، بەڵام دیسان ئەوەی یەکلاییکەرەوەیە کەڵەکەبوونە مێژووییەکەی دەسەڵاتە. با سەیرێکی ئینگلتەرا بکەین کە یەکەمین وڵاتە دەوڵەت ـ نەتەوەی رێکخستووە: لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم ئینگلتەرا لەناو مەنگەنەی دەسەڵاتی ئیسپانیا، فەرەنسا و نۆرمانەکاندا[٢] بوو. ئەگەر خۆی وەك دەوڵەت ـ نەتەوە رێکنەخات، ئەوا مەترسی و هەڕەشەکانی لەناوچوون زۆر ئاشکرایە. بۆخۆی سیستەمەکەی پاشایەتییە، یەك بەدوای یەك خانەدانەکان دێن و دەچن. ئابوورییەکەی لەلایەن ئەو کۆچانەوە ئاوا دەکرێت کە لەسەردەمی نیولیتیکەوە بۆ ئەورووپا لە ئارادایە. جیاوازییەکەی لەگەڵ وڵاتانی دیکەی ئەورووپا، لە بنەڕەتدا هەڵکەوتەکەی وەك دوورگەیەکە. لەرێگای پشتبەستن بەم هەلومەرجە مێژوویی و بەرجەستانە دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆی ئاولکرد. مێژوو بەشێوەیەکی کۆنکرێتی و روون و ئاشکرا باس لەم قۆناخە دەکات کە زیادبوونی هێزی ستەرلین[٣] و پاوانە مەزنەکەی بەسەر ئابوورییەوە چۆن بەیەکەوە بەڕێوەچوو. هەروەك دەزانرێت لەپێناو هەژموونگەرایی هەنگاوی بۆ شۆڕشی پیشەسازی هاوێشت. کەواتە

---

[٢] نۆرمانەکان: بە واتای پیاوانی باکور (باکورییەکان) دێت. تێکەڵەی چەند گەلێکی ئەسکەندەنافیان، لەنێوان سەدەکانی ٩–١٢ دا چەندین جەربەزەییان ئەنجامداوە. لە دانیمارك، سوێد و نەرویج جێگیر بوون. بە بنەچە جەرمەن بوون و کلتووری تایبەت بەخۆیان هەبووە. زۆربەیان جووتیار بوون، بەڵام دەریاوانیشیان کردووە. بتپەرست بوون، بەڵام دوای جێگیربوونیان لە فەرەنسا بوون بە کرستیان.

[٣] ئەستەرلینی (Sterlin): یەکەی دراوی بریتانیایە، واتە جونیەی ئەستەرلینی، بۆ ئاسانکاری بە پاوند ناو دەبرێت. دوای دۆلار و یۆرۆ بە سێیەمین دراوی یەدەگی جیهان دادەنرێت.

ئەگەر مێژووی ئینگلیز، بەتایبەتیش مێژووی خانەدانێتی و خانەدان بەخۆی نەبێت، ئەك تەنیا ناشێ دەوڵەت ـ نەتەوەی ئینگلیز ئاوابکرێت، ئاشکرایە کە هەرگیز بیری لێناکرێتەوە. بەدرێژایی مێژوو خانەدانێتی بەرفراوانترین و درێژخایەنترین شێوەی دەوڵەتە. تا ئێستاش دەستبەرنەدانی ئینگلتەرا لە پایە و نمایشی خانەدانێتی گرێدراوی ئەم لایەنەی مێژووەکەیەتی. دیموکراسی و کۆمارییەکان زۆر سنووردارن. ئیمپراتۆرییەتەکان فۆرمێکی جیاوازترن. ئەگەر کەڵەکەبوونی دەسەڵات نەبێت کە بەهەزاران ساڵ وەك پاوانێکی پاڵاوتە هاتووە، بەگشتی دەوڵەت، بەتایبەتیش دەوڵەت ـ نەتەوەکان ئاوا ناکرێن.

زۆر کەم باسی پەیوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە بە سەرچاوە تیۆلۆژییەکان کراوە، بەڵام ئەم بابەتە تا دوارادە گرنگە. کارل سمیت کاتێك دەڵێت" سەرجەم زاراوە سیاسییە هاوچەرخەکان سەرچاوەکەیان ئیلاهییات (خوداناسی)ە، لەڕوانگەیەکەوە راستی رۆشنکردۆتەوە. هەر کەسێکی خاوەن قاڵبوونەوەیەکی وردی سۆسیۆلۆژییانە بێت لە دەستنیشانکردنی ئەو راستییە زەحمەتی نابینێت، ئایین و گرێدراو بەویشەوە سیمبۆڵی خوداوەند کۆنترین شێوەی ناسنامەی کۆمەڵایەتییە. لەوە زیاتر کە ئایین و خوداوەند هەر یەکە و ناسنامەیەکی وێناکراوی سیمبۆلی بن، پێویستە وەك پێداویستییەکی قۆناخی زهنییەتی خۆیان دەرکی پێبکرێت. وێناکردنی هاوبەشی کۆمەڵگا لەمیانەی زاراوە پیرۆزەکانەوە وەك یەکێك لە رێگاکانی خۆ بەناسنامەکردن و لەسەرپێ مانەوە بیری لێدەکاتەوە. پیرۆزکردنی هەبوون و ژیانی کۆمەڵگا لە ژێر ئیلاهیبووندا شاراوەیە. کاتێك بەپێی قۆناخ جیابوونەوەی دەسەڵات، دەوڵەت و کۆمەڵگا لەناو پرۆسەکەدا خێرا دەبێت، پیرۆزی و ئیلاهیبوون لە نۆخی ناسنامەی هاوبەشی تەواوی کۆمەڵگا دەردەخرێت، دەکرێت بە موڵکی دەسەڵاتداران و خاوەنەکانی دەوڵەت. لێرەدا هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. چونکە بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە خوداوەند سەرچاوەی دەوڵەت و دەسەڵاتە، بەمجۆرە رێگای ئەوەش دەکرێتەوە بەو سیفەتەی خاوەنی دەوڵەت و دەسەڵاتن، خۆیشیان بەپیرۆز و ئیلاهی راگەیەنن. ئیتر گەیشتن بە دەستەواژەکانی پاشا ـ خوداوەند و دەوڵەتی خوداوەند زەحمەت نییە. زاراوەکانی سێبەری خودا و پەیامبەری خوداش یەك بەدوای یەك دێن و دەرەنگ ناکەون.

هەرچەندە زاراوەی دەوڵەتی عەلمانی خوازیارە خۆی لەدەرەوەی ئەم پرۆسەیە بگرێت، بەڵام ئەمە راست نییە. عەلمانییەت کە پرەنسیپی سەرەکی گروپە ماسۆنییە بە بنەچە یەهوودییەکانە کە لەکاریگەری کڵێسە ناڕەحەت بوون، هەڵبەتە کاتێك بە سیفەتی جەمسەری دژە پرەنسیپی رۆحانی تا رادەیەکی مەزن سەرچاوەی هەبوونی خۆی لەم سەرچاوەیە وەردەگرێت، ئەمە

پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. پێویستە زۆر راشکاوانە بڵێین، ئەوەك مەزندە دەکرێت عەلمانییەت هێندە دونیایی ـ سکۆلارە، ئەهێندەی مەزەندە دەکرێت رۆحانییەتیش ئاخیرەتییە. هەر دوو زاراوەش دونیایین، کۆمەڵایەتیین. دۆگما ئایینییەکان جیاوازی نێوان هەر دووکیانیان کردۆتەوە.

لەم سۆنگەوە هەر وەکو چۆن بەدرێژایی چاخەکان خەیاڵی ئیلاهیبوون وەك سەرچاوەی دەسەڵات و دەوڵەتەکان لە ئارادا بووە، چاوەڕوانی دەکرێت وەك خۆی رەنگدانەوەی لەم سەردەمەشمان هەبێت. دەوڵەتی هاوچەرخیش بەم رەنگدانەوە کاریگەر بووە. بەدرێژایی مێژوو زاراوەکە بەمجۆرە شێلدراوە. زاراوەکانی دەوڵەتی عەلمانی یاخود دەسەڵات ناکۆك و ئاڵۆزن.

لە مەزەندەکان زیاتر دەوڵەت ـ نەتەوە بە زاراوە ئیلاهییەکان بارکراوە. بەرادەیەك وابەستەی رێورەسمەکانی پیرۆزاندنە کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە. زاراوەکانی لە جۆری "نیشتیمان، ئاڵا، یەکگرتوویی، سەربەخۆیی، پیرۆزی، سروود ـ مۆسیقا، گێرانەوەی چیرۆکەکان" کە پشتیان پێدەبەستێت و وەك سیمبۆل و رەمز هەڵبژێردوون، لە پادشا ـ خوداوەندەکان زیاتر خاوەن پایەی ئیلاهییە. هیچ شێوەیەکی دەوڵەت هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوە بە قەڵغانی ئایدیۆلۆژی، حقوقی، سیاسی، ئابووری و ئایینی پەردەپۆش نەکراوە. هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە رێچکەی سەرەکی پێکەوەژیان و گونجانی ئەو بیرۆکراسییە سڤیل ـ سەربازییە کە زۆر قەرەباڵغ بووە. کورسییەکانی دەوڵەت لەژێر بیرۆکراتەکان دەربخرێت (بەڕەی ژێر پێیان دەربخرێت) هەموویان وەك ماسی لە ئاو دەرهێنراویان لێدێت. بۆ بیرۆکراسی دەوڵەت مەسەلەی مان وُ نەمانە. گەیاندنی دەوڵەت بە ئەوپەڕگەری پایەی خوداوەندێتی، لەنزیکەوە وابەستەی ئەم خەسڵەتەی بیرۆکراسییە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەکاتێکدا هێندە هەڵوەستە لەسەر دەوڵەت دەکات و باووباهۆز هەڵدەکات کە لە هیچ مۆدێرنیتەیەکی دیکەدا نەبینراوە، دیسان هۆکارەکەی گۆڕانکاری بونیادە چینایەتییەکەیەتی. هێندە دووبارەکردنەوە و پێداگرتن لەسەر مۆدێرنیتە، دەوڵەت ـ نەتەوە، بەتایبەتیش " یەکگرتوویی ـ ناوەندێتی" لەنزیکەوە پەیوەندی بە زاراوەی یەکێتی خوداوەندەوە هەیە. هەروەکو چۆن لەمێژوودا خوداوەندی هۆز و قەومەکان بەیەکەوە لەگەڵ هۆز و قەومەکانیان لەناودەبران و لەناو هۆز یاخود قەومی زاڵدا توێنراونەتەوە، خوداوەندەکەشیان لەناو خوداوەندی هۆز و قەومی زاڵدا توێنراونەتەوە و کراون بەیەك. کاتێك لە میانەی ئەم راستییە سۆسیۆلۆژییەدا تەماشای زاراوەی یەکێتی خوداوەند بکەین، ئەوا

بەشێوەیەکی ئاسانتر بە واتاکەی دەگەین. داگیرکەری و ئاسیمیلاسیۆن (تواندنەوە) لە خۆوە دەگرێت.

مێژووی ناوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەشێوەیەکی زۆر خەست ئیلاهییە. بۆ چەککردنی تەواوی ئەو کۆمەڵگایەی لەسروشتەکەیدا هەیە، گواستنەوەی سەرجەم پاوانی چەك بۆ دەوڵەتی مۆدێرن، لەکاتێکدا ڕێگا لەپێش ناوەندێتی دەوڵەت دەکاتەوە، لەناوەڕۆکدا ئەوەی ڕوودەدات چەوسانەوە، داگیرکاری و پاوانخوازێتییەکی سەرسووڕهێنەرە. تیۆریسیەنەکانی سەرەوەری (لەسەروویانەوە هۆبز و ماکیافیلی) کاتێك بەناوی زانستگەرایی دەوڵەتی مۆدێرن پێناسە دەکەن، گرنگترین خزمەت پێشکەش بە پاوانخوازێتی سەرمایەداری دەکەن. هەروەهالەژێر ناوی ئارامی کۆمەڵگا کۆکردنەوە و چڕکردنەوەی سەرجەم چەکەکان لە بونیادێکی تاکخوازدا، بەڕادەیەك بەواتای داماڵینی کۆمەڵگا لە هێزە سیاسییەکەی، داماڵینی لە هەبوونە ئابوورییەکەی دێت کە لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە. بەگوێرەی ئەوەی لەدوا شیکاردا دەوڵەت و دەسەڵات وەك پاوانێك دەکەونە گەڕ، لەمیانەی ئەو هێزە چەکدارانەی بەدەستیانەوە چڕبۆتەوە هیچ بەهایەکی کۆمەڵگا نامێنێت کە بەدەستی نەهێنن. بەو شێوەیەی خوازیارن بچم بە کۆمەڵگا دەدەن، ئەوانە لەناودەبەن کە خوازیاریان نین. لە ڕاستیدا ئەوەی لە مێژوودا ڕوویداوە لەسەر ئەم ڕێڕەوە بەڕێوەچووە. جینۆسایدێك ڕوویداوە کە بەخەیاڵیشدا نەدەهات.

دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی هاوبەشێتی سەرجەم پاوانەکانە تەنیا بە ئاوابوون لەسەر بنەمای زەوتکردن، فەتحکردن و داگیرکردنی کلتووری ماددی ناوەستێت، بەڵکو لە تواندنەوەی کلتووری مەعنەویشدا ڕۆڵێکی دیاریکەر دەبینێت. لەژێر ناوی کلتووری نەتەوەیی پێوانە و ڕێسای کلتووری ئەتنیکێك یان گروپێکی ئایینی دەسەڵاتدار فەرمی دەکات، شەڕ بەرامبەر تەواوی قەوارە کلتوورییەکانی دیکە ڕادەگەیەنێت. لەژێر بانگەشەی "زیانی بۆ یەکێتی نەتەوەیی هەیە" لەڕێگای توندوتیژی یان هاندانی ماددییەوە کۆتایی بە زمان و کلتووری تەواوی ئەو نەتەوە، قەوم، ئایین و ئەتنیکانە دێنێت کە بەهەزاران ساڵە هەن. چەندین زمان، ئایین، مەزهەب، ئەتنیك، خێڵ، قەوم و نەتەوە بەجۆرێك بوونە قوربانی ئەم سیاسەتە، ڕاستتر بوونە قوربانی جینۆساید کە لەهیچ قۆناخێکی دیکەی مێژوودا ڕووینەداوە. بە بەراورد لەگەڵ جینۆسایدە مەعنەوییەکان جینۆسایدی ماددی (جەستەیی) تەنانەت لە حوشتردا بەقەد گوێچکەکەیشی نابێت. لە ژێر سەرشێتی"یەکێتی نەتەوەیی" وەك بڵێی چالاکییەکی پیرۆزە بەهای ئەو زمان و کلتوورانەی بەهەزاران ساڵ لە بیژنگ دراون و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتوون بەیەکەوە لەگەڵ گروپەکانیان کراونەتە قوربانی.

چەمکی "نیشتیمان"ی دەوڵەت ـ نەتەوە زۆر بەکێشەترە. هەرچۆنێك بێت ئەو سنوورە جوگرافییەی دەخرێتە ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەت، واتە دەخرێتە ژێر پاوانی دەوڵەت، وەك "نیشتیمانی پیرۆز" وێنا دەکرێت. لەراستیدا نیشتیمان کراوە بە موڵکی هاوبەشی هاوپەیمانێتی پاوانەکان. ئەو سیستەمەی لەسەر (نیشتیمان) ناوایان کردووە داگیرکارییەکە زۆر لە داگیرکاری کۆلۆنییە کۆنەکان قووڵترە. ئەگەر جاران یەك وڵاتی داگیرکەر هەبوو، بەڵام لە دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرندا بە قەدەر ژمارەی پاوانەکان جۆری داگیرکاری لەسەر "نیشتیمانی پیرۆز"ی خۆی هەیە. وەك چۆن گەلە کۆلۆنییەکان بۆ چەك کرابوون، گەلی "نیشتیمانی پیرۆزی"ش بۆ چەك دەکرێت و بەرامبەر هەموو جۆرەکانی چەوسانەوە دەخرێنە دۆخی بێبەرخودانی و دەستەمۆییەوە. سەرجەم پێکهاتەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی لەسەروویانەوە هێزەکانی کار، دووچاری چەوسانەوەیەکی چەند قاتی دەبنەوە. بەجۆرێکی دیکە ناتوانن پاوانەکانی بیرۆکراسی تێر بکەن، کە وەك وەرەم گەورەبووە.

هەرچی دیپلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوەیە لەپێناو هەماهەنگی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە ( پاوانە دەرەکییەکان) و بەدواداچوونی کاروباری سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی جیهان رێکدەخرێت. ئەگەر لە دەرەوە دان بە دەوڵەت ـ نەتەوەکاندا نەنرێت مەحاڵە تاکە دەوڵەت ـ نەتەوەیەکیش ٢٤ کاتژمێر خۆی لەسەر پێ رابگرێت. هۆکاری ئەمەش لە لۆژیکی سیستەمی سەرمایەداری جیهاندا شاراوەیە. ئەگەر رەزامەندی هێزی هەژموونگەرایی نەبێت، هەبوونی هیچ دەوڵەت ـ نەتەوەیەك سەقامگیرو هەمیشەیی نابێت. چیرۆکی هەموویان لە دەفتەری هەژموونی نووسراوە. ئەوەی لە رێساکان لابدات یان دووچاری چارەنووسەکەی سەددام دەکرێت، یان لەرێگەی گەمارۆ و ئابلۆقەکانەوە مایەپووچ دەکرێت و دەرووخێنرێت. شیمانە دەکرێت هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك باش دەزانێت لەکاتی ئاواکردن یان دواتر ئەگەر رەزامەندی هێزی هەژموونگەرایی نەبێت، هەبوونی هیچ دەوڵەت ـ نەتەوەیەك هەمیشەیی نابێت. تەنانەت دەوڵەتەکانی یەکێتی سۆڤێت و چینیش لەدەرەوەی ئەم رێسایە نەماونەتەوە.

یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، بونیادەکەی چەندەی بڵێی بەرامبەر فرەلایەنی و قەوارە سیاسییە جیاوازەکان داخراوە. هۆکاری ئەمەش ئاشکرایە و مایەی تێگەیشتنە. چونکە فرەلایەنی و قەوارە سیاسییە جیاوازەکان لەناو سنوورە دیاریکراوەکاندا دەبنە کۆسپ لەبەردەم چەوسانەوەی پاوانەکان. وەك پێویستی سروشتەکەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پێکهاتەیەکی سیاسی جیاوازە، بەتایبەتیش ئەگەر لەمیانەی پێکهاتە سیاسییە

دیموکراتییەکان ببێتە خاوەن هەبوون، تارادەیەکی مەزن مەیدانی پاوانخوازەکان تەسک دەبێتەوە. هەروەها زاراوەکانی لەجۆری خاوەندارێتی سەروەری، یەکپارچەیی وڵات و بونیادی ناوەندی لەم پێناوەدا دروستکراون. مەبەست دابەشنەکردنی بەهاکانی وڵاتە لەگەڵ گەلی خۆی و گروپەکانی کۆمەڵگا. ئەم بیانووە رۆڵێکی سەرەکی لە لەناوبردنی کلتووری مەعنەویشدا دەبینێت. سەرباری ئەوەی لەسەر بنەمای ئازادی و جیاوازییەکان فرەلایەنی دیموکراتی سیاسی گونجاوترین رژێمی سیاسییە، بەڵام وەك بۆچوون و چالاکییەکی دەرەوەی یاسا پیشان دەدرێت، گوایە "یەکپارچەیی وڵات و رژێمەکەی دەخاتە مەترسییەوە".

دەوڵەت ـ نەتەوە لەمیانەی ناسنامەی نەتەوەپەرستییەوە کە هەرە زێدە بەکاریدێنێت، لەوانەیە لەمێژوودا بەکرێگیراوترین نوێنەری هێزی هەژموونگەرایی بووبێت. واتە لەژێر کراسی میللیگەراییدا دڵسۆزترین بەکرێگیراوی سیستەمی سەرمایەدارییە. هیچ دەزگا و دامەزراوەیەك هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوە وابەستە و خزمەتکاری هێزی هەژموونگەرایی، هێزی ناوەندی سەرمایەداری جیهان نییە. بەهۆی ئەم کاراکتەرەیان داگیرکاری ناوخۆن. دەوڵەت ـ نەتەوەیەك چەندە بانگەشەی میللیگەرایی بکات، واتا بەو رادەیە خزمەتی هەژموونگەرایی سیستەمی جیهان دەکات. ئەو دەوڵەتگەراییەی ـ نەتەوە کە چوار سەد ساڵە هێزی هەژموونگەرایی بە بایەخەوە ئامادەی دەکات، شێوەی پێدەدات و بەدەستی خۆی کرلوویەتی بە سیستەم، ئەگەر بە میللیگەراترین دەوڵەت لە قەڵەم بدرێت واتە هیچ شتێك لە شەڕەکانی هێزی هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی تێنەگەیشتوون.

کاتێك زاراوەی دەوڵەت ـ نەتەوە شیکار دەکرێت، گرنگە لەگەڵ هەندێك بابەتی دیکە تێکەڵ نەکرێت و ئەنجامی چەوت بەدەست نەهێنرێت. بەر لە هەموو شتێك پێویستە زاراوەی دەوڵەت ـ نەتەوە باش پێناسە بکرێت. لە مێژوودا دەوڵەت خۆی وەك رێکخراوێك پێناسە دەکرد کە تەنیا بە ئەندامە بەشداربووەکانییەوە سنووردارە. واتا بە سیفەتی کادیرانی دەوڵەت ناچاربوون یەکتری پەسەند بکەن، ئیقناع، شکۆدار، رەسەن و تەنانەت یەکتری بە ئیلاهی (پیرۆز) بکەن. بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەت ـ نەتەوە ئەم هەڵوێستە گۆڕلوە. ئیتر بەنۆخێك گەیشتووە خۆی وەك گەورەیی خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە، شکۆداری و پیرۆزییەکەی پێشکەش بکات، ئەمجارە تەنیا بە ئیقناع کردنی کادیرانی دەوڵەتەوە نەوەستا، بەڵکو بەسەر تەولوی کۆمەڵگای گشتگیرکرد کە لە رەعییە بەناو هاوڵاتییەکانی پێکدێت. وەك بڵێی سەرجەمی کۆمەڵگا لەناو بۆتەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا تواوەتەوە. ئەمە ئەو بوویەرەیە کە بە زیندانیکردن لەناو قەفەسی ئاسنین ناو دەبرێت.

ئەگەر ئەم راستییە دەرکی پێنەکرێت، تێگەیشتنی دەوڵەت ـ نەتەوە و مۆدێرنیتە مەحاڵە. ئەو فاکتەرانەی تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بە دەوڵەت ـ نەتەوە ئاستەم دەکەن، یەکەمیان" بەیەکەوە هەڵسەنگاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەیە لەگەڵ کۆمار و دیموکراسی. هەروەك چۆن دەوڵەت ـ نەتەوە کۆمار نییە، بەڵکو لە میانەی دژایەتیکردنی فەلسەفەی کۆمار، دامەزراو و میکانیزمە سەرەکییەکانی بەرەو پێشەوەچووە. دەوڵەت ـ نەتەوە واتای نکوڵیکردنە لە کۆمار و کۆمارێتی. بۆچوونی "دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی نەبێت، دیموکراسی و سۆسیالیزم نابێت" کە تا ئێستا لە رەوتی چەپدا بەکاریگەرە و بە درێژایی ١٥٠ساڵ بۆچوونی فەرمی چەپی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو خۆ فریودانێکی مەترسیدارە. ئەنجامە مەترسیدارەکانی ئەمانە، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا، لەمیانەی لەناوبردنی چەندین سۆسیالیست و دیموکراتدا بینرا، لەسەرووشیانەوە رۆزا لوکسەمبۆرگ، هەروەها لە هەرەسهێنانی سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراویشدا بینرا. هیچ فریودان و خەڵەتاندنێك تا ئەمرادەیە زیانی بە سۆسیالیزم و دیموکراسی نەگەیاندووە. کۆمار و دیموکراسی تەنیا لە میانەی قەوارە فرەلایەنەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە بەرامبەر پاوانخوازێتی دەوڵەت – نەتەوە بەواتا راستەقینەکەی خۆیان دەگەن. تەنیا ئەو کاتە لەمیانەی سیستەمێکی فرەلایەنی سیاسەتی دیموکراتی کۆماری دیموکراتی نیشتیمانپەروەرییەکی واتادار و پێکەوەژیان لەناو جیاوازییەکاندا بەدیدێت.

لە هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمرۆماندا کە پاوانەکانی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری بەدوای هەژموونگەراییەوەن وەك دەبینرێت خوازیارن ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی ستاتۆی کۆنیان هەیە سەرلەنوێ ئاوایان بکەنەوە. ئەگەر ئەم مەیلەی نیولیبرالیزم ئامانجی جیاوازیشی هەبێت (بەتایبەتیش دەمامکە فریودەرەکەی دیموکراسی) مایەی تێگەیشتنە. لە زۆر لایەنەوە پاوانی نەتەوەیی لەگەڵ پاوانی جیهانگیری ناگونجێت، ناتوانێت بەخێرایی پێویستییەکانی سیاسەتی جیهانگیری جێبەجێ بکات. لەم سۆنگەیەوە" هۆکاری بنبەستبوونی بەردەم کامڵبوونی سیستەمە. واتە سەرلەنوێ ئاواکردنەوە لەپێناو لەناوبردنی دەوڵەت ـ نەتەوە نییە، بەڵکو بە ئامانجی گوێرایەڵی کردنێتی بۆ داخوازییە نوێیەکانی سەرمایەداری فینانسی هەژموونگەرایی جیهانگیری.

دەوڵەت ـ نەتەوە هیچ دوودڵییەك لەو هەژموونە ئایدیۆلۆژییە ناکات کە لەناو کۆمەڵگادا بڵاوی کردۆتەوە و بێ سڵەمینەوە هەر چوار فۆرمە سەرەکییە ئایدیۆلۆژییەکە بەشێوەی خستنە سەر یەك و بەیەکەوە لکاندن لەناو یەکدا بەکاردێنێت. میللیگەرایی کە فۆرمی سەرەکی ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوەیە تەواو بە ناوەرۆکێکی ئایینی گەیەندراوە. دەوڵەت ـ نەتەوە

چەندە مۆدێرنیتەیەکی سەرمایەداری بێت، بەو رادەیە میللیگەرایش ئایینێکی مۆدێرنیتەیە. بە سیفەتی ئایینی کۆمەڵایەتی فەلسەفەی پۆزێتیفیست ئامادەکراوە. بەو سیفەتەی نیشتیمانپەروەری سروشتی کۆمەڵگایە، پێویستە وەك دژی کۆمەڵگای نەتەوەیی ببینرێت و بیری لێبکرێتەوە. لەم چوارچێوەیەدا میللیگەرایی ئایدیۆلۆژیایەکە لە بەرزترین ئاستدا دژی نەتەوەیە. کاتێك لەرێگای میللیگەراییەوە نەتەوە ـ کە دیاردەیەکی دیموکراتیکە ـ دەخاتە ژێر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای سەرمایەداری، گەورەترین خزمەت بە پاوانەکانی چەوساندنەوە دەکات. بەمجۆرە سەرجەم نەتەوە دەکات بە موڵکی هاوبەشی ئەو پاوانانەی لە دۆخی رێککەوتندان (پاوانەکانی دەسەڵات، فینانس، پیشەسازی و بازرگانی). ئەم ئەرکەش بەتایبەت لە ژێر کراسی ئایینی میللیگەرایی پۆزێتیفیست جێبەجێ دەکات. ئەگەر لەم لایەنەوە وەك ناکۆکیش دیار بێت، بەڵام میللیگەرایی بەو سیفەتەی ئایینی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، لە دۆخی دوو دیاردە خۆی دەخاتە روو، کە لە بناخەدا هەمان شتن.

یەکەمیان" بەشێوەی خودلوەندێتی " دەوڵەتی ناوەندی" یە. بەو سیفەتەی دەوڵەتی تاکە خوداوەندە، لەناو نەتەوەدا زۆر هەستیارە. ئەم شێوەیەی تاکە خودلوەند لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا ، بەشێوەی هەژموونگەرایی سوپەر رەنگدەداتەوە. (جۆرج دەبلیو بۆشی سەرۆکی هەژموونگەرایی سوپەر کاتێك دەڵێت بەناوی خودلوەند ئەرکدار کراوم، بەڵگەی ئەم راستییەیە). بە گوتەی هیگل هەژموونگەرایی سوپەر "دۆخی بەرێوەچوونی خودلوەندە لەسەر زەوی" (گەرچی لە قۆناخی خۆی ئەم دەستەواژەی سەبارەت بە ناپلیۆن و فەرەنسا بەکارهێنابوو). دووەمیان" هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك بتی نەتەوەی هەژموونگەرایی سوپەرە کە سیفەتی خودلوەندێتی بەدەستهێناوە. کاتێك بەمشێوەیە خۆی زیاد دەکات، بەواتای پارچەکردنی یەکێتییەکەی و گوزەرکردن بۆ سیستەمی فرەخوداوەندی نایەت، بەڵکو بە واتای زیادکردنی بتەکان دێت. سەرچاوە فەلسەفییەکەی ئەمەش پۆزێتیڤیزمە. واتە دووەمین ئایدیۆلۆژیای بەیەکەوەلکێنراوی دەوڵەت ـ نەتەوە زانستگەرایی پۆزێتیڤیستە. نزیکترین سەرچاوەی ئایدیۆلۆژییە بۆ میللیگەرایی. هەر دووکیان یەکتر تێردەکەن و کار لەیەکتر دەکەن. خودی دامەزرێنەرەکەی ئۆگست کۆمتە ویستبووی پۆزێتیڤیزم وەك ئایینێکی گەردوونی سکۆلار ئاوا بکات. بەڵام بەقەدەر مارکسیزم جێگیر نەبوو. دیسان لە پێگەی سەرەکیترین ئایینی عەلمانیەتدایە. سەرباری ئەوەی بانگەشەی دژایەتیکردنی دەکرد، بەڵام کاتێك نیچە لەجێگای خۆیدا ئامانج دەپێکێت و پۆزێتیڤیزم وەك قەبەترین میتافیزیکی تاڵانکار هەڵدەسەنگێنێت، چەسپاندنێکی گرنگ دەکات. بەو سیفەتەی

یەکێك لە گۆڕانە (داتاشینە) ئایدیۆلۆژییەکانی گلێنەی چاوی مۆدێرنیتەیە، لە پێگەی ئایدیۆلۆژیایەکی هەژموونگەرادایە کە هەرە زێدە زانستی کۆمەڵایەتی چەواشە و نابیناکردووە، کرنووێتی بە بت.

هەروەها پۆزێتیفیزم وەك زانست (زانستگەرایی) یش فەلسەفەی قەبەترین دیاردەگەراییە. دیاردە دیمەنی راستییە، بەڵام لە پۆزێتیفیزمدا خودی راستییە، لەم سۆنگەوە هەر شتێکی دیاردە نەبێت واقیعی نییە. لەرێگای فیزیای کوانتەم، ئەستێرەناسی و بایۆلۆژی و، تەنانەت لە خودی گەوهەری هزریشەوە ئاگادارین و دەزانین کە راستی زیاتر لەو جیهانانە جێگای باسە کە لەودیوی بوویەرە بینراوەکانەوە روودەدەن. لە پەیوەندی نێوان چاودێر و چاودێریکراودا راستی (حەقیقەت) بە ماهییەتێکی هێندە نهێنی گەیشتووە کە ناکەوێتە ناو هیچ پێوانە و پێناسەیەکی فیزیاوە. بەو سیفەتەی نکوڵیکردنی ئەم قووڵاییەیە، پۆزێتیفیزمیش هەرە زێدە بە بتگەرایی (پاگانیزم)ی چاخی یەکەم دەچێت. لەبەر ئەوەی وەك دیاردە بتیش دیمەنی هەیە، پەیوەندی هاوبەشی نێوان پاگانیزم و پۆزێتیفیزم پیشاندەدات. لەبەر ئەم هۆکارەشە سەرجەم ئەو زهنانەی لەناو دەوڵەت ـ نەتەوە بە ئایینی میللیگەرایی شۆرلونەتەوە جیهان بەدیمەن و رووخسار (دیاردە)ی سادە دادەنێن، وەك جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن دەرکی پێدەکەن. ئاڵوودەبوونی کۆمەڵگای بەکاربردن بە "تۆبژە (شتوومەك)" خودی ئەم پەرستنەیە. لەم لایەنەوە شێوەگرتنی کۆمەڵگای بەکاربردن وەك بەرهەمێکی ناوەندەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە تا دوارادە گرنگە و مایەی تێگەیشتنە. بەمجۆرە لەلایەکەوە سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگا وەك دیلی کاڵا (لە دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆمەڵگای بەکاربردن کاڵا تەولو کراوە بە بت) و بەکاربەری زێدەڕۆ دەرفەتی قازانجی هەرە زۆر پێشکەش بە پاوانەکانی سەرمایەداری دەکەن، لەلایەکەی دیکەشەوە لەرێگای بەکاربردنەوە کە جۆرێك لە جۆرەکانی دیمەنی ئایینی بەدەستهێناوە کۆمەڵگا دیل کراوە، ئەم کۆمەڵگایەش دەخرێتە رەوشێکی گوێڕایەڵ (ماڵیکراو) و ئاسیمیلە کراو کە بە ئاسانترین شێوە بەرێوە دەبرێت. ئەو کۆمەڵگایەی گیرۆدەی زهنێکی میللیگەرایی مەترسیدار و دروشمدان (هوتافات) هاتووە بەشێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا گوزارشت لەم راستییە دەکات.

سێیەمین فۆرمی گرنگی ئایدیۆلۆژی رەگەزپەرستی کۆمەڵایەتییە. بەدرێژایی مێژوو رەگەز(گەرایی) پەرستی ئەو چەکە بووە کە هەرە زێدە لەلایەن سیستەمەکانی شارستانییەوە بەکارهێنراوە ( دژی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی). کۆلۆنیکردنی ژن بۆ زۆر ئامانجی جۆراوجۆر بەکاریگەرترین نموونەی ئەم باسەیە. وەچەدەخاتەوە، کرێکاری بێ کرێیە، خاوەنی بە پەژارەترین

و سەختترین کارە و گوێڕایەڵترین کۆیلەیە. هەروەها لەنۆخی ئۆبژەی هەمیشەییکردنی ئارەزووی زایەندیدایە. ئامرازی ریکلامە. بەنرخترین کالآیە، بگرە شاژنی گشت کالآکانە. وەك ئامرازی لاقەکردنی بەردەوامی پیاو دیمەنی ئەو کارگەیە دەدات کە دەسەڵاتەکەی دەستەبەر دەکات. وەك ئۆبژەی جوانی و رازانەوە لە بواری مەعنەوییەوە درێژەپێدەری کۆمەڵگای پیاوسالارییە. لەناو ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارییەی لە بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەیە بەڕادەیەکی هەرە بەرز لەم لایەنانەوە ژن بەم پێگە داڕووخاوە دەگات. چونکە خەیاڵی (وێنا)ی ژن لە کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە بە سیفەتی خودلوەند (وێنا و ناسنامەی هاوبەشی ژن) لە ڕووخساردا ئامراز و کەرەستەیەکی عیبادەتە. بەڵام سیفەتی خودلوەندە ژن "ئیلاهە" لێرەدا بە واتای سۆزانیخانە (ماڵی گشتی)و سووکایەتی پێکردن دێت. ژن بە سیفەتی ئیلاهە، ئەو ژنەیە کە هەرە زێدە دووچاری سووکایەتی پێکردن هاتووە و بچووك خراوە. لەکاتێکدا ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە لەلایەکەوە بەشێوەیەکی زێدەڕۆ و لە بەرزترین ئاستدا پیاو دەکات بە دەسەڵاتدار، (هەر پیاوێکی باڵادەست بەشێوەیەکی داپۆشراو پەیوەندی زایەندی بەواتای "ئیشی قەحبەکەم تەواو کرد"،"توانیم (زاڵبووم)"لەمێشکیدا جێگیر دەکات) لەکەسایەتی ژندا کۆمەڵگا دەخاتە نۆخی کەوتووترین کۆڵۆنییەوە، لەم چوارچێوەیەدا لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا ژن لە نۆخی پێشکەوتووترین کۆڵۆنی نەتەوەی کۆمەڵگای مێژووییدایە!

دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی نەریتی بەر لە مۆدێرنیتەیە لە بەکارهێنانی ئایین و ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی لەناو یەکتردا تواناکەوێت. هۆکاری ئەمەش، هێزە بەکاریگەرەکەی ئایینە لەسەر کۆمەڵگاکان کە تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان هاتووە. سەبارەت بەم بابەتە بەتایبەتی ئیسلام زۆر زیندووە. بەڵام لەمیانەی بەکارهێنانی لەلایەن مۆدێرنیتەوە چیتر نەریتی ئایینی، ئایینی جاران نییە. ئەگەر بە نۆخی رادیکاڵ یان میانڕەوی بێت، ئەو ئایینەی لەلایەن مۆدێرنیتە و دەوڵەت ـ نەتەوەوە بەکاردەهێنرێت، لە ڕۆڵە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکەی (ڕۆڵە گەورەکەی لە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی) خۆی دابڕێنراوە و بەنۆخێکی خەسێنراوی پێشکەش دەکرێت. ڕۆڵەکەی لەناو کۆمەڵگادا لە چوارچێوەی ئەو پێوانەدایە کە دەوڵەت ـ نەتەوە مۆڵەتی پێداوە. کۆسپی دژواری لەپێش دادەنرێت تا ڕۆڵە ئەرێنییەکەی ناو کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نەبینێت. لەم بارەیەوە عەلمانییەت لەسەرڕوی ئەم کۆسپانەوە دێت. لەم سۆنگەیەوە پێویستە سەرسوڕماو نەبین کاتێك ناوەبەناوە ململانێی نێوان هەردووکیان دەتەقێتەوە. بەتەواوی دەستبەردارنەبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە لە ئایین (بە سیفەتی نەریتی کۆن) هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، شانبەشانی

قورساییە مەزنەکەی ئایین بەسەر کۆمەڵگاوە، بونیادەکەی بۆ بەکارهێنان و میللیگەراییکردن زۆر لەبارە. هەندێك جار خودی ئایین رۆڵی میللیگەرایی دەبینێت. ئەو شیعەگەراییەی لە ئێران لەسەر شانۆیە، لە رۆژی ئەمڕۆمان بەهێزترین چەکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێرانە. شیعەگەرایی نموونەی میللیگەرایی پێشخراوترین ئایینە. نموونە هاوشێوەکانی زۆرن. ئەگەر سنوورداریش بێت لە تورکیا سوننیگەرایی رۆڵی ئایدیۆلۆژیایەکی ئایینی دەبینێت کە لە میللیگەرایی زۆر نزیکەو بە ئاسانی دەخزێت.

دەوڵەت ـ نەتەوە کە ئەرکی جێبەجێکردنی چەوسانەوەی پاوانی چوار چینی یەکگرتوو (پاوانی بازرگانی، پیشەسازی، فینانس و دەسەڵات) دەگرێتە ئەستۆی خۆی، بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی تەنیا بە بەکارهێنانی فاشیزمەوە ناوەستێت کە سەرشێتانەترین شێوەی توندو تیژییە. بەلانی کەم بە ئەندازەی توندوتیژی سیستەماتیکی فاشیزم، بەکارهێنانی هەژموونگەرایی هەر چوار ئایدیۆلۆژییە پێکەوە لکێنراوەکە وەك مەرج دەبینێت. چونکە بەبێ هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی رژێمی فاشیست بەردەوام نابێت.

تازەگەری دیموکراتی لەمیانەی ئەو پەیرەوانەی بۆ فرەلایەنی، گریمانەیی و ئەڵتەرناتیفەکان کراوەن و کۆمەڵگای دیموکراتی دێننە ئاراوە، وەڵامی کۆمەڵگای مێگەل و جەماوەر و، مرۆڤی چوونییەك(هۆمۆژەن) دەداتەوە کە دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرن لەرێگای ئەو هێڵەی خوازیارێتی و لە میانەی پەیرەوی گەردوونی، بەرەو پێشچوونی راستەهێڵی و رەهاخواز (چەمکی ئەو پەیرەوەی بەرامبەر ئەگەر و ئەڵتەرناتیفەکان داخراون) نەخشیان کردووە و هەوڵی بەدیهێنانی دەدات. ئەڵتەرناتیفی خۆی لەرێگای بونیادێکی ئابوورییەوە پێشدەخات کە بۆ قەوارەی سیاسی هەمەجۆر کراوەیە، فرەکلتوورییە، بەرامبەر پاوانخوازی داخراوە، وەڵامی پێویستییە سەرەکییەکانی ئیکۆلۆژی، فێمێنیستی و کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان دەداتەوە و پشت بە رەفتاری جڤات دەبەستێت. ئەڵتەرناتیفی سیاسی تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر بە دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کۆنفیدرالیزمی دیموکراتییە.

**کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیك:**

أ ـ بۆ هەموو قەوارە سیاسییە جیاواز و یەکجار ئاڵۆزەکان کراوەیە. بەهۆی بونیادە ئاڵۆزەکەی ئێستای کۆمەڵگا، قەوارە سیاسییە هێشوویی و ستوونییە جیاوازەکان ناچارین. پێکهاتە و قەوارە سیاسییە ناوەندی، هەرێمی و خۆجێییەکان بە یەکەوە لەناو هاوسەنگیدا رایاندەگرێت. لەبەر ئەوەی هەر یەکەیان وەڵامی هەلومەرجێکی بەرجەستەو کۆنکرێتی دەدەنەوە،

بونیادی سیاسی فره لایەن لە دۆزینەوەی رێگە راستەکانی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا نزیکترە. هەروەها خۆگوزارشتکردنی ناسنامە کلتووری، ئەتنیکی و نەتەوەییەکان لەمیانەی پێکهاتە و قەوارە سیاسییەکانەوە سروشتیترین مافی خۆیانە. راستتر، پێویستی و مەرجی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. بۆ رێککەوتنی بە بنەما لەگەڵ ئەریتەکانی دەوڵەت کراوەیە ئینجا ئەمە دەوڵەت – نەتەوە، کۆمار یان شێوەکانی دیموکراسی بۆرژوازی بێت. لەسەر بنەمای ئاشتییەکی بە پرەنسیپانە دەتوانێت بە یەکەوە لەگەڵیدا بژی.

ب ـ پشت بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەبەستێت. هەوڵەکانی پرۆژەی کۆمەڵگای قالبگەرایی لە شێوەی ئەندازیارێتی کۆمەڵگای سەرمایەداری، سۆسیالیستی، دەرەبەگایەتی، پیشەسازی و بەکاربەر لە چوارچێوەی پاوانەکانی سەرمایەداریدا دەبینێت. لەناوەرۆکدا ئەمجۆرە کۆمەڵگایە بوونی نییە، پروپاگەندەکەی هەیە. لە بنەرەتدا کۆمەڵگاکان سیاسی و ئەخلاقین. پاوانە ئابووری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی و سەربازییەکە ئەم سروشتە بنەرەتییەی کۆمەڵگا دەکرێنن، تەنانەت ئامێرێکن کە بەدوای زێدە بەها و باجی کۆمەڵگاوەن. سەربەخۆ بەتەنیا هیچ بەهاو نرخێکیان نییە. تەنانەت شۆڕشیش ناتوانێت کۆمەڵگای نوێ بئافرێنێت. بەو سیفەتەی ئۆپەراسیۆنێکە لە پێناو گەڕاندنەوەی رۆڵی راستەقینەی شانەی ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا ـ کە دووچاری بێ بەهایی و سووان هاتووە ـ پەنای دەبرێتە بەر، دەتوانێت رۆڵێکی ئەرێنی ببینێت. ئەوەی تریش لەلایەن ئیرادەی ئازادی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە دەستنیشان دەکرێت.

ج ـ پشت بە سیاسەتی دیموکراتییانە دەبەستێت. بەرامبەر بە چەمکی حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی ناوەندێتی رەها و راستەهێڵی دەوڵەت ـ نەتەوە، لە رێگای ئەو قەوارە سیاسییانەی سەرجەم گروپە کۆمەڵایەتی و ناسنامە کلتوورییەکان خۆیان تێدا گوزارشت دەکەن، بەڕێوەبەرایەتی خودی کۆمەڵگا ئاوا دەکات. نەك لە میانەی دامەزراندنی ئاستە جیاوازەکان، بەڵکو لەرێگای بەڕێوەبەرە هەڵبژێردراوەکانەوە کارەکانی رادەپەڕێنێت. ئەوەی گرنگ و سەرەکییە توانای وەرگرتنی بڕیارە لەرێگای گفتوگۆ و ئەنجومەنەکانەوە. ئەو بەڕێوەبەرایەتییانە بێکەڵکن کە لەخۆیانەوە فەرمان دەدەن. چاودێری و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتییانە سەبارەت بەکارەکانی کۆمەڵگا لەڕێگای دەستەی ئەو جڤاتانەوە دەکرێت کە بە گوێرەی بونیادی هەر کلتوور و گروپێکە، لەناو فرە بونیادی و هەمەڕەنگییەکان بەدوای یەکێتیدا دەگەڕێت، لە جڤاتی کۆردیناسیۆنی ناوەندی گشتی ( ئەنجومەن ـ کۆمیسیۆن ـ کۆنگرە) تا دەگاتە جڤاتە هەرێمییەکان.

د ـ پشت بە بەرگری گەوهەری دەبەستێت. نەك بە سیفەت و شێوەی پاوانی سەربازی، بەڵکو یەکینەکانی بەرگری (ڕەوا) گەوهەری بە گوێرەی پێداویستی ئاساییشی ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا لەژێر کۆنترۆڵی توندی ئۆرگانە دیموکراتییەکاندا هێزی بنەڕەتییە. بەو سیفەتەی بونیادی بڕیاری ئازادی پشتبەستوو بە یەکسانییە و لەسەر بنەمای هەمەڕەنگی و جیاوازییەکان ئاولکراوە ئەرکی کاراکردنی ئیرادەی سیاسەتی دیموکراتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. هەروەها دەستێوەردانی هێزە دەرەکی و ناوخۆییەکانیش بێ کاریگەر دەکات کە بە ئامانجی مایەپووچکردن و بەربەستکردنی ئەم ئیرادەیە ئەنجامی دەدەن. بونیاد و پێکهاتەی فەرماندارێتی یەکینەکان لەژێر چاودێری جووتەی ئۆرگانەکانی سیاسەتی دیموکراتی و ئەندامانی یەکینەدایە، کاتێك پێویست ببینرێت لەڕێگای پێشنیار و ئەرێکردنی دوولایەنە بە ئاسانی دەگۆڕدرێت.

هـ ـ بەگشتی هەژموونگەرایی، بەتایبەتیش هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی جێگایان نابێتەوە. پرەنسیپی هەژموونگەرایی لە شارستانییە کلاسیکییەکان کارایەو پەسەند دەکرێت. بەڵام لە تازەگەری و شارستانێتی دیموکراتیدا بەسنگفراوانی و لێبووردەیی تەماشای ئایدیۆلۆژیا و هێزە هەژموونگەراییەکان ناکرێت. کاتێك سنوورەکانی دەربڕینی ڕای جیاواز و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی ببەزێنێت، لەڕێگای بەڕێوەبەرایەتی خۆیەتی و ئازادی رادەربڕینەوە بێ کاریگەر دەکرێت. لە بەڕێوەبەرایەتی هاوبەشی کاروبارەکانی کۆمەڵگا لە یەکتری تێگەیشتن، ڕێزگرتن بەرامبەر بە پێشنیارە جیاوازەکان و وابەستەبوون بە بنەماکانی بڕیاری دیموکراتییانە مەرجە. سەرباری ئەوەی لەم بارەیەوە چەمکی بەڕێوەبەرایەتی شارستانی کلاسیکی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەگەڵ چەمکی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوە بە یەك دەگەن، بەڵام جیاوازی و پێچەوانەبوونێکی مەزنیان لەگەڵ چەمکی بەڕێوەبەرایەتی تازەگەری و شارستانێتی دیموکراتیدا هەیە. شێوازی حوکمڕانی بیرۆکراتی هەرەمەکی و شێوازی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی ئەخلاقییانە بنەمای ئەم جیاوازی و پێچەوانە بوونانە پێکدێنن.

هەرگیز هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی جێگای باس نابێت. هەروەها فرەڕەنگی بۆچوونی جیاواز لەنێوان ئایدیۆلۆژییەکانیش لەجێگای خۆیدایە. بەڕێوەبەرایەتی پێویستی بەوە نییە لەڕێگای پەردە و قەڵغانی ئایدیۆلۆژییەوە خۆی بەهێز بکات. لەم سۆنگەیەوە هەر وەك چۆن پێویستی بە ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی، ئایینی، زانستگەرایی پۆزێتیفیست و ڕەگەزگەرایی نابینێت، دژی ئاواکردنی هەژموونگەراییشە. هەر بۆچوون، هزر و باوەڕییەك بونیادی ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا

تێك نەدات و بەدوای بەدەستهێنانی هەژموونگەراییەوە نەبێت خاوەنی مافی رادەربڕین و گوزارشتی ئازادانەیە.

و - بەرامبەر بە چەمکی یەکێتی نەتەوە یەکگرتووەکان UN ی دەوڵەت - نەتەوەکان کە لەژێر کۆنترۆڵی هێزی هەژموونگەرایی سوپەردایە، لایەنگری یەکێتی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی جیهانی کۆمەڵگا نەتەوەیی - نیشتیمانییەکانە. لەمیانەی پێوانەکانی سیاسەتی دیموکراتییەوە بە یەکگەیاندنی جڤاتێکی بەرفراوانتر لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتییانەی جیهاندا بۆ دونیایەکی ئارامتر، ئاشتیخواز، ئیکۆلۆژی، دادپەروەر و بە پیت مەرجە.

ئەنجام" جیاوازی نێوان مۆدێرنیتەی دیموکراتی و سەرمایەداری کە دەتوانین بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوانتر بەراوردیان بکەین، دژێتییەکەیان تەنیا بانگەشەیەك نییە، بەڵکو دوو جیهانی زەبەلاح و کۆنکرێتین. ئەم دوو جیهانە بە درێژایی مێژوو لە رەوشی دژێتی دیالیکتیکیدا هەندێك جار بێ ئامانانە لەناو شەڕدا بوون، ئاشتی نێوانیشیان کەم نەبووەو تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتوون، لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەرێگای پەیوەندی و ناکۆکییەکانیانەوە، هەندێك جار شەڕ دەکەن، جارانێکیش ئاشت دەبنەوە. بێگومان ئەوەی لەم قەیرانە بونیادییەی سیستەمدا بە سیفەتی رۆشنبیری، سیاسی و ئەخلاقی قەڵەمبازێکی راست، چاك و جوان فەراهەم بکات ئەنجام دەستنیشان دەکات.

د - ئایدیۆلۆژیای یەهودی، سەرمایەداری و مۆدێرنیتە.

ئەگەر چیرۆکی عیبرانییەکان لە مێژوو و رۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی راست دەرکی پێنەکرێت، باسێکی تەواوی پەرەسەندنی کۆمەڵگای مێژوویی زەحمەتە. لەمێژوودا عیبرانییەکان، لە رۆژی ئەمڕۆشماندا یەهودییەکان هەڵسەنگاندنیان وەك جڤاتێکی ئەتنیکی یاخود نەتەوەیەك کەموکوڕی گەورە لەخۆوە دەگرێت. بەڵکو هەڵسەنگاندنی وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی کلتوورێك کە بەڕیشە هی رۆژهەڵاتی ناوینە، بەڵام بە پلە یەك سەرجەم جیهان پەیوەندیدار دەکات و کاریگەرییان لەسەر دەکات، بایەخدار و گرنگە. بەواتا سنووردارەکەی باسی کلتوور ناکەم، بە سیفەتی کۆی کلتووری ماددی و مەعنەوی تاووتوێی دەکەم. دەرهەق بە بابەتەکە پێویستە خۆپارێزی لە دوو هەڵە بکرێت: یەکەمیان" ئەو چەمکەیە کە زێدەڕۆییانە یەهودێتی وەك هێزی بەڕێوەبەری جیهان گەورە و شکۆدار دەکات. گوتەی "نەتەوە (ئوممەت)ی هەڵبژێردراوی

خوداوەند" دەکەوێتە ئەم چوارچێوەیەوە. چەندە خۆپارێزی لەمجۆرە زێدەڕۆییانە بکرێت کە بۆ قۆستنەوە زۆر لەبارە، ئەوا بەو ئەندازەیە تێگەیشتنێکی واقیعییانە سەبارەت بابەتەکە ئاسان دەبێت. دووەمیان" ئەو چەمکەیە کە یەهودییەکان بەشەیتان لەقەڵەم دەدات، دەیانکات بە قۆچی قوربانی. بینین و لەقەڵەمدانی یەهودییەت بە سەرچاوەی گشت خراپییەکان بۆچوونێکە زۆر بەکارهێنراوە. ئەم هەڵوێستە کە بەلانی کەم هێندەی زێدەڕۆیی یەکەم بەرەو تێگەیشتنی هەڵەت دەبات، دوورکەوتنەوە لە کاریگەرییەکانی، بابەتەکە زیاتر و باشتر روون دەکاتەوە و دەبێتە مایەی تێگەیشتن.

لەبەرگەکانی دیکە لە روانگەی جیاوازەوە هەوڵمداوە لە چوارچێوەی ئایینە ئیبراهیمییەکان تیشک بخەمە سەر عیبرانییەکان. ئێستاکەش لەلایەنی دیکەوە هەوڵی پتەوکردنی بۆچوونەکەم دەدەم. لە راستیدا گرێدراو بە سەرمایەداری و مۆدێرنیتەوە یەهودییەت و کێشەی یەهودی تاوتوێ دەکرێت.

پەرتەوازەبوون (بڵاوبوونەودیان بۆ هەر چوار لای جیهان)ی یەهوودییەکان کە دوای دووەمین جار رووخاندنی پەرستگا (٧٠ ی زاین) لەلایەن ئیمپراتۆرییەتی رۆماوە دەستی پێکرد، لە رۆژهەڵاتی ناوین و ئەورووپا، تەنانەت لە تەواوی جیهان تا دەگاتە رۆژگاری ئەمڕۆشمان رێگای لە پێش ئەنجام و کێشەی گەورە کردۆتەوە. گەرچی پێشتریش کێشە و ئەنجامی هاوشێوەی لێکەوتۆتەوە. بۆ نموونە کۆچی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفاوە بۆ ناوچە نزیکەکانی قودس، لەبواری ئەو کێشە و ئەنجامانەی رێگەی لەپێش کردۆتەوە، لەسەرتاسەری دونیا گەورەبووە و کاریگەرییەکەی تا رۆژی ئەمڕۆشمان بەردەوامە. چیرۆکی کوڕەکانی لە میسر، رووداوی یوسف و کۆچی موسا بوویەرێکن کاریگەرییان لەسەر تەواوی دونیا هەبووە. هەروەها کۆکردنەوەی پەرتووکی پیرۆز، ئاواکردنی یەکەمین پاشایەتی عیبرانی، دوورخستنەوەیان بۆ بابل و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ پارس و گریکەکان کە لەو قۆناخەدا دەستی پێکرد، ئەنجامی گرنگیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە. لەمێژووی شارستانیدا کاریگەرییەکەیان جێگایەکی تایبەتی هەیە. کۆکردنەوەی پەرتووکی پیرۆز خۆی لە خۆیدا رووداوێکی مەزنە. جۆرێک لەجۆرەکانی بەدەستهێنانی فەرمیەتی ئایینە ئیبراهیمییەکانە. بوون بە خاوەن کتێب، بوویەرێکە کاریگەرییە مێژوویییەکەی زۆر گەورەیە.

بەلام پەرتەوازەبوونەکەی دوای ٧٠ ی زایینی کاریگەریەکەی ریشەدارتر بوو. لێرە مێژوو نانووسمەوە، هەر بۆیە بە شیکاری کورت سنووردار دەبم. بۆچوونێکی هاوبەش و پەسەند کراوە

کـە پەرتەوازەبوونەکـەیان بـۆ دوو بەشـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا (سـەفارید[٤] و ئەشـکیناز[٥]) جیادەکرێتـەوە. گرێـدراو بـەم دۆخـە کاریگەرییەکەشـیان جیـاوازبووە. هـەروەکو زانـراوە یەهوودییـەکانی ڕۆژهـەڵات لـە سـەرووبانەوە بـۆ سـوریا، ئێـراق و ئێرانـی ڕۆژگـاری ئـەمڕۆمان، کەنارەکانی قەزوین، روسیاو دواتریش بەرەو ئاسیای ناوەوە بڵاو بوونەتـەوە، هـەروەها بەشێوەی کۆلۆنی گرنگ ژیاون. بەرەو ڕۆژئاواش بەردەوام کۆچکردنیان بـۆ کۆلۆنیـەکانیان و ناوچـەکانی ژێـر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما پێشکەوتووە. لە باکووری ئەفریقیایەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، لە دورگـەی ئیبریکـەوە تـا دەگاتـە بـەلقان کـۆچ و کۆلۆنییـەکان بەرچاودەکەوێت. هەرچـی ئەنادۆڵـە دیمەنی ئەو ناوەندە دەدات کە جیاوازی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای تێدا ڕوودات. تا سەردەمی ڕووخـانی ڕۆما لە بواری ئایینیەوە کاریگەرییەکەیان بایەخداربوو. هیچ گومانێکی تێدا نییە هـەم بـە سیفەتی موسـەوێتی، هـەم کرسـتیانی کـە زادەی موسـەوییەتە کاریگەرییـەکی نەپێشـینەیی و سـەرەکییان هەبووە. بەجۆرێك لە جۆرەکان ئیمپراتۆرییەتی مەعنەوی قۆناخی خۆیان دامەزراندووە.

بێگومـان دەرککـردن بـە چـۆنیەتی ئاشـنابوون و پەیوەنـدی یەهودییـەکان بـە دراو (پـارە)، هەروەها چۆن هێندەی کاریگەری مەعنەوی پارەشیان کرد بە هێزێکی ماددی بە کاریگەر، هەڵبەتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانە. ئەگەر یەکەمین بابەتی بەشێوەیەکی ستراتیژی کاریـان لەسـەر کـردووە زانسـت، ئـەدەبیات و ئـایین بێـت کـە قورسـایی کلتـووری مەعنـەوییان هەیـە، مسـۆگەرە دووەمین بابەتی ستراتیژی کار و قازانج پارەیە. لەبەر ئەوەی لەمێژوودا کلتووری مەعنـەوییان کـرد بە یەکەمین، کلتـووری ماددیشـیان کـرد بـە دووەمـین بابـەتی سـتراتیژی، زۆرگرنگـە. ئـەوەی لـەو سەردەمەوە پێشەنگایەتی ئەم دوو بابەتەی بەدەستەوەیە، واتا گرنگییەکی ستراتیژی لـە مێـژووی جیهان بەدەستهێناوە. لەو بڕوایەدام کە هەر لەو سەردەمەدا یەهودییەکان لە قووڵاییـەوە ئاگـاداری ڕۆڵی پێشەنگایەتی ستراتیژی هـەر دوو بابـەت بـوون و لـەم پێناوەشـدا کاریـان کـردووە. هۆکـاری

---

[٤] سەفاردیم یان سەفارد(Sephadim): یەهودییە ڕۆژهەلاتیەکان، بنەچەیان بۆ ئەو یەهودیانە دەگەڕێتەوە کە لە سەدەکانی پازدەهەم و شازدەهەم لە ئیسپانیا و پورتوگال دوورخرانەوە، لە حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست و بەلقان و هەندێك ناوچەی دیکە گیرسانەوە، بە تایبەتیش لە سەلانیك ئەستانە، ئەزمیر، ئەدرنە، قاهیرە و ئێران.

[٥] ئەشکینازیم یان ئەشکیناز(Ashkenazim): یەهودییەکانی ڕۆژئاوان. کۆن بەوە ناسرابوون کە زمانی یەدیشی بەکاردێنن، کە لە شێوە زارێکی کۆنی ئەڵمانی پێکهاتبوو و کاریگەری زمانی عیبری و زمانە سلافیەکانی لەسەر هەبوو. ئەشکینازەکان زۆربەی زۆری یەهودییە هاوچەرخەکان پێکدێنن. بە پێی لێتوێژینەوەکان دەستنیشان کراوە کە هەموویان سامی نین و بنەچەیان بۆ ڕۆژهەلاتی ناوین ناگەڕێتەوە، بەڵکو بە نەژاد تورکی ـ مەغۆلین. لە شارە ئەورووپیەکانی وەك لاهای، ڕۆتردام، هارلم، بە تایبەتیش لە ئەمستردام نیشتەجێبوون.

سەرەکی ئەمەش ئەو هەلومەرجە بەرجەستە و کۆنکرێتییە بوو کە تێیدا دەژیان. کەمی ژمارەیان، ژیانی بەردەوامییان لەناو مەنگەنەی هەردوو شارستانییەتی رۆژئاوا و رۆژهەڵات، هەروەها خۆناساندنیان وەك "بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوداوەند"(رووبەڕووی هەژموونگەرایییەکی تیژی ئایدیۆلۆژین)، ناچاریان دەکات بەردەوام بەدوای لێکەڕینی ستراتیژییدا بن. واتە کەمی ژمارە، کۆچبەری، باوەڕییە پیرۆزەکانیان و هەبوونی هەڕەشە بەردەوامەکانی جینۆساید بەسەریانەوە، ناچاری کردوون هەم خۆیان زۆر وریا (وشیار) بکەنەوە، هەم بەردەوام ئایدیۆلۆژیای رزگاری پەرە پێبدەن (چەندە بە ستراتیژییەتی رزگاری شۆڕشگێڕی دەچێت!). شێوازی ژیانیان پێشخستنی هێزی ستراتیژی و ئامرازەکانی رزگارییان بەسەردا دەسەپێنێت. چونکە لەدۆخێکی پێچەوانەدا، هەروەك هەزاران هۆز و تیرەی دیکە ئەوانیش لەناو دەچوون.

لە خاڵێکی بەمجۆرەدا" دۆخی بەرخودانی بەردەوام دەبێتە تاکە رێگای رزگاری. هەرچی بەرخودانە مسۆگەر پێویستی بە دوو شت هەیە: باوەڕی و ئامرازە مادییەکان. لەکاتێکدا باوەڕی بە سیفەتی ستراتیژی مەعنەوی رەنگدەداتەوە، هەرچی پارەیە وەك ستراتیژی ماددی رەنگدەداتەوە. لەم سۆنگەیەوە" رۆڵی ستراتیژی پارە بە سیفەتی فاکتەری ماددی، و رۆڵی ستراتیژی ئایین بە سیفەتی فاکتەری مەعنەوی، کە لە یەهوودییەتدا گرنگی و بایەخێکی زۆریان هەیە، لە ئامانجی رزگاریدا دەبنە دوو سەرچاوەی یەککگرتووی ژیانی و دەست لێبەرنەدراو. کاتێك لای یەهودییەکان لە وەڵامی پرسیاری مانای باڵادەستی پارە و ئایین دەگەڕێین، وەڵامەکە ئاشکرایە: رێگە چارە و بژارێکی دیکەیان نییە. چونکە شێوازی ژیانیان بەردەوام پێویستی بە بەرخودان هەیە. بۆ لەسەر پێ مانەوە و ژیانێکی بە کوالیتی (جۆری) مەرجە(چونکە لەو بڕوایەدان کە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوداوەندن). هەرچی بەرخودانە، ئەگەر ستراتیژی رزگاری (پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی) و تواناکانی ستراتیژی ماددی (پارە، پێشەنگایەتی ماددی) نەبێت، هونەرێکە درێژەپێدانی ئاستەمە. لەم پێناوەشدا پێویستە لە بیابان (وەك عەرەبەکان) یان لە شاخ (وەك کوردەکان) بێت. بەڵام هەردووکیشیان لای یەهوودییەکان نییە. تەنیا دەرفەت و توانا ماددی و ئایدیۆلۆژییەکان دەمێنێتەوە.

سەرباری بەردەوامی گفتوگۆکان لەبارەیەوە، بەڵام رۆڵی کریستیانی لەناوخۆ لە رووخانی رۆما مسۆگەرە. ئەگەر ریشەی یەهودی حەزرەتی عیسا رەچاو بکرێت، ئەو کاتە رۆڵی لقی یەهودی لە رووخانی رۆما - ئەگەر بە تەواویش نەبێت - گفتوگۆ هەڵناگرێت: بەم جۆرە تۆڵەی دوو پەرستگا(مەعبەد واتا پەرستگا، بەجۆرێك لەجۆرەکان واتای قودسی پایتەختی یەهودییەکان

دەبەخشێت) رووخێنراوەکە دەکاتەوە. هەڵبەتە لە کەللەدان (سەربڕین)ی ساینت پاول لە رۆما بێ وەڵام نەدەمایەوە ( ساینت پاول: لە تەرسوس لەدایکبووە. لە کریستیانییە یەکەمینەکانە. پێشەنگی رێکخەرانی رێسای کریستیانییە). هەروەها لەخاچدانی هەزاران کرستیانی، کردنیان بە خۆراکی شێر و لەناوبردنیان وەك بەشێکی بەرخودانەکەیان بوو. واتە یەکەمین هەڵمەتی سەرکەوتووانەی دیاسپۆرا (مەنفا)، لە بەکارهێنانی کرستیانی بە سیفەتی هێزی ستراتیژی مەعنەوی بەدیدەهات. بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە لە ناوەوە داڕووخانی رۆما، بەشێوەیەکی بابەتی ئەنجامی یەکەمین هەڵمەتی سەرکەوتووانەی ستراتیژی مەعنەوی دیاسپۆرای یەهودی بوو. بێگومان پەلاماری هۆزەکانی جێرمەن، هون و فرانکی ئەورووپاش رۆڵێکی بەکاریگەریان لەمەدا هەیە. بەڵام دیسان فاکتەرە ناوخۆییەکان دیاریکەرە.

پێهەڵگرتنی یەهودییەکانی رۆژئاوا دوای رۆما لە زەمینەی ماددیدا لەگەڵ ئاواکردنی شارەکان (یەکەمین شۆڕشی ئەورووپا لەسەدەی دەیەم بەدواوە) و پەرەسەندنی بازاڕ لە دەورووبەریدا بەدیهات. پێشکەوتنی پەیوەندی کالآ - پارە - بازرگانی، هێزی دووەمین هەڵمەتی ستراتیژی بە یەهودییەکان بەخشی، واتە رۆڵی ستراتیژی بە پارە دەبەخشرێت. باڵادەستی پارە بە واتای نیوە بە نیوەی دەسەڵاتی شار دێت، لەم سۆنگەیەوە" بە واتای رۆڵ بینین دێت لە حوکمڕانی (بەڕێوەبەرایەتی) ئەو دەوڵەتانەی تازە گەشە دەکەن و لەهەڵکشاندان. هەروەها لەسەدەی دەیەم بەدواوە فەتحی مەعنەوی ئەورووپا (بەکرستیانکردنی) تەواوبووە. ئەم فەتحە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەلایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر یەهودییەکان. لایەنی ئەرێنی، ئایینێکی ئیبراهیمی ئەورووپای فەتحکردووە. هەرچی لایەنی نەرێنییەتی، چەندەی دەچێت ئایینی موسەوی - بە سیفەتی ئایینی هۆزێکی بەرتەسك - تەنگەتاو دەکات. ئەورووپای سیکۆلار و هۆزەکان، کاریگەری هێزی مەعنەوی موسەوێتی و هێزی پارەی یەهودی بەسەرچاوەی زۆربەی ئەو کێشە و قەیرانانە دادەنێت کە تا سەردەمی هیتلەر، تەنانەت تا رۆژی ئەمڕۆمان دووچاری هاتوون.

یەکەمین بڕیاری کۆنسەی کرستیانە کاسۆلیکەکانی[٦] ساڵی ١١٧٩ دەرهەق بە کۆکردنەوەی یەهودییەکان لە گیتۆ(سەربازگە)کان[٧] ئەنجامێکی ئەم کاریگەرییەیە.

لە سەدەی دەیەم بەدولوە بەو سیفەتەی هێزی ستراتیژی ماددی و مەعنەوی ئەورووپا (رووسیاشی لەناودا)یە ئیتر یەهودییەت لە نۆخی گەشەسەندندایە. مسۆگەر یەکێك لە دەوڵەمەند و رۆشنبیری هەر شارێك یەهودییە. هەر بۆیە هەڵبەتە ئەم نۆخە رێگا لەپێش نێرەیی، ناکۆکی و پێکدادانی مەزن دەکاتەوە. یەکەمین گیتۆکان (گەڕەکە داخراوەکان) هەواڵدەری رووداوەکانی دواترە. بەرامبەر بەم رەوشە نوێیانەش یەهودییەت ستراتیژی و تەکتیکی نوێ پەرەپێدەدات: یەکەمیان بزاوتی "هەڵگەڕانەوە[٨]"یە، دووەمیان بزووتنەوەی "سیکولار - عەلمانی"یە. هەردووکیشیان بزاڤێکن ئەنجامی گەورەیان دەبێت. یەهوودییەکان لەرێگای ئەم دوو هەڵمەتە ستراتیژییە نوێیە پێهەڵگرتنێکی سەرکەوتووانە لە چاخی ناوین ئەنجام دەدەن. پێویستە لەبیر نەکەین کە هەڵگەڕانەوە لە ئایینی کۆن، یەکەمین هەڵمەتی ستراتیژییە کە حەزرەتی ئیبراهیم و موسا ئەنجامیانداوە. بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت پێهەڵگرتنەکە بە هەڵمەتی ستراتیژی مەعنەوی ناوببرێت.

رێکخراوی ماسۆنی کە وەستاکانی بیناسازی یەهودی لە چاخی ناوین دایانمەزراند دەشێت وەك یەکەمین بزاوتی سیکولار - عەلمانی بیری لێبکرێتەوە. هەرچی فەیلەسوفی مەزنی بەریشە یەهودی سپینۆزایە لە یەکەمین پەرستگاکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری - ئەمستردام - بوو بە پێشەنگی یەکەمین پێهەڵگرتنی فەلسەفی مەزنی سیکۆلار - عەلمانی. عەلمانییەت یەکێك لەو بابەتە

---

[٦] ئەنجوومەنی کرستیانی کاسۆلیکی: مەبەست سێیەمین ئەنجوومەنی لاترانە (Lateran Konsey) کە لە ساڵی ١١٧٩ بڕیاری کۆکردنەوەی یەهودییەکانی لەگیتۆکاندا. هەروەها بڕیاریاندا کە پەرستیارە کرستیانەکان خزمەتی یەهودییەکان نەکەن، ئەمەش لە چوارچێوەی هەڵمەتێکی دژایەتیکردنی یەهودییەکان دەستیان پێکردبوو، هۆکارەکانیشی ئابووری بوو، بەڵام لە ژێر دەمامکی ئایینیەوە ئەنجامدرا.

[٧] گیتۆکان (Getto): گەڕەکی داخراون لە ناوچە دوورەدەستەکانی شار ئاواکراون. بە زۆرەملێیی یەهودییەکانی تێدا نیشتەجێ کراوە، بۆ ئەوەی تێکەڵ بە خەڵکانی دیکە نەبن. بە تایبەتیش لە سەردەمی هیتلەر بە شێوەیەکی بەربڵاو جێبەجێ کراوە.

[٨] بزاوتی هەڵگەڕانەوە (دۆنمە– Sabatarianism): مەزهەبی یەهودییە هەڵگەڕاوەکانە. ناوەکەی بۆ دامەزرێنەرەکەی دەگەڕێتەوە سەبتای تسفی (١٦٢٦–١٦٧٥)، کە لە ساڵی ١٦٤٨ خۆی بە مەسیح راگەیاند. دادگایی کرا، لە کاتی دادگایی کردن ئیسلامبوونی خۆی راگەیاند، بۆیە سوڵتان محەمەدی چوارەم لێی دەبورێت، بەمجۆرە سەبتای ناوی خۆی کرد بە محەمەد عەزیز ئەفەندی. بە هەڵگەڕاوە ناوبران چونکە لە رووخساردا خۆیان وەك موسڵمان پیشاندەدەن، بەڵام لە ناوەرۆکدا یەهودین. ئەم رەوتە رۆڵێکی بە کاریگەری لە رووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی و ئاواکردنی کۆماردا بینی، لە ناو کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیدا بە کاریگەربوون.

سەرەکیانەیە کە لە وڵاتە بەناو ئیسلامەکان (هەر وەکو چۆن ناولێنانی وڵاتان یاخود کۆمەڵگاکـ بە سەرمایەداری و سۆسیالیستی بە هەوڵێکی پروپاگەندە کردن دەبینم، ئەوا ناوبردنی وڵاتان بە ئیسلامی، کرستیانی وبودیزمی لەناو هەمان چوارچێوەدا دەبینم) لەسەرووشیانەوە تورکیـ. گفتوگۆیەکی چڕی لەبارەوە دەکرێت. لە چوارچێوەی سیکولاریتی (دنیاییبوون) بەو سیفەتەی بە واتای دوورکەوتنەوە لە دۆگما ئاینییەکان و ئازادبوون دێت، عەلمانییەت رۆڵێکی ئەرێنی هەیە. بەڵام کاتێك خودی عەلمانییەت بەواتای رەوت یان مەیلی دەمارگیری عەلمانی (عەلمانییەتگەرایی ـ لاییسیزم) بەکاربهێنرێت، خۆیشی وەك جەمسەرێکی دژ لەوانەیە بە خێرایی ببێت بەقاڵب و دۆگما. ناچارم بە بایەخەوە ئاماژەی پێبکەم، عەلمانیەتێك لەم چوارچێوەیەدا بێت هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئاینگەراییەکانی دیکە نامێنێت. هەڵگەڕانەوەش (گۆڕینی ئاین) کاتێك دژی یەهودییەت بەرەو پێشەوەبچێت، خێرا دەبێت. بەر لەوەی لە قۆناخی دەوڵەت ـ نەتەوەدا درێژە بە باسی رەوشی یەهودییەت بدەم، لەبەر ئەوەی ئەو رووداوانەی لەرۆژهەڵاتی ناوین و رۆژهەڵات روویانداوە زۆر بەکاریگەر وسەرنج راکێشن، ئاماژە پێکردنی پێویستە.

تاسەردەمی ئیسلامییەت، یەهودییەت پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ دەوڵەتی پارس ـ ساسانی هەیە. وەك دەبینرێت کاریگەرییەکی زۆریان لە کۆشکەکاندا هەیە. هەر وەك دەزانرێت یەکەمین پێغەمبەری ژن ـ ئەستەر (ئەستێر[١]) ـ لە کۆشکی ساسانییەکاندا رۆڵێکی مەزنی هەبووە. هەروەها لە پەرتووکی پیرۆزیشدا باسکراوە. شیمانە دەکرێت هەم لە کاروبارەکانی پارە ـ بازرگانی، هەمیش لە پێشکەوتنە ئایدیۆلۆژییەکانی ئیمپراتۆرییەتدا پێگەیەکی بەهێزیان هەیە. رزگارکردنی یەهودییە دوورخراوەکان(٥٩٦ـ٥٤٦پ.ز) لەژێر حوکمڕانی نەبوخزنەسری پادشای بابلی لەلایەن کۆرشی دامەزرێنەری پارسەکان، کاریگەری نەریتێکی بەهێزی ئافراندووە. بە درێژایی مێژوو یەهودییەت لە گۆڕەپانی ئێراندا هێزێك بووە کە ناتوانرێت بچووك بکرێتەوە. هەروەها لە عەرەبستان (نیمچە دوورگەی عەرەب)، باکووری ئەفریقیا و تەنانەت رۆژهەڵاتی ئەفریقیا ـ حەبەشەش بە هەمان شێوە یەهودییەکان بەردەوام پێگەیەکی گرنگیان لە مێژوودا هەبووە. ناتوانرێت کاریگەری یەهەدییەکان لەتەولوی پەرەسەندنەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی بچووك بکرێتەوە.

---

[١] ئەستێر(Ester): رەمز و پارێزەری یەهودیەکانە، پێغەمبەرێکە و لە پەرتووکی پیرۆزیشدا باسکراوە. بە زمانی هیندی بە واتای خانمە بچکۆلانەکە دێت، بە زمانی کوردیش واتای ئەستێرەیە. ئەستێر ناوێکی دیکەی عیبرانیشی هەیە(هەدسە) کە بە واتای رووەکی رێحان دێت.

لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلامدا، لەنیمچە دورگەی عەرەبدا یەهوودییەکان بەسیفەتی گروپێکی ئایینی بازرگانی لەسەرووی گروپەکانی دیکەوە بوون. هەروەها لەزەوییە بە پیتەکانیشدا خاوەن موڵك بوون. وەك دیارە لەسەرووی ئەو گروپە بە بنەچە سامیانەوە بوون کەببوون بە عەرەب. سریانیەکانیش دۆخێکی هاوشێوەیان هەبوو.

بە واتایەك لە واتاکان لەرێگای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە عەرەبەکان لە پای ئەوەبوون لە جیاتی پاوانی یەهودییەکان، پاوانی بازرگانی و دەسەڵاتی خۆیان ئاوابکەن. کارتێکردن و کاریگەری زۆری یەهودییەت بەسەر ئیسلامەوە ئەمە ئەرێ دەکات. دەشێت ئەم رەوشە بە ئاواکردنی دەوڵەت - نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بچووێنرێت. عەرەبەکان لە میانەی ئیسلامیەتەوە وەڵامی مۆدێرنیتەی چاخەکانی ناوین دەدەنەوە. ئەم واقیعە لەژێر ناکۆکییە ماددی و مەعنەوییەکانیان لەگەڵ یەهودییەت و یەهودییەکاندا شاراوەیە. پێویستە ئاماژە بەم لایەنەش بکرێت کە لە سەرهەڵدانی ئیسلامدا بە ئەندازەی رەهەندی ئەتنیکی، رەهەندی چینایەتیش رۆڵێکی گرنگی بینیوە. لە ئاکامی پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە خێراکەی ئیسلام و بەشێوەیەکی دژوارانە سەرکوتکردنی یەکەمین بەرخودانیان، وەك بڵێی یەهودییەکان دووچاری دووەمین کارەساتی رۆما هاتبن. دوو رێگایان لە پێشدا بوو: یان سەرلەنوێ پەرتەوازەبوون و مەنفا، یان "هەڵگەڕانەوە". شیمانە دەکرێت بەشێکیان پەنایان بردۆتە بەر ئێران، باکووری ئەفریقیا و ئەنادۆڵ. چەندین نموونەش پیشانیدەدەن کەبەشێکیان لە رووااڵەتدا ئیسلامییەتیان پەسەندکرد، بەڵام لە ناوەڕۆکدا پەسەندیان نەکرد و تەقیەگەراییان کرد، واتە روویان لەمەیلی هەڵگەڕانەوە کرد. شیمانەیەکی بەهێزە کە هەڵگەڕاوەکان رۆڵیان لەو بزاوتە مەزهەبی و یاخیبوونە زۆرانەدا هەبووە کە دژ بە دەسەڵاتی شۆڤێنی عەرەبە سوننەکان هاتنە ئاراوە. رۆڵی یەهودییەکان لە پەرەسەندنی چەندین رەوتی بەرهەڵستکاری بەڕیشە مێژوویۆتامیایی و ئێران شایانی لێکۆڵینەوەیە.

بەڵام جددیترین پەرەسەندن دەوڵەتی بەبنەچە تورکی خەزەری - یەهوودی بوو کە لە کەنارەکانی باکووری دەریای قەزوین ئاوایان کرد، کە ئەمڕۆ جوگرافیاکەی بە تورکمانستان و بەشێك لە ئازەربایجان ناودەبرێت. دەگێڕنەوە گوایە سەلجوق بەگی یەکەمین[١٠] باپیرەی سەلجوقییەکان پێگەی فەرمانداریێتی لەم دەوڵەتەدا هەبووە. هەروەها بنەچەی یەهودییەتی ناوی

[١٠] سەلجوق بەگی کوڕی دەقاق: دامەزرێنەری ناوکی دەوڵەتی سەلجوقی دەوروبەری ساڵانی ١٠٠٠ زایینی. وەك باس دەکرێت چوار کوڕی هەبووە: میکایل، یونس، موسا و ئەرسەلان. تۆغرل بەگی نەوەکەشی دامەزرێنەرە راستەقینەکەی دەوڵەتی سەلجوقییە، کە وڵاتی فارس و ئێراقی داگیرکرد.

هەر چوار منداڵەکەی ئەم باسە ئەرێ دەکات. کاتێك ئەمە راست بێت، ئەوا هاوشێوەی ئەو بزووتنەوانەی لەرێگای ئێران دژ بە سەڵتەنەتە عەرەبییەکان برەویان پێدا، ناتوانرێت رۆڵی یەهوودییەکان لە بزووتنەوەی سەلجووقیدا بچووك بکرێتەوە. ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگە و پێویستی بە روونکردنەوە هەیە. هەر لە چاخە کۆنەکانەوە ئەنادۆڵ ناوەندێکی جددی یەهوودییەت بووە. یەهودییەکانیش بە ئەندازەی گریکەکان لەئاواکردنی چەندین شاردا جێگایان گرتووە. کێبڕکێ لەنێوانیاندا هەیە. هەڵبەتە ئەو یەهوودیانەی لە رۆژئاوا و عەرەبستان تەنگەتاو کرابوون کۆبوونەوەیان لە ئەنادۆڵ شتێکی باوو نەریتییە. لەمیانەی ئەم رێنومایی و تێڕوانینە مێژووییەدا باشتر دەرکی پێدەکرێت کە بۆچی دوای ئیسرائیل ئەنادۆڵ وەك دووەمین وڵاتی خۆیان دەبینن. هەروەها ئەنادۆڵ لە دۆخی بازاڕێکی بەهێزی پارە - بازرگانی و بزووتنەوە ئایدیۆلۆژییەکاندا بوو، ناتوانرێت رۆڵی یەهودییەکان لەمەشدا بچووك بکرێتەوە.

هەروەکو دەزانرێت لە ساڵانی ١٣٩١ - ١٤٩٢ - ١٥٥٠ یەهوودییەکان لەرێگای ئیسپانیاوە بەشێوەی شەپۆل دوای شەپۆل لە ئەنادۆڵ نیشتەجێبوون. ئەگەر قورساییەکەیان لە سەڵتەنەتی عوسمانییەکان و سەلجوقییەکان رەچاو بکرێت، ئەوا باشتر دەرکی پێدەکرێت کە تا چ رادەیەك رەگی خۆیان داکوتاوە. هەروەها جەماوەرێکی گەورەی موسڵمانە هەڵگەڕاوەکان پێکهاتبوو. لەساڵانی ١٦٥٠ بەدواوە ئیسباتیەکان(Sabbatarianisim بزووتنەوەیەکی بەهێزی هەڵگەڕاوەکانی ئەزمیر - مانیسایە) رۆڵێکی زۆر گرنگیان بینیوە. کاریگەری ئەمانە لەسەر سیاسەتی دارایی و پارەی عوسمانییەکان دەزانرێت. لە رۆڵی ئەو مامۆستایانەدا بوون کە گرنگی پارە و بازرگانییان روون دەکردەوە. سەرباری ئەوەی هەندێ جار دووچاری ململانێی دژوارهاتوون و دەست بەسەر موڵکەکانیاندا گیراوە، بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لە رۆڵەکەیان بکرێت لە بواری دامەزراندن و لە دەسەڵات خستنی چەندین سوڵتاندا.

وەك دیار دەبێت و دەرکی پێدەکرێت هەڵگەڕانەوە بووە بە سێیەمین پێهەڵگرتنی ستراتیژی یەهودییەکان لە پێناو مانەوە و ژیاندا. ئەگەر دیاردەی هەڵگەڕانەوە نەبێت، لەناو زۆرینەی موسڵمانانی رۆژهەڵات و زۆرینەی کرستیانی رۆژئاوا، ناتوانن بەردەوامی بە هەبوون و ژیانی خۆیان بدەن. پێویستە هەڵگەڕانەوە وەك ستراتیژییەکی ژیان دەرکی پێ بکرێت (لەم دۆخەی یەهوودییەکان). هەر وەك لە ئایدیۆلۆژیا هاوشێوەکانیش جێگای باسە، تا دۆگماتیزمی ئایینی دان بە ئازادی مافی رادەربڕیندا نەنێت، مەیلەکانی هەڵگەڕانەوە دەست لێبەرنەدراوە. لەمیانەی ئەم سێ ستراتیژییە گرنگەوە یەهودییەکان لە چاخی ناوین خۆیان لە لەناوچوون رزگارکرد.

پێویستە تەنیا لە روانگەی بەرژەوەندی ماددییەوە سەیری پارە نەكرێت. لە سایەی ئەو هێزەی پێیان دەبەخشێت، دەرفەتی رێكخستن و بەردەوامبوونی ژیانیان دەرەخسێنێت. هەرچی لەسایەی بەدەستهێنانی هێزی ئایدیۆلۆژییە، لەمیانەی پەیرەوە مەعنەوییەكانەوە هەم بەكاریگەر دەبن هەمیش لەسەر پێیان دەمێننەوە و بەردەوامی بە ژیان دەدەن. زۆری ژمارەی رۆشنبیر، نووسەر، بیرمەند، ئایدیۆلۆگ و زانا گەورەكانی یەهودی لە نزیكەوە پەیوەندی بە پێگەی رێبەرایەتی مەعنەوییەوە هەیە كە پێویستییەكی زۆریان پێیەتی. هەروەها پێشخستنی چەندین بزووتنەوەی ئایینی، فەلسەفی و زانستی لە پێویستییە ژیانییەكانی ستراتیژییەتی ژیانیانە.

هەرچی ستراتیژییەتی هەڵگەڕانەوەیە لەسەردەمی دەوڵەت ـ نەتەوەدا گرنگییە مەزن و سەرەكییەكەی دەردەكەوێت. بەو سیفەتەی یەكەمین دەوڵەت ـ نەتەوەیە ئینگلتەرا لە دەركردن بە بابەتەكە رۆڵی كلیل دەبینێت. پادشاكانی ئیسپانیا و فەرەنسا، ئەو دوو هێزە زەبەلاحەی كەوا دوورخستنەوە(نەفی) و كۆمەڵكوژییان دەرهەق بە كرستیانییە پرۆتستانتە بەریشە كاسۆلیكەكان و بەرامبەر یەهودییەكان پەیرەو دەكەن، لەسەدەی شازدەهەم هەوڵێكی یەكجار زۆریانداوە ـ هەڵگیرسانی شەڕیشی لەناودا ـ تا كاریگەرییەكان و قەڵەمبازی ئینگلتەرا لەئەورووپا بەربەست و مایەپووچ بكەن. شانبەشانی ئەوەی یەهودییەكان لەم سەدەیە (سەدەی شازدەهەم) لەنێوان ئەزمیر ـ ئەنادۆڵ، ئەمستردام ـ هۆڵەند و لەندەن ـ ئینگلتەرا كە تێیدا زیاتر هەستیان بە دڵنیایی و ئاسایش دەكرد پەیوەندییەكی توند و بەردەوامیان لەنێواندا هەبوو (كاركردن لەپێناو رێككەوتنی هەرسێ هێز لە ئارادایە)، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو لەندەنیان وەك پێگەی ناوەندی هەڵدەبژارد. لەو رۆژە بەدواوە لەندەن درێژەی بەم پێگەیەی خۆی داوە.

وەك دەزانرێت لەو سەدەیەدا هەنگاو بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەی ئینگلیزی هاوێشترا. وەك دەزانرێت دەوڵەت ـ نەتەوە تەنیا كادیرانی دەوڵەت ناگرێتەوە، بەو واتایە دێت كە سەرجەم كۆمەڵگا بە ئەندامی دەوڵەت یان هاووڵاتی دەوڵەت دادەنرێت، تەواوی هاووڵاتی و كادیرانی دەوڵەت (وەك هەمان ئایین) خاوەن یەك چوارچێوەی ئایدیۆلۆژین. خودی ئەم خەسڵەتە هەمان ئەو كارەكتەرەیە كە هۆزی عیبرانی لەسەرەتادا بەشێوەی قەوم لەخۆیەوە دەگرت، دواتریش بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە هەڵكشا. هۆزی عیبرانی، قەومەكەی و دواتریش نەتەوەكەی، لە بواری ئایینی و ئەتنیكی یەكپارچەیە. راستتر، مەیلی ئەتنیكگەرایی لە هەمانكاتدا مەیلی ئایینگەراییە، مەیلی ئایینگەراییش مەیلی ئەتنیكییە. هەروەها بەبێ زەچاوكردنی جیاوازی نێوان بەڕێوەبەر و بەڕێوەبراوەكان، لە ئامانجی هاوبەشدا یەكدەگرن. روون و ئاشكرایە دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوە بەو

سیفەتەی داتاشینێکی پێشخراوی ئایدیۆلۆژیای هۆزی عیبرانییە، ئەو شێوە گۆڕاوەیەتی کە بەگوێرەی هەر قەوم و نەتەوەیەك گونجێنراوە و بەسەر هەموویاندا سەپێنراوە (ئەمە شرۆڤەی شەخسی خۆمە و زۆر گرنگی دەبینم).

ڕێکخستنی دەوڵەتی مۆدێرنی سەرمایەداری بە شێوازی عیبرانی و یەهوودی (ئەمڕۆ ئیسرائیلییەکان) بەسیفەتی دەوڵەت - نەتەوە خۆی پیشان دەدات. لەوەش گرنگتر، ناوکی هەر دەوڵەت - نەتەوەیەك نەك لەبواری نەژادی، بەڵام بە واتا ئایدیۆلۆژییەکەی کارەکتەرێکی زایۆنیزم (دەوڵەتگەرایی - نەتەوەی یەهوودی)ی یەهوودی هەیە. مۆدێلی دەوڵەت - نەتەوە فۆرمی ئەو دەوڵەتەی یەهودییە کە لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا شێوەی گرتووە. کاتێك ڤێرنەر سۆمبارت[11] سەرمایەداری بە بەرهەمێکی یەهوودییەت دادەنێت، زێدەڕۆیی کردووە. هەرچی گەورە فەیلەسووفی مێژوویی ئینگلیز کۆلینوود ( ئەگەر بەهەڵەدا نەچوویم) کاتێك میللیگەرایی دەوڵەت - نەتەوە پێناسە دەکات، دەڵێت "گەردوونگەرایی (دەتوانین بڵێین ئایدیۆلۆژیای) ڕەهای یەهودی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، بەڵام لە سایەی ئەو جینۆسایدە بەدەستیان هێنا کە دووچاری هاتن" لەو بڕوایەدام و پستوویەتی ئاماژە بەم ڕاستییە بکات. واتە دەوڵەت ـ نەتەوە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. ئایدیۆلۆژیای یەهوودی (هۆزگەراییەکەی، میللیگەرایی و زایۆنیزمەکەی) لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. بەڵام لە ئاکامدا کۆمەڵکوژییەکەی (بکوژەکەی) لەگەڵ خۆیدا ئافراندووە. لە ڕاستیدا ئەم دەستنیشانکردنە گرنگە، خەسڵەتێکی گشتی ڕوون دەکاتەوە: هەر میللیگەرایيەك زایۆنیزمە. لە تۆخێکی بەمجۆرەدا میللیگەرایی عەرەبیش زایۆنیزمیە. ئەگەر سەرجەم میللیگەراییەکانی فەلەستین، تورك، کورد، شیعی - ئێران وەك ئەو شێوە و فۆرمە پێناسە بکەین کە سەرەتا لەلایەن پاوانە نەتەوەییەکانی ئایدیۆلۆژی یەهودی پراکتیزە کراوە هەڵە نییە. بێگومان کاتێك لێکۆڵینەوە سەبارەت بە دەوڵەت - نەتەوەی هۆڵەندا و ئینگلیز بکرێت دەبینرێت کە نەك تەنیا لە بواری تێوری بەڵکو بەشێوەیەکی بەرجەستە و کۆنکرێتی پاوانەکانی یەهودی بەسیفەتی پارە - سەرمایە ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە.

---

[11] وێرنەر سۆمبارت (Werner Sombart): ئابووریزان و سۆسیۆلۆگێکی ئەڵمانییە، لە بەناوبانگترین کۆمەڵناسەکانی چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمە (١٨٦٣-١٩٤١). داکۆکی لەسەر ئەوە کردووە کە ئابووری قۆناغێکی مێژووییە، بۆیە ناشێت بە بێ ئابووری گەردوونی جێگای باس بێت. لە گرنگترین بەرهەمەکانی: ئەشق و خۆشگوزەرانی و سەرمایەداری، ڕوانگەی جیهانی بۆ زانست و ئابووری، سەرمایەداری و یەهود. سومبارت بەرگری لە زانستێکی ئابووری دەکات کەبنەما مێژوویی - کۆمەڵایەتییەکان کۆڵەکەکەی پێکبێنن.

پێویستە ئەمە وەك پیلانگێڕی و نیازخراپی لێکنەدرێتەوە. چونکە یەهودییەکان بەو سیفەتەی خاوەن بانك و بازرگانێك بوون کە زۆرترین سەرمایەیان لەژێر دەستی خۆیان مۆڵ دابوو، لە ئاواکردنی هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەکدا گۆڕەپانێکی وەبەرهێنان و حەوانەوەیان بەدەست دەهێنا. بەمجۆرە دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێگای لەپێش گەورەبوونێکی هەرەسناسای سەرمایەی یەهوودی کردەوە. ئەگەر فێرنەر سۆمبارد بەمجۆرە تیۆرییەکەی خۆی ڕوونکردبایەوە، لەوانەیە واقیعیتر بووایە. کاتێك سەرمایداری یەهوودی لەسەرتاسەری جیهان گەورە دەبوو، هەڵبەتە دژەکەی خۆیشی دەخولقاند. ناکۆکییەکانی نێوان پاوانەکانی دەوڵەت و پاوانی بان نەتەوەیی ڕۆژی ئەمرۆمان سەرچاوەی خۆی لەم ڕاستییە وەردەگرێت. لێرەدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەردەکەوێت، کەڵەکەکارانی سەرمایەی یەهوودی بەردەوام ئەو تەنگەتاوبوون و گیرۆدەبوونەیان ڕەچاوکردووە کە لە مێژوودا تووچاری هاتوون، لەمیانەی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لەسەر بنەمای ڕێبازی نەریتی ئایدیۆلۆژی خۆیان خزمەتێکی مێژووییان پێشکەش کردووە، بەمجۆرە بەشێوەیەکی بابەتی بناخەی جینۆسایدی جڤاتە یەهوودییەکانیان داناوە کە لەم مەسەلە بێئاگان و هیچ بەرپرسیارێتییەکیان نییە. ئەمەش تاڕادەیەك حەزرەتی عیسا و یەهوودا ئیسکاریۆتی هەوالدەرەکەی دێنێتەوە بیری مرۆڤ. یەهوودییەکان کە نزیکەی ٢٠٠ ساڵ کلتووری ماددی و مەعنەویی خۆیان بۆ پێشخستنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمانی سەفەربەر کرد (لە خۆڕا نییە ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی لە ئایدیۆلۆژیای یەهوودی دەچوو) تا سەردەمی هیتلەریش تووندترین میللیگەرایی ئەڵمانی بوو. لەبەر ئەم هۆکارە لە زۆر لایەنەوە میللیگەرا هەرە بەهێزەکانی زایۆنیزم نوێنەرە بەهێزەکانی میللیگەرایی ئەڵمانی بوون. دەشێت چەندین نموونەی هاوشێوە پێشکەش بکەین (بەتایبەتی، لە کەسایەتی ڕوسیا، عوسمانی ـ تورکیا)دا. هەروەکو کۆلینوود ئاماژەی پێکردووە، گەردوونگەرایی یەهوودی (میللیگەراییەکەی ـ پۆزیتیفیزم ـ ئایینگەراییەکەی) سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو. بەڵام تەنیا جینۆسایدی نەژادی یەهوودی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو، بەڵکو سەرجەم بکەرانی جینۆسایدە جەستەیی و کلتوورییەکانی جیهانیشی لەگەڵ خۆیدا ئافراندبوو.

بەهۆی گرنگییەکەوە پێویستە لە نزیکەوە تەماشای بابەتەکە بکەین.

لەوانەیە یەهودییەت یەکەمین نموونەکانی ناسنامەکانی کۆمەڵگای مێژوویی بێت کە لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە خەسڵەتی ئەتنیکی و ئایینی تێدا تێکەڵ بە یەکتر بووە. لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمەوە تا ڕۆژگاری ئەمرۆمان ئەم تایبەتمەندێتییەی خۆی دەپارێزێت. کاتێك باوەڕی "قەومی

هەڵبژێردراو"یشی هاتەسەر، سێیەمین خەسڵەتی گرنگی ئایدیۆلۆژیاکەیان دیاردەبێت، خۆیان لەسەرووی سەرجەم کۆمەڵگاکانەوە دەبینن. ئەم چەمکەی باڵابوون بە درێژایی مێژوو پۆتانسێلی رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دیکە - ئەوانی دیکە - لە خۆوە گرتووە و زۆر جاریش رێگای لە پێش ئەو شەڕ و پێکدادانانە کردۆتەوە کە تا ئاستی جینۆساید بەردەوام دەبێت.

یەهودییەت بەردەوام خەسڵەتی کۆمەڵگای ئایدیۆلۆژی پاراستووە کە گرێدراو بەم ناکۆکییە پێشکەوتووە. بەشێوەیەکی سروشتی یەهەدییەکان ناچاربوون لەپێناو پاراستنی خۆیان ستراتیژ و ئامرازی تەکتیکی برەو پێبدەن. وەك پێویستییەکی بونیادەکەی ناچارن لە بواری تیۆری و ئایدیۆلۆژییەوە ستراتیژی پاراستن پەرە پێبدەن. هەرچی ئامرازە تەکتیکییەکانە زیاتر پەیوەستی هێزی مادییە، هێزی چەك و پارەش لەسەروویانەوە دێت. لەکاتێکدا پارە لەرێگای بانك و بازرگانییەوە دابین دەکرێت، هەرچی چەکە زیاتر لەمیانەی نوژەنکردنەوەی تەکنیك ( ئامرازە )کان پێشدەخرێت. لە هەردوو بواریشدا هێزی یەهوودییەکان دەزانرێت و سەلمێنراوە. لەم بارەیەوە باچاخەکانی یەکەمین و ناوین بەلاوە بنێین، لەکاتێکدا چاخی نوێ، واتا لە کاتێکدا سەردەمی مۆدێرنمان پێشدەکەوێت، بێگومان بەو سیفەتەی گەلێکی هەرە بە ئەزموون و رێکخراوە لەناو پەیوەندی و هۆگری نزیکی یەهوودییەکاندا دەبێت. لەکاتێکدا لە سەدەی شازدەهەم بەدواوە هەڵکشانی هەژموونگەرایی سیستەمی شارستانی سەرمایەداری جیهانی پەرە دەسەنێت کە ناوەندەکەی رۆژئاوای ئەوروپایە، بەتایبەتیش ئەمستردام - هۆڵەندا و لەندن - ئینگلتەرایە، هێزی فینانس و ئایدیۆلۆژیای یەهوودی رۆڵێکی گرنگ لەمەدا دەبینێت. ئەوەی لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو قۆناخە بکات لە دەستنیشانکردنی ئەم راستییەدا زەحمەتی نابینێت.

گوتەی یەهودییەت سەرمایەداری نوژیوەتەوە (ڤێرنەر سۆمبارد) دەشێت زێدەڕۆیی بێت، بەڵام لە بواری بەسیستەمبوونی سەرمایەداری و گەیشتنیان بە ئاستی هێزێکی هەژموونگەرایی ناتوانرێت نکوڵی لە رۆڵە گرنگەکەیان بکرێت. تەواوی لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەکان ئەو دیاردەیان دەستنیشان کردووە کە لە بازاڕ، بۆرسە و پێشەنگاکانی تەواوی شارە گرنگەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە لەندەن و ئەمستردام بانك و بازرگانە یەهوودییەکان تەراتێنیان بووە. بێدەنگی و نابینایی ئابووریناسی - سیاسی سەبارەت بەم بابەتە، پەیوەندی بە رۆڵی کوێرکەرانەی ئایدیۆلۆژیاوە هەیە. "سەرمایە"کەی مارکسیشی لەناودا، ناووتوێ نەکردنی زێدی ئەتنیکی و نەتەوەیی کەڵەکەبوونی سەرمایە لە هەڵسەنگاندنەکانی دەرهەق بە ئابووریناسی - سیاسی، هەم کەموکورییەکی زۆر گرنگە، هەمیش چەندەی بڵێی جێگای بیرکردنەوەیە. هەروەها ئەو پەندە

گەلێرییەش هەڵەیە کە دەڵێت "سەرمایە ئایین، ئیمان و نەتەوەی نییە". سەرمایە پەیوەندییەکی زۆر توندوتۆڵی لەگەڵ ئایین، ئیمان و نەتەوەدا هەیە. بێگومان لەکاتێکدا خاوەنەکانی هەندێك ئایین، باوەڕی و نەتەوە چەندین پاوانی نەتەوە و دەسەڵات ئاوا دەکەن، لەبەرامبەر ئەوەشدا زۆربەیان دووچاری داگیرکاری دێن و دەکرێن بە کۆلۆنی. بەرچاوترین نموونەش وڵاتە یەکگرتووەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمانە. ناتوانرێت نکوڵی بکرێت کە هەم وەك ئایین و ئیمان، هەمیش وەك نەتەوە زۆرترین سەرمایەدار لەوێن.

هەڵبەتە رۆڵی یەهوودییەت لە ئاواکردنی ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە حاشاهەڵنەگرە، کە هەربوو کۆڵەکەکەی تری سەرمایەداری و مۆدێرنیتە (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری)یە. بانکدار و بازرگانە یەهوودییەکان لەسەردەمی شۆڕشی شار لە ئەورووپا (١٠٥٠ ـ ١٣٥٠ زایین) و لەسەردەمی سەرمایەداری بازرگانی سەدەی (١٥ ـ ١٨) دا زیاتر درەوشاونەتەوە و قەڵەمبازیان ئەنجامداوە. لە شارەکانی رۆژهەڵاتیش (قاهیرە، حەلەب، شام، ئەزمیر، تەبریز، ئەنتاکیا، بەغداد، ئەستەمبوڵ .. هتد) پێشکەوتنێکی هاوشێوەیان ئەنجامداوە. کاتێك شۆڕشی پیشەسازی وەك گۆڕەپانی قازانج دەرکەوتە پێش، لە گواستنەوەی تەواوی سەرمایەکەیان بۆ گۆڕەپانی پیشەسازی درەنگ نەکەوتن. هێندە پێویستی بە روونکردنەوەی ئەم خاڵە ناکات. چونکە هەر شوێنێکی ئاستی قازانجی تێدا بەرز بێتەوە، ئەو شوێنەیە کە سەرمایە لە هێرشدایە. ئایا ئەمەش ئەو پرەنسیپە نییە کە بە یاسای قازانج ناودەبرێت؟

لە دۆخێکی بەمجۆرەدا" چۆن دەشێت گرنگی رۆڵی پاوانەکانی سەرمایەی یەهوودی لە مۆدێرنیتەدا بچووکبکرێتەوە یان جەختی لەسەر نەکرێتەوە؟ ئینجا ئەمە مۆدێرنیتەی خاوەن مۆرکی سەرمایەداری بێت یان بە سیفەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پیشەسازی. ئەگەر ئەمە بە چەواشەکارییەکی ئەنقەست و نەخشە بۆ کێشراویش ناو نەبرێت، بەدڵنیاییەوە دەشێت بە نابینایی ئایدیۆلۆژی ناوببرێت. کەچی ئەم رەوشە سەبارەت بە یەهوودییەکان تاوانیش نییە. دەشێ پاوانی بازرگانی و پیشەسازی لە هەر جڤاتێکی نەتەوەیی، ئایینی و ئەتنیکیدا پێکبێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە رۆڵی ستراتیژی پاوانە بازرگانی و پیشەسازییەکانی یەهوودییەکانە. هەڵبەتە فینانس بەشێوەی بەردەوام – هەمیشە لە پاوانی یەهودیدا پەیدابووە. وەك بانگەشەی بۆ دەکات خۆدزینەوەی ئابووریناسی ـ سیاسی لە شیکارکردنی پەیوەندی پاوانەکانی فینانس، بازرگانی و پیشەسازی بەگشتی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا ( دەشێت لیبرالیزم تەنیا لە چوارچێوەی پڕوپاگەندە جێگەی باس بێت ) بەتایبەتیش لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا میللیگەرایی، ئایینی، زانستگەرایی و

رەگەزگەراییەکان سەرچاوەی خۆی لە ئەندێشەی "ئۆبژەکتیفێتی" بوون ناگرێت. بە پێچەوانەوە ئۆبژەکتیف نەبوون گرێدراوی ئەو تۆخەی سەرجەم پاوانەکانە، پاوانەکانی دەسەڵاتیش لەناویدا، لەمیانەی شاردنەوەی ناسنامە ئایینگەرایی، رەگەزگەرایی، میللیگەرایی و زانستگەراییەکەیان ناخوازن بابەتی بن، گرێدراوی پەردەپۆشکردن و بێ بایەخکردنی واقیعی بەرجەستە و ژیانە لە هەستیارترین خاڵیدا. واتە گرێدراوی رۆڵەکەیەتی وەك ئامرازێکی پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆژی، نەك وەك زانست.

پێگەی ستراتیژی یەهوودییەکان لە سیستەمی هەژموونگەرایی چوار سەد ساڵەی جیهاندا تا ئێستاش لەمیانەی زیادبوونی بایەخ و گرنگییەکەی لە پاوانەکانی بازرگانی، پیشەسازی، فینانس، میدیا و سەرمایەی رۆشنبیری بەردەوامە. تا ئەم دیاردەیە دەستنیشان نەکرێت، بەپێی پێویست ناتوانرێت هیچ کێشەیەك شیکار (تیۆری) و چارەسەر (زانستیانە)بکرێت، ئینجا ئەمە جیهانی بێت یان خۆجێیی.

یەهودییەت بەو سیفەتەی هێزی ستراتیژی ماددی و ئایدیۆلۆژییە لە ئاواکردنی مۆدێرنیتە و دەوڵەت ـ نەتەوەدا پێگەیەکی دیارتری هەیە. لەکاتێکدا لەرێگەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە ناوەرۆکە سەرمایەدارییە رەهاکەی مۆدێرنیتە ئاشکرا دەکات و ئاوای دەکات، لەمیانەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە بەو سیفەتەی تۆخی یەککگرتووی پاوانەکانی بازرگانی، فیانس، پیشەسازی و دەسەڵاتە مۆدێرنیتە بەرجەستە و مسۆگەر دەکات. هەڵبەتە یەهودییەت خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە نییە. بەڵام لەسەردەمی هۆزایەتییەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان، واتا لەو تۆخەی لە منداڵدانی دایکیدابوو تا ئەمڕۆ کە گەورەبووە و بەتەمەنی پیری و پووکانەوە گەیشتووە لە مەیدانی شارەزایی خۆیدا پەرەی پێداوە.

هیچ بایەخێك بە تیۆرییەکانی پیلانگێڕی نادەم. بەردەوام بانگەشەی لەو جۆرە پێشدەخرێت، گوایە جیهان لەلایەن کۆمەڵە نهێنییەکانی ماسۆنی، کۆبوونەوەکانی بیلدربەرگ[١٢]، کۆبوونەکانی

[١٢] کۆبوونەوەکانی بیلدربرگ: لە ساڵی ١٩٤٥ کۆمەڵێك لە کەسایەتییە جیهانیەکان لە ئۆتێلی بیلدربرگ کۆبوونەوە، کە پێکهاتبوون لە سەرکردە سیاسیەکان، سەرمایەداران، خاوەن دامەزراوە میدیاییەکان، ئەفسەر، هەوالگری، زانا، پسپۆڕ و مامۆستایانی زانکۆ. ئەم گرووپە کە ساڵانە بە شێوەیەکی نهێنی لە وڵاتێك کۆدەبنەوە بە حکومەتی شاراوەی جیهانی دادەنرێن. لە کاتی کۆبوونەوەکان بڕیاری ستراتیژی سەبارەت بە گشت بوارەکان دەدرێت لە راگەیاندنی شەڕەوە تا دەگاتە تەقاندنەوەی قەیرانی ئابووری. ئەم کۆمەڵەیە لە سێ بازنەی ناو یەك پێکهاتووە: بازنەی دەرەوە لە لە سەدا هەشتای بەشداربووانی کۆبوونەوەکان پێکدێت، تەنیا ئاگاداری بەشێك لە ستراتیژ و ئامانجەکانی کۆمەڵەکەن. بازنەی دووەم لیژنەی بەڕێوەبەرە و لە ٣٥ ئەندام پێکدێت و لە سەدا نەوەدی ستراتیژ و ئاماجی کۆمەڵەکە دەزانن. سێیەمیشیان بازنەی ناوەندییە.

داڤۆس، کۆنسەی دوازدە کەسە هەمیشەییەکەی بەڕێوەبەری جیهان[١٣] و نوخبەی یەهوودی لەUN بەڕێوە دەبرێت، هەوڵ دەدرێت تیۆرییەکانی پیلانگێڕی ئەرێ بکرێ. لەگەڵ ئەوەی ئەم بانگەشانە لایەنی راستیان هەیە، بەڵام لایەنە زێدەڕۆییەکەی، دۆخی دۆگماتیکی و نازانستیبوونیان خەسڵەتی هاوبەشی ئەم تیۆرییانەیە. بەڵام راستیش وەك رۆژی روون لە بەرچاوانە، چیتر رمەکە ناچێتە ناو رمدانەکەوە. باڵابوونی یەهودییەت لە هەر سێ پێچکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. لە هەرسێ بواریشدا بە شێوەیەکی ستراتیژی و سیفەتی هێزی ماددی و ئایدیۆلۆژی بەکاریگەرە، تەنانەت لە زۆر باریشدا لە پێگەی دیاریکەردایە. پێویستە ئاگاداری چوارچێوەی گوتەکەم بن: باسی کاریگەرییەکەی دەکەم لە گۆڕەپانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا، باسی تازەگەرییە دیموکراتییەکان ناکەم کە سیفەتی راستینەی کۆمەڵگای مێژوویی بەرفراوان لە خۆوە دەگرێت. یەهودییەت لەم تازەگەرییانەشدا هەیە. بەڵام بەشێوەیەك زۆری لە هێزی ستراتیژی خۆی لەدەستداوە.

بەر لەوەی بچینە سەر ئەم بابەتە، کەمێکی تریش شیکارکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە سوودبەخش دەبێت. لەگەڵ دەرکەوتن لە چاخەکانی ناوین بۆ بێکاریگەرکردنی رکابەرە موسڵمان و کریستیانەکانی لەبواری ستراتیژی ژیانەوە، ئایدیۆلۆژیای یەهوودی هیچی لە هەوڵەکانی خۆی کەم نەکردەوە. مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە هەم بە سیفەتی خوداوەندێتی نەتەوە (رەب لە یەهودییەتدا بە واتای خودلوەندی نەتەوە دێت) کە لەبونیادیدا هەیە، هەمیش وەك دۆخی چڕبۆوەی سەرجەم پاوانەکانی بازرگانی، فینانس، پیشەسازی، ئایدیۆلۆژی و دەسەڵات، بەشێوەی گونجاوترین مۆدێلی ستراتیژی ژیان سەبارەت بەم بابەتە رووبەڕوومان دەبێتەوە. لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا عەلمانییەت لە شوێنگەی خوداوەندی نەتەوەیی یەهودی ـ رەب ـ دا رۆڵ دەبینێت. لەم بارەیەوە دروستکردنی زاراوە لەلایەن ماسۆنییەتی یەهوودی زۆر گرنگە. لێرەدا بەم لایەنە و لەو واتایەدا دەوڵەت ـ نەتەوە بەگرنگترین ئامرازەکانی بەڕێوەبەرایەتی گەردوونی یەهوودییەت دادەنرێت. پاوانەکانی یەهوودی مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوەیان وەك ئامرازێکی بەکاریگەر بۆ شیکار و هەڵوەشانەوەی پاوانە بە ریشە ئەنگلۆ ـ ساکسۆنەکان و ئیمپراتۆرییەتی فەرەنسا و ئیسپانیا بەکارهێناوە. چونکە ئەم دوو هێزە پیلانی کوشندەیان بەرامبەر هەردوو هێزەکەی دیکە (هۆڵەندا و ئینگلتەرا) هەبوو. رووبەڕووی کۆمەڵکوژی و سڕینەوە بوون لە شانۆی مێژوودا. دەوڵەت ـ نەتەوە

---

[١٣] لیژنەی دوازدە کەسیەکە(حوکمڕانە بەردەوامەکانی جیهان): بازنە ناوەندییەکەی کۆمەڵەی بیلدربێرگە، یانیش لیژنەی راوێژکاری پێدەڵێن، تەنیا لە دوازدە کەس پێکدێت، ستراتیژیەت و ئامانجە راستەقینەکانی گروپەکە دادەڕێژێت.

بەو سیفەتەی چڕترین هێزی پاوانە، بەرامبەر بە پاوانخوازی ئیسپانیا و فەرەنسا بوو بە مۆنیتی سەرکەوتن، چونکە لەم لایەنەوە خۆیان ڕێکنەخستبوو و لەمیانەی نەریتەکانی ئیمپراتۆرییەتی چاخەکانی ناوین خوازیاربوون ئەنجام بەدەست بێنن. لەکاتێکدا والرشتاین لە شاکارە بەناوبانگەکەی بەناوی "سیستەمی جیهان" سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوە بە فاکتەری سەرەکی بالآبوونی ئینگلتەرا بەرامبەر بە فەرەنسا دادەنێت، ئەوا ئاماژە بە گرنگی ئەم راستییە دەکات.

دوای داڕماندنی خانەدانی هابسبۆرگ لە نەمسا، هاوپەیمانەکان شێوەگرتنی دەوڵەت ـ نەتەوەی بروسیا دەردەخەنە پێش. یەکێتی ئەڵمانیا لە ژێر ڕێبەرایەتی نەمسا دەردەخرێت و پێشەنگایەتیەکەی بە بروسیا دەبەخشرێت. لەکاتی شۆڕشی فەرەنساش لەندەن دەبێتە ناوەندی هەموو جۆرە بەرهەڵستکارێکی دژی پادشا کە دوژمنە نەریتییەکەیەتی. ڕێکخراوی ماسۆنی ڕۆڵێکی گرنگ لە شۆڕشدا دەبینێت. پادشا لە کەللەی دەدرێت. لەشۆڕشەکانی ئینگلتەرا و هۆڵەندای پێشووتریشدا هەمان قڕکردن ڕوودەدات. لەکاتێکدا بروسیا خوازیارە بە سیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە وەك هێزی هەژموونگەرا جێگای فەرەنسا بگرێتەوە، هەمان تەڵەزگە و گەمە بەرامبەر بە بروسیاش بەڕێوە دەبرێت. تەنانەت مارکسیش وەك بەرهەڵستکارێك لە لەندەن نیشتەجێیە. لە شەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهاندا، هاوپەیمانەکان بانگەشەکانی هەژموونگەرایی ئەڵمانیا تێکدەشکێنن. هۆکاری سەرەکی ئەو جینۆسایدەی هیتلەر بەرامبەر بە یەهوودییەکان ئەنجامیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرمایەی یەهوودی هێزی ستراتیژی خۆی بۆ پشتگیری ئینگلتەرا بەکارهێنا، بەمجۆرە ڕۆڵێکی گرنگیان لە تێکشکاندنی ئەڵمانیادا بینی. هەمان هاوپەیمانێتی لەڕێگای هەندێ شێوە و فۆرمی نوێوە، لە شەڕی ساردا بانگەشەکانی هەژموونگەرایی روسیاش تێکدەشکێنێت. ئەگەر ئاراستەکە بەمجۆرە بەردەوام بێت، پێویستە هیچ گومانێکمان نەبێت کە بانگەشەکانی چین یش بۆ هەژموونگەرایی ـ وەك بانگەشە و گریمانێك باس دەکرێت ـ شیمانەیەکی بەهێزە بەم ئاراستەیەی دووچاری هەمان چارەنووس ببێتەوە.

لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا لە نەتەوە یەکگرتووەکان UN نوێنەرایەتی نزیکەی ٢٠٠ دەوڵەت ـ نەتەوە دەکرێت کە ناوەندەکەی شاری نیویۆرکە. هەروەك دەزانرێت UN یش لە ژێر پێشەنگایەتی هەمان هاوپەیمانێتیدا دەجووڵێتەوە، بەلانی کەم هیچ بڕیارێك بەبێ ڕەزامەندی ئەم هاوپەیمانێتییە دەرناچێت.

پێویستە دیسان دووبارەی بکەمەوە، زایۆنیزم یاخود هێزێکی دیکەی یەهوودی ئەم ٢٠٠ دەوڵەت ـ نەتەوەیە بەڕێوە نابات. بەڵام هەر ٢٠٠ یان (بە دەوڵەتانی ئێران و عەرەبیشەوە کە

دوژمنی سەرسەختیان) لەرێگای پارادایمی میللیگەرایی یەهوودی ئاواکراون و چوار سەد ساڵە جڵەویان بەدەست نوخبەی هەمان هاوپەیمانێتیەوەیە. تەنانەت تاکە یەهودییەکیش لەناو نوخبەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا نەبێت، بەهۆی پارادایم و تەگبیرە کۆنکرێتییەکانی هاوپەیمانێتیەکە (واتا تەگبیرە تیۆری و کردارییەکان) گۆڕەپانی جووڵەی سەربەخۆیان تا دوا رادە سنووردارە. ئەگەر رەفتار و هەڵسووکەوتەکانیان بەگوێرەی قاڵبە بونیادی و ئایدیۆلۆژییە باوەکانی چوار سەد ساڵەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێت، ئەوە هیچ کێشەیەك نییە، دەتوانن درێژە بە کاروانی خۆیان بدەن. بەڵام بە گوتەی جۆرج دەبلیو بۆش ئەگەر بۆ پێگەی "دەوڵەتی یاخی" بخزێن، ئەوا چارەنووسی هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك وەك ئێراقی سەددام، ئەفغانستانی تالیبان و دەیان نموونەی دیکەی مێژوو دەبێت. ئەمە ئەو دیاردەیەیە کە بە سیستەمی نێو دەوڵەتی و ستاتۆی UN ناودەبرێت.

تەنانەت روسیای سۆڤیێتی حەفتا ساڵەش تەنیا کاتێك گوێڕایەڵی تەولوی داواکاریەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو ئینجا خرایە ناو سیستەمەوە. هەرچی چین ە زووتر خرایە ناو سیستەمەوە. ئاشکرایە کە سیستەم وزەی خۆی لە دوو هێزی ستراتیژییەوە وەردەگرێت کە لەسەرەتاوە هەوڵی باسکردنیانم دا. لە هەردووکیشیاندا یەهودییەت لە پێگەی دیاریکەری نزیکە، ئینجا ئەمە لە مێژوودا بێت یان رۆژگاری ئەمڕۆمان. هەروەها پیشەسازی کلتوور، سەرمایەی رۆشنبیری و میدیا (راگەیاندن) فاکتەرەکانی هێزی ستراتیژی ئایدیۆلۆژین.ناوەڕۆکەکەشیان ئایینی، زانستگەرایی، رەگەزگەرایی و میللیگەراییە. بونیادی پاوانەکانی بازرگانی، پیشەسازی، فینانس و دەسەڵات فاکتەرەکانی هێزی ستراتیژی ماددین. بە سیفەتی سیستەمەکانی دەوڵەت، رێککەوتنە نێو دەوڵەتییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشت لە بونیادی فەرمی دەکات. پێویستە گۆڕەپانی هەردوو هێزە ستراتیژییە زەبەلاحەکە لەگەڵ دەوڵەت و سیستەمەکانیان تێکەڵ نەکرێت کە گوزارشتی فەرمین.

وەك پاشکۆیەك ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنێکی کورت دەرهەق بە یەهوودییەتی ئەنادۆڵیش گرنگە. سەبارەت بەم بابەتە بە کورتی ئاماژەم بە چاخەکانی یەکەم و ناوین کردبوو. پەیوەندی سەلجووقی ـ یەهوودی و گریگ ـ یەهوودی گرنگە. یەهوودییەکانی رۆژهەڵات لە چاخی ناوین لە ئەندەلووسەوە تا دەگاتە ئاسیای ناوین بڵاوببونەوە. دەوڵەتی تورکی یەهوودی قەزوین بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. هەڵگەڕاوەیی و یەهودییەتی ئاشکرا لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا قەدەغە نەکرابوون،

بەڵکو لەمیانەی هێزە ماددی و ئایدیۆلۆژییە نەریتییەکەیان بەتایبەتی لە گۆڕەپانە ستراتیژییەکانی دەسەڵات و دەوڵەتاندا بەکاریگەر بوون. بانکداری و بازرگانی پێگەکەی لە هی ڕۆژئاوا کەمتر نییە.

کاتێك ناکۆکییە نەریتییەکانیان لەگەڵ کریستیانەکان ( لە خاچدانی عیسا و بوونی کرستیانی بە باوەڕی فەرمی ڕۆژئاوا ) لە ئاکامی بڕیاری کۆنسەی لاتران لە ساڵی ١١٧٩ بە کۆکردنەوە لەگەڕەك و سەربازگە داخراوەکان ئەنجامگیر بوو، هەروەها دوورخستنەوەی ساڵانی ١٣٩١ و ١٤٩٢ لە ئیسپانیا جێگای باس بوو، یەهودییەکان پێویستییان بە وڵاتێکی تایبەت بەخۆیان بینی. دەستەواژەی "وڵاتی بەڵێن پێدراو" هێشتا زیندووە. ئەو پەیوەندییانەی لەسەردەمی هەڵکشانید لەگەڵ ناوەندەکانی سەڵتەنەتی عوسمانیدا بەستبوویان دەرەنجامی ئەرێنی لێدەکەوتەوە. کاتێك گرنگی بانکداری و بازرگانی بۆ عوسمانییەکان زیادی کرد، یەهودییەتیش پێگەی خۆی بەهێز کرد. عوسمانییەکان بەردەوام لەسەر حیسابی دانیشتوانە کرستیانەکان دەسەڵاتی خۆی بڵاو دەکردەوە و پەرەی پێدەدا، یەهوودییەکانیش کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕەوشەکەیان لە جیهانی کرستیانی (کاسۆلیك و ئۆرتۆدۆکسەکان) سەخت دەبێت، هاوپەیمانێتیەکی هاوشێوەی ئینگلتەرا لەگەڵ پاشا عوسمانییەکانیش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بۆچوونی هاوبەش، ئەم هاوپەیمانێتی و ڕێککەوتنە لە ساڵانی ١٥٥٠ ـ ١٦٠٠ بەهێز بووە. لە هەمان مێژوودا هاوپەیمانی و ڕێککەوتنێکی هاوشێوە لەگەڵ هۆڵەندا و ئینگلتەرای پرۆتستانیش دەبەستێت. پەیوەندی نێوان پرۆتستانتی، سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە، مۆدێرنیتە و یەهودییەت بابەتێکی گرنگی شایستەی لێکۆڵینەوەیە.

وەك دژە هەڵمەتێك بەرامبەر پاککردنەوەی ئیسپانیا و نیمچە دوورگەی ئیبریك لە موسڵمان و موسەویەکان(تا ساڵانی ١٦٠٠ تەولو دەبێت)، پاککردنەوەی ئەنادۆڵ لە کریستیانەکان دەخاتە ڕۆژەڤەوە. بەهۆی ئەم ڕۆژەڤەوە چارەنووسی کۆنترین گەلەکانی ئەنادۆڵ ڕۆم، پۆنتۆس، ئەرمەنی و سوریانییەکان کە خاوەن مێژوویەکی بەهێزی کلتووری ماددی و مەعنەوین، بەڵام زوو بوونەتە کرستیان، دۆخیان پێچەوانە دەبێتەوە و دووچاری مەرگەسات دێن. نیمچە دوورگەکانی هەر دوولای ئیجە وەك بڵێی تۆڵە لە یەکتر دەکەنەوە، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو بە قڕکردن دەدەن. دوای هەڵمەتەکەی ساڵانی ١٥٥٠ ـ ١٦٠٠ یەهوودییەکان دووەمین هەڵمەتی گەورەی خۆیان لەسەردەمی

پارتی ئیتحاد و تەرەقی دا ئەنجام دەدەن (ئیتحاد و تەرەقی لە ١٨٩٠، کۆنگرەی زایۆنیزمیش[١٤] لە ١٨٩٦ دا ئاوا دەکرێت). ئیتحاد و تەرەقی کە بەیەکەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکانی ناوەندی سەلانیک و ساباتاییەکان پێشکەوت، بەلانی کەم باڵێکی یەهوودییە. ئەو میللیگەراییەی ئاوایانکردووە (کۆهێن، وامبەری) وەك وشە "تورکە"، بەڵام ناوەڕۆکەکەی پڕ لە کورد، ئەڵبانی و یەهوودییە هەڵگەڕاوە و ماسۆنییەکانە. وەك دیاردەیەکی کۆمەڵناسی هیچ پەیوەندیەکیان بە تورکێتییەوە نییە. بەتەواوی تورکێتییەکی سیاسی جێگای باسە. کاریگەری ئەو یەهودیانەش گرنگە کە لە ئەڵمانیا و ئینگلتەرا کێبڕکێیان لەسەر دەکرێت. مێژووەکەی درێژە و ئێرەش جێگاکەی نییە.

بە کورتی، بە بڕوای من، کاتێك مێژووی یەهودییەکان لە ئەنادۆڵ، دووڕخستنەوە و ئەزموونەکانی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە، لەگەڵ هێزە ماددی و مەعنەوییە ستراتیژییەکەیان دەبێتە یەك، ڕۆڵێکی گرنگ لە دامەزراندنی کۆماری تورکیا و گۆڕینی خێرای بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە (شیمانە دەکرێت ساڵی ١٩٢٦ روویدابێت)دا دەبینێت. هەر وەك ئەو ڕۆڵەیە کە لە ساڵانی ١٦٠٠ کان لە هۆڵەندا و ئینگلتەرادا بینیان. بە ڕۆژەڤبوونی لەناوبردنی کلتووری کوردان و نەریتی ئیسلامی دوای قڕکردنی کریستیانەکان لە ئەنادۆڵ (جینۆسایدی جەستەیی کرستیانەکان جێگای باسە) و گۆڕانی خێرای کۆمار بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە، تەنیا پێشکەشکردنی وەك پرۆژەی بە نەتەوەبوونی تورکان هەڵەیەکی گەورەیە. ئەم بابەتە زۆر بەرفراوانە و لە نزیکەوە پەیوەندی بە یەهودییەکانەوە هەیە کە بەر لە ئیسرائیل ئەنادۆڵیان وەك وڵاتی خۆیان پەسەند کردبوو. وەك دەزانرێت لەناو یەهودییەکان ئەم بابەتە گفتوگۆیەکی زۆری لەبارەوە کراوە. هەرچی پرۆژەی یەهوودییەکانە کە سەلانیك یان ئەدرنە بە ناوەند دادەنێت و ویستیان بەسەر مستەفا کەمالیدا بسەپێنن، بابەتێکی پەردەپۆشکراوە. بەڵام دەتوانرێت بگووترێت دوای ئاواکردنی ئیسرائیل ئەم پرۆژەیە بایەخی خۆی لەدەستدا. بەڵام تا ئێستاش پەیوەندی یەهوودییەکان و ئیسرائیل لەڕێگای کۆماری تورکیاوە سەبارەت بە ئەنادۆڵ ستراتیژییە.

پێگەو ڕۆڵی مستەفا کەمال لە ئاولکردنی کۆماردا حاشا هەڵنەگرە. بەڵام لەدەرەوەی داخوازی خۆی بە ئیلاهیکردنی وێنایەکی ئایدیۆلۆژی یەهودییە کە بە درێژایی مێژوو لە زۆر شوێندا

[١٤] کۆنگرەی زایۆنی: دەسەڵاتی باڵای یاسادانانە لە بزووتنەوەی زایۆنیزمدا. دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل ڕێکخراوی زایۆنیزمی جیهانی ئامانجەکانی خۆی هەموار کرد، ڕێکخراوەکەی بۆ "بزووتنەوەیەکی گشتی" گۆڕی. بڕیاری دامەزراندنی "بزاوتی کۆچکردن" یدا تا یەهودیەکان بۆ " وڵاتی مێژوویی" بگەڕێنەوە.

ئەنجامیان داوە. لەچەمکی گەردوونگەرایی ڕەهای (لەوحی مەحفوز، قەدەر، یاساگەرایی، دیتێرمینیزم، پێشکەوتنگەرایی: گشتیان شێوەی تاکخودایی وێناکردنی سۆمەرییەکانە دەرهەق بە خوداوەند کە بۆ ئایینە یەکتاپەرستەکان وەرچەرخێنراوە) بەهوودیدا بە ئیلاهیکردن زاراوەیەکە زۆر پێشخراوە و پراکتیزە کراوە. هەر بۆیە سەرجەم شێوە زاراوە نهێنیەکانی لەجۆری ئۆتۆپیای ئەبەدی،چاخی زێڕین، تیۆری، گریمان و یاساکان کە لەلایەن پێغەمبەرانەوە یان لەلایەن ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی مۆدێرنیتەوە پێشخراون، لە نزیکەوە پەیوەندییان بەم نەریتەوە هەیە. لەم سۆنگەیەوە ئەگەر ئەم دۆگما هەژموونگەراییە سیکۆلار - عەلمانییە ئیلاهییە خەستە بە شێوەیەکی ڕاست شیکار نەکرێت کە لەپاڵ تورکەکان لەسەر تەواوی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئاوایان کردووە، ئەوا تێگەیشتنی ناوچەکە ناتەواو و ئاستەم دەبێت.

هەڵبەتە هێزی ماددی یەهوودییەکان گرنگییەکی ستراتیژی هەبوو. لەو بڕوایەدام کە مستەفا کەمال تەسلیم بەم مەیلە نەبووە. سەرباری ئەوەی زۆری خوێندۆتەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کردووە (لەخۆڕا بۆ بنەچەی سۆمەر و هیتیتەکان شۆڕ نەبۆتەوە) لەو بڕوایەدا نیم تەواو شیکاری کردبێت. هیچ گومانێکم لەوە نییە خواستوویەتی ببێت بە کۆمارییەکی باش، بە شێوەی دیموکراسی بەرەو پێشەوە بچێت نەك دەوڵەت - نەتەوە. وەك بانگەشە دەکرێت دژە کورد و دژە ئیسلامیش نییە. بەڵام ئاشکرایە کە هەڵوێستە لیبراڵەکانی سەرەتای دەربارەی کێشەی ئیسلام - عەلمانی (لەساڵی ١٩٢٧ عەلمانییەت لە دەستووردا جێگیر دەکرێت) و کێشەی کوردی درێژە پێنەداوە.بە بڕوای من هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەردەوام لەلایەن کادیرە هەڵگەڕاوەکانی ئیتحاد و تەرەقییەوە گەمارۆ درابوو.

بەبۆچوونی من لە ساڵی ١٩٢٦ بەدواوە بە هەموو خێراییەکەوە بەردەوامبوونی ململانێی هەژموونگەرایی سەر کۆماری تورکیا (لەنێوان عەلمانی و ئیسلامییەکان)، بابەتێکە پێویستە وەك کەموکوڕی و داخوازییەکی مستەفا کەمال هەڵنەسەنگێندرێت. ئەو بەڵگە و نیشانانە زیاترن کە مەیلی کۆماری دیموکراتییانەی ئەو ڕوون دەکەنەوە. لەو بڕوایەدا نیم کە ململانێی هەژموونگەرایی ڕۆژی ئەمڕۆمان بە قازانجی لایەنێکیاندا بشکێتەوە. هیواکانم زیاد بووە لەمەڕ: سەرکەوتنی قەڵەمباز و هێزی کۆماری دیموکراتی لەخاکی ئەنادۆڵ کە لەو بڕوایەدام خاوەن نەریتێکی مەزنی دیموکراتییە. لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ناویندا نیازی پێشکەشکردنی ڕووی ناوەوەی ململانێی هەژموونگەرایی سەر تورکیام هەیە کە وەك بەرگێکی جیاوازی بەرگرینامەکەم بیری لێدەکەمەوە.

تەنیا گرێدراو بە سەرمایەداری، مۆدێرنیتە و دەوڵەت - نەتەوە بیرکردنەوە لە یەهودییەت ناتەواو و هەڵەیە. هەروەها کاریگەرییەکی زۆری لەسەر تازەگەری دیموکراتیش هەبووە. ئەگەر بە ئەندازەی باڵی دەسەڵاتگەرایی - دەوڵەتگەرایی (پادشایەتی یەهوودی، دەوڵەتی ئیسرائیل)یش نەبێت، دیسان بەدرێژایی مێژوو باڵێکی تازەگەری شارستانێتی دیموکراتی یەهوودی هەبووە. یەهوودییە هەژار و دوور لە پەیوەندییەکانی هۆزایەتی بەردەوام لە مێژوودا خۆیان کردووە بە رۆژەڤ. لە ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم و هاجەری کەنیزەك ، تا یوسف لە میسر، لە مەریەمی خوشکی موسا تا مەریەمی دایکی عیسا و رۆژگاری ئەمرۆمان: رووەکەی دیکەی یەهوودییەت، بەتەواوی گەلە رەنجدەرەکەی، ژمارە زۆرەکەی پێغەمبەران، نووسەران، رۆشنبیران، ئەنارشیستە کۆمەڵایەتییەکان، فێمینیستەکان، فەیلەسوف و زاناکان چەندین داهێنان، نۆژینەوە، تیۆری، شۆڕش و شاکاری ئەدەبییان لەچوارچێوەی تێکۆشان لەپێناو تازەگەری و شارستانێتی دیموکراتی ئەنجامداوە. واتە یەهودییەکان بەردەوام هێزە ماددی و ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان لەپێناو خزمەتی پاوانەکان نەخستۆتە گەڕ. بەڵکو هەوڵێکی زۆریان لەپێناو دونیایەکی دیموکراتی، ئازاد، دادپەروەر و رۆشندا داوە، تەنانەت دەستکەوتی گرنگیشیان بەدەستهێناوە. دەتوانین بیر لە کامە بزاوتی پێغەمبەرایەتی، هاوکاری برایەتی و هەژاران، بزاوتی ئۆتۆپی، سۆسیالیستی، ئەنارشیزم، فێمینیزم و ئیکۆلۆژی بکەینەوە کە بەبێ یەهوودی بێت؟ ئەگەر یەهوودییەکان نەبوونایە ئایا بەرامبەر بە سەرمایەداری سۆسیالیزم، ئەنتەرناسیۆنالیزم بەرامبەر بە دەوڵەت - نەتەوە، کۆمیناڵیزم بەرامبەر بە لیبرالیزم، فێمینزمیش بەرامبەر بە رەگەزگەرایی کۆمەڵگا، ئابووری ژینگەخواز بەرامبەر ئیندوستریالیزم، عەلمانییەت بەرامبەر بە ئایینگەرایی و رێژەگەرایی بەرامبەر بە گەردوونگەرایی رەها، تا چەند توانای پێشکەوتنیان هەبوو؟

ئاشکرایە کە یەهوودییەت بۆ دونیای هەردوو مۆدێرنیتەش گرنگە. لە بەشە گرنگەکانی مێژوو و رۆژی ئەمرۆماندا یەهودییەکان ئەم گرنگییەی خۆیان پاراستووە. سەرباری ئەمەش، هەر وەکو لە مێژوودا، لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا کێشەی یەهوودی لە ئارادایە. هەروەکو لەسەرەتاش ئاماژەم پێکرد، بینینی یەهوودییەکان وەك جڤاتە هەڵبژێردراوەکەی خودلوەند یان هەڵسەنگاندنیان وەك قۆچی قوربانی، هەروەك زۆرجار نموونەکەی بینراوە رێگا لەپێش هەڵە و قەوارەی کارەساتاوی دەکاتەوە. بەهۆی گرنگییەکەیەوە پێویستم بینی لە چوارچێوەی گەلاڵەیەکدا ئاماژە بەم بابەتە بکەم. ئەگەر شیکارە خۆجێیی و گەردوونییەکان راستی یەهوودییەکان رەچاو نەکات، بەپێی پێویست راست نین و ئەنجامگیر نابن.

لەکاتێکدا ئەم بابەتە تەواو دەکەم خوازیارم گوتەیەکی مارکس دووپات بکەمەوە: مارکس گوتبووی "ئەگەر پرۆلیتاریا خوازیارە رزگاری بێت، پێویستە بزانێت تا جیهان رزگار نەکات ئەم کارە سەرناگرێت". منیش دەڵێم، ئەگەر یەهودییەت دەیەوێ خۆی رزگار بکات، پێویستە بزانێت بەبێ رزگارکردنی جیهان بەدی نایەت، هەر بۆیە با هێزە ماددی و مەعنەوییە ستراتیژییەکەی لەسەر ئەم بنەمایە بەکاربێنێت. تازەگەری دیموکراتیش لەسەرووی ئەم بنەمایانەوە دێت.

**ه ـ رەهەندەکانی تازەگەری دیموکراتی**

لەو بڕوایەدام ئەو شیکارانەی لە چوارچێوەی بەناویەکدا چوونی رەخنەکردنێکی بەرفراوانی شارستانی و مۆدێرنیتە لەگەڵ مێژووی پەرەسەندنی تازەگەری دیموکراتی شارستانێتی و ئەو بەشانەی فاکتەرە سەرەکی و جیاوازەکانی پێناسە دەکات تابلێی رۆشنکەرەوە بوو. بەڵام ئەوەی لێرەدا هەوڵی بۆ دەدەم، باشتر خستنەڕووی بابەتەکەیە لەمیانەی رەهەندە سەرەکییەکانی و یەکپارچەییەکەیەوە. وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە: لەرێگای لەسەرەوە تەماشاکردنەوە چۆن دەتوانرێت مۆدێرنیتە (تازەگەری)ی دیموکراتی بە نۆخی رەهەندە سەرەکییەکانییەوە پێشکەش بکرێت؟ شکاندنی چەمکی یەکانەیی مۆدێرنیتە و دەرخستنەڕووی قەوارەو پێکهاتەکانی کۆمەڵگای مێژوویی کە پەردەپۆشی کراوون، پێویستە ببێتە کۆڵەکەی کارە زانستییەکانمان. مێژووی شارستانی لە بیرێکی قووڵ دەچێت چەندە بچیتە خوارەوە بنەکەی دیارنییە. چەندە هەوڵی رۆشنکردنەوەی بدەین، دیسان خاڵە رەشەکانی دیکە بەدەر دەکەوێن. دەتوانرێت شیمانە بکرێت کە یادگای (ویژدان) هەزاران ساڵەی کۆمەڵگا لەژێر بۆردومانی ئایدیۆلۆژی پاوانە باڵادەستەکان هەڵبەتە دووچاری قەدبوونێك هاتبێت کە پێچ و لوولەکانی مێشك بە بیر مرۆڤدا دێنێتەوە. ئەمەش بەشێوەی هەزاران راڕەوەی پێچ خواردوو دەبێت کە بەدیاردەی وشیاری یان ژێر شعور ناوی دەبەین. دیسانیش پێویست بە ترس ناکات. هەر کێشەیەکی کۆمەڵگا ئەگەر بەپێی پێویست رۆشن نەکرێتەوە، وەك چۆن ناکرێ ئۆرگانێکی مرۆڤ تیمار بکرێ، ئەگەر پشکنینی بۆ نەکرابێت و نەخۆشییەکەی دەستنیشان نەکرابێت، بەهەمان شێوە ئەویش بە دەرفەتی شیکار (پشکنین)و چارەسەری (تیمارکردن) راست ناگات.

بۆ ئەوەی سەر سوڕماو نەمێنم، بەردەوام پێویستی جەخت لەسەرکردنی ئەوە دەبینم کە: ئەگەر زانستی کۆمەڵایەتی یان هەر لقێکی دیکەی زانست کە هەمان ئامانجە نموونەییەکانی ئەوی بەرزکردۆتەوە سەرکەوتوو بووایە، ئەوا مرۆڤایەتی لە ئاکامی شەڕە سامناکەکانی ئەم چوار سەد

ساڵەی دوایی، جینۆساید و کۆمەڵگاکوژییەکان، هەڵدێرەکانی دەوڵەمەندێتی و هەژاری، بێکاری و کۆچبەری، نارەسەنی کلتووری و بێ ئەخلاقی، هێزە هاربووەکانی پاوان و ئەو تاکانەی کراون بە هیچ و وێرانکارییە مەحشەرئاساکەی ژینگەی بەو ئۆخەی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان نەدەگەیشت. ٥٠٠٠ ساڵە لەژێر ناوی چارەسەرییەوە سیستەمی شارستانی جیهانی داباریوەتە سەر ئامرازەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی و ڕووبەڕووی لەناوچوونی کردۆتەوە. ئیتر شوێنێك نەماوە و نییە کە لەڕێگای ئامرازەکانی شەڕەوە فەتح بکرێت و سەرلەنوێ دەستی بەسەردا بگیرێت. ئەگەر بگووترێت هەیە، بەڵام زیانەکەی چەندین قاتی قازانجەکەیەتی. ئەوەی وەك پاشماوەی ئامرازی شار ماوەتەوە، شارە ناشارەکانی وەك شێرپەنجە گەورە دەبێت و کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ کە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی دەدەن و هەرە دواییش لەڕێگای شارە ناشارەکانەوە دووچاری لەناوچوون هاتووە کە. ئەوەی لەدوای ئەو ئامرازەشەوە ماوەتەوە کە بەناوی ئابوورییەوە پەنای دەبەنە بەر و لەهیانەی پەیرەوە تا ئەخلاقییەکانی قازانجکردنی پارە بە پارەوە هەڵاوساوە و لە ڕێگای پاوانە جیهانگیرییەکانەوە دەچەوسێنرێنەوە، ملیۆنان بێکار و هەژارن کە بەردەوام ژمارەکەیان لە زیادبووندایە. هەروەها ئەوەی لەدوای ئەو ئامرازەشەوە ماوەتەوە کە دەوڵەتی پێدەڵێن و پەنایان بۆ بردووە، پاوانەکانی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوەیە، کە هیچ ڕۆڵێکیان نەماوە و لەمیانەی کراندنەوەی ناواخنی کۆمەڵگا هەڵاوساون، لەبەرامبەر ئەمەشدا جەماوەری مێگەلی هاووڵاتیان ماوەتەوە کە بەتەواوی گێل کراوە و هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە نەماوە. هەرچی پاشماوەی ئامرازی ئایدیۆلۆژییە کە چاوەڕوانی فریاکەوتن و هیوای لێدەکرێت، ئایینگەراییەك کە ڕۆڵی ئەخلاقی لەدەستداوە، ڕەگەز (پەرستی)گەراییەك کە دەسەڵاتی لەناو سەرجەم مەمیلەکانی دەسەڵاتدا بڵاوکردۆتەوە،میللیگەراییەك هەزار هێندەی هۆزگەرایی لەناو شۆڤێنیزمدا خنکاوە و زانستگەراییەك ماوەتەوە کە جگە لە پیشاندانی ڕێگاکانی قازانجی هەرە زۆر بۆ پاوانەکانی دەسەڵات و سەرمایە هیچ ئامانجێکی دیکەیان نییە. هەرچی ئەوەی وەك پاشماوەی کلتوور ماوەتەوە پیشەسازی کلتوورە کە شکۆمەندی سۆز و هەستی جوانی کردووە بە کاڵا. ئەو ڕەوشەی بە کۆتایی مێژوو ناودەبرێت بە هەرحاڵ پێویستە ئەم ئامارەی شارستانی بێت. کۆمەڵگایەك چەندە لەلایەن دونیایەکی وەهمی پاوانەکانی میدیاوە بخنکێنرێت و بێبایەخ بکرێت، چەندە بێ پەرچەکردار بکرێت و لەڕێگای دامەزراوەکانی دەسەڵاتەوە تا دەگاتە مەمیلەکانی بخرێتە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵەوە، بەگشتی سیستەمی مۆدێرنیتەی ٥٠٠٠ ساڵە بەتایبەتیش هی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی لە کەوتووترین خاڵی قەیرانی

زهنی و بونیادیدان. سەرمایەداری فینانس روونترین بەڵگەی ئەم دۆخەیە، کە بووە بە هێزێکی هەژموونگەرا و جیهانگیری. هەرچی ئەو دونیایەیە کە چەرخەکەی لەلایەن سەرمایەداری جیهانگیرییەوە هەڵدەسوورێت، جیهانی قەیرانەکانە کەبەهۆی تەنگەژەکانەوە گرمۆڵە بووە.

مەبەستم پێشخستنی تیۆرییەکانی تەنگەژە و قەیران نییە. سەرمایەداری سیستەمێك نییە تەنیا خاوەنی قەیرانی خولی بێت، بەڵکو وەك سیستەماتیکی پەرەسەندنی قەیرانی بونیادی و سیستەماتیکی شارستانی پێناسەم کردبوو کە خاوەن قەیرانی خولی و درێژخایەنەیە. ئەگەر قۆناخەکانی پەرەسەندن لەناو خۆیدا قۆناخی دژوارتری هەبێت، ئەمە ئەوەیە کە ئێستا لە ئارادایە. کاتێك ئاماژە بەم خاڵانە دەکەم، پێویستە بڵێم لەو سۆسیالیستانە نەبووم کە سەردەمێك تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەم قەیرانانەوە هیوایان بە شۆڕش هەیە و لە چاوەڕوانیدان. چونکە قەیرانەکان تەنیا شۆڕش لەگەڵ خۆیاندا ناهێنن، بەڵکو دژە شۆڕشیشی لێدەکەوێتەوە. کەچی من ئەمجۆرە تیۆرییانەی قەیران ـ شۆڕش ـ دژە شۆڕشانە لە راستی زیاتر، وەك تیۆری و هەوڵێکی پروپاگەندەکردن هەڵدەسەنگێنم. هەر بۆیە من نالێم بەخێرایی کەش و زەمینە بۆ تازەگەری دیموکراتی دەرەخسێت. بەڵکو قۆناخەکانی تەنگەژە و قەیران وەك دیاردەیەك پەسەند دەکەم. بەڵام وەك فاکتەرێکی بەکاریگەرییان نابینم کە رووداوی مێژوویی لەگەڵ خۆیاندا بێنن. سەردەمانێك رێبازی پێشکەوتنی گەردوونگەرایی رەها گرنگییەکی زۆری بە دەرخستنی شێوەکانی کۆمەڵگا لە تیۆرییەکانی تەنگەژە دەدا کە هەنگاو بە هەنگاو لە خراپییەوە بەرەو باشبوون دەچوون. بەڵام خودی واقیعی کۆنکرێتی هێندە ئەم تیۆرییە ناسەلمێنێت.

ئەمەش بەو واتایە دێت، پێویستە لە گۆڕەپان و بوارەکانی دیکە لەو فاکتەرانە بگەڕێین کە لەمێژوو و دۆخی هەنووکەییاندا بەها دیاریکەرەکان لەخۆوە دەگرێت. بژاری تازەگەری دیموکراتی زیاتر ئەنجامی هەوڵەکانی ئەم لێگەڕینە بووە. کاتێك باسی دەکەم بەردەوام ناچاری ئاماژە پێکردنی دەبم، لەو بڕوایەدام کە ناسینی تایبەتمەندییە جیاوازەکانی ئەم بژارە، هەوڵەکانی پرۆسە کردارییەکە ئەنجامگیر دەکات. رێز و وابەستەبوونێکی گەورەم بەرامبەر بە میراسی دیموکراتی نەرێنی مێژوو هەیە. هەروەها ئەمە وەك رەخنەدانێکی خۆم پەسەند دەکەم. نالێم تەنیا پەند و ئەزموونی لێوەربگرن، بەڵکو لەو بڕوایەشدام کە کاری هەنووکەیی پاڵپشت بە مێژوو بەهای پەیڕەوێکی دەست لێبەرنەدراوی هەیە. هەمان رێز و وابەستەبوونم بۆ ئەو هێز و چالاکییانە نییە کە دەرك بە پێویستی ئەوە ناکەن کە مێژوو ئێستایە، ئێستاش مێژووە، جا بەها و ئەنجامەکانیان هەرچییەك بێت. چونکە باوەڕیم بەمجۆرە هێز و چالاکییانە نییە. هەروەها لەو بڕوایەشدا نیم ئەو

کەس و رەوتانەش ئایندەیان هەبێت کە دەزانن داهاتوو بە ئێستادا تێپەڕ دەبێت، بەڵام ئێستای خۆیان شیکار و چارەسەر ناکەن.

لەم دووبارەکردنەوانەی سەبارەت بە پەیڕەو ئەنجامیدەدەم مەبەستم جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی تازەگەری دیموکراتی وەك خەیاڵێکی "چاخی زێڕینی" رابردوو، یان وەك "ئۆتۆپیا"یەکی دەرهەق بە داهاتوو وێنا نەکراوە، بەڵکو گوزارشتی واتای شێوازی ژیانی رۆژانە و ساتە وەختییە کە وەك پێویستییەك لە هزر و کرداردا بەدیدێت. نە یادکردنەوەی بیرەوەرییە کۆنەکانە و نە دڵخۆشبوون و ئۆقرەگرتنە بە خەیاڵەکانی داهاتوو. نە دۆخی پێکهاتە و قەوارە ساتەوەختییەکانە، نە دۆخی هەبوونی راستییە ئەزەلی ـ ئەبەدییەکانە. دۆخی هەبوون بەو سیفەتەی ژێری نەرمی سروشتی کۆمەڵایەتییە، ئەگەر لەناو یەکێتی جیاوازەکانی خاوەن ئاسۆ و بەهرەی ئازادیدا بە تازەگەری دیموکراتی ناوببرێت، گونجاوتر دەبێت. بەڵام لەبەر ئەوەی مۆدێرنیتە (تازەگەری) بەواتای سەردەم دێت، پێویستە لە بیر نەکەین کە وەك جەمسەری دیالیکتیکی دژ بەرامبەر چاخەکانی شارستانی کلاسیك، هەبوونی خۆی بەدەست دێنێت و، مسۆگەر پێویستە لەگەڵ ئەم پێناسەیە بیکەین بە یەك.

هەر وەکو چۆن وەك ناوێکی تایبەت بەم چوار سەد ساڵەی دوایی شارستانی کلاسیکی بیر لە مۆدێرنیتە دەکرێتەوە کە هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە، ئەوا پێویستە وەك ناوێکی تایبەتی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی شارستانێتی دیموکراتی بیر لە تازەگەری دیموکراتی بکرێتەوە.

خەسڵەتە گرنگەکەی دیکە ئەوەیە تازەگەری دیموکراتی وەك جەمسەرێکی دژ لە هەر گۆڕەپان و زەمەنێك ئامادەیە، کە تۆڕەکانی (دەزگاکانی) مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تێدایە. واتا تازەگەری دیموکراتی لە هەر کات و شوێنێك لەناواخنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا هەیە، ئینجا ئەمە سەرکەوتوو یان ژێر کەوتوو بێت، بە ئازادی بارگاوییە یان کۆیلایەتییە، چوونیەکن یان جیاواز، نزیك یان دوور لە یەکسانی، واتای فێمێنیستی و ئیکۆلۆژی بەدەستهێناوە یان نا، بە کورتی دوور یان نزیکی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە.

هەرچی دەرهەق بە رێبازی چەپڕەو و راستڕەوەکانە کە لەمیانەی شۆڕش و دژە شۆڕشەوە سەرەتا دەسەڵات (لەم سۆنگەوە دەوڵەت) زەوت دەکەن، دواتر بە ئامانجی جێبەجێکردنی پیلان و بەرنامەکەیان دەبن بە "ئەندازیاری کۆمەڵگا" و لە رێگای نەخشە ناوەندییەکانەوە ئەو کۆمەڵگایانە دەخولقێنن کە بە حەسرەتییەوە بوون: چیتر ئەم میتۆدانە تەنیا وەك نامەعقوول و گوتە (رەوانبێژی)ی حەماسی هەڵناسەنگێنم، بە بایەخەوە ئاماژەی پێ دەکەم لەناوەڕۆکدا ئەمانە

یان گەمەیەکی لیبرالیزمن یان هێز و کردارێکن ئەگەر حەفتا ساڵیشی بەسەردا تێپەڕیووبێت. لەهەرسکردنیدا زەحمەتی نابینێت.

سروشتە کۆمەڵایەتییەکانیش هاوشێوەی سروشتە بایۆلۆژییەکان خاوەن کۆدی بۆهێڵین. ئاگاداری مەیلی بایۆلۆژیم، دەزانم کە گواستنەوەی بۆ سروشتە کۆمەڵایەتیەکان داروینیزمە و بەسیفەتی قەبەترین ماتریالیزم ماتریالی فیکری بۆ ئەندازیارێتی کۆمەڵگا دابین دەکات. ئەو بابەتەی باسم کرد، ئاماژە بە هەستیارییە تایبەتەکانی کۆمەڵگا مێژووییەکان دەکات سەبارەت بە توانای هەموارکردنی یادگا و تایبەتمەندێتییە بونیادییە سەرەکییەکانی، بەو سیفەتەی سروشتێکە خاوەن بەرزترین ئاستی ژیرییە و بەو رادەیەش بۆ بڕاری ئازادی کراوەیە. وەك چۆن لە میانەی گۆڕینی کۆدی بۆهێڵییەوە رووەك و ئاژەڵی دەستکاریکراو پێدەگەیەنرێت، ناتوانین کۆمەڵگاکان بگۆڕین، چونکە یانگای سروشتی کۆمەڵگا لەخۆڕا ئەمەی بە سیفەتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەستنیشان نەکردووە. هەر بۆیە زۆر گرنگە بزانین تەنیا لەکاتێکدا ئاستی کۆمەڵگای ئەخلاقی بەرز بکرێتەوە دەشێت رێگای گۆڕانکاری کۆمەڵگا رەوا ببینرێت، لەرەوشێکی پێچەوانەدا لەمیانەی سەرجەم پەیڕەوە تۆتالیتار و سەرەڕۆکان ئاستی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەخرێت، هەر بۆیە ئەنجامەکەی هەرچییەك بێت رەوا نابینرێت.

تازەگەری دیموکراتی خەسڵەتی ئەو سیستەمەی هەیە کە رێگای گۆڕانکاری رەوا بە کراوەیی دەهێڵێتەوە. بەرزی ئاستی بەها ئەخلاقی و سیاسییەکەی گرێدراوی ئەم ناوەڕۆکە سیستەماتیکەیەتی. لەگەڵ ئەوەی رێگای گۆڕانکاری رەوا زۆر گرنگە بەڵام زۆر سادەیە. هەر ئەندامێکی ئەم کۆمەڵگایە لە هەر کوێ و زەمانێك بێت دەتوانێت کۆمەکی خۆی پێشکەش بەم گۆڕانکاریە بکات. ئەو تاکەی لەناو پاشماوەکانی کۆمەڵگای نیولیتیك تەنانەت لەناو پاشماوەکانی کۆمەڵگای کلاندا دەژێت، لەگەڵ ئەندامێك کە لە نیویۆرك یان مۆسکۆدا دەژی هەر ئان و ساتێك پۆتانسێلی پێشکەشکردنی کۆمەکیان بە گۆڕانکاری هەیە. هەروەکو چۆن لەم پێناوەدا باسە پیرۆزەکان مەرج نییە، ئەوا چالاکییەکانی قارەمانێتیش مەرج نییە. تاکە مەرج توانای پیشاندانی بەهرەی بیرکردنەوە و رەفتاری ئەخلاقی و سیاسییە بەو سیفەتەی ئۆخی هەبوونی بنەڕەتی سروشتی کۆمەڵایەتییە، هەروەها کارلکردنی ئەم بەهرە(فەزیلەت)یە کە دڵنیاین لە هەر تاکێکدا هەیە ئەگەر لە ئاستێکی نزمیشدا بێت. بێگومان لەم رێگایەوە ناخوازم بڵێم کە باسە پیرۆز و شکۆدارەکان بێ بایەخن، کە بە درێژایی تەمەنی کۆمەڵگای مێژوویی سەریهەڵداوە و لەپێناو رۆشنکردنەوەی رێگای رەوای گۆڕانکاری کراوەتە موڵکی یانگای مرۆڤایەتی. بە پێچەوانەوە کاتێك

رێگای رەوای گۆڕانکاری لەلایەن پاوانە ماددی و ئایدیۆلۆژییەکانەوە دابخرێت، رۆڵ و ئەرکێکی مەزن دەکەوێتە سەر ئەم باسانە. دیسان بە هەمان شێوە لەو رێگایەی بەرەو ئازادی دەچێت چالاکییەکانی قارەمانێتی بەهایەکی دەستلێبەرنەدراویان هەیە. گرنگ ئەوەیە بزانین ئەگەر هەوڵە سەرتاسەرییەکانی کۆمەڵگای مێژوویی نەبێت گۆڕانکاری لە تازەگەری دیموکراتیدا بەدی نایەت. نکوڵی لە رۆڵی کەسایەتی و رێکخراوە گرنگەکان ناکرێت. بەڵام تا نەکرێت بە موڵکی شانەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و مێژوویی، هەروەها بەرێگای رەوادا تێپەڕ نەبێت ئەم رۆڵە واتایەکی ئەوتۆی نابێت.

هەمان خاڵ بۆ شۆڕشەکانیش لەجێگای خۆیدایە. ئەو پەرەسەندنە کۆمەڵایەتییەی بەرێگای رەوادا تێپەڕ نەبێت و نەکرێتە موڵکی شانەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، پێویستە بە گۆڕانکارییەکی خۆڕسکانەی سروشتی کۆمەڵگا ناو نەبرێت، چونکە کۆمەڵگاکان ناخولقێندرێن، بەڵکو بابەتی ژیانکردنن. بێگومان جیاوازی لەنێوان چۆنییەتی ژیان و ژیانێکی دیکەدا هەیە. هەروەك چۆن ژیانێکی ئازاد، یەکسان و دیموکراتیك بوونی هەیە، هەروەها ئەو جۆرە ژیانانەش جێگای باسن کە لەژێر دیکتاتۆرییەت و نایەکسانی و کۆیلایەتییەکەیدا بەرگە ناگیرێت. لەوانەیە چەندین جۆری ژیان هەبێت، بەڵام لەژێر تەولوی ئەم هەلومەرجانەدا تازەگەری دیموکراتی گوزارشت لەو هزر و بونیادە دەکات کە لەمیانەی سەرجەم پەیرەوەکانەوە ژیان ئازاد، یەکسان و دیموکراتییانە دەکات. لە هەڵگرتن و لابردنی بەردێك کە کەوتۆتە سەر رێگاوە تا دەگاتە هەڵگیرسانی شۆڕش کە وەك تاکە رێگای رەوا مابێتەوە، لە چوارچێوەی تازەگەری دیموکراتیدا بەهادارن. بەرامبەر بەمەش، لە هەمان چوارچێوەدا بیر لە رزگاری ئیلاهی و سۆفیگەرایی قەدەرگەرایی کۆیلانە ناکرێتەوە و تەنانەت بەنەخلاقیش دانانرێن. لەژێر رۆشنایی ئەو پەند و ئەزموونانەی دەتوانین لە تێکۆشانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی وەریبگرین، لە قۆناخی قەیرانی بونیادی و سیستەماتیکی هەژموونگەرایی سەرمایەداری فینانسی جیهانگیری رۆژگاری ئەمڕۆمان دەتوانین تازەگەری دیموکراتی بەهێز بکەین، تەنانەت لەمیانەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەوە دەتوانین هەندێك لایەنی نوێ بکەینەوە. لەم سۆنگەیەوە قاڵبوونەوە و رۆشنبوونەوە سەبارەت بە رەهەندە سەرەکییەکانی تازەگەری دیموکراتی ئەمجۆرە هەوڵانەمان بەسەرکەوتنی زیاتر دەگەیەنێت.

**و ـ ڕەهەندی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی (کۆمەڵگای دیموکراتیك)**

هەروەکو چۆن دەتوانرێت لەژێر سێ ڕەهەندی گرنگەوە بیر لە مۆلێرنیتەی سەرمایەداری بکرێتەوە، دەشێت هەڵوێستێکی هاوشێوە سەبارەت بە تازەگەری دیموکراتیش جێگای باس بێت. بەرامبەر بە کۆمەڵگای بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، کۆمەڵگای پیشەسازی و کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە کە وەك ماهییەتی تایبەت و نابەردەوامە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بیری لێدەکرێتەوە، ڕەهەندەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، کۆمەڵگای ئیکۆ ـ پیشەسازی و کۆمەڵگای کۆنفیدراڵی دیموکراتی وەك ڕەهەندەکانی تازەگەری دیموکراتیك دەردەکەونە پێش. سەبارەت بە هەردوو سیستەمیش لە وردەکاریدا دەتوانرێت ڕەهەندەکان زیاد بکرێت. بەڵام بە هێڵە گشتییەکانییەوە ئەم ڕەهەندە سێیانەیە واتای پێویست بە پێناسەکانیان دەبەخشێت. لە بەشەکانی پێشووتردا بەشێوەیەکی فراوان شیکارمان دەرهەق بە ڕەهەندەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامدابوو. هەرچی تازەگەری دیموکراتییە لەمیانەی چوارچێوەی پێشکەوتنی مێژوویی و باسکردنی فاکتەرە سەرەکییەکانی و بەراوردکردنی لەگەڵ مۆدێرنیتە و شارستانی کلاسیك هەوڵی خستنەڕووی درابوو. هەربۆیە جیاکردنەوەی بەشێوەی ڕەهەندە سەرەکییەکان و لە نزیکەوە پێناسەکردنیان، باس و هەڵوێستە کردارییەکانی بەهێز دەکات.

هەروەها دەمانتوانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی وەك کۆمەڵگای دیموکراتی (کۆمیناڵی دیموکراتی) پێشکەش بکەین. چونکە دەشێت گونجاوترین پۆلێن بێت کەبەرامبەر کۆمەڵگای سەرمایەداری وەڵام بداتەوە. هەروەها لەبەر ئەوەی سروشتەکەی کۆمەڵگای دیموکراتی لەخۆوە دەگرێت، لە بەبنەما گرتنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی وەك زاراوەیەکی پۆلێنی سەرەکی دوودڵیمان نەکرد. لە بەشە جیاوازەکاندا بابەتەکەمان تاوتوویێ کردووە. هەربۆیە ئەوەی لێرەدا ئەنجامی بدەم کۆکردنەوە و ئامادەکردنێکی بنەڕەتییە. بەر لە وەسفکردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، چەند خاڵێکی گرێدراو بە ناوەڕۆکەکەی دووبارە بکەینەوە لەجێگای خۆیدا دەبێت. ئەویش پەیوەندی گەوهەرییانەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە لەلایەکەوە لەگەڵ چاکە، بەختەوەری، ڕاستی و جوانی، لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ ئازادی، یەکسانی و دیموکراسیخوازیی. چاکە و بەختەوەری لەبنەڕەتدا گەوهەری ئەخلاق پێکدێنن. دروستیش پەیوەندی بە حەقیقەتەوە هەیە. لەدەرەوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی گەڕان بەدوای حەقیقەتدا بێهوودەیە. چونکە ئەوەی خاوەن خەسڵەتە ئەخلاقی و سیاسیەکان نەبێت حەقیقەت نادۆزێتەوە. هەرچی جوانییە، ئامرازی زارلوەی جوانناسی (ئەستاتیکا)یە. من بەخۆم جوانی دەرەوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و

سیاسی بە جوانی دانانێم. چونکە جوانی ئەخلاقی و سیاسییە!. هەرچی سێیانەکەی دیکەیە، ئازادی، یەکسانی و دیموکراسییە چەندی بڵێی پەیوەندییەکەی لەگەڵ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی شیکار کراوە. هیچ کۆمەڵگایەك بە قەدەر کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ناتوانێت ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی بەرهەم بهێنێت و دەستەبەر بکات.

یەکەمین بابەتی کۆکردنەوە پەیوەست بە ئاسۆ و توانای گۆڕانکاری و وەرچەرخانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. بەو سیفەتەی پێکهاتە و هەبوونە سەرەکییەکەیەتی تا رەهەندی ئەخلاقی و سیاسیەکەی لە ئارادابێت بە کۆمەڵگایەك دادەنرێت کە خاوەن بەرفراوانترین ئاسۆ و توانای گۆڕانکاری و وەرچەرخانە. بێگومان لە هیچ کۆمەڵگایەکدا ناتوانرێت ئەخلاق و سیاسەت بە تەواوی لەناوببرێت. بەڵام رۆڵەکەیان تا دوارادا سنووردار و تەسك دەکرێتەوە. بۆ نموونە لە کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا، لە ژێر حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا ئەخلاق و سیاسەت بۆ نزمترین ئاست بچووك کراوەتەوە، تەنانەت بە جۆرێك تەسك کراوەتەوە کە بە سنوورەکانی لەناوچوون گەیشتووە. بەدرێژی هەڵوەستەمان سەبارەت بە هۆکار و ئەنجامەکانی کردبوو. ئایا لە رەوشێکدا ئەخلاق سنورداربکرێت کۆمەڵگا گۆڕاوە؟ نەخێر. بەپێچەوانەوە تەسك کراوەتەوە، گۆڕانکاری و جیاوازییەکەی وەستێنراوە، تەنانەت ناچاری چوونییەکی کراوە و لە ژێر ستاتۆیەکی حقوقی زۆر دژواردا تووشی خنکان بووە. ئاسۆ و توانای گۆڕان لەولاوە بمێنێت، لەپێناو پێگەیاندنی یەك چەشنە کلتوور و هاووڵاتی لە ژێر ناوی هۆمۆژەن (چوونیەك) کردندا بۆ دووالیزمی ئێمە ـ ئەوانی دیکە بچووك و تەسك کراوەتەوە. لە رواڵەتدا دیمەنێکی هەمەڕەنگ پیشان دەدرێت، وەك بڵێی کۆمەڵگای مۆدێرن لەناو گۆڕانکارییەکی بێ سنووردایە. ئەمە دیمەنێکی میدیاییە و بەتەواوی ئامانجەکەی پڕوپاگەندەیە. رەنگە شاراوەکەی ژێری یەکڕەنگە، یان نزیك بە خۆڵەمێشییە یان رەشێکی تێرە.

بەرامبەر بەمەش کۆمەڵگای دیموکراتی کە نۆخی تازەگەری دیموکراتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە، ئەو کۆمەڵگایەیە کە هەرە زێدە لەناو بەرفراوانترین جیاوازی و هەمەڕەنگیدا دەژی. بەبێ ئەوەی مەحکومی هاووڵاتێتی و کلتووری یەکچەشنی بکرێت، هەر گرووپێکی کۆمەڵایەتی دەتوانێت لەناو ئەو جیاوازییانەدا بژی کە لەدەوروبەری ناسنامە و کلتووری خۆی پێکدێت. لە جیاوازی ناسنامەوە تا دەگاتە جیاوازییە سیاسییەکان جڤاتەکان دەتوانن پۆتانسێلی خۆیان بخەنەڕوو و بۆ ژیانێکی کارا و چالاکی وەرچەرخێنێت. هیچ جڤاتێك نیگەرانی هۆمۆژەنێتی نییە. چونکە یەکڕەنگی بە قێزەونی، بێزاری و هەژاری دادەنرێت. هەرچی فرە رەنگییە دەوڵەمەندی،

لێبووردەیی و جوانی لەخۆوە دەگرێت. لەم هەلومەرجانەدا ئازادی و یەکسانییەکی زیاتر دەستەبەر دەبێت. تەنیا ئەو ئازادی و یەکسانییە بەهادارن کە پشت بە جیاوازییەکان دەبەستن. هەرچی ئەو ئازادی و یەکسانییە کە بەدەستی دەوڵەت ـ نەتەوە بەدیهاتووە، هەروەك لە تەواوی ئەزموونەکانی جیهانیشدا سەلمێنراوە تەنیا لەپێناو پاوانەکانە. چونکە یەکسانی و ئازادی راستەقینە لەلایەن پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵاتەوە نابەخشرێت، بەڵکو تەنیا لەمیانەی شێوازی سیاسەتی دیموکراتیانەی کۆمەڵگای دیموکراتییانەوە بەدەست دەهێنرێت، لە رێگای بەرگری گەوهەریشەوە دەپارێزرێت.

لەوانەیە ئەم پرسیارە بکرێت: سیستەمێك چۆن ئەم هەموو جیاوازییەی پێ هەڵدەگیرێت؟ ئەو وەڵامەی بدرێتەوە، یەکێتی لە بناخەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیدایە. تاکە بەهای کە هیچ تاك و گروپێك سازشکاری تێدا ناکات و دەستبەرداری نابێت، سووربوونە لەسەر مانەوە بەشێوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی. تاکە مەرجی پێویست بۆ جیاوازییەکان، ئازادی و یەکسانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. چەندەی بەسەر دەچێت کۆمەڵگای دیموکراتی وەك دۆخی هاوچەرخ (مۆدێرن)ی کۆمەڵگای مێژوویی خۆی دەسەلمێنێت.

لیبرالیزم بەو سیفەتەی ئایدیۆلۆژیای ناوەندی سیستەمی فەرمییە لەپێناو سەرلوبنکردنی ئەم راستییە ئامراز و بەڵگەگەلێکی زۆر بەکار دێنێت. تەنانەت هێندەی نەماوە خۆی لەگەڵ دیموکراسی بکات بەیەك. تێکەڵاوی و ئاڵۆزییەکی تەواوی زاراوەکان دروست دەکرێت. بەرچاوترین نموونەی ئەمەش، سەرباری ئەوەی لیبرالیزم ئایدیۆلۆژیایە بەڵام خۆی لەگەڵ دیموکراسی هاوواتا دەکات کە سیستەمێکی سیاسییە. کەچی لەناوەرۆکدا بەواتای ئەو وێرانکارییانە دێت کە تاك بەرامبەر بە کۆمەڵگا خولقاندوویەتی. ئەمەش لەلای خۆیەوە باڵادەستی پاوانەکان بەسەر کۆمەڵگادا دەسەلمێنێت. بەهۆی هەرجۆرە مەیلێکی تاکرەوی نادیموکراتییانە و بونیادە نادیموکراتییەکەی لە خێزانەوە تا دەگاتە دەوڵەت بەرەو دیکتاتۆرییەت دەچێت. هەرچی تاکێتی دیموکراتییە جیاوازە. بەو سیفەتەی دەنگی هاوبەش و بریاری کۆمەڵگایە تاك دەردەخاتە پێش. تەنیا کاتێك ئەم دەنگ و بەبریاربوونە بە بنەما بگیرێت، تاك بەهادار دەبێت. پێگەیەکی رێزدار لەناو کۆمەڵگا بەدەستدێنێت. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا بەو سیفەتەی تاکرەوێتی لیبرالیزم جۆرێك لە جۆرەکانی پاوانی بێ سنوور و لە ژمار نەهاتووە، دژە دیموکراتییە. هیچ ئاڵۆزکردنی زاراوە و چەنەبازییەکی لیبرالیزم و نیوولیبرالیزم ناتوانێت ئەم خەسڵەتە بنەرەتییەی بگۆرێت. لیبرالیزم کە وەك وشە بە مانای ئازادبوونیش بەکاردەهێنرێت، لە بواری کرداریدا سەلماندوویەتی کە لەپێناو پەرەسەندنی

بێ سنووری پاوانەکان ئەم ناوەی لەخۆی بارکردووە. ئەو ئازادییەی لە روالەتدا پێشکەش دەکرێت، لە بواری پراکتیکیدا کۆت و زنجیرێکی ماددی و ئایدیۆلۆژی هەمەجۆری ئەوتۆی لێدراوە کە تەنانەت لە مێژوو و لە رژێمە فیرعەونیەکانیشدا نەبینراون. تەنیا کاتێک بە رەهەندی کۆمەلایەتییەوە پالپشتی بکرێت ئازادی راستەقینە لەناو کۆمەلگایەکدا واتادار دەبێت. هەرچی ئەو ئازادییانەی تاکە کەسە کە پالپشتی کۆمەلگای لە پشتەوە نییە تەنیا واتای پاشکۆیەتی بۆ ویژدانی پاوانەکان دەبەخشێت، ئەمەش گوزارشت لە تۆخێکی پێچەوانەی رۆحی ئازادی دەکات. هەلبەتە لیبرالیزم کێشەیەکی نییە ناوی یەکسانی بێت.

لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا کۆمەلگای ئەخلاقی لە خراپترین تۆخی گەمارۆدان دایە، لە بێ رۆلی و بێ بایەخترین رەوشی مێژووی خۆیدا دەژی. هەروەها بەجۆرێک کۆدەکانی حقوق لەجێگای رێسا ئەخلاقییەکاندا جێگیرکراون کە لەهیچ سەردەمێك و قۆناغێکی مێژوودا نەبینراوە. چینی بۆرژوازی ئەخلاق دەخاتە پەراوێزەوە و لەژێرناوی حقوقەوە تا وردترین داتاکانییەوە بالادەستی چینایەتی خۆی دەکات بە جفرە و کۆد و بەسەر کۆمەلگایدا دەسەپێنێت. کۆمەلگای حقوقی لەجێگای کۆمەلگای ئەخلاقی جێگیر دەکرێت. لێرەدا رووبەرووی گۆرانکارییەکی زۆر گرنگین، چونکە لە مێژوودا هەولەکانی قانوونگەرایی رووبەرووومانە، بەلام هیچ یەکێکیان هێندەی ئەوەی سەردەمی مۆدێرنیتەی بۆرژوازی لەناو وردەکاری داتاکاندا نەخنکێندرلوە. لە بنەرەتدا ئەوەی لەژێر ناوی حقوقدا ئەنجام دەدرێت پاوانخوازی چینە، ئافراندنی پاوانخوازی حقوقە. چونکە ناشێت سروشتێکی یەکجار ئالۆزی وەك کۆمەلگا لە رێگای حقوقەوە بەرێوەببرێت. بێگومان بەو مەرجەی عادیلانە بێت جێگای حقوق لەناو کۆمەلگادا هەیە، لەم چوارچێوەیەدا دەستلێبەرنەدراوە. بەلام ئەوەی لەژێر ناوی حقوقی پۆزێتیڤیستەوە لەلایەن دەولەتەوە بەسەر کۆمەلگادا دەسەپێنرێت حقوقی عادیلانە نییە، بەلکو پاوانخوازی نەتەوە و چینی دەسەلاتدارە کە چۆتە ناو حقوقەوە، رێساگەرایی دەولەت ـ نەتەوەیە. وێرانکردنی ئەخلاق لەگەل وێرانکردنی کۆمەلگا هەمان واتایان هەیە، رووداوەکان ئەم راستییە دەسەلمێنن. کۆمەلگا بەرچاوەکانی لەجۆری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و روسیا تەنانەت یەك کاتژمێریش بەبێ ستاتۆ، واتا بەبێ هەبوونی رێسا فەرمییەکانی حقوق ناتوانن لەسەر پێیان بمێنن. هەر وەکو لە قۆناغەکانی قەیراندا بینیومانە ئەگەر حقوقی فەرمی نەبێت ناوەبەناوە کۆمەلگا دەبێتە گۆرەپانێکی ترس و پەژارە.

لەبنەرەتدا ئەم رەوشە گوزارشت لە راستییەك دەکات. کاتێك دەولەت ـ نەتەوەمان پێناسە کرد گووتمان تۆخی شەرێکە کە تا شانە و مەمیلەکانی کۆمەلگا سەپێنرلوە. لە قۆناغەکانی

تەنگەژە و قەیراندا ئەم راستییە دەسەلمێنرێت. کۆمەڵگاکانی حقوقی فەرمی گەورەترین پۆتانسێلی قەیران لە خۆوە دەگرن. هۆکارەکەش بێ بەشبوونێتی لە پرەنسیپی ئەخلاقی. ئەگەر لە ئاستی کارەساتدا ژینگە دووچاری قەیران هاتووە، هۆکاری ئەمە شانبەشانی نەبوونی رەهەندی ئەخلاقی بۆ پێشنەخستنی حقوقی ژینگەش دەگەڕێتەوە. وەك دەزانرێت ژینگە بابەتێك نییە لەرێگای حقوقەوە بپارێزرێت، چونکە بێ سنوور و ناکۆتایە، هەرچی کاریگەری حقوقییە تا دواڕادە سنوورەکان تەسك دەکاتەوە. لەم سۆنگەیەوە" کەوتن و بێبەری بوون لە پرەنسیپی کۆمەڵگای ئەخلاقی لە ژێر کێشەی ئیکۆلۆژیدا شاراوەیە. کۆمەڵگایەك شوێنگەی شایستە بە پرەنسیپی کۆمەڵگای ئەخلاقی نەدات نە لەناو بونیادەکەی، نە لەدەوروبەر و ژینگەکەی دەرفەتی بەردەوامبوونی نامێنێ. واقیعی ئێستامان زۆر باش ئەم مەسەلەیە روون دەکاتەوە.

هەمان خاڵ بۆ پرەنسیپی کۆمەڵگای سیاسیش لەجێگای خۆیدایە. کاتێك ئیرادە بیرۆکراتییە زەبەلاحەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەجێگای سیاسەت دابنرێت، رۆڵ و چالاکی دیموکراتییانەی کۆمەڵگاکان نامێنێت. ئیرادەگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە کە بۆ ناو وردترین شانە و مەمیلەکانی کۆمەڵگا دزەی کردووە بەم رەوشەیەوە گوزارشت لە دۆخی ئیفلیجی کۆمەڵگا دەکات. کۆمەڵگایەك سەرجەم کردەکانی کارە هاوبەشەکانی بۆ بیرۆکراسی جێهێشتبێت، لە راستیدا هەم لە بواری زهنییەوە هەمیش لەبواری ئیرادەوە دووچاری دۆخێکی ئیفلیجی هاتووە. ئەورووپا کە هەستی بەمە کرد، هەروا بەبێ هۆکار بە هەموو هێزییەوە خۆی لە پرەنسیپی سیاسەتی دیموکراتییەوە نەپێچاوە. پێشکەوتنە کەمەکەیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شانبەشانی بیرۆکراسی دەرفەتی بە سیاسەتی کۆمەڵایەتی داوە – هەر چەندە سنوورداریش بێت –.

بە تێڕوانینی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتە کۆمەڵگای سیاسی هەڕەشەیەکە بەرامبەر بە هەبوون، یەکێتی و یەکپارچەییەکەی. ئیدارەگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەش چوارچێوەی گەمارۆدانی فاکتەری سیاسی تێپەڕ کردووە کە گوزارشت لەدۆخی هەبوونی کۆمەڵگا دەکات و بەشێوەیەکی کردەیی ئیفلیجی کردووە، هەروەها بیرۆکراسییەکەشی تەنیا وەك شمشێری دیموکلیس لەسەر سەری کۆمەڵگا رانەگیراوە، بەڵکو کانتۆمێر بە کانتۆمێر کۆمەڵگا لەت لەت دەکات. هەروەك چۆن ئەمە سەرەکیترین کێشەی فەلسەفەی سیاسی سەردەمەکەمانە، لەهەمانکاتدا بە سیفەتی فاشیزم لەبواری کرداریدا گەورەترین کۆسپی بەردەم ژیانە. پێشتر گوتبووم وەك کەس هیتلەر دۆڕا، بەڵام سیستەمەکەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لەبواری لەناوبردنی کۆمەڵگای سیاسیدا دەوڵەتگەرایی

نەتەوە یەکسانە بە فاشیزمی هیتلەر (ئەگەر هیتلەر یەکەمین کەسیش نەبێت کە لەمەدا سەرکەوتووە، بەڵام ئەو کەسەیە کە بەشێوەیەکی فەرمی رایگەیاند و خاوەندارێتی کرد).

ئەو کۆمەڵگایەی پرەنسیپی سیاسی نییە، یان لەکار خراوە یاخود لەناوبراوە، بەڵکو تەنیا لاشەیەکی سارنوسرە. باشترین نۆخیشی کۆمەڵگایەکی کۆلۆنیکراوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ئەو رۆڵەی کۆمەڵگای دیموکراتیک بە پرەنسیپی سیاسی بەخشیوە گرنگییەکی ژیانی هەیە. باڵابوونی وەك سیستەم سەرەکیترین بەڵگەی ئەم راستییەیە.

بەواتایەك لە واتاکان مێژووی شارستانی مێژووی تەسککردنەوە، بێ رۆڵ و بێبایەخ کردنی کۆمەڵگای سیاسییە. گۆڕینی کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵگای چینایەتی تەنیا لە دەرەنجامی سەرکوتکردنی ململانێی سیاسی دژوار و یەکلابوونەوەی بەلایەنی دەوڵەتدا فەراهەمبووە. پێویستە بە بایەخەوە سەرنجی ئەم خاڵە بدرێت. تەنانەت مارکسیستەکانیش کە هەرە زێدە خەریکی کێشەی ململانێ و تێکۆشانی چینایەتی بوون، نەیانتوانیوە بەشێوەیەکی راست سروشتی جیابوونەوەی چینایەتی دەستنیشان بکەن. تەنانەت جیابوونەوەی چینایەتییان وەك فەزیلەتێك هەڵسەنگاندووە کە شارستانی و ژیار بەرەو پێشەوە دەبات. وەك پێویستییەکی ماتریالیزمی مێژوویی، بە قۆناخ و پردێکییان داناوە کە مسۆگەر پێویستە مێژوو بەسەریدا تێپەڕێت. لە شیکردنەوەکانمدا دەرهەق بە شارستانی جیابوونەوەی چینایەتیم وەك تەسککردنەوە و لە کارخستنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی هەڵسەنگاند، بە بایەخەوە ئاماژەم بەو خاڵە کرد، چەندە جیابوونەوەی چینایەتی پێشدەکەوێت، ئەوەندەش کۆمەڵگا دەکەوێتە ژێر هەژموونگەرایی دەسەڵات و دەوڵەتەوە. لەم لایەنەوە مێژوو ململانێیەکی دژواری چینایەتییە. بەڵام خودی بە چینایەتیبوون نەك هەر تەنیا پێشکەوتن و پەرەسەندن نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دولکەوتن و داڕووخانە. لەبواری ئەخلاقییەوە گۆڕانکارییەکی نەرێنییە نەك ئەرێنی. راگەیاندنی جیابوونەوەی چینایەتی وەك وێستگەیەکی دەستلێبەرنەدراوی پێشکەوتن، بەتایبەتیش ئاماژە پێکردنی وەك گوزارشتێکی مارکسیانە، هەڵەیەکی جددییە کە تێکۆشانی ئازادی تێیکەوتووە.

کاتێك کۆمەڵگای سیاسی لەگەڵ کۆمەڵگای چینایەتیدا بەراورد دەکەین، راسترین پێناسەی، بەرخودانی بەردەوامێتی بەرامبەر بە جیاوازی چینایەتی. باشترین کۆمەڵگا ئەوەیانە کە کەمترین جیاوازی چینایەتی ئەنجام دەدات. سەرکەوتنی تێکۆشانی سیاسیش لەوەدایە کە دەستەمۆی جیابوونەوەی چینایەتی نەبێت. هەروەها تێکۆشانێکی سیاسی سەرکەوتووانەش تەنیا لەمیانەی رێنەدان بەجیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگاکەی دێتە دی، لەم سۆنگەیەوە" لە رێگای نەکەوتنە

ژێربـاری توندوتیـژی یەکلایەنـەی دامـەزراوەکانی دەوڵـەت و دەسـەڵاتەوە دەسـەلمێنرێت. لـەو کۆمەڵگایانـەی تـا بینـە قاقایـان لـەناو توندوتیـژی دەوڵـەت و دەسـەڵات لـە ئـارادان، باسـکردنی تێکۆشـانێکی سیاسـی سـەرکەوتوو خـۆ فریـودانێکی مەزنـە. نموونـەییترین تۆخ سـەبارەت بـە کۆمەڵگای سیاسی: یان هیچ خۆی نەخستۆتە ژێر توندوتیژی دەسـەڵات و دەوڵـەت (هێنـدە گـرنگ نییە کە ئەم توندوتیژییە ناوخۆیی یان دەرەکی، میللی یان نـامیللی بێـت) یـاخود لـە دەرەنجامی تێکۆشانێکی دژوار و لەسەر بنەمای رێککەوتنێکی نێـوان هـەر دوولا دان بـە دەسـەڵات و دەوڵـەت دادەنرێت.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دوا قۆناخی شارستانییە کە تێیدا کۆمەڵگای سیاسی تەسك دەکرێتەوە و لەکار دەخرێت. پێویستە باش دەرك بەم مەسەلەیە بکرێت. بەو سیفەتەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییە بەگوێرەی لیبرالیزم تێکۆشانی سیاسی، تەنانەت سیاسەتی دیموکراتیش لەسەردەمی ئەودا تا دوا رادە پێشکەوتووە. ئەم بانگەشانەی لە رواڵەتدا راست دەبینرێت، بەڵام لە ناوەڕۆکدا پێچەوانەیە. چونکە لەئەنجامی پێشخستنی بێ سنووری تاکڕەوێتی و پاوانخوازێتی قۆناخێکە کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە بێ کاریگەرترین تۆخی خۆیدایە. دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی بەرزترین یان زۆرترین رادەی دەسەڵاتە، بە واتای بەرزترین ئاستی کۆمەڵگای ناسیاسی دێت. واتە دەوڵەت ـ نەتەوە کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە ئاوا دەکات. تەنانەت شتێك لە ئارادا نامێنێت ناوی کۆمەڵگا بێت. وەك بڵێی کۆمەڵگا لەناو دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆمپانیا جیهانگیرییەکاندا توێنراوەتەوە. لەم حاڵەدا میشێل فۆکۆ بەرگریکردن لەکۆمەڵگا بە بناخەی ئازادی دادەنێت. لەدەستدانی کۆمەڵگا (لەلایەن پاوانەکان و تاکڕەوێتی زێدەڕۆیانە، لەلایەن خودی مۆدێرنیتەوە) تەنیا وەك لەدەستدانی ئازادی هەڵناسەنگێنێت، بەڵکو وەك لەدەستدانی مرۆڤیشی هەڵدەسەنگێنێت.

لەم چوارچێوەیەدا بەو رادەیەی کۆمەڵگا بپارێزرێت تازەگەری دیموکراتی تاکە دەرەتانی بەدەستهێنانی ئازادییە. ئەو کۆمەڵگایەی لەرێگای سیاسەتی دیموکراتییانەوە خۆی بپارێزێت (بەرامبەر بە تاکڕەوێتی و دەوڵەت ـ نەتەوە و پاوانەکان) شانەی سیاسی خۆی کارا دەکات و دەتوانێت خۆی بۆ کۆمەڵگایەکی دیموکراتی هاوچەرخ وەرچەرخێنێت. کۆمەڵگای دیموکرات و هاوچەرخیش، بەو سیفەتەی کۆمەڵگایەکە سەبارەت سەرجەم کارە کۆمەڵایەتییەکان بیر دەکاتەوە، رادەردەبڕێت، بڕیار دەدات و لە بواری کرداریدا جێبەجێی دەکات، جیاوازییەکان، فرەکلتووری و یەکسانی دەکات بە واقیعێکی ژیانداری، لەم چوارچێوەیەشدا باڵابوونی خۆی

دەسەلمێنێت. بەمجۆرە تازەگەری دیموکراتی تەنیا بەوە ناوەستێت تێکۆشانی چینایەتی لەسەر بنەمایەکی راست ئەنجام بدات، لە هەمانکاتدا لەرێگای خولقاندنی دەسەلات یاخود دەولەتێکی نوێشدا کۆمەلگای خۆی ناخنکێنێت (هەلە ترازیدی و مێژووییەکەی ریال سۆسیالیزم)، ناکەوێتە ئەم تەلەزگە مێژووییەوە. چونکە دەزانێت چەندە ببێت بە دەسەلات و دەولەت بەو رادەیە جیاوازی چینایەتی پێش دەکەوێت، لەم سۆنگەیەوە" تێکۆشانی چینایەتی دووچاری شکست دێت. هەربۆیە پێویستە ئەم دەرك پێکردنە وەك گرنگترین و سەرەکیترین خەسلەتەکانی خۆی دەستنیشان بکات.

وەك دەرکـی پێـدەکرێت لەمیانـەی تازەگـەری دیموکراتییـەوە جـۆرێکی نـوێی کۆمـەلگا ناخولقێنرێت کە سیستەمەکەی سەرمایەداری یان سۆسیالیزم بێت. بـەلکو ئامـاژە بـەوە دەکـات، ئـەم زارلوانـە لـە وەسـفکردنی کۆمـەلگا دوورن و دەسـتەواژەیەکی پڕوپاگەنـدەیین. بێگومـان کۆمەلگایەك ئاوا دەکرێت، بەلام ئەمە کۆمەلگای دیموکراتی هاوچەرخە کـە پرەنسیپی ئـەخلاقی و سیاسی لەبەرزترین ئاستدا رۆلی تێدا دەبینێت. جیاوازی چینایەتی دەرفـەتی پـەرەسـەندنی نییـە، یان دامەزراوەکانی دەولەت و دەسەلات لـە سـەپاندنی توندوتیـژی مایـەپووچ دەبـن یـان لـەرێگای رێککەوتنێکی دوو لایەنە دان بە یەکتریـدا دەنـێن، بـەمجۆرە یـەکێتی لـەناو جیاوازیـەکان ژیانداری دەکرێت، یەکسانی و ئازادیش هەم وەك تایبەتمەندێتییەکی کەسێتی تـاك (نـەك تـاکرەوێتی) هـەم وەك خەسلەتی کۆمەلگابوون جێگای باس دەبێت. یەکسانی و ئازادی و دیموکراسی زیاتر بەرهەمی ئـەو گۆڕانکـاری و پێشـکەوتنەیە کـە وەك پێویسـتییەکی سروشـتی ئـەم کۆمەلگایـە دامـەزراوەی سیاسەتی دیموکراتی رێگای لەپێش کردۆتەوە.

### ر ـ رەهەندی کۆمەلگای پیشەسازی ئیکۆلۆژی

بناخەی رەهەندی پیشەسازی و ئابووری تازەگەری دیموکراتی ئیکۆلۆژییە. بەتایبەتی پێناسەیەکی راست سەبارەت بە ئابووری گرنگە و کارێکی لەپێشینەیە. لەم لایەنەوە دەرککردن بەم راستییە بەر لە هەمووشتێکەوە دێت: ئابووری ـ سیاسی ئامرازێکی سەرسوڕهێنەری شێواندن و پەردەپۆشکردنە. بەتایبەتیش دەستەواژەی "ئابووری سەرمایەداری" ئامرازێکی پڕوپاگەندە و سەفسەتەیەکی پووچە. هەروەك لە بەرگەکانی دیکەدا شیکارمان کرد، خودی سەرمایەداری ئابووری نییە، بەلکو دوژمنی ئابوورییە. رێکخراوی تۆڕێکی سیستەماتیکە (لەسەر هەژموونگەرایی کلتووری ماددی و مەعنەوی قالبۆتەوە) کە لەپێناو قازانجی پاوانەوە گۆی زەوی بەدۆخێك

دەگەیەنێت دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێت (جگە لە دەستەی فیرعەون و نەمرد) و لەناوەڕۆکی خۆیدا پشت بە تالانکردنی بەهاکانی کۆمەڵگا (نەك تەنیا زێدەبەها) دەبەستێت. جیاوازییەکەی لەگەڵ چل جەردە و چەتەکان ئەوەیە ئەم تۆڕانە رەوابوونێکی ئایدیۆلۆژی هەمەلایەن، دەمامکی یاسایی و پاڵپشتی دەسەڵات بۆ خۆیان دابین دەکەن. چونکە لەرێگای ئەم ئامرازانەوە هەوڵی شاردنەوەی رووی راستەقینە و ناوەڕۆکی خۆیان دەدەن. لەمیانەی چەندین دسپلین (لقی)ی زانستییەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئابووری ـ سیاسی، خۆیان وەك خودی حەقیقەت پێشکەش دەکەن. ئەگەر ئەو قەڵغانە نەبێت کە بە توندوتیژی و ئایدیۆلۆژیایەکی مەزن چنراوە، تەنانەت بۆ تاکە رۆژێکیش ناتوانن بەردەوامی بە هەبوونی خۆیان بدەن. بەم بونیادەیانەوە چالاکی ئابووری (شێوەی سەرەکی چالاکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی) دەخەنە ژێر فشار و چەوسانەوەوە کە هەبوون و شێوازی ژیانی سەرەکی کۆمەڵگایە و واتای ژینگەش لەخۆوە دەگرێت، بەمجۆرە هەم پێشکەوتنەکەی دەوەستێنێت، هەمیش دەکرێت بەسەرچاوەی بەختەوەری کەمینەیەك.

بێگومان پێناسەکەی فرناند براودل سەبارەت بە ئابووری بەهایەکی مەزن و هێزای فێرکاری هەیە کە دەڵێت: نهۆمی ژێر زەمین (یەکەم) پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤە، نهۆمی دووەمیش گۆڕەپانی بنەڕەتی ئابوورییە کەچالاکییەکانی کالاّ لە دەورووبەری بازاڕ بەڕێوە دەچێت و جێگای پاوان و قۆستنەوەی جیاوازی نرخی تێدانییە، هەرچی نهۆمی(سێیەم) سەر ئەم دوو نهۆمەیە، بە گۆڕەپانی بنەڕەتی سەرمایەداری و دوژمنی ئابووری دادەنێت (والرشتاین ئەم دەستنیشانکردنە گرنگ دەبینێت) کە لە تۆڕەکانی پاوان و قۆستنەوەی نرخ پێکدێت. لەژێر رۆشنایی ئەم پێناسەیەدا ئاشکرا دەبێت کە وەسفکردنی سەرمایەداری بە ئابووری بازاڕ لەلایەن لیبرالیزمەوە سەفسەتەیەکی تەواوە. چونکە پەیوەندی سەرمایەداری بە بازاڕەوە، سیستەمێکی دڕندەی گەمە و تەڵەکەبازییە کە لەمیانەی یاریکردن بە نرخەکان قازانجی پاوان بەدەستدێنن، لەم پێناوەشدا لە ئەنجامدانی هیچ گەمەیەکی سەرشێتانە دوودڵی ناکات: لە دەرخستنی شەڕ و قەیرانەکانەوە تا دەگاتە ئەو ئاستەی ئابووری لە نرخی کردە و چالاکییەك دەردەخات کە پێداویستییە سەرەکییەکان دابین دەکات و بەرەو ئەو گۆڕەپانەی دەخزێنێت کە زۆرترین قازانج(یاسای زۆرترین قازانج) بە دەست دێنێت. بەڵێ دەڵێین گەمەیە، بەو سیفەتەی چالاکی و شێوازێکی هێرشکردنە کە هێندە دژی ژیانە تەنانەت کۆمەڵگای مرۆڤ لە فاکتەرە سەرەکییەکانی هەبوونیشی دادەبڕێت.

بەگشتی پاوانەکانی شارستانی، بەتایبەتیش پاوانەکانی سەرمایەداری ( کشتوکاڵ، بازرگانی، فینانس، دامەزراوەکانی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوە) بەدرێژایی مێژوو هۆکاری

سەرەکی چەواشەکارییەکانی ئابووری، قەیران، کێشە، برسێتی و هەژاری و کارەساتە ژینگەییەکان بووە. هەروەها هەموو جۆرە گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی ـ سیاسی، دەسەڵات، شارنشینی زێدەڕۆیانە (تەواوی نەخۆشییەکانی)، چەواشەکاری و شێواندنە ئایدیۆلۆژییەکان (هەموو جۆرە دۆگمایەکی ئایینی، میتافیزیکی و زانستگەرایی)، قێزەوەنییەکان (چەواشەکردنی هونەر) و خراپییەکان (نەبوونی ئەخلاق و تێکچوونی) لەسەر بنەمای ئەم فاکتەرە سەرەکییە بەرز دەبنەوە. ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نموونەیەکی لەژمار نەهاتووی سەبارەت بەم دەستنیشانکردنانە دەخاتەڕوو.

لە تازەگەری دیموکراتیدا ئابووری بەواتای راستەقینەی خۆی دەگات. گوزارشت لە بونیادێکی سیستەماتیکی واتاداری بەهاکانی بەکارهێنان (خەسڵەتی دابینکردنی گرنگترین پێداویستییەکان) دەکات کەپێویستییە سەرەکیەکانی نەوەی ژێر زەمینە، هەم بەهای ئاڵوگۆڕکردن (رادەی ئاڵوگۆڕی کاڵاکان لەگەڵ یەکتری) دەردەخاتە روو کە بازاڕێکی راستەقینەی ئابوورییە. چیتر ئابووری لەدۆخی ئەو گۆڕەپانەدا نامێنێت کە حیساب و لێکدانەوەکانی قازانجی لەسەر بکرێت. بەمجۆرە یەکلایی دەبێتەوە کە بەبێ ئەوەی پێویستییە سەرەکییەکان رێگا لە پێش جیاوازی چینایەتی بکاتەوە و زیان بە ئیکۆلۆژی بگەیەنێت، چۆن و لەرێگای کامە پەیڕەوەوە بە بەرهەمدارترین نرخ دەگەیەنرێت. بەو سیفەتەی گۆڕەپانی چالاکی کۆمەڵایەتییە، ئابووری بە واتای راستەقینەی خۆی دەگات. بەجۆرێك واتادار دەبێت کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەسەر پێش دەکەوێت، لەهەمانکاتدا وەك شێوەی سەرەکی چالاکی پەرەی پێدەدرێت.

ئابووریناسی سیاسی مارکسیشی لەناودا چەمکی ئابووری مۆدێرنیتە لە روانگەی چینایەتی (روانگەی هەژموونگەرایی بۆرژوازی) رزگاری نەبووە. لەمیانەی وابەستەکردنی بەها بە پەیوەندی نێوان کارکەر و خاوەن کار ناچار بوون زەمینەی کۆمەڵگای مێژوویی پشتگوێ بخەن و پەردەپۆشی بکەن. بەها بەرهەمێکی کۆمەڵگای مێژووییە. ئەمە لەولاوە دابنێین کە خاوەنکار و کرێکاری سازشکار دابینکاری ئەم بەرهەمە نین، بەڵکو لەپێگەی تاڵانکاریدان. بەڵگە سەلمێنەرەکەیشی زۆر روون و ئاشکرایە. ئەگەر رەنجی بێ بەرامبەری ژن نەبێت تاکە خاوەنکار و کرێکارێکی سازشکار ناتوانن سکی خۆیشیان تێر بکەن: ناتوانن گوزەرانی ژیانی رۆژانەی خۆیان بەڕێوە ببەن. تەنانەت ئەم نموونەیەش بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا رووخسارە نائابوورییەکەی سەرمایەداری پیشان دەدات. بەشێوەیەکی بەرفراوان روونمان کردەوە ئەگەر کۆمەڵگای مێژوویی نەبێت، بەگشتی شارستانی بەتایبەتیش مۆدێرنیتەی فەرمی نابێت.

لە رەهەندی ئابووری تازەگەری دیموکراتیدا هەمووێتی و یەکپارچەیی ئیکۆلۆژی و پیشەسازی بەهاکانی ئاڵوگۆڕکردن و بەکارهێنان مەرجە. سنووری پیشەسازی پشت بە ئیکۆلۆژی و سنووری پێداویستییە سەرەکییەکان دەبەستێت. واتا ئەم دوو سنوورە تێپەڕ ناکات. ئەو پیشەسازییەی لەم رەوشەدا سەرهەڵبدات پیشەسازییەکی ئیکۆلۆژییە. ئەو پیشەسازییەی ژینگەپارێز نەبێت، پیشەسازییەکی نائابوورییە. ئەو پیشەسازییەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئیکۆلۆژیا پچڕاندووە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو جانەوەرە نییە کە بووە بە ئامێر ( بەردەوام ژینگە دەخوات و لەناوی دەبات). هەروەها ئەو پیشەسازییەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئابووری پێداویستییە سەرەکییەکان لەدەستداوە جگە لە ئامانجی قازانج هیچ بەهایەکی دیکەی نییە. لەمیانەی ئەم راستییانەوە پیشەسازی ئیکۆلۆژی پرەنسیپێکی سەرەکییە. ئەو پرەنسیپە بنەڕەتییەیە کە پێویستە سەرجەم چالاکییە ئابوورییەکان پێیەوە گرێدراوبن و جێبەجێی بکەن. لە رەوشێکی وەهادا چالاکی ئابووری بەواتای راستەقینەی خۆی دەگات. بەمجۆرە دەرفەت و زەمینەی بێکاری، بەرهەمهێنانی زیاد یان کەم، ناوچە و وڵاتە زۆر یان کەم گەشەکردووەکان، دژایەتی لادێ ـ شار، هەڵدێرە چینایەتییەکان، زەمینەی کۆمەڵایەتی تەنگەژە ئابوورییەکان و شەڕ لە ئارادا نامێنێت.

بێکاری دەرەنجامێکی چەواشەکارییەکانی بونیادی ئەو ئابوورییەیە کە ئامانجی قازانجێکی رەهایە. لە رەهەندی ئابووری تازەگەری دیموکراتیدا ئەم شێواندن و چەواشەکارییە جێگای نابێتەوە. چونکە بێکاری نۆخێکی کۆمەڵایەتییە کە هەرە زێدە لەدەرەوەی مرۆڤایەتییە.

هەروەها زیادبوون یان ناتەواوی و کەمبوونی بەرهەمهێنانیش دیسان ئەنجامێکی بەلاڕێداچوونی بونیادی ئەو ئابوورییەیە کە ئامانجی قازانجە. چونکە لەکاتێکدا پێداویستییە سەرەکییەکان جێگای باس بێت و پیشەسازیش تا ئەم رادەیە گەشەی کردبێت، زیادبوون یان کەمبوونی بەرهەمهێنان هیچ واتایەکی نییە. پێویستە بە بایەخەوە ئاماژەی پێ بکەم لەدەرەوەی هەلومەرجەکانی سروشت و کەش و هەوا، بەرهەمهێنانی کەم یان زیاد کە بە ئەنقەست و لە چوارچێوەی ئیرادەی مرۆڤ بێت بەلانی کەم هێندەی بێکاری گوزارشت لە نۆخێکی دەرەوەی مرۆڤایەتی دەکات.

دیسان مەسەلەی ناوچە و وڵاتە تازە یان زۆر گەشەسەندووەکانیش گوزارشتێکی دیکەی ئەو نۆخە نامرۆڤانەیە کە ئابووری قازانج هێناویەتە ئاراوە. بەمجۆرە تۆوی هەموو جۆرە پێکدادانێك لەنێوان وڵاتان و ناوچەکان دەچێنرێت، رێگا لەپێش ئەو تەنگەژە و شەڕە خۆجێیی ـ نەتەوەیی و

نێو دەوڵەتیانە دەکەنەوە کە کۆتایی پێنایەت. زۆر ئاشکرایە ئابوورییەك کە لە خزمەتی کۆمەڵگای مرۆڤدا بێت هەرگیز رێگا لە پێش ئەم رەوشانە ناکاتەوە، پێویستە رێگاشی لەپێش نەکاتەوە.

هەروەها پەیوەندییەکانی نێوان لادێ ـ شار کە بەدرێژایی کۆمەڵگای مێژوویی لەمیانەی گونجان و دابەشکردنی کار ئاواکراوە، هەنگاو بە هەنگاو وەرچەرخانی بۆ ناکۆکی قووڵ و تێکچوونی هاوسەنگی بەلایەنی کۆمەڵگای شار، دیسان لە بنەڕەتدا پەیوەندی بەو دابەشکردنانەوە هەیە کە بە گوێرەی ئامانجی قازانجە. جێگیربوونی ئەو پەیوەندییانەی یەکتری لەناو دەبەن لەجێگای ئەو پەیوەندییانەی کەلادێ و شار، کشتوکاڵ، پیشە و پیشەسازی یەکتری بەخێو دەکەن ئەنجامێکی دیکەی مەترسیداری زیاترین قازانجە. لەکاتێکدا کۆمەڵگای کشتوکاڵ و لادێ رووبەڕووی لەناوچوون دەبێتەوە، شار و پیشەسازی کەوتۆتە قۆناخی گەورەبوونی شێرپەنجەییەوە. نەك تەنیا ئابووری تەنانەت خودی کۆمەڵگای مێژووییش رووبەڕووی لەناوچوون کراوەتەوە.

ئەو ئابوورییەی لەسەر بنەمای یاسای زۆرترین قازانج دووچاری ئەم چەواشەکاری و شێواندنانە بۆتەوە جیابوونەوەی چینایەتی و پێکدادانی سیاسی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. رێگای لەپێش هەموو جۆرە شەڕێکی خۆجێیی، نەتەوەیی و نێو دەوڵەتی کردۆتەوە. داگیرکردن و تاڵانکردنی ئابووری لەلایەن ئاکرەوێتی و پاوانی سەرمایەداری دژە ئابووری لەژێر تەواوی ئەو خراپەکاریانەدا شاراوەیە کە لە گێڕانەوە و باسکردنی شارستانیدا وەك چارەنووسێك پێشکەش دەکرێت.

تازەگەری دیموکراتی تەنیا بە رزگارکردنی ئابووری لەم مەیلە چەواشەکارییانە ناوەستێت. بەڵکو خاوەن سیستەمێکە کە لەناو هەلومەرجێکی گەشەسەندووی شێوەی ژیاندا دان بە بێکاری و هەژاریدا دانانێت و رێگای پێ نادات، جێگا و دەرفەت بە بەرهەمی زیاد یان کەم نادات و ناکۆکییەکانی نێوان لادێ ـ شار بۆ پەیوەندییەك وەردەچەرخێنێت کە یەکتری تێردەکەن و جیاوازی نێوان وڵات و ناوچەکە کەم یان زۆر گەشەسەندووەکان بۆ نزمترین ئاست کەم دەکاتەوە. هەروەها جیاوازییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بە رەهەندەکانی چەوساندنەوەی چینایەتی ناگات، گۆڕانکارییە چینایەتییەکان قووڵ نابێتەوە. چەوسانەوەی ئابووری و ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان بەو رەهەند و ئاستانە ناگات ببێتە هۆکاری تەنگەژە و شەڕ. سیستەمی تازەگەری دیموکراتی رێگا بە ئیندوستریالیزم و شارگەرایی نادات گوند و شار تەنانەت چالاکییە پیشەسازی و ئەو شارانەش قووت بدات کە راستەقینەن و خاوەن رەهەند و چوارچێوەی ژیانن. میکانیزمی ئەمەش لە رەهەندە

سەرەکییەکانی تازەگەری دیموکراتیدا بەدۆخی هەمووێتی و یەکپارچەیی دراوە. سەرجەم جڤاتەکان گرێدراو بە رەهەندی ئەخلاقی و سیاسی چالاکییە ئابوورییەکانیان لەناو گشتگیری فاکتەرە ئیکۆلۆژی و پیشەسازییەکان تاووتوێ دەکەن. ئەمانە بە رایەڵەیەك بە یەکترەوە گرێدراون کە ناپچڕێن. هیچ شتێك لە ژێر رکێف و چەپۆکی تاکرەوێتی و پاواندا ناهێڵێتەوە. لە تەواوی چالاکی و کردە کۆمەڵایەتییەکاندا ئابووری - ئیکۆلۆژی و پیشەسازی - ئیکۆلۆژی رەچاو دەکرێت. لەسەر ئەم بنەمایەش تەنیا پرۆژەکانی نوژەنکردنەوەی ژینگە، زیندووکردنەوەی کشتوکاڵ و گەیاندنی گوند بە دۆخێك کە خاوەنی تەندروستانەترین ژینگە و گۆرەپانێکی ژیان بێت، بە تەنێ ئەو پۆتانسیێلەی هەیە کە کۆتایی بە بێکاری و هەژاری بێنێت. بێکاری پێچەوانەی سروشتی مرۆڤە. مرۆڤ کە خاوەن ژیرییەکی هێندە گەشەکردووە، بێکاری کچ و کوڕانی، تەنیا لەمیانەی دەستی ئەنقەست و زۆرداری خودی مرۆڤ بەدیدێت، لە راستیدا رەوشەکە بەمجۆرەیە. ئەو سروشتەی تەنانەت مێرووڵەیەکیش تێیدا بێکار نابینرێت، چۆن پێگەیشتووترین بوونەوەری خۆی بێکار و بێچارە دەکات؟ لەسەردەمی تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی کە بەرهەمێکی سەیر و سەمەرەی پراکتیکی مرۆڤە، چۆن دەبێت هەژاری قەدەرێك بێت؟

ئاشکرایە کە وەرچەرخانێکی بونیادی سیستەماتیکانە پێویستە. راستینەی مێژوویی و هەنووکەیی تازەگەری دیموکراتی خەسڵەتەکەی بەمجۆرەیە، مرۆڤ لە پراکتیك و رەنجی خۆی نامۆ ناکات. شۆڕشی پیشەسازی بەو سیفەتەی یەکێك لە قۆناخ و پرۆسە گەورەکانی ئەم کردارەیە، بۆ کۆمەڵگا و ئابوورییەکەی سەرکەوتنێکە. کێشەکە لەوەدایە کە هەر لەسەرەتاوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەم سەرکەوتنەی خستە ژێر خزمەتی یاسای قازانجی خۆیەوە. لەم پێناوەشدا تاکرەوێتی و پاوانخوازی (بازرگانی، پیشەسازی، فینانس، دەسەڵات و دەوڵەت - نەتەوە) بیەکی بێهاوتای ئاواکرد و کۆمەڵگای مێژوویی رووبەڕووی لەناوچوون کردەوە. بەجۆرێك لە جۆرەکان تازەگەری دیموکراتی لەناو ئەم چەمك و کردارە چەواشەکاریانەدا ناوی شۆڕشێکی بونیادی و سیستەماتیکە. پیشەسازی - ژینگەپارێز یەکێك لە رەهەندە سەرەکییەکانی ئەم شۆڕشەیە. تەنانەت ئەم راستییە بۆ خۆی پێویستییە ژیانییەکەی تازەگەری دیموکراتی دەسەلمێنێت.

هەرچەندە خێزان و کۆمپانیا خاوەن بونیادە پرۆفیشناڵەکان وەك یەکینەی ئابووری کلاسیکی مۆدێرنیتەی فەرمی پێشکەش بکرێن، بەڵام ئەمانە یەکینەیەکن ئامانجیان قازانجە. لەدەرەوەی قازانج نیگەرانییەکی دیکەی سەرەکییان نییە. سەرباری ئەوەی تاکە گۆڕەپان و بوارێکی ئابووری نەماوە کە وەك هەشت پێ لە سەرتاسەری دونیا خۆیان لێنەپێچابێت، تاکە کێشەی پێیەوە

خەریکن چۆنیەتی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجە. بەرزبوونەوەی ئاستی بێکاری و گەورەبوونی هەرەسئاسای جیاوازی داهات، هەروەها لەکاتێکدا بە سەدان ملیۆن مرۆڤ لەناو برسێتیدا تێکدەشکێنرێن، لەلایەکەی دیکەوە پۆتانسێلێکی زەبەلاحی بەرهەمهێنان بە فیڕۆ دەچێت، کشتوکاڵ و کۆمەڵگای گوندیش لەناو دەبرێت، ئەمەش هەر هەمووی دەرەنجامی چالاکی کۆمپانیا و یەکینەی ئابووری ـ راستتر دەرەوەی ئابووری ـ یەکانە کە پشت بە یاسای زۆرترین قازانج دەبەستن. هەڵبەتە یەکینەی ئابووری سەرەکی تازەگەری دیموکراتی لە بواری زهنییەت و بونیادەوە دژی یەکینەی ئەم کۆمپانیایە دەبێت کە تاکە ئامانجیان قازانجە.

بەدرێـژایی مێـژوو ئـابووری وەك بابـەتێکی هەسـتیار لەسـەرووی نیگەرانییـەکانی کۆمـەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە هاتووە. چونکە دیاردەی لە جـۆری هـەژاری، برسـێتی و مـردن لەلوتکـەی مەسەلەکەدا هەیە و هەڕەشە لە تەواوی کۆمەڵگا دەکات. قازانجیش وەك کەڵەکەکردن هـیچ کاتێـك لەلایەن کۆمەڵگاکانەوە رەوا نـەبینراوە، بـەردەوام بـە سەرچـاوەی خراپـی و تـاڵان دانـراوە و هـەر کاتێکیش دەرفەت هەبووە لە دەست بەسـەرداگرتنیدا دوودڵـی نـەکردووە. زۆر ئاشـکرایە لـەرێگای وابەستەبوون بە ئامانجێکی بەمجۆرەوە ناتوانرێـت ئـابووری ئاوابکرێـت. هـەر وەکـو روون کرایـەوە چـالاکییەك کـە وەك پێویسـتییەکی ناوەرۆکەکـەی دوژمـنی ئابوورییـە وەك ئـابووری بـاس بکرێـت خودی ناکۆکی خۆیەتی.

تاکە رێگای رزگاربوون لەم ناکۆکییە ئابووری جڤاتی ـ ژینگەپارێزە. وەك پێویستییەکی هەلومەرجەکان بە هەزاران کۆمەڵگای ـ ژینگەپارێز دەتوانێت خۆی وەك یەکینەیەکی ئابووری رێکبخات. لەمیانەی رەچاوکردنی پرەنسیپی پیشەسازی ـ ژینگەپارێز سەرلەنوێ رێکخستنەوەی ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەی لەلایەن بنەماڵە و خێزانەکانەوە پارچە پارچە کراوە و خەسڵەتی یەکینەیی لە دەستداوە، لەمێژە وەك کێشەیەکی گرنگ دەرکەوتۆتە پێش. ئاواکردنی جڤاتە ـ ژینگەپارێزەکان لە کشتوکاڵدا یەکێك لە پرەنسیپە ئابوورییە سەرەکییەکانی تازەگەری دیموکراتییە. گرێدرلو بەمەشەوە چەمکی جووتیاری پاشماوەی بەندایەتی و کۆیلایەتیش ئیتر سەردەمیان بەسەرچووە. هەروەها ئەو جڤاتە ـ ئیکۆلۆژییانەی لەسەر بنەمای یەکینە کشتوکاڵییە ژینگەییکان ئاوا دەکرێن بناخەی تازەگەری گوندیشن. واتا گوند یاخود گوندە هاوچەرخەکان بەو سیفەتەی جڤاتی ـ ژینگەپارێزن وەك یەکینەی ئابووری خاوەن پێوانەی ئیکۆلۆژی، دەتوانن سەرلەنوێ هەبوونی خۆیان بەدەست بێننەوە.

لەشارەکانیشدا دەتوانرێت جڤاتی ئیکۆلۆژی هاوشێوە ئاوابکرێت. لە پلاننامەی ئەو شارانەی ئیکۆلۆژی تەوەرەکەیانە، ئابووری وەك پارچە و بەشێکی هەمووێتی گشتی رێکدەخرێت. هەروەکو چۆن پێویستە بیرۆکراسیەت لە ئارادا نەبێت کە شار قووتدەدات، ئەوا ئابوورییەکیش شێ قووتبدات جێگای نابێتەوە و نییە. بەگوێرەی سروشتی هەر شارێك چالاکی ئابووری بەشێوەی ئەو یەکینانە رێکدەخرێت کە ئامانجی قازانج نییە، بەڵکو ئامانجی نەهێشتنی هەژاری و بێکاری خەڵکی شارەو گەورەبوونەکەشی سروشتییە. بەگوێرەی بونیاد و تواناکانیان دەتوانرێت دانیشتوان بەسەر ئەم یەکینانەدا دابەش بکرێت.

لەوانەیە وابزانن باس لە ئابوورییەك دەکەین کە نەخشە و پلانەکەی سۆسیالیستانەیە. بەڵام ئەو مۆدێلەی باسی دەکەین جیاوازترە. هەر وەك چۆن ئەم مۆدێلە هیچ پەیوەندییەکی بەئابووری پلاندانان و ئاراستەکردنی ناوەندییەوە نییە، ئەوا پەیوەندی بەو کۆمپانیایانەشەوە نییە کە لەدەرەوەی ئابوورین، هۆڤن و ئامانجیان قازانجە و ناوی کۆمپانیای ئابوورییان لەخۆیان ناوە. بەڵکو بونیادێکە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی خۆجێیی بڕیار و چالاکی خۆی تێدا ئەنجام دەدات. هەڵبەتە هەموو کاتێك کۆردیناسیۆنێك پێویستە کە هەلومەرجە نەتەوەیی - نیشتیمانی، هەرێمی و تەنانەت نێو دەوڵەتیەکانیش رەچاو بکات. بەڵام ئەمە ئەو نۆخە بەلاوە نانێت کە ئەم بڕیار و چالاکییە لەژێر دەستپێشخەری کۆمەڵگای خۆجێیی دابێت. پێویستە دووبارەی بکەمەوە، ئابووری کێشەیەکی تەکنیکی ژێرخان نییە، بەو سیفەتەی بونیادی سەرەکی هەبوونی کۆمەڵگاکانە. چالاکییەکە لەرێگای بۆچوون، گفتوگۆ، بڕیار و چالاکی رێکخستنی و تێکۆشانی تەولوی کۆمەڵگاوە بەدیدێت. دابڕانی مرۆڤ لە ئابووری بناخەی سەرجەم نامۆکردنەکانە. وەك چۆن بەرپەستکردنی مەرجە، تاکە رێگاشی بەوەدا تێپەڕ دەبێت ئابووری بکرێت بە موڵکی تەولوی جڤاتەکان. هەروەکو چۆن کاتێك"یەکێك بخوات، ئەویتر تەماشا بکات" دونیا سەرلوبن دەبێت، ئەوا کاتێك" یەکێك کاربکات، ئەویتریش سەیران بکات" دیسان قیامەت رادەبێت. ئابووری مەرجی سەرەکی هەبوونی کۆمەڵگایە کە مسۆگەر پێویستە گرێدرلو بە بنەماکانی بەپیتی و ئیکۆلۆژی و لە تەوەرەی جڤاتدا رێکبخرێت. جگە لە کۆمەڵگا و جڤاتەکان هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت ببێتە خاوەنی ئەم هەبوونە و ناتوانێت لەناوی ببات. تەواوی یەکینەکان ناچارن گوێڕایەڵی ئەم پرەنسیپانە بن، جا ئەمانە بازرگانی، پیشەسازی، کشتوکاڵی بن یاخود فینانس بێت بە مەرجێك تەنیا رۆڵی ئامراز ببینێت. پێویستە ئەم پرەنسیپانە لە بناخەی کارگەیەکی زەبەلاح و یەکینەی لادێ - کشتوکاڵیشدا هەبێت.

لە تازەگەری دیموکراتیدا موڵکایەتی یەکینە ئابوورییەکان گرنگی خۆی لەدەست دەدات و لە پلەی دووەمدا دەمێنێتەوە. هەڵبەتە موڵکایەتی هی ئەو جڤاتانە دەبێت کە بەگوێرەی پرەنسیپەکان رەفتار و هەڵسوکەوت دەکەن. نە موڵکایەتی خێزان، نە موڵکایەتی دەوڵەت هیچ یەکێکیان ناتوانن وەڵامی داواکاریەکانی ئابووری هاوچەرخ بدەنەوە. موڵکایەتی خێزان و دەوڵەت کە لەسەردەمی پلەدارییەوە ماونەتەوە، بگرە لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریشدا ناتوانن بەردەوامی بە هەبوونی خۆیان بدەن. تەنانەت کۆمپانیاکانیش بەهۆی فشار و بیانووە ئابوورییەکانەوە هەنگاو بە هەنگاو دەچێتە ژێر موڵکایەتی هاوبەشی خەباتکاران. بەڵام دیسان پێویستە لەمیانەی هێڵەپانەکانەوە پێوانەکانی موڵکایەتی لەیەکتری جیانەکرێنەوە. هەر وەکو چۆن هەر دوو سیستەمی شارستانی و شارستانێتی لەناو یەکتردا دەژین، ئەوا سیستەمەکانی موڵکایەتیش بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەناو یەکتردا دەبن. هەروەك چۆن موڵکایەتی خێزان لە موڵکایەتی جڤاتدا هەبوونی خۆی دەپارێزێت و درێژەی پێدەدات، ئەوا بوون (پێکهاتە)ی دەوڵەتیش هەبوونەکەی خۆی دەپارێزێت و بەردەوامی بەکاریگەرییەکەی دەدات. ئەوەی گرنگە کرانەوەیە بەڕووی پێوانە نەرمەکانی موڵکایەتی کە دەتوانێت وەڵامی ژینگە، بەرهەمهێنان و بێکاری بداتەوە. هەر رەفتارێك خزمەت بە هەبوون، ئازادی، چاکی و جوانی تاك بكات، تەنانەت ئەگەر موڵکایەتیش بێت، بەهادارە. بەڵام بەگوێرەی ئەو راستییەی کە ئەم بەهایانە بەبێ جڤات پێکنایەت، دیسان راسترین هەڵوێست چارەسەرکردنی کێشەکانە لەسنووری هاوسەنگی سروشتیدا. تازەگەری دیموکراتی دەتوانێت سەبارەت بەم بابەتەش بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە رۆڵی خۆی ببینێت: لە هەلومەرجە هاوچەرخەکاندا سەرلەنوێ موڵکایەتی جڤاتەکان ـ کە بە درێژایی مێژوو هەبوونی کۆمیناڵی خۆی لەدەست نەداوە ـ لە بناخەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیدا جێگیر بکات.

## ز ـ رەهەندی کۆمەڵگای کۆنفیدراڵی دیموکراتی

دەشێت سێیەمین رەهەندی سروشتی کۆمەڵایەتی لە ئاستی پەیڕەودا بەشێوەی سیستەمی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی دەستنیشان بکرێت. سەرباری سەرجەم مەترسییەکانی دەشێت رەهەندی سێیانە فێرکەر و ئەزموونبەخش بێت. ئەوەی گرنگە بەناو یەکداچوونی رەهەندەکانە. لەوانەیە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی شتێك لەجێگای رەهەندێکیان دابنرێت، بەڵام ئەوەی دێتە ئاراوە سیستەمی تازەگەری دیموکراتی نابێت، بەڵکو دەبێتە شتێکی دیکە. سێیانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش لەناو یەکتردایە. هەبوونەکانیان پێویستییان بە یەکتری هەیە.

لە تازەگەری دیموکراتیدا سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی بەرامبەرەکەی دەوڵەت نەتەوە پێکدێنێت کە فۆرمی سەرەکی دەوڵەتی مۆدێرنیتەی فەرمییە. دەشێت ئەمە بەشێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی وەسف بکرێت کە دەوڵەت نییە. ئەمەش ئەو خەسڵەتەیە کە تایبەتییە بە سیستەمەکە بەخشیوە. مسۆگەر پێویستە بەڕێوەبەرایەتییە دیموکراتییەکان لەگەڵ حوکمڕانیی ئیداری دەوڵەت تێکەڵ نەکرێت. دەوڵەت حوکمڕانی دەکرێت، بەڵام دیموکراسی بەڕێوە دەبرێت. دەوڵەت پشت بە دەسەڵات دەبەستێت، دیموکراسی پشت بە ڕەزامەندی گشتی دەبەستێت. لە دەوڵەتدا دامەزراندن، لە دیموکراسیشدا هەڵبژاردن مەرجە. هەروەها لە دەوڵەتدا ناچاری، لە دیموکراسیشدا خۆبەختی مەرجە. دەتوانین جیاوازی هاوشێوەی دیکە بژمێرین.

وەك مەزەندە دەکرێت کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی شێوەیەکی بەڕێوەبردنی تایبەت بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان نییە. بەڵکو سیستەمێکە بە هەموو قورساییەکەیەوە جێگای خۆی لە مێژوو گرتووە. لەم واتایەدا مێژوو دەوڵەتی ناوەندی نییە، کۆنفیدراڵە. لەبەر ئەوەی فۆرمی دەوڵەت بە فەرمی کراوە، دانی پێدا نراوە. بەڵام ژیانی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) زیاتر نزیکی کۆنفیدراڵیزمە لەکاتێکدا بەردەوام دەوڵەت بەدوای ناوەندیگەراییەوەیە، بەرژەوەندی پاوانەکانی دەسەڵات بە بنەما دەگرێت کە پشتی پێدەبەستێت. لە ئۆخێکی پێچەوانەدا ناتوانێت ئەم بەرژەوەندییانە بپارێزێت. چونکە تەنیا ناوەندیگەراییەکی توند دەتوانێت زامنی بکات. بەڵام لە کۆنفیدرالیزمدا پێچەوانەکەی پەسەند دەکرێت و جێگای باسە. لەبەر ئەوەی کۆمەڵگا بەبنەما دەگرێت نەك پاوان. هێندەی بۆی دەکرێت ناچارە لە ناوەندگەرایی دووربکەوێتەوە. لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکان چوونیەك(هۆمۆژەن) نین و لە چەندین جڤات، دەزگا و جیاوازییەکان پێکدێت، خۆی ناچار دەبینێت بەشێوەیەکی هەمئاهەنگانە یەکپارچەیی هەموویان دەستەبەر بکات و بیانپارێزێت. لەم سۆنگەیەوە" بەڕێوەبەرایەتییەکی ناوەندی زێدەڕۆ بۆ ئەم فرە ڕەنگییانە بەردەوام ڕێگە لەپێش تەقینەوە دەکاتەوە. نموونە لە ژمارنەهاتووەکانی ئەمەش لە مێژوودا دەبینرێت. هەرچی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتییە لەبەر ئەوەی بەگوێرەی خۆگوزارشتکردنی هەر جڤات، دەزگا و جیاوازییەك گونجاوترە زیاتر دەژی. هۆکاری نەناسراوی سیستەمەکەشی بۆ هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیا و بونیادی شارستانی (قەوارەیەکی) فەرمی دەگەڕێتەوە. هەرچەندە پێناس و دانپێدانانێکی فەرمیش جێگای باس نەبێت، بەڵام کۆمەڵگاکان لە بنەڕەتدا لە مێژوودا کۆنفیدراڵن. بەڕێوەبەرایەتی سەرجەم خێڵ، هۆز و قەومەکان دەرفەت بە کۆنفیدرالیزم دەدەن کە خاوەن پەیوەندییەکی نەرمە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا سەریەخۆییەکەیان زەبری بەردەکەوێت. ئەمەش

ڕیزەکانیـان و هەبوونەکـەیان پەرتـەوازە دەکـات. تەنانـەت ئیمپراتۆرییەتـەکانیش لـە بونیـادی ناوخۆیاندا پشت بە بەڕێوەبەرایەتییە جیاوازە لـە ژمارنـەهاتووەکان دەبەسـتن. بگـرە هـەر جـۆرە بەڕێوەبەرایەتییـەکی هـۆز، خێـڵ و قـەوم، دەسـەڵاتی ئـایینی، پاشـایەتی، تەنانـەت کۆمـار و دیموکراسیەکانیش دەتوانن لەژێر بونیادی ئیمپراتۆریەتێکدا یەکبگرن. لەم واتایەدا دەرککردن بـەو ڕاسـتییە گرنگـە ئیمپراتۆرییـەتیش کـە بەناوەنـدی مەزەنـدە دەکرێـت، جۆرێـك لـەجۆرەکانی کۆنفیدراڵیزمــە. هەرچــی مــەیلی ناوەندییــە داخــوازی کۆمــەڵگا نییــە، بــەڵکو مــۆدێلێکی ئیدارە(حوکمڕانی)یە کە پاوان پێویستی دەبینێت.

سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەو قۆناخەیە کە دەوڵەت بە بەرزترین ئاستی ناوەندێتی گەیشت. مۆنارشییە مۆدێرن و دەوڵەت ـ نەتەوەکان کە لەسەر بنەمای دەستبەسەرداگرتنی ناوەندەکانی هێزی سیاسی و سەربازی کۆمەڵگا لەبەرژەوەندی ئەو پاوانە بەهێزانەی بە دەسەڵات ناودەبرێن و بێ بەشکردنی کۆمەڵگا لەهێز و بەڕێوەبەرایەتی هەردوو بوارەوە پێشخراون، ئەو شێوانەی حوکمڕانین کە لە لایەنەکانی سەربازی و سیاسی لە بەرزترین ئاستدا کۆمەڵگایان لاواز و بێچەك کردووە. هەرچی ئەو دیاردەیە کە بە سیستەمی حقوقی و ئارامی کۆمەڵایەتی ناودەبرێت جگە لە دامەزراندنی باڵادەستی چینی بۆرژوازی شتێکی دیکە نییە. چڕبوونەوەی چەوسانەوە و ئەو شێوە نوێیانەی وەریدەگرێت دەوڵەت ـ نەتەوەی کردووە بە ناچاری. هەرچی دەوڵەت نەتەوەیە کە دەتوانین وەك ڕێکخستنی دەسەڵات بەشێوەی بەرزترین ئاستی دەوڵەتی ناوەندی وەسفی بکەین، شێوەی سەرەکی حوکمڕانی مۆدێرنیتەیە. هەرچی کردەوەکانی "دیموکراسی بۆرژوازییە" کە وەك کراسێك بەبەریدا دەکرێت، لە بنەڕەتدا لەپێناو بەدەستهێنانی مەشرووعیەتی پاوانی دەسەڵاتە لەناو کۆمەڵگادا. دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لە دیموکراسی، تەنانەت نکوڵیکردن لە کۆمار، دێتە ئاراوە. چونکە دیموکراتی و کۆمار بەهۆی ماهیەتەکەیان شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتین کە لە دەوڵەت ـ نەتەوە جیاوازترن.

کاتێك تازەگەری دیموکراتی وەك بناخەی مێژوویی یان سـەبارەت بـە سروشـتی کۆمەڵایـەتی ئاڵۆزی ڕۆژانە (هەنووکە)یی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی وەك مۆدێلی سیاسی سەرەکی دەستنیشـان دەکات، بژارێکی هەرەمەکی دەست نیشان ناکات. بەڵکو بەمجۆرە گوزارشـت لـە چـەتری سیاسـی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەکـات. تـاوەکو تـەواو دەرك بـەم ڕاسـتییە نـەکرێت کـە سروشـتی کۆمەڵایەتی چوونیەك و مۆنۆلیتیك نییە، تێگەیشتنی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی زەحمەتە. مێـژووی ئـەم چـوار سـەد سـاڵەی دوایـی مۆدێرنیتـەی فـەرمی چـالاکی جۆرێـك لـە کۆمـەڵکوژی (بەگشـتی

کۆمەڵگۆژی کلتووری، ناوەناوەش کۆمەڵکوژی جەستەیی) کۆمەڵگای فرە ئەتنیکی، فرە کلتووری، فرە لایەنی و بەرگری گەوهەرییە بەناوی نەتەوەی چوونیەك(هۆمۆژەن)ەوە. هەرچی کۆنفیدڕالیزمی دیموکراتییە مێژووی سووربوونە لەسەر بەرگری گەوهەری، فرە ئەتنیکی، فرە کلتووری و فرە لایەنی قەوارە سیاسییەکان. پۆست مۆدێرنیزمیش بەردەوامکردنی ئەم مێژووە شەرانگێزەی مۆدێرنیتەیە لەژێر شێوەی نوێدا.

لەسەردەمی فینانسی جیهانگیریدا درزدانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە وەك هەبوونێکی ئیلاهی ئەم دوو سەدساڵەی دوایی پیرۆز کرابوو، وەك بڵێی تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە سەرلەنوێ بە رۆژەڤبوونی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییانەی لەرێگای توندوتیژییەوە تواندبوویەوە و سەرکوتی کردبوو قۆناخێکن بەیەکەوە گرێدراون. چونکە چەمکی قازانجی فینانسی جیهانگیری گۆڕینی دەوڵەت ـ نەتەوە دەکاتە پێویستییەك. لەبەر ئەوەی قەیران و تەنگەژەکە بونیادییە، ئەم گۆڕانکارییە رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. هەرچی هەوڵەکانی نیولیبرالیزمە لەپێناو ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی نوێیە، چەندەی دەکرێت سەرکەوتوو نابێت. لەم لایەنەوە ئەزموونەکانی رۆژهەڵاتی ناوین فێرکەرو ئەزموونبەخشن.

سیستەمی دیموکراتی بەو سیفەتەی تازەگەرییەکی دژە و ناچارە خۆی پیشان بدات، کاتێك لە ژێر ئەم هەلومەرجانەدا هەبوونی خۆی بەهێزتر دەکات بەشێوازێکی سەرکەوتووانە رووبەڕووی چارەسەرکردنی کێشەی شێوە دەبێتەوە. بەم ئامانجە هەوڵی دەستنیشانکردنی ئەو چەسپاندنەمان دا کە کۆنفیدڕالیزم لە مێژوو نامۆ نییە و وەڵامێکی باشترە بۆ سروشتی تێکچڕژاوی رۆژی ئەمڕۆمان. بەردەوام ئاماژەمان بەم خاڵە کرد، سیاسەتی دیموکراتییانە باشترین رێگای خۆ گوزارشت کردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. سیاسەتی دیموکراتی شێوازی ئاولکردنی کۆنفیدڕالیزمی دیموکراتییە، دیموکراتیزەبوونەکەیشی لەم شێوازە وەردەگرێت. هەرچی مۆدێرنیتەی دژە کەچەندەی دەچێت ناوەندی دەبێت، کاتێك لەمیانەی ئامێر و دامەزراوەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە هەوڵی بەردەوامکردنی خۆی دەدات کە تا مەمیلەکانی ناواخنی کۆمەڵگا بڵاوبۆتەوە ، لە بنەڕەتدا گۆڕەپانی سیاسیش لەناو دەبات. بەرامبەر بەمەش لە کاتێکدا سیاسەتی دیموکراتی دەرفەت بۆ سەرجەم توێژەکانی کۆمەڵگا و ناسنامەکان دەڕەخسێنێت گوزارشت لە خۆیان بکەن و ببن بە هێزێکی سیاسی، بەمجۆرە کۆمەڵگای سیاسیشی لەگەڵدا ئاوادەکات. سەرلەنوێ سیاسەت دەکەوێتەوە ناو ئەجندای ژیانی کۆمەڵایەتی. چونکە سیاسەت نەکەوێتە گەڕ قەیرانی دەوڵەت شیکار ناکرێت، خودی قەیرانەکەش سەرچاوەی خۆی لە نکوڵیکردنی کۆمەڵگای

سیاسی وەردەگرێت. سیاسەتی دیموکراتی تاکە ڕێگای تێپەڕاندنی قەیرانەکانی دەوڵەتە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا خەست بۆتەوە. ئەگەر نا لێگەڕین بەنەوای دەوڵەتی توند و ناوەندیتر لە شکاندنی دژوار ڕزگاری نابێت.

جارێکی دیکە ئەم فاکتەرانە پیشانی دەدەن کە کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی وەك بژارێکی بەهێز بۆتەوە ڕۆژەڤ. ئەو کۆنفیدراڵیزمەی لەسەرەتای ئەزموونی ڕوسیای سۆڤێتەوە لە ڕەواجدا بوو، بەخێرایی لەناوبردنی لەژێرناوی دەوڵەتی ناوەندییەوە هۆکاری سەرەکی هەڵوەشاندنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوە. سەرنەکەوتنی بزاڤەکانی ڕزگاری نیشتیمانی، تەنانەت تێکچوون و پەراوێزبوونیان لە ماوەیەکی کورتدا لە نزیکەوە وابەستەی پێشنەخستنی سیاسەتی دیموکراتی و کۆنفیدراڵیزمە. ئەو هەڵوێستەی دەوڵەت ـ نەتەوە بە شۆڕشگێڕ لە قەڵەمدەدات و کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتییش بە شێوەیەکی کۆنەپەرستانەی سیاسەت دادەنێت لە ژێر سەرنەکەوتنی بزاوتە شۆڕشگێڕییەکانی ئەم دوو سەد ساڵەی دواییدا شاراوەیە.

ئەو بزووتنەوانەی مەزەندەیان دەکرد کە لەمیانەی خۆ پێچان لە دەوڵەت ـ نەتەوە کە چەکی باڵای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە بە شێوەیەکی قەدبڕ دەتوانن وەرچەرخانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی ئەنجام بدەن، زۆر درەنگ بۆیان روون بۆوە و تێگەیشتن کە بەم چەکە خۆیان کوشتووە.

هەروەك چۆن کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی پۆتانسێلی تێپەڕاندنی ئەو خراپەکارییانەی هەیە کە سەرچاوەی خۆی لە سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوە وەردەگرێت، لە هەمانکاتدا گونجاوترین ئامرازی پۆلیتیزەکردنی کۆمەڵگایە. سادەیە و دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت. هەر جڤات، ئەتنیك، کلتوور، گرووپی ئاینی، بزاوتی ڕۆشنبیری و یەکینەیەکی ئابووری و .. هتد بەشێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ دەتوانن یەکینەی سیاسی خۆیان بونیاد بنێن و گوزارشت لە خۆیان بکەن. پێویستە زاراوەی خۆیەتی لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگێندرێت، ئینجا ئەمە فیدراڵییەت بێت یان ئۆتۆنۆمی. هەر قەوارەیەکی ئۆتۆنۆم (سەربەخۆ) لەخۆجێییەوە تا دەگاتە جیهانگیری دەرفەتی ئاولکردنی کۆنفیدراسیۆنی هەیە. فاکتەری هەرە سەرەکی لەئاستی خۆجێییدا، مافی گفتوگۆ و بڕیاردانی ئازادە. هەر یەکینەیەکی خۆیەتی یاخود فیدراڵی لەبەر ئەوەی دەرفەتی جێبەجێکردنی دیموکراسی ڕاستەوخۆی هەیە کە بە دیموکراسی بەشداریکردنیش ناودەبرێت، بێهاوتایە. تەواوی هێزی خۆی لە توانای جێبەجێکردنی دیموکراسی ڕاستەوخۆ وەردەگرێت. ئەمەش بیانووی

هەبوونی رۆڵە سەرەکییەکەیەتی. چەندە دەوڵەت ـ نەتەوە واتای نکوڵیکردنە لە دیموکراسی راستەوخۆ، بەپێچەوانەوە کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی بەو رادەیە شێوەی ئاولکردن و کاراکردنێتی.

یەکینە فیدراڵییەکان بەو سیفەتەی ناووك و خانەی سەرەکی دیموکراسی بەشداریکردنی راستەوخۆن، بەو رادەیەی پێدلویستی و هەلومەرجەکان پێویستی ببینێت لەبواری نەرمایی وەرچەرخان بۆ یەکێتی کۆنفیدراڵییانە بێهاوتاو نموونەیین. هەر جۆرە یەکێتییەکی سیاسی لەسەر بنەمای پشت بەستن بە دیموکراسی بەشداریکردنی راستەوخۆ پێشبخرێت دیموکراتیکە. لە یەکینە هەرە خۆجێییەکانی دیموکراسی راستەوخۆی تێدا جێبەجێ دەکرێت و دەژێنرێت، تا دەگاتە ئەو کارابوونە سیاسییەی لە ئاستی قەوارە جیهانگیرییەکان پێشخراوە، دەشێت بە سیاسەتی دیموکراتی ناوببرێت. سیستەمی دیموکراسی راستەقینەش فۆرمێلەی ژیانداریکردنی سەرجەم ئەم قۆناغ و پرۆسانەیە.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدرێتە سروشتی کۆمەڵایەتی و چاودێری بکرێت، ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانرێت دەرك بە ماهیەتی "قەفەسی ئاسنین"ی دەوڵەت ـ نەتەوە و گونجاوترین ماهیەتی ئازادیخوازی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی بکرێت. چەندە دەوڵەت ـ نەتەوە کۆمەڵگا سەرکوت دەکات، دەیکات بە یەکچەشن و لە دیموکراسی دووری دەخاتەوە، مۆدێلی کۆنفیدراڵی دیموکراتی بەو رادەیە ئازادیخوازە، بەدیهێنەری فرە لایەنی و دیموکراتییە.

خاڵێکی دیکە کە پێویستە سەرنجی بدرێتێ، لە چوارچێوەیەکی دەوڵەمەند بیر لە یەکینەکانی فیدراسیۆن و خۆیەتی دەکرێتەوە. زۆر گرنگە دەرك بەم خاڵە بکرێت، تەنانەت لە گوندێك یاخود گەڕەکێکی شاریشدا پێویستی بە یەکێتییە کۆنفیدراڵییەکان هەیە. هەر گوند یاخود گەڕەکێك بە ئاسانی دەتوانێت ببێتە یەکێتییەکی کۆنفیدراڵ. بۆ نموونە ژمارەیەکی زۆری یەکینەکانی دیموکراسی راستەوخۆی لەجۆری یەکینەی ـ یان فیدراسیۆنی ـ ئیکۆلۆژی، تا یەکینەی ژنی ئازاد و یەکینەکانی لاوان، پەروەردە، فۆلکلۆری، تەندروستی و هەرەوەزی و ئابووری گوند پێویستە یەکبگرن. زۆر بە دڵنیایی دەتوانرێت کۆی ئەم یەکینانە واتە یەکینەکەیان بە یەکینە یاخود یەکێتی کۆنفیدراڵ ( یەکینەی یەکینە فیدراڵییەکان ) ناو ببرێت. کاتێك هەمان سیستەم بۆ ئاستە خۆجێیی، هەرێمی، نەتەوەیی و جیهانگیرییەکان بگوازینەوە، بە ئاسانی دەرکی پێدەکرێت کە سیستەمی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی چەندە بەرفراوان و سەرتاسەرییە. هەروەها لەرێگای سیستەمی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتییەوە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە هەر سێ رەهەندە سەرەکییەکەی تازەگەری دیموکراتی یەکتری تەولو دەکەن. لەبەر ئەوەی لەناو ئەم سیستەمەدا

هەر ڕەهەندێك خاوەنی پۆتانسێلی گفتوگۆکردن، هەڵسەنگاندن، بڕیاردان و سەرلەنوێ خۆبونیادنانەوەیە، بە باشترین شێوە ڕاستینە و تێگەیشتنی کۆمەڵگای مێژوویی سروشتی کۆمەڵایەتی بەدیدێنێت.

هەروەها دەشێت بەرگری گەوهەری کۆمەڵگا بە باشترین شێوە لە سیستەمی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتیدا جێبەجێ بکرێت. بەو سیفەتەی بەرگری گەوهەری دامەزراوێکی سیاسەتی دیموکراتییە دەکەوێتە چوارچێوەی سیستەمی کۆنفیدراڵییەوە. وەك پێناسە بەرگری گەوهەری گوزارشتی چڕکراوەی سیاسەتی دیموکراتیانەیە.

دەوڵەت ـ نەتەوە لە بنەڕەتدا سیستەمێکی سەربازییە. سەرجەم دەوڵەت ـ نەتەوەکان بەرهەمی ئەو شەڕانەن کە لەناوەوە و دەرەوە بەشێوەیەکی دژوار، هەمەلایەن و درێژخایەن ڕوویانداوە. دەوڵەت ـ نەتەوەیەك نابینرێت کە بەرهەمی شەڕ نەبێت. نەك تەنیا لە قۆناخی دامەزراندندا، بەڵکو لەو زیاتر لە قۆناخەکانی بە دامەزراوەبوون و هەڵوەشانەوەدا لە ناوەوە و لە دەرەوەش دەوڵەت ـ نەتەوە تەواوی کۆمەڵگا بە قەڵغانێکی میلیتاریست (سەربازی) دادەپۆشێت. بەمجۆرە تەواوی کۆمەڵگا دەکرێت بە سەرباز. هەرچی ئەو دەزگایانەن کە بە ئیدارەی سڤیلی دەسەڵات و دەوڵەت ناودەبرێن لە ڕاستیدا ئەو پەردەیە کە ئەم قەڵغانە سەربازییە دادەپۆشێت. ئەو دامەزراو و ئامێرانەش کە بە دیموکراسی بۆرژوازی ناو دەبرێن، زیاتر بەرەو پێشەوە دەبرێن و لەمیانەی جلوە و ڕوتووشێکی دیموکراسییەوە ئەم زهنییەت و بونیادە میلیتاریستە دادەپۆشێت و پروپاگەندەی ئەوە دەکات کە سیستەمێکی دیموکراتی لیبراڵی کۆمەڵگا لەئارادایە. هەربۆیە تا ئەم ناکۆکییە ترسناکەی بەڕێوەبەرایەتی مۆدێرنیتە شیکار نەکرێت، ناتوانرێت باس لە دیاردەی سیاسیبوونێکی ڕاست و بەڕێوەبردنی سیاسەتی دیموکراتییانە بکرێت. ئەمەش ئەو دیاردەیە کە بەمیللەتی سەرباز ناودەبرێت. دیاردەیەکە بۆ سەرجەم ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانە لەجێی خۆیدایە کە لە چوار سەد ساڵی ڕابردوودا ئاواکراون. ئەم واقیعە لەژێر سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتییەکان، تەنگەژە و پووکانەوەکاندا شاراوەیە. هەر جۆرە کردەوەیەکی دەسەڵاتی فاشیستانە (فاشیزمی بە کودەتا، بێ کودەتا، سەربازی و سڤیل) کە وەك چارەسەری دەسەپێنرێن و بەردەوام دووبارە دەبنەوە پێویستییەکی سروشتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، تایبەتترین دۆخی گوزارشتی شێوەکەیەتی.

تەنیا لەڕێگای ئامرازی بەرگری گەوهەرییەوە کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتیك دەتوانێت ئەم میلیتاریستبوونە بەربەست بکات کە سەرچاوەکەی بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە دەگەڕێتەوە. ئەو کۆمەڵگایانەی لە بەرگری گەوهەری بێبەشن، ناسنامە، تایبەتمەندێتیی سیاسی و

دیموکراتیزەبوونی خۆیان لەدەست دەدەن. لەبەر ئەمەش ڕەهەندی بەرگری گەوهەری بۆ کۆمەڵگاکان دیاردەیەکی سادەی پاراستنی سەربازی نییە. بەڵکو لەگەڵ دیاردەی پاراستنی ناسنامە، بەدیهێنانی سیاسیبوون و ئەنجامدانی دیموکراسیبوونیاندا تێکەڵە. تەنیا کاتێك کۆمەڵگا بتوانێت بەرگری لە خۆی بکات، دەتوانێت باس لە پۆلیتیزەبوون و ئەنجامدانی سیاسەتی دیموکراتیك بکات. لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانەدا کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی ناچارە وەك سیستەمێکی بەرگری گەوهەری خۆی ڕێکبخات. لەسەردەمی هەژموونگەرایی جیهانگیری پاوانەکان و هەلومەرجەکانی میلیتاریستەکردنی تەواوی کۆمەڵگا بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە، تازەگەری دیموکراتی تەنیا لە میانەی سیستەمە خۆییەکەی دەتوانێت وەڵامی هەژموونگەرایی بداتەوە، کە لەسەرجەم هەلومەرجەکانی شوێن و کاتدا لەسەر بنەمای سیاسەتی دیموکراتی و بەرگری گەوهەری بە تۆڕێکی کۆنفیدراڵی گەیشتووە. چەندە تۆڕی هەژموونگەرایی ( بازرگانی، فینانس، پیشەسازی، دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوە و پاوانی ئایدیۆلۆژی) هەبێت، تازەگەری دیموکراتیش ناچارە بەو ڕادەیە تۆڕەکانی بەرگری گەوهەری، سیاسەتی دیموکراتی و کۆنفیدراڵی پێشبخات.

دواترین کێشەی پەیوەندیدار بەم ڕەهەندە کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین سەبارەت بە چۆنێتی بەردەوامبوونی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی نێوان هەردووکیانە. بەتایبەتی ئەو هەڵوێستە دەسەڵاتگەراییانەی بەسەر ڕەوتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و ڕزگاری نیشتیمانیدا زاڵە (لەجیاتی دەسەڵاتی بۆرژوازی، دەسەڵات یاخود دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا، لەجیاتی بەڕێوەبەرایەتی دڵگیرکەر و بەکرێگیراوەکان دەسەڵاتگەری میللی) تراژیدیترین هەڵەی مێژوویی کرد، بەهۆی ئەم چەمکەیانەوەش دەرفەتی بەردەوامکردنیان بۆ سەرمایەداری ڕەخساند کە شایستەی نەبوو. ئەم ڕەوتە هاوشێوانەی دەتوانین بە جۆرێك لە چەمك و کردەوەکانی ڕووخاندنی دەسەڵات و دەوڵەت، ئاواکردنی نوێ لەجێگایاندا ناویان ببەین، بەرامبەر خنکاندنی کۆمەڵگا لەناو میلیتاریزەبوون و لەدەستدانی ماهییەتی سیاسی و تێکۆشانی دیموکراتی بەرپرسیارێتی هەرە زۆریان لە ئەستۆدایە. نزیکەی دوو سەد ساڵە ئەم شێواز و شێوە هەڵوێستانە بەدەستی خۆیان لەسەر سینییەکی زێڕین سەرکەوتن پێشکەش بە دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری دەکەن. ئەنارشیستەکان و هەرچەندە درەنگیش بێت هەندێك بزاوتی ئیکۆلۆژی و فێمینیستی پۆست مۆدێرن لەگەڵ چەمکەکانی چەپ و کۆمەڵی مەدەنیتر لەم بارەیەوە خاوەن پێگەیەکی ئەرێنیترن.

هەردوو مۆدێرنیتە ناچارن ماوەیەکی درێژی پڕ لە ئاشتی و ناکۆکی بەیەکەوە لەناو هەلومەرج و پرەنسیپێکدا بەیەکەوە بژین کە پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو. ئەمە راستییەکی ژیانە. بەردەوامکردنی ئەم قۆناخە درێژەی بەیەکەوە ژیان لەمیانەی هەڵوێستەکانی ئاشتی تەسلیمکارانە و بێ پرەنسیپ، یاخود لەمیانەی چەمك و کردەوەکانی پێکدادان و شەڕ لە هەر هەلومەرجێکدا، راست نین. فەلسەفەیەکی سیاسی و هەڵوێستە ستراتیژی و تەکتیکییەکانی بە ئەندازەی ئاشتی مەرجدار و بە پرەنسیپی نێوان سیستەمەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی، لێکدانەوە بۆ ئەوەش بکات کە لەدۆخی پێشێلکردنی ئەم مەرج و پرەنسیپانەدا لەمیانەی شەڕەکانی بەرگری گەوهەرییەوە بەیەکەوە دەژین، ئەوا زیاتر بەگوێرەی کاروانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی کۆمەڵگای مێژوویییە.

لەو بڕوایەدام کە بەپێی پێویست کارەکتەری دووانەیی مۆدێرنیتەم پێناسە کردووە کە دوا قۆناخی مێژووی شارستانییە و لەم بەشە درێژەی کارەکەمان هەوڵی شیکارکردنیماندا. هەروەکو لە پێشکەوتنی دیالیکتیکی مێژووی شارستانیدا دەبینرێ خودی مۆدێرنیزم و مێژووە کورتەکەی پڕ لە پێشکەوتنە دیالیکتیکەکانە. کاتێ دەڵێین دیالیکتیك ئەوەی پێویستە دەرکی پێ بکرێت ئەو پەرەسەندنە دووانەییەی دوو جەمسەری پەیوەندی و ناکۆکی هەیە دووجۆرە زهنییەت و بونیادی جیاواز لەخۆوە دەگرێت. هەروەها مێژووی ئەم چوار سەدەیەی دوایی دەیسەلمێنێت کە سەرمایەداری مۆرکی خۆی لە مۆدێرنیزم داوە، بەڵام ئەمەش بەو واتایە نایەت کە مۆدێرنیتە بەتەواوی سەرمایەدارییە. چونکە لە راستیدا خودی سەرمایەداریش لە شێوەیەکی کۆمەڵگا زیاتر، سیستەمی کەڵەکەکردنی قازانج و سەرمایەیە. هەروەها سیستەمێکی گونجاو نییە بۆ وەسفکردنی دیاردەیەکی گشتگیر و بەرفراوانی وەك مۆدێرنیتە (تازەگەری). هەرچەندە زۆرجار زاراوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریم بەکارهێناوە، بەڵام بەردەوام جەختم لەسەر ئەو خاڵە کردەوە کە پێویستە بەواتای مۆرك لێدان دەرکی پێ بکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵمدا ئەولایەنە روون بکەمەوە کە شیکارکردنی دووەمین رووی مۆدێرنیتە وەك تازەگەری دیموکراتی (ئەگەر زاراوەیەکی گونجاوتر بدۆزرێتەوە، دەکرێ ناوێکی دیکەش بێت) زیاتر لایەنی راستی(ناوبردنی بە مۆدێرنیتەی خاوەن مۆرکی دیموکراتی راست نابینم) لەخۆوە دەگرێت. بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو هەمان ئەو بێچارەیی و هەڵە مێژووییانەی لە جیاوازی نێوان کۆمەڵگای سەرمایەداری ـ سۆسیالیستی هاتە ئاراوە، گرنگییەکی زۆرم بە خۆدوورخستنەوە لە هەڵوێستە رووکەشییەکانی لە جۆری مۆدێرنیتەی سەرمایەدارێتی ـ مۆدێرنیتەی سۆسیالیستی داوە.

بەردەوام پەیڕەوی بەراوردکاریم سەبارەت بە تاووتوێکردنی دوو دیاردەی جیاوازی مۆدێرنیتە (تازەگەری) بەکارهێنا. چونکە خودی ڕاستی دوو لقی هەیە. هەروەك مێژووی شارستانی-زەمەنەکانی مۆدێرنیتەش کە ماوەکەیان کورترە بە تەواوی پەیوەندی و پێکدادانەکانییەوە شاهێدی ئەم دووالیزمە بوو. هەر چەندە وەك تاقیکردنەوەیەکیش بێت ئەوەی هەوێ ئەنجامدانمدا، پێشخستنی شیکاری کورت بوو لەسەر بنەمای ئەم شاهێدییەوە. هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە بەلانی کەم وەك گەڵاڵەی هزرێك دەرکی پێدەکرێت. هەڵبەتە ئەو ڕەخنەو پێشنیارانەی لەم بارەیەوەی پێشبخرێن شیکارەکان بەهێزتر دەکەن.

ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە سەرمایەداری بەو سیفەتەی سیستەمی کەڵەکەکردنی قازانج و سەرمایەیە، مۆرکی خۆی لە مۆدێرنیزم داوە و تا ئێستاش لە سایەی باڵادەستی سەرمایەداری فینانس وەك هێزێکی هەژموونگەرا درێژە بە پێگەی خۆی دەدات. هەروەها نکوڵی لەوەش ناکرێت وەك سیستەمێك ئاواکراوە (سیستەمی سەرمایەداری جیهانی، سیستەمی جیهان) کە لە هەلومەرجی تەواوی زەمان و شوێنەکاندا هێزێکی چڕی ناکۆك لەگەڵ یەکتردا لەخۆوە دەگرێت. ئەو هێزانەی بە ئامانجی ئاسانکاری هەوڵدەدرێت لەمیانەی زاراوەی تازەگەری دیموکراتی پێناسە بکرێت، تەنیا بریتی نییە لە بزاوتەکانی ڕزگاری نیشتیمانی و سۆسیالیزمی بونیادنراو، بەڵکو لەسەروویانەوە ئەنارشیزم، لەم قۆناخانەی دوایی بۆتە شاهێدی قەڵەمبازی بزاوتە ئیکۆلۆژی و فێمێنیستی و سیستەمە ئاینییە ڕادیکاڵەکانیش. لە مێژە جەرگ و هەناوی سیستەم کونکراوە، ئەوانەی لەناوەوە و دەرەوە دێن (پێویستە زیاتر باسی دەرەوەی بکەم، چونکە سروشتی کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتدا ئەو هێزانە دەناسێت کە لە دەرەوە دێن) لەمیانەی گوتە و کردار لەسەرجەم کات و شوێنەکاندا بەردەوام هەبوون، داخوازییەکانی ئازادی و یەکسانیان خستۆتەڕوو. دیسان هیچ کاتێك لە لێکەڕین بەدوای سیستەمدا دوانەکەوتوون.

هەروەکو لە تەواوی مێژووی شارستانیدا تاقیکراوەتەوە، لە زەمەنە مۆدێرنەکانیشدا وەك چۆن هەوڵەکانی یەکتر لەناوبردنی سیستەمەکان و ئاواکردنی پاوان هیچ ئەنجامێکی نەبووە، هەروەها باجەکەشی قورس بووە. بێگومان ئەو نابینایییەی لە خۆوەی دەگرێت ئاماری شەڕەکانی ئەم سیستەمەی زۆر قورس کردووە. چونکە لەمیانەی بنپێکردنی یەکترییەوە سیستەمەکان داخوازی بەردەوامکردنی ژیانیان هەیە. هەروەك چۆن لە ئاستی جیهانگیرییەوە تا دەگاتە ئاستی خۆجێییەوە بەردەوام هەژموونگەرایی دەسەپێندرێت، ئەوا لەبەرامبەریدا لەمیانەی ئەو پەند و وانانەی لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانەوە وەریان گرتووە بەرخودانیش بەشێوەیەکی بەهێزتر

بەردەوام دەبێت. تا بێچارەییش بەردەوام بێت، ئەوا بەردەوام بەیەکەوە لەناو ئاشتی و شەڕدا دەژین. کاتێك شیکار و ڕێگە چارەکان سەرکەوتووترین، زیاتر ڕاستی،چاکە و جوانی تێدا ڕەنگ بداتەوە، ئەوا بێگومان ئەو ڕەوشەی بە نەشەڕ نەئاشتی ناودەبرێت، دەشێ دونیایەکی جوان و ئارەزوومەندانەتر خەیاڵ بکەین. هەڵبەتە ئاشتییەکی زیاتر و شەڕێکی کەمتر دۆخێکی بەهادارە و هەوڵەکانیش لەم پێناوەدا ڕەسەنە. بەڵام بە مەرجێك بەپرەنسیپ و شەرەفمەندانە بێت.

هەژموونگەرایی سەرمایەی فینانسی جیهانجگەرامان وەك قووڵترین قۆناخی قەیران پێناسەکرد. دەرەنجامەکانیش ئەم پێناسەیە پشتڕاست دەکەنەوە. هەروەها بە شێوەیەکی بەرفرلوانیش ئامارەمان بەو خاڵە کرد کە قەیرانەکە سیستەماتیکە و بونیادییە. تەنانەت هەواڵی قەیرانە ڕۆژانەییەکانیش کارەکتەری سیستەماتیك و بونیادی دەسەلمێنێت. لە قۆناخەکانی قەیراندا سیستەمەکان وەچە دەخەنەوە. وەك چۆن وەچەی هەندێکیان ئیفلیج و سەقەت دەبێت، ئەوانیش کەم نین کە وەچەخستنەوەیان تەندروستانە دەبێت. هەروەها هیچ کاتێك لە ئۆتۆپیای لیبرالیزمی سەرمایەداریدا پێشنیاری چارەسەرییە بەرفراوان و بەیەکەوە لکێنراوەکان کەم نابنەوە. نەخشەی ڕۆژانە، هەفتانە، مانگانە، ساڵانە، دە ساڵانە و پەنجا ساڵانە دادەڕێژن. ئەمە کارەکەیانە و درێژەشی پێدەدەن.

لەم قۆناخانەی قەیراندا دەشێت شانسی هێزەکانی تازەگەری دیموکراتیش زیاتر بکرێتەوە. چونکە مێژوو شکۆدارەکانی بەرخودان کە پشتی پێدەبەستن و ئۆتۆپیاکانی یەکسانی و ئازادی، ڕێگایان ڕۆشن دەکاتەوە. هەروەها پەند و ئەزموونێکی گەورەشیان لە ناتەواوی و تێکشکانەکان وەگرتووە. کاتێك هەموویان لەناو یەکتردا وەك بەستەیەکی ئەرکە ڕۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان دەرکی پێدەکرێت و دەیخەنە بواری کردارییەوە، هەڵبەتە شانسی سەرکەوتنیان بەرزە. سەرباری ئەمەش، دیسان قۆناخەکانی قەیرانی سیستەماتیکی و بونیادی هەندێك لایەنی تایبەت بە خۆیان هەیە کە پێویستە سەرنجی بدرێتێ. هەرچەندە لەسەر ڕێبازی رابردوو بن، بەڵام پێویستە ئەو ڕاستییە پشتگوێ نەخرێت کە ئەو فەلسەفە ئەخلاقی ـ سیاسی و زانستەی لە چاوەڕوانی جێبەجێکردندایە، پێویستە نوێکاری لە خۆوە بگرێت، لە دۆخێکی پێچەوانەدا ئەو ڕووکەشییەی زۆر جار لە ڕابردوو ڕوویداوە نابینایی نوێ لەگەڵ خۆیدا دێنێت، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی بەردەوام لیبرالیزم خۆی نوێ دەکاتەوە مەترسییەکە گەورەتر دەکات. پێویستە لەبیر نەکەین کاتێك هەر کەس لەسەردەمی قەیرانە گەورەکەی دونیا لە ساڵی ١٩٢٩ چاوەڕوانی شۆڕشی مەزن بوو ، شەپۆلێکی فاشیستی بەرزبۆوە کە تارۆژی ئەمڕۆشمان کاریگەرییەکەی ماوە. لە

هەموو کاتێك زیاتر کۆمەڵگا لە ماهییەتی سیاسی و ئەخلاقی بێبەش کرا. تەکنۆلۆژیای راگەیاندن بە زیادەوە دەرفەتی دونیای وەهمی و شێواندنی جیهانی واقیعی پێشکەش بەهێزەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای جیهانگیری کردووە. بەبێ ئەوەی هیچ زیان و خراپییەکی تێدا ببینن زۆر بە ئاسانی بونیادە رزیوەکەیان بە سیستەمێکی نوێ دەپێچنەوە و وەك بڵێی تازە لەدایك بووە پێشکەشی دەکەن. ئەو جەماوەری لە ئارادایە لەمێژە بۆ جەماوەری مێگەلی فاشیزم گۆڕاوە. بەم مەبەستەش ئاماژە بەم خاڵە دەکەم کە لەجیاتی هیواشکێنی، پێویستە تەنیا بە یەکێتی لایەنی سۆزداری و ئەنالیتیکی سنووردار نەبین، چونکە تا ژیانی سیاسی و ئەخلاقی بۆ هەر شوێن و زەمەنێکمان نەگوازینەوە ئەوا بە ئاسانی مایەپووچ دەکرێین. دوا بەشی لەمە بەدواتر سەبارەت بەم بابەتە دەبێت.

# کێشەکانی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی تازەگەری دیموکراتی

تراژیدیترین لایەنی شۆڕشە مۆدێرنەکان، دەبنە قوربانی ئەو مۆدێرنیزمەی کە لە ئاواکردنیدا خاوەن رۆڵ بوون. شیکارنەکردنی مۆدێرنیزم کەموکوڕی هاوبەشی ئەم شۆڕشانە بوو، چونکە لەو بڕوایەدابوون بەبێ شیکارکردنی ناکۆکی و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ مۆدێرنیزم دەتوانن بە ئامانجەکانیان بگەن. کاتێك رەوش بەمجۆرەبوو، هێندەی بەسەر نەچوو ناوەڕۆکی یۆتۆپیای شۆڕشەکان بەرامبەر لێکدانەوە تەزێنەرەکانی مۆدێرنیتە لە توانەوە رزگاری نەبوو. ئەو وانەیەی لە مێژووی پێنج هەزار ساڵە، بەتایبەتیش چوار سەد ساڵی دوایی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە وەربگیرێت: سەرەکیترین فاکتەری سەرنەکەوتنی سەرجەم شۆڕش و بەرخودانەکان جیاوازی خۆیان لەگەڵ ئەو سیستەمانە نەخستەڕوو کە لەبەرامبەریدا تێدەکۆشان و دژە سیستەمی خۆیان ئاوانەکرد. مۆدێرنیتە و شارستانییەکانیان لەمیانەی هەڵوێستێکی یەکانەیی هەڵسەنگاندووە، لەگەڵ ژیانی گەردوونیدا هاوتایان کردووە کە پێویستە پێڕەو بکرێت. سەرباری ئەوەی شارستانیەك نەماوە بەرخودانە لە ژمار نەهاتووەکان نەیانڕووخاندبێت، بەڵام ئەوەی لە جێگایان ئاواکراوەتەوە ڤێرسیۆن (نوسخە)یەکی نوێی شارستانی کۆن بووە.

لێرەدا سەرچاوەی هێزی شارستانییەکان رووبەڕوومان دەبێتەوە. جگە لە ریزپەڕییە دەگمەنەکان، گەورەترین شۆڕشگێڕەکانیشی لەناودا، بەگشتی کەسەکان منداڵی شارستانییەکانی سەردەمی خۆیانن. باوك ـ دایك ی راستەقینەیان ئەو سەردەمەیە کە تێیدا دەژین. بە هەڵوێستێکی قەدەرگەرایی بابەتەکە تاووتوێ ناکەم. بەڵکو دەمەوێت جەخت لەسەر ئەم خاڵە بکەمەوە، تا ئەو هەڵە ریشەییە تێپەڕ نەکرێت کە پێنج هەزارا ساڵە یاخود چوار سەد ساڵە بەردەوامە، ئەوا شۆڕشە هەرە رادیکاڵەکانی گوتە و کرداریش لە ژێر کەوتن رزگاریان نابێت. هەرگیز ناتوانرێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە شۆڕش و بەرخودانە کۆمەڵایەتییەکان هیچ میراسێکیان بەجێنەهێشتووە. ئەگەر ئەم میراسە نەبوایە ژیانمان هیچ واتایەکی نەدەما. تەنانەت قەیرانی ئەو مۆدێرنیتەیەی هەرە زێدە لەم نێوانەدا متمانەی بەخۆی هەیە دەیسەلمێنێت کە لە شیکارکردنی سەرچاوەی کێشەکان دوورە. هەروەها بڵاوکردنەوەی بۆ ماوەی درێژخایەن هەڵەکان لە دۆخی هەڵە رزگار ناکات: کێشەکانیش لە دۆخی کێشەبوون رزگار ناکات. تا ئەم رەوشە بەمجۆرە بەردەوام بێت ئەوا خەیاڵەکانی ژیانی ئازاد، یەکسان و دیموکراتی لە گێژاوی یۆتۆپیا خەیاڵیەکان رزگاری نابێت.

کاتێك لە بەرگرینامەکەمدا لە بنەڕەتدا حیساب لەگەڵ مۆدێرنیتە و مێژووی شارستانید دەکەم، لەلایەکەوە بە ڕەخنەدلنیکی ریشەییدا تێدەپەڕم، لەلایەکی دیکەشەوە هەرچەندە ناتەواویش بێت هەوڵی پێشکەشکردنی ئەڵتەرناتیفی خۆم دەدەم. بە پرەنسیپبوون پێویستی بەم هەڵوێستەیە. زانستی کۆمەڵایەتی تەوەرەی ئەورووپا ئەم پرەنسیپبوونە پیشان نادات. لەلایەکەوە باسی سەردەمێکی بێهاوتای زانست دەکەین، لەلایەکی دیکەشەوە ناتوانین کارەساتێکی وەك شەڕ بەربەست بکەین ! لەڕەوشێکی وەهادا ڕەخنەکردنی چاخە کۆنەکان بەچەکی زانستگەرایی هیچ ڕەوابوونێکی نامێنێت. ئەوەی پێویستە بکرێت، شوێنکەوتنی زانستێکە مەشرووعیەتی مابێت. هەوڵەکانی خۆم لەم چوارچێوەیەدا هەڵدەسەنگێنم.

پێویستە هەڵسەنگاندنەکانم سەبارەت بە شارستانی و مۆدێرنیتە بە زێدەڕۆیی لە قەڵەم نەدرێت. لەکاتێکدا پێغەمبەران بە گوتەی خودلوەند سیستەمەکانی نەمروود و فیرعەون ڕەخنە دەکەن. هەرگیز گومان لەوە ناکرێت کە ئەم هەڵوێستەیان لەناخەوە واتە لەدڵەوە بووە، بەلام هەرچی ئەوانەن کە بەردەوام دەڵێن لەسەر ڕێگای پێغەمبەران دەڕۆین، نەیانتوانیوە خۆیان لە ئاواکردنی سیستەمێکی نوێی نەمروود و فیرعەون دووربگرن کە هەمان نەمرود و فیرعەونی جارانی تێپەڕاندووە. هەروەها ئەگەر سوڵتان، شا و پادشاکان لەمیانەی ئەو سیستەمانەی ئاوایان کردووە بوونەتە دیلی هەمان سیستەم، دیسان پێویستە هێزی شارستانی لەمەدا ببینرێت. نیازی چاك و شوێنکەوتنی پێغەمبەران، لە وابەستەبوون بە سیستەمی نەمرود و فیرعەون ڕزگاریان ناکات.

مارکس، لینین و ماویش لەناخەوە بەشێوەیەکی ڕاستگۆ و دڵسۆزانە بەرامبەر سەرمایەداری تێدەکۆشن، تەنانەت بڕوای تەواویان هەیە کە بەرامبەر سەرمایەداری سۆسیالیزمیان ئاواکردووە، بەڵام هێندەی بەسەردا تێپەڕ نەبوو ئەو ئەنجامەی هاتە ئاراوە پیشانیدا کە ئەو بونیاد و پێکهاتەیەی ئاوایان کردووە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سەرمایەداریدا نییە. ئەوەی لێرەشدا هێزی خۆی دەسەپاند شارستانی نوێ، واتە مۆدێرنیتە بوو. چونکە هەڵسەنگاندنە رووکەشییەکانی سەرمایە بۆ پێشخستنی سۆسیالیزم بەس نەبوو. ئەوەی کەم بوو شیکارەکانی مۆدێرنیتە بوو. بۆچوونی دونیای پۆزێتیفیست کە لە قووڵاییەوە لە ژێر کاریگەریەکەیدا بوون، مۆدێرنیتەی وەك پیرۆزترین لۆخی ڕاستی پێشکەش دەکرد. نەك تەنیا ڕەخنەیان نەدەکرد، بەڵکو لەو بڕوایەدابوون و بیریان لەوە دەکردەوە کاملتری بکەن. ئەنجامەکەشیان لەبەر چاوانە. تا زنجیرەی هەڵەی مێژوویی بەردەوام بێت، تەنانەت ڕەسەنترین و پیرۆزترین ئامانجەکانیش لەبوون بە ئامرازی حساب و لێکدانەوە سەهۆڵییەکانی شارستانی و مۆدێرنیتە ڕزگاریان نابێت.

سەرباری ئەوەی پۆست مۆدێرنیتە یەکێکە لەو بزاوتە یەکەمینانەی بەجددی رەخنەیان سەبارەت بە بەردەوامنەبوونی مۆدێرنیتە گرتووە، بەڵام دوورە لەوەی ببێت بە ئەڵتەرناتیف. بونیادە داخراو و پێکەوە لێکنراوەکەی، دەرفەتی ئەوەشی پێنەدا جیاوازی خۆی لەگەڵ مۆدێرنیتەی کلاسیك بخاتە روو. هەوڵە هاوشێوەکانی رۆمانسییەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا لە جۆرێك لە جۆرەکانی ئەدەبیات بەولاوە تێپەڕی نەکرد. سەرباری ئەوەی ئەو رەخنانەی دەرهەق بە مۆدێرنیتە زۆر بەهادارە کە فریدریك نیچە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و میشێل فۆکۆ لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم سەرکێشییان کرد، بەڵام لە چوارچێوەی هەوڵ و کۆششی تاکەکەسی دەرنەچوون و بە ماهیەتی رەوتێکی هەرەوەزی ئەخلاقی و سیاسی نەگەیشت. سەرەڕای ئەوەی ئەنالیزە هەنووکەییەکانی فرناند برلودل، ئامانوێل والرشتاین، ئەندرێ گۆندەر فرانك و هاوڕێکانیان دەرهەق بە سیستەمی مۆدێرن و شارستانی لە چوارچێوەی یەکپارچەیی کۆمەڵگای مێژوویی هەڵوێستی رەخنەگرانەی واقیعیتر دەرهەق بە بابەتەکە لەخۆوە دەگرێت، بەڵام ناتوانرێت بگوترێت لە ئافراندنی ئەڵتەرناتیفدا هەمان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە. مۆدێرنیتە و شارستانی بە جۆرێك تاوتوێ دەکرێت وەك بڵێی سیستەمێکی خڕەکی(بازنەیی) داخراوە کە ناچارە بەردەوام بێت: رەخنەیەکی زۆر بەرفراوان پێشخراوە، بەڵام ئەوەی بەناوی ئەڵتەرناتیفەوە باس دەکرێت چەند رستەیەکی تێپەڕ نەکردووە. دەرك بە شێتبوونی نیچە و مردنی پێشوەختی مێشێل فۆکۆ دەکەین. بەڵام ناشێت و مەحاڵە وەك ئەڵتەرناتیف پێشکەشکردنی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەلایەن فرناند برلودل، سنووردارێوونی ئەمانوێل والرشتاین بە زارلوەکانی یەکسانیخوازتر، ئازادیخوازتر و دیموکراتیزەبوون، گوتە گشتییەکەی"یەکێتی لەناو جیاوازیدا" ئەندرێ گۆندەر فرانك بەس ببینین. وەك بڵێی بەم ناتەولوی و کەموکوڕیانەیان دان بەوە دادەنێن کە بەتەواوی خۆیان لە زنجیرەکانی زانستی تەوەری ئەورووپا رزگار نەکردووە کە زۆر رەخنەی دەکەن.

لەوانەیە شیکارکردنی بابەتەکە لەسەر بنەمای رەخنەکردن و پێشکەشکردنی ئەڵتەرناتیف لە چوارچێوەی بەرگرینامەدا وەك دادگاییکردنێکی شەخسی سەبارەت بەناوەندگەرایی شارستانی کۆن و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ببینرێت کە نوێنەرەکەی رۆژی ئەمڕۆمانە. لەلایەنێکەوە ئەم بۆچوونە راستە. بڕوای شەخسی خۆم ئەوەیە، تاك مەحکومییەتی خۆی ( بەواتا تەسکەکەی، مەبەستم مەحکومییەتی زیندان نییە، باسی ئەو مەحکومیەتە گشتییە دەکەم کە مۆدێرنیتە و شارستانی بەسەر ژیانی ئازادیاندا سەپاندووە) شیکارنەکات، ناتوانێت زانستێکی تەندروستانە

بەرهەم بێنێت. یەکەمین مەرجی ئەنجامدانی زانستێکی واتادار، ئەو سۆبژەیەی ئەنجامی دەدات بەر لە هەموو شتێك پێویستە خۆی شیکار بکات و پێگەی کرداری خۆی مسۆگەر بکات. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ئەو زانیاری و زانستەی بەدەستی هێناوە وەك سەرچاوەی فیکری لە بازاڕ بەکاری دێنێت، بەمجۆرەش زانستی دەسەڵات ئەنجامدەدات.

کۆڵەکەی سەرەکی ڕەخنەکانم ئەوەیە، سیستەمی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی (سیستەمی پلەداریشی لەناودا کە کۆنترە) سەرچاوەی خۆی لەو کەڵەکەکردنەی دەسەڵات و سەرمایە وەردەرگرێت کە لەسەر جڤاتە کۆچبەر و کشتوکاڵ ـ گوندەکانی لادێ و پیشەکار و کارکەرە کۆیلەکانی شار ئاواکراوە. ئەو پاوانانەی دەوڵەت و دەسەڵات لەگەڵ ئەوەی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم ماهیەتەی خۆیان پاراستووە چەندین بچمی لە شێوەی بازرگانی، پارە و پیشەسازییان بەدەست هێناوە، بەڵام خۆیان وەك دوو شێوەی بنەڕەتی و نەگۆڕ ماونەتەوە. مێژووی شارستانی لەسەر ئەو شەڕانە ئاواکراوە کە لەلایەك لەپێناو بەدەستهێنانی بەش لەنێوان خودی پاوانەکان دێتە ئاراوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو شەڕانەی هەموو بەیەکەوە دژی هێزە ڕکابەرەکان بەڕێوەیان بردووە. ئەویتریش شەڕەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی، گەمە و تەڵەزگەکانی شەڕ و دەسەڵاتن دەرهەق بە زەوتکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان. قۆناخی شارستانی سەرمایەداری، واتە مۆدێرنیتە لەپێشترین دۆخی ئەم سیستەمەیە. هەر لە سەرەتاوە سیستەم خاوەن کارەکتەری ناوەند ـ کەنار، هەژموونگەرایی ـ کێبڕکێ و تەنگەژەی هەڵکشاو ـ داکشاوە. هەرچی سەردەمی مۆدێرنیتەیە، بەتایبەتیش ئەو قۆناخەی سەرمایەی فینانس ڕۆڵی هەژموونگەرایی تێدا دەبینێت گوزارشت لە قووڵترین دۆخی قەیرانی بونیادی دەکات.

بەڵام ئەو ڕێگەچارە ئەلتەرناتیفەی کە پێشنیارم کردووە سەبارەت بەوەیە وەك پێویستییەکی کارەکتەری دیالیکتیکی سیستەم بەدرێژایی مێژووی مۆدێرنیتە لەسەردەمی هەڵکشانی پلەداری و سەردەمەکانی شارستانییەوە تا دەگاتە ئەو مۆدێرنیتەیەی مۆرکی سەرمایەداری پێوەیە، پێویستە لە زانیاری و بزووتنەوەکانی سروشتی کۆمەڵایەتی تەواوی هێزە ڕکابەرەکانیان بەدوایدا بگەڕێین. هیچ ئەوە یان ڤێرسیۆنێکی مێژووی شارستانی فەرمی نابێتە چارەسەری هێزە ڕکابەرەکان. ئەگەر تێکۆشانەکۆمەڵایەتیەکانی ئۆتۆپیای ئازادی و یەکسانی لەمێژوودا سەرکەوتوو نەبووە، هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەمان ئەو چەکانەیان بەکارهێناوە کە شارستانییە هەڵوەشاوەکە بەکاریهێنابوو (هێزەکانی دەوڵەت و دەسەڵات) هەروەها ئەو ئایندەیەی خوازیاری بونیادنانی بوون وەك ڤێرسیۆنێکی جیاوازتری شارستانییەکە

وێناكرابوو. كاتێك بەشێوەیەكی سەربەخۆ ئەو بونیاد و زهنییەتەی ئاوانەكرد كە بەگوێرەی سروشتی كۆمەڵایەتی خۆیان گونجاوە، ڕێگای لەپێش توانەوەیان لەناو ڤێرسیۆنی جەمسەری بەرامبەردا كردەوە.

هەروەك چۆن لێشاوی مێژوویی سیستەمێكی بازنەیی دووبارە بووە نییە، لەهەمانكاتدا پەرەسەندنێكی ڕاستەهێڵیش نییە. چەندە لەناو خۆیدا بزاوتی زهنی و بونیادی ئافراندبێت، بەو ڕادەیە كۆی بزاڤی ئەو چالاكی و هۆشیاریەیە كە گشتگیری بەدەست هێناوە و بە قەدەر ئەو قورساییەش بەش لەخۆوە دەگرێت. لەهەموو كاتێكدا دەشێت وەرچەرخان بۆ مێژوو (بە مێژووبوون) و بوون بە ئەڵقەی لێشاو ڕووبدات. مەرجی ئەمەش بەگوێرەی قورسایی پێویست بەدەستهێنانی فۆڕمی بونیادی و هێزی زهنییە. لەم واتایەدا مێژوو خاوەن سروشتێكە هەڵە ناكات. سەرجەم ئەو بۆچوون و چالاكیانەی هێزی زهنییەت و فۆرمی بونیادییان بەو ڕادەیە پێشنەخستووە كە جێگای خۆی لە مێژوودا بگرێت، ناچارن خۆیان بەرپرسیار ببینن.

### أ ـ شارستانی، مۆدێرنیتە و كێشەی قەیران

وەك پێویستییەكی بونیادەكەیان سیستەمەكانی شارستانی ماهیەتی تەنگەژەیان هەیە. واتە تەنگەژەو قەیرانەكان ڕەوشێك نین كە هەندێك جار لە ئاكامی فاكتەرە ناوەكی و دەرەكییەكان تێی بكەون. بەڵكو خودی سیستەم بەردەوام تەنگەژە (قەیرانی هەرە درێژ) بەرهەم دێنێت. لۆژیكی تەنگەژە چەندەی بڵێی سادەیە: بەشێوەیەكی گشتی دەسەڵات و بەجۆرێكی فەرمیش چینەكانی دەوڵەت لەسەر زێدە ـ بەها و بەها كۆمەڵایەتییەكان ئاوا دەكرێن كە دەستی بەسەرداگیراوە. ئەم چینانەی لە ناواخن و هەناوی كۆمەڵگادا ئاوا دەكرێن وەك پێویستییەكی بونیادە ڕێكخراو و چەكدارەكەیان بەردەوام مەیلی گەورەبوونیان هەیە. لەكاتێكدا توێژە ڕەنجدەرەكانی كۆمەڵگا بە زەحمەتییەوە گوزەران دەكەن و بەهۆی نەخۆشی هەمەجۆر و شەڕەوە دەمرن، بە بەراورد لەگەڵ چینەكانی دەوڵەت ژمارەیان كەم دەبێتەوە. هەرچی ژمارەی ئەندامانی سەرجەم دامەزراوەكانی دەسەڵات و دەوڵەتە، لەبەر ئەوەی خۆراكیان باشترە و خۆیان دەپارێزن و وەچەی زیاتر دەخەنەوە (كارەكتەری بنەماڵەكان بۆ دەسەڵات و دەوڵەتە یەكەمینەكان مەیلی بەلای خێزان و بنەماڵەی قەرەباڵغە. چونكە ئەمە پێویستیەكی سیاسەتی هێزە)، بەردەوام لەزیادبووندان. ئەم دۆخە ناهاوسەنگییە دوولایەنەی سیستەماتیكە بە واتای تەنگەژە دێت. چینەكانی دەوڵەت كە بەهێزتربوون و ژمارەیان زیادی كردووە، كاتێك لەسەر كۆمەڵگا بەها زەوت دەكەن، ئەوا

بەردەوامنەبوونی سیستەم دەکەوێتە گەڕ. ئەمەش ئەو ڕەوشەیە کە بە قۆناخەکانی تەنگەژە ناو دەبرێت.

بۆ دەرکەوتن لە تەنگەژە دوو ڕێگا پێویستە: یەکەمیان، ئەو هێزەی لە ئاکامی شەڕە گرگرتووەکانی هەژموونگەراییدا ڕەقیبەکانی خۆی لە ناودەبات وەك هەژموونێکی نوێ دەردەکەوێتە مەیدان. بەشێوەیەکی سروشتی لەبەر ئەوەی هێزی هەژموونگەرایی ڕەقیبەکانی خۆی لەناوبردووە کە پێشتر خاوەن بەش بوون و دەستی بەسەردا گرتووە، تا ڕەقیبی نوێ دەردەکەون بەشێوەیەکی ڕێژەیی تەنگەژەی تێپەڕاندووە. دووەمیان کە زیاتر بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ یەکەمیان پێشدەخرێت، لەمیانەی خستنەگەڕی بەرهەمهێنانی پەیپتر و پەیڕەوی بازرگانی و پیشەسازی، زیادکردنی بەرهەم فەراهەم دەکرێت. سیستەمی هەژموونگەرایی کە زیادکردنی بەرهەمی مەیسەرکردووە، واتا بەرامبەر بە تەنگەژە قۆناخی خۆشگوزەرانی بەدەستهێناوە. لە شارستانییەکانی چاخی یەکەمدا تەنگەژەکان هەم درێژخایەنترن هەم ماوەی نێوانیان درێژترە. زۆر جار ئەو تەنگەژانە ڕوویانداوە کە دوو سەد ساڵ تا هەزارساڵیان خایاندووە. هەر قۆناخێکی تەنگەژەی مەزن بەشێوەیەکی گشتی بە گۆڕانکاری خانەدان و ناوەند ئەنجامگیر بووە. لەسەردەمی شارستانی سۆمەر و میسرەوە دەشێت بەشێوەیەکی بەربڵاو ئەم قۆناخانە ببینرێت. لەگەڵ ئەوەی تەنگەژەکانی چاخی ناوینیش هاوشێوەی ئەمەن، بەڵام ماوەکەیان کورتتر بۆتەوە. بەشێوەیەکی مامناوەند، بە نۆخی ماوەی دوو سەد، دوو سەد و پەنجا ساڵ ڕوویانداوە.

لەگەڵ ئەوەی لەسەر ئەم ئاراستە و هێڵە گشتییە ڕوودەدات بەڵام تەنگەژەکانی سیستەمی سەرمایەداری لایەنی تایبەت بە خۆیان هەیە. لەسەرەتادا پاوانەکانی بازرگانی و درلو ڕۆڵی پیشەنگایەتی لە سیستەمدا دەبینن. پەیوەندییان لەگەڵ بەرهەمهێنان سنووردارە. لەبەرامبەر ئەمەشدا بە شێوەیەکی بەربڵاو پارە لە ئابووریدا بەکاردەهێنرێت، هەروەها پێشکەوتنی بازرگانی کاڵاکان و بوونی بەتایبەتێتییەکی زاڵ گرنگی پارە زۆر زیادی کردووە. بەپێی بەسەرچوونی قۆناخ پاوانی بازرگانی و پارە لەدەستی هێزێکی کەمدا چڕ دەبێتەوە. لە نۆخێکی بەمجۆرەدا بەهۆی بێپارەیی هێزی کڕین لەلایەن کۆمەڵگاوە دەکەوێت. لەبەر ئەوەی بەرهەمی زیادە بەکارنابرێت و بێکڕیار دەمێنێتەوە، یەکەمین نۆخی تەنگەژە، بەشێوەی تەنگەژەی بەرهەمی زیادە دێتە ئاراوە. لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی بەرهەمی زیادە نەفرۆشراوە، ستۆك دەبێت و لەناو دەبرێت، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو زەحمەتکێشانەی بەهۆی بێپارەیی هێزی کڕینیان کەوتووە، بەهۆی هەژاری و

برسێتییەوە دەشکێن. لەماوەیەکی کورتدا پێچەوانەکەشی روودەدات. ئەو بەرهەمەی پارە ناکات (بێنرخە) باش دەکەوێت، ئەو پارەیەی لەبەر دەستیشدایە پەیوەندی لەگەڵ بەرهەمهێنان دەبڕێت. واتە پارەیەکی زۆرو بەرهەمێکی کەم لە ئارادا دەبێت. زیادبوون و گرانی (نرخی) گوزەران و ژیان رەوشی تەنگەژەیەکی نوێیە. ئەو رێگایەی بۆ دەرکەوتن لە هەردوو تەنگەژە دۆزراوەتەوە، شانبەشانی شەڕەکانی هەژموونگەرایی کە رێگایەکی باوە، لەمیانەی زیادکردنی خەرجییەکانی دەوڵەت ، توێژێکی دیاری بەکرێ دەئافرێنێت، بەمجۆرە هەوڵی بەرتەرەفکردنی بەرهەمی کەم و زۆر دەدرێت. لەسەردەمی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەمجۆرە تەنگەژانە بەشێوەیەکی بەربڵاو و لەناو یەکتردا روویانداوە. ماوەکەیان توێژێکی دیکەش کورت بۆتەوە و بە پەنجا ساڵ تا سەد ساڵ گەیشتووە.

شەڕەکانی هەژموونگەرایی هێندە بەرفراوان، خەست و درێژخایەن بوون کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی دیکەی شارستانیدا بەراورد ناکرێن. ئەو پاوانانەی بەشداری شەڕیش بوون لە ئاستی نەتەوەیی و نێو دەوڵەتیدا بوون. لەم سۆنگەیەوە" بۆ یەکەمین جار ئاشنای شەڕێك بوون کە لە ئاستی جیهانیدا بێت. هەروەها هیچ کاتێك شەڕە خۆجێیی و هەرێمییەکان کەم نەبووە. لەمەش مەترسیدارتر هەنگاو بە هەنگاو تەواوی کۆمەڵگا لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە میلیتاریزە دەکرێت و دەخرێتە ناو جۆرێك لە دۆخی شەڕەوە. هەربۆیە ناوبردنی کۆمەڵگاکانی رۆژی ئەمڕۆمان بە کۆمەڵگاکانی دۆخی شەڕ واقیعیترە. دۆخی شەڕی سەپێنراو لە دوو باڵەوە بەڕێوە دەبرێت: یەکەمیان وەك تۆڕێك چاودێری و کۆنترۆڵکردنی تەواوی خانە و مەمیلەکانی کۆمەڵگایە لەلایەن ئامێر و دامەزراوەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە و سەپاندنی فشاری خۆیەتی، ئەمەش باڵی رێگایەکی واقیعییە. رێگای دووەم، ئەمەش جێگیرکردنی کۆمەڵگای وەهمییە لە جێگای کۆمەڵگای واقیعیدا، لەمیانەی سەرچاوەکانی تەکنۆلۆژیای گەیاندنەوە ئەنجامدەدرێت کە لەم پەنجا ساڵەی دوایی لەرێگای شۆڕشێکی چۆنایەتییەوە هاتە ئاراوە. دەشێت هەر دوو دۆخی شەڕیش بە کۆمەڵگاکوژی ناوببرێت. لەگەڵ ئەو جینۆسایدانەی جاران کە ئیتر کەمتر پەیڕەو دەکرێن، ئەم قڕکردنانەی کۆمەڵگا بە دۆخە خەست و بەردەوامەکەیانەوە کۆتایی سروشتی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکەن. لەوانەیە هەبوونی بوونەوەرێك بەردەوام ببێت کە لەجۆری مرۆڤ دەچێت، بەڵام بە سیفەتی جەماوەری مێگەل و کۆمەڵی فاشیزم. ئاماری کۆمەڵگاکوژی لەمیانەی لە دەستدانی ماهییەتی ئەخلاقی و سیاسی تەواوی کۆمەڵگا خۆی پیشان دەدات هەربۆیە زۆر لەجینۆسایدەکان قورسترە. خەمساردی گروپە مۆڵبووەکانی مرۆڤ و پیشاننەدانی بەرپرسیارێتییان بەرامبەر قورسترین

کارەساتە کۆمەڵایەتی و ژینگەییەکان ئەم راستییە دەسەلمێنێت. لەم سۆنگەیەوە ناتوانرێت نکوڵی لەم راستییە بکرێت کە رەوشێکی سەرووتری تەنگەژە و قەیران لە ئارادایە. ئەگەر دووبارەش بێت بە کورتی ئاماژەکردن بە چۆنیەتی گەیشتن بەم رەوشە سەبارەت بە فەراهەمکردنی یەکپارچەیی سوودبەخش دەبێت.

أ ـ لەسەردەمی ئاولکردنی یەکەمین پلەدارییەکانی دەسەلات و فەرمانڕەوایەتی دەولەت تا رۆژی ئەمرۆمان بەواتایەك لە واتاکان مێژوو گەورەبوونی کەڵەکە بوون (وەك تۆپی بەفرین چەندەی خلۆر دەبێتەوە گەورە دەبێت) ی دەسەلاتە. هەم ماوە زەمەنییەکان هەمیش شوێن پڕ لە شەڕەکانی دەسەلاتە کە پوختەی مێژووی شارستانییە. لە شەڕە خۆجێییەکانەوە تا شەڕە جیهانییەکان، لەشەڕی هۆزەکان تا شەڕە نەتەوەییەکان، لە شەڕە چینایەتییەکانەوە تا دەگاتە شەڕە ئاینییەکان گشتی بە زیادکردنی دەسەلات و گەورەبوونە کەڵەکەبووەکەی ئەنجامگیر بووە. زیادبوونی دەسەلات بە واتای پەرەسەندنی چینایەتی دێت کە بەشێوەیەکی مشەخۆرانە لەسەر بەها کۆمەلایەتییەکان دەژیت. چونکە ئەو حوکمڕانییەی کە لەسەرەتادا پلەدارییەکی سنووورداری پێکدەهێنا و لەرێگای ئەزموون و شارەزاییەکەیەوە کۆمەکی هێژای پێشکەش بە کۆمەلگا دەکرد، دوای وەرچەرخانی بۆ توخی دەولەت بە رەوشی کاستە داخراوەکان گەیشت. لە میانەی ماهییەتی خانەدانێتیش گروپە کاستەکان خۆیان لە پێگەی چینە جیاکارەکان رێکخست، تەنانەت بەو ئاستە گەیشتن بانگەشەی خودلوەندێتی بکەن. دەسەلاتەکانی چاخەکانی یەکەمین پڕ لەو ئیمپراتۆر و پادشا ـ خودلوەندانەیە کە بەردەوام لەمیانەی ئەم بانگەشانە گەورەبوون و خۆیان شکۆدار کردووە. دەسەلات و چینەکانی دەولەت کە وەك سێیانەی راهیب + بەڕێوەبەر+ فەرماندە خۆیان رێکخستووە، بەم توخەشیان ئیسان دەستەیەکی سنووردار بوون. رێژەیەکی زۆر کەمی ژمارەی کۆمەلگایان پێکدەهێنا. بەلام لەمیانەی نموونە لە ژمار نەهاتووەکانەوە ئاگادارین کە بەهۆی رەوشی سەرەتایی مشەخۆرییان بوونەتە بارێکی قورسی سەر پشتی کۆمەلگا. ئەهرام، پەرستگا و ئاراناکان زۆر بە چاکی ماهییەتی ئەم بارە روون دەکەنەوە.

لەچاخەکانی ناویندا زیادبوونی دەسەلات هیچ شتێکی لە خێرایی خۆی ون نەکرد. مێژوو پڕە لە شەڕەکانی دەسەلات، کە بۆ شوێنی بەرفراوانتر پەرش و بلاوبۆتەوە. بێگومان هۆکاری ئەمەش زیادبوونی بەرهەمهێنەری کۆمەلگایە. چینێکی بەرفراوانی ئەرستۆکراسەکانیش خرانە سەر خانەدانێتییەکانی پادشا. سەرباری ئەمە هێشتا ناتوانرێت باس لە شێرپەنجەییبوونی چینی حوکمڕان بکرێت. کارەسات ئەو کاتە دەستی پێکرد کە چینی ناوین بونیادی ئەرستۆکراتی و

پادشـایەتی رووخانـد و، دوای گۆڕینییـان، چـینی نـاوین واتـە بـۆرژوازی و بیرۆکراسـی بـە نۆخـی چینەکانی دەسەڵات (فەرمانڕەوا) گەیشتن. بێگومان دەشێت حوکمڕانی پێشووتریش بە کارەسـات ناوببرێت. بـەڵام ئەمانـە لـە رەوشێکدا نـەبوون سـەرجەم کۆمـەڵگا قـووت بـدەن. چـونکە پێگـەی چەندایەتی و چۆنایەتییەکەیان دەرفـەتی بەمـە نـەدەدا. کاتێـك بەشـێکی گرنگـی بـۆرژوازی نـاوین لەگەڵ توێژەکانی سەرووی پاوانخوازی بۆرژوازی، واتە لەگەڵ بیرۆکراسیەکەیان بوون بـە دەسـەڵات و بە نۆخی چینەکانی دەوڵەت گەیشتن، بەو واتایەدێت کە دەیان هـەزار هێـزی خانـەدانی نـوێ لـە جیاتی هێزی چەند خانەدان و پادشایەتییەك ئاواکراون. واتە هەزاران پاشا جێگـای پادشـایەکیان گرتۆتـەوە. یەکبوونی کەسایەتی پیاوسالاری کە لە کۆمەڵگای رەگەزگەرایی پەرەیسـەندووە لەگـەڵ هێزەکانی ئەم پادشایەتییە نوێیە، بەواتای فەتحکردن و داگیرکردنی تەولوی سروشتی کۆمەڵایـەتی دێت لەلایـەن هێـزە نوێکـانی دەسـەڵاتەوە. سـەرجەم توێـژەکانی کۆمـەڵگای سیاسـی و ئـەخلاقی لەسەرووی هەموویانەوە ژن، دەبنە قوربانی ئەم داگیرکارییە ناوخۆییە.

بەهۆی پەیوەندییە ریشـەدارەکەی زانسـتی کۆمەڵایـەتیی لەگـەڵ چـینی نـاوین تـا ئێسـتا بـە دەوڵەتبوونەکەی شیکار نـەکراوە. بـۆ ئـەوەی سـەبارەت بـە کۆمـەڵگا دەوڵـەت واتایـەکی هـەبێت، مسۆگەر پێویستە وەك کەڵەکەبوونی ئەزموون و پیشەی پسـپۆڕی دەسـت بـەکاربێت. دەرککـردن بەم خاڵە زەحمەت نییە کە دەرهەق بە بەڕێوەبەرایەتی پسپۆڕی و ئەزموون لەمیانـەی ژمارەیـەکی زۆر کەمـەوە نوێنەرایـەتی دەکرێـت. بـەڵام کاتێـك بـۆرژوازی و بیرۆکراسـی بـە جەسـتە زەبەلاحەکەیانـەوە خۆیـان وەك چـینی فـەرمانڕەوای دەوڵـەت پێشـکەش دەکـەن، گـەورەبوونی شێرپەنجەییانەی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا دەکەن بە رووداوێك کە دەربازبوون لێی نەبێت.

دەوڵەت ـ نەتەوە کە گوزارشت لە یەکبوونی پاوانەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی و چەوسانەوەی ئابووری لەگەڵ ئامێرەکانی دەسەڵاتدا دەکات، لە رێگای دەسەڵاتەوە بوو بە هەموو شتێك. هەرچی کۆمەڵگایە بوو بە هیچ. ئەمە گەوهەری ئەو بوویەرەیە کە قەیرانی دەسەڵاتی پێدەڵێین. سیستەمی سەرمایەداری هێزی ئافرێنەری ئەم قەیرانەیە. تۆڕی سەرمایەداری لەگەڵ چینی ناوین و پاوانەکانی سەرمایە کە لەسەر ئابووری سنووری گەورەبوونی ناناسێت، تەنیا کاتێك دەسەڵات بە سیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە شێوە دەگرێت دەتوانێت درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. ئەمەش ئەم رووداوەیە کە بە بنبەستبوونی سیستەم ناو دەبرێت. بە دەسەڵاتبوونیش رەوشێکی سەرووتری قەیرانە.

ب ـ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی کە توخی ئاسایی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە لەم سەردەمەمان بەجۆرێك رووبەرووی بێبەشبوون لە ماهییەتە بنەڕەتییەکانی بۆتەوە کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی دیکەی مێژوودا بەراورد ناکرێت. کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی کە بە درێژایی چاخەکانی کۆن و ناوین لە سەر بنەمای دژایەتی دەوڵەت هەڵکشا، لەمیانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە ناچار بووە بەخێرایی جێگای خۆی بۆ حوکمڕانی دەوڵەت و ماددەکانی یاسای پۆزیتیڤ بەجێبهێڵێت کە بەشێوەیەکی بێ سنوور زیادی کردووە. واتە لەمۆدێرنیتەدا ماهییەتی ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا جێگای خۆی بۆ جەماوەری بە مێگەل بوو و ئەندام ـ هاووڵاتی ـ یە بە مێرووله کراوەکەی بەجێهێشتووە کە هیچ واتایەك نابەخشێت.

ئەو هاووڵاتییەی بانگەشەی مۆدێرنبوونی دەکرێت هیچ نیگەرانییەکی ئەخلاقی و سیاسی لە خۆوە ناگرێت، بەپێچەوانەی بانگەشەکان نوێنەرایەتی لاوازترین قۆناخی بوون بە تاك دەکات. پەیوەندییەکەی لەگەڵچ کۆمەڵگاوە بە ژنەکەیەوە سنووردارە کە دەستڕۆیی ئیمپراتۆریەتی لەسەر بەڕێوە دەبات. بوونەوەرێکی بێ کەسایەتییە و هێندە لەناو دەستڕۆیی حوکمڕانی دەوڵەت و دەسەڵاتدا تواوەتەوە کە لەگەڵ سەردەمی فیرعەونیش بەراورد ناکرێت. راستتر، لەمیانەی هەژموونگەرایی جەستەیی و ئایدیۆلۆژییەوە، لەرێگای کردەوەکانی تەکنیك و راگەیاندنەوە هاووڵاتی تەنیا رادەستی سیستەمی پاوانخوازی نەبووە، بەڵکو بەبێ هیچ شەرت و مەرجێك بووە بە ئەندامێکی فاشیستی خۆبەخشانەی ئەم سیستەمە. ئەمە ئەو رووداوەیە کە بە قەیرانی کەسایەتی ناوم برد. سروشتی کۆمەڵایەتی لەم جۆرە کەسایەتیانە پێکنایەت، چونکە شانە سەرەکییەکەی ماهییەتێکی سیاسی و ئەخلاقی هەیە. بە مۆمیش بەدوای ئەم چۆنایەتییەدا بگەڕێن لەم کەسایەتیەدا نایدۆزنەوە. دەوڵەت لەرێگای ئەم کەسایەتیانەوە دەتوانێت بەڕێوەبچێت. بەڵام هیچ کۆمەڵگایەك لەرێگای ئەم کەسایەتییەوە بەردەوام نابێت. راستتر بڵێین، ئەم کەسایەتییە واتای نکوڵیکردن لە کۆمەڵگا دەبەخشێت.

بەگوێرەی ئەوەی دەوڵەتیش بەبێ کۆمەڵگا نابێت، جارێکی دیکەش رووبەرووی ئەو رەوشەین کە دەوڵەت و کۆمەڵگا بەیەکەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ دووچاری قەیران هاتوون. رەوشی ئەو بێ کەسایەتییەی کەسایەتی تاکڕەویتی سەرمایەداری تێی کەوتووە جگە لە سێبەر و شوێنپەنجەی ئەو قەیرانەی کۆمەڵگا و دەوڵەت تێیدا دەژیت شتێکی دیکە نییە. ئاشکرایە تا کۆمەڵگا و تاك نەخرێنە ئەم رەوشەوە، نە پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات، نە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوە کە فۆرمی دەوڵەتی یەکگرتووە، هیچ یەکێکیان ئاوا ناکرێن. قەیرانی کۆمەڵایەتی

گوزارشت لە رەوشێکی سەرووتری قەیرانی بونیادی دەکات. دەشێ بونیادێکی نوێ لە جێگای ئەوەی پێشوو ئاوا بکرێت. بەڵام لەدەستدانی ماهیەتە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگابوونە، رەوشێك نییە بە ئاسانی لەرێگای سەرلەنوێ ئاواکردنەوە تێپەڕ بکرێت. پێویستی بە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. زەحمەتییەکە لێرەدایە.

ج ـ شارگەرایی فاکتەرێکی دیکەی هەرە قەیراناوی مۆدێرنیتەیە. کۆمەڵگای شار کە لەمیانەی کشتگیری دیالیکتیکی لەگەڵ کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ گەشەی کرد رۆڵێکی گرنگی کۆمەڵایەتی بینیوە. هەروەها لە پێشکەوتنی راسیۆنالی و پیشەسازیدا رۆڵێکی کۆمەڵایەتی هەیە. هێشتا ناکۆکییەکەی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەر پێشنەکەوتووە. بەڵام قۆناخی دەوڵەتبوون رۆڵی شاری شێواندووە. شار کە کراوەتە شوێنی جێگیربوونی چینی فەرمانڕەوا، بەمجۆرە بەپێی بەسەرچوونی قۆناخە مێژووییەکان بونیادو زهنییەتێکی دژ بە ئیکۆلۆژی و کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵی بە دەست هێناوە. لەبەرئەوەی شانبەشانی چینی بەرهەمهێنەر پێگەی ناوەندی چینی بازرگانی بەدەست هێناوە، ئەرکی دژ بەکۆمەڵگا لەشار بارکراوە. ئەو رۆڵە نەرێنییانەی لە چاخەکانی یەکەمین(کۆن) و ناویندا سنووردار بوون لە سەردەمی مۆدێرنیتە وەك هەرەسی بەفر گەورەبوون. ئەو شارانەی لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازییەوە وەك شێرپەنجە گەورەبوون، بوونەتە ناوەندی رووخاندنی کۆمەڵگای نەریتی. شاری پیشەسازی شار نییە، بەڵکو شاری ناشارە، دەرخستنی شارە لە نۆخی شارێتی و ناوەڕۆکی خۆی. نەك شارە ملیۆنییەکان، تەنانەت شارە سەد هەزارییەکانیش پێچەوانەی لۆژیکی شارە. شارێکی ملیۆن کەسی نابێت، دەشێت چەندین شار بەیەکەوە ژمارەی دانیشتوانەکەیان ملیۆنێك کەس بێت. ئەگەر شوێنێك شارێکی پێنج ملیۆنی کەسی هەبێت، واتە بەلانی کەم پەنجا شار لەوێ هەیە. تایبەتمەندێتی رووخێنەرانەی شار سەبارەت بە کۆمەڵگا لەم راستیەیدا شاراوەیە. کۆمەڵگا ئاساییەکان بەرگەی ئەمجۆرە شارانە ناگرن، هەرچی ژینگەیە هیچ بەرگەی ناگرێت.

ئەو لۆژیکەی لە ژێر گەورەبوون و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی ئەمجۆرە شارانەدایە، چەوساندنەوەی کۆمەڵگای ناسەرمایەداری، زیادکردنی دەسەڵات و بەرزکردنەوەی چینی ناوینە بۆ پێگەی حوکمڕانی. هەرسێ فاکتەریش لەمیانەی لەناوبردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پێکدێت. تەنیا کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ و کۆمەڵگا کۆچبەرەکان پاکتاو ناکات، بەڵکو هونەرمەند، پیشەوەران، رۆشنبیر و رەنجدەرەکانی دیکەش کە لە شاردا رۆڵێکی ئەرێنی باو

دەبینن، هەم کلتووری ماددی هەم کلتووری مەعنەوییان دەخاتە نێو پرۆسەی لەناوبردنەوە. بەمجۆرە لە کۆمەڵگای شارەوە بۆ جەماوەری شار گوزەر دەکات. هەرچی لادێ نشینەکانن بۆ گەڕەکەکانی تەنیشت شار دەگوزارێنەوە، بەمجۆرە بە پێگەی کۆلۆنییەکی کۆنترۆڵکراو دەگەن. پاوانی دەوڵەت و سەرمایە شار قووتدەدەن، شاریش ناوچە لادێیەکان قووت دەدات. هەرچی ئەو کۆمەڵگایەیە کە کۆمەڵگا نییە، ژینگەی قووت داوە. بەگوێری ئەوەی نە کۆمەڵگای لادێ، نە ژینگە، نە رۆشنبیر و رەنجدەرە باوەکانی شار، هیچ یەکێکیان نەماون شار هەڵگرن، ئەو رەوشەی هاتۆتە ئاراوە جارێکی دیکە دۆخی سەروتری قەیرانە.

نەك تەنیا کارەساتەکانی ژینگە، بەڵکو کۆمەڵگاکوژییەکی واقیعی راستەوخۆ پەیوەندییان بەم شێرپەنجەبوونەی شارەوە هەیە. دەستنیشانکردنێکی هاوبەشی زانستەکانە کە لەمیانەی رەوشی ئەو شارە زۆرانەی نەك تەنیا ناوچەیەك تەنانەت وڵاتێکیش ناتوانێت هەڵیگرێت، هاوسەنگی ئیکۆلۆژیای جیهان زەبرێکی کوشندەی بەرکەوتووە. هەرچی نیشانەکانی لەناوبردنە کە بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنرێت، رووخاندنی شانەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە لەلایەن فەرمانڕەوایی چینی ناوینەوەوە کە وەك تەنێکی وەرەمدار گەورە دەبێت، واتە جەماوەری بێکارە، قەرەباڵغی هاووڵاتییە نابەرپرسیارەکانە.

د - پاوانەکانی دژە ئابووری کە چەندەی دەچێت هێزە هەژموونگەراییەکەی گەورە دەبێت، سەرچاوەکانی ئابووری بە کەڵەکەکردنی قازانج - سەرمایە دەبەستنەوە، بەمجۆرەش لەپێگەی دابینکردنی پێداویستیە سەرەکییەکانی کۆمەڵگایان دوورخستۆتەوە. بە پێچەوانەی مەزەندەکان، لەمیانەی تەنگەژە سیستەماتیکەکانیەوە سەرمایەداری سەلماندوویەتی کە نەك تەنیا بە پیتترین سیستەمی ئابووری نییە، بەڵکو پاوانێکی دژە ئابوورییە. سەرباری سەرجەم تێزە پێچەوانەکانی ئابووری - سیاسی، تۆڕەکانی پاوانی سەرمایەداری، لە سیستەمێکەوە کە پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ بەرهەم دێنێت ئابووری بۆ سیستەمێك گۆڕی کە بە جۆرێك کەڵەکەکردنی قازانج - سەرمایە بەدیدێنێت کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی دیکەدا بەراورد ناکرێت. پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا بە ئاستێك گەیشتوون کە زۆر بە ئاسانی دەتوانن پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ دابین بکەن. بەڕێوەبەرایەتییەکی راست و دروستی ئابووری لەرێگای بەکارهێنانی زانست و تەکنۆلۆژیاوە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت ئەم پێداویستییانە فەراهەم بکات. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا

لەبەر ئەوەی دەرفەت بە گەشەکردنی ئابووری نادات، کەڵەکەکردنی قازانج ـ سەرمایە دەکەوێتە مەترسییەوە. بەمجۆرەش دژایەتیکردنی ئابووری دەبێتە ناچارییەك.

پێویستە لەم واقیعەدا بەدوای تەنگەژەی بونیادی و سیستەماتیکدا بگەڕێین. چونکە ئەو تەنگەژە و قەیرانانەی لەمیانەی ئەو بێکاری (زۆر دەگمەن مێژوو باس لە کۆیلە و بەندەی بێکار دەکات)ییەی لەمێژوودا نموونەی نەبینراوە، هەژاری و برسێتی و کەم و زیادی بەرهەم خۆی پیشاندەدات (زۆر دژوار نین بەڵام بەربڵاون) شەڕ و پێکدادانەکان چڕتر دەکەنەوە کە ئامرازە باوەکانی چارەسەرین و درێژخایەنتریان دەکەن، جۆرێك لە فەرمانڕەوایی قەیران پێکدێنێت. چونکە دژایەتی ئابووری بەناچاری پێویستی بە فەرمانڕەوایی قەیرانە. جۆرێکی دیکەی حوکمڕانی نابێت. لێرەدا پێویستە باش تێبگەین کە حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوە حوکمڕانیەکی نائاسایی قەیرانە. دەرخستنی کۆمەڵگا لە ناوەڕۆکی خۆی و گۆڕینی بۆ جەماوەری مێگەلێکی ـ فاشیست، تەنیا پەیڕەوێکی تایبەت بە هیتلەر نییە، بەڵکو پەیوەندی بەکارەکتەری میلیتاریستانەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەیە. لەبەر ئەوەی سیستەمی پاوانخوازی بەجۆرێکی دیکە بەردەوام نابێت، فەرمانڕەوایی دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی ئەو فۆرمەی دەسەڵات کە تا بەرزترین ئاست کۆمەڵگای گەمارۆداوە و تا ناو مەمیلەکانی دزەی کردووە، ناچارە ببێتە فەرمانڕەوایی قەیران. ئافراندنی نەتەوە ئامانجی لاوەکییە. هەرچی میللیگەرایییە، لەگەڵ فاکتەرە ئایدیۆلۆژییەکانی دیکە مەرجێکی دەست لێبەرنەدراو و ژیانی ئەم شێوازەی حوکمڕانییە.

جیاکردنەوەی تەنگەژە پیشەسازی، فینانس و بازرگانییەکان سەبارەت بە پاوانەکانی سەرمایەداری، شێوازێکی پەیڕەوکراوی شیکارکردنە. هەروەها زاڵکردنی قۆناخەکانی تەنگەژە ـ خۆشگوزەرانی لە پیشاندانی ناوەڕۆکی سیستەم دوورە. خڕەکەکانی ناوەند ـ کەنار، هەژموون ـ کێبڕکێ و تەنگەژە ـ خۆشگوزەرانی، هیچ یەکێکیان گەوهەری راستەقینەی سیستەم پیشان نادەن. بێگومان تەواوی ئەم واقیعانە بەشی خۆیان هەیە. بەتایبەتیش ئەمە دەستنیشانکردنێکی راستە کە قۆناخی هەژموونگەرایی پاوانەکانی فینانس ئەو قۆناخەیە کە هەرە زێدە قەیرانی تێدا رەنگدەداتەوە. بەڵام پێویستە لەمیانەی تێگەیشتنی ئەم خاڵەوە شیکار پێشبخرێت، ئەگەر دەرك بە دژایەتی سیستەم بەرامبەر ئابووری نەکرێت ئەم واقیعانە واتایەکی ئەوتۆیان نابێت.

هـ ـ تەقینـەوەی قـەیرانی ئیکۆلـۆژی لەسـەردەمی مۆدێرنیتـەدا رێکـەوت نییـە. ئـەم قەیرانـە پەیوەندی بە سیستەمەوە هەیە کە دژە ئابوورییە. لایەنی بونیادی لـەخۆوە دەگرێـت. هاوسـەنگی

بایۆلۆژی لە بنەڕەتدا لەمیانەی پەیوەندی سیمبۆتیک (دوو لایەنە یەکتری بەخێوکردن و بەردەوامبوون)ەوە بەدیدێت. بەشی بایۆلۆژی ژێری گەردوونی ڕێکخستنێکی بەمجۆرەی فەراهەم کردووە. پێشتر هەوڵماندا بوو ژیان وەك فەراهەمبوون و گەشەکردنی جیاوازییەکان پێناسە بکەین. هاوسەنگی بایۆلۆژیش وابەستەی ئەم ڕێسایەیە. هەروەها ئاماژەم بە پەیوەندی پێکهاتنی جیاوازی لەگەڵ توانای هەڵبژاردن و ئازادی کردبوو. جیهانی میکرۆ (بچووکترین تەنۆلکەکانی ووزە و ماددە) و جیهانی ماکرۆ (دوورگەکانی ماددە و ووزە کە بەقەدەر گەردوون گەورەن) بە سیستەمێکی هاوشێوە کاردەکەن. لێپرسینەوە لەبارەی هۆکاری شێوازەکانی پەیوەندی ناکات کە جیاوازییەکانی فەراهەم کردووە. ئێستا بەگوتەی "لەبەر ئەوەی بەمجۆرەن ئاوەهان" سنووردار دەبین. لەوانەیە ناتەواوی زانیاریەکانمان و چەمکی چەوتی زانیاریمان لە دەرککردن بە ڕاستییەکان بێچارەبێت.

سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ژینگەدا وابەستەی ئەم یاسا گەردوونیەیە. لە هەمانکاتدا لەبەر ئەوەی سروشتەکەی بە نەرمترین ژێری بارکراوە، جۆرێکە توانای ئازادی و هەڵبژاردنی لە بەرزترین ئاستدایە. پاوانەکانی سەرمایەداری کە دژە - ئابوورین لەگەڵ ئەم ڕێسایە ناکۆکن. هەروکو چۆن لەناو بونیادی کۆمەڵگادا پەیوەندی سیمبیۆتیك بۆ زۆرترین پەیوەندی باڵادەستی، دەسەڵات و زۆرداری دەگۆڕێت، پەیوەندییە ئیکۆلۆژییەکانی لەگەڵ ژینگەش بۆ پەیوەندی حوکمڕانیکردن و کۆلۆنیکردنی سروشت دەگۆڕێت. هەروەك قەوزە بکوژەکان یاخود هەروەك لە جۆرێکی دیکەی هاوشێوەدا دەبینرێت، تەواوی ژینگە و کۆمەڵگا دەخاتە ژێر ڕکێفی باڵادەستی یەکلایەنەی خۆی و هاردەبێت. بەمجۆرە بەدۆخی بوونەوەرێکی زەبەلاح (لێڤی ئەتهان) دەگات. چونکە سیستەمێك تەنیا پشت بە کەڵەکەکردنی قازانج - سەرمایە ببەستێت بەجۆرێکی دیکە ڕەفتار ناکات. ئەگەر بە ئاراستەیەکی پێچەوانە بجووڵێتەوە، واتە ئەگەر شێوازی پەیوەندی سیمبیۆتیك بە بنەما بگرێت، ئەوکاتە یاسای قازانج کار ناکات. بەمجۆرەش سیستەم ناچاری وەرچەرخان دەبێت.

بەپێچەوانەی مەزەندەکان سروشت و ژینگە لەگەڵ سیستەمی لۆژیکی خۆیان لە هاوسەنگیدان. بەڵام باسکردنی دیلێتی هێزە کوێرەکان[1] هەڵسەنگاندنێکی چەوتە. ئەوەی ئەم

---

[1] هێزی نابینا: زاناکانی فیزیا هاوڕان کە هەموو شێوە جیاواز و شێوازەکانی وزە لە سروشتدا هێزی نابینان. بەڵام بە ڕووخسارە جیاوازەکانیەوە لە هەر شوێنێکی ژیان لە ئارادا بێت، ئەم هێزانە هەوڵدەدەن نموونەی دەست نیشانکراو و گونجاو بە گوێرەی ئەو سروشتە بئافرێنن و ئاوا بکەن کە تێیدا خولقاوە. ئەم وزە ئاراستەکارە لە هەموو شوێنێکی سروشتدا بوونی هەیە، لە سەرجەم

هەستیارییەی رووخاندووە، سیستەمی شارستانی بەتایبەتیش مۆدێرنیتەی پاوانخواز و ستەمکاری رۆژگاری ئەمرۆمانە. گەورەبوونە شێرپەنجەییەکەی چینی ناوین کە بووە بەهێزی دەسەڵات، هەروەها بە هەمان شێواز گەورەبوونی شێرپەنجەییانەی شارەکان کە گۆڕەپانە سەرەکییەکانی ژیانن و گرێدانی ژیان بە زنجیری دەوڵەت - نەتەوەوە هۆکارە کۆمەڵایەتییە راستەقینەکانی وێرانکارییەکانی سەر ژینگەن. هەم لە رێگای شەڕکردن بەرامبەر بونیادەکانی سروشتی کۆمەڵایەتی کە بە نەرمترین ژێری بارکراوە، هەمیش لەمیانەی گۆڕینی پەیوەندییە سیمبۆتیکەکەی لەگەڵ ژینگە بۆ پەیوەندییەکانی زۆرداری و کۆلۆنیکردن رێگا لەپێش ئەم وێرانکاریانە دەکاتەوە. لەبەر ئەم هۆکارەیە پەیوەندییەکی توند لەنێوان قەیرانی کۆمەڵایەتی (راستتر کۆمەڵگاکوژی) و قەیرانی ئیکۆلۆژی هەیە. قەیرانەکانی هەردوو گۆڕەپان بەردەوام یەکتری بەخێو دەکەن. لەکاتێکدا قازانجی پاوان رێگا لەپێش زیادبوونی ناچاری ژمارەی دانیشتوان، بێکاری، برسێتی و هەژاری دەکاتەوە، هەمان تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان بۆ نەهێشتنی بێکاری، هەژاری و برسێتی ناچار دەبێت ژینگە تێکبدات. بەمجۆرە جیهانی ئاژەڵان، رووەك و دارستانەکان دەکەونە ژێر مەترسییەکی گەورەوە.

بێگومان ئەم رەوشەش وەك قازانجێکی زیاتر بۆ پاوانەکان دەگەڕێتەوە. تا ئەم گێژاوە بەردەوام بێت (بۆنموونە ئەگەر ژمارەی دانیشتوان ببێتە دە ملیار و زیاتریش بێت) هاوسەنگی بەرگەگرتنی دونیا بەتەواوی هەڵدەوەشێتەوە. بەمجۆرە قیامەتی چاوەڕوانکراو روودەدات. هەر وەکو چۆن گەورەبوونی شێوەی شێرپەنجەیی لە ئاستی خانەدا شێوەی گەورەبوونی تەندروستانە بەلاڕێدا دەبات و رێگا لەپێش شێرپەنجە و مردن دەکاتەوە، بە شێوازێکی هاوشێوە گەورەبوونی قازانجی پاوانیش گەورەبوونی تەندروستانە (لە هەر ئاستێکی سروشتی کۆمەڵایەتیدا) بەربەست دەکات، بەمجۆرە گەشەی شێرپەنجەیی کۆمەڵگا و ژینگە دەستپێدەکات. هەروەها لەلایەن زانستی پزیشکییەوە روونکراوەتە کە نەخۆشییەکانی شێرپەنجەی بایۆلۆژی لە جۆری مرۆڤدا وەك دەرەنجامێکی ئەم شێرپەنجە کۆمەڵایەتییە هاتۆتە ئاراوە. بوونەوەرێکی وەك جۆری مرۆڤ کە خاوەن ئاستێکی نەرمی ژیری و توانای هەڵبژاردن و ئازادییە بەهەر حاڵ لەمێروولەیەك کەمتر نییە. ئایا هیچ بینراوە مێروولە بێکار بێت، تا بەم دۆخە ژیرییەی ئێستای مرۆڤ بێکار بمێنێت؟ ئەگەر بەدوای یاسای قازانجەوە بن، ئەوا دابەشکردن و رێکخستنەوە ئیکۆلۆژییەکان بەتەنیاش خاوەن

---

شێوەکانی ژیان بە شێوازی بۆماوەیی بەردەوام دەبێت. هەروەها بەو ئەنجامە گەیشتوون کە بۆشایی گەردوونی مادەیەکی پلازماییە وەك هەبوونێکی زیندوو دەتوانێت پرۆسەی پەرەسەندن لە سروشتدا بەڕێوە ببات.

ئەو دەرفەت و توانایانەی خستنەکارن کە بێکاری لە ئارادا ناهێڵێت. ئەو خستنەکارانەی ئامانجی ئیکۆلۆژییان هەیە لەلایەکەوە ژینگە رزگار دەکەن، لەلایەکی دیکەشەوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەتوانێت کۆتایی بە بێکاری بێنێت. دەشێت هەزاران گۆڕەپانی بەمجۆرە بدۆزرێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بەگوێرەی یاسای زۆرترین قازانج وەك سەرچاوەی قازانج نابینرێن، لە بەکاربردن بێبەش دەکرێن. ماهیەتی پەیوەندی نێوان ئیکۆلۆژی و سیستەم قەیراناوییە و بەردەوام نابێت.

و ـ ئایدیۆلۆژیای هەژموونگەرایی سیستەم (لیبڕالیزم) نە بەشێوە کلاسیکەکەی و نە بەشێوە نوێیەکەی چارەسەری بەرهەم ناهێنێت. لیبڕالیزم کە وەك وشە واتای ئازادیگەرایی (مەزهەبی ئازادی) دەبەخشێت، زاراوەیەکە رێژەگەراییەکی چڕی هەیە. کۆیلایەتی وەك شێوە دژەکەی ئازادییە کە بۆ کەسێك یاخود گروپێك رەنگیداوەتەوە، ئازادییە هەرە زۆرەکەی پادشا ـ خوداوەندەکانی چاخی یەکەمین، بەرامبەرەکەی خۆی وەك چینی کۆیلەدار ئافراندووە. تەنیا لەمیانەی کۆیلایەتی کۆمەڵێکی بەرفراوانی لادێیی ـ بەندەکان ئازادی بۆ ئەرستۆکراسی چاخی ناوین بەدیهاتووە. هەرچی ئەو لیبڕالیزمەیە کە لەپێناو بۆرژوازییەکانی سەردەمی نوێیە، لەمیانەی کۆیلایەتی کەمترین کرێی پرۆلیتار و پرۆلیتارە نیوەچڵەکانی شێوازی نوێی کۆیلایەتی لەگەڵ رەنجدەرەکانی دیکە بەیەکەوە لەناو یەکتردا بەڕێوەچووە. لیبڕالیزم بە واتا فەرمییەکەی لەکاتێکدا بۆ تەواوی چینەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە مانای ئازادییە، بەڵام بۆ بەندە مۆدێرنەکان واتە بۆ هاووڵاتییان واتای بێکاری، کارکردنی بێکرێ، نەداری، برسێتی، نەبوونی یەکسانی و ئازادی و دیموکراسییە. پێویستە زۆر باش ئەم راستییە ببینین کە لیبڕالیزم بەواتا راستەقینەکەی مانای ئازادیگەرایی نایەت. هێگل دەوڵەتی بە باشترین ئامرازی ئازادی دانا بوو. بەڵام ئاشکرابوو کە ئەم ئازادییە تەنیا بۆ بیرۆکراسی و چینەکانی دەوڵەت جێگای باسە. بە گوتەیەکی دیکە ئەوەی بۆ پاوانەکانی دەسەڵات و ئابووری بەرزترین ئاستی ئازادییە، بۆ تەواوی ئەوانی دیکە کۆیلایەتییە.

پێناسەکردنی لیبڕالیزم وەك ئایدیۆلۆژیا گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. ئەگەر تەنیا بڵێین تاکرەوێتی و ئازادیگەراییە، کورت دێنێ و پێناسەکردنەکەی ناتەواو دەبێت. لیبڕالیزم وەك زاراوە لە شۆڕشی فەرەنسادا لەگەڵ زاراوەکانی یەکسانی و برایەتی دەرکەوتە پێش: Fraternite، Liberte،Egalite (ئازادی، یەکسانی، برایەتی)ی بەناوبانگ. بەو سیفەتەی زاراوەیەکی ناوەندییە" مزحافەزەکارەکانی لەلای راستی خۆی، هەرچی لایەنی چەپێتی سەرەتا دیموکراسخوازی، دواتریش سۆسیالیستەکانی لای خۆی بینی. دیمەنێکی میانڕەوی بەو جۆرەی

نیشـاندا کـە بـەبێ پێویسـت بینـینی شـۆڕش، لەمیانـەی پەرەسـەندنەوە سیسـتەم (پـاوانخوازی سەرمایەداری) پێشدەخات. ئەگەر لەرێگای پەرەسەندنەوە بێـت یـان شـۆڕش، موحافـەزەکارەکان بەتەواوی دژی پێشکەوتنی ئازادیخوازانە بوون. بەشێوەیەکی دەمارگیرانە بەرگرییان لەپادشایەتی، بنەماڵەگەرێتی و کڵێسـا دەکرد. هەرچـی سۆسیالیسـت و دیموکراسـیخوازەکانیش بـوون، لـەپێناو گۆڕانکارییەکی خێرا شۆڕشیان بە ناچارییەك دادەنا. خاڵی هاوبەشی هەمووشیان مۆدێرنیتـە بـوو. هەرچەندە هەندێك خاڵی ناڕازیبوونیان هەبێت، بەڵام بۆ مۆدێرنیتەبوون هەر کـەس خـۆی بـەخاوەن بانگەشە دەزانی. ئەنجامدانی وەرچەرخانێك لە چوارچێوەی هێڵـە گشـتییەکانەوە بـۆ گەیشـتن بـە مۆدێرن بوون بەس بوو. ژیانی مۆدێرن کە تەوەرەکەی ئەورووپا بوو، لەگەڵ شارگەراییدا بناخەکـەی دانرلو لەمیانەی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری خێرابوو، نوێنەرایەتی ئاسۆی هاوبەشی هـەر سـێ ئایدیۆلۆژیای سەرەکیشی دەکرد. کێشەکە لەم خاڵەدا دەبوو بـەگرێ کـە کـێ، کامـە ئایـدیۆلۆژیا و پارتی، بەڕێوەبەرایەتی و کردار، چالاکی و شەڕ بە باشترین شێوە بەم ئاسۆیە دەگات.

لیبرالیزم زۆر بەباشی ئەم رەوشەی دەستنیشان کرد. کاتێك هەستی بەوە کرد کـە مۆدێرنیتـە بـە مـۆرکی سـەرمایەداری پەرەیسـەندووە و دەتوانرێـت زیـاتریش پێشـبخرێت، بەشـێوەیەکی وەستایانە لـە یـاریکردن بـە بونیـاد و ئایـدیۆلۆژیاکانی راسـت و چـەپی درەنـگ نەکـەوت. خـۆی بەشـــێوەی لیبرالیزمـــی راســـت و چـــەپ دابـــەش کـــرد. لـــەرێگای لیبرالیزمـــی راســـترەوەوە موحافەزەکارەکانی بێکاریگەر کرد و لەناو خۆیدا کردنی بەباڵێك، لەمیانەی لیبرالیزمی چەپیشـەوە تا رادەیەك دیموکرات و سۆسیالیستەکانی کرد بە یەدەگی خـۆی. بـەمجۆرە لـە پێگـەی ناوەندیـدا جێگیر بوو. لەکاتی قووڵبوونەوەی هەر قەیرانێکدا یەکێکیانی دەکرد بە یەدەگی خـۆی و دەیتـوانی رێگـای بـەهێزبوون بگرێتـە بـەر. لەگـەڵ بـە بۆرژوازیبـوونی ئەرستۆکراسـیدا بـە درێـژایی مـاوەی فـەرمانڕەوایی قـەیران توێـژێکی کرێکـاری سازشـکار بەشـێوەی سۆسـیال دیمـوکرات پێشـکەوتنی بەخۆوە دیوە. بەشێکی کەمی قازانجی پاوان بۆ ئەمە بەس بوو. بـەمجۆرە رکابـەرەکانی سیسـتەم لەسەدەی نۆزدە و بیسـتەم تـەنیا بێکاریگـەر نـاکرێن، بەڵکو بـە ئامـانجی بـەڕێوەبردنی بونیـادی قـەیراناوی لەهــەموو قۆناخێکـدا، خرانـە نۆخـی هێـزی یەدەگـەوە. بـەمجۆرەش هەژموونگـەرایی ئایدیۆلۆژی لیبرالیزم ئاوا دەکرا.

لیبرالیـزم بـۆ بـەردەواکردنی هەژموونگـەرایی ئایـدیۆلۆژی خـۆی سـوودی لـە چـوار کـەناڵی ئایدیۆلۆژی گرنگ وەرگرت.

١ - بەشێوەیەکی بەکاریگەر میللیگەرایی بەکارهێنا. ئەگەر لە مەشروعیەت پێدانی شەڕە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بێت، یان ئاواکردنی نەتەوەبێت بەدەستی دەوڵەتەوە، میللیگەرایی بەرچاوترین هاوپەیمانی لیبرالیزم بوو. بەکەمین ئەڵقەی لێکنرلوی پێکدەهێنا. لەمیانەی دەربازکردنی قورسترین قەیرانەکان لەرێگای گردانی هەستەکانی میللیگەرایی، ئەزموونێکی زۆری بەدەستهێنا. میللیگەرایی لە ئاستی ئاییندا کرا بە ئایدیۆلۆژیایەکی پیرۆز. لەژێر ئەم پەردەیە تەنیا بە ئاسانی بەسەر قەیرانەکاندا بازنادرێت و بەردەوامی پێنادرێت، بەڵکو لەلایەکی ترەوە پاوانەکان لەرێگای هەمان پەردەوە دەتوانن سیستەمە خراپەکەیان و قورسترین چەوسانەوە پەردەپۆش بکەن.

٢ - رۆڵی میللیگەرایی بە ئایدیۆلۆژیای باوی ئایینی بەخشرا. ئەو ئایینە نەریتیانەی لیبرالیزم لە خەسڵەتە ئەخلاقی و سیاسییەکەیان خاڵیکردنەوە و لەژێر هەژموونگەرایی خۆی کردنی بە میللیگەرایی، راستتر کردنی بە ئایینی میللی. ئەو سۆزە ئایینیانەی رەگەکەیان لە قووڵایی کۆمەڵگادایە بە ئاسانی بە رەنگی میللیگەرایی بۆیاخ کراون، هەمان رۆڵی میللیگەراییان بینی، تەنانەت لەو زیاتر رۆڵی گونجاندنیان بینی. هەندێك جار هەردوو ئایدیۆلۆژیا تێکەڵ بەیەکتر بوون و لەسەر بنەمای ئایینی - ئەتنیکی هەوڵی بونیادنانی نەتەوە درا. بەتایبەتیش ئایدیۆلۆژیاکانی یەهودی و ئیسلامی زۆر بە ئاسانی لەگەڵ میللیگەرایی بوون بەیەك. ئایینەکانی دیکەش (کرستیانی، ئایینەکانی رۆژهەڵاتی دوور، نەریتی ئایینە کۆنەکانی ئەفریقیا) لە پەسەندکردنی پێگەیەکی هاوشێوە درەنگ نەکەوتن. بەمجۆرە لیبرالیزم میراسی کلتووری مەعنەوی لە کەناڵی ئایینی دەگواستەوە و بەگوێرەی شارستانی سەرمایەداری دەیگونجاند کە میراسی کلتووری ماددی لە شارستانی وەرگرتبوو. ئایدیۆلۆژیا ئاینییە میللیگەراکان کە خرلونەتە سەر لیبرالیزم رۆڵیان لە دەربازکردنی قەیرانە قورسەکانی سیستەم پشتگوێ ناخرێت.

٣ - ئایدیۆلۆژیای زانستگەرایی پۆزێتیڤیست بەتایبەتی وەك کەناڵێکی فەلسەفی ئەلتەرناتیف کۆمەکێکی بەهێزی پێشکەش بە لیبرالیزم کرد. ئایدیۆلۆژیای پۆزێتیڤیست کە سوودی لە متمانە بەهێزەکەی زانستە سروشتییەکان وەرگرت، لەکارتێکردنە سەر ئایدیۆلۆژیا راسترەو و چەپڕەوەکان رۆڵی سەرەکی بینی. زۆر بە ئاسانی بەشێوەی تەنتەنەی زانستی لەئایدیۆلۆژیاکان ئالا و رێگای لەپێش بەلارێداچوونی مەترسیدار کردەوە. بەتایبەتیش مۆرکی خۆی لە قەڵەمبازی سەرجەم ئایدیۆلۆژیا چەپەکاندا. سەبارەت بەم بابەتە سۆسیالیزمی بونیادنرلو سەرکێشی دەکرد. لەرێگای زانستگەرایی پۆزێتیڤیستەوە خرایە ناو تەڵەزگەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە. هەرچی

نەباڵی راستڕەوە، فاشیزم لە پێگەی سەرووترینی ئەو رەوتانەوە دێت كە هێزی خۆیان لە ژاننستگەرایی پۆزێتیڤیست وەردەگرن. بەمجۆرە پۆزێتیڤیزم لەوپەڕگەری چەپەوە تا ئەوپەڕگەری راست لەژێر یەك چەتردا بژارە ئایدیۆلۆژییەكانی پێشكەش بە لیبرالیزم دەكرد. لە هەموو هەلومەرجە پێویستەكانی كات و شوێندا لیبراڵیزم ئەم بژارانەی بەخۆیەوە دەلكاند و لەمیانەی بەكارهێنانیەوە بۆ تێپەڕكردنی قەیرانە بونیادییەكانی سیستەم سوودی هەرە زۆری لێوەردەگرت.

٤ ـ لەمێژوودا هەرە زێدە لە سەردەمی لیبرالیزمدا رەگەزگەرایی وەك فاكتەرێكی ئایدیۆلۆژی پێشخراو بەكارهێنرا. لیبرالیزم كە كۆمەڵگای رەگەزگەرایی دەور وەرگرت، تەنیا بەوە نەوەستا كە لەماڵەوە ژن بكات بە كرێكاری بێكرێ. بەڵكو لەمەش زیاتر لەمیانەی كردنی بە ئۆبژەی زایەند و وەك كاڵایەك پێشكەشكردنی لە بازاڕدا، قازانجی زیاتری بەدەستهێنا. لەكاتێكدا پیاو تەنیا رەنجەكەی دەكرێت بە كاڵا، ژن بەهەموو جەستەیەوە كرا بەكاڵا. لەراستیدا بەمجۆرە مەترسیدارترین شێوەی كۆیلایەتی ئاوادەكرا. ئەگەر "ژنی مێردەكەی" سیفەتێكی باشیش نەبێت، نەبێتە بابەتی قۆستنەوەیەكی سنووردار. بەڵام كاتێك بەهەموو كەسایەتیەكەیەوە دەكرێت بەكاڵا، بە واتای كۆیلایەتییەك دێت لە كۆیلایەتی سەردەمی فیرعەونەكان خراپترە. چونكە كرانەوە بۆ كۆیلایەتی هەر كەسێك، چەندین جار لە كۆیلایەتی دەوڵەتیك یاخود كەسێك مەترسیدارترە. ئەمە ئەو تەڵەزگەیە كە مۆدێرنیتە بۆ ژنی داناوەتەوە. ئەو ژنەی لە رەواڵەتدا بۆ ئازادی كراوەیە، كەوتبووە دۆخی ریسواترین ئامرازی قۆستنەوە. لەئامرازێتی ریكلامەوە تا دەگاتە ئامرازی سێكس و پۆرنۆ، ژن سەرەكیترین ئامرازی قۆستنەوەیە. بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم لە گواستنەوەی سەرمایەداریدا ژن خراوەتە ژێر قورسترین بارەوە.

پیاو بەو سیفەتەی نوێنەری دەوڵەتە لەناو خێزاندا، خۆی بە بەرپرسیار و خاوەن كاریگەری دەبینێت سەبارەت بە پێشخستنی چەوسانەوە و دەسەڵات بەسەر ژنەوە. لەمیانەی بەربڵاوكردنی فشاری باوی سەر ژن، هەر پیاوێك دەكرێت بە بەشێكی دەسەڵات. لەم رێگایەوە كۆمەڵگا دەكەوێتە ناو نەخۆشی گرێكوێرەی گەیشتن بە بەرزترین ئاستی دەسەڵاتەوە. ستاتۆی ژن سۆز و هێزی بێ سنووری دەسەڵات بە كۆمەڵگای پیاوسالاری دەبەخشێت. لەلایەكی دیكەشەوە لە پێكهاتنی كرێكاری سازشكارەوە تا بێكار، كرێكاری بێكرێ تا دەگاتە كەمترین كرێ، ئەوەی لە هەر خراپەكاریەكدا باجی لێدەبڕێت ژنە رەنجدەرەكانن، خودی ژنە. ئایدیۆلۆژیای رەگەزگەرایی لیبرالیزمی پێكەوە لكێنراو، تەنیا بەچەواشەكردن و شێواندنی ئەم رەوشە و پیشاندانی بەجۆرێكی ترەوە ناوەستێت، هەروەها بۆ ئەو كەناڵە ئایدیۆلۆژییانە وەردەچەرخێنرێت كە تایبەت بۆ ژنان

پێشخراوە. شتێکە لە جۆری: بەدەستی خۆی کۆیلایەتییەکەی پەسەند و هەرس بکات. دەتوانرێت بگوترێت، کاتێك لەبواری ماددی و ئایدیۆلۆژییەوە سیستەم ژن دەقۆزێتەوە و بەکاری دێنێت تەنیا قورسترین قەیرانەکانی تێپەڕ ناکات، بەڵکو هەبوونی خۆشی فەراهەم دەکات و دەخاتە ژێر گەرەنتییەوە. ژن لەپێگەی کۆنترین و نوێترین نەتەوەی کۆڵۆنیکراوی مێژووی شارستانی بەگشتی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدایە. ئەگەر لەهەر لایەکەوە ئۆخەی قەیرانێك جێگای باسە کە چیتر دەرفەتی بەردەوامبوون لە ئارادا نامێنێت، ئەوا بەشی کۆڵۆنیکردنی ژن لەسەرووی هۆکارەکانی ئەم ئۆخەوە دێت.

بەو رادەیەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی لەژێر هەژموونگەرایی پاوانە جیهانگیرییەکانی فینانس لەناو قەیرانی گشتی سیستەماتیکدایە، بەشێوەیەکی هاوبەش قەیرانی تایبەت بە فینانسیش جێگای باسە. تەنگەژە گشتییەکانی سیستەم (سەرچاوەی خۆی لە دژایەتیکردنی ئابووری وەردەگرێت) لەگەڵ قەیرانەکانی تایبەت بە فینانس ( لەمیانەی ئەو پێدرلو و کاغەزە وەهمییانە نوێنەرایەتی دەکرێن کە لە بەرهەمهێنانی پارە، زێڕ و تەنانەت لە دۆلاریش دابڕاوە) بەشێوەیەکی تێکەڵ لە نزمترین خاڵی مێژوویی خۆیدایە. بەشێوەیەکی سەرەکی تا ئێستا سیستەم لە دوو رێگاوە تەنگەژەکانی خۆی تێپەڕاندووە: یەکەمیان" لەرێگای دامودەزگاکانی توندوتیژی رووتی دەوڵەت ـ نەتەوە و دەسەڵات کە بەردەوام زیاد دەکرێت. ئەمانەش مەترسیدارترین جۆرەکانی شەڕ، زیندان، شێتخانە، نەخۆشخانە، ئەشکەنجە، سەربازگەکانی کۆکردنەوە، جینۆساید و کۆمەڵکوژییە سامناکەکانن. دووەمیان" لەرێگای ئامێر و دامەزراوەکانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم کە بەردەوام لەمیانەی پێوەلکانەوە پێشدەخرێت. وەك ئایدیۆلۆژیا خۆی لەناوەندە، میللیگەرایی، ئایینگەرایی، زانستگەرایی و رەگەزگەراییش ئەو پاشکۆیانەن کە پێیەوە لکێنراون. هەروەها خوێندنگا، سەربازگە، پەرستگا، ئۆرگانەکانی راگەیاندن، زانکۆ و هەرە دواییش تۆڕەکانی ئەنتەرنێتیشیان لەناودایە. هەروەها پێویستە گۆڕینی هونەر بۆ پیشەسازی کلتووریش لەسەر ئەمانە زیاد بکەین.

بەڵام زانا ئاساییەکانییش ئەم راستییەیان پەسەند کردووە کە هەردوو رێگا لەجیاتی ئەوەی چارەسەری لەگەڵ خۆیاندا بێنن، بەڵکو واتای پێشخستنی فەرمانڕەوایی قەیران دەبەخشن. تەنانەت وەك جارانیش تەنگەژە و قەیرانەکان تێپەڕ ناکرێن. بەپێچەوانەوە، تەنگەژە و قەیرانەکان کە ریزپەڕن، بە ئۆخێکی گشتی و بەردەوام دەگەن، قۆناخە ئاساییەکانیش دەبن بە ئۆخێکی ریزپەڕ، بەمجۆرە جێگۆڕکێ دەکەن. لەگەڵ ئەوەی فاکتەرەکانی تەنگەژە لە بناخەی

سیستەمەکانی شارستانیدا شاراوەیە، بەڵام هیچ کاتێك کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاشنای تەنگەژەی هێندە قورس نەبووە. ئەگەر کۆمەڵگاکان بەردەوام بن، بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگەی فەرمانڕەواییەکانی قەیران ناگرن. یان هەڵدەوەشێنەوە و پەرتەوازە دەبن، یان بەرخودان دەکەن و لەمیانەی پێشخستنی سیستەمی نوێ قەیرانەکە تێپەڕ دەکەن. ئێستا بە قۆناخێکی بەمجۆرەدا تێپەڕ دەبین.

**ب ـ رەوشی هێزە رکابەرەکانی سیستەم**

وەك دەستەواژە رکابەرێتی سیستەم زۆر بەکێشەیە. بەر لە هەموو شتێك ئایا شارستانی لەخۆوە دەگرێت؟ بەکامە لایەنیەوە لەخۆوەی دەگرێت و بەکامە لایەنییەوە پەسەندی ناکات؟ تا پێگە و هەڵوێستێکی دژ بە مۆدێرنیتەی سیستەم لە ئارادا نەبێت، ئایا لە دەرەوەی سیستەم دەتوانرێت سیستەمێکی نوێ ئاوا بکرێت؟ ئایا چۆن لە مۆدێرنیتە تێگەیشتووە، کارەکتەرە نووانەکەی دەستنیشان کردووە؟ ئایا دەرك بە مۆدێرنیتەی ئەڵتەرناتیف دەکات؟ تا ئەمجۆرە پرسیارانە وەڵام نەدرێنەوە، دەستەواژەی هێزە رکابەرەکانی سیستەم بە هەڵواسراوی و بێبناخە دەمێنێتەوە. نەك تەنیا لەمیانەی پرۆژەکانیان دەرهەق بە داهاتوو، تا مێژووی رابردووشیان بەشێوەیەکی راست شیکار نەکرێت، زەحمەتە رکابەرایەتییەکی واتادار بەرامبەر بە سیستەم پێشبخرێت. بە ئامانجی بەلاوەنانی ئەم زەحمەتیانە و پێشخستنی وەڵامی شیمانەکراو بۆ ئەم پرسیارانە لە شیکارەکانماندا زاراوەی شارستانی و مۆدێرنیتەم بە بنەما گرت. لەو بڕوایەدام بۆ نەکەوتنە ناو خرەکە نەرێکەکانی جاران ئەمە لێگەڕینێکی راستی پەیرەو و ئەڵتەرناتیفە.

سەرباری تەواوی بونیادە بەکێشەکەی بەڵام هێزە رکابەرەکانی سیستەم حەقیقەتێکی واقیعییە. بەلانی کەم هێندەی سیستەم کاریگەرییان لەسەردەمەکەمان کردووە. لەوانەیە لە بواری تیۆری و پراکتیکی سیستەمی خۆیان ریالیزە نەکردووە، بەڵام راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە خاوەنی ئەزموونێکی مەزنی کەڵەکە بوون. هێزە رکابەرەکانی سیستەم کە خاوەن چەترێکی بەرفراوانن، لەگەڵ ئەوەی جیاوازی گرنگ لەنێوانیاندا هەیە، راشکاوانە دەتوانرێت بگوترێت چەندین بەهای هاوبەشیان هەیە.

مەبەست لەسیستەم ئاماژەکردنە بەسەرمایەداری. ناتوانرێت بگوترێت تەواوی مۆدێرنیتە کراوەتە ئامانج. بەڵام سەبارەت بە هەردوو رەهەندەکەی دیکەی مۆدێرنیتە، واتە دەرهەق بە ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە زۆر لێکجیاوازن. سەبارەت بەشارستانی ناروون و ئاڵۆزن.

لەمیانەی بۆچوونە تێکەڵ و ئاڵۆزەکەیان (هێزە رکابەرەکان) زۆر جار جێگای خۆیان لە جەمسەری دژدا دەگرن. هەروەها نەبینراوە کە ئۆتۆپیاکانیان سەبارەت بە ئایندە مۆدێرنیتە تێپەڕ بکات. دەتوانرێت بگوترێت لەجیاتی بەلاوەنان و تێپەڕکردنیان راستکردنەوەیان بە بنەماگرتووە. دەشێت مۆدێرنیتەیەکی بێ سەرمایەداری وەڵامی بەرنامەی زۆریەیان بداتەوە، بەڵام دەرك بەمە ناکەن کە ئەمە تەنیا ئۆتۆپیایەکە.

سەبارەت بە سیستەم و نوخبە قەیراناوییەکەی بەگشتی خاوەن باوەڕی و فیکرێکی هاوبەشن. بەڵام بۆ رزگاربوون و دەرەتان جیاوازییەکەی نێوانیان گەورە دەبێت. لە گۆڕانکاری پلە بەپلە(پەرەسەندن) تاگۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە، لە پەیڕەوە ئاشتیخوازەکانەوە تا دەگاتە پەیڕەوەکانی شەڕ چەندین رێگای جیاواز پێشنیار دەکرێت. هەر وەك ئەوانەی گۆڕینی دەسەڵات و دەوڵەت بە شۆڕش دادەنێن، ئەوانەش هەن کە کۆمەڵگای بێدەوڵەت و بێدەسەڵات پێشنیار دەکەن. لە بنەڕەتدا بناخەی هەموویان بۆ شۆڕشی فەرەنسا دەگەڕێتەوە. بونیادە هزرییەکەیان لە میللیگەراییەوە تا کۆمۆنیزم، لە ئایینگەراییەوە تا پۆزێتیڤیزم، لە فێمێنیستیەوە تا دەگاتە ئیکۆلۆژی رێنومایی و دیدگایەکی بەرفراوان پێشکەش دەکەن. سەرباری ئەوەی تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ ئەمانە تێکەڵ بە یەکترن، بەڵام دەرکی پێناکەن. ئەو دەستنیشانکردنە گشتییە بنەڕەتییەی سەبارەت بە پێگەی کۆمەڵایەتییان بکرێت، دەتوانرێت بگوترێت پشت بەو توێژە بنەڕەتیانە دەبەستن کە لە دەرەوەی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات ماونەتەوە. ئەم بزووتنەوانەی ئەو رۆشنبیرانە پێشەنگایەتی دەکەن و بە پەیوەندییەکی دیاری مۆدێرندا دەربازبوون کە چەندەی دەچێت رەوشیان بەرامبەر بە سەرمایەداری سەختتر دەبێت ، زۆرینەی زۆری کۆمەڵگا لەخۆوە ناگرێت، لە رەوشێکی بەمجۆرە نوورن. ئەگەر بەشێوەیەکی قەبە بڵێین ئەوانەی بەرژەوەندییان لەگەڵ هەبوونی سەرمایەداریدایە رێژەیان لە سەدا دە بێت، ئەوا رێژەی رکابەرەکانیش لەم ئاستەدایە. لەسەدا هەشتای کۆمەڵگا بەو سیفەتەی کۆمەڵگای ناسەرمایەدارییە، لە شیکار و چارەسەرییەکاندا لەلایەن هەرنوو توێژیشەوە سۆبژە نییە، بەڵکو لەپێگەی ئۆبژەدایە. لەکاتێکدا سەرمایەداری لێکدانەوە و حیسابی قازانج لەسەر کۆمەڵگا دەکات، هەرچی رکابەرەکانن بە چاوی کۆمەڵێك سەیری کۆمەڵگا دەکەن کە دەکرێ لە دەرەوە پەلکێش بکرێن. ئەم واقیعە لە ژێر بناخەی تێپەڕنەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا شارلوەیە.

کاتێك دەڵێین" سیستەم (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) بە فەرمانڕەوایەتیەکی قەیراندا تێپەڕ دەبێت کە ناتوانێت بەردەوام بێت، باس لە "نوخبەیکی شۆڕشگێڕی" نوێ ناکەین. ئەم رەوشانە کە

وەك هەلومەرجی بابەتی شۆڕشیش هەڵدەسەنگێندرێت، لە گفتوگۆکانی رابردوودا زۆر قۆستراپەوە. ناتوانرێت بگوترێت دەرەنجامی سەرکەوتووانەی لێ هەڵێنجراوە. لەکاتێکدا قەیرانەکان زیاتر فەرمانڕەواییەکانی قەیرانی لێدەکەوێتەوە، دەشێت دژە شۆڕشی دژوار و توندتریشی لێ بکەوێتەوە. لەوانەیە زیاترین شانس یاوەری شۆڕش بێت. بەگشتی رۆڵی شۆڕشەکان لە وەرچەرخاندا گەورەکراوە و زێدەڕۆیی لێکراوە، زیاتریش بە هەڵە شیکارکراوە. جیاوازییەکانی سیستەم وەرچەرخانی سەرەکی ئەنجام دەدات نەك شۆڕش. چونکە شۆڕشەکان تەنیا لەناو ئەو سیستەمانەی تێی کەوتوون دەتوانن رێگا لەپێش گۆڕانکاری واتادار بکەنەوە. بێگومان ئەوە راستە کە هێزە رکابەرەکانی سیستەم بە دژواری کاریگەری تەنگەژە و قەیرانەکانیان کراوتە سەر. بەڵام بەستنەوەی تەواوی هیواکانیان بەو ئەنجامەی لە تەنگەژەکان دەکەوێتەوە کارێکی هەڵەیە. لە رابردوو زۆر جار کەوتنە ناو ئەم هەڵەوەو دووچاری هیوا شکێنیەکی قووڵ هاتن.

بەر لەوەی سەدەیەك بەسەر تەمەنیاندا تێپەڕ بێت پێوەلکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال دیموکراتەکان و رەوتەکانی رزگاری نیشتیمانی بە سەرمایەدارییەوە، کاریگەرییەکی قووڵی نەرێنی کردە سەر رکابەرانی سیستەم. بزووتنەوەکان هێزیان لەدەستدا. لە راستیدا ئەم رەوشە سەرچاوەی خۆی لە بۆچوونە ئایدیۆلۆژی و پرۆگرامە هەڵە و بونیادە ناتەواوەکەیان وەردەگرێت. کاتێك لێکۆڵینەوە دەرهەق بە بونیاد و زهنییەتەکەیان بکرێت، دەبینرێت کە مۆدێرنیتە و لیبڕالیزمیان تێپەڕ نەکردووە. پێگەی راستڕەوترین یان چەپڕەوترین لیبڕالیزم، بەریەست نەبوو لە پێش ئەوەی زوو یان درەنگ بە لیبڕالیزم ئەنجامگیر بن. هەرچی لکاندنیانە بە پاوانەکانی سەرمایەدارییەوە، پەیوەندی بە چەمکەکەیان دەرهەق بە مۆدێرنیتەوە هەیە. پۆست مۆدێرنیزم، ئابینگەرایی رادیکاڵ، بزووتنەوە فێمێنیستی و ئیکۆلۆژییەکان، بزاوتێکی نوێن کە زیاتر وەك پەرچەکردارێك بەرامبەر ئەم گۆڕانکاریانە هاتوونەتە مەیدان. بەڵام ئەو پێگە ئایدیۆلۆژی و کردارییەی ئێستایان گومانێکی بەمجۆرە دروست دەکات کە بتوانن هێندەی رکابەرە کۆنەکانی سیستەم بەکاریگەربن. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە نیوولیبڕالیزم و ئابینگەرا رادیکاڵەکان تا رادەیەك دەتوانن بەکاریگەربن. لەبەر ئەم هۆکارانە رکابەرایەتی سیستەم پێویستی بە نوێبوونەوەیەکی ئەخلاقی، سیاسی و رۆشنبیری رادیکاڵانە هەیە. لەم چوارچێوەیەدا لە نزیکەوە ناسینی هێزە رکابەرەکانی سیستەم گرنگە، پێویست و سوودبەخشە.

**ج - میراسی سۆسیالیزمی بونیادنراو**

لەسەرووی ئەو بزووتنەوانەوە دێت کە بۆ یەکەمین جار بە ئاگاییەوە پەرچەکرداریان بەرامبەر سیستەمی سەرمایەداری نیشاندا. بە گوتەی دامەزرێنەرەکانیان کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس سێ سەرچاوەی بنەڕەتییان بەبنەما گرتووە و هەوڵی پێشخستنی دژە - سیستەمی خۆیان دەدە. ئەمانەش ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی، ئابووری - سیاسی ئینگلیز و سۆسیالیزمی تۆباوی فەرەنسا بوون. وەك دەرکی پێدەکرێت ماتریالیزمی دیالیکتیکیان لە ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی، تیۆرییەکانی بەهێز لە ئابووریناسی - سیاسی ئینگلیز و تیۆرییەکانی تیکۆشانی چینایەتییان لە سۆسیالیزمی تۆپیای فەرەنسا وەرگرتووە. لەمیانەی ئەو سەنتێزەی لە هەرسێکیانەوە پێکیان هێناوە راڤە و شرۆڤەی خۆیان پێشخستووە. ئەو قۆناخەی تێیدا ژیاون و رکابەرایەتییان تێدا کردووە هاوکاتبوونی لەگەڵ سەرمایەداری سالآنی ١٨٤٠ - ١٨٥٠ کە لەناو قەیرانێکی جددی دا بوو، کاریگەری لەسەریان هەبوو. هیوایەکی بەمجۆرە سەریهەڵدابوو کە دەشێت یەکسەر سیستەم برووخێت. کێشەکانی یەکێتی نەتەوەیی ئەڵمانیا و کۆمار لە فەرەنسا، ئەوکاتە لە رۆژەڤدایە. ئینگلتەراش وەك هێزی هەژموونگەرایی سیستەم بە لوتکە گەیشتووە. شۆڕشە گەلەرییەکانی ئەورووپای سالآنی ١٨٤٨ بە نیشانەیەکی بەدیهاتنی هیواکان دانراوە. **مانیفێستۆی کۆمۆنیستی**ش وەك پرۆگرامی گشتی ئەم شۆڕشانە بیری لێکراوەتەوە. هەرچی **لیگی کۆمۆنیستەکانە**، وەك یەکەمین پارتی یاخود رێکخستنی ئەنتەرناسیۆنالی ناوکراوە. ئەم دوو کار و خەباتە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پیشانی دەدات کە بۆ سەرکەوتن چاوەڕوانی لە تەنگەژەکانی سەرمایەداری و بزووتنەوە گەلەرییە شۆڕشگێڕییەکان دەکەن.

کاتێك شۆڕشەکانیش سەرکوت کراون، لە قووڵاییدا پێویستی لێکۆڵینەوەی سەرمایەدارییان بینیوە. کارل مارکس وەك دوورخراوەیەك لە لەندەنی کەعبەی سەرمایەداریدا نیشتەجێ بووە. بەردەوام دیدار لەگەڵ فریدریك ئەنگلس ئەنجامدەدات، خەباتەکانی یەکەمین ئەنتەرناسیۆنالی ١٨٦٤ بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. بەهۆی ئەگەرەکانی دواکەوتنی شۆڕش، پێویستی خەبات و تێکۆشانی درێژخایەنی پلە بە پلە"تدریجی" پێشکەوتنێکی دیکەی گرنگی ئەم قۆناخەیە. خەباتی سەندیکایی و پەرلەمانی گونجاو بینراوە. هەرچەندە راپەڕینەکانی کۆمۆنەی پاریسی ساڵی ١٨٧١ لە فەرەنسا هیواکانی نوێکردەوە، بەڵام هەر زوو سەرکوتکردنی راپەڕینەکان، هزراندنێکی زیاتری سەبارەت بەبابەتەکانی دیکتاتۆرییەت، دەسەڵات و دەوڵەت لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

لایەنگیریکردنیان بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی، هەروەکو چۆن رێگای لەپێش رکابەرایەتی ئەنارشیستەکان کردەوە، یەکەمین گفتوگۆکانی هەموارکردنیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

سەرلەنوێ راگەیاندنی دووەمین ئەنتەرناسیۆنال لە ساڵانی ١٨٨٠ لەژێر سێبەری شۆڤێنیزمی نەتەوەییدا ئەنجامدراوە. لەژێر ناوی **ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاریا و کاوتسکی[٢] هەڵگەڕاوە،** لینین ئەم قۆناخەی بە ریڤیزیۆنیزم[٣] تاوانبار کرد. هەر لەم قۆناخەدا پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانی (پارتی یەکەمین) بە سەرکێشیکردنی ریڤیزیۆنیزم تاوانبار دەکرێت. شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە روسیا هیواکانی پراکتیزەکردنی ئۆتۆپیای کۆمۆنیستی بەهێزتر کردووە (سەرخستنی ئەوەی کۆمۆنەی پاریس نەیتوانی سەرکەوتنی تێدا بەدەست بێنێت). ئەم شۆڕشە لە ئاستی تەواوی جیهان رێگای لەپێش پێشکەوتن و گۆڕانکاری کردەوە. پشتگیریکردنی بزووتنەوەی رزگاری نیشتیمانی کورد ـ تورك لە ئەنادۆڵ، یەکەمین هەنگاویانبوو لە گەیاندنی سەردەمی بزووتنەوە نیشتیمانییەکان بۆ قۆناخێکی سەرووتر و کۆمەککردن بە پێشکەوتنەکانیان. مردنی پێشوەختی لینین، ئەو قۆناخەی بە تیکۆشان بەرامبەر پاکتاوکاری (تصفویین) ناودەبرێت، بوونیادنانی سۆسیالیزم، تێکۆشانی دژە ـ فاشیزم لە ساڵانی دووەمین شەڕی جیهاندا، لەقۆناخی شەڕی ساردیشدا هاوپەیمانێتی وارشۆ کەبەرامبەر بە ناتۆ دامەزرا، کار و خەباتەکانی فەزا، کێبڕکێی ئابووری لەگەڵ سەرمایەداری و ئەو پشتگیرییە بەرێڵاوەی پێشکەش بە بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی کراوە ئامارە سەرەکییەکەی پێکدێنێت. لەم ماوەیەدا، واتە لە ساڵانی ١٩٢٠ سێیەمین ئەنتەرناسیۆنالیزم نوێکراوەتەوە، بەڵام هەروەکو دووەمین ئەنتەرناسیۆنالیزم بەهۆی بێچارەیی و نەرێکی دەوڵەت ـ نەتەوە لەناوخۆ دووچاری پاکتاوکاری(تصفیە) هاتووە. روسیای سۆڤێتی وەك

---

[٢] کارل کاوتسکی(Karl Kautsky): یەکێك لە سەرکردەی بزووتنەوەی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم و پشتیوانانی هێڵی ناوینە (١٨٥٤–١٩٣٨). لە پەرتووکەکەی بە ناوی (شۆڕشی پرۆلیتاریا و کاوتسکی هەڵگەڕاوە) لینین رەخنەیەکی توندی کردووە، هۆکارەکەشی ئەو هەوڵە هەڵپەرستانە بووە کە ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی رژێمی حوکم بووە. بە هۆی دژوارپوونی ناکۆکیەکانیان سەبارەت بە دوو فاکتەری بەرهەمهێنان (سەرمایە و کار) جیابوونەوە لە نێوان پشتیوانانی ئەم بزووتنەوە روویدا. بەمجۆرە سێ رەوت سەریانهەڵدا: هەڵپەرستی راستڕەو کە برنشتاین سەرکێشی دەکرد، هێڵی ناوینی لادەر کە کاوتسکی یەکێك لە سەرکردەکانی بوو، هەروەها باڵی چەپی بزووتنەوەی کرێکاری لە رۆژئاوا. دوای ناکۆکییە دژوارەکەی لەگەڵ لینین و ترۆتسکی لە ڤیەننا نیشتەجێ بوو، دواتر لە ئەمستردام لە دۆخێکی هەژاری و نەداری دژواردا کۆچی دوایی کرد.

[٣] ریڤزیۆنیزم(Revisionisim): وشەیەکی فەرەنسییە بە واتای هەموارکردنی مەزهەب، فیکر یان رێککەوتنێك دێت لە هەندێك لایەنەوە. بەڵام لە تێکۆشانە کۆمەڵایەتیەکاندا بە واتای گۆڕینی ستراتیژیەتی گشتی، پاشداکشاندن و تێکدان دێت. بزووتنەوەیەکە کە بە دژوارترین شێوە لەلایەن سۆسیالیزمی مارکسی شۆڕشگێڕ رەخنەکراوە، ئەدوارد برنشتاین یەکێك لە سەرکردە دیارەکانی بوو.

بەرئەندامێکی نوێی هەژموونگەرایی توانیویەتی لە یەك لە سێی جیهان بەکاریگەر بێت. بەڵام کاتێک بزووتنەوە سۆسیالیستەکانی ناو دەوڵەت ـ نەتەوەکانی رووبەرووی قەدەری خۆیان بەجێ هێشتووە، بۆسەر هەمان رێگای رێفزیۆنیستی (یەکەمین پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانی لایداوە. ئیتر پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤێت رێبواری رێگای سەرمایەدارییە. بەرخودانی کورتخایەنی چین (قۆناخی ماو ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠) و ئەلبانیا ئەنجامی بەدەست نەهێناوە. لە ئاکامی زووتر خۆگونجاندنی بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی و بزاوتی سەندیکای کرێکاران بەگوێرەی سیستەمی سەرمایەداری، هەروەها کاتێك چین نە سالانی هەشتاکان، روسیا و هاوپەیمانەکانیشی لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو بە فەرمی دەستبەرداری سۆسیالیزمی بوونیادنراویان راگەیاند، ئیتر لاپەرەی قۆناخێك داخراوە.

ئەزموونە دوو سەد ساڵییەکەی (ئەگەر شۆرشی فەرەنسا بەبنەما بگرین) رێگای لەپێش ناوبردنیان بەبزووتنەوەکانی سۆسیالیزمی بوونیادنراو کردەوە، دەرفەتی هەڵسەنگاندنی ئەو بزووتنەوانەمان بۆ دەرەخسێنێت.

١ ـ زیاتر لە دژی پاوانخوازە تایبەتەکان دەرکەوتوون، سەرمایەداری دەوڵەتیان لە دەرەوەی رەخنەکان هێشتۆتەوە کە پاوانی دەسەلات و سەرمایەن. رووکەشیبوونی شیکارەکانیان سەبارەت بە دەسەلات و دەوڵەت هۆکارەکەی بۆ ئەم مەیلە بنەرەتییەیان دەگەرێتەوە. لەقووڵاییەوە(لەناخەوە) لەو بروایەدان بەو سیفەتەی خۆیان هێزی دەسەلات و دەوڵەتن، سۆسیالیزم ئاوا دەکەن. بیر لە رێگایەکی دیکە ناکەنەوە. تەنانەت سەبارەت بە هەردوو چین (بۆرژوازی ـ پرۆلیتاریا) دیموکراسی وەك جۆرێك لە دیکتاتۆریەت راڤە دەکەن. بەهۆی ئەو ئابووری ـ سیاسییەی ئینگلیز کە پشتی پێدەبەستن، شیکارێکی زۆر رووکەشی و بەرتەسکیان دەرهەق بە سەرمایەداری پێشخستووە.

٢ ـ یان لەبناخەی چینایەتی مۆدێرنیتە بێگان، یاخود بە پێویستیان نەبینیوە بیکەن بە بابەتێکی شیکارکردن. کاتێك ئەنجامیشیان دلوە، تەولو نموونەیەکی لادانی راستڕەوییان پیشاندلوە. تەنانەت سەرمایەداریشیان لە دەرەوەی بناخەکانی خاوەنکار ـ کرێکار، قازانج ـ کرێ و زێدە. بەها بەولاتردا نەبردووە کە یەکەمین پێچکەی مۆدێرنیتەیە. ئەم راستییەیان نەبینیوە کە سەرمایەداری شێوازێکی کەڵەکەکردنە کە لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە بینرلوە. سەرمایەداری سێسەد ساڵەی شارەکانی ئیتاڵیایان بە سەرەتای دەست پێکردنی سیستەمەکە دانەناوە . بەڵکو بەجۆرێك لە جۆرەکان دەرکەوتنی سەرمایەداری ئینگلیز ـ هۆڵەندای سەدەی شازدەهەمیان

بەسەرەتای مێژوو داناوە. هەرچی ئیندوستریالیزمە کە دووەمین پێچکە گرنگەکەی مۆدێرنیتەیە بە شان و باڵیدا هەڵدراوە. پەیوەندییە چۆنایەتییەکەی بە سەرمایەدارییەوە و مەترسییەکانی دواتری رەخنە نەکراوە، بە پێچەوانەوە رۆڵی فریادڕەسی پێدراوە. هەروەها پێچکەی دەوڵەت ـ نەتەوەش بە پێشکەوتنخواز دانراوە، ئەمەش دەرگای بۆ شۆڤێنیزمی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی کردۆتەوە. واتە لەجیاتی کۆنفیدرالیزم دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندییان هەڵبژاردووە. ئەوانیش وەك مێژووناسەکانی شارستانی کلاسیك رێگایان بەخۆیان نەداوە رووەکەی دیکەی مۆدێرنیتە وك بەڵگەیەکی دواکەوتوویی، بێئاگایی، هۆڤێتی، بزووتنەوە کۆنەپەرستەکان و پێچەوانەی سورانەوەی رەورەوەی مێژوو هەڵسەنگێنن.

٣ ـ کاتێك لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە قەبەترین شێوەی ماتریالیستی پۆزێتیڤیزمیان وەك زانستیبوون پەسەندکرد، لەم بوارەشەوە کەوتوونەتە ناو هەڵەیەکی مێژووییەوە. ئەو سۆسیالیزمەی ئاوایانکردووە لەهەمان ئاستی زانستەکانی داروین و نیوتن ی بوارەکانی بایۆلۆژی و فیزیا بەزانستییان لەقەڵەمداوە. هەڵوێستە سۆسیۆلۆژییەکەیان لە داروینیزمێکی قەبە بەولاتر تێپەری نەکردووە. پێویستی دەست نیشانکردنی جیاوازییە چۆنایەتییەکەی سروشتی کۆمەڵایەتییان نەبینیوە، لەو بڕوایەدا بوون کە لەگەڵ سروشتی یەکەم پابەندی چۆنایەتی هەمان یاسان، بەمجۆرەش دەرگایان بۆ حەتمیەتگەراییەکی رەها کردۆتەوە. ئەو هێزانەی لە پێشکەوتنەکانی دواتر کەوتنە رێ سوودیان لەم دەرگا کراوەیە بینی، تەنانەت گەلەریترین شرۆڤەشیان هاوتای راستی زانستی لە قەڵەمداوە.

٤ ـ بەگشتی دەسەلات، بەتایبەتیش نەکەوتوونەتە ناو شیکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە، تەنیا بە کۆمیسیۆنێکیان لە قەڵەمداون کە رۆڵ و کاری بۆرژوازی هەڵدەسوورێنێت. شیکارنەکردنی دەسەلات، بەتایبەتیش شیکارنەکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە وەك چڕبوونەوەی سەرمایەداری پاوانخوازی، ناتەواوترین لایەنی تیۆرییەکەیانە. هەرچی ئەو شیکارانەیە کە ئەنجامیاندلوە جگە لە باش پیشاندانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەولاتر شتێکی دیکە نییە. دڵنیان لەوەی کە لە رێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە باشترین سۆسیالیزم ئاوا دەکەن. هەروەك چۆن شیکارەکانی هیگل یان سەبارەت بەدەوڵەت تێپەر نەکرد، هیچ گومانێکیان لەوە نییە، لە حاڵەتێکدا دەستی بەسەردا بگرن، ئەوا وەك ئامرازێکی پەرەپێدانی ئازادی ـ یەکسانی و هەموو جۆرە رێکخستنێك بەکاری دێنن. پەیوەندی نێوان سۆسیالیزم ـ دیموکراسیش لە سەرووی ئەو بابەتانەوە دێت کە بە هەڵە و رووکەشانەترین شێوە تاووتوێیان کردووە. شۆڕشەکانی چین و روسیا لەسەر بنەمای ئەم

هەڵوێستانە بەرەو پێشەوەچووە. هەروەها کردەوە و رەفتاری دەسەڵاتەکانی دیکەی رزگاری نیشتیمانی و سۆسیال دیموکراتەکانیش جیاوازترنەبووە. جیاوازییان لەگەڵ سەرمایەداری تایبەت ئەوەیە کە سەرمایەداری دەوڵەتیان بە باشتر داناوە. چۆنییەتی پەیڕەوکردنی دەسەڵات بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم راستییەی خستۆتەڕوو.

٥ ـ رەخنەیان سەبارەت بە شارستانی زۆر کەمە، ئەوەی کە کردوویانە رووکەشییە. باسی ئەوەیان نەکردووە کە قۆناخی شارستانی سەرمایەداری بەشێکی شارستانییەکانە، دوا ئەڵقەی زنجیرەی سەرەکییە. پێویستیان بە دەست نیشانکردنی کارەکتەری گەشەبوونەوەی کەڵەکەبوونی مێژوویی دەسەڵات نەبینیوە. ئەوەیان بۆ خۆیان نەکردووە بەمەسەلەیەك کە سیستەمی خۆشیان بە ئاسانی ببێتە شارستانی و دەسەڵاتێکی هاوشێوە. لەجیاتی ئەو راستییە تێبگەن کە دەسەڵات ئەشکەنجە، فێڵەونی، درۆ، شەڕ، قرێژ و سەرمایەی کەڵەکەبووە، بەڵکو هەوڵیانداوە تیۆرییەکی لەوجۆرە پێشبخەن کە چۆن لە مێژوودا رۆڵی ئامرازی پێشکەوتنی دیوە. مێژوو سەلماندوویەتی کە ئەم بۆچوونانەیان هەڵە و نابەجێ بووە.

٦ ـ پێویستی شیکارکردنی هێزەکانی دژە ـ شارستانییان نەبینیوە، کە دووەمین رووی مێژوو و دووەمین جەمسەری دیالیکتیکی مێژووە. هەرچی ئەو شرۆڤانەن کە سەبارەت بەم هێزانەوە کردوویانە زۆربینەی نەرێنییە. تەنانەت لە باسکردنی پێشکەوتنخوازی داگیرکاری سەرمایەداری لە ئەمریکا، ئاسیا و ئەفریقیا دوانەکەوتووە. رکابەرەکانی ئەم داگیرکاریانەشیان بە پاراستنی سیستەمی کۆن تاوانبار کردووە. نەبینینی ئەو راستییە کە جەمسەری دژە شارستانی خاوەن قورسایی، نەریتی دیموکراتی، لێگەڕینەکانی ئازادی، یەکسانی، دادوەری و بەرخودان و ئەزموونی کۆمۆنالیتەن، لە نزیکەوە گرێدراوی واقیع و راستینەی چینایەتی بۆرژوازی و وردە بۆرژوازییانە. نابینن، چونکە ئەوانەی لەم چینانەوە هاتوون چاوی بینینی ئەم راستیانەیان نییە.

٧ ـ هەڵوێستی پێشکەوتنی ـ راستەهێڵی و گەردوونگەرایی پۆزێتیڤیست سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵایەتی بەرەو چەمکێکی سۆسیالیستی وەهایان دەبات کە زوو یان درەنگ سۆسیالیزم بەدیدێت. واتە ئەسکاتالۆژی (باوەڕی ئاخیرەت) پەرتووکە پیرۆزەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان وەك سۆسیالیزم رەنگی داوەتەوە. کۆمەڵگاکان بەشێوەی مۆدێلەکانی پێشکەوتنی راستەهێڵی لە جۆری سەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیستی وێناکراوە. لێرەدا جۆرێك لە چەمکی قەدەرگەرایی جێگای باسە. زۆر درەنگ و پڕ بە ئێش دەرکمان بەو راستینە کردووە کە باوەڕی ئاخیرەت و قەدەرگەرایی ئایینی لە ژێر ئەم چەمکە

ئۆگماتیکانەدا شاراوەیە کە لە قووڵاییەوە(لەناخەوە) کاریگەری کردۆتە سەرمان. ئەو راستییەیان شیکار نەکردووە کە لە بنەڕەتدا سروشتی کۆمەڵایەتی خاوەن ماهییەتی سیاسی و ئەخلاقییە، بەڵام سیستەمەکانی شارستانی ئەم ناوەڕۆکەیان سوویوە، رێسا قەبەکانی یاسا و ئیرادەی دەوڵەتیان لە جێگایدا جێگیر کردووە، هەروەها مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش بەشێوەیەکی بێ سنوور ئەم قۆناخەی لە بواری قووڵایی و بەرفراوانییەوە بەرەو پێشەوە برد، ئەمەش جگە لە قەیرانێکی ئابووری، کۆمەڵایەتی، دەسەڵات و دەوڵەتی شتێکی دیکە نییە. پێشتر پێشبینی ئەم راستییە نەکراوە کە راست، چاك و جوان تەنیا لەمیانەی بەدەستهێنانی ماهیەتی سیاسی و ئەخلاقی کۆمەڵگاوە بەدیدێت، لەم پێناوەشدا سیستەمێکی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی پێویستە کە لەمیانەی سیاسەتی دیموکراتییانە بەڕێوەبچێت. لەم لایەنەوە شیکار و چارەسەری پێشنەخراوە. هەروەها ئەم راستییەیان نەبینیوە کە کۆمەڵگای دیموکرات، ئازادو یەکسان بە ئامێر و دامەزراوەکانی دەسەڵات و دەوڵەت پێك ناهێنرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەگەڵ ئەم ئامێرانە ناکۆکە" تیۆری و کرداری ئەوەیان پێشنەخستووە کە هەردووکیان تەنیا لەسەربنەمای پەسەندکردنی یەکتری لەناو ئاشتییەکی بە پرەنسیپانە دەتوانن لەگەڵ یەکتردا بژین. لەبەر ئەوەی پارادیمی سەرەکی بەشێوەی شۆڕش ـ دەسەڵات ـ سۆسیالیزم پێشبینی کراوە، پێویستە سەرمان سوڕ نەمێنێت کاتێك لە سەرمایەداری دەوڵەت زیاتر شتێکی دیکەی لێناکەوێتەوە.

واتایەکی دیکەی ئەنجامگیربوونی سۆسیالیزمی بوونیادنراو بە سەرمایەداری دەوڵەت، پەیوەندی بە بناخەی چینایەتیانەوە هەیە. پێویستە دیسان ئاماژەی پێ بکرێت، ئەو بیرۆکراسییەی زیاتر لە چینەکانی بۆرژوازی و وردە بۆرژوازییەوە هاتوون کە هیوالکانی خۆی لە پاوانی تایبەت نەبینیوەتەوە و سەرمایەیان کەڵەکە نەکردووە، تەنانەت سەرمایەکەی خۆیشی لەدەستداوە، تاکە بژاری ئەوەیە لەڕێگای دەوڵەتەوە ببێتە سەرمایەدارێکی هاوبەشی. ئەو دیاردەیەی بە بۆرژوازی و سەرمایەداری میللی ناو دەبرێت لەمە زیاتر شتێکی دیکە نییە. بەمجۆرە وەك پاوانێکی هاوبەشی سەرمایەداری دەوڵەت، بەگوتەیەکی دیکە بە سیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە پێگەیەکی زۆر بەهێز بەدەست دێنن. لەبەر ئەم هۆکارەیە مەیلی دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیزمی بوونیادنراو زۆر بەهێزە. ئەم بناخە ماددییەش سازشکاری و یەکبوونی ئاسانیان لەگەڵ مۆدێرنیتە روون دەکاتەوە.

٨ ـ بزووتنەوە کلتووری و ئیکۆلۆژی و فێمێنیستییەکانیان وەك کۆسپی بەردەم تێکۆشانی چینایەتی بینیوە. ئەو چەوسانەوە و داگیرکارییە قورسەی نەك تەنیا لەسەر رەنجی ژن بەڵکو

لەسەر تەواوی جەستە و رۆحی بەرێوە دەچێت، شیکاری بەرفراوانی لەبارەوە نەکراوە. پێوانەکانی یەکسانی حقوقی بۆرژوازی دەرباز نەکراوە. ئەم کۆنترین و نوێترین رەنجدەرەی مێژوو کە زیاتر بێکرێیە و کەم جاریش کرێیەکی کەمی هەیە، وەك پێویستییەکی مێژووی پیاوسالاری جگە لە ئۆبژە هیچ واتایەکی دیکەی نەبووە. ئاشکرایە ئەو چینەی شیکار کراوە پیاوە. بە هەڵوێستێکی هاوشێوە نزیکی ئیکۆلۆژیش بوونەتەوە. هەر وەکو چۆن پێشبینی کێشەی بەمجۆرە نەکراوە، بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە بەشێوەیەکی نەرێنی رەنگدانەوەی لەسەر یەکپارچەیی تێکۆشانی چینایەتی دەبێت. هەرچی بزووتنەوە کلتوورییەکانە وەك زیندووکردنەوەی کۆن و فاکتەرێکی دیکەی تێکدانی تێکۆشانی چینایەتی هەڵسەنگێنراوە. ئەنجام، وەك بزاڤێکی چینایەتی دەرهەست رەنگیداوەتەوە کە لە تەواوی رکابەرە شیمانە کراوەکان دابڕاوە و لەناو ئیکۆنۆمیزمدا خنکاوە.

٩ ــ لەبواری سیاسی و ئەخلاقییەوە جیاوازی چینایەتی وەك پەرەسەندنێکی نەرێنی نەبینراوە، بەڵکو وەك پێویستییەکی باش و پێشکەوتنخوازی ئازادی و قۆناخێکی حەتمی هەڵسەنگێنراوە. دەرکیان بەوە نەکردووە، رەوا بینینی پێکهاتەی چینایەتی بەشێوەیەکی بابەتی خزمەتکردنە بەچینەکانی دەوڵەت و دەسەڵات. کۆیلایەتی، بەندایەتی و پرۆلیتاریی وەك باجێك شرۆڤە کراوە کە لەپێناو بە دەستهێنانی ئازادی پێویستە بەرامبەر پێشکەوتنی مێژوویی و سروشت بدرێت. بە پێچەوانەوە وەك شرۆڤەیەکی دژ زۆر بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە هەرسێ شێوەی چینایەتی یەك ناوەرۆکیان هەیە، پەیوەندییان بە پێشکەوتن و ئازادییەوە نییە، کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیش بە یەکەوە لەگەڵ ئەم پێکهاتانە ناژیت، هەروەها بەرامبەر بەمجۆرە جیابوونەوە چینایەتییە تێکۆشانێکی ئەخلاقی، سیاسی و رۆشنبیری پێویستە.

سەرباری ئەوەی میراسگرانی ئەمرۆی بزووتنەوەی سۆسیالیزمی بوونیادنراوی دوو سەد ساڵە رەخنەدانێکی سنووردارایان ئەنجامداوە، بەڵام ناتوانرێت بگوترێت کە وەرچەرخانێکی ریشەییان ئەنجام داوە. بە قۆناخێکی لاوازبوون و قەیرانێکی مەزنی متمانە و باوەڕیدا تێپەڕ دەبن. بەڵام دیسان بزووتنەوەیەکە جێگای خۆی لەمێژوودا هەیە. هەرچەندە سیستەمی سەرمایەدارییان تێپەڕ نەکردووە، بەڵام چەندەی بڵێی سەرقاڵیان کردووە. لە گەیشتن بە رۆژی ئەمڕۆمان خاوەن رۆڵی ئەرێنی و نەرێنین. ئەو تەنگەژەی تێیدا دەژین بەشێکی قەیرانی بوونیادی سیستەمە. دیسان راستترین هەڵوێست ئەوەیە کە سۆسیالیزمی بوونیادنراو وەك قۆناخێك پەسەند بکەین کە زۆرترین کاریگەری لەسەر رکابەرانی سیستەم کردووە. هەروەها لەمیانەی ئەو پەندانەی لە میراسەکەی

وەردەگیرێت وەك بەشێکی ئاواکردنی تازەگەری دیموکراتی تاووتوێ بکرێت و رێککەوتنی لەگەڵدا ئەنجام بدرێت.

### د ـ سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنی ئەنارشیزم

بزووتنەوە ئەنارشیستەکان کە هاوتەمەنی سۆسیالیزمی بوونیادنراون و رەگەکەیان بۆ شۆڕشی فەرەنسا دەگەڕێتەوە دوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بوونیادنراو، راستتر دوای یەکبوونی لەگەڵ سیستەمدا سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی لە جێگای خۆیدایە. ئەمڕۆ باشتر دەرکی پێدەکرێت کە سێ نوێنەرە بەناوبانگەکەی پرۆدۆن، باکۆنین و کرۆپۆتکین لە رەخنەکانیان (سەبارەت بە سیستەم و سۆسیالیزمی بوونیادنراو)دا بە تەواوی ناهەق نەبوون. وەك بزووتنەوەیەك کە تەنیا بە سیفەتی پاوانی تایبەت و دەوڵەت سەرمایەداری رەخنە ناکات، بەڵکو بە سیفەتی مۆدێرنیتەش لە رەخنەکردنی دوانەکەوتووە، لەمیانەی جێگرتنی لەو پەڕی جەمسەری رکابەرێتی سیستەم سەرنج رادەکێشێتە سەرخۆیەوە. ئەو رەخنانەی لەبوارەکانی موراڵ و سیاسییەوە ئاراستەی دەسەڵاتیان کردووە بەشێکی گرنگی راستی لە خۆوە دەگرێت. ئەو بوونیادە کۆمەڵایەتییەی لێیەوە هاتوون کاریگەرییەکەی لەسەر بزووتنەوەکە بەرچاوە. پەرچەکرداری چینایەتی توێژە ئەرستۆکراتەکان کە سەرمایەداری دەسەڵاتی لەدەست دەرهێنان لەگەڵ کاردانەوەی پیشەوەرانی شار کە بە گوێرەی جاران رەوشیان خراپتر بوو، ئەم راستییە پیشاندەدات. مانەوەیان لەسنووری تاکە کەسیدا، ئاوانەکردنی بنکەیەکی جەماوەری بەهێز و پێشنەخستنی سیستەمێکی رکابەر لە نزیکەوە وابەستەی بوونیادە کۆمەڵایەتییەکەیانە. چونکە باش دەزانن سەرمایەداری چی کردووە، بەڵام باش نازانن کە پێویستە چی بکەن. ئەگەر بەکورتی بۆچوونەکانیان کۆبکەینەوە:

١ ـ لەوپەڕی چەپەوە سیستەمی سەرمایەداری رەخنە دەکەن. باشتر تێدەگەن کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پەرتەوازە کردووە. وەك مارکسیستەکان رۆڵی پێشکەوتنخوازی پێ نابەخشن. هەڵوێستیان دەرهەق بەو کۆمەڵگایانەی سەرمایەداری پەرتەوازەی کردوون ئەرێنیترە، بە کۆنەپەرستییان دانانێت و شایستەی مەحکومبوون بە رزینیان نابینێت. بەڵکو لەسەر پێ مانەوەیان بە هەڵوێستێکی ئەخلاقی و سیاسی دادەنێت.

٢ ـ بەگوێرەی مارکسیستەکان هەڵوێستیان سەبارەت بە دەسەڵات و دەوڵەت بەرفراوان و واقیعیترە. ئەوەی دەڵێت دەسەڵات خراپی رەهایە باکۆنینە. بەڵام کاتێك داوا دەکەن و دەڵێن

باجەکەی چی دەبێت با ببێت پێویستە یەکسەر دەسەڵات و دەوڵەت هەڵگیرێت ، هەڵوێستێکی خەیاڵییە و لەبواری کرداریدا هێندە شانسی جێبەجێکردنی نییە. هەروەها پێشبینی ئەوەیان کردووە کە لەرێگای پشتبەستن بە دەوڵەت و دەسەڵاتەوە سۆسیالیزم ئاوا ناکرێت، بەڵکو بە سەرمایەدارییەکی بیرۆکراتی مەترسیدارتر ئەنجامگیر دەبێت.

٣ ـ کاتێك دەڵێن: ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی بۆ تەولوی بزووتنەوەکانی چینی کارکەر و گەلان دەبێتە کارەسات و زەبرێکی مەزن لە هیولاکانیان دەدات، دووربینییەکەیان واقیعییە. لەو رەخنانەشیان مافدار دەرکەوتوون کە سەبارەت بە یەکێتی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا ئاراستەی مارکسیستەکانیان کردبوو. خاڵێکی دیکەی گرنگ و شایستەی ئاماژە پێکردن ئەوەیە کە دەڵێن پێشکەوتنی مێژوو لە بەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە بە واتای زیانێکی مەزنی ئۆتۆپیاکانی ئازادی و یەکسانی دێت، هەروەها بەهۆی لایەنگیریکردنی مارکسیستەکان بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە زۆر بەتوندی رەخنەیان کردوون و بەخیانەت تاوانباریان کردوون. خۆشیان داکۆکیان لەسەر کۆنفیدرالیزم کردووە.

٤ ـ بەشێکی گرنگی رەخنەکانیشیان دەرهەق بە بیرۆکراسیەت، ئیندوستریالیزم و شارگەرایی راست دەرکەوتوون. ئەم بۆچوون و رەخنانە رۆڵێکی گرنگیان لەوەدا هەیە کە پێشوەخت هەڵوێستی ئیکۆلۆژی و دژە ـ فاشیستییان پێشخستووە.

٥ ــ ئەو رەخنانەی ئاراستەی سۆسیالیزمی بوونیادنراویشیان کردوون بە هەرەسهێنانی سیستەم پشتراست کراوەتەوە. ئەو توێژ و گروپەن بە باشترین شێوە ئەو راستییەیان دەستنیشان کردووە کە ئەوەی ئاواکراوە سۆسیالیزم نییە، بەڵکو سەرمایەداری دەوڵەتی بیرۆکراتییە.

سەرباری ئەم بۆچوونە گرنگ و رەخنە سەلمێنراوانەیان، بە بەراورد لەگەڵ سۆسیالیزمی بوونیادنراو بە جەماوەری نەبوونیان و نەبوونی شانسی پراکتیزەکردنیان، جێگای تێرامان و هزراندنە. لەو بروایەدام کە ئەمە سەرچاوەی خۆی لە ناتەولوی و سەقەتییەکی گرنگی تیۆرییەکەیان وەردەگرێت. ناتەولوی شیکارەکانیان دەرهەق بە شارستانی و پێشنەخستنی سیستەمێك دەرفەتی پەیرەوکردنی هەبێت، رۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە. شیکارەکانیان دەرهەق بە کۆمەڵگای مێژوویی و پێشنیارەکانیان لەمەڕ چارەسەری هێندە پێشکەوتوو نەبووە. هەروەها خۆشیان کاریگەری فەلسەفەی پۆزێتیڤیستیان لەسەرە. ناتوانرێت بگووترێت" هێندە لەچوارچێوەی زانستی کۆمەڵایەتی ناوەندێتی ئەورووپا دەرکەوتوون. بەبروای من، گرنگترین کەموکورییان ئەوەیە کە بونیاد و سیستەمێکیان سەبارەت بە سیاسەتی دیموکراتی و تازەگەری

پێشنەخستووە. ئەو وردەکاری و هەستیارییەی سەبارەت بە راستی بۆچوون و رەخنەکانیان هەوڵیان بۆ داوە دەرهەق بە ئاواکردنی سیستەم و پراکتیزەکردندا پیشانیان نەدلوە. لەوانەیە پێگەی چینایەتییان ئەمەی بەربەست کردبێت. کۆسپێکی دیکەی گرنگ ئەو کاردانەوەیەیە کە لە بۆچوونە تیۆرییەکانیان و ژیانیاندا بەرامبەر هەموو جۆرێکی دەسەڵات نیشانیاندلوە. کاتێك ئەو کاردانەوە گونجاوەی بەرامبەر فەرمانڕەوایەتی دەسەڵات و دەوڵەت هەیانە سەبارەت بە تەواوی شێوەکانی حوکمڕانی و سیستەمەکان پیشانیاندا، لە بواری تیۆری و کردارییەوە کاریگەری لە بەرۆژەڤکردنی تازەگەری دیموکراتی کردووە. لەو بڕوایەدام گرنگترین بابەتی رەخنەدانیان ئەوەیە، مەشروعیەتی قەڵەمڕەوێتی دیموکراتی و تازەگەری دیموکراتییان پێویست نەبینیوە. هەروەها پێشنەخستنی بژاری نەتەوەی دیموکراتی لەجێگای دەوڵەت ـ نەتەوە کەموکوڕییەکی گرنگ و بابەتی رەخنەدانە.

بێگومان هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بوونیادنراو، پێشکەوتنی بزووتنەوە فێمینیستی و ئیکۆلۆژییەکان و گەورەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی لە رۆژی ئەمڕۆماندا کاریگەرییەکی ئەرێنی کردۆتە سەر ئەنارشیستەکان. بەڵام هێندە دووبارەکردنەوەی راست دەرکەوتنی دووربینییەکانیان واتایەکی ئەوتۆی نییە. ئەو پرسیارەی پێویستە وەڵامی بدەنەوە، بۆچی بە سووربوونەوە مەیلی سیستەمێکیان پیشان نەداوە، بوونیادیان نەناوە؟ ئەمەش کەلێنە گەورەکەی نێوان تیۆری و ژیانیان نیشاندەدات. ئەو ژیانە مۆدێرنەی زۆر رەخنەی دەکەن ئایا خۆیان توانیویانە دەربازی بکەن؟ راستتر لەم بارەیەوە چەندە دڵسۆز و بەپرەنسیپن؟ ئایا دەتوانن دەستبەرداری شێوازی ژیانی ناوەندێتی ئەورووپا ببن و هەنگاو بۆ تازەگەری دیموکراتی بهاوێژن؟

دەشێت پرسیار و رەخنەی هاوشێوە زۆر بکەین. ئەوەی گرنگە کۆکردنەوەی ئەم بزووتنەوەیە و میراسەکەیەتی لەناو سیستەمێکی هاوسەنگی دژ بە سیستەم کە دەرفەتی پێشکەوتنی هەبێت، چونکە ئەم بزاڤە فیداکاری گەورەی لە مێژوودا تۆمارکردووە، بیرمەندی گەورەو گرنگی لەخۆوە گرتووە، لەمیانەی بۆچوون و رەخنەکانیانەوە جێگایەکی گرنگیان لەناو کۆمەڵی رۆشنبیریدا گرتووە. بە بەراورد لەگەڵ ریال سۆسیالیستەکان چاوەڕوانی دەکرێت ئەنارشیستەکان لەرێگای رەخنەدانێکی ئاسان و بەمتمانە روو لە پراکتیکی رۆژانەیی و هەنووکەیی بکەن. چونکە بەدەستهێنانی پێگەی شایستە لەتێکۆشانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، رۆشنبیری و ئەخلاقی هێشتا جێگای گرنگییە. لەو تێکۆشانانەی لە زەمینەی رۆژهەڵاتی ناوین لە رەهەندەکانی شارستانێتی و کلتووردا خێرابووە و دەرکەوتۆتە پێش، دەشێت ئەنارشیستەکان

هەم خۆیان نوێ بکەنەوە، هەم کۆمەکی گرنگ و بەهێز پێشکەش بکەن. لە کار و خەباتەکانی سەرلەنوێ بووونیادنانەوەی سیستەمی تازەگەری دیموکراتیدا یەکێك لەو هێزە گرنگانەن کە پێویستە رێککەوتنیان لەگەڵدا پێشبخرێت.

#### هـ - فێمێنیزم: راپەڕینی کۆنترین کۆڵۆنی

دەستەواژەی فێمێنیزم کە لە زمانی تورکی بە واتای بزووتنەوەی کادنجیلیك (ژنگەرایی) دێت، لە پێناسەکردنێکی تەواوەتی کێشەی ژن دوورە، لەبەر ئەوەی بەرامبەرەکەشی وەك پیاوگەرایی وێنا دەکرێت دەشێت زیاتر بەرەو نەزۆکی ببات. واتایەکی بەمجۆرە پیشاندەدات وەك بڵێی ژنە چەوسێنراوەکەی پیاوی باڵادەستە. کەچی راستینەی ژن زۆر بەرفراوانترە. لەولاتری رەگەزەوە واتا و رەهەندی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر زاراوەی کۆڵۆنی لە چوارچێوەی وڵات و نەتەوەکان دەربخەین و لەسەر گروپە مرۆڤییەکانی پێڕەو بکەین. لە راستیدا هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵگا لەبواری جەستەیی و رۆحییەوە بەقەدەر ژن داگیرکاری نەبینیوە. پێویستە دەرك بەم خاڵە بکرێت، ژن لە پێگە و ستاتۆی کۆڵۆنیەکدایە کە بە ئاسانی سنوورەکانی دیار ناکرێت.

هەروەك لە تەواوی زانستەکانی دیکەشدا جێگای باسە، زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش کە پیاوێتی مۆرکی خۆی لێداوە، ئەو دێڕانەی لە چوارچێوەی ئەم گووتانەی باس لە ژن دەکات، بەو هەڵوێستە حەماسی و پروپاگەندەییانەوە باسکراوە کە هەرگیز نزیکی راستی نەبۆتەوەو دەستی بۆ نەبردووە. هەروەك چۆن ئەمجۆرە گووتانە چین، چەوسانەوە، فشار و ئەشکەنجەکانی مێژووی شارستانیان پەردەپۆش کردووە، چل ئەوەندەش ستاتۆ راستەقینەکەی ژنیشی شاردۆتەوە. لەجیاتی فێمێنیزم دەشێت زاراوەی ژنۆلۆژی (زانستی ژن ناسی) باشتر وەڵامی ئامانجەکە بداتەوە . هەر چۆنێك بێت ئەو دیاردانەی ژنۆلۆژی ئاشکرایان بکات لایەنی راستییان لە زۆربەی بەشەکانی دیکەی سۆسیۆلۆژی لە جۆری تیۆلۆژی(خوداناسی)، ئەسکاتۆلۆژی(ئاخیرەتناسی)، پۆلیتیکۆلۆژی(سیاساتناسی) و پیداگۆژی[4] (زانستی پەروەردە)دا کەمتر نییە. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ژن هەم لە بواری جەستە هەمیش لەبواری واتاوە بەرفراوانترین بەشی سروشتی

[4] پیداگۆژیا (Pedagogy): دەستەواژەیەکی پەروەردەییە، بە ریشە یۆنانییە، سەبارەت بە چۆنیەتی پێناسە کردنیەوە بۆچوونی جیاوازی چەندین فەیلەسوف جێگای باس بووە. بەڵام بە گشتی بە واتای زانستی پەروەردە و بنەماکانی خوێندن دێت. لەلایەن قوتابخانە فەلسەفی و قوتابخانە هەمەجۆرەکانی دەروونناسیەوە ئاواکراوە.

کۆمەڵایەتی پێکدێنێت. کەواتە بۆچی ئەم بەشە زۆر گرنگەی سروشتی کۆمەڵایەتی نەکەین بە بابەتی زانست؟ ئەو سۆسیۆلۆژییەی لە پێداگۆژییەوە تا دەگاتە زانستی نەشونوماکردنی منداڵان و پەروەردەکردنیان بۆ چەندین پارچە دابەش بووە، ژنۆلۆژی ئاوانەکردووە، هۆکارەکەشی جگە لە گوتەی باڵادەستێتی پیاو هیچ شتێکی دیکە روونی ناکاتەوە.

تا سروشتی ژن لە تاریکیدا بمێنێتەوە، ئەوا تەواوی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاش لە ناڕوونیدا دەمێنێتەوە. رۆشنکردنەوەی بەرفراوان و راستەقینەی سروشتی کۆمەڵایەتی تەنیا لەمیانەی رۆشنکردنەوەیەکی راستەقینە و بەرفراوانی سروشتی ژنەوە بەدیدێت. کاتێك لەمێژووی کۆلۆنیکردنیەوە تا دەگاتە کۆلۆنیکردنی لە بواری ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و زهنییەوە پێگەی ژن رۆشن بکرێتەوە، ئەوا کۆمەکێکی مەزن بە ئاشکرابوونی سەرجەم بابەتەکانی دیکەی مێژوو و هەموو بوارەکانی کۆمەڵگای رۆژی ئەمرۆمان دەکات.

بێگومان ئاشکراکردنی ستاتۆ (پێگە)ی ژن رەهەند و لایەنێکی مەسەلەکەیە. رەهەندی گرنگتر پەیوەندی بە کێشەی رزگارییەوە هەیە. بە گوتەیەکی دیکە چارەسەرکردنی کێشەکە گرنگییەکی زیاتر و مەزنتری هەیە. زۆر جار دەگووترێت کە ئاستی ئازادی گشتی کۆمەڵگا بە رادەی ئاستی ئازادی ژنەوە پەیوەستە. ئەوەی گرنگە چۆنیەتی پڕکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم گوتەیەیە. چونکە یەکسانی و ئازادی ژن تەنیا یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگا دەستنیشان ناکات. بەڵکو لەم پێناوەدا تیۆری، بەرنامە، رێکخستن و چالاکی گونجاویش پێویستە. لەمەش گرنگتر پیشانیدەدات کە بەبێ ژن سیاسەتی دیموکراتییانە نابێت، تەنانەت سیاسەتمەدارێتی چینایەتیش ناتەواو دەمێنێتەوە، ئەوکاتە ئاشتی و ژینگەش پێش ناخرێن و ناپارێزرێن.

پێویستە ژن لە ستاتۆی دایکی پیرۆز، نامووسی سەرەکی، هاوسەری دەست لێبەرنەدراو دەربخەین و وەك کۆی سۆبژە ـ ئۆبژە هەڵیسەنگێنین و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین. بێگومان بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەم لێکۆڵینەوە لە گاڵتەجارییەکانی ئەشق بپارێزین. تەنانەت یەکێك لە گرنگترین رەهەندەکانی لێکۆڵینەوەکە پێویستە ئەو چەپەڵییە گەورانە ئاشکرا بکات و پیشانی بدات کە بەناوی ئەشقەوە دەکرێت (لاقەکردن، کوشتن، لێدان، ئەو جنێوانەی هەزاری دینارێك ناکات). گوتەی "سەرجەم شەڕەکانی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا بەهۆی ژنەوە روویداوە" کە هیرۆدوت گووتویەتی، تەنیا دەتوانێت راستییەك روون بکاتەوە، ئەویش ئەوەیە" وەك کۆلۆنییەك بەهاداربووە، هەر بۆیە کراوەتە بابەتی شەڕە گرنگەکان. هەروەکو چۆن مێژووی شارستانی بەمجۆرەیە، مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش نوێنەرایەتی دلگیرکارییەك دەکات کە هەزاران قات

قورسـتره و بەشـێوەیەکی هەمەلایەنـەتره. ئەمـەش لەسـەر ناسـنامەی ژن نـەخش دەکرێـت کۆلۆنیکردنی بەشێوەی دایکی سەرجەم رەنجەکان، خاوەن رەنجی بێبەرامبەر، کرێکاری کـەمترین کـرێ، بێکـار، سەرچـاوەی فشـار و ئـارەزووی سـنوور نەناسـی پیـاو، کارگـەی سیسـتەم بـۆ وەچەخستنەوە، دایانی بەخێوکردنی منداڵ، ئـامرازی ریکلام، ئـامرازی سـێکس و پۆرنـۆ و ...هتـد بـەردەوام دەبێـت. سـەرمایەداری بـەجۆرێك میکـانیزمی چەوسـاندنەوەی سـەبارەت بـە ژن پێشخسـتووە کـە لـە هـیچ سیسـتەمێکی دیکـەی چەوسانەوەدا بـەم رادەیـە نـەبووە. هەرچـەندە خوازیاریش نەبین بەڵام چەندین جار گەڕانەوەمان بۆ سـەر تـاووتوێکردنی سـتاتۆی ژن بـە ئـازارە. بەڵام زمانی راستییەکان بۆ چەوساوەکان بەجۆرێکی دیکە نابێت.

لەژێر رۆشنایی ئەم راستییانەدا بێگومان بزووتنەوەی فێمێنیسـتی ناچـارە ببێتـە رادیکـاڵترین بزاوتی رکابەری دژە سیستەم. بزووتنـەوەی ژنـان بـەم لۆخـە مۆدێرنـەی دەتـوانێ ریشـەکەی بـۆ شۆڕشی فەرەنسا بگەڕێنینەوە، دوای چەند قۆناخێك توانیویەتی بە رۆژگاری ئـەمڕۆمان بگـات. لـە یەکەمین قۆناخدا دوای یەکسانی یاسایی کەوتن. ئەم یەکسانییە کـە واتایـەکی ئـەوتۆی نییـە وەك بڵێـی لـە رۆژگـاری ئـەمڕۆمان بەشـێوەیەکی بـەربڵاو بـەدیهاتووە. بـەڵام پێویسـتە بـاش بزانرێـت ناوەرۆکەکـەی پووچـە. هـەروەکو مافـە ئـابووری، کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکان پێشـکەوتنی رووکەشیانەی مافەکانی مرۆڤیش جێگای باسـە. لـەپێناو دیموکراسـی، یەکسـانی و ئـازادی ژن کـە تەنیا مۆدێرنیتەی فەرمی بەندی نەکردووە، بەڵکو سەرجەم قۆناخەکانی شارسـتانی و پلـەداری لـە بـواری زهـنی و جەسـتەیی تـەواوی شـانەکانی بەنـدکردووە و لەمیانـەی قـووڵترین کۆیلایەتییـەوە بـەکاری دێنێـت، خـەباتێکی تیـۆری بـەرفراوان، تێکۆشـانی ئایـدیۆلۆژی، چـالاکی رێکخسـتنی و بەرنامەیی و گرنگترینیشیان چالاکی بەهێز پێویستە، ئەگەر ئەمانە نەبن فێمێنیـزم و خـەباتی ژنـان لە چالاکی ژنە لیبراڵەکان بەولاوە واتایەکی دیکەی نابێت کە هەوڵی دڵنیاکردنی سیستەم دەدات.

لەلۆخێکدا زانستی ژنناسی پێشبکەوێت، روونکردنەوەی چارەسەرکردنی کێشەکان لـە رێگـای نموونەیەکـەوە چـەندەی بڵـێین سـوودبەخش دەبێـت، پێویسـتە تێبگـەین کـە غـەریزەی زایەنـد لەسەرووی شێوە هەرە کۆنەکانی فێربوونی ژیان دێت. وەڵامی پێداویستی بـەردەوامکردنی خـودی ژیانە. نەبوونی دەرفەتی ژیانی ناکۆتای تـاك، چارەسـەرییەکەی تـاکی ناچـار کـردووە پۆتانسـێلی سەرلەنوێ خۆ ئافراندنەوە پێشبخات. ئەو شتەی بـە ئـارەزوو و رەمـەکی زایەنـد نـاو دەبرێـت، لـە هەلومەرجی گونجاودا ئەم پۆتانسێلە بەرهەم دێنێـت و بـەردەوامی بـە ژیـان دەدات. بـەجۆرێك لـە جۆرەکان دەبێتە رێگەچارەی هەڕەشەی لەناوچوونی رەچەڵەك و مردن. یەکەم دابەشبوونی خانە،

خۆ بەنەمرکردنی تاکخانەیە لەرێگای زۆربوونەوە. ئەگەر گشتگیرتری بکەین، بوویەری بەردەوامکردنی مەیلی ناکۆتاییبوونە لە ژیانی بوونەوەردا کە بەرامبەر بەو نەبوون و بۆشاییەی هەولّی قووتدانی گەردوون دەدات، بەردەوام لەمیانەی هەمەرەنگ کردنی خۆیەوە هەولّی بۆ دەدات.

ئەو تاکەی ئەم بوویەرە گەردوونییە لەجۆری مرۆڤدا درێژە پێدەدات زیاتر ژنە. چونکە زۆربوون لە جەستەی ژندا روودەدات. رۆڵی پیاو لەم رووداوەدا تا نوارادە لاوەکییە. لەم سۆنگەیەوە" لە ئەستۆگرتنی تەواوی بەرپرسیارێتی بوویەری بەردەوامکردنی رەچەڵەك لەلایەن ژنەوە لە بواری زانستییەوە مایەی تێگەیشتنە. چونکە ژن تەنیا بە هەلگرتنی کۆرپەلە لەسکیدا، پێگەیاندن و لەدایکبوونی ناوەستێت، بەڵکو تا مردنیش بەشێوەیەکی سروشتی بەرپرسیارێتی بەخێوکردنی لە ئەستۆ دەگرێت. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا یەکەمین ئەنجامی بەدەستی بێنین، سەبارەت بە تەواوی بابەتەکانی پەیوەندی زایەندی پێویستە ژن خاوەن گوتە و بریاری مسۆگەر بێت. چونکە هەر پەیوەندییەکی زایەندی لە بواری پۆتانسێلدا چەندین کێشەی قورس لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە بەرگەگرتنی ئاستەمە. پێویستە تێبگەین ئەو ژنەی دە منداڵ بخاتەوە لەبواری جەستەیی بگرە لەبواری رۆحیشەوە دەکەوێتە رەوشێکەوە زۆر لەمردن خراپترە.

تێروانینی پیاو سەبارەت بە زایەند نادروست و نابەرپرسیارانەیە. بە پلەی یەکەم جەهالەت و کوێرایی دەسەلاّت رۆڵ لەم رەوشەدا دەبینن. هەروەها لەگەڵ دەرکەوتنی پلەداری و دەوڵەتی خانەدانێتیدا فرە منداڵی بۆ پیاو بە واتای هێزێکی دەست لێبەرنەدراو دێت. منداڵی زۆر، بە تەنیا بە واتای بەردەوامکردنی رەچەڵەك نایەت، بەڵکو مانەوەی دەسەلاّت و دەوڵەتیش مسۆگەر دەکات. لەدەست نەدانی دەوڵەت کە بەجۆرێك لە جۆرەکان بە واتای پاوانی موڵك دێت، گرێدراوی گەورەیی خانەدان و بنەماڵەیە. بەمجۆرە لەپێناو هەبوونی بایۆلۆژی و هەبوونی دەوڵەت و دەسەلاّتدا ژن دەکرێت بە ئامرازی وەچەخستنەوەی زۆر. بەمەش گرێدرلو بەسروشتی یەکەم و دووەم بناخەی داگیرکارییە ترسناکەکەی ژن دادەنرێت. گرێدراو بەم دوو سروشتەوە شیکارکردنی داڕووخانی ژن بایەخدارە. هێندە پێویستی بە روونکردنەوە نییە، تا بزانین لە ژێر ستاتۆی ئەم دوو سروشتەدا مەحاڵە بۆ ماوەیەکی درێژ ژن لەبواری رۆحی و جەستەییەوە بتوانێت بەشێوەیەکی تەندروست و چالاك لەسەر پێیان بمێنێتەوە. داڕووخانی جەستەیی و رۆحی بەشێوەیەکی تێکەڵ پێشوەخت پەرەدەسەنێت و بەرامبەر بە بەردەوامکردن و مسۆگەرکردنی ژیانی هەندێکی تر،

لەمیانەی ژیانێکی کورت خایەنی پڕ لەئێش و خەمباری ژن کۆتایی دێت. شیکارکردن و خوێندنەوەی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە لەسەر بنەمای ئەم واقیعە گرنگییەکی زۆری هەیە.

کارەساتی کێشەکە سەبارەت بە ژن لەلایەکەوە دابنێین. زێدەڕۆیی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان کە کاریگەرییە قورسەکانی خۆی کردۆتە سەر سەرجەم سروشتی کۆمەڵگا و ژینگەی ئیکۆلۆژی، واتە رەهەندی کێشەی دیموگرافی خۆی دەسەپێنێت. یەکێك لەو وانە و پەندە سەرەکیانەی پێویستە سەبارەت بە زانستی ژنناسی و سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەربگیرێت ئەوەیە کە ژمارەی مرۆڤ لە میانەی پەیڕەوی "فێربوونی غەریزی" بەردەوامی پێنەدراوە و گەورە نەکراوە، لە هەندێك رەوشی دەگمەنیشدا بەگوێرەی ئەو بچووك نەکراوەتەوە. رەمەکە خۆڕسکەکان کە سەرەتاییترین پەیڕەوی بەردەوامکردنی رەچەڵەکن پشتگیریکردنی لەمیانەی ئەو پەیڕەوە زانستیانەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە پێشخراوە، هۆکاری سەرەکی زۆربوونە زێدەڕۆییەکەی ژمارەی دانیشتوانە. تەنیا لەمیانەی رێگاکانی رەمەکی خۆڕسك، بەتایبەتیش لەمیانی پاڵنانی رەمەکی زایەندەوە درێژەدان بە هەبوونی جۆری مرۆڤ کە سروشتی کۆمەڵایەتیشە، گوزارشت لە رەوشێکی زۆر دواکەوتوو دەکات. چونکە ژیری و ئاستی کلتووری پۆتانسێلێکی فێربوون پێشکەش بە هەبوونە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن کە بتوانن بە ماهیەتێکی پێگەیشتووتر درێژە بە خۆیان بدەن. واتە تاك و جڤاتەکان لەمیانەی ژیری و کلتوورەکانیان، دامەزراوە فەلسەفی و سیاسییەکان لە رەوشێکدان کە لەماوەیەکی درێژخایەندا دەتوانن دەرفەتەکانی خۆژیاندارکردن بەکاربێنن. لەم سۆنگەیەوە" لە میانەی زۆربوون لەرێگای رەمەکی زایەندییەوە پێویستی بە بەردەوامکردنی رەچەڵەك نامێنێت. چونکە ژیری و کلتووری مرۆڤ لە مێژە ئەم پەیڕەوەی دەرباز کردووە. هەربۆیە لە بنەڕەتدا پرەنسیپی قازانجی شارستانی و مۆدێرنیتە بەرامبەر ئەم دواکەوتوویە بەرپرسیارە. بێگومان زیادبوونی زێدەڕۆییانەی ژمارەی دانیشتوان زێدەڕۆیی دەسەڵات و پاوانە. ئەویش یەکسانە بە زێدەڕۆییترین و زیاترین قازانج. زیادبوونی زێدەڕۆییانەی جۆری مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو، نەك تەنیا کۆمەڵگای خۆی بەڵکو ژینگە و سروشتەکەشی رووبەڕووی لەناوچوون کردۆتەوە، مسۆگەر ئەمەش ئەنجامی سەرمایەداری کۆکراوە و کەڵەکەبوونی دەسەڵاتە، واتە ئەنجامی یاسای زۆرترین قازانجە. تەواوی فاکتەر و هۆکارەکانی دیکەش لە پلەی دووەمدا رۆڵ دەبینن.

لە دۆخێکی بەمجۆرەدا، پێویستە بەرپرسیارێتی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەی ژن بەدەستی ژنەوە بێت کە بە رەهەندی مەزن گەیشتووە، لەرێگایەوە کێشەی دیمۆگرافی چارەسەر

دەبێت کە ڕێچکەی لەپێشینەیی بەرپەستکردنی ئەو وێرانکارییە ئیکۆلۆژییەیە کە بە ئاستێکی بەرز گەیشتووە. یەکەمین مەرجی ئەمەش ئازادی و یەکسانی تەواوەتی ژنە، مافی تەواوەتی ئەنجامدانی سیاسەتی دیموکراتییانەیە، لە سەرجەم پەیوەندییە زایەندییەکان خاوەن مافی گوتە و ئیرادەی تەواوە. لە دەرەوەی ئەم واقیع و راستینەیە بە تەواوی واتا رزگاری، ئازادی و یەکسانی ژن، کۆمەڵگا و ژینگە مەحاڵە. هەڵبەتە ئەگەری شێوەگرتنی سیاسەتی دیموکراتی و سیاسەتی کۆنفیدراڵیش نابێت.

هەروەها بەو سیفەتەی ژن فاکتەری سەرەکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە، ئەوا لەژێر رۆشنایی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبووندا سەبارەت بە جوانی و ئاکاری ژیان رۆڵێکی ژیانی دەبینێت. زانستی جوانی و ئاکار بەشێکی دانەبڕاوەی زانستی ژنناسییە. بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتییە قورسەی لە ژیاندا هەیەتی، هیچ گومانێکی تێدا نییە کە وەك هێزی هزر و کردار سەبارەت بە تەواوی بابەتەکانی ئاکار و جوانی ژن کرانەوە و پێشکەوتنی مەزن ئەنجامدەدات. بە بەراورد لەگەڵ پیاو رایەڵە و پەیوەستبوونی ژن بە ژیانەوە زۆر بەرفراوانترە. پێگەیشتوویی رەهەندی ژیری سۆزداریش پەیوەندی بەمەوە هەیە. لەم سۆنگەیەوە" بەو سیفەتەی ئەستاتیك جوانکردنی ژیانە، سەبارەت بە ژن بابەتێکی ژیانی و هەبوونە. هەروەها سەبارەت بە ئەتیك ـ ئاکار ـ (تیۆری ئەخلاق، ئەستاتیك = تیۆری جوانی)یش بەرپرسیارێتی ژن فراوانترە. رەفتاری واقیعی و بەرپرسانەی ژن سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی لایەنە باش و خراپەکانی پەروەردەی مرۆڤ، گرنگی ژیان و ئاشتی، خراپی و سامناکی شەڕ، دەستنیشان کردن و بڕیاردان لە بارەی پێوانەکانی ماف و دادوەرییەوە سەبارەت بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە وەك پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. هەڵبەتە باسی ئەو ژنە ناکەم کە مەقاشی دەستی پیاوە و سێبەرەکەیەتی. ئەوەی جێگای باسە، ئەو ژنەیە کە ئازادە، یەکسانە و دیموکراتیزەبوونی پەسەندکردووە.

پێشخستنی زانستی ئابووریش وەك بەشێکی زانستی ژن راستتر دەبێت. لە سەرەتاوە ئابووری شێوەیەکی چالاکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە ژن رۆڵی بنەڕەتی تێدا بینیوە. لەبەر ئەوەی کێشەی بەخێوکردنی منداڵان لە ئەستۆی ژندایە، ئابووری واتایەکی ژیانیی بۆ ژن هەیە. لە راستیدا گوتەی ئابووری(NOMY-ECO) بە واتای "یاسای ماڵ، رێساکانی گوزەراندنی ماڵ" دێت. ئاشکرایە کە ئەمەش لەکارە سەرەکییەکانی ژنە. زەوتکردنی ئابووری لە دەستی ژنەوە و رادەستکردنی بە سووخۆر، بازرگان، پارە، سەرمایەدار و دەسەڵات ـ دەوڵەت و ئەو فەرمانڕەوایانەی وەك ئاغا رەفتار دەکەن، کوشندەترین گورز بوو بەر ژیانی ئابووری کەوت. ئەو

ئابوورییەی رادەستی هێزەکانی دژە - ئابووری کراوە، بەتایبەتیش کاتێك بە خێرایی دەکرێتە سەرەکیترین ئامانجی دەسەڵات و ملیتاریزم، بە درێژایی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە دەکرێت بە فاکتەری سەرەکی تەواوی ململانێ، تەنگەژە، پێکدادان و شەڕە سنوورنەناسەکان. لە رۆژگاری ئەمرۆماندا ئابووری کراوەتە مەیدانی یارییەك لەلایەن ئەوانەی هیچ پەیوەندییەکیان بە ئابوورییەوە نییە، یاری بە پارچە کاغەز دەکرێت و لە رێگای پەیرەوی زۆر لە قومار خراپترەوە بەشێوەیەکی بێ سنوور بەهای کۆمەڵایەتی زەوت دەکەن. پیشەی پیرۆزی ژن، بە تەواوی ژنی لێ پەراوێزکراوە، بۆ یارییەکانی نرخ و سوود، بۆرسە و وەرشەکان گۆڕاوە کە بەرهەمەکانی جوانکاری و ئەو بەرهەمە زیادانە بەرهەم دێنێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤەوە نییە و لە میانەی ئامرازەکانی هاتووچۆ و ئامێرەکانی شەڕەوە ژینگەی بەدۆخێك گەیاندووە کە دەرفەتی ژیانی تێدا نەماوە.

بزووتنەوەی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی ژنان کە فێمێنیزمیش لەخۆوە دەگرێت و پشت بە زانستی ژنناسی دەبەستێت ئاشکرایە کە لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا رۆڵی سەرەکی دەبینێت. پێویستە بە رەخنەکردنی بزووتنەوەی ژنانی رابردووی نزیك سنووردار نەمێنێت، بەڵکو دابەزێتە سەر مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە کە زیاتر ژنی فەوتاندووە. ئەگەر بابەتی ژن، کێشەکەی و بزووتنەوەکانی جێگەیان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هێندە کەمە وەك بڵێی نییە، بەرپرسیاری سەرەکی ئەمە زهنییەت و بوونیادی هەژموونگەرایی شارستانی و مۆدێرنیتەیە. دەشێ لەرێگای هەڵوێستی حقوقی و سیاسی تەسکی یەکسانیی کۆمەك پێشکەش بە لیبڕالیزم بکرێت. بەڵام لەمیانەی ئەم هەڵوێستانە نەك هەر تەنیا کێشەکە چارەسەر نابێت، تەنانەت وەك دیاردەش شیکار ناکرێت. بانگەشەیەکی لەو جۆرە کە بزووتنەوە فێمێنیستییەکانی لە ئازادان دابڕاو لە لیبڕالیزم، بوونەتە هێزێکی رکابەری سیستەم، خۆخەڵەتاندنە. وەك بانگەشە دەکرێت ئەگەر یەکێك لەکێشە سەرەکییەکانی فێمێنیزم رادیکاڵیزم بێت، ئەوکاتە پێویستە بەشێوەیەکی ریشەیی پەیوەستبوونی خۆی بەخوو و ئالوودەبوونەکانی لیبڕالیزم، شێوازی هزر و هەستیان و ژیانیان بپچڕێنن، هەروەها دوژمنی ژن شیکار بکەن، واتە شارستانی و مۆدێرنیتە شیکار بکەن کە لە پشت لیبڕالیزمەوەن. پێویستە لەسەر ئەم بنەمایە رێگا واتادارەکانی چارەسەری بگرنەبەر.

پێویستە تازەگەری دیموکراتی بزووتنەوەی ئازادی و سروشتی ژن وەك یەکێك لە هێزە سەرەکییەکانی خۆی ببینێت، هەم پەرەپێدانی هەم هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵیدا بە ئەرکە لە پێشینەکانی خۆی دابنێت و لە کار و خەباتی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەدا هەڵیسەنگێنێت.

و ـ ئیکۆلۆژیا: سەرهەڵدانی ژینگە

یەکێك لەو کێشە سەرەکییانەی سیستەمی شارستانی رێگای لەپێش کردەوە، تێکچوونی هاوسەنگییە هەستیارەکەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا ـ ژینگەیە. سروشتی کۆمەڵایەتی بە درێژایی ژیان و قۆناخی پەرەسەندنی بۆ هەماهەنگی و گونجان لەگەڵ ژینگە بەردەوام گرێدراوی هاوسەنگییە هەستیارەکە مایەوە. لە پەرەسەندنی خۆڕسکانەدا نەبوونی لادانێکی ئەوتۆ کە بەشێوەیەکی ریشەیی هاوسەنگی بگۆڕێت، پێویستییەکی پەرەسەندنی سروشتییە. چونکە لەبنەڕەتدا سیستەمەکان لەرێگای کار لە یەکترکردن و بەخێوکردن پەرەدەسەنن نەك لەمیانەی رووخاندنی یەکتر. کاتێك لادان رووبدات، ناچارە لەلایەن لۆژیکی سیستەمەکانەوە تێپەرێنرێت. لەم چوارچێوەیەدا شارستانی وەك لادانێك لە سیستەمی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا رووبەڕوومان دەبێتەوە. هەرچەندە دەڵێین سیستەمی شارستانی، بەڵام ئەم گوتەیە تەنیا پایە و بەهایەکی پروپاگەندەیی هەیە. بۆ ئەوە دروستکراوە کە خۆی لەجێگای سیستەمی راستەقینەی سروشتی کۆمەڵگا جێگیر بکات. لەکاتێکدا سیستەمی راستەقینە بە بەربەر و گروپە کۆچبەر و مارژیناڵەکان ناودەبرێن، هەرچی ئەو تۆڕانەن کە بەشێوەیەکی مشەخۆرانە لەسەر پشتی بەها کۆمەڵایەتییەکان دەژین ناوی سیستەمی شارستانی پێوە لکێنراوە. لە هەر کام لایەنەوە تەماشا بکرێت شەڕ، تاڵان، کاولکاری، قڕکردن، پاوان و باج نیشانە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی شارستانین، هەر بۆیە شایستەی ئەوەیە وەك هۆڤێتی و بەربەرێتی راستەقینە هەڵسەنگێنرێت. وێرانکردنی بەردەوامی شار و گوندەکان، کوشتنی ملیۆنان مرۆڤ و پەلکێشکردنی زۆرینەی زۆری کۆمەڵگا بۆ ژێر سیستەمی چەوساندنەوە پێویستییەکی خۆڕسکی سروشتی کۆمەڵایەتی نییە، تەنیا دەتوانرێت وەك لادانێکی هەڵسەنگێنرێت.

مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی لە هەمانکاتدا مێژووی پەرەسەندن و گەورەبوونی ئەم لادانەیە. تەقینەوەی کارەساتە ئیکۆلۆژییەکان لەسەردەمی سەرمایەداریدا، کە گوایە شارستانی هەرە پێشکەوتووە، بەڵگەی سەلمێنەری راستینەی ئەم لادانەیە. سروشتی کۆمەڵایەتی لەقۆناخی ژیانی بەردەوامی نزیکەی سێ ملیۆن ساڵەی خۆی رێگای لەپێش ئەم چەشنە کارەساتانە

نەکردەوە. چونکە سیستەمەکانی ژینگە و کۆمەڵگا یەکتریان بەخێو دەکرد. ئەو قەیرانە ئیکۆلۆژییانەی لە مێژووی کورتی شارستانیدا تەقینەوە پەیوەندییان بە خەسڵەتی وێرانکارانەی ئامانجی قازانجەوە هەیە. نەک تەنیا قازانجی سەرمایەداری، بەڵکو کەڵەکەکردنە زێدەڕۆییەکانی سەرجەم قۆناخەکانی شارستانی دەست لەناو دەست لەمیانەی وێرانکاری هەرلوو سروشت بەڕێوە چووە. ئەهرامەکانیش کەڵەکەکردنێکە. بەڵام کەم و زۆر دەتوانرێت خەیاڵ بکرێت لەئاکامی چ جۆرە وێرانکارییەکی کۆمەڵایەتیدا ئەنجامدراوە. کەڵەکەبوونە لە ژمار نەهاتووەکانی هاوشێوەی ئەمە بەردەوام باری زیاتری خستۆتە سەر پشتی ژینگەو دەورووبەر. داڕووخانی کۆمەڵگا داڕووخانی ژینگەیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. بوونیادەکانی قازانجی پاوانخوازی سنووڕنەناسی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بارێکی ئەوتۆی خستە سەر کۆمەڵگا و هاوسەنگییەکەی لەگەڵ ژینگەدا کە لەدەرەوەی تواناکەیەتی و بەرگەی ناگرێت، ئەمەش وایکرد کە لەمدواییانەدا بکەوینە ناو سەردەمی قەیرانی ئیکۆلۆژییەوە. ڕۆڵی ستراتیژی ئیندوستریالیزم لەمەدا دیاریکەر بووە. پیشەسازی پشتبەستوو بە پاشماوەی سووتەمەنییەکان و مۆدێرنیزم فاکتەری سەرەکی ئەم ڕۆڵە دیاریکەرەن. هەروەها بەکارهێنانی پاشماوەکانی سووتەمەنی لە ئۆتۆمبێلدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێگای لەپێش کارەسات و ڕووداوەکانی هاتووچۆ دەکاتەوە، ئەویش کارەساتی یەک لەدوای یەک لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بەمجۆرە کارەساتەکانی ژینگە بۆ کارەساتە کۆمەڵایەتییەکان دەگۆڕێت، ئەویش دووبارە بۆ کارەساتە ژینگەییەکان وەردەچەرخێت و بەمجۆرە پەرچەکردارێکی زنجیرەیی ڕوودەدات. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ناشێت سەردەمی سەرمایەداری بە سەردەمی راسیۆنالیزم ناو ببرێت. چونکە چاوی کەڵەکەکردن کوێرە. لەمیانەی دەرەنجامەکانیەوە لەبەر چاوانە کە تەواوی کەڵەکەبوونەکان بە درێژایی مێژوو لەمیانەی ناقڵمەندێتی ژینگە ـ کۆمەڵگا جموجۆڵی نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە نابینایی جوڵاوەتەوە. لەوانەیە لەبواری ئەنالیتیک راسیۆنال بێت. بەڵام بەپێی پێویست ئاشکرا بووە کە سەبارەت بە ژیری سۆزداری کە تاکە ژیری ژینگەیە، ژیری ئەنالیتیک بە واتای ژیری کاولکاری و نابینایی دێت.

پاڵپشت بە ڕوونکردنەوەکانی پێشووترمان، دەتوانین بڵێین زیادبوونی زێدەڕۆییانەی ژمارەی دانیشتوان و گەورەبوونی شار کە لەگەڵ گۆڕانی شار و چینی ناوین و بوونیان بە ناوەندی دەسەڵات تاودانی بەخۆیەوە بینی، چیتر دیاردەیەک نین ژینگە بەرگەیان بگرێت و توانای هەڵگرتنیانی هەبێت. سروشتی کۆمەڵگاش بەرگەی ئەم دیاردانە ناگرێت. بەیەکەوە و بەشێوەیەکی تێکەڵ گەورەبوونی دەسەڵات و دەوڵەت لەگەڵ قۆناخی کەڵەکەکردنی سەرمایە، قورسایی و

قەبارەیەك نییە کە هیچ هاوسەنگییەکی کۆمەلگا و ژینگە توانای بەرگەگرتن و هەلگرتنیانی هەبێت. هەروەها بەناو یەکداچوون و هەمیشەییبوونی قەیرانەکانی کۆمەلگا و ژینگەش پەیوەندییان بە گەورەبوونی پاوانخوازی هەردوو گۆرەپانەوە هەیە. وەك سیستەمی دوو قەیران یەکتری بەخێو دەکەن. تەواوی چەسپاندنە زانستییەکان لەو بارەوە هاوفیکرن کە ئەگەر ئەم گەردەلوولە پەنجا سالی دیکە بەردەوام بێت داڕووخان بە ئاستی دەگات بەرگەی ناگیرێت، تێبینییەکان بەمجۆرەن. بەلام کارەکتەرە نابیناکەی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەلات کە رێگای لەپێش وێرانکاری کردۆتەوە ئەمە نابینێت و نابیسێت، وەك پێویستییەکی گەوهەرەکەی بەم شێوەیەیە.

رۆژ بەدوای رۆژ مێژووە نوێیەکەی زانستی ئیکۆلۆژی و بزووتنەوەکەی پەرە دەسەنێت. هەروەکو لە راستینەی ژندا بینرا، سەبارەت بە دیاردەی ژینگەش چەندە زانست پێشبکەوێت وشیاری پێشدەکەوێت، چەندە وشیاریش پێشبکەوێت بزووتنەوەکە پێشدەکەوێت. بەرفراوانترین گۆرەپانی بزاوتی کۆمەلگای مەدەنییە. چەندە دەچێت زیاتر ریال سۆسیالیست و ئەنارشیستەکان بەرەو خۆی رادەکێشێت. لە دۆخی بزووتنەوەیەکدایە کە هەرە زێدە رکابەرایەتی سیستەمی تێدا دەبینرێت. لەبەر ئەوەی تەواوی کۆمەلگا پەیوەندیدار دەکات، ئەوا بەشداریکردن ماهیەتێکی سەرووتری چین و نەتەوەکانی بەدەستهێناوە. لێرەشدا دەشێت شوێنپەنجەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبرالیزم لەسەر بزوتنەوەکەی ببینرێت. هەروەك بابەتە کۆمەلایەتیەکان، لیبرالیزم لەکێشەی ئیکۆلۆژیشدا لایەنە پەیوەندیدارەکەی گەوهەری بوونیادی سەرکوت دەکات، هەولدەدات تەکنۆلۆژیا، سووتەمەنی پاشماوەکان و کۆمەلگای بەکاربردن بەرپرسیار پیشانبدات. کەچی لە راستیدا تەواوی ئەم دیاردە لاوەکی و نەرێنیانە بەرهەمی سیستەمی (بێ سیستەمی) مۆدێرنیتەی خۆیەتی. لەم سۆنگەیەوە هەروەکو لە بزووتنەوەی فێمێنیستیدا بینیمان، بزووتنەوەی ئیکۆلۆژیش پێویستیەکی زۆری بە زەلالبوونی ئایدیۆلۆژی هەیە. پێویستە رێکخستن و چالاکییەکانی لە شەقامە تەسکەکانی شارەوە بۆ ناو سەرجەم کۆمەلگای بگوازنەوە، بەتایبەتیش بخزێننە ناو کۆمەلگای گوند ـ کشتوکالی ناوچە لادێییەکان. لەراستیدا ئیکۆلۆژی رابەری چالاکی کۆمەلگای کشتوکال ـ گوند، تەواوی کۆچبەران، بێکاران و ژنانە.

ئەم واقیعانەی بناخەکانی تازەگەری دیموکراتیش پێکدێنن بە هەموو رووتییەکەوە پیشانیدەدات کە لە خەباتی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەدا ئیکۆلۆژیا رۆلێکی چەندە گرنگ دەبینێت.

**ر ـ بزووتنەوە کلتوورییەکان: تۆڵەسەندنەوەی نەریت لە دەوڵەت ـ نەتەوە**

بەدرێژایی سەردەمەکانی مێژووی شارستانی هیچ کاتێك بزووتنەوە کلتوورییەکان کەم نەبوونەتەوە. بەشێوەیەکی بەرفراوان باسکردنیان لەسەردەمی پۆست مۆدێرنیتەدا پەیوەندی بە هەڵوەشاندنەوەی سنوورەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەیە. بە گوتەیەکی دیکە وەسفکردنی بزووتنەوە کلتوورییەکان وەك سەرهەڵدانی نەریت لەجێگای خۆیدا دەبێت. چونکە لە قۆناخی هۆمۆژەنکردنی نەتەوە و کۆمەڵگادا، لەمیانەی پشتبەستن بە دیاردەی گروپێك یان ئەتنیك، ئایین و مەزهەبێکی دەسەڵاتداردا، چەندین نەریت یاخود کلتوور لە رێگای قڕکردن یان تواندنەوە (ئاسیمیلاسیۆن) لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەوڵی لەناوبردنی دراوە. هەزاران زمان، شێوەزار، هۆز و خێڵ ـ قەوم شانبەشانی کلتوورەکانیان رووبەڕووی لەناوبردن بوونەتەوە. چەندین ئایین، مەزهەب و تەریقەت قەدەغە کراون. فۆلکلۆر و نەریتەکانیان توێنراوەتەوە. ئەوانەی ئەشتوێنانەوە نەکران، ناچاری کۆچکردن کراون. بێکاریگەر کران، یەکێتییەکەیان پارچە پارچە بوو. ئەو قۆناخەی بەواتای قوربانیکردنی تەواوی هەبوونە (پێکهاتە) مێژووییەکان و کلتوور و نەریتەکان دێت بۆ میللیگەرایی"یەك زمان، یەك ئاڵا، یەك نەتەوە، یەك وڵات، یەك دەوڵەت، یەك سروود، یەك کلتوور" کە بەسیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە وەك پەردەی پاوانی دەسەڵات و پاوانەکانی فینانس، پیشەسازی و بازرگانی مۆدێرنیتە بەکار دەهێنرێت و هیچ واتایەکی ئەوتۆی کۆمەڵگای مێژوویی نییە، نزیکەی دوو سەد ساڵ بە هەموو خێراییەکەیەوە بەردەوام بوو، ئەو سەردەمەی درێژخایەنترین و دژوارترین قۆناخی شەڕ بوو، گەورەترین وێرانکاریەکەی لەسەر نەریت و کلتوورە هەزاران ساڵییەکان پیشاندا. چاوچنۆکی قازانجی پاوانخوازی، کە لە بەرزترین ئاستدا خۆی رێکخستووە بەزەیی بە هیچ کلتوور و نەریتێکی پیرۆزدا نەهات.

دوای ئەوەی هەندێك بزووتنەوەی بێ سیستەم کە بە پۆست مۆدێرنیتە ناودەبرێن "قەڵغانی دەوڵەت ـ نەتەوە"ی مۆدێرنیتەیان کونکرد یاخود"قەفەسە ئاسنین"ەکەیان شکاند، ئەو کلتوور و نەریتانەی رووبەڕووی لەناوچوون بوونەوە و زیاتریش لە ئاستێکی بێکاریگەردا مەحکومی ژیان کرابوون، وەك ئەو گوڵانەی دوای باران بارین لەبیابان پشکووتوون سەرلەنوێ گوڵەکانیان دەگەشێنەوە و زیاد دەبن. هەڵوەشانەوەی ریال سۆسیالیزمیش کاریگەرییەکی گرنگی لەمەدا هەبووە. هەرچی بزووتنەوەی گەنجانی١٩٦٨بوو، بوو بە بڵێسەی ئەو ئاگرەی ئەم پەرەسەندنەی هەڵگیرساند. هەروەها تەواوی بزووتنەوەکانی رزگاریی نیشتیمانی ئەو مەیل و قۆناخانەی نەبوون بە دەوڵەت ـ نەتەوە و بەرامبەر داگیرکاری سەرمایەداری بەرخودانیان دەکرد کاریگەرییان لەمەدا

هەبووە. هەڵبەتە لەبنەڕەتدا خودی نەریت و کلتوور واتای بەرخودانە. یان لەناو دەبرێن، یان دەژین، چونکە ڕادەستبوون پەسەند ناکەن، خەسڵەتێکی بەمجۆرەیان هەیە. کاتێك دەرفەت ببینن، وەك پێویستییەکی گەوهەرەکەیان بەرخودانێکی چڕ و بەرفرلوانتر پیشاندەدەن. ئەمە ئەو ڕاستینەیە کە فاشیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە حیسابی بۆ نەکردووە. سەرکوت کردن، تەنانەت تواندنەوەشیان بە واتای لەناوچوونیان نایەت. بەرخودانی کلتوورەکان نموونەی ئەو گوڵانە بەبیری مرۆڤدا دێنێتەوە کە بەرد کون دەکەن و بەردەوامی هەبوونی خۆیان دەسەلمێنن. شکاندنی چیمەنتۆی ئەو مۆدێرنیتەی بە بەریاندا کراوە و سەرلەنوێ دەرکەوتنیان ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. دەتوانین ئەم بزووتنەوانە بۆ چەندین گروپ جیا بکەینەوە، ئەگەر بە کورتی ڕیزبەندیان بکەین بەمجۆرەیە:

**١ ـ ئەتنیك و بزووتنەوەکانی نەتەوەی دیموکراتی**

وردە میللیگەرایی دیاردەکانی ئەتنیك لەسەرووی ئەو بزووتنەوە کلتوورییانە دێت کە دەوڵەت ـ نەتەوە سەرکوتی کردووە بەڵام نەیتوانیوە بیتوێنێتەوە. لە میللیگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە جیاوازترە. چونکە ناوەڕۆکە دیموکراتییەکەی لەپێشترە. لەلێگەڕین بەدوای دەوڵەتێکی نوێ زیاتر لە دەورووبەری کلتووری خۆیان گەیشتن بە قەوارەیەکی سیاسی دیموکراتیك گرنگترین ئامانجیانە. لەئۆتۆنۆمی هەرێمی یاخود خۆجێیی جیاوازترە. گوزارشت لەیەکێتی و هاوکاری نێوان هاوبەشانی هەمان هەبوون (پێکهاتە) ی کلتووری دەکات کە گرێدراوی سنوورەکانی شوێن (جوگرافیا) نییە. بەرگریکردن و پاراستنی هەبوونی خۆیان بەرامبەر ئەتنیکی دەسەڵاتدار یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانیانە.

هەنگاوێکی دیکەی ئەتنیکە جیاواز و ستەم لێکراوەکان، بەگوتەیەکی دیکە" هەنگاوێکی دیکەی ئەو گەلانەی لەژێر فشاردان ناوبردنیان بەبزووتنەوەی نەتەوەی دیموکراتیك، لەبواری سۆسیۆلۆژییەوە چەندەی بڵێی ڕاست و واتادارە. چونکە لەسەرڕێمانەوە و درێژەدان بە هەبوون لەدۆخی تاکە ئەتنیکی سەرکوتکراودا چەندەی بڵێی زەحمەتە. بەهۆی چەند فاکتەرێکەوە پێویستە بزلوتی ئەو کلتوورە هاوشێوانەی هاوبەشێتی لەهەمان زمان و شێوەزار و سنوورە جوگرافی و سیاسییەکان دەکەن وەك بزووتنەوەی نەتەوەی دیموکرات وەسف بکرێن. یەکەمیان" لەئامانجی دەوڵەتێکی جیاواز زیاتر، لێگەڕینیان لەپێناو بەڕێوەبەرایەتی و قەوارەیەکی سیاسی دیموکراتیکدایە. قەوارەیەکی سیاسی دیموکراتی ژێر چەتری هەمان دەوڵەت شێوەیەکی پێکهاتەی

سیاسییە کە هەرە زێدە لەمێژوودا ئاشنای بووین. تا رادەیەك مێژوو پڕ لەپێکهاتەی سیاسی هەبوونی کلتووره جیاوازەکانە. لەسنوورەکانی هەر دەوڵەت یاخود ئیمپراتۆریەتێك هێندە دەخوازیت ژیان لە نۆخی قەواری سیاسییدا شێوەیەکی ئاسایی حوکمڕانییە. ئەوەی نا ئاساییە بە نەبوو دانانی ئەم پێکهاتە سیاسییانە یاخود سەرکوتکردنیانە. هەرچی ئاسیمیلاسیۆنە شێوازێکی هێندە پەیڕەوکرلو نەبوو. ئیمپراتۆریەتەکانی رۆما، بێزەنتی، عوسمانی، پارس ـ ساسانی و عەرەب ـ عەباسی سەدان یەکینەی سیاسی ـ ئیدارییان بە بیانووی هەبوونی خۆیان دانابوو. بە مەرجێك تەنیا دان بە مەشروعیەتی ئیمپراتۆر یان سولتاندا بنێن. پاراستنی زمان، ئایین، فۆلکلۆر و بەڕێوەبەرایەتی خۆییان و ژیانداریکردنیان ئامانجی سەرەکی بوو. بەڵام جانەوەری دەوڵەت ـ نەتەوە (لێڤی ئەتهان) ئەم سیستەمەی لەناو برد. لەسەر ئەم بنەمایەش بەرەو فاشیزم چوو. ئەنجامیش چەندین جینۆسایدی جەستەیی و کلتووری بوو.

تەنیا شرۆڤەکردنی ماف بە نەتەوەبوونی گەلان و ئەتنیکە سەرکوتکرلوەکان وەك دەوڵەت ـ نەتەوە، کارەسات و چەواشەکارییەکی گەورەی لیبڕالیزم و ریال سۆسیالیزم بوو. ئەم رەوشەش دەرەنجامی میللیگەرایی فاشیستانە و تۆتالیتاریزم بوو. ناولکردنی نەتەوەبوونی ئاسایی لەسەر بنەماکانی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی کلتوورەکان بەبێ ئەوەی مەحکومی سنوورەکان بکرێت راسترین رێگایە و بە گوێرەی سروشتی کۆمەڵایەتی و مرۆییە. راستییەکانی مێژووش زیاتر ئەم رێگایەیان دەگرتە بەر. بەڵام چاوچنۆکی کەڵەکەکردنی خێرای سەرمایە لەلایەن سەرمایەی پاوانخواز کە بەدوای زۆرترین قازانجەوەیە گرنگترین فاکتەری داخستنی ئەم رێگایەبوو. دەوڵەت ـ نەتەوە کە رێگایەکی نائاسایی بوو، بوو بەرێگای ئاسایی بەنەتەوەبوون، هەرچی رێگای نەتەوەبوونی دیموکراتیکە کە رێگای ئاساییە، وەك رێگایەك بینرا کە نائاساییە و تەنانەت بە نەبوو دانرلوە. ئەمە چەواشەکارییە گەورەکە بوو.

کاتێك بێچارەییە هەمەلایەنەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاشکرابوو (شەڕە جیهانی و هەرێمییەکان، ململانێی نەتەوەیی، بەرکەوتنی سەرمایە بەدیوارە نەتەوەییەکان) نەتەوەبوونی دیموکراتی کە رێگای ئاساییە بەشێوەیەکی بەربڵاو هاتە ئارلوە. ئەوەی تەواوی ئەورووپا دوای دووەمین جەنگی جیهانی بەخۆیەوەبینی، لەراستیدا وەرچەرخان بوو لە دەوڵەت ـ نەتەوەوە بۆ نەتەوەبوونی دیموکراتیك. خۆی لە خۆیدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوام وەك نەتەوەی نەتەوە دیموکراتەکان لەسەرپێ مایەوە. سەرباری چەندین چەواشەکارییەکانی پاوانخوازی لەبارەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە، بەڵام لە یەکێتی سۆڤێتدا دەوڵەت ـ نەتەوە و نەتەوەگەرایی دیموکراتیك لەناو

بەکتردا دەژیان. لە هیندستان یش مەیلەکانی نەتەوەیی دیموکراتیك بەهێزە. لەئەفریقیا و ئەمریکای باشوور هەموو کاتێك مەیلەکانی نەتەوەیی دیموکراتیك لەپێشترە. ژمارەی دەوڵەت ـ نەتەوە رەهاکان زۆرکەمە، لە هەندێك شوێن ماوە کە رۆژهەلاتی ناوین لە سەرووپانەوە دێت. ئەمانەش بەخێرایی لە قۆناخی هەڵوەشانەوەدان.

دووەمیان" کاتێك نەتەوەبوونی دەوڵەتگەرا و دەسەلاتگەرێتی بە بنەما ناگرێت، یان بەپاڵشتی هەندێك دامەزراو و دەزگاکانی پاشماوەی چاخی ناوین (ئاغایەتی، شێخایەتی، تەریقەت و سەرۆکایەتی خێڵ) زیاتریش لەمیانەی پشتبەستن بە بەرژەوەندییەکانی خێزان (بنەماڵە) بەڕێوەبەرایەتییە بەکرێگیراوەکان بەبنەما دەگیرێن و لەرێگای مۆدێرنیزمەبوونەوە بەردەوام دەبێت، یان بەڕێوەبەرایەتییە دیموکراتیەکان پێشدەخرێن. یەکەمین رێگا، نوخی مۆدێرنی بەکرێگیراوە کلاسیکەکانە کە مێژوو زۆر ئاشنایەتی. هەرچی رێگای دووەمە، ئەو رێگایەیە کە ئامانجی سەرەکی تازەگەری دیموکراتییە. بەڕێوەبەرایەتی بەرخودان بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە و بەکرێگیراوەکانی تەنیا دەشێت دیموکراتیك بێت. ئەمەش تەندروستانەترین رێگای ئازادی و یەکسانیخوازییە کە بەرەو نەتەوەبوونی دیموکراتیك دەچێت.

سێیەمیان" کارەکتەری فرەڕەنگی کلتوور، شێوەزار و زمانەکان نەتەوەییبوونی دیموکراتی دەکرد بە ناچارییەك. وەك دەوڵەت ـ نەتەوە بە بنەماگرتنی زمان، شێوەزار و کلتووری ئەتنیکی دەسەلاتدار پێچەوانەی گەوهەرەکەی بوو. تاکە بژار نەتەوەیەکی فرە زمان ـ کلتوور ـ پێکهاتەی سیاسی بوو. ئاشکرایە کە ئەمەش بەواتای نەتەوەبوونی دیموکراتیك دێت. تەنانەت ئەو رێگایەش کراوە بوو کە چەند نەتەوەیەکی دیموکراتیك ببن بە نەتەوەیەکی دیموکرات. ئەوەی لە ئیسپانیا، هیندستان، کۆماری ئەفریقیای باشوور کە هەندێك کەس بە دڵیان نییە، تەنانەت لە ئەندەنوسیا و چەندین وڵاتی ئەفریقیا لە ئارادایە پەرەسەندنێکی لەمجۆرەیە. تەنانەت دەشێت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپاش وەك جۆرێك لە جۆرەکانی نەتەوەی دیموکراتیك پێناسە بکرێت. فیدراسیۆنی روسیاش نموونەیەکی دیکەی گرنگ و هاوشێوەیە.

چوارەمیان" بەهۆی ئەو داخوازییەی بۆ پاراستنی جیاوازییە ئابووری، کۆمەلایەتی، سیاسی، هزری، زمان، ئایینی و کلتوورییەکان جێگای باسە، ئەوا یەکسەر تێدەگەن کە رێگای ئەمە بە نەتەوەی دیموکراتیکدا تێپەڕ دەبێت. ئەگەر هەر جیاوازییەك بۆ جوداخوازی بگۆڕێت، ئەمە بە زیانی هەمووان تەواو دەبێت. چونکە گونجاوترین شێوەی نوخی نموونەیی "یەکێتی لەناو جیاوازییەکان" بۆ هەمووان نەتەوەی دیموکراتە. تەنانەت ئەم پۆتانسێلەی چارەسەری بەتەنیا

بەسە بۆ ئەوەی هێزە سەرسورهێنەرەکەی بزووتنەوەی نەتەوەی دیموکراتی بۆ چارەسەری و بوونیادە ئەلتەرناتیفەکەی بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە روونبکاتەوە.

ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لەناو بێچارەییدا دەژیت کاتێك لەسەرەوە لەلایەن بزووتنەوەکانی سەرمایەی جیهانگیری، لە خوارەوەش لەلایەن بزووتنەوە ئۆتۆنۆمەکانی شار، خۆجێیی و هەرێمی و بزووتنەوە ئایینی و نەتەوە ـ دیموکراتەکان تەنگەتاو دەکرێت ئەو کاتۆسی لە ئارادایە بۆ ئافراندنی سیستەمی نوێ پاڵێورلو و بەرنەندامە. چەندین نیشانە و بەڵگەی ئەمە دەرکەوتوونەتە مەیدان.

لەکاتێکدا لیبرالیزم هەوڵدەدات دەوڵەت ـ نەتەوەی کلاسیك تێپەڕ بکات و سەرلەنوێ بوونیادی بنێتەوە، لەلایەکەی دیکەوە گرنگی و بایەخێکی تایبەت بەوە دەدات کە ئەم کردەوەیەی خۆی لە ژێر دەمامکی دیموکراسی ئەنجامبدات. هەرچی دەوڵەت ـ نەتەوە توندڕەوەکانن، لەناو موحافەزەکاری و کۆنەپەرستیەکدا پەلەقاژەیانە کە موحافەزەکاری کۆنی تێپەڕ کردووە. بەجۆرێك لە جۆرەکان ئەم هێزانە هەڵوێست و دۆخی موحافەزەکارە راستەقینەکانی رۆژی ئەمڕۆمانیان وەرگرتووە. هەرچی ئایینگەراکانن، بەنوای لێگەڕینی ئوممەتی کلاسیکیدان. ئەگەری بەهێز ئەوەیە، لە ژێر پەردەی ئاییندا مۆدێرنیزم پراکتیزە بکەن و دەوڵەت ـ نەتەوەیەك لەسەر بنەمای ئایین ئاوا بکەن. لەم بارەیەوە ئێران نموونەیەکی ئەزموونبەخشە.

بژاری نەتەوەبوونی دیموکراتیك لەمیانەی ئەو پۆتانسێلە بەرزەی چارەسەری کە سەبارەت بە کێشە بوونیادی و ئایدیۆلۆژییە ئاڵۆزەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان پێشکەشی کردووە ئاییندەی هەیە. بەتایبەتیش ئەو رێگایەی یەکێتی ئەورووپا گرتوویەتیە بەر زۆر بەکاریگەرە. زۆر گرنگە کە تازەگەری دیموکراتی هەم لەبواری ئایدیۆلۆژی هەمیش بوونیادی بژاری نەتەوەی دیموکراتیك وەك یەکێك لە رەهەندە سەرەکییەکانی خۆی تاوتوێ بکات. ئەم هەڵوێستەش هەم کۆمەك بەشارستانی دەکات هەم شانسی رزگاری دەرەخسێنێت. تێکۆشانی سەرلەنوێ بوونیادنانەوە کە تازەگەری دیموکراتی لەرێگای نەتەوەی دیموکراتییەوە ئەنجامی دەدات، سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و ژینگەییە بنەڕەتییەکان پرۆژەیەکی هیوابەخشە.

### ٢ ـ زیندووبوونەوەی نەریتی ئایینی: بزووتنەوەکانی کلتووری ئایینی

وەك تێبینی دەکرێت ئەو ئەتنیك و نەریتە ئایینیانەی مۆدێرنیتە بەتایبەتیش دەوڵەت ـ نەتەوە لەمیانەی زارلوەی عەلمانییەتەوە هەوڵی کۆلۆنیکردنیان دلوە زیندووبوونەوەیەك

بەخۆیانەوە دەبینن، وەك بڵێی دووبارە ژیاوەتەوە. بێگومان ئەمە زیندووبوونەوەیەك نییە لەمیانەی هەمان ڕۆڵی کۆمەڵایەتی جارانی. چونکە لە ژێر مۆرکی مۆدێرنیتەی فەرمیدا ئەمە گەڕانەوەیە بۆ دواوە، ئینجا ئەمە بە فاکتەرە رادیکاڵەکانی یان باڵە میانڕەوەکانی بێت. واتە لەمیانەی پەسەندکردنی چەندین تایبەتمەندێتی مۆدێرنیتەدا ئەم گەڕانەوەیە ئەنجام دەدات. لەراستیدا بابەتەکە کەمێك ئاڵۆزترە. هەرچەند عەلمانییەت بەمجۆرە پێناسە بکرێت کە دەست کێشانەوەی ئایینە لە ژیانی دونیایی بەتایبەتیش دەست کشاندنەوەیە لە کاروبارەکانی دەوڵەت، بەڵام زاراوەیەکی ئاڵۆز و نادیارە. وەك بانگەشە دەکرێت نەعەلمانییەت تەولو دونیاییە، نە دەوڵەتیش تەولو لە ئایین دادەبڕێنرێت و دەرهەست (ئەبستراکت) دەکرێت. لەوەش گرنگتر هیچ کاتێك ئایینەکان ژیانی ئاخیرەت رێکناخەن. بەڵکو ئەوەی لە بنەڕەتدا رێکی دەخەن رۆڵ و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانن، بەتایبەتیش ئەرکی دەوڵەتی و دەسەڵاتگەرایی دونیاییە.

عەلمانییەت مەزهەبێکە (ماسۆنیەت) کە وەستا یەهوودییەکانی بیناسازی لەچاخی ناوین لەپێناو شکاندنی هەژموونگەرایی دونیای کاسۆلیکی ئاوایانکردووە. هەرچەندە وەها دیار بێت کە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ زانستە پۆزێتیڤەکان پێشکەوتووە، بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نییە کە زادەی فاکتەری رەبانی ئایدیۆلۆژیای یەهودییە. تا بەباشی دەرك بەم خاڵە نەکرێت، ئەوا عەلمانییەت و ئەو کێشانەی لەگەڵ خۆیدا هێناون دەرکیان پێناکرێت. بەلانی کەم هێندەی نەریتە ئایینییەکانی دیکە فاکتەری رەبانی (ئیلاهی: بەزمانی یەهوودی بەواتای "سەردار" دێت) لە خۆوە دەگرێت. بەڵام ناچارە ئەم راستییەی خۆی بە شێوەیەکی زۆر نهێنی و لەژێر چەندین پەردەوە ئاوابکات. فشارە بێ ئامانەکانی کاسۆلیکەکانی چاخی ناوین بەکارهێنانی ئەمجۆرە پەیڕەوانەیانی لێکردوّتە ناچارییەك. عەلمانیەکان کە لەرێگای شۆڕشی بۆرژوازی هۆڵەندا و ئینگلیز هەڵمەتیان کرد، بە بەراورد لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسا دەسکەوتی زۆر گەورەتریان فەراهەم کرد. لەگەڵ ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەوە خۆیان وەك توێژێك رێکخست کە زەحمەتە ناوکی دەوڵەت پێی بگات، پێناسە بکرێت و دەسەڵاتی لەدەست دەربهێنرێت. لەو قۆناخەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان درێژە بەم حوکمڕانێتییەی خۆیان دەدەن. دیاردەی دەوڵەتی قووڵ (یان دەوڵەتی شاراوە) لەلایەکەوە گوزارشت لەم راستییە دەکات. هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك کە ئەمڕۆ لە جیهاندا ژمارەیان دوو سەدی تێپەڕکردووە بەو رادەیەی عەلمانییە ماسۆنییە. ماسۆنیەکان هێزی سەرەکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین. کاریگەرییەکەیان جیهانگیرییە. تا ئێستاش ئەم پێگەیەی خۆیان پتەو دەکەن و بەردەوامی پێدەدەن. ئەو ناوەندانەی دیکەی تێیدا

بەکاریگەرن چەندین ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنییە کە لە ئاراستەکردنی ستراتیژی جیهان خاوەن ڕۆڵی گرنگن، پاوانەکانی میدیا و مامۆستاکانی زانکۆش لەسەرووی ئەمانەوە دێن. ڕۆڵی ئاقڵمەندان و چاودێرانی مۆدێرنیتە دەبینن کە بەدونیای عەلمانی ناوی دەبەن. ئەو کار و ئەرکەی بە دونیای سیکولار ناوی دەبەن لەم چوارچێوەیەدایە.

کاتێك لە ڕێگای کاریگەرییەکانی مۆدێرنیتەوە نەریتە ئایینییە وشکەکان لە سەرووی هەموویشیانەوە کاسۆلیکی و ئیسلامی سوننی تێپەڕ بکرێت، ئەوا عەلمانییەت وەك ئایدیۆلۆژیا و بەرنامەی سیاسی گرنگی خۆی لەدەست دەدات. سەرلەنوێ زیندووبوونەوەی ئایینی نەریتی، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانەی تائێستا کاریگەرییە بەهێزەکانی نەریتی ئیسلامی جێگای باسە گفتوگۆی عەلمانییەت - ئاین گری گرتووە. ئەو پەرەسەندنانەی گرێدراوی شەڕی دەسەڵاتی سیاسی و ئایدیۆلۆژی نێوان دەوڵەت - نەتەوە و چەمکی ئوممەتگەراییە، ڕاست نییە تەنیا وەك مەسەلەیەکی پەیوەندیدار بە شێوازی ژیانی مۆدێرنەوە پیشان بدرێت. ئیتر تێکۆشانێکی هاوشێوەی جارانی نێوان کرستیانی و موسەوێتی لەنێوان جیهانی ئیسلام و موسەوێتی لە ئارادایە. ئەم ڕاستینەیە لەژێر پێکدادانە مەزنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا شاراوەیە. خوازیارن ڕێککەوتنێکی هاوچەشنی ئەورووپا و ئەمریکا لەنێوان موسەوی - ئیسلام ئەنجام بدرێت. لەکاتێکدا فاکتەرە رادیکاڵەکان لایەنی پێکدادان و دژە ڕێککەوتن پێکدێنن، فاکتەرە میانڕەوەکان زیاتر نزیکی ڕێککەوتن دەبینرێن.

لەگەڵ ئەمەشدا دیسان هەڵنەسەنگاندنی تەواوی زیندووبوونەوەی کلتووری نەریتی ئایینی وەك کۆنەپەرستی، بایەخدارە. بەو ڕادەیەی بەرامبەر مۆدێرنیتە و دەوڵەت - نەتەوە ڕابن ناوەڕۆکی دیموکراتی لە خۆوە دەگرن. هەروەها نابێت ئەو خاڵەش پشتگوێ بخرێت کە نوێنەرایەتی ڕەگ و دەماری ئەخلاقی بەهێز دەکەن. لەنزیکەوە گرنگیدان بەگۆڕانکاریەکانی نەریتی ئایینی سەبارەت بەتازەگەری دیموکراتییەوە بایەخدارە چونکە یەکێك لەو کلتوورانەیە کە مۆدێرنیتە یارییەکی زۆری لەسەر کردووە و کردوویەتی بەکۆلۆنی. زیندووبوونەوەیەکی هاوشێوە لەهەر کلتوور و نەریتێکی ئایینی سەرکوتکراودا دەبینرێت. بابەتەکە جیهانگیرییە. لەم سۆنگەیەوە تەنیا کێشمەکێشێکی ئیسلام - یەهوودی نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو بوویەر و ڕووداوانەشەوە هەیە کە لە ئاستی جیهانگیریدا ڕوودەدەن.

هەروەکو چۆن دەشێت کلتووری ئەتنیکە جیاوازەکان لەچوارچێوەی نەتەوەی دیموکراتی بەیەکەوە تاوتوێ بکرێت، هەروەها لەناو نەتەوەی دیموکراتیکدا هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکی

دیموکراتیانەی کلتووری ئایینی وەك فاکتەرێکی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی و جێکردنەوەی لە چارەسەریدا چەندەی بڵێی گرنگە. چەمکی رێککەوتن و تەبایی کە تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر بزووتنەوە رکابەرەکانی سیستەم پێشیخستووە، پیشاندانی بەرامبەر ئەو کلتوورە ئاینییەی ناوەڕۆکی دیموکراتی هەیە، دەکەوێتە چوارچێوەی ئەرکێکی دیکەی گرنگ کە سەبارەت بە کار و خەباتەکانی سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوە بایەخێکی ژیانی هەیە.

٢ ـ بزووتنەوە نیمچە سەربەخۆکانی شار، خۆجێیی و هەرێمی

خود بەڕێوەبەرایەتیەکانی چوارچێوەی شار، خۆجێیی و هەرێمی کە هەموو کاتێك لەمێژوودا قورساییەکی مەزنیان هەیە، لەناو ئەو نەریتە کلتوورییە گرنگانەی دیکەدا جێی خۆی دەگرێت کە دەوڵەت ـ نەتەوە کردوونی بەقوربانی. لە تەوژمی بەڕێوەبەرایەتییە پراکتیزە کراوەکانی دەوڵەتی و کۆمەڵگادا بەردەوام شار، ناوچە خۆجێیی و هەرێمەکان خود بەڕێوەبەرایەتی (ئۆتۆنۆمی) تایبەت بەخۆیان هەبووە. چونکە بەجۆرێکی دیکە بەڕێوەبردنی دەوڵەت و ئیمپراتۆریەتە بەرفراوانەکان مەحاڵ بووە. هەرچی ناوەندگەرێتی رەهایە وەك کارەکتەری پاوانخوازی مۆدێرنیتە لە بنەڕەتدا نەخۆشییەکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. وەك داواکاری و پێویستییەکی یاسای زۆرترین قازانج سەپێنراوە. لەپێناو دەسەڵاتدارێتی بیرۆکراتە بۆرژوازییەکانی چینی ناوین رێکخراوە کە وەك تەنێکی نەخۆشی گەورە دەبێت. وەك مۆدێلێك پێشخراوە کە تەنیا لەمیانەی فاشیزمەوە بەڕێوە دەچێت، لەجیاتی یەك پاشا، لەپێناو دامەزراندنی سیستەمێکی هەزار پاشاییە.

کاتێك هەڵوەشانەوەی مۆدێرنیتەی کلاسیك خێرابوو و بزووتنەوە کلتوورییەکانی لەچەشنی پۆست مۆدێرنیتە پێشکەوتن کە زۆربەیان خاوەن ماهییەتێکی لیبراڵبوون و هەندێکیشیان بەواتای دابڕانی رادیکاڵ دەهاتن، بزووتنەوە ئۆتۆنۆمییەکانی شار، خۆجێیی و هەرێمەکان بەشی شێریان لەخۆوە گرتووە. لە راستیدا سەرلەنوێ زیندووبوونەوە و گەڕانەوە بۆ کلتوورەکانیان جێگای باسە کە رەهەندی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی لەخۆوە دەگرن و بەدرێژایی چاخ و سەردەمەکان بەشێوەیەکی بەهێز ژیاندوویانە. لەسەرووی ئەو بزووتنەوانەوە دێن کە واتایەکی گرنگی کۆمەڵگای مێژوویان هەیە یان پێویستە واتایەکی بەمجۆرەیان هەبێت. تاوەکو شار، خۆجێیی و هەرێمەکان رزگار نەبن، رزگاربوون لەنەخۆشی دەوڵەت ـ نەتەوە مەحاڵە. ئەو هێزانەی بە باشترین شێوە لەمە تێگەیشتوون و لە بواری کرداریدا پەیڕەوی دەکەن ئەندامانی یەکێتی ئەورووپان. بەربەرێتی چوار سەد ساڵەی لەژێرناوی مۆدێرنیتە تێیدا ژیاون و هەروەها جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهان پەند

و ئەزموونی پێویستی پێشکەش بەکلتووری ئەورووپا کردووە. رێکەوت نییە کە یەکەمین هەنگاوەکانی لەبواری کرداریدا جێبەجێیان کرد یاساکانی ئۆتۆنۆمی خۆجێیەتی، شار و هەرێمەکان بوو. ئەمەش پەیوەندی بە تێگەیشتنی ئەو راستییەوە هەیە کە دەوڵەت ـ نەتەوە بە واتای هەر جۆرێکی جینۆسایدکردنی هەبوون و پێکهاتە کلتوورییەکان دێت.

بەرچاوترین کار و خەباتەکانی یەکێتی ئەورووپا لەرۆژی ئەمڕۆماندا لەچوارچێوەی کلتوورەکانی هەرێمایەتی، خۆجێیەتی و شار ئەنجام دەدرێت، ئەمەش لە سەرووی فاکتەرەکانی چارەسەرکردنی سەرجەم کێشە جیهانگیرییەکانەوە دێت. ئەگەر هێندە رادیکاڵیش نەبێت، بەڵام بزووتنەوەیەکی کلتووری گرنگ و پێویستە. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی چوونیەکی(هۆمۆژەنی) بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی لە تەواوی کیشوەرەکانی جیهان نەسەپێنرا و پەرەی پێنەدرا، زیندوێتی ئۆتۆنۆمی چەندین شار، خۆجێیی و هەرێمی پارێزراوە. لەفیدراسیۆنی روسیاوە تا چین و هیندستان، لەتەواوی کیشوەری ئەمریکا (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا فیدراڵە، لە کەنەدا ئۆتۆنۆمی بەربڵاوە، ئەمریکای لاتینیش خاوەن پێگەی ئۆتۆنۆمی هەرێمییە) تا دەگاتە ئەفریقیا (لە ئەفریقیاش ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی نەریتی خێڵ و ناوچە نەبێت، دەوڵەت ئاوا نابێت و بەڕێوە نابرێت) پێگەی تایبەت و خەباتی ئۆتۆنۆمی چالاکترین و رۆژانەییترین بابەتن. ناوەندیگەرایی رەها کە نەخۆشیەکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە تەنیا لە هەندێ دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین و دیکتاتۆرییەکانی دیکەدا پەیڕەو دەکرێت کە ژمارەیان کەمە.

ئەو هەڵوەشانەوەیەی گرنگترین رەهەندی مۆدێرنیتەی کلاسیک، واتە بوونیادەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی رەها لە ئاکامی ئەو تەنگەتاوبوونەی لەسەرەوە لەلایەن سەرمایەداری جیهانگیری، لەخوارەوەش لەلایەن بزووتنەوە کلتوورییەکان دووچاری هات، هەرە زێدە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئۆتۆنۆمی شار، خۆجێیی و هەرێمی هەوڵی ئاواکردنەوەی دەدرێت. ئەو مەیلەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا چەندەی دەچێت بەهێز دەبێت، ناچارە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەی ـ دیموکراتیک پێشبکەوێت. نەتەوەی دیموکراتیک وەك شێوەی بەڕێوەبەرایەتی زۆر نزیکی کۆنفیدراڵیزمە. کۆنفیدراڵیزم بەجۆرێك لە جۆرەکان شێوەی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی نەتەوە دیموکراتییەکانە. تەنیا لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێیی و هەرێمییە ئۆتۆنۆمەکان شاری بەهێز دێتە ئاراوە. لەبەر ئەوەی هەردوو بزووتنەوەکە شێوەی بەڕێوەبەرایەتین یەکسانن و ناچارن بە یەکتری بگەن. چونکە ئەگەر ئۆتۆنۆمییەکانی شار، خۆجێیی و هەرێمی نەبێت، نەتەوەبوون و نەتەوە دیموکراتەکان هێزی بەڕێوەبەرایەتی بەدەست

ناهێنن. یان دووچاری کائۆس دێن و پەرتەوازە دەبن یان لەڕێگای مۆدێلێکی نوێی دەوڵەت ـ نەتەوەوە بەلاوە دەنرێت. بۆ ئەوەی دووچاری هەردوو رەوشیش نەبێت بزووتنەوەی نەتەوەی دیموکراتیك مسۆگەر ناچارە ئۆتۆنۆمی دیموکراتی شار، خۆجێیی و هەرێمی پێشبخات. بەرامبەر بەمەش بۆ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی ئۆتۆنۆمی شار، خۆجێیی و هەرێمی بە تەواوی قووت نەدرێت و بتوانن بەتەواوی هێزی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆیان بەکاربێنن، لە ژێر ناوی نەتەوەی دیموکراتی پێویستییان بە یەکبوون لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانی دیموکراتی هەیە. تەنیا لەمیانەی رێککەوتنێکی پتەوەوە دەتوانن ئەو پاوانانەی هێزی ناوەندگەرایی زێدەڕۆ تێپەڕێنن کە دەوڵەت ـ نەتەوە بەردەوام بەرامبەر بەهەردوو بزووتنەوەکە دەیسەپێنێت. لەدۆخێکی پێچەوانەدا، هەر وەکو زۆر جار لە رابردووش دووچاری هاتوون هەر دوو بزووتنەوە تەنانەت وەك دیاردە سەرلەنوێ لەژێر هەڕەشەی هۆمۆژەنی و لەناوچوون و توانەوە رزگاریان نابێت. هەر وەك چۆن هەلومەرجە مێژووییەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەبەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە دابوو، هەلومەرجەکانی رۆژی ئەمڕۆشمان ـ واقیع و راستینەکانی سەدەی بیست و یەکەم ـ لایەنگری نەتەوە دیموکراتەکان و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێیی، شار و هەرێمییە ئۆتۆنۆمەکانە کە لە هەموو ئاستێکدا بەهێز بووە.

هەروەکو زۆرجار لیبڕالیزم لەمێژووی خۆیدا ئەنجامیداوە، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ئەم مەیلە ئەرێنیانەی دیموکراتیزەکردن لە ژێر هەژموونگەرایی ماددی و ئایدیۆلۆژی خۆی خراپ نەکات و نەیتوێنێتەوە، ئاشکرایە کە پێویستە هەستیارییەکی زۆر هەبێت. هێندەی سەرجەم رکابەرانی سیستەم، ئەرکێکی ستراتیژی و گرنگی تازەگەری دیموکراتییە کە لێنشاوی پێکهاتەی سیاسی شار، خۆجێیی و هەرێمی کۆمەڵگای مێژوویی لەمیانەی بوونیادێکی نوێی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بکاتە یەك. لەسەر ئەم بنەمایە ناچارە لەڕێگای خەباتێکی تیۆری بەرفراوانەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ بوونیادەکانی بەرنامە، رێکخستن و چالاکی پەرەپێبدات. بۆ ئەوەی هەمان چارەنووسی بونیادە کۆنفیدرالەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە سەدەی بیست و یەکەم دووبارە نەبێتەوە کە ئەو کاتە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە لەناوبران، بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی بۆ سەرکەوتنی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیك وەرچەرخێنرێت تا بڵێی هەلومەرجەکان لەبارە. بۆ ئەوەی لەو تەنگەژە قووڵ و هەمیشەییەی قۆناخی سەرمایەی فینانسی مۆدێرنیتە کە تەنیا لە رێگای بەڕێوەبەرایەتی قەیران لەسەر پێیان ماوەتەوە تازەگەری دیموکراتی بەسەرکەوتن بگەیەنین، ئەوا لە کاروخەباتی

سەرلەنوێ ئاوالکردنەوەدا بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەنجامدانی ئەرکە رۆشنبیری، سیاسی و ئەخلاقییەکان گرنگییەکی ژیانی هەیە.

## ئەرکەکانی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی تازەگەری دیموکراتی

ئەو بابەتەی هەوڵی شرۆڤەکردنیم دا نە زیندووکردنەوەی یادەوەرییەکانی "چاخی زێڕینی" رابردووە، نە خەیاڵی "یۆتۆپیایەکی" نوێی داهاتووە. پیشاندانی هێزی گەڵاڵەکردن سەبارەت بە هەردوو بابەتەکە واتادار نابینم. هەرچەندە زهنیەتە کۆمەڵایەتییەکان بەم چەشنە قاڵبوونەوانەش بارکرابێت، بەڵام ئەم روونکردنەوە و باسانە بەهایەکی ئەوتۆیان نییە بتوانن کۆمەك پێشکەش بەراستینەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بکەن کە لە راستیدا هەوڵی شرۆڤەکردنیانم دەدا. ئەگەر بەتەواوی نکوڵی لە کۆمەکەکانیشیان نەکەین پێویستە ئاگادار بین کەرێگایان لە پێش مەترسی کردنەوە و بەمجۆرە هەڵوەستەیان لەبارەوە بکەین و بیکەین بەبابەتی هەندێك باس و گفتوگۆ.

لەم روانگەیەوە زاراوەی تازەگەری دیموکراتی نە تەقەلایەکی هەواڵدانی "چاخی زێڕینە" نە "یۆتۆپیایەکی بەهەشتە" سەبارەت بەئاییندە. هەروەها شێوەی کۆمەڵگا و چاخە مێژووییەکانیش نییە کە زانستی پۆزێتیڤیست زۆر باسی دەکات. لەمیانەی پەیرەوە میتافیزیکییەکانەوە باس بکرێت یان پۆزێتیڤیستەکانەوە ، بەلانی کەم لە روانگەی خۆمەوە پێویستە ئامـاژەی پـێ بکـەم، هـەروەکو چـۆن ئـەمجۆرە باسـانەی مێـژوو و کۆمـەڵگا وەك پـەیرەو پەسـەند ناکـەم، ئـەنجامی هاوشێوە لەگەڵ خۆیان دێنن و وەك بانگەشـەی بـۆ دەکـەن شرۆڤەکانیان سـەبارەت بـە راسـتی و حەقیقەت جێگیر و بەپرەنسیپ نییـە. هەڵبەتـە سـەبارەت بـە هزرانـدنی ئەزموونـەکانی کەرەسـتە (ماتریال)ی مێژوو مسۆگەر پێویستی دەبینم. مەسەلەکە تەنیا بە کەرەستەکانی مێـژوو سـنووردار نییە، بەڵکو کەرەستە و ئەزموونەکانی سروشتیش پێویسـت دەبیـنم. سـەبارەت بـەم بابەتـە لـەناو هەڵوێستی ئەزموونگەری(ئەمپیریستی) نموونەییـدا نـیم. هـەروەها هەڵوێسـتی ئایدیالیستی(مەیلی هزری رەها) پەیرەو ناکـەم کـە بەرامبـەرێتی، بانگەشـەی ئافراندنی هـزری سـەربەخۆ لـە ئـامراز و ئەزموونە سروشتی و مێژووییەکان دەکات. ئاگادارم کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی لەرێگای ئـەم پەیرەوانەوە شاکاری زەبـەلاح پێشکەشـکراون. لەگـەڵ ئـەوەی بـاوەڕیم بەپێویسـتی ئاگـاداربوونی ئەمانە هەیە، بروام بەمەش هەیە کە سەبارەت بـە شـرۆڤەکردنی حەقیقـەتیش دەسـت لێبەرنـەدراو نین. لەو بڕوایەدام بەبێ هەبوونی ئەمانەش دەتوانرێت حەقیقەت شرۆڤە بکرێت. بەتایبەتی رەوتـی لێکۆڵەرەوە پۆزێتیڤیستەکان لە لۆخێکی داماوی و بـەزەیی پـێهاتنـەوەدا دەبیـنم کـە لـەناو زۆری

کەرەستەی مێژوودا خنکاوە. بەهەمان شێوە لەو بڕوایەدام کە مەعریفەی شێخەکانیش هیچ پەیوەندی بە حەقیقەتەوە نییە کە تا دوارادە بێ کەرەستەن، وەك بڵێی خاوەن کەرامەتن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لەغەیبەوە زانیاری وەردەگرن! ئەوانیش لە رەوشێکی بێنەوایی و بەزەیی پێهاتنەوەدان!

تەنیا رەخنەکردنی هەڵوێستەکانی ئەزموونگەری و ئایدیالیستی ناتەولو دەمێنێت. هەڵوێستی رەخنەگرانە سەبارەت بەپەیرەوەکانی پێشکەوتنخوازی راستەهێڵی گەرلوونی و رێژەیی بایەخدارە کە شێوەی جیاوازی ئەم دوو پەیرەوەن. بەگشتی نە لەرێگای پەیرەوی پێشکەوتنی راستەهێڵی نە پەیرەوی رێژەگەرایی حەقیقەت ئاواناکرێت و نادۆزرێتەوە. بێگومان ئاستی بەرزی نەرمی ژیری سروشتی کۆمەڵایەتی بژارێکی بەرفراوانی ئازادی پێشکەش بە راستی کۆمەڵگا دەکات. بەڵام ئەم رەوشە بە واتای "هەر کەسێك وەك دەخوازێت دەتوانێت راستی خۆی بوونیاد بنێت" نایێت کە پەیرەوی رێژەیی بانگەشەی بۆ دەکات. هەمان راستی بەو واتایەش نایەت "وەك لە لەوحی مەحفوزدا نووسراوە کاتی بێت روودەدات" نایەت کە ئایدیالیستەکان مەزەندەی بۆ دەکەن. وەك دەبینرێت و پەسەند دەکرێت واقیعیترین پەیرەو لەو زهنیەت و رێگایەدا بەرجەستە دەبێت کە بەگوێرەی هەلومەرجی کات و شوێنی پێدرلودا لەمیانەی هێزە نوێکان راستینەی کۆمەڵایەتی(سروشتە کۆمەڵایەتیەکان، لە کلانەوە تا نەتەوە، چین، دەوڵەت ..هتد) بەشێوەی راستی نوێ بوونیاد دەنێت.

ئەگەر دووبارەکردنەوەش بێت، ئەوەی هەوڵی روونکردنەوەی دەدەم، مسۆگەر پێویستە پەیرەو پشت بە سروشتی کۆمەڵگا، بەتایبەتی پشت بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ببەستێت کە نۆخی ژیان و هەبوونی سروشتی کۆمەڵایەتییە، لەو بڕوایەدام و دڵنیام کە بەمجۆرەیە. هەوڵی ئاماژەکردن بەم خاڵە دەدەم: لەبەر ئەوەی سەرجەم قوتابخانە هزریەکان، بەرهەمە زانستی، فەلسەفی و هونەرییەکانی پەیوەندییان بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە نییە بە سەقەتی لەدایك دەبن و زوو یان درەنگ مەترسی لەگەڵ خۆیاندا دێنن. مسۆگەر بە بنەماگرتنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەلایەن سەرجەم کێشەکانی پەیرەو، بەرهەمە مەعریفی، ئاکار و ئەستاتیکەکان وەك یەکەمین مەرج دەستنیشان دەکەم. سەرنجیان بۆسەر ئەم خاڵە رادەکێشم کە تەواوی پەیرەو، مەعریفە، ئاکار و ئەستاتیکەی لە دەرەوەی ئەم یەکەمین مەرجە پێکبێن، جێی متمانە نابن، سەقەتی و چەوتی لەخۆوە دەگرن و پڕ لەقێزەوەنی و خراپین. ئەم خاڵانە تەنیا

باوەڕی و فیکری تایبەت بە شەخسی خۆم نییە، بە سووربوونەوە جەختی لەسەر دەکەمەوە کە لە ڕێگای حەقیقەتدا بەها و پایەی پێوانی سەرەکییان هەیە.

دوای ئەوەی دووبارە پەیڕەو و شێوازی هەڵوێستی خۆم سەبارەت بە تازەگەری دیموکراتی باسکرد، ئەوا دەرکی پێدەکرێت کە تا ئێستا لەڕێگای شیکارەکانەوە هەوڵی پێشخستنی دوو جۆر هەڵوێستم داوە. یەکەمین مەسەلەی بە سووربونەوە شیکارەکان هەوڵی چەسپاندنی دەدەن ئەوەیە: سیستەمی شارستانی لەڕێگای سووانی بەردەوام، قۆستنەوە و ئاواکردنی پاوانەکانی دەسەڵات و چەوساندنەوە لەسەر کۆمەڵگای خاوەن ماهیەتی ئەخلاقی و سیاسی پێشکەوتووە کە دۆخی ئاسایی سروشتی کۆمەڵایەتییە. ئەم خاڵە زۆر گرنگە، هەر بۆیە مسۆگەر پێویستە دەرکی پێبکرێت و شیکاری گونجاوی پێشکەش بکرێت. هەوڵی ئەنجامدانی ئەمەیانم دا. وەك پێویستیەکی ئەو هەلومەرجەی تێیدا دەژیم، هەرچەندە سنورداریش بن کەرەستە و ماتریالەکانی بەردەستم بەکارهێنا، بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەم ماتریالە و لەمیانەی شرۆڤەکردنی ژیان ـ ژیانی خۆم ـ کە لەبنەڕەتدا ڕێگایەکی ژیانی ڕاستییە بەبێ ئەو نابێت، بەمجۆرە هەوڵی شیکارکردنی ڕاستیمدا.

ئەنجام ئەمە بوو: وەك پێویستی دیالیکتیکی سەردەمە زەبەلاحەکانی شارستانی بەرامبەر بە کێ پێشخرابوون؟ لەکوێ و چۆن پەیوەندی و ناکۆکییەکانیان لەگەڵ کێ پێکهێنابوو؟ لەمیانەی کەمترین ماتریال و هێزی شرۆڤەکردنیش بێت، لەبەر ئەوەی (DEMOS) کۆی پەیوەندی و ڕکابەرێتییەکانە، (KRATI)ش بە واتای خۆ بەڕێوەبردن دێت، وەك دەستەواژەیەکی ناسراو زۆر بەکاردەهێنرێت و لە جیهانی ڕۆشنبیریدا ناسراوە، منیش لە پێشکەشکردنیان بە شێوەیەکی لێکدراو دوودڵ نەبووم. بێگومان دیموکراتیا (DEMOSKRATIYA) سەرجەم یەکینەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە خۆوە ناگرێت. لەوانەیە بە تەواوەتی بەرامبەرەکەی"کۆنفیدراڵیزمی خێڵەکان" بێت کە سەردەمێك لە ئێونا لە ئارادابوو. لەم سۆنگەیەوە لەوانەیە یەکینەکانی خوارتر، سەرووتر و جیاوازییەکانی ئەخلاقی و سیاسی لە خۆوە نەگرتبێت. ڕاستتر، لە گریمانێك زیاتر لەخۆیەوە ناگرێت. بەڵام لەبەر ئەوەی لەو بڕوایەدام کە گونجاوترین گوتەیە لەناو ئەوانەی ئێستادا لە بەکارهێنانیدا دوودڵیم نەکرد. ئەگەر لەداهاتوودا زاراوەیەکی گونجاوتر پێشبخرێت، بێگومان لەبەکارهێنانیدا هیچ دوودڵییەکم نابێت. ئەوەی گرنگە ئەو ناوەڕۆکەیە کە لەخۆیەوە دەگرێت، سەبارەت بەو مەبەستەمانە کەدەرهەق بە ناوەڕۆك هەمانە.

هەرچی دووەمین وشە واتە "مۆدێرنیتە" یە هێندە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە. هەروەکو زۆر باسکراوە، ئاماژە بەو قۆناخ، سەردەم و ماوانە دەکات کە ژیاون و پێوانەی دیاریان هەیە.

لەدۆخێکی بەمجۆرەدا چەند سەردەمی شارستانی هەبێت، ئەوا هێندەی ئەوان، تەنانەت دوو هێندە زیاتر دیمۆسکراتیا و تازەگەری(مۆدێرنیتە) دیموکراتی هەیە. چونکە چەندین یەکینەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی هەن کە دەتوانین وەك تازەگەری دیموکراتی شرۆڤەیان بکەین و سیستەمەکانی شارستانی بەتەواوی دەستی پێیان ناگات و نەیخستونەتە ژێر پاوانی چەوسانەوە و دەسەلاتی خۆیەوە. لەم بارەیەوە مێژوو ماتریالیکی زۆری پێشکەش کردووە. وەك نموونە منیش ئاماژەم بە ژمارەیەکی کەمیان کرد.

دووەمین خاڵی گرنگ سەبارەت بە تازەگەری دیموکراتی،هێندەی سیستەمەکانی شارستانی، بەسیفەتی کلتووری ماددی خۆیان رێکنەخستووە یاخود نەیانتوانیوە خۆیان رێکبخەن. لەبەر ئەوەی شارستانی ناچارە ئامێرە رۆژانییەکانی پاوانخوازی دەسەلات و سەرمایە بخاتە گەڕ، پێویستی بەوەیە هەم لەبواری ئایدیۆلۆژی تا دوارادە ئامادە و رێکخراو بێت، هەمیش وەك بوونیادی ماددی لەناو دۆخی یەکێتی و چالاکیدا بن. ماتریالی مێژوو سەبارەت بەم بابەتە چەندەی بڵێی زۆرە. ئەوەی خوازیار بێت چەندەی پێویست بێت دەیدۆزێتەوە. بەڵام یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتی لەهەمان دۆخ و پێگەدانین. راستتر هەرچی ئەو یەکینە سەربەخۆیانەن کە بەردەوام لەنێوان پێگەی بەرخودان و دۆخی کۆلۆنییەوە هاتووچۆیان بووە، لەبەر ئەوەی زیاتر لە قوژبنەکان، لوتکەی شاخەکان و ناوەڕاستی بیابانەکان بوون دەرفەتی پێشکەوتنیان نەبووە، ناشێت خاوەنی هەمان بوونیادی ماددی و ئایدیۆلۆژی بن. ناڵێم ناتوانن هیچ سیستەم، ئایدیۆلۆژی و بوونیادێك پەرە پێ بدەن. بێگومان مێژوو پڕ لە کلتووری بوونیادی ماددی و ئایدیۆلۆژی دەوڵەمەندترە کە ئەوانیش پێشکەشیان کردووە. هەرچەندە بەهۆی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی شارستانی هێندە ئاشکراشیان نەکەن، پێویستە هەرگیز گومانمان لەو راستییە نەبێت کە لەم لایەنەوە مێژوو پێدراوی زۆر دەوڵەمەندی پێشکەشکردووە.

لەمیانەی هێڵە بنەڕەتییەکانییەوە هەوڵی بەدواداچوونی هەردوو لایەنی لوتکەی ژیار و شارستانیم داوە کە تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتوون. سەرباری تەواوی ریزکردنە قەبەکان، ئەگەر کەموکوڕیشی هەبێت لەو بڕوایەدام کە مەیلە بنەڕەتییەکانم خستۆتەڕوو. بەتایبەتی هەست بەوە دەکرێت بە شێوەیەکی بەرفراوان هەوڵی شیکارکردنی مۆدێرنیتەم داوە کە بە سەرمایەداری ناودەبرێت. لەبەرامبەر ئەمەشدا زۆر باش دەبینرێت کە رکابەرانی هەمان قۆناخی مۆدێرنیتەشم بەشێوەیەکی بەرفراوانتر و لەرێگای رەخنەکردنێکی دیارەوە پێشکەش کردووە. ئەو ئەنجامەی پێویستە لەم رەخنانە وەرگیرێت، ئاشکرایە کە تازەگەری دیموکراتی چۆن رووبەڕووی ئەرکی

سەرلەنوێ خۆبووونیادنانەوە بوتەوە. هەروەکو دەزانین هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری فەرمی بە پێشەنگایەتی لیبرالیزم سەبارەت بە خۆ پێشکەشکردنی لەژێر هەر دەمامکێکدا زۆر بەهرەمەند و بە ئەزموونن، خۆیان نوێ بکەنەوە یان نا بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە ئەنجامی دەدەن. بەڵام ناتوانین هەمان شت سەبارەت بە هێزەکانی تازەگەری دیموکراتی بڵێین. کاتێک تەماشای هەڵوەستەکانی مێژوویی و رابردووی نزیکیان بەرامبەر بە لیبرالیزم بکرێت بەشێوەیەکی روون دەبینرێت کە چۆن لە بواری ئایدیۆلۆژی توێنراونەتەوە و ماهییەتی خۆیان لەدەستداوە. بۆ ئەوەی جارێکی دیکە تووچاری ئەم رەوشانە نەبن، بەلانی کەم بۆ ئەوەی جارێکی دیکە دەرفەت بە دۆخی تراژیدی رابردووی نزیک نەدرێت، زەلالکردن و یەکلاییکردنەوەی ئەرکەکانی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتی گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە.

کاتێک دەڵێم یەکینە، مەبەستم تەواوی ئەو بزووتنەوە، تاک و جڤاتانەیە کە کەم تا زۆر رەوشی رکابەرێتی سیستەم دەزانن و لە ژیاندان. چەندە جێگای داخە ئەم هەبوون و پێکهاتانەی زۆرینەی زۆری سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا پێکدێنن زۆر لەدواوەی ژمارەکانیان هەر یەکە وەک هێزێکی چۆنایەتی لە ئارادایە. بەر لە هەموو شتێک پێویستە سەرلەنوێ ئاواکردنەوە گەیاندنی زۆرینەی چەندایەتی بەهێزێکی چۆنایەتی بۆ خۆی بکاتە ئامانج. تەنانەت ئەگەر بۆ ساتێکیش لەبیر نەکەین کە تۆڕەکانی پاوانی بازرگانی، پیشەسازی، فینانس، ئایدیۆلۆژی، دەوڵەت ـ نەتەوە و دەسەڵاتی جیهانگیری چەندە بە شێوەیەکی بەرفراوان و لەناوبەرانە بەرامبەر بە ئامانجەکانیان رەفتاریان کردووە، بەلانی کەم سەبارەت بە نەهێشتنی ئەو لاسەنگییە مەترسیدارەی لەنێوانیاندا هەیە، ئەوا لەمیانەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی تازەگەری دیموکراتی گەیشتن بەهێزێك کە بەگوێرەی ژمارەی یەکینەکانی بێت، ئەرکێکی روونە و ناشێت درەنگ بخرێت. دەشێت ئەم ئەرکانە بەشێوەی سێ سەرە دێڕی سەرەکی دەستنیشان بکرێن، ئەمانەش ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکانن کە هەرسێکیان بەشێوەیەکی توکمە بە یەکترەوە گرێدراون. بەڵام ئەم پەیوەندییە توندەی لەگەڵ یەکتریدا هەیانە، ئەو سەربەخۆییە مسۆگەرە لە بەین نابات کە لەبواری دەزگاییەوە پێویستە. بە پێچەوانەوە هەر گۆرەپانێك بەو سیفەتەی وەك دەزگایەکە، پێویستە لە مێژوو، رۆژی ئەمرۆمان و داهاتووش سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت. لەدۆخێکی پێچەوانەدا ناتوانن بەشێوەیەکی شایستە رۆڵی خۆیان جێبەجێ بکەن. بەڵام یەکلاییکردنەوەی دامەزراوەبوون و ئەرکەکانی پەیوەندیدار بەم گۆرەپانانەی ئەرك کە لە مێژوودا زۆر تێکەڵ بە یەکتری ژیاون، هەروەها رێکخستنی چۆنیەتی هاوکاریکردنی یەکترییان، مەسەلەیەکن پێویستە شیکار بکرێن.

لەم روانگەیەوە روونکردنەوەی قۆناخی مێژوویی لەرێگای چەند نموونەیەکەوە رۆشنکەرەوە دەبێت. لەیەکینەکانی هۆز و قەبیلەدا بەگشتی ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان بە شێوەیەکی تێکەڵ جێبەجێ دەکرێن. جیاکردنەوە و شارەزابوون هێندە پێش نەکەوتووە. کۆنفیدراسیۆنەکانی خێڵیش زیاتر خەریکی ئەرکە سیاسییەکانە. لەکاتێکدا لەمیانەی ئەزموونی تەمەندارەکان نوێنەرایەتی نەریتی ئەخلاقی دەکرێت، رۆشنکردنەوە و هزراندن زیاتر لە رێگای سیستەمەکانی شامان، شێخ یاخود راهیب نوێنەرایەتی دەکرێت. لەقۆناخە درێژخایەنەکانی مێژوودا کە ئاینە ئیبراهیمییەکان رەهەندی ئەخلاقی و سیاسییان بەدەست هێناوە هەرسێ ئەرکیش ئارادەیەك دەبن بە دامەزراوە و دەزگا. لە ئیسلامدا کاتێك حوجرەکان (مەدرەسە) و حەوزە زانستییەکان رۆڵی دەزگای رۆشنبیری دەبینێت، مزگەوت دەزگای ئەخلاقییە، هەرچی سەڵتەنەتە رۆڵی دەزگای سیاسی جێبەجێ دەکات. بەلام نۆخی تێکەڵی رادەبەدەریان پەرەسەندنی ئافرێنەرانەیانی بەربەست کردووە. بەلانی کەم پەرەنەسەندنیان بە قەدەر کرستیانی و موسەوێتی گرێدراوی ئەم واقیعەیانە. پێگەی ئەکۆمینی(گەردوونی) یاخود ئوممەت شێوەی زاڵی پەیوەندی نێوانیانە، نوێنەرایەتی جۆرێك لە ئەنتەرناسیۆنالیزمەکەیان دەکات.

لە شارستانی گریك ـ رۆماشدا رۆشنبیری تۆزێکی تر سەربەخۆیی بەدەست دێنێت. قوتابخانەکانی فەلسەفە زیاتر دەزگا و دامەزراوی رۆشنبیرین. سەربەخۆییان زۆر پێگەییشتوو بوو. لەکاتێکدا ئەخلاق لە پەرستگا بەدەزگابوو، سیاسەتیش سەرەتا لە ئەنجوومەن و سیناتۆی کۆمار بەدەزگا بوو، دواتر لەگەڵ دەرکەوتن و پەرەسەندنی ئیمپراتۆریەت زەبری کوشندەی بەرکەوتووە. چونکە بەجۆرێك لە جۆرەکان ئیمپراتۆرییەت نکوڵیکردنە لە دەزگابوونی سیاسی لە ئاستی ناوەندییدا. هەوڵی تیرۆرکردنی قەیسەر جۆلیۆسیش لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم راستییەیە.

لەکاتێکدا لەمۆدێرنیتەی سەردەمی نزیکدا رۆشنبیری لەزانکۆدا دووچاری تەڵەزگە دێت، ئەخلاق گورزێکی کوشندەی بەر دەکەوێت و رووبەڕووی سڕینەوە دەبێتەوە. لەرێگای جێگیرکردنی یاسای دانراو (پۆزێتیڤ) لە جێگایدا، هەوڵی پاکتاوکردنی رۆڵەکەی ناو کۆمەڵگای دەدەرێت. هەرچی سیاسەتە لەژێر پەردەی پەرلەمانتەریدا چەندەی دەچێت سنوورەکەی تەسك دەبێتەوە، لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی بیرۆکراتیەتی دەوڵەت ـ نەتەوەدا بەنۆخێکی ئیفلیجی دەگەیەنرێت. ئەویش وەك ئەخلاق چیتر بەواتا راستەقینەکەی ناتوانێت رۆڵی خۆی ببینێت. هەرچی یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتییە پەرەسەندنی دامەزراوەیی هەمەڕەنگ و ئاڵۆز بەخۆیەوە دەبینێت. رێکخراوەکانی برایەتی بەجۆرێك لە جۆرەکان هەرسێ ئەرك لە کەسایەتی خۆیاندا دەکەن بە یەك.

یۆتۆپیاگەراکانیش لەپێگەیەکی هاوشێوەدان. تایبەتمەندێتی و ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان لە دەوروبەری هەمان کەس بەشێوەی تەریقەت کارا دەبێت و جێبەجێ دەکرێت. بەتایبەتیش لەسەردەمی ریال سۆسیالیزمدا لیگی کۆمۆنیستەکان، مانیفیستۆ، یەکەم و دووەم و سێیەم ئەنتەرناسیۆنال وەك دامەزراوێك دێنە پێشەوە کە هەرسێ دەزگابوون بەشێوەیەکی تێکەڵ لە ئارادایە. مەیلێکی هاوشێوەی ئاسیمیلاسیۆنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان سەبارەت بە هەرسێ گۆرەپانی ئەرك پیشانداوە. لەکاتێکدا وەك دەزگا سیاسەت دەکرێتە قوربانی میکانیزمەکانی بەرێوەبەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوەی خودلوەند، ئەوا ئەخلاقیش کراوەتە قوربانی یاسای پۆزێتیڤی هەمان میکانیزم کە دیلێتی هاووڵاتی رێکدەخات. هەرچی ئەرکی رۆشنبیرییە فیدای دووانەیی سەرمایەداری رۆشنبیری و حەمباڵ (گوێدرێژی هەڵگری زانیاری) کانی زانکۆ کراوە کە رۆڵی پەرستگای نوێی دەوڵەت ـ نەتەوە دەبینێت، یاخود دووچاری نکوڵی لێکردن هاتووە.

تەنانەت ئەم ئاماژە و یادە کورتانەی سەبارەت بەمێرووش بەشێوەیەکی روون و بەهەموو گرنگییەکیەوە پیشانیدەدات ئەگەر یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتی وەك کۆمەڵگا خوازیارن بە تەواوی پەرتەوازە نەبن، ئەوا پێویستە بە شێوەی تۆری بەرامبەر خۆیان بەهەرسێ ئەرك تەیار و بارگاوی بکەن.

بەر لەباسکردنی ئەرکەکان بەشێوەیەکی کورت ئاماژەکردن بە بابەتەکانی تۆر و یەکینە رۆشنکەرەوە دەبێت. لە یەکینەدا مەبەست هەر جڤاتێکی دژە پاوانە. لە نەتەوەی دیموکرات تا کۆمەڵەیەکی گوند، لە کۆنفیدراسیۆنێکی نێو نەتەوەیی تادەگاتە هۆبەی گەرەك هەر جڤاتێك یەکینەیەکە. لەهۆزەوە تا شار، لە خۆجێییەوە تا دەگاتە نەتەوەیی هەر تۆرگانێکی بەرێوەبەرایەتیش یەکینەیە. لە یەکینەی دووکەسییەوە، تەنانەت یەك کەسییەوە تادەگاتە ئەو یەکینانەی نوێنەرایەتی ملیۆنان کەس دەکەن جێگای باسن. سەیرکردنی زارلوەکە لەناو ئەم دەوڵەمەندییەوە ئەزموونبەخشی دەکات. بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە سەرجەم یەکینەکان هەر یەکە وەك کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی هەڵسەنگێنرێت. لەم سۆنگەیەوە " هاوبەشێتی هەر یەکینەیەك لە ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکاندا وەك پرەنسیپێك بەهادارە. وەك چۆن یەکینە بە کۆمەڵگابوونی ئەخلاقی و سیاسی دەکاتە پێویستی، کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیش وابەستەبوون بە ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان دەکاتە پێویستییەك. هەرچی لۆخی رایەڵە و تۆرە، گرێدراوی بوونیادی رێکخستنی و بەرێوەبردنی جەمسەری بەرامبەرە. هەروەها دەتوانرێت یەکێتییە ناوخۆییەکان لە باشترین لۆخی تۆردا لەگەڵ یەکتری رێك بخرێن. رێکخستن و

بەڕێوەبەرایەتی ناوەندێتی ڕەها و فەرمانی پلەداری تەواو پێچەوانەی پرەنسیپەکانی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتییە.

### أ ـ ئەرکە ڕۆشنبیرییەکان

بەر لە هەموو شتێك پێویستە بڵێم کە ئەرکە ڕۆشنبیرییەکان وەك پێشخستنی مەعریفە و وشیاری لەمیانەی قاڵبە داڕێژراوە لەپێشینەکان و گواستنەوەیان بۆ یەکینەکان دەست نیشان ناکەم. یەکەمین کاری پێویستە بکرێت هەڵسەنگاندنی خودی ڕۆشنبیرێتییە. زۆر جار دەگوترێت کە "سەردەمی ڕۆشنگەری" (ئەوروپای سەدەی هەژدەهەم) مۆدێرنیتەی چەسپاندووە. بەڵام ئەو جینۆسایدە جەستەیی و کلتوورییە لە ژمارنەهاتووانەی بەشێوەیەکی سیستەماتیك لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە پەیڕەوکراوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە جینۆسایدکردنی یەهودییەکان، زەبرێکی کوشندە لە بانگەشەکانی ڕۆشنگەری مۆدێرنیتە دەدات. ئەمە ئەو ساتەیە کە ئەدۆرنۆی ڕۆشنبیر گوتوویەتی" ئیتر پێویستە سەرجەم خودلوەندەکان بێدەنگ بن. لە هەمانکاتدا دواقۆناخە کە شارستانییەکان پێی گەیشتوون. ئەم ساتە ساتێکی گرنگە، تا شیکار نەکرێت، تەنانەت تاکە هەنگاوێکیش بۆ پێشەوە ناهاوێژرێت. باس لە ساتی جینۆساید، درۆ و ئیفلاسێکی مێژوویی دەکەین. وەك چالاکییەکی ڕۆشنگەری، وشیاربوون و زانستیبوون ڕۆشنبیرێتی ناتوانێت خۆی لەم ساتە دەرهەست (ئەبستراکت) بکات. بەڵکو پێویستە وەك یەکێك لە تاوانبارە سەرەکییەکان دادگایی بکرێت. بارکردنی تاوانەکە لەسەر چەند هیتلەرێکەوە، قێزەونترین پڕوپاگەندەی لیبرالیزمە. تا ئەو سیستەمە ڕۆشن نەکرێتەوە کە لەناو بێشکەوە تا گۆڕستان هیتلەری بەخێوکرد حەقیقەت ڕۆشن نابێتەوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا تەنیا ڕۆخی خیانەتکردنە لە حەقیقەت. ئەگەر"گەڕان بەدوای حەقیقەت" دووچاری خیانەت هاتووە کە ئەرکی سەرەکی ڕۆشنبیرێتییە، بەتایبەتیش ئەم خیانەتە بەشێوەیەکی بەربڵاو لەلایەن حەمباڵێتی و سەرمایەدارێتی ڕۆشنبیرییەوە ئەنجامدەدەرێت، واتە هەندێك مەسەلە هەن پێویستە لە ڕەگەوە چاوێکی پێدا بخشێنرێتەوە. تا ئەو بابەتانە شیکار نەکرێت کە پێویستە لە ڕەگەوە ڕەچاو بکرێنەوە، ئەو پێگەیەی پێی بگەن جگە لە حەماڵ و سەرمایەداری نوێی ڕۆشنبیری بەولاتر هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە.

ئەگەر قەیرانی سیستەماتیکی جیهانگیری تەنیا لەرێگای فەرمانڕەوایی نائاسایی قەیران درێژەی پێدەدرێت، لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا باسنەکردنی قەیرانی ڕۆشنبیری، یان سەرچاوەی خۆی لە نابینایی وەردەگرێت یان لەمیانەی حەماڵ و سەرمایەدارانی ڕۆشنبیرییەوە مەبەستدار بووە

کە نایانەوە سەر ڕێ. هەر رۆشنبیرێکی ئاسایی خاوەن کەرامەت، زەحمەتی لە تێگەیشتنی ئەو ڕاستییە نابینێت کە لە بنەڕەتدا قەیران پەیوەندی بە بنەستبوونەکەی گۆڕەپانی زهنییەتەوە هەیە. چونکە تۆڕێکی هاوشێوەی پەیوەندی جەستە - ڕۆح لەنێوان بوونیادەکانی سیستەم و زهنیەتەکانیانەوە هەیە. قەیرانی جەستە لەبواری بوونیادییەوە، وەك ڕۆح تەنیا قەیرانی زهنیەت ناکات بە پێویستییەك، بەڵکو دەیکاتە پێشەنگەکەی. واتە لەپێشینەیی لە جەستەدا نییە لە قەیرانی ڕۆحیدایە. هەروەکو چۆن مردنی مێشك بەڵگەی مسۆگەری مردنی جەستەییە، قەیرانی زهنییەتیش دەشێت بەڵگەی قەیرانی بوونیادی بێت. مسۆگەرە کە قەیرانێکی قووڵی ڕۆشنبیری لە ئارادایە. لەبەر ئەوەی لەمیانەی ئەو نوێبوونەوانەی لە هەندێك گۆڕەپاندا ئەنجامدەدرێت تێپەڕ ناکرێت ئەو وەڵامەی بدرێتەوە تا ڕادەیەك پێویستی بە قووڵبوونەوە هەیە پێویستە وەڵامەکە پەیوەندی بە وەرچەرخانی سیستەمەوە هەبێت. واتە تەنیا لە میانەی "شۆڕشی ڕۆشنبیری"یەوە دەشێت قەیرانی ڕۆشنبیری سیستەم بەلاوە بنرێت. بەر لەوەی گفتوگۆ سەبارەت بە شۆڕشی ڕۆشنبیری ڕۆژی ئەمڕۆمان بکەین، ئاماژەکردن بە چەند نموونەیەکی مێژوویی تا دوارادە دەرهەق بەم بابەتە ڕۆشنکەرەوە دەبێت.

بەپێی دەرفەتەکانی شرۆڤەکردن دەرکەوتووە کە یەکەمین گەورە شۆڕشی ڕۆشنبیری لەمێژوودا لە قۆناخی ٦٠٠٠ - ٤٠٠٠ پ.ز لە میزۆپۆتامیا ڕوویداوە. قۆناخێکە کە بۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی بەرفراوان هێزی کۆمەڵگا و هێزە سروشتییەکان تێبینی کراوە و لە ئاستێکی بەرزدا دەرەنجامی کرداری لێ هەڵێنجراوە. ئەمە ئەو قۆناخەیە کە گۆردن شیلد لەبارەیەوە گوتوویەتی تەنیا دەتوانرێت لەگەڵ ئەورووپای دوای سەدەی شازدەهەم بەراورد بکرێت. ئەو دەسکەوتە کۆمەڵایەتییانەی تا ئێستا بەشێوەی ئامراز و زهنی لە ئارادان بەشێکی زۆری لەو قۆناخەوە بۆمان ماوەتەوە. دووەمین شۆڕشی گەورە، قۆناخەکانی دامەزراندنی شارستانیەکانی سۆمەر و میسرە. هەم لەبواری زهنییەوە هەمیش لەبواری ئامرازەوە توانا و بەهرەی وەرچەرخاندنی دەسکەوتەکانی شۆڕشی قۆناخی یەکەم بۆ سیستەمی شارستانی پیشاندەدات. چەندین داهێنانی لە جۆری نووسین، بیرکاری، ئەدەبیات، پزیشکی، ئەستێرەناسی، ئیلاهیات و بایۆلۆژی .. هتد کە لەم قۆناخەدا دۆزراونەتەوە پێشکەوتنێکی ڕۆشنبیری لە ئاستی شۆڕشدان. دواتر تا سەردەمی شۆڕشی گریك - ئیۆنا مێژوو لەمیانەی فێربوونی ئەم پەرەسەندنانە و دووبارە کردنەوەیان بەردەوام دەبێت.

شۆڕشی ڕۆشنبیری گریگ ـ ئیۆنا سێیەمین هەنگاوی مەزن پێکدێنێت. قۆناخی ٦٠٠ پ.ز پێش قۆناخێکە هەم لەبواری زهنییەتی فەلسەفی، هەم لەبواری زانستییەوە زۆر دەوڵەمەندانە گوزەری کرد. بێگومان گوزەرکردن لە ئایینەکانی تێکەڵ بە میتۆلۆژیاکان بۆ شۆڕشی فەلسەفی شۆڕشێکی گەورەی ڕۆشنبیرییە. هەروەها لە بوارەکانی نووسین، ئەدەبیات، فیزیا، بایۆلۆژی، لۆژیك بیرکاری، مێژوو، هونەر و سیاسەتیشدا پێشکەوتنی شۆڕشئاسا هاتنە ئاراوە. تا سەدەی شازدەهەم تەنیا لەڕێگای گواستنەوەو دووبارەکردنەوەی بەرهەمی ئەم شۆڕشانە مێژوو بەردەوام بوو. بێگومان لە شوێن و کاتی دیکەشدا چەندین پەرەسەندنی دیکەی ڕۆشنبیری ڕوویداوە. بەڵام ئەمانە بە شۆڕشی گەورە دانانرێن. دەشێت قەڵەمبازی ئایینە یەکتاپەرستەکان وەك شۆڕشی زهنی گرنگ شرۆڤە بکرێت. هەروەها شۆڕشی ئەخلاقی زەردەشتیش شۆڕشێکی گەورەی ڕۆشنبیرییە. لە چین کۆنفۆشیۆس، بوداش لە هیندستان بەهای گرنگی ڕۆشنبیرین. بریسکە و ڕوناکییە ڕۆشنبیرییەکەی سەدەکانی ٨ ـ ١٢ی ئیسلامیش گرنگە. بەڵام وەرنەچەرخانیان بۆ شۆڕش زیانێکی مەزنە.

هەڵبەتە شۆڕشی ڕۆشنبیری ئەورووپا ریشەیی و بەرفراوانە. بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نییە کە سەرچاوەی خۆی لەو شۆڕش و ڕوناکییانە وەردەگرێت کە باسمان کردن. پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکەم" تەواوی ئەم شۆڕشە ڕۆشنبیرییانە پەیوەندییان بە پاوانەکانی دەسەڵات و چەوسانەوە نییە. بە پێچەوانەوە بەهۆی ئەم پاوانانەوە بەشێوەیەکی شایستە پێشکەوتنیان بە دەست نەهێناوە، چەواشەکراون، پووکێنراونەتەوە و زیاتر بەخۆیانەوە بەستوونەتەوە و کراونەتە سەرمایە. لە شۆڕشە ڕۆشنبیرییە گەورەکەی ئەورووپا ئەم واقیعە ئاشکرا و بەکاریگەرترە. سیستەمەکانی موتڵەقییەت و دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی پاوانەکانی سەرمایەداری و دەوڵەتن، هەوڵێکی زۆریان لەپێناو بەربەستکردن و چەواشەکردنی شۆڕشی ڕۆشنبیری و بەستنەوەیان بە دەسەڵاتی خۆیان داوە، تەنانەت ئەمەیان بەکاری سەرەکی خۆیان داناوە. لەم بارەیەوە تێکۆشانی مەزن ئەنجامدراوە. لەپێناو لەدەستنەدانی سەربەخۆیی ڕۆشنبیری و کەرامەتی خۆیان، لە ئەنگیزاسیۆنەکانەوە تا دەگاتە دادگاکانی شۆڕشی فەرەنسا بەرامبەر ستەمی بێ ئامانی دەسەڵاتە یەك بەدوای یەکەکان بەرخودانیان کردووە و دەستگیرکردنیان ڕەچاوکردووە، وەك برۆنۆ، ئاراسمۆس، گالیلۆ، تۆماس مۆر[1] و ..هتد هاوشێوەکانیان.

---

[1] تۆماس مۆر(Thomas Moore): سەرکردەیەکی سیاسی، نووسەر و زانایەکی ئینگلیز بوو، هەروەها بە گوێرەی کڵێسای کاسۆلیکی قەشە بووە، لە ساڵانی (١٤٧٨–١٥٣٥) دا ژیاوە. لە گرنگترین بەرهەمەکانی: مێژووی مەلیك ریتشاردی سێیەم و یۆتۆپیا.

لەسەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەمدا، هەروەکو هەر گۆڕەپان و یەکینەیەکی کۆمەڵگا، هەژموونگەرایی بەهێزی سەرمایە و دەوڵەت ـ نەتەوە لە گۆڕەپانی رۆشنبیری و یەکینەکانیدا رەنگدانەوەیەکی بەهێزی هەبوو. زانست، فەلسەفە، هونەر و تەنانەت ئایینیش تا رادەیەکی مەزن لەگەڵ دەسەڵات، بەتایبەتیش بەگوێرەی بوونیادەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە گونجێندران. پاوانخوازی هەربوو گۆڕەپان زەبرێکی بەهێزی لە سەربەخۆیی رۆشنبیری وەشاند. ئەو رۆشنبیرەی لە ژێر وابەستەیی و پاشکۆیەتی دایە یان بۆ سەرمایەداری رۆشنبیری یان لەرێگای زانکۆ و سیستەمەکانی دیکەی قوتابخانە بۆ حەماڵەکانی زانیاری گۆڕاوە. بوونیادەکانی قوتابخانە لەسەرووی هەموشیانەوە زانکۆکان بوون بە پەرستگای نوێی هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك. رۆح و مێشکی نەتەوەی نوێ لێرەدا دەشۆرێتەوە، بەلۆخی ئەو هاووڵاتی ـ بەندانە دەگەیەنرێن کە بەجۆرێك خودلوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە دەپەرستن لەگەڵ هیچ قۆناخێکدا بەراورد ناکرێن. بەم نۆخە مامۆستاکانی گشت ئاستەکان لە پێگەی چینی راهیبی نوێدان. بێگومان تاکە تاکەی رۆشنبیران هەن کە کەرامەتی رۆشنبیرییان پاراستووە، بەڵام بە ژمارە هێندە کەم و ریزپەڕن ناتوانن رێساکە تێکدەن.

خاڵی گرنگتر سەبارەت بە پەرەسەندنەکانی ناواخنی شۆڕشی رۆشنبیری ئەوروپایە. بەر لە هەموو شتێك پێویستە بگوترێت زۆر باش ئایین، زانست، فەلسەفە و هونەری سەردەمەکانی پێش خۆیان هەرس کردووە. زۆر ئاشکرایە لەسەر بنەمای ئەم هەرسکردنە کۆمەکی خۆیان ئەنجامداوە. هەروەها پێویستە ئەوە پەسەند بکرێت سەبارەت بە چۆنیەتی نزیکبوونەوە لەحەقیقەت رۆشنبیرەکانی ئەوروپا مەودایەکی باشیان بڕیوە. لەبواری میتۆد و جێبەجێکردنەوە سەرکەوتنیان مسۆگەرە. بەتایبەتیش سەرکەوتنەکەیان سەبارەت بە سروشتی یەکەم (لە بوارەکانی فیزیا، کیمیا، بایۆلۆژی، ئەستێرەناسی) بەمجۆرەیە. بەڵام ناشێت و ناکرێت هەمان شت سەبارەت بە هەڵوێستی زانستی، فەلسەفی، هونەری و ئەخلاقیەکانیان دەرهەق بە کۆمەڵگا بگوترێت کە سروشتی دووەمە. روونکردنەوەی واتادار و مەزن(مانیفستۆکان)، دیسپلین (لقی)ی زانستەکان، قوتابخانەی فەلسەفی، مەیلی هونەری و باوەڕی ئەخلاقییان پەرە پێدلوە. بەڵام هێندە سەرکەوتوو نەبوون بتوانن کارەکتەری ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا بپارێزن. بەپێچەوانەوە چەندە بە پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات گرێدراون، بەو رادەیەش کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیان کرد بە

دانی بە هنری هەشتەم دا نەنا کە وەك سەرۆکی کلێسای کاسۆلیکی رۆمانی لە ئینگلتەرا دەستنیشان کرابوو، بە خیانەت تاوانبارکرا، لە تاوەری لەندەن زیندانیکرا، دواتر لە کەللەی درا.

ئامانج تا لەناوچوو، بەجۆرێك هاوبەشێتی تاوانیانکرد کە ئەمەش تەنیا بە ناتەواوی، کەموکوڕی و هەڵە کردنەوە روون ناکرێتەوە. قەیرانی رۆشنبیری بەمجۆرە دەستی پێکرد.

بێگومان نەك تەنیا کۆمەڵگا، بەڵکو لەبوونی ژینگەش بە ئامانجی لەناوبردن توێژی رۆشنبیر تێیدا بەرپرسیارە. هەڵبەتە هەڵوێستی هاوبەشیان لە قەیرانی جیهانگیریدا، بەهۆی هاوبەشێتی قەیرانەکەوەیە. لێرەدا گرنگترین خاڵی پێویستە رۆشن بکرێتەوە، چۆنیەتی پەرەسەندنی لۆڕاندنی رۆشنبیر، تێکچوون و شێواندنێتی لەبواری ستراتیژی و تەکتیکیەوە. بەتایبەتیش لە پەرەسەندنی ئاڵۆزی مەزن، شکست و خیانەت لە گۆڕەپانی یەکینە کۆمەڵایەتییەکان (بەر لە هەموو شتێك لەو بروایەدام کە زانستەکانی سەبارەت بە سروشتی یەکەمیش ماهییەتی کۆمەڵایەتییان هەیە یاخود پێویستە بەمجۆرە بن)دا پێویستە چی و کێ بەرپرسیار ببینین؟ ئایا نەخۆشییەکی پەیوەندیدار بە تەواوی پارادایمی زانستی جێگای باسە؟ یان پێویستە بەشی شێر لە هەندێ دیسپلین (لق)دا بگەڕێین ؟ ئایا نەخۆشی بوونیادییە، یاخود دەرەکی و کاتییە؟ ئایا دەرفەتی چارەسەرکردنی هەیە؟ پێویستە چۆن رێگا و پەیرەوەکانی تیمارکردنی پێشبخرێت؟ دەشێت نیشانە بنەڕەتییەکانی شۆڕشی زانستی نوێ یاخود پارادایمی چی بن؟ لەبواری ستراتیژییەوە پێویستە لەکوێ دەست پێ بکەین؟ تەنیا کاتێك وەڵامی گوهەرییانەمان بۆ ئەم پرسیارانە و هاوشێوەکانیان هەبێت، ئەوا بە ئەندازەی دەرکەوتن لە قەیران، دەتوانین ئەرکە پارادایمی و زانستییە نوێیەکانمان دەستنیشان بکەین.

قەیرانی زانستی ناوەندێتی شارستانی ئەورووپا بوونیادییە. ئەمەش پەیوەندی بە پەرەسەندنەکانی قۆناخەکانی سەرەتای شارستانییەوە هەیە. ناوەندیبوونی زانست لە پەرستگا، بەواتای یەکبوونی لەگەڵ دەسەڵات دێت. چەندین نموونە هەن دەیسەلمێنن کە زانستی سەردەمی شارستانی سۆمەر و میسر بوو بە بەشێکی جیانەبۆوەی دەسەڵات. ئەو راهیبێتییەی زانستی کۆکردەوە لە پێگەی گرنگترین هاوبەشی دەسەڵاتدابوو. کەچی لە راستیدا بوونیادی زانستی سەردەمی نیولیتیك جیاوازتر بوو. زانیاری ژن سەبارەت بە رووەکەکان لەوانەیە بناخەی بایۆلۆژی و پزیشکی بووبێت. هەروەها چاودێریکردنی بۆ مانگ و وەرزەکان ژمارەی لەگەڵ خۆی دەهێنا ئاراوە. بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت راڤە و شرۆڤەیەکی بەمجۆرە بکرێت: پراکتیکی ژیانی هەزاران ساڵەی جڤاتەکانی گوند ـ کشتوکاڵ گەنجینەیەکی گەورەی زانیاری هێنایە ئاراوە. بەڵام لەقۆناخی شارستانیدا ئەم زانیارییانە کۆکرانەوە و کران بە بەشێکی دەسەڵات. لێرەدا وەرچەرخانێکی چۆنایەتی لەبواری نەرێنیدا روویداوە.

زانیاری و زانستی کۆمەڵگا رکابەرەکانی بەر لە قۆناخی شارستانی بەشێکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بوون. تا بەرژەوەندییە ژیانییەکانی کۆمەڵگا نەیاندەکرد بە پێویستییەك مەحاڵ بوو زانست بە جۆرێکی دیکە بەکار بهێنرێت. تاکە ئامانجی زانست بەردەوامکردنی هەبوونی کۆمەڵگا، پاراستن و گوزەرانی بوو. بیر لە ئامانجێکی دیکەی نەدەکرایەوە. بەڵام شارستانی لە رەگەوە ئەم رەوشەی گۆڕی، پاوانی خۆی لەسەر زانست و زانیاری ئاواکرد و لە کۆمەڵگای دابڕاند. لەکاتێکدا کۆمەڵگا لە زانست و زانیاری بێبەش کرا، هێزەکانی دەوڵەت و دەسەڵات لە رێگای وەرگرتنی زانست و زانیارییەوە تا بڵێی بەهێزبوون. ئافرێنەر و هەڵگرانی زانیارییان بە خانەدان و کۆشکەکانەوە بەستەوە و پاوانەکانی خۆیان پتەوکرد. بەمجۆرە دابڕانێکی ریشەیی زانست لە کۆمەڵگا بەتایبەتیش لە ژن بەدیهات، ئەمەش بە واتای نەهێشتنی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژیان و ژینگە دەهات. لە هەمانکاتدا دابڕانی ریشەیی پەیوەندی نێوان ژیری ئەنالیتیکی و ژیری سۆزداری و گەورەبوونی کەلێن و مەودای نێوانیشیان بە یەکەوە زیادیان دەکرد.

واتای زانست لە سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا ئیلاهیبوونە. کۆمەڵگا ئاستی زانیاری و مەعریفەی سەبارەت بە سروشتەکەی وەك گوزارشتی ناسنامەی خۆی دەکات بە ئیلاهی، وەك ئیلاهی دەبینێ. شارستانی ئەم پێگەیەشی گۆڕی. کاتێك زانست بۆ خانەدان و هاوبەشەکانیان گوێزرایەوە، ئیلاهیبوونیش پێگەی خۆی گۆڕی. ئیتر لەکاتێکدا پایەکانی بەندایەتی و نائیلاهی بۆ کۆمەڵگا دیار دەکران، خانەدان و دەوروبەرە نزیکەکەی بە سیفەتی رەچەڵەکی خودلوەند لە میتۆلۆژیا و ئاییندا جێگیر دەکران. پاشا ـ خوداوەندەکان و رەچەڵەکەکانی خودلوەند بەرهەمی قۆناخێکی بەمجۆرەبوون. ئەمجۆرە دابڕانەی پەیوەندییەکانی نێوان ئافرێنەر و هەڵگرانی زانست و زانیاری لەگەڵ کۆمەڵگا بە درێژایی سەردەمەکانی شارستانی بەردەوام بوو. ئەگەر بەرخودان بەرامبەر بەم دۆخەش روویدا بێت، ئەوا زۆر بە ئاسانی لەناوبراون. زانیاری و زانست وەك بڵێی کاست (چینێکی تایبەت و جێگیر)ی ئاواکردبێت. بەڵام کاتێك قۆناخی شارستانی ئەورووپا دەستی پێکرد، بەتایبەتی کێشمەکێشی نێوان کڵێسا و پادشا، هەروەها بە هۆی کەشە سەربەخۆییە رێژەییەکەی مانستەرەکان بەرهەمهێنەرانی زانست و مەعریفە قۆناخێکی سنووررداری سەربەخۆییان بەخۆوە بینی. شەڕە بەردەوام و دژوارەکانی دەسەڵاتدارێتی دەرفەتی بۆ دەرەخساندن بەبێ زیان گەیشتن بە لێکۆڵینەوەکانیان بە ئاسانی ئەوانە بۆ خۆیان بدۆزنەوە کە دەیانپارێزن. رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم زەمینە ئۆتۆنۆم و تایبەتە بوو کە ئەم شەڕانەی دەسەڵات رێگایان لەپێش کردەوە. نەبوونی حوکمێکی رەهای شێوازی چین و عوسمانییەکان

کۆمەکی پێشکەش بە ئۆتۆنۆمی دەکرد. ئەنجام شۆڕشی فەلسەفی و زانستی بوو. بەڵام لەلایەکەوە هەڵکشانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری، لەلایەکەی دیکەشەوە ئاولکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە، لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا ئاواکردنی پاوانی دەسەڵات و سەرمایەی سەر زانستی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئیتر زانست بووە بەشێکی دانەبڕاوەی سەرمایە و دەسەڵات. ئەو رەوشەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی لەسەر حیساب و دژی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پەرەیسەند لەسەردەمی مۆدێرنیتەی ئەوروپا بەلوتکە گەیشت.

ئەمەش بەو واتایە دێت کە ئەو پارادایمە زانستیانەی ئەوروپا ناوەندەکەیانە زۆرپێشتر لە کۆمەڵگا دابڕابوون. ئەوانەی خەریکی زانست و مەعریفەن زیاتر لەناو دیدگای سەرمایە و دەسەڵاتدان. لەمێژبوو کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەبەر چاو کەوتبوو. لەگەڵ دۆڕاندنی کڵێسا ئەم قۆناغ و پرۆسەیە خێراتربوو. ئەو زانستەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نیگەرانییە سەرەکییەکەی نەبوو، جگە لە پابەندبوونی تەواوی بە ئامانجەکانی دەوڵەت و سەرمایە هیچ گۆڕەپانێکی دیکەی سەرقاڵبوونی نەدەدۆزییەوە. ئیتر لەکاتێکدا زانست دەسەڵات و سەرمایەی بەرهەم دەهێنا، سەرمایە و دەسەڵاتیش زانستییان دەکرد بە موڵکی خۆیان. هەروەها وێرانبوونی بێ سنووری پەیوەندی زانست لەگەڵ کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیی تا دوایی دەرگای بەرووی شەڕ، پێکدادان، ململانێ و هەموو جۆرێکی قۆستنەوە کردەوە. هەر بۆیە مێژووی شارستانی ئەوروپا لە هەمانکاتدا بوو بە مێژووی بەرفراوانترین و زۆرترین شەڕ. ئیتر ئەو رۆڵەی بۆ زانست تەرخانکرابوو، قاڵبوونەوە بوو لەسەر دۆزینەوەی ئامرازە کامڵەکانی شەڕ کە دەتوانن سەرکەوتن لەگەڵ خۆیان بێنن. بەمجۆرە ئەنجام بە داهێنانی چەکە ناوکییەکان گەیشت. لە کۆمەڵگایەکدا کە رێساکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی تێدا زاڵ بێت نەك چەکی ناوکی بەڵکو دەمتنچەیەکی یاریکردنیش نەدەدۆزرایەوە. ئەگەر دروستیش کرابونایە بەلانی کەم بەرامبەر بە کۆمەڵگا بەکار نەدەهێنران.

داڕووخانی ئەخلاقی گرنگترین فاکتەری دەستپێکردنی شەڕەکانە. هەرچی دابڕانی پەیوەندی نێوان زانست و ئەخلاقە، بناخەی دۆزینەوە و ئافراندنی هەموو جۆرە ئامرازێکی وێرانکارە. ناشێت ئەم پەیوەندییەی نێوان زانست و دەسەڵات لەگەڵ کۆمەڵگا رەنگدانەوەی لەسەر پەیڕەو و پارادایمی سەرەکی نەبێت. پەراوێزکردنی کۆمەڵگا بەواتای ئۆبژەکردنیشی دەهات. هەروەکو بە ئۆبژەکردنی ژن و کۆیلەکان لە پێشووتردا. دواتر جیاوازییەکانی سۆبژە ـ ئۆبژە کە لە رێگای باکۆن و دیکارتەوە دەستی پێکرد بۆ گشت زانستەکان گواسترایەوە. بە ئۆبژەبوون لە زانستدا زۆر

بە شان و باڵیدا هەڵدەدرێت. کەچی لە ڕاستیدا لەمیانەی دژواربوونی جیاوازی ئۆبژەکتیڤێتی - سۆبژەکتیڤێتی دەرگای لە بەردەم سەرەکیترین کارەسات کرایەوە. هەروەها لەڕێگای جیاوازی من - ئەویتر ئەم کارەساتە قووڵکرایەوە. دواتر بۆ ئەو جەمسەرە دیالیکتیکانە گۆڕا کە یەکتری لەناو دەبەن. مسۆگەر ئەم دوالیزمانە ڕەنگدانەوەی جیابوونەوە و ناکۆکی نێوان کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە لەگەڵ دەسەلات و سەرمایەدا. سەرەتا جێگیرکردنی سروشت، دواتر جێگیرکردنی ژن و کۆیلەکان لە پێگەی ئۆبژەدا، هەروە دواییش بچووککردنەوەی تەواوی کۆمەڵگا بۆ دۆخی ئۆبژە، بەشێوەی "ڕێسای ئۆبژەکتیڤی" بەناوبانگ ڕووبەڕوومان بوویەوە کە تا ئێستاش لە زانستدا بەکار دەهێنرێت. پەیوەندی خودلوەند - بەندەی جاران بۆ پەیوەندی سۆبژە - ئۆبژە گۆڕاوە. هەروەها چەمکی سروشتی زیندووی کۆن جێگای خۆی بۆ سروشتی ئۆبژەی مردوو و مرۆڤی سۆبژەی ئیلاهی بەجێهێشت.

کاریگەری ئەم هەڵوێستە پارادایمییانە لەسەر زانست، بەتایبەتیش لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان وێرانکار بووە. بۆ نموونە زانستی فیزیا کە ئۆبژەی تەواوە، واتە سروشتی فیزیایی بە بنەما دەگرێت، لەو بڕوایە دایە کە سەبارەت بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە و ڕەفتاری سنوورنەناس لەسەر سروشت ئازادە. لە تاقیکردنەوە ناوکییەکانەوە تادەگاتە خستنەگەڕی هەر جۆرە دینامیزمێکی ئۆتۆماتیکی خۆی ئازاد دەبینێت. کاتێك ئەمە ئەنجام دەدات هەست بە هیچ ئەندێشەیەکی ئەخلاقی ناکات. کاتێك چەمکی سروشتی ئۆبژە ڕەفتاری سنوورنەناسانەی ماددە لەگەڵ خۆی دێنێت، ئەنجام تا بۆمبای ئەتۆمی دەڕوات. لەدۆخێکدا زانستی ئیلاهی بۆ زانستێك بگۆڕێت کە بووە بە ئامراز، پەیوەندی بەکۆمەڵگاوە نامێنێت، دەبێتە ئامرازێکی گرێدراوی یاسای زۆرترین قازانجی دەستی سەرمایە و دەسەلات. لە ڕووخساردا فیزیا تەواو زانستێکی سەربەخۆیە و سەرقاڵی سروشتی ئۆبژەکتیڤە، بەلام ئاشکرایە کە لەناوەڕۆکدا یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی هێزی سەرمایە و دەسەلاتە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا زانستی فیزیا نەیدەتوانی دۆخی ئێستای بپارێزێت. گۆڕانی بۆ دۆخی هێزێکی دژە - کۆمەڵگا پیشانیدەوە کە زانستێکی ئۆبژەکتیڤی بێلایەن لە ئارادا نییە. پەیوەندییەکانی هێزیش کە بە یاساکانی فیزیا ناو دەبرێت لەدوا شیکاردا جگە لە ڕەنگدانەوەی هێزی مرۆڤ هیچ واتایەکی دیکەی نییە. هەر وەکو دەزانین هەرچی مرۆڤە بە واتایەکی ڕەها هەبوونێکی کۆمەڵایەتییە.

کاتێك فەلسەفەی پۆزێتیڤیست شیکار بکەین کە مۆرکی خۆی لە تەواوی بوونیادی زانستی مۆدێرنیتە داوە، ئەوا باشتر دەتوانین ڕووی شاراوەی پەیوەندی نێوان شارستانی - دەسەلات -

زانست ئاشکرا بکەین. وەك دەزانین فەلسەفەی پۆزێتیڤیست لە دیاردە ئۆبژەکتیڤە مسۆگەرەکانەوە سەریهەڵداوە و، جگە لەمەش جێگای بەهیچ هەڵوێستێکی دیکەی زانستی نەداوە. کاتێك لە نزیکەوە تەماشا بکرێت بەو سیفەتەی پەیوەندی ئۆبژەکانە ئەوا دەرکی پێدەکرێت کە لە تەواوی بتپەرستەکانی جاران و هێزە میتافیزیکەکان زیاتر بتپەرست و میتافیزیکترە. سەبارەت بەم بابەتە ئەگەر بە کورتی دیالیکتیکی مێژوویی بەبیر خۆمان بێنینەوە ئەوا زیاتر رۆشن دەبینەوە. وەك چۆن ئایینە تاکخوداییە دەرهەستەکان لەسەر بنەمای رەخنەکردنی پاگانیزم (بتگەرایی، ئایینی بە ئیلاهییکردنی دیاردەکانە) سەریهەڵداوە و شێوەیان بە خۆیانداوە، پۆزێتیڤیزمیش وەك جۆرێك لە جۆرەکانی هێرش و هەڵمەتی بەرامبەر بەشێوەی بتپەرستی نوێ سەریهەڵدا. رەخنەکانی دەرهەق بە ئایین و میتافیزیك بەسیفەتی بتگەرایی نوێ(حەقیقەتگەرایی پشت بەستوو بە دیاردەکان مسۆگەر پاگانیزمی نوێیە) وەك میتافیزیك شێوەی گرتووە. ئەم خاڵە تا دوادادە گرنگە کە نیچە یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی بۆ یەکەمجار ئەم راستییەیان دەستنیشان کردووە و هەڵسەنگاندنەکانی کۆمەك پێشکەش بە لێکدانەوەکانی حەقیقەت دەکات. دەستنیشانکردنی ئەم خاڵە بایەخێکی مەزنی هەیە، ئەو دەستەواژەیەی بە دیاردەی ئۆبژەکتیڤێتی ناودەبرێت زاراوەیەکی دوور لە حەقیقەتە. چونکە بەتەنیا دیاردەکان یان هیچ زانیارییەکی واتادار دەرهەق بە حەقیقەت پێشکەش ناکەن یان بەو رادەیەی پێشکەشی دەکەن ئەنجامی زۆر چەوت لەگەڵ خۆیاندا دێنن.

گوتبوومان ئەگەر دیاردەکان لە چوارچێوەی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانیاندا واتادار نەبن، یان هیچ زانیارییەك پێشکەش ناکەن یان رێگا لەپێش چەوتترین ئەنجام دەکەنەوە. با دیاردە فیزیایی، کیمیایی و بایۆلۆژییەکان لەلایەك دابنێین و تەنیا لەمیانەی تاوتوێکردنی نموونەیەکی دیاردەی کۆمەڵایەتی ئەو ئەنجامانە لە نزیکەوە ببینین کە رێگایان لەپێش کردۆتەوە. بە گوێرەی پۆزێتیڤیزم دەوڵەت ـ نەتەوە دیاردەیەکە. هەروەها تەواوی فاکتەرە پێکهێنەرەکانیشی هەر یەکە و دیاردەیەکن. واتە هەزاران دام و دەزگا و بە ملیۆنان مرۆڤ هەر هەموویان هەر یەکە و دیاردەیەکن. کاتێك پەیوەندییەکانی نێوانیشیان بخەینە سەر، ئەوا تابلۆکە تەواو دەکەین. واتە بەگوێرەی پۆزێتیڤیزم زاراوەی زانستیمان دروست کرد. ئیتر رووبەرووی حەقیقەتێکی رەهاین: ئەویش حەقیقەتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. پۆزێتیڤیزم ئەم پێناسەیە وەك شرۆڤەیەك نابینێت، بەڵکو وەك دیاردەی حەقیقەتێکی رەها تەماشای دەکات. هەروەها لەمیانەی ئەم چەمکەوە تەماشای سەرجەم دیاردەکانی دیکەی زانستی کۆمەڵایەتیش دەکات. واتە وەك هەر دیاردەیەکی فیزیایی،

كیمیایی و بایۆلۆژی ئەمانەش هەر یەكە و دیاردەیەكن. پێناسەكەی سەبارەت بە حەقیقەت بەمجۆرەیە. بەتایبەتی لە پەلامارەكانی جینۆساید ـ قڕكردنی ئەتنیكی بەتەواوی سامناكیەكەیەوە بۆمان دەركەوتووە كە ئەم هەڵوێستەی لەرووخساردا بێ تاوان و بێ مەترسی دەبینرێت هیچ بەم شێوەیە نییە. لە هیتلەرەوە تا دەگاتە گوایە میانڕەوترین سەركردەی دەوڵەت ـ نەتەوە هەموویان دەڵێن" ئەوەی ئەنجامماندوە بەگوێرەی زانست تا دواڕادە راستە (بەگوێرەی زانستە پۆزێتیڤیستەكان)، گوایە راستییەكانی نەتەوەیان پاڵاوتووە، بە بڕوای ئەوان پێكهێنانی نەتەوەیەكی هۆمۆژەن و چوونیەكتر تەنیا ماف نییە، بەڵكو رووداوێكە بەگوێرەی یاسای پەرەسەندنی سروشتییە. بەگوێرەی ئەو زانستەی بە بنەمایان گرتووە دەڵێن" راستە. فەلسەفە و زانستی پۆزێتیڤیست ئەم هێزەیان پێدەبەخشێت. لەم چوارچێوەیەشدا وەك پێویستییەكی ئەم چەمكە پۆزێتیڤیستە تەواوی سەردەمی مۆدێرنیتە كەوتە ناو شەڕە سنوورنەناسەكانی نیشتیمان، میللەت، دەوڵەت، ئەتنیك، ئایدیۆلۆژیا و سیستەم. چونكە تەواوی ئەم زاراوانە پیرۆز بوون و تا دوایی شەڕ لە پێناویاندا پێویستییەك بوو. وەك دەزانرێت لە دەرەنجامی ئەم چەمكەدا مێژوو بوو بەدەریای خوێن. ئەو پۆزێتیڤیزمەی لە رووخساردا بێ تاوان دیارە، رووە خراپەكەی ناواخنی بەمجۆرە ریسوای دەكرد.

تۆزێكیتر هەوڵی روونكردنەوەی بابەتەكە بدەین. لە رۆژی ئەمڕۆماندا نزیكەی دووسەد دەوڵەت ـ نەتەوە لەجیهاندا هەیە. ئەگەر ئەوەی لەسەرەوە باسمانكرد بە دەزگا و جەماوەری هاوولاتیانی رووبەرووی گشت دەوڵەتەكان بێتەوە، ئەوا سەرهەڵدانی رەوشێك یاخود سیستەمێكی لانی كەم خاوەن دووسەد خودلوەندی، هەزار پەرستگا و تەریقەتە لە ژمارنەهاتووەكان دەست لێبەرنەدراو دەبێت. چونكە سەرجەم ئەو دیاردانەی نوێنەرایەتی دەكەن پیرۆزن و مردن لەپێناویاندا بەهادارە. پێویستە سەرنج بدەین كە تەنانەت لە ئاستی ناوهێنانیش باسی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ناكەن كە سروشتی كۆمەڵایەتی راستەقینەمان پیشاندەدات. ئەگەر تاكە راستییەك هەبێت كە لەكاتی پەلاماردانیدا شایستەی خۆبەختكردن بێت ئەویش راستینەی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. هەرچی دەوڵەت ـ نەتەوەیە بەناوی بتی ئەو دیاردانەوە شەڕ دەكات كە هەركەس بۆخۆی ئافراندوویەتی و پێكهێنراوە و پێشكەش كراوە. رووبەڕووی قۆناخێكی شەڕكردن لەپێناو بتەكان بووینەتەوە كە هەزار قات لە شەڕەكانی جاران لەپێناو بتەكان دژوارترە. ئەنجام كەوتنەگەڕی یاسای زۆرترین قازانجی پاوانەكانی سەرمایە و دەوڵەت ـ نەتەوەیە، ژیانێكی ئەوتۆ پێشكەش بە كەمینە بەختەوەرەكە دەكرێت كە فیرعەونەكانیش نەیانبینیوە. ئەوەی بە

ژیانی مۆدێرن ناودەبرێت جگە لە ئەنجامەکانی لەناوبردنی ئەم راستی یان راستییانە لەلایەن پۆزێتیڤیزمەوە هیچ شتێکی دیکە نییە. ئەمڕۆ بە سەردەمی کۆمەڵگای وەهمی - شاشەیی گەیشتووین. هیچ رەوشێك هێندەی کۆمەڵگای وەهمی دیاردەگەرایی روون ناکاتەوە. کۆمەڵگای دیاردەگەرا کۆمەڵگای وەهمییە. کۆمەڵگای وەهمی رووی راستەقینەی کۆمەڵگای دیاردەگەرایە، نەك تەنیا رووەکەی بەڵکو خودی حەقیقەتەکەیەتی. بۆ واتایی دیاردەکان (مەبەستم دەریای خوێن، کۆمەڵگای خەیاڵی و کۆمەڵگای بەکاربردنە) لەسەردەمی کۆمەڵگای وەهمی بە لوتکە دەگات. کۆمەڵگای میدیاتیك، کۆمەڵگای خۆنواندن حەقیقەتی ئاشکرابوونی پۆزێتیڤیزم و چەمکی دیاردەی ئۆبژەکتیڤێتییە. لە راستیدا ئەمەش نکوڵیکردنی حەقیقەتە.

وەك پێویستییەکی بابەتەکەمان بەبێ پەنابردنە بەر لێکۆڵینەوەی زیاتر دەتوانم ئەنجامی دیکەی هاوشێوە ریز بکەم. زاراوەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی، کرستیانی، موسەوی، بودی، سەرمایەداری، سۆسیالستی، دەرەبەگایەتی و کۆیلەداری راستینەی هەمان هەڵوێستە. لێرەشدا رووی میتافیزیکیانەی پۆزێتیڤیزم رووبەروومان دەبێتەوە. بەڵێ کۆمەڵگای ئیسلامی و کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەنجامی هەمان هەڵوێستن. واتە ئەمانە زاراوەی دیاردەن: بەگوتەیەکی دیکە " زاراوەی هەڵبەستراو و رواڵەتین. دەتوانرێت هەمان شت سەبارەت بە مەنسوبیەتی نەتەوەش بگوترێت. زاراوەکانی نەتەوەی ئەڵمان، فەرەنسی، عەرەب، تورك و کورد هەریەکە حەقیقەتێکی خاوەن کارەکتەری پۆزێتیڤیستین. بەڵام لەناوەڕۆکدا دیمەنە بێکاریگەرەکانی حەقیقەتن. لە دۆخێکی وەهادا لەوانەیە بپرسن کەواتە حەقیقەت چییە؟ بەبڕوای من وەڵامەکەی زۆر سادەیە، حەقیقەتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی جێگای باسە کە لەناو کۆمەڵگای سروشتیدا لەگەڵ حەقیقەتی شارستانی لە ئارادان کە بەردەوام هەوڵی تێکدانی حەقیقەتی یەکەم دەدات. ناڵێم سیفەت و ناوەکانی دەرەوەی ئەمانە گوزارشت لەهیچ راستییەك ناکەن. بەڵکو دەڵێم نوێنەرایەتی دیمەنەکەی، فۆرمە سادە و گۆڕاوەکەی دەکەن، نەك ناوەڕۆکەکەی.

بۆ نموونە سەیری واقیعی نەتەوەی عەرەب بکەین، لەو شوێنەی بە عەرەبستان(نیمچە دوورگەی عەرەب) ناو دەبرێت عروبە ــ هەرچەندە لاوازیش بووبێت ــ جگە لە کۆمەڵگایەکی خاوەن خەسڵەتی ئەخلاقی و سیاسی، لەگەڵ راستینەی دەسەلات کە بەهەزاران ساڵ فەرمانڕەوایەتی لەسەر پشتی ئەم کۆمەڵگایەکردووە و لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەخاڵی پووکانەوەی گەیاندووە، گوزارشت لە شتگەلێکی ئەوتۆ ناکات. بەهەزاران عەرەبی جیاواز، ناکۆك و تەنانەت عەرەبی دوژمنی سەرسەختی یەکتر هەن. واتە بە هەزاران حەقیقەتی ناکۆك جێگای باسە! بە گوێرەی

فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم پێویستە بەمجۆرە بێت. بەڵام زۆر باش دەزانین لەناوڕۆكدا پێویستە ئەمە راستی عەرەبەكان نەبێت. نموونەیەكی دیكەی مایەی تێگەیشتن درەختە. درەختیش وەك دیاردەیەك بە هەزاران لق و پۆپ و هێندە گەڵایەی هەیە لە ژمارنایەت. ئەگەر درەختێكی بەرهەمدار و بەهادار بێت، ئەوكاتە واتادار دەبێت، نەك بەگوێرەی لق و گەڵاكانی. كەچی پۆزێتیڤیزم ئەو نابینایییە كە هەمان قورسایی بە هەموویان دەدات. بەڵێ لق و گەڵاكانیش راستیەكن، بەڵام راستی واتادار نین. كیلۆیەك یان هێشووێك ترێ بەدارەوە واتایەكی هەیە. بەڵام گەڵایەك واقیعێكی دیاردەیی هەیە كە تەنیا دیمەنە، ناوەڕۆكەكەی پیشاننادات و رووخسارێكە.

خنكاندنی زانستەكان لەناو دیاردەكاندا و رۆژانە لە دایكبوونی دیسپلین(لق)ێكی دیكەی زانست، هەروەها خۆ دانانیان بە حەقیقەتی هاوسەنگ و خاوەن هەمان قورسایی هۆكاری سەرەكی قەیرانی زانستییە. لەسەرەتادا پەیوەندییەكەیمان لەگەڵ سیستەم دیاركرد. بەردەوام بەشێوەیەكی قووڵ دابەشكردنی حەقیقەت بۆ دوالیزمە دژەكانی لە جۆری سۆبژە ـ ئۆبژە، ئێمە ـ ئەوانی دیكە، جەستە ـ رۆح، ئاین ـ زانست، میتۆلۆژیا ـ فەلسەفە، خودلوەند ـ بەندە، چەوسێنەر ـ چەوساوە، حاكم ـ حوكمدرلو .. هتد لەناوەڕۆكدا ئەنجامی ئەو كۆلۆنیكردن و تێكدانەیە كە تۆڕەكانی پاوانی شارستانی لەسەر كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ئاوایانكردووە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەشێوەیەكی سنووورنەناسانە ئەم دوالیزمەی شارستانی زیاد و قووڵكردۆتەوە، بەمجۆرەش كۆمەڵگای بەخاڵی پەرتەوازەبوون و پووكانەوەی رۆژگاری ئەمرۆمان گەیاندووە. زانستی بەكرێگیرلوی سیستەمیش رۆڵێكی گەورەی لەمەدا هەیە. كاتێك قەیران لەنێوان گەوهەری ئایدیۆلۆژی و بوونیادی ئامرازەكە بە خاڵی لەناوبردنی یەكتر بگات، ئەو دۆخەیە كە پەی پێدەبرێت. واتە لەمیانەی بێكاری، شەڕ، برسێتی و هەژاری، فشار و قڕكردن، نەبوونی یەكسانی و ئازادییەوە لە جەستە و رۆحی زۆرینەوە دەبێتە هاوار و پەلەقاژە.

پێویستی بە ئاگاداركردنەوەیەكی لەو جۆرە دەبینم، كاتێك پۆزێتیڤیزم رەخنەدەكەین، نابێ هەندێك تێگەیشتنی هەڵە دەركەوێت، یەكەمیان" لەناو هەڵوێستێكی بەمجۆرەدا نیم، بڵێم دیاردەكان هیچ بەهایەكیان نییە و پەیوەندییان بە راستییەوە نییە. تەنیا دەڵێم زۆر سنووردارە. لەو بڕوایەدام كاتێك دیاردەگەرایی بە ئاستی فەلسەفەیەك بگەیەنرێت رێگا لەپێش مەترسی مەزن دەكاتەوە. جەخت لەسەر ئەوە دەكەمەوە كە لە سیستەمی هزری ئەورووپادا ئەم رەوشە بە زیادەوە ئاشكرابووە. دووەمین خاڵی تێگەیشتنی هەڵە" لەوانەیە رەخنەیەكی لەمجۆرە جێگای باس بێت كە خزلومەتە ناو جۆرێك لە جۆرەكانی ئەفلاتوونگەرایی. كاتێك دەڵێم" ناوەڕۆك

دیاریکەرە، بەتایبەتیش لەنموونەی درەختدا چاوەڕوانی ڕەخنەیەکی بەمجۆرە دەکرێت. بەڵام ئەوەی خوازیاری ئاماژە پێکردنیم بانگەشە و فیکری "درەخت" نییە، بەڵکو خوازیاری ئاماژەکردن بەو ڕاستییە بووم کە درەخت لەڕوانگەی کۆمەڵگاوە لەخۆوەی دەگرێت. هەڵوێستێکی سوونگەراییش پێشکەش ناکەم. تەنیا ئاماژە بەو خاڵە دەکەم، پێویستە ڕاستی تەنیا لەلایەن کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە دەستنیشان بکرێت. دەشێت درەخت سوودێکی زۆری بۆ تاکێك یاخود گروپێك هەبێت. بەڵام ئەگەر ئەم ڕەوشە لەلایەن کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە بەهەمان شێوە شرۆڤە نەکرێت، ئەوکاتە ڕاستی سوود و بەهای نابێت، ئەمەیە کە خوازیاری ئاماژە پێکردنیم.

ئەو فەلسەفەیە ڕەخنە دەکەم کە لیبرالیزم خوازیارە لەژێر ناوی "تاکەکان دەگەڕێن و هەر شتێکی ڕاستەقینەی لە جۆری فەیلەسوف، زانا، سەرباز، سیاسەتمەدار، سەرمایەدار و ... هتد دەیدۆزنەوە و ژیانداری دەکەن" ڕەواجی پێبدات و بیسەپێنێت، مسۆگەر ئەمە بە نائەخلاقی و ناسیاسی دادەنێم. خوازیارم بڵێم" ئەمە ئایدیۆلۆژیای گەورترین بۆ ئەخلاقکردن و بێ سیاسەت هێشتنەوەیە کە مێژووی شارستانی و سیستەمی سەرمایەداری ڕێگای لە پێش کردۆتەوە و قۆناخی شارستانیش هەوڵدەدات دەرخواردی تەولوی کۆمەڵگای بدات، ڕاستتر چیرۆکێکی میتۆلۆژی هاوبەشە کە لەڕێگای پروپاگەندەوە ڕەواجی پێدراوە و کراسی مۆدێرنیان بە بەردا کردووە.

لە لۆخێکی بەمجۆرەدا" ئەو کێشە یاخود پرسیارەی بایەخدارتر دەبێت ئەوەیە، چۆن و لەکوێ حەقیقەت بدۆزینەوە؟ لەڕێگای بەبیرهێنانەوەی ڕێسایەکی زۆرسادە خوازیاری وەڵامدانەوەم، شتێك کە ونت کردووە، لەو جێگایە دەیدۆزیەوە کە تێیدا ونت کردووە. چونکە لە جێگایەکی دیکە، تەنانەت ئەگەر تەولوی جیهانیش بگەڕێیت نایدۆزیتەوە. چونکە ئەوکاتە ڕێباز و پەیڕەوەکەی چەوتە. واتە لەجیاتی ئەو جێگایەی شتەکەت تێیدا بزرکردووە، گەڕان لە شوێنێکی دیکە پەیڕەوێکە تەنیا وزەو کاتت بە فیڕۆ دەدات. لێکۆڵینەوەی ئەم سەردەمەشمان سەبارەت بە حەقیقەت بەم نموونەیە دەچوێنم. سەرباری بودجە و تاقیگە زەبەلاحەکانی لێکۆڵینەوە، هەر وەك ئاماژەم پێکرد ئەو ئەنجامانەی بەدەستهێنراون پڕ لە ئێش و قەیرانە. ئاشکرایە ناشێت ئەمە ئەو حەقیقەتە بێت کە مرۆڤایەتی بە دوایدا دەگەڕێت. بەردەوام وەڵامم دووبارە کردنەوەی دووبارەکانمە: تەنیا دەشێت حەقیقەت کۆمەڵایەتی بێت. لە سەردەمی شارستانیدا کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی سووڵو خرایە ژێر چەپۆکی پاوانی سەرمایە و دەسەڵاتەوە، واتە حەقیقەتی

كۆمەڵایەتی ونكراوە. ئەوەی ونكراوە، لەگەڵ بەها ئەخلاقی و سیاسییەكان بەیەكەوە ونكراوە، ئەگەر دەتەوێت دووبارە بیدۆزیتەوە، پێویستە لەو شوێنە بەدوایدا بگەڕێیت كە گومت كردووە. واتە بەرامبەر بەشارستانی و مۆدێرنیتە پێویستە بەدوای كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، واتە بەدوای راستییەكەیدا بگەڕێیت و بیدۆزیتەوە. پێویستە بەمەشەوە سنووردار نەبیت، هەبوونەكەشی سەر لەنوێ ئاوا دەكەیتەوە كە خراوەتە دۆخێكەوە چیتر ناناسرێتەوە. ئەو كاتە تاكە تاكەی ئەو حەقیقەتە زێڕینانە دەدۆزیتەوە كە بەدرێژایی مێژوو ونت كردوون. لەسەر ئەم بنەمایەش بەختەوەرتر دەبیت و تێدەگەیت كە ئەمەش بە كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسیدا تێپەڕ دەبێت.

كاتێك سەرلەنوێ بوار و گۆڕەپانی رۆشنبیری رێكدەخەینەوە و لە چوارچێوەی ئەركەكاندا هەوڵی پێشخستنی هەندێك پێشنیار دەدەین، ناچارم لەسەر بنەمای رەخنەكان و لە ئاستی پرەنسیپدا پێشكەشیان بكەم:

١- پێویستە هەوڵە رۆشنبیرییەكان، كار وخەباتەكانی زانست و زانیاری لە چوارچێوەی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پێشبخرێت كە دۆخی بنەڕەتی هەبوونی سروشتی كۆمەڵایەتییە. راستینەی ئەم كۆمەڵگایە كە بە درێژایی مێژووی شارستانی دابڕێنراوە و بەپێی بەسەرچوونی قۆناغ زیاتر سووڵوە و تێكچووە، لەسەردەمی مۆدێرندا كە مۆركی سەرمایەداری لێدراوە بە تەواوی پارچە پارچە كراوە، رووبەڕووی پووكانەوە و لەناوچوون كراوەتەوە.

٢ ـ لە دۆخێكی وەهادا پێش هەموو شتێك پێویستە هەوڵی رۆشنبیری، كار و خەباتی زانست و زانیاری بەربەستكردن و وەستاندنی ئەم رەوشە بكاتە ئامانجی خۆی. چونكە شتێك لەناوچووبێت زانستی نابێت. دەشێت یادەوەری هەبێت، یادەوەریش زانست نییە. زانست بەو شتەوە پەیوەندیدارە كە هەیە و دەژی. ئەو كۆمەڵگایەی لەم رەوشەدایە ئەگەر دەخوازێت لەناو نەچێت ناچارە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (بەرامبەر تەواوی فاكتەرەكانی) بەرخودان بكات. ئیتر بەرخودان لەگەڵ هەبوون بە هەمان ئاقاردا دەڕۆن و یەكسانن. ئەگەر رۆشنبیر دەخوازێت بەشێوەی حەماڵێتی و سەرمایەداری رۆشنبیری نەژیت، بەڵكو لەرێگای كەرامەتی لێتوێژەری راستەقینە بژی و لەسەر پێ بمێنێتەوە ئەوا پێویستە رۆشنبیران لە تەواوی هەوڵەكانیاندا هەم بەرخودانكارین و هەمیش فاكتەرەكانی لێكۆڵینەوەیان لە چوارچێوەی رەهەندی بەرخوداندا بێت. لەم واتایەدا هەم رۆشنبیرییەكەی هەم زانستەكەی بەرخودانكارە. چەشنێكی دیكە یان خۆخەڵەتاندنە یان شاردنەوەی ناسنامەی سەرمایە و حەماڵێتییە.

٣ - ئەو زانستەی پێشدەخرێت بەر لەهەموو شتێك ناچارە وەك "زانستی كۆمەڵایەتی" رێكبخرێت. ناچار زانستی كۆمەڵایەتی وەك شاژنی سەرەكی تەولوی زانستەكان پەسەند بكرێت. نە زانستەكانی دیكەی (فیزیا، كیمیا، ئەستێرەناسی، بایۆلۆژی) پەیوەندیدار بەسروشتی یەكەم، نە زانیاری - زانستە مرۆییەكانی (ئەدەبیات، فەلسەفە، هونەر، ئابووری) پەیوەندیدار بە سروشتی دووەم هەرگیز رۆڵی پێشەنگایەتی نابینن، ئەمانە پەیوەندییەكی واتادار لەگەڵ حەقیقەت دروست ناكەن. تەنیا كاتێك هەردوو بوار بەشێوەیەكی سەركەوتووانە پەیوەندی لەگەڵ زانستی كۆمەڵایەتی ببەستن دەشێت بەشی خۆیان لە حەقیقەت وەربگرن.

٤ - بەو سیفەتەی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بابەتی سەرەكی زانستی كۆمەڵایەتییە، پێویستە وەك ئۆبژەیەكی ئۆبژێكتیڤی یان دوالیزمەكانی سۆبژە - ئۆبژە، ئێمە - ئەوانی دیكە، جەستە - رۆح، خوداوەند - بەندە و مردوو - زیندوو لێكۆڵینەوەی لەبارەوە نەكرێت كە لە هزردانی مرۆڤ قووڵكراونەتەوە و كەلێنی مەزن و هەڵدێریان خستۆتە نێوانیان، بەڵكو لەمیانەی پەیڕەوێكەوە لێكۆڵینەوەی بەبنەما بگرێت كە ئەم دوالیزمانە تێپەڕ و دەرباز بكات. جیاوازی شێوازی ژیانی گەردوونە و، ماهییەتێكە لەدۆخێكی چڕبۆوە، ئازاد و نەرمتر لە سروشتی كۆمەڵگادا بەرێوەدەچێت و جێگای باسە. بەڵام گواستنەوە و گەیاندنی ئەم جیاوازییە بە ئاستی سۆبژە - ئۆبژە كە كراوەتە بناخەی سەرجەم بوونیادە ئایدیۆلۆژییەكانی شارستانی و مۆدێرنیتە، مسۆگەر بە واتای پارچەبوون و لەدەستدانی حەقیقەتی گەردوونی و كۆمەڵایەتی دێت.

٥ - ئەو پۆزێتیڤیزمەی لە مۆدێرنیتەی ئەورووپادا بەلوتكەی خۆی گەیشت، بەگشتی زانست بەتایبەتیش زانستی كۆمەڵایەتی لەسەری هەڵكشا و فەلسەفەی گشتی ئەم ئۆبژێكتیڤێتیەیە، تا لەسەر بنچینەی رەخنەی بەرفراوانەوە فرێنەدرێتە ناو زبڵدانی مێژووەوە، ناتوانرێت پارادایم (فەلسەفەی زانستی دژە - شارستانی ریشەیی)ێكی واتاداری زانستی كۆمەڵایەتی پێشبخرێت. هەرچەندە زۆر پارچە بوو بێت و مەترسی لە دەستدانی حەقیقەتی هەبێت ، بەڵام تێگەیشتن و پەسەندكردنی دەسكەوتە ئەرێنییەكانی زانستی ناوەندێتی ئەورووپا، بەتایبەتیش زانستی كۆمەڵایەتی و بەشیان لە حەقیقەتدا مەرجە. چەندە رەخنەكردن و تێپەڕاندنی پۆزێتیڤیزم ناچارییە، ئەوا بەو رادەیەش پێویستە هەرسكردنی ئەو بەشەی حەقیقەتیش پەسەند بكرێت كە ئاشكرا كراون. لەكاتی لێكۆڵینەوەكانی حەقیقەتدا دژە - ئەورووپاگەرێتی ریشەیی بەلانی كەم هێندەی ئەورووپاگەرێتی ریشەیی دەشێت رێگا لەپێش ئەنجامی نەرێنی بكاتەوە.

٦ ـ هەرچەندە ئەو لێکۆڵینەوانەی حەقیقەت کە بە پۆست مۆدێرنیزم ناو دەبرێن پۆزێتیڤیزم رەخنە دەکەن و زانستی کۆمەڵایەتی ناوەندێتی ئەورووپا پەسەند ناکەن، دەشێت ئەم هەڵوێستانە بە ئاسانی لیبراڵیزە بکرێت و بەشێوەی دژە ـ ئەورووپاگەرێتییەکی زیاتر دژی حەقیقەت شێوە بگرێت. ئەم لێکۆڵینەوە پۆست مۆدێرنانەی سوودیان لە دۆخی قەیرانی زانستی کۆمەڵایەتی وەرگرت ئەگەر هەمووشی رەت نەکرێتەوە، هەڵوێستێکی تا دوارادە رەخنەگرانە، گرنگ و بایەخدارە. دیدگا و پەیڕەوی گەردوونگەرایی رەها، پەرەسەندنی راستەهێڵی پۆزێتیڤیزمی مۆدێرنیست چەندە چەواشەکار بێت، ئەوا پەیڕەوەکانی رێژەگەرایی بازنەیی پۆست مۆدێرنیستیش بۆ چەواشەکاری و لادانی هاوشێوە کراوەیە. بۆ ئەوەی بەرەو ئەم جەمسەرانە پەرش و بڵاو و شپرزە نەبێت هەرسکردنی پرەنسیپە سەرەکییەکان مەرجە کە پێویستە پێیەوە گرێدراو بێت. زەمینەی قەیراناوی بۆ ئەوە لەبارە کە هەر کەس بەگوێرەی خۆی لە رێگایەکی حەقیقەت بە لارێیاندا ببات و مایە پووچیان بکات. ئەم مەسەلەیەش بەتەنیا لە چەندین لایەنەوە لێکۆڵینەوەکانی حەقیقەت بە لارێدا دەبات و ناوەڕۆکەکەیان خاڵی دەکاتەوە.

٧ ـ ناشێت لە لێکۆڵینەوەی حەقیقەتدا رێباز و پەیڕەوی سەرەکیمان ئۆبژێکتیڤێتی پۆزێتیڤیست یان سۆبژێکتیڤێتی رێژەگەرایی بێت. لەناوەڕۆکدا هەردووکیان دوو رووەکەی لیبرالیزمن، بەردەوام تێکەڵ بە یەکتریان دەکات و دەیانخاتە بازاڕەوە، ئەوەی لە دروستکردنی حەماڵێتی و سەرمایەی رۆشنبیری بەکاری دەهێنێت هەڵایسانی پەیڕەوە. بەکاریگەرترین لایەنی بێ توانا‌کردنی حەقیقەت ئەم هەڵایسانەی پەیڕەوە. ئەمەش بە واتای زۆری پەیڕەوەکان دێت کە هێندەی ژمارەی خەڵك دەبێت و تەنیا لەمیانەی تێکەڵکردنی پەیڕەوە ئۆبژێکتیڤ و سۆبژێکتیڤەکان دێنە ئاراوە. گرنگە لەمیانەی زۆری ئەم پەیڕەوانە نەخەڵەتێیت کە هاوشێوەی پارەی ورد کردەیەکی بێ بەهاکردنی حەقیقەتە. بێگومان راستی لایەنی ئۆبژێکتیڤ و سۆبژێکتیڤی خۆی هەیە. لە دوا شیکاردا مەعریفە و حەقیقەت گوزارشت لە بەیەکتر گەیشتنی دوالیزمی چاودێر ـ چاودێریکراو دەکەن (مەبەستم هاوتاییبوونیان نییە، وەك یەکسان بوون دەرکی پێبکرێت ئەرێنیترە). چەندە قووڵبوونەوە و قاڵبوونەوە سەبارەت بەم بابەتە پێشبکەوێت، بەو رادەیە پشکەکانی حەقیقەت زیاتر ئاشکرا دەبن. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا لەپێگەی سۆبژەی چاودێر یان ئۆبژەی چاودێریکراودا نابن. بەڵکو واتای زیاتر لە یەکتر نزیکبوونەوەی هەردووکیانە، ئەگەر هاوواتاش نەبن، لە دۆخی یەکسانبوون نزیك بوونەتەوە. قۆناخی بەدەستهێنانی دەرفەتی ئەم یەکسانبوونە ئەو قۆناخەیە کە زۆرترین حەقیقەت دێتە ئاراوە. ئێستا بەرلەوەی پێویستی بە

ناولێنانێك ببینین، ناچارم بەمجۆرە پێناسەی بابەتی پەیرەو تەواو بکەم. بێگومان لە هیچ کات و شوێنێکدا ئەو راستییە پشتگوێ ناخەین کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی یەکینەی بنەڕەتی چاودێر و چاودێریکراوە.

٨ ـ ناشێت دامەزراوە فەرمییەکانی شارستانی و مۆدێرنیتە لەسەروویانەوە زانکۆکان ببن بە شوێنە سەرەکییەکانی لێتوێژینەوە. هەر وەك رابردوو لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا گەیاندنی زانست بە دەسەڵاتدارێتی و ئافراندنی لەلایەن دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەتەوە، بەواتای لەدەستدانی پەیوەندییەکەی بە حەقیقەتەوە دێت. دابڕانی پەیوەندی زانست بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە، واتا لە نۆخی سوودبەخشی بۆ کۆمەڵگا نامێنێتەوە، بە پێچەوانەوە لەپێشخستنی پاوانەکانی فشار و چەوسانەوەی سەر کۆمەڵگا یارمەتیدەر دەبێت. هەروەك چۆن ئەو ژنەی لەماڵی تایبەت یان ماڵە گشتییەکاندا ئاخنراوە راستینەی ئازادی و حەقیقەتی خۆی لەدەستدەدات، ئەو زانست و رۆشنبیرانەی لە دامەزراوە فەرمییەکاندا داخراون یان بەندکراون بەو رادەیە ئازادی و ناسنامەی راستەقینەی خۆیان لەدەست دەدەن. بێگومان ئەمە بەو واتایە نایەت کە هیچ رۆشنبیرێك لەم دامەزراوانە پێناگەیەنرێت و زانست پێشناخرێت. ئەو خاڵەی پێویستە دەرکی پێبکرێت، ئەو زانست و رۆشنبیرەی بووە بە دەسەڵات لەئامانجی نۆزینەوە و لێتوێژینەوەی پەیوەست بە راستینەی کۆمەڵگا دادەبڕێت. دەرکەوتنی نموونەی ریزپەڕی رۆشنبیرێتی و ئەو بەرهەمانەی بەهای زانستییان هەیە راستییە بنەڕەتییەکە ناگۆڕێت.

٩ ـ شۆڕشی دامەزراوەیی(بە دەزگاییبوون)، بەگوتەیەکی دیکە" سەرلەنوێ بونیادنانەوە لەپێناو زانستی کۆمەڵایەتی مەرجە. وەك چۆن لە رۆشنگەری گریك ـ رۆما دا ئەکادیمیا سەربەخۆکانی زانست و فەلسەفە ئاولکران، هەروەها لەچاخی ناوینیش تەکیە، خەڵوەتگا و مانستەرەکان لە نەریتی ئیسلامی و کرستیانیدا رۆڵێکی هاوشێوەیان بینیوە، ئەگەر بەڕاستی بزووتنەوەکانی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری ئەورووپاش لە هەمانکاتدا هەر یەکە و شۆڕشێکی زانست و رۆشنبیری بوون، ئەوا بۆ رزگاربوون لەو قەیرانەی لەئارادایە لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا پێویستی بە شۆڕشی هاوشێوە هەیە. هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی چوار سەد ساڵەی مۆدێرنیتە توانای تێپەڕاندنی ئەو قەیرانەی خۆی نییە کە بەلانی کەم هێندەی قەیرانی هەژموونگەرایی کلتووری ماددی قووڵ و هەمیشەییە. لەبواری ناوەڕۆك و شێوەوە ئەگەر دەستێوەردانی تازەگەری دیموکراتی نەبێت، ئەوا قەیرانەکە رۆڵێکی شپرزەکار و داڕزێنتر دەبینێت. لە پێهەڵگرتنی سۆسیالیستە تۆباویەکانەوە تا سۆسیالیستە زانستییەکان، لە ئەنارشیستەکانەوە تا قوتابخانەی

فرانكفۆرت، لە قەڵەمبازی فەلسەفەی فەرەنسی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە تا شۆڕشی كلتووری لاوانی ١٩٦٨، هەروە دواییش قەڵەمبازی پۆست مۆدێرنیست، فێمێنیست و ئیكۆلۆژییەكانی دوای ١٩٩٠ میراسێكی دەوڵەمەندی زانست و رۆشنبیری هەیە. تازەگەری دیموكراتی ناچارە لەسەر بنەمای هەرسكردنی تایبەتمەندێتییە ئەرێنییەكانی شۆڕش و بریسكە رۆشنبیرییەكانی سەردەمی شارستانی و قەڵەمبازە رۆشنبرییەكانی دژە شارستانی، شۆڕشی زانست و رۆشنبیری خۆی ئەنجام بدات.

دامەزراوەبوون یەكێك لە مەرجەكانی ئەم شۆڕشەیە. لەپێناو سەركەوتنی شۆڕشی رۆشنبیری لە ئاستی جیهانگیریدا، لەسەر بنەمای سوود وەرگرتن لەو ئەزموونانەی لە مێژوودا جێگای باسن، پێویستی بەناوەندی دەزگایەكی نوێی جیهان هەیە. بۆ جێبەجێكردنی ئەم پێداویستییە دەشێت كۆنفیدراسیۆنی ئەكادیمیا و كلتوورەكانی جیهان بوونیاد بنرێت. ئەو كۆنفیدراسیۆنەی لەسەر جوگرافییایەكی ئازاد بوونیاد دەنرێت هەروەك چۆن گرێدراوی هیچ یەكێك لە هێزەكانی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوە نابێت، ناچارە لەسەر بنەمای ركابەرایەتیكردنی پاوانەكانی سەرمایە ئاوابكرێت. سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمییەكەی مەرجە. دەشێت هەر كلتوورێكی خۆجێیی و ئەكادیمیایێكی هەرێمی ـ نەتەوەیی لەسەر بنەمای خۆبەخشانە و بەگوێرەی پرەنسیپەكانی بەرنامە، رێكخستن و چالاكی بەشداری بكەن. دەشێت كۆنفیدراسیۆن لە ئاستی خۆجێیی، هەرێمی، نەتەوەیی و تەنانەت لەسەر ئاستی كیشوەریشدا دام و دەزگای ئەركدار ئاوابكات.

١٠ ـ دەشێت ئەكادیمیەكانی كلتوور و سیاسەتی دیموكراتیك دامەزراوی گونجاو و بەگوێرەی ئەم ئەركانە بێت. دەكرێ ئەم ئەكادیمیانە یارمەتی زانستی و رۆشنبیری بۆ پێویستییەكانی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی یەكینەكانی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دابین بكەن. لەجیاتی ئەوەی دەزگاكانی پاوانی تایبەت و فەرمی بۆخۆیان بە نموونە وەربگرن، بوونیادنانەوەیان لە میانەی پێهەڵگرتن و هەنگاوی ئۆرژیناڵەوە (رەسەنەوە) گونجاوترە. چونكە لاساییكردنەوەی دامەزراوەكانی مۆدێرنیتە، دەشێت شكست لەگەڵ خۆیدا بێنێت. وەك سەرەتا پێشبینی ئەوە دەكرێت كە ئۆتۆنۆم(نیمچە سەربەخۆ) و دیموكرات بن، خۆیان پرۆگرام و كادیرەكانیان ئامادە بكەن، خوێندكار و مامۆستای خۆبەخش بە بنەما بگرن، بەردەوام پێگەی مامۆستا و خوێندكار لە جێگۆڕكێ دا بێت و هەر كەسێك خاوەن ئامانج و بانگەشە بێت، لە شوانێكی شاخەكانەوە تا دەگاتە پرۆفیسۆرێك بتوانن بەشداری تێدا بكەن. ئەكادیمییەكانی ژنانیش بە ئامانجی بە زانستیكردنی لایەنە تایبەتییەكانیان دەشێت ئاواكردنی بەهەمان ناوەڕۆكەوە گونجاو بێت. بۆ

ئەوەی تەنیا لە بواری تیۆریدا نەمێننەوە بەشداریکردنێکی هەمەلایەنەی بواری کرداری پێویستە یەکێك لە ماهییەتەکانیان بێت. لەبواری شوێن و کاتدا پێویستییەکان رەچاو دەکرێن و بەمجۆرە ئەکادیمییەکان ئاوادەکرێن و دەخرێنەکارەوە. هەروەك لەمێژوودا زۆر لە نموونەکانیان بینراوە (ئاتەشگاکانی زەردەشت لەسەر شاخەکان، باخچەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆ، شۆستە و شەقامەکانی سوقرات و ستۆواگەراکان، تەکییە و کڵێساکانی چاخی ناوین .. هتد) دامەزراوێکی سادە و خۆبەخشانەن. لە لوتکە و بناری شاخەکانەوە تا دەگاتە کوچە و قوژبنی گەڕەکەکان دەشێت شوێن هەڵبژێردرێت. بێگومان بەدوای ئەو تەلارانەدا ناگەڕێن کە هەیبەتی دەسەڵات بسەلمێنێت. هەر وەك لە کڵێسا و قوتابخانە سفیلەکاندا دەبینرێت، دەشێت ماوەی پەروەردە بەگوێرەی رەوشی بەشداربووان و چڕی و زۆری هاتنی خوێندکاران دەستنیشان بکرێت. وەك دامەزراوە فەرمییەکان پێویستی بە هەلومەرجی توندی کاتەوە نییە. هەڵبەتە ناشێت بەتەولوی لە شێوەو رێساش بێبەش بن. مسۆگەر پێویستە رێسای ئاکاری و ئەستاتیکیان هەبێت.

لە کار و خەباتەکانی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی یەکینەکانی تازەگەری دیموکراتیدا کۆمەکی زانستی و رۆشنبیری مەرجە. ئاشکرایە کە ئەم مەرجە لەرێگای ئەو سەرمایە رۆشنبیرییە جێبەجێ ناکرێت کە لە بازاڕدا هەیە. تەنیا ئەو زانست و کادیرانەی سەرچاوەکەیان ئەکادیمیای نوێیە دەتوانن ئەم پێداویستییە جێبەجێ بکەن. بێگومان ئەم هەڵسەنگاندنە کورتە و پرەنسیپەکانی چارەسەری کە لە چوارچێوەی ئەرکی رۆشنبیری هەوڵی ئەنجامدانیماندا ماهیەتی پێشنیاری هەیە و پێویستی بە گفتوگۆکردنە. تەنیا لەرێگای قەڵەمبازە نوێکانی رۆشنبیری و زانستییەوە دەشێت هەلومەرجەکانی قەیران بەلایەنی ئەرێنیدا تێپەڕ بکرێت. کاتێك ئەم خاڵە رەچاو بکرێت کە قەیرانی ئامانژە پێکراو جیهانگیری، سیستەماتیك و بونیادییە، ئەوا ئاشکرایە کە بۆ رزگاربوونیش پێویستی بە دەستێوەردانی جیهانگیری، سیستەماتیك و بوونیادی هەیە. دەشێت لە ئەزموونی شۆڕشە لە ژمار نەهاتووەکان ئەو وانەیە فێربین کە لەرێگای لاساییکردنەوەی زانست، دامەزراو و قاڵبە کۆنەکان یاخود پێکەوە لکاندنیان بەشوێنێك بگەین.

بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ شۆڕشێکی رۆشنگەری ریشەیی، سەرلەنوێ خۆ بوونیادنانەوەی تازەگەری دیموکراتی لەسەرووی ئەو وانانەوە دێت کە پێویستە لە رابردوو فێری ببێت. لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە یەکسەر جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکەمەوە کە رابردوو ئێستایە. ئەگەر هێندە باسی تەواوی رابردووی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نەکەین کە شێوەی رەسەن و راستەقینەی هەبوونی سروشتی کۆمەڵایەتییە (بەڵام نابێت ئەو خاڵە پشتگوێ بخەین کە کۆمەڵگای نیولیتیك

كۆمەڵگای گوند ـ كشتوكاڵ، رەوەندەكان، هۆز و خێڵ و گروپە ئاینییەكان بەسووربوونەوە تا ئێستا بەردەوامی بە ژیان و هەبوونی خۆیان دەدەن). بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ئەو بەهایانەی خۆیان بەدەست بێننەوە كە لەلایەن پاوانەكانی دەسەڵات و كەڵەكەكردنی پێنج هەزار ساڵە لەبەین براون، بەدەستهێنانی زانست و رۆشنبیرییەكی خاوەن ماهیەتی شۆڕشگێڕی، ئۆبژەیەكی ژیانی هەرە پێویستە. قاڵبوونەوە، شیكاركردن و پێشخستنی هەوڵەكانی چارەسەری لەپێناو ئەركە رۆشنبیرییەكان لە هەموو كاتێك زیاتر گرنگییەكی ژیانی هەیە و پێویستییەكی دەست لێبەرنەدراوە.

### ب ـ ئەركە ئەخلاقییەكان

سەرباری ئەوەی قسە و باسێكی زۆری لەبارەوە دەكرێت، بەڵام ئەخلاق لەسەرووی ئەو دامەزراوە كۆمەڵایەتییانەوە دێت كە هێشتا شیكار نەكراوە. سەرەڕای سەرجەم هەوڵەكانی تیۆریزەكردن كەوا بەناوی ئەخلاقەوە دەكرێن، بەڵام ئەو رووداوانەی لە بواری كرداریدا روویانداوە زۆر هیوا شكێنن. دەستنیشانكردنێكی هاوبەشی چاودێریكراوی زانست ئەوەیە" چەندەی دەچێت هەبوون و ژیانی كۆمەڵگا لە ئەخلاق بێبەش دەبێت. هۆكار و ئەنجامەكانی ئەمەش بەپێی پێویست رۆشن نەكراوەتەوە. تەنانەت هەنگاو بە هەنگاو بە نرخ و پێگەی دامەزراوێكی لەبەرچاوخراو و بێبایەخ گەیێندراوە. بەڵام ئەخلاق وەك بابەت و دامەزراوە لەوەی مەزەندە دەكرێت زیاتر گرنگترە. دەشێت قەیرانەكانی مێژوو، هەروەها قەیرانی جیهانگیری رۆژگاری ئەمرۆمان تا رادەیەكی مەزن وەك ئەنجامێكی نەبوونی ئەخلاق بیری لێ بكرێتەوە. لە مێژوودا كاتێك ویژدانی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا داپۆشینی شارەكانی سۆدۆم[2] (لە چاخی یەكەم شارێكی نزیك گۆلی لووتە) و پۆمپی[3] بە گڕی ئاگری شاخە گڕكانییەكان، گرێدراو بە داڕووخانی ئەخلاقییەوە روون دەكاتەوە، وەك بڵێی خوازیارە هەواڵی حەقیقەتێك رابگەیەنێت! داڕووخانی ئەخلاقی كۆمەڵگاكان وێران دەكات. ئەو شتەی بە غەزەب و نەفرینی خودلوەندەكان ناو دەبرێت، لە ناوەڕۆكی خۆیدا شێوەی

---

[2] سودوم یان سەدوم (Sodom): كۆمەڵە گوندێكن كە بەهۆی خراپەكاری و فەسادی خەڵكەكەی خودا وێرانی كردووە. زۆربەی لێتوێژەرەوە و زانا ئاینییەكان لەو بڕوایەدان كە ئەم گوندانە دەكەونە ناوچەی دەریای مردووی نزیك بە ئەردەن. بە گوێرەی سەرچاوە عیبرییەكان ناوی گوندەكان ئەمانەن: سەدوم، عەمورە، ئادومە و سەبییم. شوێنەواری شاخی گڕكانی جێگای باسە.

[3] بومبای (Pompei): پایتەختی ویلایەتی ماهاداشترای هیندستان و یەكێك لە گەورەترین شارەكانی جیهان بووە. یەكەمین شارە لە هیندستان بووە بە ناوەندی ئابووری، رۆشنبیری و بازرگانی. دەكەوێتە كەناری رۆژئاوای هیند. لە ساڵی ١٩٦٠ دەوڵەتێكی نوێ لە پایتەختی ویلایەتەكی دامەزرێنرا، بەمجۆرە ناوەكەی لە بومبای بۆ مومبای گۆڕاوە.

رەنگدانەوەی ئاسمانی چالاکی سزادانی بێ ئەخلاقییە لەلایەن ویژدانی کۆمەڵگا (ئەخلاق)ەوە. ئەگەر خودلوەند وەك پیرۆزترین و شکۆمەندترین پێناسەی ئاسنامەی کۆمەڵگا شرۆڤە بکەین، ئەوا نەفرەت کردنیش دەبێتە چالاکییەکی نموونەیی و سزادانی تایبەت بە کۆمەڵگا.

پێناسەکردنی ئەخلاق لە بواری زاراوەییەوە سادەیە. چۆنییەتی ژیان بەگوێرەی نەریت، فێربوون و ڕێساکانی کۆمەڵگا دەشێت ئەخلاق پێناسە بکات. بەڵام ئەم روونکردنەوە چەندەی بڵێی رووکەشی دەمێنێت. ئەو شیکارانەی فەیلەسوفەکانی چاخی کۆن و نوێ (لەسەروویانەوە ئەفلاتوون، ئەرستۆ، کانت) لەژێر ناوی ئەتیك (ئاکار) ئەنجامیانداوە جگە لە هەنگاونان بۆ تیۆری دەوڵەت کۆمەکێکی دیکەی پێشکەش نەکردووە. ڕاستتر، وەك ئامادەکارییەکانی سەرەتای دابڕانی تاك لە ئەندامێتی کۆمەڵگا و گوزەرکردنە بۆ ئەندامێتی دەوڵەت. ئاشکرایە هەڵوێستێکی بەمجۆرە پێشکەش دەکەن: وەك بڵێی ئەرکی ئەخلاق ئەوەیە چۆن تاك بۆ دەوڵەتەکەی بگەیەنێتە لۆخێکی سوودبەخش. بەکورتی شرۆڤە ئەخلاقییەکانیان لایەنگری شارستانییە.

وەك هەر بابەتێکی دیکەی کۆمەڵایەتی سەبارەت بە بابەتی ئەخلاقیش گەڕانەوە بۆ مێژوو فێرکەر و ئەزموونبەخشتر دەبێت. وەك دەزانین قۆناخێکی درێژخایەنی سەردەمەکانی کۆمەڵگا واتە نزیکەی ٩٨٪ ی ئەك یاسا، بەڵکو ڕێسا ئەخلاقییەکان تێیدا پەسەند بووە و پەیرەو کراوە. لەبەر ئەم هۆکارەشە کە پێی دەڵێین کۆمەڵگای ئەخلاقی. لەم سۆنگەیەوە" تا بەباشی دەرکی پێنەکرێت کە ئەخلاقی ئەم قۆناخە درێژخایەنە وەڵامی چی داوەتەوە شرۆڤەکردنی ئەخلاق ناتەواو دەمێنێتەوە. دەشێت پێناسەکردنی سروشتی کۆمەڵگا وەك سروشتێکی بارکراو لە ژیری نەرم تیشك بخاتە سەر بابەتەکە. مەبەست لە ژیری نەرم، زیاتر کارکردنە لەڕێگای هزراندنەوە. پەیوەندی نێوان بیرکردنەوە و کار بەشێوەیەکی ناچاری ڕێسایەك لەخۆوە دەگرێت. هەڵبەتە پێویستی چۆنییەتی ئەنجامدانی کار بۆ خۆی واتای ڕێسایە. دەشێت ئەم یەکەمین چالاکییەی دەرهەق بە کار وەك یەکەمین ڕێسای ئەخلاقی دەستنیشان بکەین. کاتێك دەڵێین" کار مەبەستمان هەموو جۆرە جموجۆڵێکی کۆمەڵایەتییە. لە خواردەمەنی پەیداکردن تا خەوتن، لە ڕۆیشتن تا خواردنی خواردەمەنی ، لە لۆستایەتی تا شەڕکردن لەگەڵ ئاژەڵان، تا دەگاتە سەرقاڵبوون بە رووەك و ماسی گرتنەوە هەر چالاکییەك کارە. ئەگەر ڕێسا نەبێت ئەم کارە سەرناکەوێت. سەرنەکەوتنیش بەواتای مردنی کۆمەڵگا دێت.

لەم خاڵەدا زاراوەکانی دابەشکردنی کۆمەڵگا بەشێوەی بناخەی ئابووری و سەرخانی ئەخلاقی ناماقووڵیەکە. دەشێت ئەخلاق وەك باشترین ڕێگای ئابووری، ڕاستتر، وەك باشترین ڕێگای

بەدەستهێنانی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان پێناسە بکرێت. ئەخلاق وەك نەریت و ڕێ و شوێن شێوازی بەدەستهێنانی ئابووری یاخود پێداویستییە سەرەکییەکانە. لەم سۆنگەیەوە" دەستەواژەکانی ژێرخان ـ سەرخان لە پێگەی زاراوەی ڕۆشنکەرەوە نوورن. ئەخلاق گوزارشت لە باشترین شێوازی ئەنجامدانی سەرجەم چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، لەسەرووشیانەوە هەوڵ و تەقەلا ئابوورییەکان. لەم سۆنگەیەوە هەر شتێکی کۆمەڵایەتی بێت، ئەخلاقییە. هەرشتێکی ئەخلاقیش کۆمەڵایەتییە. بۆ نموونە" وەك چۆن ئابووری ئەخلاقییە، ئایینیش ئەخلاقییە. بە سیفەتی دیموکراسی ڕاستەوخۆ سیاسەت خودی ئەخلاقە.

لەتۆخێکی بەمجۆرەدا یەکەمین ڕێسای کار واتا ئەخلاقەکەی، هەر لە سەرەتاوە بابەتێکی ژیانییە بۆ کۆمەڵگا، چۆن کار بەباشترین شێوە ئەنجامدەدرێت، ئەو چۆنێتییە وەك باشترین ڕێسای ئەخلاق لە زهندا جێگیر دەبێت. ئەمە بە پێی قۆناخ بەهێزتر دەبێت، وەك دابونەریتێکی تەندروست دەبێتە مولکی یادگای کۆمەڵگا. ئەمەش بە واتای پێکهاتنی ئەخلاق دێت. ئەمەیە ئەو بوویەرەی بە دابونەریت ناو دەبرێت. لێرە گرنگترین خاڵی پێویستە شیکار بکرێت، بەو ڕادەیەی ئەخلاق چالاکییەکی زهنییە هێندەش گرنگی بە کاری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا دەدات. واتە بەیەکەوە پێویستی بە هەوڵی زهن و چالاکی کۆمەڵگا هەیە. بۆ خۆم ناوبردنی ئەم ڕەوشە بە یەکەمین تۆخی ڕەسەنی دیموکراسی لە جێگای خۆیدا دەبینم. لەم ڕەوشەدا دیموکراسی ڕەسەن و ئەخلاقی ڕەسەن یەکسان دەبن. بەگوێرەی ئەوەی کۆمەڵگا بەدوای کارە زۆر ژیانییەکانەوە بووە، بیرکردنەوە و گفتوگۆکردن لەسەر کار پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراو بووە. تەنیا بەمەش ناوەستێت، چۆنیەتی سەرخستنی باشترین کار، واتە هەرە زێدە ڕاوەستەکردنی لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەبردنی پێویستییەکی دەستلێبەرنەدراوی ژیانە. ئاشکرایە کە هەردوو ڕەوش، واتە هەم بیرکردنەوە و گفتوگۆکردن و بڕیاردان، هەمیش بەڕێوەبردنی بڕیارو سەرخستنی کارەکە ڕاستەوخۆترین شێوەی دیموکراسی (دیموکراسی بەشداریکردنی ڕاستەوخۆ) یە. ئەمەش لە هەمانکاتدا بە واتای بەڕێوەبردنی ئەخلاقییانەی کۆمەڵگا، بە واتای ژیانی ئەخلاقی کۆمەڵگا دێت. واتە سەرچاوەی دیموکراسی و ئەخلاق هەمان شتە. ئەویش توانای کارکردن و زهنی کۆمەڵکاری پراکتیکی کۆمەڵایەتییە. تەنیا لە ٩٨٪ی ژیانی کۆمەڵگا لەمیانەی ئەخلاق و دیموکراسی ئۆرژینال گوزەر ناکات، چونکە ئەوەی تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی بەرچاو لە یەکینە پارچەکراو و فەرامۆشکراوەکانی کۆمەڵگادا پەیڕەو دەکرێت یاسا نییە ئەخلاقە. پێویستە زۆر باش بزانرێت لە خێزان و بنەماڵەوە تا ئەتنیك، تەنانەت تا دەگاتە کارکردن لە زۆربەی بوارە دامەزراوەییەکانی تا

دەگاتە داتا و ئەو وردەکارییانەی یاسای تێدا ڕێکخراوە، هەر چەندە زۆر تێکچووە، بەڵام ئەگەر ئەخلاق نەبێت ژیان نابێت. یاسا پەردەیەکە. دڵنیام ئەوەی لە بنەڕەتدا تا ئێستا کار بەڕێوە دەبات ئەخلاقە.

کاتێک تەماشای سەردەمی شارستانی دەکەین یەکەمین دەستنیشانکردنی سەبارەت بە بابەتەکە بکرێت، لەسەر حیسابی ئەخلاق بەردەوام هەوڵی پەسەندکردن و پەیڕەوکردنی نۆرمەکانی دەوڵەت دراوە. ڕێکخستنی یەکەمین ڕێساکانی یاسا لە تابلێتەکانی حامورابی کۆمەڵگای سۆمەردا بە باشترین شێوە ئەم ڕەوشە روون دەکاتەوە. لەوانەیە باس لەوە بکرێت کە ئەخلاق کورتی هێناوە، بۆیە حقوق بووە بە پێویستییەک، بەڵام هەڵوێستێکی لەمجۆرە هەڵەیە. کێشەکە کورت هێنانی ئەخلاق نییە، بەڵکو تێکدانی کۆمەڵگای ئەخلاقییە. زۆر جار ئاماژەمان پێکرد کە چۆن ئەخلاق تێکدەچێت و پەراوێز دەکرێت. ئیتر کە ئاواکردنی پاوانە کەڵەکەبووەکانی سەرمایە و دەسەڵات لەسەر کۆمەڵگا دەستی پێکردووە، بەها ئافرێنراوەکانی کۆمەڵگاش زەوت دەکرێن. لە ڕەوشێکی وەهادا نەك ناتەواوی و کورتهێنانی ئەخلاق، بەڵکو دەتوانین باس لە پەیڕەوکردنی فشار و چەوسانەوە و سەپاندنی ستەمکاری بەسەر کۆمەڵگا بکەین. لەژێر ناوی ڕێساکانی حوکمڕانی دەوڵەت ڕێسا یاساییەکان جێبەجێ دەکرێت. لەم سۆنگەیەوە چەندەی دەچێت سنووری ئەخلاق تەسك دەبێتەوە، گرێدراو بەویشەوە گۆڕەپانی دیموکراسی ڕاستەوخۆ تەسك دەبێتەوە. بەرامبەر بەمەش گۆڕەپان و سنووری فەرمانڕەوایی دەوڵەت و یاسا فراوان دەبێت. واتە ئەوەی لایەنێك لەدەستی دەدات، لایەنەکەی دیکە بەدەستی دێنێت. ڕاسترە بڵێین" بە زەبری دەوڵەت لەدەستی ئەخلاق دەردەهێنرێت. لەڕێگای تەسککردنەوەی سنوورەکان و ئاستەمکردنی جێبەجێکردن ئەم ڕەوشە فەراهەم دەکرێت. لە تەواوی کۆمەڵگا شارستانییەکانی دواتردا تەسککردنەوەی سنوورەکانی ئەخلاق (هی دیموکراسی ڕاستەوخۆش) بەردەوام دەبێت و بەشی حقوق(سنوورەکەی) زیاد دەکرێت. شارستانی ڕۆما کە بەجۆرێك لە جۆرەکان کۆتایی و پوختەی شارستانییەکانی چاخی یەکەمین و حوکمڕانی دەوڵەت بوو کە هەرە زێدە حقوقی جێبەجێدەکرد، ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. تا ئێستاش حقوقی ڕۆما یەکێکە لە بەردە سەرەکییەکانی بناخەی حقوق. لە شارستانی ئەورووپا بە گوتەیەکی دیکە لە مۆدێرنیزمدا وەك بڵێی کۆمەڵگا دووچاری داگیرکاری حقوق هاتووە. جۆرێك لە داگیرکاری حقوق جێگای یاسە. لە کاتێکدا ئەخلاق لە قوژبنە تەسکەکاندا گەمارۆ دەدرێت، حقوق لە تەواوی گۆشە سەرەکییەکاندا جێگیر دەکرێت.

ئەم راستییە چی پیشان دەدات؟ زیادبوونی قورسایی دەسەڵات و پاوانی سەرمایە لەسەر کۆمەڵگا پیشاندەدات. کاتێك تەماشای مۆدێرنیتەی ئەم چوار سەد ساڵەی دوایی بکەین دەبینین ئەوەی روویداوە کەڵەکەبوونی زۆرترین سەرمایە و زیادبوونی دەسەڵاتە. راستتر بڵێین" کەڵەکەبوونی چڕکراوەی تێکەڵبوونی هەردووکیانە. هەرچی ئەو خاڵەیە کە دەرهەق بە ئەخلاق ئاماژەی پێبکرێت، بێ رۆڵبوونی نییە، بەڵکو زەوتکردنێتی لەدەستی کۆمەڵگاوە. واتە ئەو کۆمەڵگایەی لەژێر بونیادی ئەخلاق پەیرەو دەکرێت، لێی دابڕێنراوە و لێی زەوتکراوە. لەم سۆنگەیەوە" ئەو بانگەشە و باسانەی زۆر جار دەڵێن ئەو کۆمەڵگایەی بە دۆخێکی ئاڵۆز گەیشتووە لەبەر ئەوەی چیتر لەرێگای ئەخلاقەوە بەرێوە نابرێت هەر بۆیە پێویستی بە حقوق بینراوە، درۆیەکی گەورە و بەو رادەیەش دلوەرییەکی بێ ئەخلاقیانەیە. واتە هەرگیز رەوشی ناتەولوی ئەخلاق، سەرنەکەوتنی و بێکاریگەربوونی بەهۆی ئاڵۆزبوونی دۆخی کۆمەڵگا جێگای باس نییە. لێرەشدا رێسایەکی سادەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیٔ لیبرالیزم پەیرەو دەکرێت، ئەو رێسایەی دەڵێ: بۆ ئەوەی بە ئاسانی رەقیبەکەت پەراوێز بکەیت لەرێگای پروپاگەندەوە باش لە پەلوپۆی بخە. رۆڵی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبرالیزم لە ئاواکردن و پێشخستنی هەڵوێستی هاوچەرخ سەبارەت بە ئەخلاق زۆر ئاشکرایە. هەرچی ئەو حقوقەیە کە لە جێگای ئاواکراوە، کێ هەیە نەزانێت کە پڕ لە رێسا ناویژدانی و ناماقووڵەکان بارکراوە. گوتەی "ئەوەی بەسەر ئەو کەسانە دێت کە یەکەمجار دەکەونە دادگاکانەوە بەسەر مریشکی برژاو نایەت" لە خۆڕا نەگووتراوە. لە شوێنێك یان دامەزراوێك چەندە رێسایەکی زۆری حقوقی هەبێت، واتە لەوێدا پاوانێکی چەوسانەوە و فشاری هێندە بەکاریگەر هەیە. لە هەر دامەزراوێکی ئێستا هەنگاوی بێ بهاوێژیت راستییە کردارییەکان ئەم خاڵە دەسەلمێنن.

یەکێك لەو پرسیارە گرنگانەی پێویستە سەبارەت بە بابەتەکە بکرێت ئەمەیە" ئەخلاق یان یاسا، کامەیان باشتر بەرێوەبەرێتی و حوکمرانی دەکات؟ هەر چەندە باسەکەمان لەناوەڕۆکی خۆیدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بەڵام تەنیا لەبەر ئەوەی یاسا حوکمرانیەکی ناچارییە، بەباشترین شێوە راستییەکە روون دەکاتەوە. وەك دەزانرێت پێناسەی یاسا بە شێوەی " پەیرەوکردنی یاساکان لە میانەی زەبری دەوڵەتەوە" دەکرێت. بەڵام لە ئەخلاقدا بەرێوەبردن و جێبەجێکردنی زۆرەملێیانە جێگای باس نییە. هەڵبەتە رێسایەك لە ناخەوە پەسەند نەکرابێت بە رێسای ئەخلاقی ناونابرێت. کاتێك بەراورد لەنێوان حوکمرانی حقوقی زۆرەملێیانە و

بەڕێوەبەرایەتی ئەخلاقی بکرێت، ئاشکرایە کە قورسایی بەلای باشەکەدا دەچێت، واتە مسۆگەر تای تەرازوو بەلای ئەخلاقدا دەشکێتەوە.

پەیوەندی نێوان ئەخلاق و ئایین خاڵێکی دیکەی گرنگە کە پێویستە شیکار بکرێت. هەروەك چۆن دەتوانرێت هاوتابوونێك لەنێوان ئەخلاق و دیموکراسی راستەوخۆ پێشبخرێت (بۆ کۆمەڵگاکانی دەرەوەی شارستانی و دژە شارستانی) دەشێت هاوتابوونێکی هاوشێوە لەنێوان ئایین و ئەخلاقیش پێشبخرێت. لەو هەلومەرجانەی هێشتا ئایین مۆرکی شارستانی بەرنەکەوتووە، ئەخلاق و ئایین و دیموکراسی راستەوخۆ لەناو یەکتردا دەژین. بە بەراورد لەگەڵ ئاییندا ئەخلاق دامەزراوێکە پێشتر پێکهاتووە. وەك دیار دەبێت ئایین زیاتر سەرقاڵی رەهەندە هێزی و سۆزدارییەکانی ئەخلاق دەبێت کە حەرام، پیرۆزی، جادوو، سەرنج راکێشانەواتا پێنەدان و حوکمڕانی نەکردنی سروشت لە خۆوە دەگرن. کاتێك لە دەرەوەی سروشتی خۆی کۆمەڵگا ئاشنای سروشت دەبێت و دەرك بە پەسەندکردنی دەکات، هەستی ترس و بەخشندەیی تێدا وشیار دەبێتەوە. ترس لە نەرێنییەکان و، هزری سوود وەرگرتن لە لایەنە ئەرێنییەکانی سروشت و ئەو هێزانەی دەرکیان بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژیانەوە کردبوو، وەك سەرچاوەی رەسەن و سەرەتایی نەریت و دەزگای ئایین دەبینرێت.

هیچ گومانێکی تێدا نییە ئایین دامەزراوێکی بەر لە شارستانییە. ئایین زیاتر خاڵە قەدەخەکار و مەترسیدارەکان، هەروەها فاکتەرەکانی میهرەبانی و بەخشندەیی ئەخلاق لەخۆوە دەگرێت. بەپێی تێپەڕبوونی کات دەبێتە نەریتێکی وشك. لەم چوارچێوەیەدا رێکخەری وشکترین و پیرۆزترین فەرمانی ئەخلاقی، ئایین پێکدێنێت. سەربازی ئەوەی لەناواخنی ئەخلاقەوە دەرکەوتووە و لەسەرەتادا بەشێکی بوو، بەڵام لەمیانەی گۆڕانکاری هەلومەرجەکانی کات و شوێنەوە بەهێز دەبێت، دامەزراو و رێساکانی بەلۆخی یاسایەکی وشك (سیستەمە نموونەییەکەی دە فەرمانەکەی موسا) گەیاندووە کە پەیڕەوکردنی مەرجە، بەمجۆرەش سەربەخۆیی و پێشەنگایەتی خۆی رادەگەیەنێت. هەروەها دەشێت بە قەڵەمبازێکی هاوشێوەی یاساش بەراورد بکرێت. رێساکانی یاساش کە سەرەتا بەشێکی رێسا ئەخلاقییەکان بووە، لەگەڵ ئاولکردنی دەوڵەت بۆ قانونگەلێکی زۆرەملێیانە گۆڕا و، بەمجۆرە یاسای پێکهێنا. لەگەڵ پەرەسەندنی سەردەمی شارستانی ئایین جیاوازییەکی دیکەشی بەخۆیەوە بینی، لەمیانەی رەهەندەکانی وەرچەرخان بۆ بەرژەوەندی هێزەکانی دەسەڵات و چەوسانەوە بەپێگەی هێزێکی ئیلاهی گەیشت کە دەتوانێت بەشێوەیەکی قورس کۆمەڵگا سزا بدات. بەمجۆرە بەرژەوەندییەکانی پاوان کە حقوق

بەدەستی دەوڵەت بەڕێوەی دەبات، ئەو هەوڵیدا بەدەستی ئایینێکی ئیلاهی بەڕێوەی ببات کە مۆرکی شارستانی نوێی پێوەیە.

هەر دوو وەرچەرخانیش گرنگن. گوزارشت لە دوو ساتی هەرە گرنگی خاڵی شکانەوەی مێژوو دەکەن. بەهێزبوونی نفوزی هەڵکشاوی پادشایەتی و دەسەڵات لەمیانەی خۆ وەسفکردنی بە دەستەواژە ئیلاهییەکانەوە، ڕێسای سەرەکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییە. چەندە ریشەکانی دەستەواژەی خوداوەند بکۆڵدرێت، بەردەوام ستەمکاری پاوانەکانی فشار و چەوسانەوە و دەزگاکانی دەوڵەت و دەسەڵات، هێزی کارپێکردنی کۆیلە و تاڵانکاری لەژێردا دەردەکەوێت. بەڵام دەستنیشانکردنی ئەم خاڵە زۆر گرنگە، فاکتەرەکانی ئەو بەشەی ئایین کە لە رەهەندی دیموکراتی و کۆمەڵایەتیدایە و لەگەڵ ئەخلاق یەکسانە هەنگاو بە هەنگاو بۆ یەکینەکانی کۆمەڵگا و سروشت وەردەچەرخێت. بەمجۆرە دەتوانرێت پەرەسەندنی ئایین بەدرێژایی مێژووی شارستانی وەك ناسنامە، نەریت و کلتوورێکی خاوەن دوو کارەکتەر واتادار بکرێت. چەندە ئایین و خوداوەندی ناسنامەی هێزەکانی شارستانی بە دەستەواژەکانی ترس، سزا، فرێدانە دۆزەخ، برسی کردن، لەناوبردن، بێ بەزەییبوون، شەڕ، ستەم، حوکمڕانی، خاوەنداری و پەرستن بار کرابێت (پێویستە لەبیر نەکرێت کە ئەم زاراوانە هەرە زێدە ماهییەتی هێزەکانی شارستانی و کەسایەتییەکەیان پیشان دەدات)، ناسنامەی ئایین و خوداوەندی هێزە سیاسی و ئەخلاقییەکانیش بە زاراوەی بوێری، لێبووردن، بەخشندەیی، هیوا، رزقدان، ئافراندن، میهرەبانی، خۆشەویستی، ئاشتی، توانەوە لە خوددا و بەیەکتر گەیشتن بارکراوە.

لە رەوشێکی وەهادا پێناسەکردنی ئایینی لە درێژایی مێژووی شارستانی لەناو ئەم دوو ناسنامەیەدا تا دوارادە فێرکەرە. وەك نموونەیەك ئایینە ئیبراهیمییەکان خاوەن خەسڵەتێکن کە هەردوو مەیلیش لە خۆوە دەگرن. بەو رادەیەی نوێنەرە پایەدارەکانی ئایین (راهیب، حاخام، شێخی ئیسلام، ئایەتوڵلا..) مەیلی شارستانی پیشاندەدەن، ئەهلی ئوممەتی ئاستی ژێرەوەش مەیلی شارستانێتی دیموکراتی پیشاندەدەن. دەشێت بە گوێرەی شوێن و کات مەیلێکیان زاڵ بێت یان یەکسان بن. ئایینە ئیبراهیمیەکان بەم دۆخەیان سۆسیال دیموکراتەکانی مۆدێرنیتە دێننەوە بیری مرۆڤ. وەك چۆن لەسەردەمی مۆدێرنیتەدا سۆسیال دیموکراتەکان نوێنەرایەتی رێککەوتن و سازشی نێوان چینی کرێکار و بۆرژوازی دەکات (هەڵبەتە لەژێر هەژموونگەرایی سەرمایە و دەسەڵات)، ئایینە ئیبراهیمییەکانیش بە درێژایی سەردەمی شارستانی نوێنەرایەتی رێککەوتن و

سازشی نێوان هێزەکانی دەسەلآت و سەرمایەی شارستانی و هێزەکانی شارستانێتی دیموکراتی دەکات (دیسان هەژموونگەرایی هێزەکانی دەسەلآت قورسترە).

لەمێژوودا زەردەشتیزم وەك باوەڕی و زەردەشت وەك کەسایەتییەکی ڕیزپەڕ و تایبەتی پەیوەندیی نێوان ئاین ـ ئەخلاق دەبینین. لێتوێژینەوەکان زەردەشت و باوەڕییەکەی وەك شۆڕشێکی گەورەی ئەخلاق پێناسە دەکەن. ئەو شۆڕشە ئەخلاقییەی لە کەش و زەمینەی کلتوورێکی کۆمەلآیەتی ئاژەلداری و کشتوکالی بنارەکانی زنجیرە چیای زاگرۆس (ئەو کلتوورەی لەسەردەمی شۆڕشی نیولیتیکەوە، لە سالآنی ١٢٠٠٠ پ.ز، تەنانەت لە ڕێکەوتی توانەوەی چوارەمین قۆناخی سەهۆلبەندان لە سالآنی ٢٠٠٠٠ بیست هەزاری پێش زایینەوە شێوەی گرتووە) لە پیرۆزی زیاتر وەك مەیلێکی سیکۆلاری لایەنگری ئەخلاقی دونیایی بەرامبەر هەژموونگەرایی میتۆلۆژی و ئایینی شارستانی سۆمەر (دوای ٣٠٠٠ پ.ز) پێشکەوت، ئەگەر وەك زیادەکردنێك بۆ ناوی زەردەشت بە زەردەشتیزم پش ناو ببرێت، بەلآم وەك دەزانرێت ریشەیەکی زۆر کۆنی هەیە. بە خیتاب و گوتە بەناوبانگەکەی زەردەشت "پێم بلێ تۆ کێی؟" ئاشکرایە کە خودلوەندێتی ئایینی و میتۆلۆژی شارستانی سۆمەر دادگایی دەکات. لەم سۆنگەیەوە یەکەمین رەخنەکردنی ئەخلاقی سەبارەت بە ئاین و خودلوەندەکانی شارستانی گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. لە خۆڕا نییە کە فریدریك نیچەی فەیلەسوف شاکارە بەناوبانگەکەی خۆی بە "وەهای فەرموو زەردەشت" ناونا و ناوەڕۆکەکەشی بە داوەری ئەخلاقی زەردەشتییەوە پڕکردەوە. لەم لایەنەوە خۆشی وەك بەهێزترین شرۆڤەکاری مێژوو دەناسرێت، تەنانەت جێگای تێڕامانە کە هەندێك جار وەك نازناو شاگردی زەردەشت یان شاگردی دیۆنیسۆسی بۆ خۆی بەکارهێناوە.

فاکتەرەکانی (توخمەکانی) شارستانێتی دیموکراتی لە زەردەشتێتیدا لەپێشە و قورسە. لە ناو خێزاندا نزیك بە یەکسانی ژن ـ پیاوە. ئاژەل ئازار نادرێت، زۆر بە دەگمەن گۆشتەکەی دەخۆن، سوود وەرگرتن لەبەرهەمەکانی بە بنچینە دادەنرێت. کشتوکال بەهایەکی مەزنی هەیە. زارلوەکانی چاکە ـ خراپە دەردەکەوێتە پێش کە لە پیرۆزی پاککراوەتەوە. شێوازی بیرکردنەوەی دوانەیی (هێزەکانی رووناکی ـ تاریکی) زۆر بەرچاوە کە یەکەمین تۆوەکانی دیالیکتیك دێنێتەوە یاد. هەولێکی تێگەیشتنی دیالیکتیکیانەی گەردوون جێگای باسە. بەڕێوەبردنی کۆمەلگا لەرێگای پرەنسیپە بەهێزەکانی ئەخلاقەوە بەبنەما وەردەگرێت. زۆر ئاشکرایە لە میانەی ئەم لایەنانەیەوە شۆڕشێکی گەورەی ئەخلاقی بەرامبەر سۆمەرییەکان و ئەو شارستانیانە پیشان دەدات کە ریشەکەی خۆیان لەوێوە وەردەگرن. هەرچەندە چەواشە کرابێت، وەك دەزانرێت گەورەترین

بەرهەمی ئەم شۆڕشە كۆنفیدراسیۆنی میدیا و ئیمپراتۆرییەتی پارسی دوای ئەوە. هەر چەندە مانی خوازیارە دووەمین شۆڕش لەم باوەڕییەدا بكات (ساڵانی ٢٥٠ پ.ز)، بەڵام ئیمپراتۆرە نارەسەنەكانی ساسانییەكان بەرپەستیان كرد. خودی مانیش بە شێوەیەكی قورس سزادرا. لێرەدا پێكدادانی دوو ناسنامەی ئەخلاقی و باوەڕی جێگای باسە.

تا ئێستاش شوێنپەنجەی نەریتی ئەخلاقی زەردەشت - مانی (مەجوسی، ئێزیدیی) لە رۆژهەڵاتی ناوینەوە تا دەگاتە هیندستان و ئەورووپا لە ئارادایە. وشەی زەندیق ریشەكەی زەردەشتییە، رەگی وشەی "Science" یە كە ئەمڕۆ بەواتای زانست بەكار دەهێنرێت. پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بكەین كە پێغەمبەرە یەهوودییەكانی قۆناخی دوورخستنەوەی بابل (٦٠٠ - ٥٤٦ پ.ز)، فەیلەسوفەكانی گریك - ئیۆنی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی ماد - پارس و رۆژهەڵاتناسە ئەورووپییەكان چەندەی بڵێی لە نەریتی زەردەشتایەتییەوە كاریگەر و تێر خۆراك بوون. پێویستە بەهەمان بایەخەوە ئاماژە بەم خاڵەش بكەین كە كۆنفۆشیۆس، سوقرات و بودا كە لەگەڵ زەردەشتدا لە هەمان سەردەمدا ژیاون (سەدەكانی ٥ - ٦ پ.ز) باوەڕییەكەیان لەسەر بنەمای ئەخلاقییە، بەرامبەر بە هەڕەشەكانی شارستانی بۆسەر ئەخلاق نوێنەرایەتی بەرگریكارێكی بەهێزی ئەخلاق دەكەن. هەروەها لەچاخی ناوین فاكتەری ئەخلاقی جێگایەكی گرنگ لە باوەڕی كرستیانی و ئیسلامیدا دەگرێت. هەرچی لەسەردەمی شارستانی ئەورووپایە واتە سەردەمی مۆدێرنیتە، ئەخلاق دووچاری داخورانێكی گەورە دەبێت. بە شێوەیەكی بەرفراوان ئاماژەمان بە هۆكارەكانی كردبوو.

ئەم كورتە یادكردنەوانەی مێژووش پیشانی دەدات كە كۆمەڵگای ئەخلاقی بەرخودانێكی مەزنی كردووە. تا ئەخلاق وەك خودی ئەخلاق ماوەتەوە رادەستی هێزەكانی شارستانی نەبووە. بەرامبەر بە ئایین و یاسای سەپێنراوی شارستانی هیچ كاتێك سووربوونی دیموسDemos لەسەر ئەخلاق كەم نەبۆتەوە. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا سەرەكیترین ئەرك و كێشە سەبارەت بە ئەخلاق دەرهەق بە چۆنییەتی پێگە و جێگیركردنیەتی. بێگومان بەو سیفەتەی ئەتیك (تیۆری ئەخلاق) یەكێك لە لقەكانی زانستی كۆمەڵایەتییە ئەركێكە سەبارەت بە بواری رۆشنبیری كە پێویستە بە بایەخەوە بەرەو پێشەوە ببرێت. ئەوەی گرنگە چۆن ئەتیك لەگەڵ كۆمەڵگا دەكرێت بە یەك، چۆن كۆمەڵگایەكی ئەخلاقی سولو سەرلەنوێ و لەسەر بنەمایەكی بەهێزتر لەرێگای ئەخلاقەوە پۆشتە دەكرێتەوە. ئەركی سەرلەنوێ ئاواكردنەوەی ئەخلاق تەنیا سەردەم و مۆدێرنیتە پەیوەندیدار ناكات، بەڵكو كێشەی بەردەوامبوون و بەردەوامنەبوونی كۆمەڵگاشە. هەروەها ئاشكرابووە كە

قەیرانی بوونیادی لەرێگای ناچاری و هێزی توندوتیژی حقوقیەوە بەلاوە نانرێت. سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ ئایینیش ڕووداوێکی نا ئومێدانەیە. پێویستە باش دەرکی پێ بکرێت تا شانە ئەخلاقییە بەهێزەکەی سروشتی کۆمەڵگا دووبارە کارانەکرێتەوە، بەهیچ ڕێگایەك مۆدێرنیتە ناتوانێت لە قەیرانی جیهانگیری دەربچێت. چونکە ئەو قەیرانەی لە ئارادایە قەیرانێکە کە سەرجەم هێزەکانی دژە کۆمەڵگا لە سیستەمی شارستانی پێنج هەزار ساڵە دژی کۆمەڵگای ئەخلاقی ئافراندوویانە. لەم سۆنگەیەوە نوێنەوەی دەرەتان و ڕزگاری لەمیانەی کۆمەڵگای ئەخلاقی (بەهۆی یەکسانی ئەخلاق لەگەڵ دیموکراسی ڕاستەوخۆ، لە کۆمەڵگای سیاسی)یەوە پێویستییەکی دیالیکتیکە. وەك پرەنسیپێك تا لەم دەستنیشانکردنانەدا نەبن بە یەك، ناتوانرێت هیچ ئەرکێکی ئەخلاقی بەشێوەیەکی ڕاست دەستنیشان بکرێت. لە دۆخێکی بەمجۆرە گەورەترین چەکی ڕزگاری تازەگەری دیموکراتی بەرامبەر بە قەیرانی جیهانگیری مۆدێرنیتە کار و خەباتی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەخلاقە، ئەگەر جارێکی دیکە ئەرکە ئەخلاقییەکان لە دۆخی پرەنسیپدا دەستنیشان بکەین، ئەوا بەمجۆرەیە :

١ - قەیرانی جیهانگیری مۆدێرنیتە (قەیرانی بوونیادی و سیستەماتیکی ڕۆژی ئەمڕۆمان) ئەنجامی ئەو کاولکارییەیە کە هێزەکانی شارستانی پێنج هەزار ساڵە بەرامبەر بە کۆمەڵگای ئەخلاقی پەیڕەویان کردووە، وەك پێویستییەکی دیالیکتیك یش نوێنەوەی ڕێگای ڕزگاری لە سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی کۆمەڵگای ئەخلاقیدا ڕاستە، تەنانەت بژاری بنەڕەتییە.

٢ - سەرباری سەرجەم هەوڵەکانی سووین، پووکانەوە و لەناوبردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی (لەلایەن هێزەکانی مۆدێرنیتەوە) کە یەکینەی سەرەکی تازەگەری دیموکراتییە، بەڵام بە سیفەتی سروشتی کۆمەڵگا تا ڕادەیەکی زۆر بەردەوامی بە هەبوونی خۆی دەدات. هێزەکانی شارستانی تۆڕێکی سنووردار و بەرتەسکی نوخبە بژاردەکانن ( لەوانەیە هیچ کاتێك زیاتر سەدا دەی سروشتی کۆمەڵگای پێکنەهێنابێت) تا ئێستاش تەواوی فاکتەرە زۆرلێکراو و چەوەساوەکان، گەلان، ئەتنیکەکان، ژنان، کۆمەڵگاکانی لادێ ـ کشتوکاڵ، بێکاران، ڕەوەندەکان، لاوان و گروپە مارژیناڵەکان.. هتد قورسایی سەرەکی پێکدێنن.

٣ ـ ئەوەی لە بنەڕەتدا کۆمەڵگای لەسەر پێیان هێشتۆتەوە و درێژەی پێدەدات، سیستەمی حقوقی دەوڵەت نییە، سەرباری هەوڵەکانی دەرهەستکردنی لە کۆمەڵگا و لاوازییەکەشی فاکتەری ئەخلاقە. چونکە تا کۆمەڵگا لەناو نەبرێت ئەخلاقیش لەناو ناچێت. هەروەها قووڵایی قەیرانی کۆمەڵگایەك گرێدراوی ئاستی داڕووخانی ئەخلاقییە. زوو یان درەنگ نەك تەنیا بۆ ڕزگاربوون لە

قەیران ، بەڵكو ئەخلاق ناچارە وەك دەزگا و شانەیەكی بنەڕەتی كۆمەڵگا ڕۆڵی خۆی لە بەردەوامبوونی ژیانی كۆمەڵگاكان لەناو بەختەوەریدا ببینێت.

٤ ـ لەگەڵ ئەوەی خەباتی ئەتیك ئەركی گۆڕەپانی رۆشنبیرییە، هەروەها كار و خەباتەكانی سیاسەتی دیموكراتیش ئەركێكی بواری سیاسییە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ كۆمەڵگای ئەخلاقی نەبن بەیەك ناتوانن رۆڵی خۆیان ببینن. ئەخلاق گوزارشت لەو راستینەیەی كۆمەڵگا دەكات كە ئەركی هەر دوو گۆڕەپانی تێدا پراكتیزە دەكرێت. لەناو چوارچێوەی دیموكراتیكدا یەكسانی لەنێوان ئایین و ئەخلاقدا هەیە. لەم سۆنگەیەوە پێویستە پەرستگاكان ئەو دامەزراوانە بن كە هەرە زێدە ئەخلاقی كۆمەڵگای تێدا تاووتوێ بكرێت. راسترین هەڵوێست ئەوەیە كە یەكە یەكەی پەرستگاكان ـ لە سەرووی هەموویانەوە مزگەوت و كڵێساكان ـ وەك دەمەزراوێكی كرداری ئەخلاق تاووتوێ بكرێن و لە ئاواكردنی كۆمەڵگای ئەخلاقیدا بەكار بهێنرێن. بەتایبەتیش پێویستە مزگەوتەكان بۆ ئەو رۆڵەیان بگەڕێنرێنەوە كە لەسەردەمی حەزرەتی محەمەد وەك ناوەندی ئەخلاقی بوون. مزگەوت تەنیا شوێنی رێوڕەسمی سادەی ئایینی لە جۆری نوێژ نییە (لەسەردەمی حەزرەتی محەمەد لەبنەڕەتدا مزگەوت ناوەندی سەرلەنوێ ئاواكردنی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بوو. نوێژ تەنیا وەك رێوڕەسمی پشتڕاستكردنی ئەم كارە بیری لێ كرابووەوە. دواتر رێوڕەسم بوو بە سەرەكی. هەرچی ئاواكردنی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە كە ئەرك و ئامانجی سەرەكی بوو، لەبیر برایەوە).

تازەگەری دیموكراتی ـ كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی ـ بەو سیفەتەی دامەزراوە ئەخلاقیەكانە كاتێك پێویست بێت لەبواری بەرنامە، رێكخستن و شێوازی كاركردنەوە چاوی پێدا دەخشێنرێتەوە و كارەكانی سەرلەنوێ دابەش دەكرێتەوە. سەرباری ئەوەی پەرستگای عەلەوییەكان زیاتر رۆڵی دامەزراوەكانی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەبینێت، بەڵام پێویستە لە كار و خەباتی سەرلەنوێ ئاواكردنەوەدا لە ئاستی پێشەنگایەتیدا بكەوێتە ناو چوارچێوەی دابەشكردنەوەی كاری نوێدا. یەكینەكانی كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بەرامبەر بە داسەپاندنەكانی دەوڵەت و دەسەڵات، مافی بەرخودانی ئەخلاقی و پیرۆزیان هەیە. لەكاتی پێویستدا دەكرێ ئەم مافە بەكاربهێنرێت. هەروەها ئازادی ئایین و ویژدان (ئەخلاق)یش ئەمە دەكاتە پێویستییەك.

٥ ـ وەك مەزەندە دەكرێت داسەپاندنی عەلمانییەت لەژێر پەردەی مۆدێرنیزم و هەروەها داسەپاندنەكانی ئایینگەرایی میانڕەو یاخود رادیكاڵ لەژێر ناوی نەریت، وەك چۆن دوو مەیلی دژی

یەکتر نین، بەو سیفەتەی دوو ڤێرسیۆنی ئایدیۆلۆژی پێوە لکێنراوی لیبرالیزمن، ناتوانن رۆڵی ئەخلاقی و سیاسی ببینن. بۆ ئەخزانە ناو ئەمجۆرە تەڵەزگانەوە پەسەندکردنی ناوەرۆکی دیموکراتیانەی ئاین و ئەو فاکتەرانەی بەشێوەیەکی رێژەیی ئازادی و عەلمانییەتی تێدا رەنگدەداتەوە هەڵوێستێکی گرنگ و بایەخدارە. هەردوو فاکتەر تەنیا لەم چوارچێوەیەدا دەتوانن رۆڵ لە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی تازەگەری دیموکراتیدا ببینن. بەو رادەیەی پێویستە لەو گەمە و پێکدادانە سەدان ساڵییەی نێوانیان نەبین بە لایەن، بەهەمان ئەندازەش پێویستە بتوانین ئەو هەوڵانەشیان مایە پووچ بکەینەوە کە دەخوازن ئاین و ئەخلاق بشێوێنن، بێکاریگەریان بکەن و سەرلەنوێ لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی مۆدێرنیتە بیانگونجێنن.

٦ ـ پێویستە بەو تیرۆرە نەخەڵەتێین کە یاسا لەمیانەی توندوتیژی دەوڵەتەوە لەسەر کۆمەڵگای پەیرەو دەکات. چونکە ئەخلاق سەرەکییە، یاسا لاوەکییە. تا یاسا دادپەروەرانە بێت رێزی لێدەگرێت. بەڵام لە دۆخێکی پێچەوانەدا تا دوایی داکۆکیکردن و سووربوون لەسەر کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی مەرجە. پێویستە بۆ ساتێکیش لە بیر نەکرێت کە رێگای سەرەکی پاراستن و بەردەوامکردنی کۆمەڵگا بە رلوەستە و هەڵوێستی ئەخلاقیدا تێپەڕ دەبێت.

٧ ـ سەرلەنوێ بە دامەزراوەکردنی دەزگای کۆنی خەلافەت لە چوارچێوەی نوێنەرایەتیکردنی ئوممەتی ئیسلام بە شێوەی ڤاتیکانی نوێنەری ئوممەتی کاسۆلیکی ( لەم نێوەندەدا نەریتە ئەخلاقی و ئایینیەکانی لە جۆری موسەوی و بودیزم.. هتدی لەناودا) و هاوشێوەکانیان و کۆکردنەوەیان لەژێر چەترێکی هاوبەشدا و لەجیاتی تیۆلۆژی قاڵبوونەوەیان لەسەر کردە ئاکارییەکان، بەناوی تەواوی مرۆڤایەتییەوە دەتوانێت رۆڵێکی مەزن لە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیدا ببینێت. وەك شێوازێکی کۆبوونەوە دەوڵەت ـ نەتەوەکان لەژێر چەتری نەتەوە یەکگرتووەکان UN، بەرامبەر بە هێرشەکانی مۆدێرنیتە کۆبوونەوەی باوەڕییە بنەڕەتییە ئەخلاقییەکان و بەدامەزراوەبوونیان مەرجێکی سەرکەوتنیانە. پێویستە ئاواکردنی کۆنفیدراسیۆنی باوەڕی ئەخلاقی و پیرۆزی جیهانگیری بەرامبەر بە جانەوەرە (لیڤی ئەتهان)ەکانی شارستانی و مۆدێرنیتە کە هەوڵی قووتدانی سەرجەم پیرۆزی و باوەڕییە ئەخلاقییەکان دەدات وەك پێویستییەکی ئەم مەرجە ئاوا بکرێت.

٨ ـ پێویستە هێزەکانی تازەگەری دیموکراتی باش بزانن تا ئەرکەکانی خۆیان سەبارەت بەگۆڕەپانی ئەخلاقی هەرس و جێبەجێ نەکەن، ناتوانن بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە یەکینەکانی

كۆمەڵگای دیموكراتی بەرامبەر هێرشە بەرفراوانەكانی چەكی كلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتە و شارستانی بپارێزن.

ئەم هەڵسەنگاندنە كورتانەی سەبارەت بە پێناسەكردنی دامەزراو و بابەتی ئەخلاقی ئەنجامماندا ماهییەتی پێشنیارەكانی چارەسەری لە خۆوە دەگرێت و پێویستی بە گفتوگۆكردنێكی بەرفراوان هەیە. هەروەك چۆن كۆمەڵگای ئەخلاق ناكەوێتە ناو نووتوێی قاڵبەكانی بونیادی سەرخان ـ ژێرخان، ئەوا سروشتی كۆمەڵگاش پەیڕەوی ئەمجۆرە قاڵبانە ناكات. هەر یەكینەیەكی كۆمەڵگا، تەنانەت هەر تاكێك باش دەزانێت تا بەشی خۆی لە ئەخلاق وەرنەگرێت ناتوانێت بژی. ئەوەی گرنگە تەیاركردنی تاك و كۆمەڵگایە بە ئەخلاقێكی باشەوە. جانەوەرەكان (لێڤی ئەتهان)ی شارستی و مۆدێرنیتە چەندە هێرش بكەن و هەوڵی لەناوبردنی بدەن، جگە لە بەرگریكردن لە كۆمەڵگای ئەخلاقی هیچ چارەیەكی دیكەمان نییە. ئەوەی بەرگری لە كۆمەڵگای خۆی نەكات و نەیپارێزێت مافی ژیانێكی شەرەفمەندانەی نابێت. بەڵام ئەگەر ئەخلاقیش نەبێت ناتوانرێت بەرگری لە كۆمەڵگا بكرێت. ئەو سەركەوتنەی تەواوی یەكینەكانی كۆمەڵگا لەكاتی خەباتی سەرلەنوێ ئاواكردنەوەی تازەگەری دیموكراتی لە ئەركە ئەخلاقییەكاندا پیشانی دەدەن دەبێتە پێودانگی سەرەكی دەركەوتنێكی سەركەوتووانە لە قەیرانی سیستەمی جیهانگیری.

### ج ـ ئەركە سیاسییەكان

وەك ئەخلاق زاراوەی سیاسەت(پۆلیتیكا) یش وشەیەكە كە زیاترین پشێویی و شپرزەیی زاراوەی لەبارەوە پێشخراوە. واتای گوتەكە سادەیەو رەگەكەی بۆ یۆنانیٔ كۆن دەگەڕێتەوە. ئەگەر بە هونەری بەڕێوەبردنی شار ناوی ببەین مایەی تێگەیشتن دەبێت. بەڵام لەمیانەی گوتەكانەوە گەڕان بە دوای حەقیقەتدا زۆر ناتەواوە و پەیڕەوێكە مرۆڤ لەنیوەی ڕێگادا دەهێڵێتەوە. زاراوەكانی سەبارەت بە سروشتی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا بەگشتی زۆر نادیارن. دەشێت ئاماژە بە راستی بكەن، بەڵام ناتوانێت كۆیان بكاتەوە و بە یەكتریان ببەستێتەوە. پێویستە تۆزێكیش لەو دیوی زاراوەكانەوە بەدوای راستیدا بگەڕێین. بەداخەوە ئەم كارەش دیسان لە سایەی زارەوەكاندا فەراهەم دەبێت. ئەو كاتە ئەوەی دەمێنێتەوە هێزی راڤەكردنە. چەسپاندنی مانای خودی سیاسەت وەك هونەری ئازادی، دەشێت باشتر گوزارشت لە مەبەستەكە بكات، هەرچی خودی ئازادییە نزیكایەتی لە حەقیقەت دێنێتەوە یاد. بێگومان كاتێك زاراوە و دەستەواژەكانی سیاسەت، ئازادی و حەقیقەت بەكاردێنین دیسان كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی

یەکینەی سەرەکی لێتوێژینەوەکەمانە. راشکاوانە دەیڵێم نیگەرانیم سەبارەت بە روونکردنەوەی ئەو یەکینانە هەیە کە لەسەر بنەمای تاك یان هەر بنچینەیەکی تورن و کەلێنی نێوان خۆیان و کۆمەڵگایان کردۆتەوە. زاراوە و دەستەواژەکانی شەڕ، پێکدادان و چەوسانەوە کە لەگەڵ سیاسەتدا هاوواتاکراوە، گرژی و ناثارامی هزریم زیاتر دەکات. ئەوەی شپرزەییەکە زیاتر دەکات وەك یەك لە قەڵەمدانی سیاسەت Politikaو پۆلیس (دەوڵەت)ە.

ئەنجامدانی قەڵەمبازێکی سەرکەوتووانە سەبارەت بە بابەتێکی بە بانگەشەی وەك ئەرکی سیاسی وەك مەزەندە دەکرێت هێندە ئاسان نییە. لەجیاتی ئەوەی هیچ تەقەلایەکی بۆ نەدرێت، تاقیکردنەوەیەکی خاکییانە، بەلانی کەم سەبارەت بە پێشخستنی گفتوگۆ، لەم سۆنگەیەوە" بۆ پەرەپێدانی لێتوێژینەوە باشترە. لەو بروایەدام بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەو کارانە دەستنیشان بکەم کە بە سیاسەتیان دانانێم. یەکەمیان" پێویستە باش دەرکی پێبکرێت کە کارەکانی دەوڵەت کاری سیاسی نییە، بەڵکو کاری ئیدارییە. چونکە پاڵپشت بە دەوڵەت سیاسەت ئەنجامنادرێت، بەڵکو حوکمڕانی دەکرێت. دووەمیان" ئەو کارانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندییە ژیانییەکانی کۆمەڵگاوە نییە، سیاسەتی بنەڕەتی دەستنیشان ناکات. لە ئاستی ئەو کارە رۆتینیانەن کە لەلایەن دامەزراوەکانی دیکەی کۆمەڵگاوە جێبەجێ دەکرێن. سێیەمیان، ئەو کارانەی پەیوەندییان بە ئازادی، یەکسانی و دیموکراسیخوازییەوە نییە، لە بنەڕەتدا پەیوەندییان بە سیاسەتیشەوە نییە. هەرچی پێچەوانەی ئەم کارانەیە لە بنەڕەتدا پەیوەندی بە سیاسەتەوە هەیە: واتە بەرژەوەندییە ژیانییەکانی کۆمەڵگا، ژیان و هەبوونەکەی، ئاسایشی، گوزەرانی، هەروەها ئازادی و یەکسانی و دیموکراسی کە دەوڵەت و دەسەڵات رێگری لێدەکات. وەك لێرەشدا دەبینرێت کارەکانی سیاسەت و دەوڵەت هەمان شت نین، تەنانەت تا دوا رادە لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن. لە رەوشێکی وەهاشدا چەندە دەوڵەت فراوان و پتەو بێت، بەو رادەیەش سیاسەت بەرتەسك و خاو دەبێتەوە. دەوڵەت واتای رێسایە، هەرچی سیاسەتە داهێنانە. دەوڵەت حوکمڕانی ئامادەکە دەکات، سیاسەت خۆی ئاوایدەکات و بەڕێوەی دەبات. دەوڵەت پیشەیە، بەڵام سیاسەت هونەرە.

پەیوەندی دەسەڵات و سیاسەت زۆر شاراوە و نادیارترە. لەوانەیە دەسەڵات لە دەوڵەت زیاتر واتای نکوڵیکردنی سیاسەت بێت. هەموو کاتێك لە دەوڵەت زیاتر، دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا جێگیرە. ئەمەش گوزارشت لەو راستییە دەکات کە ئەنجامدانی سیاسەت لەناو کۆمەڵگادا چەندە

سەخت و سنووردارە. لە دەرەنجامدا بەردەوام پەیوەندی نێوان سیاسەت و دەسەڵات گرژە و بە چالاکییەوە گوزەر دەکات.

جگە لە هەڵوێستێکی بەرجەستە و کۆنکرێتی تر سەبارەت بە بابەتەکە هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە. چونکە پراکتیزە نەکرێت سیاسەت واتای نامێنێت. هەوڵی شیکارکردنی چەندین بابەتی پەیوەندیدار بە کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیماندا. هەر چەندە هەوڵی دووبارە نەکردنەوەی رادەبەدەر دەدەین، بەڵام دیسان ناچار دەبین. هەروەك لە ئەخلاقیشدا بینرا، کۆمەڵگاش دیاردەیەك یان سروشتێکی سیاسییە. وەك مەزەندە دەکرێت ئەمە بە واتای کارە فەرمییەکانی دەوڵەت نا، بە سیفەتی سروشتی کۆمەڵایەتی سیاسییە. ئەگەر رۆڵی ئەخلاق بە باشترین شێوە ئەنجامدانی کارە ژیانییەکانە، رۆڵی سیاسەتیش دۆزینەوەی باشترین کارە. ئەگەر سەرنج بدرێت دەبینرێت کە سیاسەت (پۆلیتیکا) هەم رەهەندی ئەخلاقی لە خۆوە دەگرێت، هەم لەوەش زیاترە. چونکە دۆزینەوەی کاری باش ئاسان نییە. پێویستی بە ئاگاداری و ئاشناییەکی باشی کارەکان هەیە، پێویستی بە مەعریفە و زانست و دۆزینەوەی کارە، واتە لێتوێژینەوەی پێویستە. کاتێك دەستەواژەی چاك یان باش کەوتە ناو مەسەلەکەوە، ئەوا پێویستی بە زانین و ناسینی ئەخلاقیش دەکات. وەك دەبینرێت سیاسەت هونەرێکی زۆر زەحمەتە. یەکێك لە بەهەڵەداچوونە گەورەکانی تێی کەوتوون: ئەوەیە کە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ زاراوە قەبارە زلەکانی لە جۆری دەوڵەت، ئیمپراتۆریەت، خانەدان، نەتەوە، کۆمپانیا و چین بیر لە سیاسەت دەکرێتەوە. بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەمجۆرە دیاردە و زاراوانە بیرکردنەوە لە سیاسەت دەشێت بێواتای بکات. سیاسەت (پۆلیتیکا)ی راستەقینە لە پێناسەکەیدا شاراوەیە. جگە لە زاراوەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی هیچ دەستەواژەیەکی دیکە ناتوانێت بەرژەوەندییە ژیانییەکانی کۆمەڵگا روون بکاتەوە. لە دۆخێکی وەهادا لە بنەڕەتدا سیاسەت بە واتای چالاکییەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی دێت کە لەپێناو بەردەوامکردنی ماهییەت یاخود هەبوونی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە ژێر هەر هەلومەرجێکدا ئەنجام دەدرێت.

کاتێك دەڵێین کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی باسی بەر لەمێژوو ناکەین. باس لە دۆخی ئاسایی سروشتی کۆمەڵگا دەکەین کە بەردەوام دەژی و تاکۆتایی بە هەبوونەکەی نەیەت، هەر بەردەوام دەبێت. چەندە دووچاری سووان، پووکانەوە و پارچەبوون بێت، بەڵام کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی هەر بەردەوام دەبێت. تا سروشتی کۆمەڵایەتی بوونی هەبێت ئەویش هەبوونی دەبێت. هەرچی رۆڵی سیاسەت زیاتر ئازادکردن، یەکسانی و دیموکراتیزەکردنی ئەم هەبوونەیە بەبێ

ئەوەی ڕێگا بە سووان، پووکانەوە و پارچەبوونی بدات. هەر کۆمەڵگایەکی سیاسی و ئەخلاقی کەلەم ڕەوشەدا دەژیت، واتە باشترین کۆمەڵگایە، بە واتای گەیشتن بە کۆمەڵگای نامانجکرلو دێت.

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باشتر دەرك بە ناوەڕۆکی زاراوەکە بکرێت پێویستە جارێکی دیکە بۆ مێژوو بگەڕێینەوە. بۆ ئەم کارەش دیسان شارستانی دەبێتە زاراوەی سەرەکیمان. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی دەسەڵات و دەوڵەت لەخۆوە دەگرێت، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چەندە تۆڕەکانی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی کە لە چوارچێوەی چینایەتی و شارگەراییدا لەسەر حیسابی کۆمەڵگا بەرفراوان و قووڵدەبنەوە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی گەمارۆ بدەن، ڕۆڵی سیاسەت تەسك دەبێتەوە. تەسکبوونەوەی ڕۆڵی سیاسەتیش دواکەوتنی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگا یان نکوڵیکردنی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. مێژووی شارستانی پڕ لە بوویەری لەمجۆرەیە. بەپێی بەسەرچوونی کات زیاتر بە کۆیلەکردن، بەندایەتی و پرۆلیتارکردنی کۆمەلگا حوکمکراوەکان، لەدەرەوە بۆ قۆناخی سەرکەوتکردن و کۆلۆنیکردنی کۆمەڵگا ئازاد، یەکسان و دیموکراتەکان دەگۆڕا و بەردەوام دەبوو. چونکە یاسای زۆرترین قازانجی پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات پێویستی بەمەیە. لەم ڕەوشەدا سیاسەت وەك بەرخودانی یەکینەکانی شارستانێتی دیموکراتی واتادار دەبێت. چونکە وەك چۆن بەبێ بەرخودان هەنگاوێکی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبوون بەدینایەت، لە هەمانکاتدا کۆلۆنیکردن، سووان، پارچەکردن و پووکانەوەی ئاستی سیاسی و ئەخلاقی بەربەست ناکرێت. ڕێگیری لە چەوسێنەری پاوانەکان ناکرێت. پێناسەکردنی سیاسەت وەك هونەری ئازادی بۆ ئەم ڕۆڵەی دەگەڕێتەوە کە لەمێژوودا بینیویەتی. هەر چین، شار، گەل، قەبیلە، گرووپی ئایینی و قەوم ـ نەتەوەیەکی سیاسەت ناکات یاخود ڕێگیری لێ بکرێت، واتە گەورەترین زەبر بەر هێزی گوتە و ئیرادەی کەوتووە. ئەو شوێنەی گوتە و ئیرادەی هاوبەشی لێنەبێت، تەنیا بێدەنگی مردنی تێدا زاڵە.

ئەسینا و ڕۆمای چاخی کۆن ناووبانگی خۆیان لە هێزە سیاسییەکەیان وەردەگرت. سەرباری تەولوی سنووردارێبوونەکەیان ئەگەر تا ئێستاکەش ڕۆمای کۆمار و دیموکراسییەتی ئەسینا جێگای سەرسوڕمانن، هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەشێوەیەکی ژیرانە سیاسەتی شاریان بەڕێوەبردووە. وەك چۆن ئەسینا لەڕێگای سیاسەتی شارەوە ئیمپراتۆریەتە زەبەلاحەکەی پارسی بەربەست کردووە و شکستەکەشی ئامادە کردووە، ڕۆماش لەمیانەی سیاسەتە کۆمارییەکەی توانیویەتی ببێتە ناوەندی جیهان. لەوەش گرنگتر سیاسەتمەدارانی هەردوو شاریش ڕۆڵێکی دیاریکەریان لە پێشخستنی کلتووری گریگ ـ ڕۆمادا بینیوە.

نموونەی بابل سەرنج ڕاکێش و بەکاریگەرترە. دەشێت وەك گەورەترین نموونەی سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی شار پێشکەش بکرێت. بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر حوکمڕانی هێزی دەسەلات و دەوڵەتە بەهێزەکانی دەوروبەری،تەواوی پسپۆڕی و ژیری سیاسەتی سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی پیشاندلوە. لەڕێگای ئەم سیاسەتە شارەزایانەوە توانیویانە بەرامبەر بە سەرجەم ئیمپراتۆریەتە بەناوبانگەکانی ئاشوورییەکان تا هیتیتەکان، کاشییەکان تا میتانییەکان، لە پارسەکانەوە تا دەگاتە ئەسکەندەر لەسەردەمی خۆی لەسەر پێیان بمێننەوە. لەڕێگای ئەو زانست، هونەر و پیشەسازییەی پەرەی پێداوە توانیویەتی ببێتە درێژخایەنترین ناوەندی سەرنجڕاکێشی شارستانی (٢٠٠٠ پ.ز تا زایین). بێگومان سیاسەتی شار ڕۆڵێکی بەرچاوی لەمەدا هەبوو. ئاشکرایە کە ئەمەش لە سەرووی ئەو نموونانەوە دێت کە بەڵگەی سەلمێنەری ڕاستی سیاسەت ئازادی و داهێنانە. هەروەها دەتوانین تەدمور و قەرتاجەش لە چوارچێوەی ئەم نموونانەدا بژمێرین. وەك چۆن بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەمیانەی سیاسەتی بەرخودانەوە قەرتاجە توانی بەرامبەر هەژموونگەرایی ڕۆما لەسەر پێیان بمێنێتەوە، هەروەها پێشکەوتنە ئافرێنەرەکەشی بەردەوام بووە. بەڵام کەی ئەویش وەك ڕۆما دووچاری ئەشقی ئیمپراتۆرییەت بوو، ئەو کاتە لە دۆڕان ڕزگاری نەبوو، چونکە بوون بە ئیمپراتۆرییەت پێچەوانەی سیاسەتی بەرخودانە. تەنانەت نکوڵیکردنە لە سیاسەت. ئەنجامیش دۆڕانێکی تراژیدیانەیە. تەدمور (پاڵیمێرا)ش بە قۆناخێکی هاوشێوەدا تێپەڕیوە. لەوانەیە دوای بابل لە ناوچەکەدا زیاترین هەڵکشانی بەخۆوە دیوە و بۆ درێژترین ماوە توانیویەتی سەربەخۆ و ئۆتۆنۆم بمێنێتەوە (٣٠٠ پ.ز - ٢٧٠ زایینی)، پاڵیمێرای بەناوبانگ کە بە هەشتێکی لە بیابان خوڵقاندبوو کەی دەستبەرداری سیاسەتەکانی هاوسەنگی و ئۆتۆنۆمی بوو، هەوڵیدا ئیتر خۆی ببێت بە ئیمپراتۆریەت (لە قۆناخی شاژنی بەناوبانگ زەنۆبیا، ساڵانی ٢٧٠ زایینی) لە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆتاییەکی تراژیدیانە ڕزگاری نەبووە. تراژیدیای تەدموریش یەکێك لەو نموونانەی پێشکەش کردووە کە بەرخودان لەپێناو ئازادی سەرکەوتن بەدەست دێنێت، بەڵام دەسەڵاتگەرێتی کارەساتی لێدەکەوێتەوە.

لەچاخی ناوین زیاتر دەرفەتی سیاسەتە ئۆتۆنۆمیخوازەکانی شار هەیە. وەك بڵێی ڕووبەڕووی جیهانی ئەستێرەی ئەو شارانەین کە بەرامبەر ئیمپراتۆرییەتە گەورەکان بەرخودان دەکەن. لە ئیمپراتیۆریەتە ئیسلامییەکانەوە (ئەمەوی، عەباسی، سەلجۆقی، تەیمور، بابور، عوسمانی) تا ئیمپراتۆریەتی جەنگیز، لە ئیمپراتۆریەتە کرستیانییەکان ( بیزەنت، ئیسپانیا، نەمسا، ڕوسیای قەیسەری، بەریتانیا)وە تادەگاتە ئیمپراتۆرییەتی چین، بە سەدان شار (لە زەریای مەزن تا

زەریای ئەتڵەسی، تاکو کیشوەری ئەمریکا، لە بیابانی گەورەوە تا دەگاتە سیبریا) لە ژێرناوی سیاسەتی ئۆتۆنۆمیخوازی بەرامبەر ئەم ئیمپراتۆریەتانە بەرخودانیان کردووە و تەنانەت لە کاتی پێویستیشدا لەم پێناوەدا لە مێژوودا سڕاونەتەوە. نموونەیەکی دیکەی هاوشێوەی قەرتاجە شاری ئۆتراره[٤] کە بەرامبەر جەنگیزخان بەرخودانی کرد، ئەویش لەگەڵ زەوی تەختکرا. هەروەها دەتوانین سەدان نموونەی بەرخودانی شارەکانی ئەورووپا بەرامبەر هێزەکانی ئیمپراتۆرییەت و ناوندەگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە پێشکەش بکەین. بەتایبەتی شارەکانی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا کە لەپێناو بەرگریکردن لە بوونیادە ئۆتۆنۆمەکانیان تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەرخودانێکی مەزنیان ئەنجامداوە. ڤێنسیا و ئەمستردام نموونە بەناوبانگەکانی ئەمانەن.

بەڵام لە هەر لایەکەوە سەرکەوتنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەدەی نۆزدەهەمدا، زەبرێکی کوشندە بوو بەر ئۆتۆنۆمی شار کەوت کە هەزاران ساڵ لەمێژوودا بەردەوام بوو. بەڵام لەڕێگای پۆست مۆدێرنیتەوە دیسان ئۆتۆنۆمییەکانی شار بەربڵاو دەبێت. سیاسەتمەدارێتی شار دەردەکەوێتە پێش.

جگە لە سیاسەتمەدارێتی شار لە مێژوودا بەرخودانی بێ ژمارەی هۆز، خێڵ، گرووپی ئایینی و قوتابخانەی فەلسەفی .. هتد بەرامبەر هێزەکانی شارستانی و لەپێناو گەیشتن بە ئاستی هێزێکی نیمچە سەربەخۆ (ئۆتۆنۆم) جێگای باس بووە. لەوانەیە چیرۆکی ئۆتۆنۆمی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵە (١٦٠٠ پ.ز ـ تا بە ڕۆژی ئەمڕۆمان)ی قەبیلەی یەهوودی بەناوبانگترین نموونە بێت. سیاسەتی ئۆتۆنۆمیخوازی قەبیلەی عیبرانی ڕۆڵێکی دیاریکەری هەبووە لەوەی یەهوودییەکان لە مێژوو زیاتریش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆر دەوڵەمەند و ئافرێنەربن. کاتێك ئایینی ئیسلامیش کراوەتە ئامرازی ئیمپراتۆرییەت و دەسەڵات، مەزهەبی گەورەی بەرخودان سەریهەڵداوە. مەزهەبەکانی عەلەوی و خەواریجەکان سیاسەتی ژیانی ئۆتۆنۆمی قەبیلە و خێڵەکان پیشان دەدات. دەرکەوتنی مەزهەبە ڕکابەرە بەربڵاوەکانی ناو هەر قەومێك دژ بە نەریتی سوڵتانێتی و حوکمڕانێتی سوننی، لە ناوەڕۆکی خۆیدا ئەنجامی سیاسەتی بەرخودان و ئازادیخوازی خەڵکانی هۆز و خێڵەکانە. بەجۆرێك لە جۆرەکان یەکەمین بزووتنەوەی سەربەخۆیی و ئازادی گەلانە بەرامبەر بە داگیرکاری ئیسلامی سوننی. لە ئایینی کرستیانی و موسەویشدا چەندین مەزهەبی بەرخودانی هاوشێوە هەیە. سەرتاسەری چاخی ناوین پڕ بە تێکۆشانی ئەمجۆرە گروپە خۆجێیی،

---

[٤] شاری ئۆترار (Otrar): شوێنی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی ناوچەی فارابی باشووری کازاخستان بووە. جەنگیزخان وێرانیکردبووە.

شار، هۆز و ئایینیانە گوزەری کردووە کە لە پێناو سیاسەتی ئازادی و ئۆتۆنۆمیخوازی ئەنجامیانداوە. ژیانی بەرخودانی نیوە نهێنی سێ سەد ساڵەی یەکەمین گروپە کرستیانیەکان لە مانستەر، ڕۆڵی سەرەکی لە ئامادەکردنی شارستانی هاوچەرخدا بینیوە. هەروەها سیاسەتە ئۆتۆنۆمەکانی قوتابخانە فەلسەفییەکانی یۆنانی چاخی کۆن ڕۆڵی سەرەکی ئامادەکردنی زانستیان بینیوە. ئەو گەل و نەتەوانەی بە ڕۆژی ئەمڕۆمان گەیشتوون لەم ڕاستیەدا هەرە زێدە قەرزداری باپیرەی ئەو هۆز و خێڵانەن کە سەدان تەنانەت هەزاران ساڵ لە لوتکەی شاخەکان و ناوەڕاستی بیابانەکاندا بەرخودانیان کردووە.

بزووتنەوەکانی ڕزگاری نیشتیمانی سەردەمی مۆدێرنیش بەردەوامی ئەم نەریتانەن. هەر چەندە بە شێوەی دەوڵەتی سەربەخۆ چەواشە کرابێت، بەڵام ئەو ئامانجەی هەموویان لەپێناویدا تێدەکۆشان سەربەخۆیی سیاسییە. هەرچەندە لیبرالیزم سەربەخۆیی سیاسی بۆ سەربەخۆییەکی ساختەی دەوڵەت ـ نەتەوە گۆڕیوە و ئەمەش ڕۆڵی ڕاستەقینەی سیاسەت بەربەست بکات، بەڵام دیسان بەواتای بەردەوامکردنی نەریتێکی گرنگی بەرخودانی سیاسی دێت.

بەدرێژایی مێژوو سیاسەتی نیمچە سەربەخۆی (ئۆتۆنۆمی) خۆجێیی و هەرێمی هەبووە و ڕۆڵێکی گرنگیان لە بەردەوامبوونی هەبوونی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیدا بینیوە. ئەو گەل و نەتەوانەی لە ئۆخی کۆمەڵگای قەبیلە، خێڵ، گوند و شاردا ژیاون لە جوگرافیایەکی زۆر فراوانی سەر ڕووی زەوی لەسەرووی هەموویشیانەوە لە ناوچە شاخاوی، بیابان و دارستانەکاندا بەردەوام لەمیانەی سیاسەتەکانی سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمییەوە بەرخودانیان بەرامبەر هێزەکانی شارستانی پیشانداوە. بەهۆی ئەم فاکتەرەیە کە دەڵێین" نەریتی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی لە مێژوودا قوورساییەکەی زیاترە. هەر بۆیە دەڵێین" بەدرێژایی مێژووی شارستانی مەیلی زاڵ بەرخودانە نەك ملکەچکردن. ئەگەر وەها نەبووایە دونیا وەك میسری فیرعەونەکان دەبوو. تا دەرك بەم خاڵە نەکرێت کە شوێنێکی ـ خۆجێیی، هەرێمی ـ مرۆڤ نییە بەرخودانی لێ نەبووبێت، ناتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و تەندروستانە مێژوو راڤە و شرۆڤە بکەین. ئەگەر ئەمڕۆ گەلانی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین بە سەرجەم ڕەنگ و کلتوورەکانیەوە بەرخودان دەکەن، ئەمە بەو واتایە دێت کە مێژووەکەشیان بەمجۆرەیە. چونکە مێژوو "ئێستایە".

مرۆڤایەتی تەنیا لەمیانەی ئەنجامدانی بەرخودانی سیاسی لەئاستی کۆمەڵگا و ناوچەی جوگرافی هەبوون و کەرامەتی خۆی نەپاراستووە، لە هەمانکاتدا ئاشنای کەسایەتی سیاسی بەرخودانکاری وەها بووە کە لە ئاستی تاکدا قورساییەکەی هێندەی نەتەوەیەك بووە. مێژوو پڕ

لەمجۆرە نموونانەیە. لە بودلوە تا سوقرات، لە زەردەشتەوە تا کۆنفۆشیۆس، هەروەها زنجیرەی ئەو پێغەمبەرانەی لە پەرتووکی پیرۆزدا ژمارەیان لە ١٢٠ هەزار زیاترە و بە حەزرەتی ئادەم دەست پێدەکات، تا نووح و ئەیوب[٥]، حەزرەتی ئیبراهیم و موسا، لەعیساوە تا دەگاتە حەزرەتی محەمەد، لە خوداوەندە ژن ئیناناوە تا حەزرەتی عایشە[٦]، لە زەنۆبیاوە تا هیپاتیا[٧]، لە کیبەلەوە[٨] تا دەگاتە مەریەم، لە ژنە جادوگەرەکانەوە تا رۆزا، لەبرۆنۆ تا دەگاتە ئاراسموس چەندین مرۆڤی لەژمار نەهاتوو، لەپێناو ئازادی و سەرفرازی تا مردن بەرخودانیان کردووە. ئەگەر تا رۆژی ئەمڕۆمان کۆمەڵگا بەشێوەی ئەخلاقی و سیاسی دەژی، ئیارە کە لە زۆر بەهادا قەرزداری ئەم تاکانەیە. لەدۆخێکی پێچەوانەدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ مێگەلی کۆیلەکاندا نەدەبوو.

بێگومان راڤەکردنی سیاسەت لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر گرنگترە. بەڵام تا ئەم خاڵە دەستنیشان نەکەین کە بەشێوەیەکی قورس مێژوو لە رۆژی ئەمڕۆشماندا بەردەوامە ناتوانین سیاسەت راڤە بکەین. بە سووربوونەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەین، ئەوەی شارستانی سەبارەت بە تەسککردنەوەی سیاسەت کردوویەتی، مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەزار هێندە درێژەی پێداوە. ئەگەر شیکارەکانمان دەرهەق بە دەوڵەت ـ نەتەوە بیربێنینەوە، لەوێدا جەختم لەسەر ئەوە کردبوویەوە کە کۆمەڵگای مۆدێرن تەنیا لە سەرەوە لە ژێر باڵادەستی دەوڵەتدا نییە، بەڵکو تا سەرجەم شانەکانی ژیانی بۆ کۆڵۆنی، داگیرکاری و کاریگەری دامەزراو و ئامێرەکانی دەسەڵات

---

[٥] ئەیوب: ئەیوبی کوڕی موسا، کوڕی رازخ کوڕی عەیس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم خەلیلە. بە گوێرەی باوەڕی ئیسلامیش، پێغەمبەرێکە خودا بۆ ئادومیەکانی رەوانە کردووە، هەروەها یەکێك لە پادشاکانی ئادومە. ئەیوب پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و چەند کوڕێکیشی هەبووە. خودا تاقیکردۆتەوە، تەواوی سامان و منداڵەکانی لێ سەندۆتەوە، دووچاری دەردی هەمەجۆری کردووە، تەنیا دڵ و زمانی بە ساغی ماوەتەوە، جگە لە خێزانەکەی کەس هاتوچۆی نەکردووە، چەندە رەوشی سەخت بووە باوەڕییەکەی بەهێزتر بووە، لە دواییدا خودا شیفای بۆ ناردووە.

[٦] عائیشە: عائیشەی کچی ئەبوبەکرە، یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەرە، لە تەمەنی نۆ ساڵی شووی بە پێغەمبەر کردووە.لای سوننەکان یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر.

[٧] هیپاتیا (Hypatia): کچی فەیلەسوف سیۆن ئەلکساندرۆسە، زانای بیرکاری و لۆژیك و فەلەك بووە، لەساڵانی (٣٨٠–٣١٥) دا ژیاوە. بە بەرگریکردنی لە فەلسەفە و پرسیارکردن، هەروەها رکابەرایەتیکردنی بەرامبەر باوەڕی ئەبستراکت ناسراوە. مامۆستای زانستە فەلسەفیەکان بووە، بە تایبەتیش فەلسەفەی ئەفلاتوون. گرنگترین کۆمەکی لە بواری زانستدا: پێوەری هایدرۆمەتری داهێناوە کە چڕی و لینجی شلەمەنیەکان دەپێوێت.

[٨] کیبەلە یان قیبەلە (Cybele):خوداوەندە ژنێکی گەلانی ئاسیای بچووکە، لەلایەن زۆربەی گەلانی ناوچەکە پەرستراوە. رۆمانییەکان بە دایکە خوداوەندی شکۆمەند ئەیدیانیە ناویان بردووە. ناوەندی پەرستنی لە فریگیا چڕبۆتەوە، لە سەرەتاکانی سەدەی شەشەم گەیشتۆتە یۆنانیش، بەڵام تێیدا بڵاو نەبوویەوە. لە ساڵی ٢٠٤ پ.ز گەیشتۆتە رۆما و گرنگیەکی زۆری پێدراوە. دواترین خوداوەندە ژنە کە عیبادەتی بۆ کراوە.

كراوەیە. دەرككردن بەم خاڵە گرنگە، لە ئاستی جیهانگیریدا كۆمەڵگا لەمیانەی ئەم راستینەیەوە گەمارۆ دراوە، فەتح و داگیركراوە. لێرەدا تەنیا بە وەبیرهێنانەوەی چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی هەژموونی كلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی دەوەستم. ئەمە رەوشێكی نوێیە. ئەگەر ناوی بنێین سوپەر هەژموونی جیهانگیری، یان ئیمپراتۆرییەت یاخود سیستەمی UN هیچ گۆڕانكارییەك لە ناوەرۆكدا ناكات. هەروەها جەختمان لەسەر ئەو خاڵەش كردبوویەوە كە سەرمایەی فینانس مۆركی خۆی لە هەژموونگەرایی جیهانگیری داوە و لە هەمانكاتدا قەیرانێكی جیهانگیری سیستەماتیك و بوونیادی هەمیشەیی لە ئارادایە.

كاتێك دەپرسین لە ژێر ئەم هەلومەرجەدا چی لە كۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی مایەوە، ناچارین لێپرسینەوە لەو بارەیەوە بكەین كە ئایا سیاسەت هێزی رۆڵ بینینی هەیە یان نا. كاتێك تەماشای ئەم تابلۆیە دەكەین دەبینین زۆرجار تووچاری رەوشێكی نەرێنی و بێ هیوایی هاتوون. تەواو لەو خاڵەدا لە لێپرسینەوەی سیاسی قووڵی رەوشەكە تێدەگەین كە دۆخی نەرێنی و هیوا شكێنی نەك تەنیا نابەجێیە بەڵكو بێ واتاشە. وەك لای هەمووان ئاشكرایە مەیل و شەپۆڵەكان (حەقیقەتە گەردوونییە رەهاكان) خاڵی گەورەترین و بچووكترینیان هەیە. تەواوی نیشانە و پێودانگەكان پیشانی دەدەن كە دۆخی ئێستای دەسەڵاتی شارستانی و مۆدێرنیتە لە مێژە لە گەورەترین (Maximum) دوە لە دابەزینندایە. ئەو دەسەڵاتەی لەناو كۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە وەك ئەو شەپۆلەی قورسایی نەماوە ئەویش هێزی خۆی لەدەست دەدات. وەك چۆن كاتێك تاشە بەردێك لە لوتكەوە دەكەوێتە خوارەوە پارچە پارچە دەبێت و بارستاییەكەی خۆی لە دەست دەدات، ئەوا بەو رادەیەش دەسەڵات قورسایی خۆی لەدەست داوە كە تا ناو شانەكانی كۆمەڵگا رۆچووە و پارچە بووە.

دەشێت واتای كۆمەڵناسی ئەم واقیعە شیكار بكرێت. كاتێك دەسەڵات لەناو تەواوی یەكینە و تاكەكانی كۆمەڵگادا چەندە بڵاوبێتەوە، بەهەمان رادە لەلایەن یەكینە و تاكەكانەوە رووبەرووی بەرخودان دەبێتەوە. وەك پێویستییەكی دیالیكتیكی لە هەر یەكینە و تاكێكی دەسەڵات تێیدا بڵاو بێتەوە بەرخودان دەئافرێنێت. چونكە كاتێك بە شێوەی فشار، چەوسانەوە و ئەشكەنجە بەسەر هەر یەكینە و تاكێكدا دەسەپێنرێت، ئەوا نەبوونی بەرگری و بەرەنگاربوونەوە پێچەوانەی راستینەی ئاراستەی گەردوونی سروشتە. راستی دەسەڵاتی مۆدێرن لە راستی دەسەڵاتی سەردەمێكی دیكە جیاوازترە. پاوانەكانی سەرمایەداری، تۆڕەكانی سەرمایەداری سەر تەواوی ئابووری جیهان لە ئاستێكدا پەلهاوێشتنی خۆی تەولو كردووە كە زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت،

تاکە قوژبنێکیش نەماوە تێیدا بڵاو بێتەوە. هەروەها ئەگەر قەیرانی ئیکۆلۆژیش بژمێرین، ئەوا لە قوولاییدا تاکە خێزان و کلانێکیش نەماوە پێی نەگەیشتبێت. ئەنجامی یاسا سەرمایەدارییەکانی ئیندوستریالیزم ئەو کاولکارییەی لە بوونیادی ناوەوەی کۆمەڵگا و ژینگەدا خولقاندوویەتی بە ئاستی کارەساتی گەیاندووە. دەوڵەت ـ نەتەوە وەك بە تواناترین هێزی ئیلاهی مێژوو تاکە هاوولاتییەکیش نەماوە کە دزەی بۆنەکردبێت و هەژموونگەرایی خۆی بەسەردا ئاوا نەکردبێت. قۆناخێکی دیکەی بەمجۆرە لە مێژوودا نییە. کاتێك ئەنتۆنی گیدنس باسی بێ هاوتایی دەکات لەم خاڵەدا لەسەر هەقە.

بەرامبەر بەم واقیعەی دەسەلات (سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم، دەوڵەت ـ نەتەوە) وەك جەمسەرێکی بەرامبەر سیاسەتیش ناچاربوو جیاوازییەك بەخۆیەوە ببینێت کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت. بەگوێرەی ئەوەی قۆناخی بەر لە شارستانی و دواتری نەژیاوین ئەوا بوونیادی سیاسەتی تایبەت بە مۆدێرنیتەش ناچارە جیاواز بێت. ئەگەر بە کورتی فۆرمێلەی بکەین" بەگوێرەی ئەوەی تۆڕەکانی دەسەلات لە هەر شوێنێکن، سیاسەتیش ناچارە لە هەر شوێنێك هەبێت. هەروەها بەگوێرەی ئەوەی دەسەلات بە هەر یەکینە و تاکێك دەگات، ئەوا سیاسەتیش ناچارە بە هەر تاك و یەکینەیەك بگات.

پێویستی ئاولکردن و پەلهاوێشتنی تۆڕەکانی سیاسەت بەجۆرێك لە ناو تەواوی کۆمەڵگا وەلامی تۆڕەکانی دەسەلات بداتەوە خاڵێکی مایەی تێگەیشتنە. ئاشکرایە لە میانەی بوونیادی رێکخستنە کۆنەکانەوە وەلامی ئەمە نادرێتەوە. چونکە مۆدێلە کۆنەکانی رێکخستن لە تەوەرەی دەوڵەتدا بوو. بەر لە هەموو شتێك سیاسەت وەك بەرەنگاربوونەوەیەك بەرامبەر بە دەسەلات دەست پێدەکات. بەگوێرەی ئەوەی دەسەلات هەوڵی فەتحکردن و دلگیرکردنی هەر یەکینە و تاکێك دەدات کە کرنوویەتی بە ئامانجی خۆی، سیاسەتیش هەوڵی رلکێشان و ئازادکردنی هەر یەکینە و تاکێك دەدات. هەر پەیوەندییەکی یەکینەیی بێت یان تاکەکەسی بەگوێرەی ئەوەی دەسەلاتدارێتییە، بە واتای رکابەریش سیاسییە. هەروەها بەگوێرەی ئەوەی دەسەلات ئایدیۆلۆژیای لیبرال، ئیندوستریالیزم، سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوەی ئافراندووە، سیاسەتیش ناچارە ئایدیۆلۆژیای ئازادی، پیشەسازی ـ ئیکۆلۆژی، کۆمەڵگای کۆمینال و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی بەرهەم بهێنێت و بوونیادیان بنێت. وەك چۆن دەسەلات لە ئاستی هەر تاکێك، یەکینە، شار، گوند، خۆجێیی، هەرێمی، نەتەوەیی، کیشوەری و جیهانی خۆی رێکخستووە، سیاسەتیش ناچارە لە ئاستی تاکە کەس، یەکینە، شار، خۆجێیی، ناوچەیی، نەتەوەیی، کیشوەری و

جیهانگیری خۆی ڕێکبخات. بەگوێرەی ئەوەی دەسەڵات لە تەواوی ئەم ئاستانەدا پڕوپاگەندە و هەموو جۆرە شێوەیەکی چالاکی (شەڕیش لەناودا) دەسەپێنێت، سیاسەتیش ناچارە پڕوپاگەندە و شێوەکانی چالاکی لەم ئاستانەدا بسەپێنێت.

تا بەشێوەیەکی ڕاست ئەم ڕاستیانەی دەسەڵات نەناسرێت کە لەمیانەی هێڵە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەوە هەوڵی پێناسەکردنیمان دا، ناتوانین بەشێوەیەکی ڕاست و تەندروستانە کار لەسەر هیچ ئەرکێکی سیاسی بکەین. با ئەزموونی سۆڤێت و تەنانەت قۆناخەکانی پێشتری ریال سۆسیالیزم بێنینەوە یادی خۆمان. سەندیکالیزمی کرێکاران (سوالکەری کرێ) بەرامبەر بە سەرمایەداری، ئیندوستریالیزمێکی پێشکەوتووتر بەرامبەر بە ئیندوستریالیزم، دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ناوەندیتر بەرامبەر بە ناوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوە جێگای باسە. بە کورتی لە ئەنجامی دەسەڵات بەرامبەر بە دەسەڵات، ئاگر بەرامبەر ئاگر، دیکتاتۆریەت بەرامبەر بە دیکتاتۆرییەت، سەرمایەداری دەوڵەت بەرامبەر سەرمایەداری تایبەت لەناوەوە لە ژێر باری قورسی دامەزراو و ئامێرەکانی دەسەڵات داتەپیوە. لەم ڕێگایەوە مەزهەبی ریال سۆسیالیست (سەرمایەداری چەپ) تەنیا سیاسەتی بەرامبەر دەسەڵات پەیڕەو نەکرد، بەڵکو دەسەڵاتی بەرامبەر بە سیاسەتیش بەکارهێنا. بۆ بینینی ئەمە خوێندنەوەی مێژووی پارتەکانیان بەسە. مەزهەبی سۆسیال دیموکرات (سەرمایەداری هێڵی ناوین)یش لەڕێگای ریفۆرمیزەکردنی دەسەڵاتەوە کردی بە هەمیشەیی، خوێندنەوەی مێژووی نموونەی پارتەکانی ئەوروپا بۆ ئەمە بەسە. هەرچی مەزهەبی بزووتنەوەکانی ڕزگاری نیشتیمانی ( سەرمایەداری ڕاستڕەو)یە یەکسەر بوون بە دەوڵەت ـ نەتەوە و ڕۆڵی سەرەکییان لە بڵاوبوونەوەی سەرمایەداری لە جیهاندا بینی. ڕکابەرەکانی ئیکەی سیستەمم شرۆڤە کردبوو کە لە دەرەوەی ئەم دوو مەزهەبە دەمێننەوە. بە هەندترین کەموکوڕی و ناتەواوییان یان لەبەرامبەر دەسەڵات خۆیان بە بەشێکی دەسەڵات (دەوڵەت ـ نەتەوە) گرتووە، یان بەشێوەی دژایەتی سەرتاسەری دەسەڵات مەیدانیان خاڵی کردووە (بەتایبەتی ئەنارشیستەکان)، یان لەڕێگای ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دەخەڵەتێنرێن. لە هیچ یەکێکیاندا بەهرەی تێگەیشتنی سیستەماتیکی دەسەڵات و پێشخستنی سیاسەتێکی ئەڵتەرناتیف بوونی نییە و هەست بە پێویستیەکەیشی ناکەن. لەکاتێکدا سیاسەت بۆ ئامراز و مەقاشە جیاوازەکانی دەسەڵات بەجێ دێڵن، ئاگادارنین بە نزایەك دەڵێن ئامین کە هیچ بوونی نییە. ئەوەی دەمێنێتەوە مەزادکاری و دەلالێتی قەیرانی سەرمایەداری و جیهانگیرییە، ئاشکرایە کە ئەمەش نەبۆتە دەرمانی هیچ دەردێك و ناشبێت.

زمانی تازەگەری دیموکراتی سیاسییە. تەواوی بوونیادە سیستەماتیکەکەی لەمیانەی هونەری سیاسەتەوە پێکدێنێت و ئاوا دەکات. ماهییەتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی یەکینە سەرەکییەکان سیاسەت دێنێتەوە یاد نەك دەسەڵات. ئەو واقیعەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا تێیدا دەژی، واتا کێشە لە پێشینەکەی بەر لە ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبوون، ژیان و هەبوونە. چونکە هەبوونەکەی لەژێر مەترسیدایە. هێرشە هەمەلایەنەکانی مۆدێرنیتە، بەر لە هەموو شتێك پاراستنی هەبوونەکەی دەردەخاتە پێش. وەڵامی تازەگەری دیموکراتیش بەرامبەر بەم هێرشە بەرخودانە کە بەواتای بەرگری گەوهەری (ڕەوا)دێت. چونکە کۆمەڵگا نەپارێزرێت و بەرگری لێنەکرێت سیاسەت ئەنجام نادرێت. پێویستە دیسان جەختی لەسەر بکەمەوە کە کۆمەڵگا یەکە، ئەویش کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. کێشەی لەپێشینە لە هەلومەرجە پێشکەوتووترەکانی مۆدێرنیتەدا سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگایە، کە تاڕادەیەکی مەزن شارستانی سوواندوویێتی و دووچاری دەستبەسەرداگرتن و داگیرکاری دەوڵەت و دەسەڵات هاتووە. بەرگری گەوهەری و سیاسەتی دیموکراتیك بە یەکەوە ناوەڕۆکی سیاسەتمەداریێتی قۆناخن. کاتێك سیاسەتی دیموکراتیك پەرە بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی دەدات، بەرگری گەوهەریش لەبەرامبەر هێرشەکانی دەسەڵات بۆ سەر هەبوونەکەی، بوونیادە ئازادیخواز، یەکسانیخواز و دیموکراتەکەی دەپارێزێت. باس لەجۆرێکی نوێی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی یان شەڕی کۆمەڵایەتی ناکەین. باس لە بەرگریکردن لە ناسنامە، ئازادییەکەی، یەکسانییە پاڵپشت بە جیاوازییەکان و دیموکراتیزەبوونەکەی دەکەین. بێگومان ئەگەر هێرش نەبێت بەرگریش پێویست ناکات.

شێوەی ژیانی سیاسی مەیلی سەرەکی هێزە ڕکابەرەکانی شارستانی لە مێژوودا کۆنفیدڕاڵە.

سەرجەم یەکینەکانی کۆمەڵگا تەنیا بە مەرجی ڕێزگرتن لە ئۆتۆنۆمیەکانیان پەیوەستبوونی خاو بە یەکترەوە پەسەند دەکەن. تەنیا بەم مەرجەوە ڕەزامەندی خۆیان بەرامبەر هێزە دەوڵەتگەراکان و دەسەڵاتی شارستانی پیشان دەدەن. لەو هەلومەرجانەی ڕەزامەندی جێگای باس نەبێت بەردەوام دۆخی شەڕ لەئارادایە. بەڵام کاتێك ڕەزامەندی جێگای باس بێت ئاشتی بەدیدێت. سیاسەت و کۆنفیدڕالیزمی دیموکراتی ئەو پرەنسیپەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگایە کە دەتوانێت وەڵامی بوونیادی دەوڵەت ـ نەتەوە و دیاردەی دەسەڵاتی سەردەمی مۆدێرن بداتەوە کە تەواوی کۆمەڵگای پێچاوە. لەکاتێکدا سیاسەت وەك سیاسەتی دیموکراتییانە پەیڕەو دەکرێت، تەواوی یەکینە کۆمەڵایەتییەکان وەك هێزێکی فیدراڵ بەشداری پرۆسە و قۆناخی کۆنفیدڕاڵ

دەکەن. ئەم سیستەمە دونیایەکی سیاسی نوێیە. لەکاتێکدا شارستانی و مۆدێرنیتە بەردەوام لە ڕێگای فەرمانەوە حوکمڕانی دەکەن، شارستانێتی و تازەگەری دیموکراتی لەمیانەی گفتوگۆ و ڕێککەوتن و ئەنجامدانی سیاسەتی ڕاستەقینەوە بەڕێوەبەری دەکات. هەرچەندە ڕاستییەکانی مێژوو و ڕۆژگاری ئەمڕۆمان چەواشە و پەردەپۆش بکرێت، پێشکەوتنە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا بە پێشەنگایەتی هونەری سیاسەت بەدیهاتووە. کاتێك لە هەلومەرجی قەیرانی جیهانگیریدا سەرمایەداری لە ڕێگای سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە هەوڵی پاراستنی دەسەڵاتەکەی دەدات، ئەرکی سەرەکی سەرجەم هێزەکانی تازەگەری دیموکراتی وەڵامدانەوەی ئەم قەیرانەیە لەمیانەی پێشخستنی سیستەمی کۆنفیدراڵی دیموکراتیك کە ئامانجی پاراستن و پەرەپێدانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە.

لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوانە دەشێت پرەنسیپە گشتییەکانی ئەرکە سیاسییەکان و هێزەکانی تازەگەری دیموکراتی بەشێوەیەکی کورت لە چوارچێوەی ئەم خاڵانەی خوارەوە پێشکەش بکەین:

١ ـ سروشتی کۆمەڵگا لە بنەڕەتدا پێکهاتە و هەبوونێکی سیاسی و ئەخلاقییە. تا کۆمەڵگاکان درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن، ماهییەتی ئەخلاقی و سیاسییان بەردەوام دەبێت. ئەو کۆمەڵگایانەی ماهییەتی سیاسی و ئەخلاقی خۆیان لەدەست دەدەن مەحکومی پەرتەوازەبوون، پووکانەوە و لەناوچوونن.

٢ ـ بەردەوام گەلاڵەکردنی کۆمەڵگاکان لەژێر شێوەکانی سەرەتایی، کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیستی کە بەردەوام لەسەر هێڵێکی ڕاست بەرەو پێشەوە دەچێت، لەجیاتی ئەوەی کۆمەك بە تێگەیشتنی حەقیقەتەکەیان بکات خزمەت بە چەواشەکردن و پەردەپۆشکردنیان دەکات. ئەمجۆرە ڕوونکردنەوانە بە پڕوپاگەندە بارکراون. ماهییەتی سیاسی و ئەخلاقی کارەکتەری سەرەکی کۆمەڵگایە، وەسفکردن و پێناسەکردنی کۆمەڵگاکان بە گوێرەی ڕادەی ئەم ماهییەتە ڕاستترینیانە. ئەگەر چۆنایەتی دەوڵەت و چین بێت، یان ئاستەکانی پێشکەوتنی کشتوکاڵ و پیشەسازی، دیاردەیەکی کاتین و کارەکتەری بنەڕەتی کۆمەڵگا پێکناهێنن.

٣ ـ کێشەی کۆمەڵگا گرێدراو بە زۆرداری و چەوسانەوەی دەسەڵات سەرهەڵدەدات. چەندە دەسەڵات و چەوسانەوە پەرەبسێنن، کێشەکانی کۆمەڵگاش ئەوەندە پەرەدەسێنن. هەرچی

دەوڵەتی خاوەن بنەمای چینایەتییە کە وەك ئامرازی چارەسەری پێشکەش دەکرێت، لە پاڵ توانا سنووردارەکەی هێزی چارەسەرییان، لە بنەڕەتدا دەبن بە سەرچاوەی کێشەی نوێ.

٤ ـ سیاسەت تەنیا ئامرازی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو ئامرازی سەرەکی کۆمەڵگایە لە دەستنیشانکردن، پاراستن و بەردەوامکردنی بەرژەوەندییە ژیانییەکانیشی. لە پاراستنی کۆمەڵگادا بەرگری گەوهەری پێویستە و بەردەوامکردنی سیاسەتە بە سیفەتی هێزی سەرپایی.

٥ ـ تا شارستانییەکان بە درێژایی مێژوو لەمیانەی حوکمڕانی دەوڵەتەوە هەوڵی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بدەن، ڕۆڵی سیاسەت لە کۆمەڵگادا بەرتەسك دەبێتەوە. تا هەبوونی کۆمەڵگاکان بەردەوام بێت بە بەرخودان وەڵامی ئەم دۆخەی سنووردارببوونی ڕۆڵیان دەدەنەوە. لەژێر ئەم دوو فاکتەرە سەرەکییەدا مێژوو نە تەواو حوکمڕانی شارستانییە، نە بە تەواوی بەڕێوەبەرایەتی سیاسەتی دیموکراتییە. پێکدادانەکانی مێژووش سەرچاوەی خۆیان لە کارەکتەری ناکۆکی ئەم دوو فاکتەرە سەرەکییەوە وەردەگرن.

٦ ـ لە مێژوودا قۆناخەکانی ئاشتی نێوان هێزەکانی شارستانی و هێزەکانی دیموکراتی لەمیانەی دان بە یەکتریدانان و ڕێزگرتن لە ناسنامە و بەرژەوەندی یەکتر بەدیهاتووە. ئەو پێکدادان و ئاگربەستانەی لە پێناو دەسەڵات ئەنجام دەدرێت پەیوەندییان بە ئاشتییەوە نییە.

٧ ـ لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لە ناوەوە و دەرەوە دەسەڵات تەولوی کۆمەڵگا گەمارۆ دەدات و دەیکات بە جۆرێك لە جۆرەکانی کۆلۆنی ناوخۆیی. دەسەڵات و فۆرمی سەرەکی دەوڵەت واتە دەوڵەت ـ نەتەوە، بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵگا لە دۆخی شەڕدان. سیاسەتی بەرخودان سەرچاوەی خۆی لەم واقیعەوە وەردەگرێت.

٨ ـ ئەم دۆخەی شەڕی سەرتاسەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرامبەر بە کۆمەڵگا، ئەلتەرناتیفی تازەگەری دیموکراتی دەکات بە پێویستییەکی بە پەلە و ناچاری. تازەگەری دیموکراتی کە هەبوونی هێزەکانی شارستانێتی دیموکراتییە لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا، نە ساتێکی زێڕینی ڕابردووە، نە یۆتۆپیایەکی سەبارەت بە ئاییندەیە. هەبوون و ڕاوەستەی تەواوی تاك و یەکینەکانی کۆمەڵگایە کە هەبوون و بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریدا ناکۆکە.

٩ ـ تێکۆشانی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی هێزە ڕکابەرەکانی سیستەم یان بەهۆی دیدگای دەسەڵاتەوە یان بەهۆی خاڵیکردنی مەیدانی سیاسی بەبێ چارەیی ماوەتەوە و سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە. سەرباری ئەوەی میراسێکی مێژا و بەهاداریان بەجێهێشتووە، لەڕێگای

زهنییەت و بوونیادە كۆنەكانەوە، نەیتوانیوە ئەڵتەرناتیفێك بەرامبەر خودی مۆدێرنیتە و قەیرانی سیستەماتیكدا ئاوا بكات.

١٠ ـ ئەڵتەرناتیف بوون تەنیا لەمیانەی ئاواكردنی سیستەمی خۆی بەرامبەر هەر سێ كۆڵەكەكەی مۆدێرنیتە سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە، فەراهەم دەبێت. دەشێت كۆمەڵگاگەرایی دیموكراتیك، ئیكۆ ـ پیشەسازی و كۆنفیدڕالیزمی دیموكراتیك، بەناوی تازەگەری دیموكراتی وەك سیستەمێكی ركابەر پێشنیار بكرێت. بە یەكگەیشتنی میراسی شارستانێتی دیموكراتی و ركابەرانی سیستەم لە سیستەمی نوێدا، شانسی سەركەوتنی زیاد دەكات.

١١ ـ كۆنفیدڕالیزمی دیموكراتی شێوەی سیاسی سەرەكی تازەگەری دیموكراتییە و لە كار و خەباتەكانی سەرلەنوێ ئاواكردنەوەدا رۆڵێكی ژیانیی دەبینێت. كۆنفیدڕالیزمی دیموكراتی كە فۆرمی سەرەكی سیاسی تازەگەری دیموكراتییە و بژارێكە لە جیاتی دەوڵەت ـ نەتەوە كە فۆرمی سەرەكی دەوڵەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە و لە ئامرازێكی چارەسەری زیاتر بەردەوام كێشە دەخوڵقێنێت، گونجاوترین ئامرازی سیاسەتی دیموكراتییە كە چارەسەری دەئافرێنێت.

١٢ ـ لە كۆمەڵگا سیاسی و ئەخلاقییەكانی سیاسەتی دیموكراتییانەی تێدا پەسەند و پەیڕەو دەكرێت پەرەسەندنەكانی ئازادی و دیموكراسی و یەكسانی پشتبەستوو بە جیاوازییەكان لە تەندروستانەترین رێگاوە بەدیدێت. ئازادی، یەكسانی و دیموكراتی تەنیا لەمیانەی ئەو هێزەی گفتوگۆ، بڕیار و چالاكی بەدیدێت كە كۆمەڵگا بەهێزی زهنییەت و ویژدانی خۆیەوە ئەنجامی دەدات. لەمیانەی هیچ هێزێكی ئەندازیارێتی كۆمەڵگاوە ئەمە ئەنجام نادرێت.

١٣ ـ كۆنفیدڕالیزمی دیموكراتی بژاری نەتەوەی دیموكراتی وەك ئامرازێكی سەرەكی، چارەسەری بەرامبەر كێشە نەتەوەیی، ئەتنیكی، ئایینی، شار، خۆجێیی و هەرێمییانە پێشكەش دەكات كە سەرچاوەی خۆیان لە مۆدێلی كۆمەڵگای فاشیستی یەك ڕەنگ، هۆمۆژەن و مۆنۆلیتیك وەردەگرن كە مۆدێرنیتە بەدەستی دەوڵەت ـ نەتەوە بەڕێوەیان دەبات. لە نەتەوەی دیموكراتدا هەر راستینەیەكی ئەتنیكی، چەمكی ئایینی، شار، خۆجێیی، ناوچەیی و نەتەوەیی، مافی خۆیەتی بە ناسنامەكەی و بوونیادە فیدراڵییە دیموكراتیەكەی جێگای خۆی تێدا بگرێت.

١٤ ـ كۆنفیدراسیۆنی نەتەوە دیموكراتەكانی جیهان و یەكێتی جیهانگیری نەتەوە دیموكراتەكان ئەڵتەرناتیفی UN ە. هەروەها بەشە كیشوەرییەكان و گۆڕەپانە بەرفراوانەكانی كلتووریش لە ئاستی ژێردا دەتوانن كۆنفیدراسیۆنی نەتەوەی دیموكراتی تایبەت بە خۆیان ئاوا

بکەن. ئەگەر بەشێوەیەکی هەژموونگەرایی رەفتار نەکات دەشێت یەکێتی ئەورووپا بە یەکەم هەنگاوی ئەم ئاراستەیە دابنرێت. دەشێت لەم چوارچێوەیەدا قەڵەمبازەکانی بەرامبەر بەدەسەڵاتی هەژموونگەرایی هەرێمی و جیهانگیری تاووتوێ بکرێت.

١٥ ـ هەروەکو زۆر جار لە مێژوودا لەنێوان هێزەکانی شارستانی و هێزە دیموکراتییەکاندا روویداوە، هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و تازەگەری دیموکراتی دەتوانن لەسەر بنەمای پەسەندکردنی هەبوون و ناسنامەی یەکدی و بەڕێوەبەراتییە ئۆتۆنۆمەکانیان بە یەکەوە لەناو ئاشتیدا بژین. لە ژێر ئەم هەلومەرج و چوارچێوە ئاماژە پێکراوەدا پێکهاتە سیاسیەکانی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتی و پێکهاتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەتوانن لەناوەوە و دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بە یەکەوە لەناو ئاشتیدا بژین.

دەشێت چەسپاندنی پرەنسیپەکانی سەبارەت بە ئەرکە سیاسیەکانی تازەگەری دیموکراتی زیاد یان کەم بکرێن. ئەوەی گرنگە دەستنیشانکرنی بنچینەکانی چوارچێوە و جێبەجێکردنە. لەو بڕوایەدام کە بەمجۆرە ریزکردنی ئەم پرەنسیپانە، ئامانجی پێکاوە. گفتوگۆ و راستیەکانی ئازادی ژیان، ئەنجام دیاری دەکەن.

هەمان خاڵ بۆ ئەو پرەنسیپانەش لە جێگای خۆیدایە کە سەبارەت بە هەر سێ گۆڕەپانە سەرەکییەکەی تازەگەری دیموکراتی هەوڵی چەسپاندنیم دا. پێویستە بە گرنگییەوە ئاماژەی پێ بکەم وەك پرەنسیپ و جێبەجێکردنی خەباتی سەرلەنوێ ئاواکرنەوە نە پرۆژەی کۆمارێکی نوێیە وەك ئەوەی لە شۆڕشی فەرەنسا گفتوگۆیەکی زۆری لە بارەوە کراوە، نە پلانی دەوڵەتی سۆڤێت (شورەویی)ی شۆڕشی روسیایە. تەنانەت پرۆژەی کۆمەڵایەتی حەزرەتی محەمەدی تایبەت بە مەدینەش نییە. تاکە ئەندێشەم و ئەو خاڵەی هەوڵی روونکرنەوەی دەدەم" هەر وەکو زۆرجار لە مێژوودا روویداوە، پەیڕەو و بنچینەکانی پراکتیزەکردنی چارەسەری ئازادی کۆمەڵگا سەبارەت بە شیکاری حەقیقەتی سروشتی کۆمەڵایەتی، رێگا لە پێش بەهەڵەداچوونی قووڵ و دەرەنجامی پەردەپۆشکەر نەکاتەوە.

ئامانج لە سەرلەنوێ ئاواکرنەوە رێکخستنی سەرجەم یەکینە و فاکتەرە کۆمەڵایەتی و تاکەکان و ئاراستەکردنیانە بۆ بواری کردارییەوە، ئەویش لسەر بنەماکانی چەمك (پارادایم) و جێبەجێکرنێکی سیستەماتیك، بە بێ نکوڵیکردن لە میراسی مێژوویی هێزە رکابەرەکانی سیستەم، کە بە هۆی بەرژەوەندیەکانیان پێویستە بەمجۆرە بن، ئەمەش بە بێ ئەوەی بە ئاگایی یان بێ ئاگاییەوە بکەونە ناو تەڵەزگەکانی لیبراڵیزمەوە. دەشێت هەندێکیان وەك شۆڕشگێڕ کار و

خەباتی لەناودا بكەن، هەندێكیش بەدوای ریفۆرمەوە بن. بەڵام گشتی كار و خەباتێكی هێژایە. خودی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش نوێنەرایەتی قەیراناویترین قۆناخی سیستەمی شارستانی دەكات. هەروەها پێگەیشتووترین سەردەمی هەژموونگەرایی جیهانگیری سەرمایەی فینانس، قۆناخە بەردەوامەكەیەتی، واتا قۆناخی قەیرانی بونیادی و سیستەماتیكە. سیستەم بۆ ئەوەی ژیانی سیستەماتیكی بەرنەكەوێت، بەشێوەیەكی رۆژانە بەدوای پرۆژە و كرداری چرەوەیە. لە رێگای ئایدیۆلۆژیایەكی زۆر فراوانی پێكەوە لكێنراو جموجۆڵ دەكات. میراسێكی گەورەی مێژوویی لە پشتەوەیە. هەروەها بەشێوەیەكی ساتەوەختیش تۆڕەكانی رێكخستنی ئەلەكترۆنی بە بەرزترین ئاست گەیاندووە. لە ئان و ساتێكدا دەتوانێت تەكتیكە خوازراوەكانی جێبەجێ بكات. تەنانەت دەتوانێت ئامرازی ستراتیژی حوكمڕانی (دەوڵەت ـ نەتەوە) رەخنە بكات و لە زۆر بوارەوە هەنگاو بۆ سەرلەنوێ ئاواكردنەوە بهاوێژێت. خودی كۆمپانیاكان هێزەكانی دەوڵەت ـ نەتەوەیان تێپەڕكردووە. وەك دەیەوێت رێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی ئاراستە دەكات كە رێكخستنی مۆدێلن.

لە ژێر ئەم هەلومەرجانەدا جگە لە پێشخستنی چەمكی سیستەم و كرداری خۆیان ركابەرانی سیستەم هیچ رێگا چارەیەكی دیكەیان نەماوە. شۆڕشەكانی فەرەنسا و روسیا (بزووتنەوە و شۆڕشە لە ژمارنەهاتووەكانی شوێنكەوتەی رێبازەكەیان بوون) بە تەواوی لە چوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئامانجەكانیدا نەبوون. تەنانەت تا دوارادە لەگەڵیدا ناكۆك بوون و بانگەشەی سیستەمی نوێیان دەكرد. بە ئامانجی گەیشتن بەم بانگەشانەیان نا ئاساییەكانیشی لەناودا بە چەندین كردەوە و قۆناخی خولییدا تێپەڕ بوون. بەڵام لە دەرەنجامدا بە ماوەی كورت یان درێژخایەن سەرمایەداری توانیویەتی ئەم شۆڕشانە لەناو چەمك و كردەوە مۆدێرنەكانی خۆیدا بتوێنێتەوە. بێگومان هەر وەك تەواوی میراسی مێژوویی، خاوەندارێتیكردن لە میراسی دیموكراتی، یەكسانی و ئازادی شۆڕشە هاوچەرخەكان، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەم شۆڕشە مەزنانە، ئەركێكی لە پێشینەیە. بەڵام ئەم خاڵەش زۆر ئاشكرایە كە پێویستە پەند و ئەزموون لە بەهەڵەداچوونەكانیان وەربگیرێت. لەم بەرگرینامەیەدا دەبینرێت كە بەتایبەتی رلوەستەیەكی زۆرم لەسەر ئەم بابەتە كردووە. هەڵبەتە پەند وەرگرتن لە ئەزموونەكانی رابردوو، ئەركێكی ژیانیی ئەو كەس و رێكخراوانەیە كە خاوەن هەمان بانگەشەن.

قەیران بەردەوام بێت یاخود نا، ئەركە سەرەكییەكان بۆ هەر كاتێك پەسەندە و لەجێگای خۆیدایە. هەروەها بەردەوام پێویستی بە جێبەجێكردنی ئەركە رۆشنبیری، ئەخلاقی و

سیاسییەکان هەیە. هەڵبەتە جیاوازییەکانی قۆناخ رەنگدانەوەی لەسەر هەڵوێستی ستراتیژی و تەکتیکی جیاواز دەبێت. بەڵام ماهییەتە بنەڕەتییەکەی ئەرکەکان ناگۆڕێت. لەو بڕوایەدام کە ئەو خاڵانەی سەبارەت بە پرەنسیپ و روونکردنەوەی دەرهەق بە ئەرکەکانی هەرسێ بوار و گۆڕەپان هەوڵی دەستنیشانکردنم دان گرنگن. لە هەمانکاتدا گوزارشتی رەخنە و رەخنەدانە بەرامبەر هەر رووداو، پەیوەندی، کەسایەتی و دامەزراوێکی لەبەرامبەریدا بەرپرسیارم. ئاگادارم تاوەکو شیکار و رەخنەیەکی بەرفراوانی سەردەمەکەمان و تەنانەت شارستانی نەکرێت رەخنە و رەخنەدانێکی تاکەکەسی بەهایەکی ئەوتۆی نابێت. لەسەر ئەم بنەمایە هەوڵی هەڵوێست پیشاندانم دا.

هەرچەندە زۆرجار ناچاری دووبارەکردنەوەش بم، بەڵام بە ناوپەکداچوونی کار و خەباتەکانی سەبارەت بە ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان مەرجە. چەندە ئەم بوارانە لەناو خۆیاندا بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاریش بکەن، ئەو بەرهەمانەی بەدەستی دێنن خزمەتەکانی یەکتری تەواو دەکەن. وەك چۆن ئەگەر رۆشنگەری و رۆشنبیری نەبێت کرداری ئەخلاقی ناتوانێت پەرە بە باشترینی بدات، ئەوا لە رێکردنەوە لە پێش خراپەش رزگاری نابێت. چونکە ئەو کات و شوێنەی ئەخلاقی چاکی لێنەبێت، ئەخلاقی خراپ هەیە. هەروەها گۆڕەپانی سیاسیش گوزارشت لە نوخی رۆشنگەری هەنووکەیی و پراکتیزەکردنی ئەخلاق دەکات. لەم چوارچێوەیەدا سیاسەت راستینەی رۆشنکردنەوەی رۆژانە و رەفتاری ئەخلاقییە، خودی رۆشنکردنەوە و ئەخلاقە. ئەو شوێنەی سیاسەت و ئەخلاقی لێنەبێت، ناشێ باس لە بوونی رۆشنکردنەوە و خەباتێکی ئەوتۆی رۆشنبیری بکرێت. ئەو رۆشنبیرییەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ سیاسەت و ئەخلاق لەدەستداوە، بۆ نموونە" وەك چۆن سەرمایەی رۆشنبیرییە دەشێت شتێکی دیکەش بێت. بەڵام ناشێت ئەم نوخە وەك ئەرکی رۆشنبیری هەڵسەنگێندرێت. چونکە لە بناخەی ئەخلاقی و سیاسی بێبەشە.

تەنیا کاتێك ئەرکی رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسی بەشێوەیەکی تێکەڵ بە یەکەوە لەپێناو کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی جێبەجێ بکرێت، ئەوکاتە لە بەرزترین ئاستدا، ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی بەدیدێت. هەر بۆیە پێوداںگی سەرکەوتنی تاك و رێکخراوەکانی رکابەری سیستەم گرێدراوە بە بەیەکەوە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی هەر سێ گۆڕەپانەکە لەناو یەکتردا.

# ئەنجام

وشیاری پەیوەندی بە هەبوونی گەردوونییەوە هەیە. تەنیا لەمیانەی زاراوەی وشیاری (هۆشمەندی) دەتوانرێت سیستەمی گەردوونی ئێستاکە روون بکرێتەوە. ئەوەی سەرسوڕهێنەرە شێوازی خۆگوزارشتکردنی وشیارییە. وەك دەرکی پێدەکرێت تەواوی هەمەڕەنگییەکانی گەردوون ئەنجامی تامەزرۆیی خۆ گوزارشتکردنی وشیارییە. سەبارەت بە تێگەیشتنە گەورەکەی مەعریفە هیچ شتێك نازانین. لێگەڕینی هەمەڕەنگییە ناکۆتاکەی پرسیاری "بۆچی" دێنێتەوە بیری مرۆڤ. پرسیاری "بۆچی" تا ئێستاش روون نەکراوەتەوە و نادیارە. فەیلەسوفە بەناوبانگەکان، تەنانەت هەندێك لە کتێبە پیرۆزەکان ئەم پرسیارە بە داخوازی خۆیانکردنەوەی گەردوون یاخود ئارەزووی خوداوەند بۆ ناسینی لەلایەن بەندەکانییەوە دەبەستنەوە. وشەی هەستپێکردن(پەی بەخۆبردن) لای من ئەفسوناوی و رۆشنکەرەوەترە. دەشێت پەی بەخۆبردن و دەرك بەخۆکردنی پچووکترین گەردیلە و نهێنیترین هەبوون، وەڵامی پرسیارەکانی "بۆچی" بێت. ئەو واتایەی لە دەرك بەخۆکردنمان بارکراوە جگە لە ژیان بەهیچ زاراوەیەکی دیکە پێناسە ناکرێت. دەشێت نزیکترین پێناسەی ژیان لە راستییەوە وەك هەستپێکردن یان دەرك بەخۆ کردن دەستنیشان بکرێت. ئەوەی لەوە گرنگترە بۆچی دەرك بەخۆکردن هێندە گرنگ و بە بایەخە؟ وەك دەزانرێت دەرك پێکردنیش نەبێت دەشێت ژیان هەبێت. بەڵام کاتێك لە قووڵاییدا هەوڵی پەیپێبردنی دەدەین، ئەو کاتە تێدەگەین کە ئەم دەشێتە دەرفەتی نییە و ئاستەمە. تەنانەت دەتوانرێت بگووترێت" ئەو ماوە درێژخایەنەی بەبێ پەیپێبردن گوزەری کرد، بەردەوام بەهای ژیانەکەی لە دابەزیندابوو، تەنانەت بەهاکەی توایەوە. بگرە دیاردەی مردنیش مسۆگەر یارییەك یاخود پسپۆڕییەکی سروشتە لە پێناو هەستکردن یان دەرك پێکردنی بە ژیان، واتە لەپێناو فەراهەمکردنی ژیان. بۆ نموونە" ئەو بوونەوەرەی بە ژیانێکی ئەبەدی سزا دراوە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ تراژیدیای سیسفوس[1] (ئەو کەسەی لەلایەن خوداوەندەکانەوە سزا دراوە، بە کۆڵ بەردێك بۆ لوتکەی شاخ دەبات، هەر جارێك

---

[1] سیسیفۆس یان سیزیف (Sisyphps): کەسایەتیەکی میتۆلۆژیای گریکە، قەدەر و چارەنووسەکەی ئەوەیە: بەردێك هەڵبگرێت و تا لوتکەی شاخی ببات، بەڵام بەردەکە بۆ خوارەوە خلۆر دەبێتەوە، سیزیف دێتە خوارەوە جارێکی دیکە بەردەکە لە کۆڵی خۆی دەکات و بەرەو لوتکە دەچێت، ئەم خرەکە تا ناکۆتا بەردەوام دەبێت.

کە نزیکی لوتکە دەبێت، بەردەکە بۆ خوارەوە خلۆر دەبێتەوە) دەمێنێت؟ نیگەران بوون لە مردن تەنیا بەهای ژیان زیاد دەکات و بە بیری مرۆڤی دێنێتەوە.

جگە لە هەستکردن(پەیبردن) سەبارەت بە ژیان زانین(مەعریفە) هیچ واتایەکی دیکە نادات. شتی زانراو، ئەو شتەیە کە پەی پێبراوە (دەرکی پێکراوە). ئەگەر دەرهەق بە هەبوونە فیزیاییەکان(جەستەییەکان) شتێك نەڵێین، بەڵام ناشێت هەست بەوە نەکرێت کە لە بوونەوەرە بایۆلۆژییەکاندا لە هەنگاونان بەرەو زانین وەك بڵێیت ئەشقێك جێگای باسە. کاتێك بەرەو جۆری مرۆڤ دێین، وەك بڵێی ئەم ئەشقە دەبێتە واقیع. پێگەیشتووترین دۆخی زانین(مەعریفە) دەشێت لە میانەی باشترین وشەی ئەشقەوە پێناسە بکرێت. بەڵام مرۆڤ هەبوونێکی هێندە سەیر و ئاڵۆزە کە رووبەڕووی خەسڵەتێکی ئەوتۆی دەبینەوە لە ئەنجامدانی گەورەترین خیانەت و چەواشەکاری بەرامبەر بە مەعریفە دوودڵی ناکات. روونکردنەوەی ئەم راستییەی مرۆڤ لەمیانەی ئەو رووداوانەی لەناو سروشتی کۆمەڵگا روودەدات کە بە سروشتی دووەمی ناو دەبەین، بەڕای من راستتر دەبێت.

زانستی کۆمەڵایەتی وەك زاراوە لەگەڵ سەردەمی شارستانی تەوەرەی ئەوروپا پێشکەوت، بێگومان بەدرێژایی تەمەنی سروشتی کۆمەڵگا هەر دیسپلین (لق)ێکی کە هەبووە دەتوانین بە جۆرێك لە زانستی کۆمەڵایەتی ناوی ببەین. بەدڵنیاییەوە دەتوانین زانستی کۆمەڵایەتی بەر لەمێژوو بە رۆحگەرایی ناوببەین. ئانیمیزم (رۆحگەرایی) کە زاراوەیەکی زانستی کۆمەڵایەتی تەوەرەی ئەوروپایە، ئایا بەگوێرەی ئەوەی دەیڵێین وشیاری سەرەتایی مرۆڤە سەرەتاییەکانە؟ کێن ئەوانەی فەتوا دەدەن گوایە بوونیادەکەی زانستی کۆمەڵایەتی رۆژگاری ئەمڕۆمان کە پشت بە جیاوازی سۆبژە - ئۆبژە دەبەستێت لە ئانیمیزم باڵاترە؟ دیسان هەمان زاناکانی کۆمەڵایەتین! بەڵام چەندەی پێدەچێت دەرکی پێدەکرێت کە رەوتی رۆحگەرایی پارادایمێکە زۆر لە دابەشکردنی سۆبژە - ئۆبژە واتا زۆر لە بێ رۆحکردنی ئۆبژە بەهادارترە. ئاشکرایە کە پێناسەی زیندوویی گەردوون بەگوێرەی پێناسەی بێ رۆحکردنی گەردوون ئەنجامی راستتری لێکەوتۆتەوە. سەرجەم پەرەسەندن و دەسکەوتە زانستییەکان ئەم خاڵە دەسەلمێنن. ئەی جگە لە ئانیمیزم ئەم راستینەیە چۆن روون دەکرێتەوە" ئەگەر جوڵەی سەیر و نادیاری تەنۆلکەکانی بچووکتر لە ئەتۆم نەبێت تاکە هەمەڕەنگییەکیش پێکنایەت؟ پۆزێتیڤیزم (زانستی دیاردەگەرایی) وەك جۆرێکی زۆر مەترسیداری میتافیزیك (هەرچەندە بانگەشەی پێچەوانەی دەکات) لە قووڵاییدا زانستی کۆمەڵایەتیشی بریندار کردووە.

قۆناخی شارستانی کە بەسەردەمەکانی مێژووی ناوینی ناودەبەین، لە ئانیمیزمەوە بەرەو میتۆلۆژیا شێوازێکی زانستی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەگەر میتۆلۆژی بە تەواوی نەکرێتە موڵکی شارستانیش، لە زۆر لایەنەوە مۆرکی شارستانی پێوەیە. بڵاو کردنەوەی یەکەمین خیانەت و چەواشەکردنی وشیاری سەبارەت بە زانستی کۆمەڵایەتی پەیوەندی بە هەژموونی ئایدیۆلۆژی قۆناخەکانی شارستانییەوە هەیە. چونکە پاوانی سەرمایە و دەسەڵات کە لەسەر سروشتی کۆمەڵایەتی ئاواکراوە بەبێ درۆ، چەواشەکردن و خیانەتکردن لە گوتە (پەیمان) رووناداتـ. زۆرترین بەشی میتۆلۆژی بە ئانیمیزم بارکراوە و بەهادارە. بەڵام کاتێك وەك رەنگدانەوەی میتۆلۆژی و سیستەمی پلەداری و سێیانەی راهیب + بەڕێوەبەر + فەرمانـدە چیرۆکەکانی قارەمانێتی و ئیلاهیکردنیان کەوتە گەڕ، چەواشەکاری و شێواندن بوو بە ناچارییەك. بەو مەرجەی سەرنجی ئەم ماهیەتە دوانەییەی بدرێت، دیسان میتۆلۆژیا زانستێکی کۆمەڵایەتی فێرکەرە. لەو بڕوایەدام بەپێی کات بایەخدار بێت. مسۆگەر لە زانین و فێربوونی مێژوودا رۆڵێکی زیاتر دەبینێت.

رەقبوونی میتۆلۆژیا بە شێوەی ئایین رێگای لە پێش دووەمین چەشنی زانستی کۆمەڵایەتی کردۆتەوە. بێگومان ئایین بەتەنیا میتۆلۆژیا وەك میراس وەرناگرێت، بەڵکو دۆگمای خۆیشی هەرچەندە مۆرکی قورسی هێزەکانی شارستانی پێوەبێت، بەڵام بەهۆی سادەیی و سروشتیبوونی شرۆڤەی ئایینی هێزە رکابەرەکانی شارستانی واقیعیترە. رێخۆشکەری سەرەکی ئەو رێگایەیە کە بۆ زانستی هاوچەرخ کراوەتەوە. دەشێت رەنگدانەوەی هەردوو هێزی دژ لە ئایینە تاکخوداییەکانیشدا ببینرێت. لەکاتێکدا رەهەندی تیۆلۆژی فەرمانـدەر، سزادەر و بەنـدەکار رەنگدانەوەی هێزەکانی شارستانی بوون، رەهەندی بەشداریکار، خەڵاتکار و ئازادیخواز هزر و باوەڕی هێزە رکابەرەکانی شارستانی پیشان دەدات. چاخی ناوین پڕ لە پێکدادانی ئایینی و مەزهەبی نێوان ئەم دوو چەمکە گوزەری کردووە. ئەگەر ئەم پێکدادانە ئایینی و مەزهەبیانە نەبووانایە مسۆگەر زانستی کۆمەڵایەتی ئەورووپا نەدەهاتە ئاراوە. تەنانەت تەنیا بیرکردنەوە لە کاریگەری ئیسلام بۆ تێگەیشتنی ئەم راستییە باشتر یارمەتیدەر دەبێت. هەروەها بە درێژایی سەردەمەکان بریسکە و روناکی دانا و فەیلەسوفەکان جێگای باسە، هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەمانە سەرچاوە بەهادارەکانی زانستی کۆمەڵایەتی پێکدێنن.

وەك چۆن زانستی کۆمەڵایەتی سەردەمی شارستانی ئەورووپا (مۆدێرنیتەکەی) سەرچاوەی خۆی لە تەواوی بەرهەمەکانی ئەم میراسە مێژووییە وەردەگرێت، وەك پێویستییەکی ئەو تێکۆشانە کۆمەڵایەتییە مەزنە سەریهەڵدا کە پێیدا گوزەری کرد. لە راستیدا وەك ئامراز و

دیسپلینێکی چارەسەرکردنی گرفتەکان بیری لێکرایەوە. سیستەمی سنوورنەناسی فشار و چەوسانەوە کە سەرمایەداری رێگای لەپێش کردەوە، هەر لە سەرەتاوە مۆدێرنیتەی ناچار کرد بە بارێکی پڕ لە قەیرانەوە ئاوابێت. زانستەکان بەگشتی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەتایبەتی، لەکاتێکدا لە لایەنێکەوە دەخرانە ژێر خزمەتی سیستەمی فشار و چەوسانەوە، لەلایەکی دیکەشەوە رۆڵی مەشروعیەت پێدانی سیستەم بە زانستە کۆمەڵایەتییەکان سپێردرا. بەمجۆرە رەوانبێژی پاوانە نوێیەکانی سەرمایە و دەسەڵات مۆرکی خۆی لە زانستی کۆمەڵایەتیش دا.

هەر لە سەرەتاوە سۆسیۆلۆژیای پۆزێتیڤیست رێگای لە پێش بە سەقەتی لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵایەتی کردەوە. نیگەرانی سەرەکی کۆمەڵناسە پۆزێتیڤیستەکان چۆنێتی هەڵێنجانی کۆمارێك بوو لە شۆڕشی فەرەنسا کە بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازی بپارێزێت. سیاسەتمەدارە ئابووریناسەکانی ئینگلیزیش بەدوای ئەقڵانیکردن و مەشروعیەت پێدانی سەرمایەوە بوون. ئایدیۆلۆگە ئەڵمانەکانیش لە هەموو گۆڕەپان و بوارێکەوە سەرقاڵی دەوڵەت ـ نەتەوە زەبەلاحەکەی ئەڵمانیا بوون. بەڵام ئەوەی دامەزرێنەرانی سۆسیالیزمی زانستی و سەرکێشی رکابەرانی سیستەم کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس خوازیاری ئەنجامدانی بوون ئافراندنی زانستێك بوو لە هەر سێ رەوانبێژی سەرمایەداریدا، بەڵام بە مۆرکی پرۆلیتاریاوە. رکابەرێتی سەرمایەداری و شیکارەکانی سەرمایە کە لەسەر ئەم بنەمایە پێشخرا، دەشیا ببێتە کۆمەکێك بۆ زانستی کۆمەڵایەتی. بەڵام سەرچاوەکانی هەنگاونانیان و سنوورداربوونیان لە رکابەرێتی سەرمایەداریدا ، سەرجەم بوونیادەکانی سیستەمی بەرامبەر بە مۆدێرنیتە بێبەرگری دەهێشتەوە. هەرچەندە شیکاری ئەنارشیستەکان دەرهەق بەدەسەڵات هەنگاوێکی پێشکەوتوو بێت، بەڵام وەك بڵێیت گۆڕەپانی سیاسییان بە بەتاڵی جێهێشتبوو. هەربۆیە لەجیاتی ئەوەی زانستی کۆمەڵایەتی ئەورووپا سەبارەت بە هەردوو باڵ توێژینەوە دەرهەق بە سروشتی کۆمەڵگا بکات، لە ژێر ئەو کێشانەدا خنکابوو کە سیستەم رێگای لە پێش کردبوویەوە. بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆیان کردبوو بە پسپۆڕی چارەسەرکردنی قەیرانەکان، دونیا و مێژووش لە پلانی دووەمدا بوون. پێویستە سەرمان سووڕنەمێنێت کە زانستی کۆمەڵایەتی لە تەوەرەی ئەورووپادایە. چاوەڕوانی ئەوەیان لێنەدەکرا بەجارێك کەڵەکەبوونی سەدان ساڵ تێپەڕ بکەن. لەناویاندا ئایدیۆلۆژیای لیبراڵ ئاقڵترینیان دەرچوو. رێگای گونجاندنی هەموویانی لەگەڵ سیستەمدا دۆزییەوە. نەك تەنیا شۆڕشی فەرەنسا بەڵکو زانی کە چۆن شۆڕشی روسیا و سەرجەم رکابەرانی سیستەم لەو

سەردەمەدا بێکاریگەر بکات. بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە زانستی کرد بە زانستی دەسەڵات و سەرمایە.

بەڵام بیر لە بێدەنگکردن و لەناوبردنی ریشەی رکابەرانی مۆدێرنیتەی ئەوروپا نەدەکرایەوە کە دەسەڵاتخوازترین و ئیستیغلاکارترین سیستەمی سەردەمی شارستانییە. لەگەڵ پەرەسەندنیدا نەك تەنیا لە بواری ئایدیۆلۆژیدا، بەڵکو لەبواری سیاسی و ئەخلاقیشەوە رووبەرووی بەرخودانی مەزن بۆوە. چونکە رکابەرێتی سیستەمیش بەلانی کەم هێندەی سیستەم ئەویش خۆی نوێ دەکردەوە. چەندە سیستەم دەبوو بە جیهانگیری، سیستەمی رکابەریش دەبوو بە جیهانگیری. بەپێی بەسەرچوونی کات هەژموونگەراییەکەی لەسەر زانست دەشکا. ئیتر دەرکی بەوە کرد کە: دەشێت مێژوو تەنیا مێژووی ئوتیا بێت، هەژموونگەرایی کورتخایەنی ئەورووپاش تەنیا بەشێکی زۆر بچووکی ئەم مێژووە پێکدێنێت.

فەیلەسووفێتی فەرەنسی دوای دووەمین جەنگی جیهانی، شۆرشی کلتووری لاوانی ١٩٦٨، لەناوەوە هەڵوەشانەوەی سیستەمی سۆڤێت، ئیفلاسکردنی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، لێکەرینەکانی پۆست مۆدێرنیزم (پاش مۆدێرنیتە) و لەناوچوونی داگیرکاری کلاسیك زەمینەی بۆ دەستپێکردنی قۆناخێکی نوێی زانستی کۆمەڵایەتی رەخساند. لێکەرینەکانی حەقیقەت کە خۆی لە کۆسپی پۆزێتیڤیزم و ناوەندگەرێتی ئەورووپا رزگار کردبوو ئاراستەیەکی ئەرێنیتری هەیە.: لە کاتێکدا زانستی کۆمەڵایەتی لە تەواوی زەمەن و کاتەکاندا بەشێوەیەکی سەرتاسەری سروشت و کۆمەڵگا دەکاتە بابەتی لێتوێژینەوە، پێویستە تەنیا بە چارەسەرکردنی قەیران و گرفتەوە سنووردار نەبێت. بەڵکو رۆڵی شاژنی زانستەکان ببینێت، رۆڵی پێشەنگایەتیکردنی گەردوونناسی، فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانی گرێدراو بە کۆمەڵگا و زانستە مرۆییەکانی لەجۆری فەلسەفە، ئەدەبیات و هونەر ببینێت. چونکە تەنیا لە ریشەی زانستی کۆمەڵایەتییەوە دەشێت داری رەچەڵەکی زانست بنەخشێنرێت. بەمجۆرە هەم لە پارچەبوونی لەرادەبەدەر رزگاری دەبێت هەمیش مەترسی دەرهەست مانەوەی لەرادەبەدەری بەلاوە دەنرێت. تێپەڕاندنی قەیرانی گۆڕەپانی زانستی کۆمەڵایەتی لەگەڵ قەیرانی گشتی کارێکی لەپێشینەیە. زانستێکی کۆمەڵایەتی کە پەیبردن بە ژیان وەك ئازادی راڤە بکات، حەقیقەتیش وەك لێتوێژینەوەی ئازادی راڤە بکات، رێبەرنامەی دەستلێبەرنەدراوی رۆشنکردنەوە و پێشکەوتنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە.

لەم پەرتووکەدا بەر لە هەموو شتێك هەڵسەنگاندم بۆ زانستی کۆمەڵایەتی پەیوەندی بە چوارچێوەی پەرتووکەکەوە هەیە. رەوانبێژی سۆسیالیزمی زانستی کە بۆ ماوەیەکی درێژ تاقیم

کردەوە ئیتر چوارچێوەکەی تەسک بوو. هەرچی ڕەوانبێژی لیبراڵە بەتەواوی دژی بووم. لە نزیکەوە ئاشنابوونم بە ئەنارشیزم کاریگەرییەکی ئەرێنی هەبوو، بەڵام لە شیکارکردنی کێشەکانی بەردەمم دوور بوو. هەندێ لەو سۆسیۆلۆگانەی لە سەرەتادا ئاماژەم پێکردن و لام بەهاداربوون کۆمەکەکەیان گرنگ بوو. بەڵام دیسان دەبوایە ڕێگای خۆم بدۆزمەوە. تا چەمکی زانستی کۆمەڵایەتی خۆم جێگیر نەکەم، هەنگاونان بۆ بابەتە بە بانگەشەکانی دیکە ڕاست نەبوو. هەر وەکو لە سەرەتادا ئاماژەم پێکرد، ئەوەی ئەنجامدراوە تاقیکردنەوەیەکە: چونکە تەنیا لە ڕێگەی ڕەخنەکردنەوە ڕاستی جێگیر دەبێت. دڵنیام کە لەو میتافیزیک و پۆزێتیڤیستە دۆگماتیکانە نیم کە هەر شتێك لە زانستی کۆمەڵایەتی چاوەڕوانن. بەشێوەیەکی هەمەلایەن پێناسەکردنم بۆ زانستی کۆمەڵایەتی، هەم بۆ نەکەوتنە ناو ئەم مەترسییە، هەم لەبەر ئەوەی بەرامبەر بە هۆگرانی بابەتەکە دڵسۆز و وشیار بووم. دوای جێبەجێکردنی ئەمەیان، تازەگەری و شارستانێتی دیموکراتی بوونە بەشە سەرەکییەکەی تری پەرتووکەکە. ئەولەویەتدان بە کێشەی کۆمەڵگا، لە پێناو باشتر پێناسەکردنی سیستەمی شارستانی و دانانی بناخەی ڕاستی ڕکابەرەکانی بوو. لەو بڕوایەدام کە بە شێوەیەکی بەرفراوان تاووتوێم کردووە. ڕەخنەکانم دەرهەق بە ڕکابەرانی دیکەی سیستەم لەپێناو گەیشتن بە هەڵسەنگاندنێکی سەرتاپاگیر و یەکپارچەبوو. لەگەڵ ئەوەی بە تەواوەتی پەیڕەوی سۆسیالیزمی زانستیم ڕەت نەکردەوە کە پشت بە دوو چین دەبەستێت و جێگایەکی کەمی مێژووی ڕکابەرایەتی و سیستەمی گرتووە و لە شیکارکردنی کۆمەڵگا دوورە، لە ڕێگای سیستەمی شارستانێتییەوە هەوڵی تێپەڕکردنیم دا کە بریتییە لە پێشکەوتنێکی پێنج هەزار ساڵەی رووباری دایك.

ئەگەر گەڕان بەدوای دژێتییەکی دیالیکتیکیدا جێگای باس بێت ـ لەو بڕوایەدام کە گەڕانێکی بەمجۆرە پێویستە ـ پێشخستنی لە چوارچێوەی سیستەمی شارستانیدا ناچاری بوو. ئاگادارم کە بابەتی شارستانییەکان ڕۆژەڤی لێتوێژینەوەی چەندین کۆمەڵناس و فەیلەسوفی هێژا بووە. ئەوەی خوازیاری ئەنجامدانی بووم زیادکردنی دانەیەکی نوێ نەبوو، بەڵکو ئەوەی ئەنجام نەدرابوو یاخود بەشێوەیەکی پارچە پارچە دەستی بۆ برابوو، بەشێوەیەکی بەرفراوان و بە سیستەم خستمە ڕۆژەڤەوە. بە گرنگییەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەم، ئەو میتۆدەی کارل مارکس بۆ "سەرمایە" بەکارهێناوە، واتە دیالیکتیك، من بۆ شارستانی بەکارمهێنا. سەرزەنشتێکی تۆدم کرد، گووتم خۆزگە مارکس خۆی ئەم خاڵەی ئەنجامدابووایە و ئێمەش سوودمان لێوەرگرتایە. بەڵام دیسان باشترین پشتگیری کە لە پسپۆڕ و مامۆستایەك وەربگیرێت واتادان بوو بە پەیڕەوەکەی. ڕەخنەی

پەیوەندیداران و پراکتیکی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات کە تا چ رادەیەك لەوەدا سەرکەوتووم. هەروەکو لە سەرمایەشدا ئاماژەی پێکراوە شارستانی گروپی رکابەر و توندڕەو دەخولقێنێت. تەنانەت دژیەکی بۆرژوازی - پرۆلیتاری تەنیا یەکێك لەو دژایەتییانە بوو کە شارستانی رێگای لەپێش کردۆتەوە. لەم چوارچێوەیەدا، لەو بروایەدام کە ئەم خەباتەم (پەرتووك) نەك وەك دژایەتی کارل مارکس، بەڵکو شرۆڤەکردنی وەك هەوڵێکی تەولوکردنی و پێشخستنی لەسەر بنەمای رەخنەی جدییەوە راستتر دەبێت. کاتێك لە زۆر لایەنەوە (پاوان، سەرمایە، دەوڵەت، ئایدیۆلۆژی، پۆزێتیڤیزم، مێژوو، شارستانی، بازاڕ، ئابووری، دیموکراسی، شۆڕش، زانستی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتیش دەسەڵات، دەوڵەت - نەتەوە، هەژموونگەرایی، شیکردنەوەکانی سیستەم ..هتد) ئاماژە بۆ هەڵە و کەموکورییەکان دەکەم پێویستە وەك دژایەتی شرۆڤە نەکرێت. لەو بروایەدام ئەگەر ئەمە وەك پیشاندانی بەهای شایستە بە مارکس و رەوتە رکابەرەکانی دیکەی سیستەم و کۆمەککردنیان شرۆڤە بکرێت راستترە.

لە بەشەکانی دیکەی ئەم بەرگرینامەیەدا بەشێوەیەکی قەبە هەولێمدا باڵە زۆردار و ئیستیغلالکارەکان(چەوسێنەر و داگیرکار)ی شارستانی شرۆڤە بکەم. بەڵام لەم بەشانەی بەردەستماندا خوازیاربووم تا بکرێت کەمتر ئاماژەیان پێبکەم و قورسایی بدەمە جەمسەری بەرامبەر دیمۆس، واتا هێزەکانی شارستانێتی دیموکراتی. بەهەموو هێزی خۆمەوە هەوڵی کرانەوە و روونکردنەوەی ئەم جەمسەرە مێژووییەمدا. بە بڕوای من سەبارەت بەم بابەتە مێژوو پڕ لە کەموکورتی و هەڵەیە. هەر هیچ نەبێت لەمیانەی هێڵێکی سوور و ئەستوورەوە سەرنج راکێشانە سەر ئەم بابەتە دیسانیش گرنگ بوو. هەر وەك بەردەوام پێشکەش دەکرێت پێکدادانی بنەڕەتی لە مێژوودا لەنێوان گروپە دەسەڵاتدارەکانی شارستانییەکان (دوا نموونەی سامۆیل هینگتۆن[٢]) دا نییە، بەڵکو لەنێوان دوو جەمسەری دژیتی. هەڵبەتە ناکۆکی و پێکدادانێکی زۆر لەنێوان گروپە فەرمانڕەوا و باڵادەستەکاندا هەیە. بەردەوام شەڕی پاستە (کێك) لەگەڵ یەکتریدا دەکەن. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەم کێکە لە کێ و چۆن زەوت کراوە. وەك پێویستییەکی دیالیکتیکی پێویستە پێکدادان و ناکۆکی راستەقینە لەنێوان دروستکەرانی کێکەکە و زەوتکارانیدا بێت. ئەم بابەتەی

---

[٢] سامۆئیل هینگتون (Samuel Huntimgton): سەرۆکی ئەکادیمیای هارفاردی تایبەت بە لێتوێژینەوە نێو دەوڵەتیەکان بوو، یەکێك لە بەناوبانگترین رۆشنبیرە ئەمریکیە پسپۆڕەکانی سیاسەتەکانی دوای شەڕی سارده، بە پەرتووکی (پێکدادانی شارستانیەکان و سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی سیستەمی جیهان) دەناسرێت کە گفتوگۆیەکی زۆری لە جیهان نایەوە. لە ساڵی ٢٠١٠ کۆچی دوایی کرد. *

پێویستی بە لێتوێژینەوەیەکی قووڵی مێژوویی هەیە، تەنیا لە میانەی هێڵی سووورەوە دەمتوانی سەرنجی راکێشمە سەر، هەرواشم کرد. ئەوەی خوازیارە چەندەی دەیەوێت بابگەڕێت، لەو بڕوایەدام کە لەمیانەی ئەو ئەنجامانەی پێی دەگات هیواشکێن نابێت.

هەوڵمدا رووبەرێکی بەرفراوان بە رکابەرانی مۆدێرنیتەش بدەم. ئەمەش بەو ئامانجە بوو کە لە کار و خەباتەکانی سیستەمی نوێدا بەشێوەیەکی راست جێگای خۆیان بگرن. چونکە ئەو پشێوییەی لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆڤێت خێرابوو، پێویست بوو لە شوێنێکی واتاداردا جێگیر بکرێت. هەرچی بێ ئومێدییە بێواتا بوو. پێویستە ریال سۆسیالیست و ئەنارشیستەکان چۆنێتی نوێبوونەوە بزانن. هەرچی فێمێنست و ئیکۆلۆژیکەکانن پێویست بوو بزانن ئەگەر سیستەم جێگیر نەکەن ناتوانن مەودا ببڕن و لە ئاوکێشان بۆ ئاشی لیبڕالیزم رزگاریان نابێت. چونکە تا نەبن بە خاوەن سیستەم و سیاسەت ئەنجام نەدەن، بە هیچ ئامانجێك نەدەگەیشتن. ئەوەی چاوەڕوانی دەکردن هەمان چارەنووسی بزووتنەوە ریال سۆسیالیست و ئەنارشیستەکان بوو. لەو بڕوایەدام کە بەشێوەیەکی چارەسەرئامێزانە هەڵوێستم سەبارەت بە بزووتنەوە کلتوورییەکان پیشاندا. ناوەڕۆکی دیموکراتییانەی ئەم بزووتنەوانە گرنگ بوو کە لەژێر چەپۆکی جانەوەری دەوڵەت - نەتەوە هەوڵی رزگاربوون دەدەن. لە چوارچێوەی تازەگەری دیموکراتیدا دەیانتوانی رۆڵێکی مێژوویی ببینن.

هەم بەشێوەیەکی شیکارکارانە، هەمیش چارەسەرئامێزانە نزیکی کێشە و ئەرکەکانی سەرلەنوێ ئاولکردنەوەی تازەگەری دیموکراتی بوومەوە. واتا هەڵوێستێکی تایبەتی تیۆری - پراکتیکیم پیشاندا. لەو بڕوایەدام کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەنجامە بەدەستهاتووەکانم بە لۆخی پرەنسیپە بەکاریگەرەکان پێشکەش کردووە. ئاشکرایە کە تازەگەری دیموکراتی وەك لێگەڕینی سەردەمی زێڕینی رابردوو، یان پرۆژەیەکی خەیاڵی بۆ ئایندە پێشکەش نەکراوە. چونکە کەرەستە و ماتریالێکی زۆری دژە سیستەم هەبوو، بەڵام خودی سیستەم بۆ خۆی لە ئارادا نەبوو. لەو بڕوایەدام کە پێویستە بابەتەکە بە باس و روونکردنەوەی تێر بگات. وەك ناو تازەگەری (مۆدێرنیتە)ی دیموکراتی گرنگ نەبوو: بەڵکو چوارچێوەکەی زۆر گرنگ بوو. هەرچی بە سیستەمکردنی ئەمەیە ناچارییەك بوو. ئەگەر بەمجۆرە نەبوایە جگە لە ژیانی ئەداری فەلسەفی کە لەمیانەی فەلسەفەی ئەدارییەوە بەرجەستە دەبێت، لەوە زیاتر تێپەڕی نەدەکرد. ئامانجی شیکارەکان رۆشنکردنەوەی ئەم رەوشە و تێپەڕکردنی بوو. هەرچی ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکانە لەپێناو رێگاچارە کردارییەکان هەوڵی دەستنیشانکردنی درا. ئەو پشێوییەی لە

ئارادابوو لەم گۆڕەپانانەشدا زۆر بەربڵاو بوو. لەو بڕوایەدام کە بەپێی پێویست چۆنێتی ئاراستەگرتنی پراکتیکی روونکراوەتەوە. بەتایبەتیش ریزکردنی پرەنسیپەکان لە بواری کرداریدا، رێگا لەپێش کار و خەباتی نوێ و خوڵقکارانە دەکاتەوە.

بابەتێکی دیکەی گرنگی ئەم خەباتە پەیوەندی بە ماهییەتی یەکینە سەرەکییەکانی لێتوێژینەوە هەبوو. سەبارەت بەم بابەتە زانستی کۆمەڵایەتی پۆزێتیڤیست وەك ئۆبژەکانی دیکەی سروشت کۆمەڵگاشی کرد بە ئۆبژەیەك و بەمجۆرە بە وەڵامێکی گشتی سنووردار بوو. سۆسیالیزمی زانستیش وەك رەنگدانەوەی چەپرەوی ئەم چەمکەی زانست شێوەی گرتووە، هەر بۆیە دیاردەگەرا و وشکتر بوو. لە چوارچێوەی کۆمەڵدا، بەگوێرەی شێوازەکانی بەرهەمهێنان کۆمەڵگای تووچاری جیابوونەوەیەکی چینایەتی ماهییەت وشك کرد. بەجۆرێك تەماشای پۆزێتیڤیزمی پێشکەوتنی راستەهێڵی گەرلوونی رەهای کرد و پراکتیزەی کرد وەك بڵێی راستی رەهان. بەمجۆرە شێوەگرتنی سەرەتایی، کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، سۆسیالیست - کۆمۆنیست سەریهەڵدا. تۆزێك قەدەرگەرایی لەمەدا هەیە. هەر چۆنێك بێت زوو یان درەنگ ئیتر نۆرەی سۆسیالیزم دەهات. ئەم هەڵوێستە لایەنی دۆگماتیکانەی زۆر ئاشکرا بوو. لەمیانەی ئەم زهنییەتەوە هەڵوێست نیشاندان بەرامبەر تەولوی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەنجامەکانی زۆر لە مەزەندەکان قورستر بووە. ئەوەی بەدیهات سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو سەرمایەداری جیهانگیری بوو. کە زۆر رەخنەیان دەکرد، بەڵام بەبێ ئاگاییانە زۆرترین خزمەتیان پێشکەش کرد. بەلانی کەم سەدەیەك درێژکردنەوەی تەمەنی سیستەم لەلایەن سەرمایەداری دەوڵەتی روسەوە، بە هەر حاڵ ئەم راستییە دەسەلمێنێت.

بەدرێژایی ئەم خەباتە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییم وەك بژار هەڵبژارد کە لەو بڕوایەدام یەکینەی سەرەکی لێتوێژینەوەی سروشتی کۆمەڵگا (سروشتی دووەم)یە، یاخود بەمجۆرە هەوڵی چەسپاندن و پێناسەکردنیمدا. بەڵگەکانم لەو بارەیەوە بوو کە سەرباری ئەوەی دیاردەکانی لە جۆری شێوازی بەرهەمهێنان، چین، دەوڵەت، ئایدیۆلۆژیا و تەکنیك کە بەردەوام لە گۆڕاندان و بەشێوەیەکی جیاواز لە هەر کۆمەڵگایەکدا جێگای باسن بەشی راستییان هەیە، بەڵام لەو قورساییەدا نین کە ببن بە بابەتی سەرەکی لێتوێژینەوە.

هەرچی شیکردنەوەکانی سەبارەت بە شارستانی و سیستەمی جیهانە وەك شرۆڤەیەك رەخنەم کرد کە یەکلایەنە و ئابلۆقەیەکی داخراوە. هەوڵمدا ئەو خاڵە شیکار بکەم و بخەمەڕوو: تا هەبوونی جۆری مرۆڤ بەردەوام بێت ماهییەتەکەشی درێژەی دەبێت، ئەوەی ناچارە بژی کۆمەڵگای

ئەخلاقی و سیاسی سروشتی کۆمەڵگایە، ناتوانێت دەستبەرداری بێت، ئەگەر دەستبەرداری بێت ئەمە مانای پارچەبوون و پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگایە. لەمیانەی لیستێکی بەرفراوانەوە هەوڵی سەلماندنی ئەو راستییەم دا: ئەگەر بە درێژایی مێژووی شارستانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لە ژێر گەمارۆی تۆڕەکانی دەسەڵات و سەرمایە سووابێت و رووبەڕووی پەرتەوازەبوون و رزینیش کرابێتەوە، بەردەوام کۆمەڵگاکان هەوڵیانداوە رێگایەك بدۆزنەوە و بەشێوەیەکی لاوازیش بێت ماهیەتی ئەخلاقی و سیاسی خۆیان بپارێزن، بەمجۆرە وەلآم بدەنەوە یاخود لە تۆخی بەرخوداندا بژین. بەشێوەیەکی بەرفراوان هەوڵی شیکارکردنی ئەو خاڵەم داوە: بەرامبەر بە بڵاوبوونەوەی تۆڕەکانی سەرمایە و دەسەڵاتی سەرمایەداری (مۆدێرنیتە) بۆ ناو وردترین شانە و مەمیلەکانی کۆمەڵگا کە پێچاویەتەوە (دەوڵەت ـ نەتەوە، ئیندوستریالیزم، بەتایبەتی ئامرازەکانی میدیا، ئایدیۆلۆژیا پێکەوە لکێنراوەکان، رێکخستنەکانی ئاسایشی، داگیرکاری ناوخۆیی، هێرشی زێدەڕۆییانە بۆسەر ژن.. هتد)، لە هەمانکاتدا ئەمانە بوونەتە هۆکاری پەرچەکرداری بەرامبەر، لە هەر تاك و یەکینەیەکی کۆمەڵگادا رێگایان لەپێش دەرفەتەکانی بەرخودان و ئەڵتەرناتیفی ژیان کردۆتەوە، تەنانەت ناچارن رێگای لەپێش بکەنەوە. ئەوەشم خستەڕوو کە هەڵبەتە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی جێگیر نییە، بەڵکو لە قۆناخی بەر لە مێژووەوە بەردەوامی بە پەرەسەندنی خۆی دەدات.

گۆڕانکاری و پەرەسەندنەکانی لە جۆری کلان، قەبیلە، خێزان، کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان، پلەداری و پارچەبوونی دەوڵەت، هەروەها لە کۆمەڵگای لادێ ـ کشتوکاڵەوە گوزەرکردن بۆ کۆمەڵگای نەتەوەیی ـ پیشەسازی کە کەم تا زۆر جەمسەرگەری بوون بەشێوەیەکی نەپچڕاو بووە. هەوڵی پیشاندانی هاوڕابوونی خۆم لەگەڵ ئەو بۆچوونانە خستەڕوو کە دەڵێن سەردەمی شارستانی بە کارەکتەرێکی نەپچڕاوی تۆخی قەیرانەکانی ناوەند ـ کەنار، هەژموونگەرایی ـ کێبڕکێ و هەڵکشان ـ داکشان پەرەیسەندووە. هەروەها لەبواری (تیۆری و کرداری)دا هەوڵمدا ئەم خاڵە شیکار و چارەسەر بکەم: سەرباری تەواوی ئەم پەرەسەندنانە ناتوانرێت کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەبەین ببرێت، بەردەوام مەیلی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسیخوازی خۆی دەپارێزێت، لە دۆخێکدا ئەرکە رۆشنبیری، ئەخلاقی و سیاسییەکان بە شێوەیەکی تێکەڵ مایەی تێگەیشتن و جێبەجێکردن بێت، ئەوا ئەم ماهییەتە لە بەرزترین ئاستدا بەرجەستە دەبێت.

بەشێوەیەکی بەرفراوان هەوڵی شیکردنەوە و شیکارکردنی ئەو خاڵەمدا: لەکاتێکدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر بنەمای سەرمایەگەرێتی، پێشەسازیگەرێتی و دەوڵەت ـ

نەتەوەگەریتی هەبوونی خۆی دەستەبەر دەکات، تازەگەری دیموکراتی بە سیفەتی کۆمینالێتی دیموکراتی، ئیکۆ ـ پیشەسازی و نەتەوەی دیموکراتی دەبێتە خاوەنی هەبوون. هەوڵمدا کۆمینالێتی دیموکراتی وەك ئەو جڤاتە (لە جڤاتی ژنانەوە تا پیاوان، لە هی وەرزش و هونەرەوە تا پیشەسازی، لە رۆشنبیرانەوە تا شوانکارەکان، لەکۆمەڵگای قەبیلەوە تا کۆمپانیاکان، لە خێزان تا نەتەوەکان، لە گوندەوە تا شارەکان، لە خۆجێییەوە تا جیهانگیری، لە کۆمەڵگای کلانەوە تا کۆمەڵگای جیهانگیری) پێناسە بکەم کە لە تاکە کەسێکەوە تا دەگاتە ملیۆنان کەس بۆتە خاوەن چۆنایەتی و ماهییەتی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی. راستینەی کۆمەڵگای ئیکۆ ـ پیشەسازیم وەك ئەو جڤاتە ئیکۆ ـ پیشەسازیانە پێناسە کرد کە کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ و کۆمەڵگای پیشەسازی ـ شار یەکتری بەخێو دەکەن و مسۆگەر بەگوێرەی ئیکۆلۆژیا گونجێنراون. هەرچی نەتەوەی دیموکراتییە هەوڵمدا وەك جۆرێکی نوێی نەتەوە پێناسەی بکەم کە لەمیانەی کردەکانی کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتییەوە و بەشێوەی پێکهاتەی سیاسی نیمچە سەربەخۆ (ئۆتۆنۆمی) هەر جۆرە هەبوونێکی کلتووری، جڤاتی ئایینی، شار، خۆجێیی، هەرێمی و نەتەوەیی پێکدێنن، راستتر بەرامبەر بە جانەوەری دەوڵەت ـ نەتەوە هەوڵمدا وەك نەتەوەیەکی فرە ناسنامەیی و فرە کلتووری شیکار و پێشکەشی بکەم.

هەروەها بەشێوەیەکی قووڵ و بە دووبارەکردنەوەوە هەوڵمدا جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکەمەوە کە: لەسەر بنەمای ئەم دامەزراوە بوونیادیانە تازەگەری دیموکراتی بژارێکە هێزی چارەسەری بەهێزە کە میراسە مێژووییەکەی و ئەزموونی رکابەرانی سیستەمی سەردەمی مۆدێرنیتەی لەگەڵ یەکتردا کردۆتە یەك و لە رێگای بەرەو پێشەوە بردنی زیاتر دەبێتە پێشەنگ.

لەدەرەوەی پێکدادان و قۆستنەوە (چەوساندنەوە و داگیرکاری) بەگرنگییەوە هەوڵمدا جەمسەرگەری شارستانێتی و مۆدێرنیتە لەلایەنی ئەگەری ئاشتی و نەبوونی پێکدادانەوە شیکار بکەم. هەڵسەنگاندنی دەرفەت و هەلومەرجەکانی ئاشتییەکی هەمیشەیی و بەردەوام بابەتێکی گرنگە و پێویستی بە وردەکاری و هەستیارییەکی زۆر هەیە. وەك دەزانرێت لەم لایەنەوە شارستانی خاوەن میراسێکی دەوڵەمەندە. چەندین قۆناخ و کردەیەك لەئارادابوون کە لە شەڕ زیاتر پیرۆزی و شکۆمەندی بە ئاشتی بەخشراوە. هەروەها لەسەردەمی مۆدێرنیتەشدا شەڕ و ئاشتی وەك کردەیەکی رۆژانەیی لەناو یەکدا جێگای باس بووە. هەروەها ئەمەش وەك فاکتەرێك دەرکەوتۆتە پێش لەجیاتی چەمکێکی دیالیکتیکی یەکتر لەناوبەر، دەشێت دیالیکتیکێکی یەکتر بەخێوکەر جێگای باس بێت. بەلام بەلانی کەم پرۆسە دیالیکتیکیەکان نە بە تەنیا یەکتر

لەناوبەرن، نە تەنیا یەکتر بەخێو دەکەن، بەڵکو دەشێت چەترێکی نێوان هەر دوو راستینە یان چەمك جێگای باس بێت و بەمجۆرە کۆمەك بە پرۆسەکە بکات. لەسایەی پێشکەوتنی زانستدا راستتر و باشتر مایەی تێگەیشتنە کە راستینەی سروشتی نە لەمیانەی فەلسەفەی بەهێزترینی داریونیزم لەبارەی ژیانەوە، نە لەمیانەی قاڵبە کۆنە میتافیزیکیە کلاسیکیە بۆ ناکۆکییەکان بەڕێوەدەچێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ماهیەتێکی زۆر گرژی و ئافرێنەر پێشکەش دەکات.

شرۆڤەکردنی سەرجەم قۆناخەکانی ئاشتی وەك پەرەسەندنی سروشتی چەندە هەڵە بێت، ئەوا شرۆڤەکردنی قۆناخەکانی شەڕیش وەك ئەو مامانانەی وەچەی نوێ دەخەنەوە بەو رادەیە هەڵەیە. چونکە شەڕەکانی نێوان پاوانەکانی دەسەڵات و سەرمایە پەیوەندی بە گەورەکردن و بچووکبوونەوەی کێکەکەی ژێردەستیانە. هیچ پەیوەندییەکیان بە ئاشتییەوە نییە. ئاشتی راستەقینە پشت بە پەسەندکردنی هەبوون، ناسنامە و مافەکانی بەڕێوەبەرایەتی نیمچە سەربەخۆ (ئۆتۆنۆمی)ی دوو لایەنەی هەر دوو هێزی دژیەکی شارستانی (ئەمە لەنێوان دوو چین دەستپێدەکات، تا قەبیلە هەمەجۆرەکان، خێڵ، قەوم، نەتەوە، توێژ، گروپی ئاینی، رەوتی کلتووری و گروپی ئاینی دەگرێتەوە) دەبەستێت. کاتێك بینیان کە شەڕ و پێکدادان زیانێکی زۆرتر لە لایەنەکان دەدات، ئەگەری ئاشتی بە دیار دەکەوێت. لەمیانەی نیازەکانی دیالۆگ و رێککەوتنەوە هەوڵی بەدەستهێنانی ئەنجام دەدەن. وەك دەزانرێت لە ئاستی خۆجێیی و جیهانگیریدا، یان لەناو نەتەوەیەك یان لە نێو دەوڵەتاندا چەندین شەڕ بە ئاشتی ئەنجامگیربوون.

کاتێك وەك جەمسەری دژ هەوڵی شیکارکردنی مێژووی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی دەدەین، تێدەگەین کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەنتر لە دۆخی دوو جەمسەریدا دەژی. ئەگەری ئەوە لە ئارادا نابینرێت کە لەماوەیەکی کورتدا جەمسەرەکان یەکتر لەناوبەرن. هەروەها لەلایەنی دیالیکتیکیشەوە ئەمە بە مەسەلەیەکی واقیعی نییە. پەلەپروزێیەکەی ریال سۆسیالیزم سەبارەت بەم بابەتە، تاقیکردنەوەی سیستەم بەبێ شیکارکردنی شارستانی و مۆدێرنیتە، بە هەڵوەشانەوەی خۆی ئەنجامگیر بوو. ئەوەی گرنگە لە تەواوی کار و خەباتە تیۆری ـ کردارییەکاندا دوو جەمسەری رەچاو بکەیت، لەناو جەمسەری قۆستنەوە و ستەمکاردا نەتوێیتەوە، لەمیانەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەدا بەردەوام هەنگاو بە هەنگاو تازەگەری و شارستانێتی دیموکراتی وەك سیستەمی خۆت بەرەو پێشەوە ببەیت. چەندە لەمیانەی سەرجەم پەیڕەوەکانی پەرەسەندن و شۆڕشگێڕییەوە سیستەمی خۆمان بەرەو پێشەوە ببەین، بەو رادیە دەتوانین کێشەکانی "ماوە" و "شوێن" چارەسەر بکەین و سیستەم هەمیشەیی بکەین.

تازەگەری دیموکراتی سیستەمێکە فاکتەرە راستەقینەکانی بۆ ئاشتی لەبار و گونجاوە. چەمکی نەتەوەی دیموکراتی لەمیانەی هێزە چارەسەرئامێزییەکەی کە لە بچووکترین جڤاتی نەتەوەییەوە تا دەگاتە نەتەوەی جیهان هەموویان لەخۆوە دەگرێت، لە هەمانکاتدا بژارێکی زۆر هێژا و پایەداری ئاشتی پێکدێنێت. لە رێگای فاکتەری ئیکۆ ـ پیشەسازی و لەمیانەی بەکارهێنانی بەرهەمهێنەرانەی پیشەسازی لەناو کۆمەڵگادا هەم کێشە قورسە کۆمەڵایەتییەکانی لەجۆری بێکاری، هەژاری و برسێتی..هتد دەکەوێتە سەر رێچکەی چارەسەری کە جۆرێك لە ئەنجامی ئەو شەڕەیە کە مۆدێرنیتە بەرامبەر بە کۆمەڵگا بەرێوەی دەبات، هەمیش کۆتایی بەو شەڕە دێنێت کە ئیندوستریالیزم بەرامبەر بە ژینگە جاڕیداوە، بەمجۆرە ئاشتی نێوان کۆمەڵگا و ژینگە بەدیدێنێت. هەرچی فاکتەری کۆمیناڵێتی دیموکراتییە بژاری بوون بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پێشکەش بە تاك و یەکینەی هەر کۆمەڵگایەك دەکات، بەمجۆرە رادیکاڵترین هەڵوێستی ئاشتی پێشکەش دەکات. ئاشکرایە چەندە تازەگەری دیموکراتی وەك سیستەم بەرەو پێشەوە بچێت، ئەوا دەرفەتی ئاشتییەکی شەرەفمەندانەش زیاتر دەبێت.

سەبارەت بەم خاڵە پێویستە ئاماژە بە داوای لێبوردن و ئاگادارییەك بکەم: زاراوەکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەگەڵ کۆمیناڵێتی دیموکراتی و کۆمەڵگای دیموکراتی یەکسان دەبینم. بە ئامانجی دەوڵەمەندێتی واتا لە بەکارهێنانی هەر سێ زاراوەدا دوودڵیم نەکرد. ئاشکرایە کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەگەڵ کۆمیناڵێتەی دیموکراتی زیاتر بە واتای سۆسیالیزمی دیموکراتی دێت، واتە بانگهێشتی یەکسانی کۆمەڵایەتی دەکات، یەکسانییەك لەسەر بنەمای جیاوازییەکان. چونکە چەمکی یەکسانیخوازی لەسەر بنەمای جیاوازییەکان، لەمانای ریال سۆسیالیزم جیاوازترە کە بەواتای هۆمۆژەن (چوونیەك)ی دێت. بە ئامانجی سەرنج راکێشان بە پێویستم بینی بە سۆسیالیزمی فێرعەونی ناودێر بکەم. هەروەها لەمیانەی زاراوەی کۆمەڵگای دیموکراتیشەوە هەوڵمدا جەخت لەسەر کارەکتەری کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بکەمەوە کە یەکسانی و ئازادی لەخۆوە دەگرێت. بێگومان ئەو زاراوانەی یەکسانن پێویستە هاوواتا نەکرێن، لە دەوڵەمەندیدا مەبەستم ئەوەیە. چونکە هاوواتاکردن، هەژاری و نەدارییە. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیداران دەرهەق بە بەکارهێنانی چەندبارەی ئەم زاراوانە ئاگادار دەکەمەوە کە نەکەونە ناکۆکییەوە، لەو بڕوایەدام کە بەسنگفراوانییەوە پێشوازی لە داوای لێبووردنم دەکەن کە جۆرێکی دیکەی زاراوەم نە ئافراندووە.

تەنیا بەوە نەوەستام کە بەرامبەر بە سێ فاکتەرە سەرەکییەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم، دەوڵەت ـ نەتەوە) تازەگەری دیموکراتی بە سێ فاکتەری سەرەکی وەسف بکەم، کە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، کۆمیناڵیتەی دیموکراتی، سۆسیالیزمی دیموکراتی و کۆمەڵگای دیموکراتی، کۆمەڵگای ئیکۆ ـ پیشەسازی و کۆنفیدراڵی دیموکراتیکن. هەروەك لە بەشی پەیوەندیداردا هەوڵی خستنەڕوومدا، لەمیانەی بەستەیەکی دەوڵەمەندی ماهییەتەکان هەوڵی پێناسەکردنیم دا. ئەو دوازدە فاکتەرە سەرەکییانەی سەبارەت بەکێشەی کۆمەڵگا ریزم کردن، لە هەمانکاتدا دوازدە ماهییەتەکەی چارەسەری تازەگەری دیموکراتی روون دەکاتەوە.

چەندین جار جەختم لەسەر ئەوە کردبوویەوە کە دەشێت ئەم خەباتە (پەرتووکە) لە ژێرناوی **سۆسیۆلۆژیای ئازادی** دا بڵاو بکرێتەوە. کاتێك هەوڵی پێناسەکردنی زانستی کۆمەڵایەتیم دا، بەگرنگییەوە جەختم لەسەر ئەوە کردەوە پێویستە ئامانجی سەرەکی پێشخستنی بژاری ئازادی بێت. کاتێك ئەوەشی بخەینە سەر کە بە واتایەك لە واتاکان چارەسەرکردنی کێشە بە مانای بەدیهێنانی ئازادی دێت، لەو بڕوایەدام کە لە چوارچێوەی ئامانجەکەیدا ناوبردنی زانستی کۆمەڵایەتی بە سۆسیۆلۆژیای ئازادی هیچ مەترسییەکی نییە. بەلانی کەم ناوبردنی بەشێکی گرنگی بەم ناوە لە جێگای خۆیدا دەبێت، واتە خەباتە کۆمەڵناسییەکانی پەیوەندییان بە رەهەندی پێشخستنی چارەسەرکردنی کێشە و پەیبردن بە ژیانەوە هەیە. بێگومان چوارچێوەی سۆسیۆلۆژیا تەنیا بە ئازادییەوە سنووریەند نییە. وەك دەزانرێت پێویستە خەریکی هەمەرەنگییەکەی ئاڵۆزی کۆمەڵگا بێت (کۆمەڵگای بەر لەمێژوو، پلەداری، چین، دەوڵەت، شار، شارستانی، سەرمایە، ئابووری، دەسەڵات، دیموکراسی، هونەر، ئایین، فەلسەفە، زانست، سیاسەت، شەڕ، ستراتیژی، رێکخستن، دامەزراوبوون، ئایدیۆلۆژیا، ئیکۆلۆژی، ژنۆلۆژی، تیۆلۆژی، ئیسکاتۆلۆژی .. هتد). بەڵام خاڵێك کە بەگرنگییەوە سەبارەت بەم خەباتە (پەرتوك) ئامارەم پێکرد: بڕوای خۆم لەم بارەیەوە خستبووە ڕوو کە بەرۆژەڤکردنی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی بەشێوەیەکی پارچەکراو و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوە مەترسی مەزن لەخۆوە دەگرێت، لە ئەنجامی ئەرێنی زیاتر ئەگەری رێکرنەوەی لەپێش ئەنجامە نەرێنییەکان هەیە. هەروەها ئامارەم بەوەش کردبوو کە بەشێوەیەکی بەهێز تەڤلیبوونی خۆم بۆ ئەو بۆچوونە پیشاندا کە لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی سروشتی کۆمەڵگا لەناو یەکپارچەیی و مێژووییبووندا راستترین پەیڕەوە.

کاتێك کۆتایی بەم بەشەیَ بەرگرینامەکەم دێنم خوازیارم بە دوو شرۆڤەی سەر سوقرات و زەردەشت کۆتایی پێ بێنم. وەك دەزانرێت ئەو گوتەیەی بەردەوام سوقرات بەکاری دەهێنا "خۆت بناسە" بوو. لەوانەیە خواستبێتی جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکاتەوە، ئەوانەی خۆیان نەناسن هیچ شتێك فێرنابن و نازانن. من لەو بڕوایەدام کە مرۆڤ کۆی ئەو واقیعەیە کە بەگوێرەی زانست بەلانی کەم پێنج ملیار ساڵ پێش ئێستا لەسەردەمی تەقینەوە مەزنە (بینگ بانگ[٢])ەکە بەولاوە لە تەواوی گەردووندا بڵاو بۆتەوە. هەست بەمە دەکەم و لێی تێدەگەم. لەم واتایەدا ناسینی خود یەکسانە بە ناسینی تەواوی زەمەن و گەردوون. هەروەها سوقرات لە بەرگرینامە بەناوبانگەکەیدا لەجیاتی خوداوەندەکانی ئەسینا (بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە نکوڵی لێکردوون) باسی "دایمۆنەکان" پەریبە ئیلهامبەخشەکانی کردووە کە ناوە بە ناوە هاتوونەتە لای. ئەمەش بە واتای ناسینی خود دێت لەمیانەی هەست و قاڵبوونەوەی ناواخندا. واتە جۆرێك لە جۆرەکانی هەوڵدان و فێربوونی شێوازی پێغەمبەرانەیە. ئاشکرایە کە ئەمە شێوازێکی فێربوونە لە بتپەرستی پێشکەوتووترە. کاتێك هێزی پەی پێبردنم یاخود " دایمۆن"ەکانم ئاگاداریان کردمەوە بەوەی کە "لەچی دەگەڕێیت لە خۆتیدا بدۆزەرەوە" ڕێگریم لە خۆم نەکرد کە ئەم دێڕانە بنووسم.

شرۆڤەی زەردەشت بەکاریگەرترە. وەك دەگێڕنەوە، لەچیاکانی زاگرۆس کە زەردەشت زۆر نامەزرۆی بووە، کاتێك خۆر بەتەواوی پرشنگداری خۆیەوە هەڵدێت دەنگێك دەبیستێت. بانگی ئەو دەنگە دەکات و پێی دەڵێت: "پێم بڵێ تۆ کێی؟"، گوایە بەمجۆرە ڕووبەڕووی خوداوەند دەبێتەوە و حیسابی لێدەپرسێت. هەرچی منم، لەو بڕوایەدام کە لەگەڵ پادشا ـ خوداوەندەکانی سۆمەرەوە کەوتۆتە ناو حیساب پرسینێکەوە کە هەزاران ساڵ هێرشیان کردۆتە سەر ئازادی گەلانی زاگرۆس. لێپرسینەوە لە پیرۆزی ئەم پادشا ـ خوداوەندانە دەکات کە خودی شارستانێن و بەمجۆرە شۆڕشی ئەخلاقی زەردەشتی ئەنجام دەدات. ئەمە ئەو شۆڕشەیە کە بەشێوەی دوالیزمی ڕووناکی ـ تارکی، چاکە ـ خراپەیە.

مسۆگەر نەفرەت لەو زێدەڕۆییانە دەکەم کە سەبارەت بە من دەکرێت. بەهەموو سادەبوونێکەوە لێتێگەیشتن و دۆستایەتیکردنم بۆ من ئەشقێکە. ڕۆژبەدوای ڕۆژ باشتر تێگەیشتم، ئەو کەسایەتییەم کە بە ئەشقەوە لەمیانەی ڕۆیورەسمی دۆستایەتییەوە بەهەموو سادەبوونێکیەوە پێشوازی لە ژیان کرد، هەر یەکێك هێرشی بۆ هێنابم بەرەنگاری بۆتەوە. کاتێك

---

[٢] تەقینەوە گەورەکە (Boung Big): تیۆری دروستبوونی گەردوونە لە بواری گەردووناسییەوە. بەگوێرەی ئەم تیۆریە نزیکەی ١٣,٧ملیار ساڵ بەر لە ئێستا لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی گەورە گەردوون دروست بووە.

هێرشیان کردۆتە سەرم، لێپرسینەوەم لەبارەیانەوە تا رادەیەك زەردەشتییانە بوو، واتا ئەم دێڕانە لەلایەکەوە ئەوانە پیشاندەدات کە لە میانەی خۆناسینەوە فێری بووم، لەلایەکی دیکەوە ئەو توانست و کەڵەکەبوونەی وشیاری و مەعریفە دەخاتەڕوو کە لەمیانەی لێپرسینەوەکانی "ئێوە کێن؟" پێکهاتووە.

هەم شیکارکردنی خۆم، هەمیش شیکارکردنی پیرۆزییە هەزار و یەك پەردەییەکەی شارستانی، بە واتای شیکارکردنی هەلومەرجە سەختەکانیش دەهات. لەکاتێکدا پیرۆزییەکانی شارستانی لەمیانەی پێشێلکردنی سەرجەم سنوورەکانی ئەخلاقی و سیاسی هەوڵی شێلانی منیان دەدا، حیساب پرسین و لێپرسینەوەیان لە ڕێگای ئەم دێڕانەوە لەناو کەشی ڕێوڕەسمێکی پڕ لە تامەزرۆییدا منی بە کەسایەتی، نەریتەکانم، گەلەکەم، ناوچەکەم، مرۆڤایەتیم و گەردوونەکەم ناساند. ئاشنابوونیش هەستپێکردن و دەرك پێکردنە، ئەمەش بە واتای ژیانێکی بێ ترس و بەرگریکردنێکی بەهێز دێت لەناو گشت دەوڵەمەندیەکانیەوە!

ناچارم یەکێك لە گوتەکانم دووبارە بکەمەوە کە زۆر جار ئاماژەم پێکردووە « ساتی وەها دێتە پێشەوە، مێژوو لە کەسایەتییەکدا، کەسایەتیش لەمێژوودا شاراوەیە». هەرچەندە زۆر بە ئێش و ئازاریش بێت، حاشاهەڵنەگرە کە تا رادەیەك من شەرەفی ئەم کەسایەتییەم بەرکەوتووە. جیاوازی من لەوەدایە، زۆرباش دەزانم لەبەرئەوەی لەولاتری « قوربانی قەدەر» خوازیاری رۆڵ بینین بووم، ئەم نەخشە و پیلانەیان لەبەرامبەرمدا بەڕێوەبرد. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو دروشمی دۆزەکەم کرد بە «ئازادی سەردەکەوێت».

تێکدان و پووچەڵکردنەوەی چارەنووسی دووبارەبۆوەی پیلان و گەمە تراژیدییەکان و شکاندنەوەی بەلای ئازادیدا. بەسە بۆئەوەی هەموو ئێش و ئازارێك رەچاو بکرێت. ئەم جارە لەکاتێکدا لەگەڵ هەڤالانم لە یارییەکدا جێگای خۆمان دەگرین کە ناوەکەی خودی راستی خۆیەتی، ئەوەی دەبێتە بەشی قەدەر تێکشکانە. لەبەرئەم هۆکارانەوە دەرکی پێدەکرێت بۆچی ئەم بەشەی بەرگرینامەم لەژێر ناوی کۆمەڵناسی ئازادی پێشکەشکردووە. هەرهەنگاوێکی ئازادی دەشێ تەنیا تاقیکردنەوەیەك بێت. لەم سۆنگەیەوە ناوی تاقیکردنەوە سەبارەت بە کۆمەڵناسی ئازادی لەجێگای خۆیدایە.